# تەفسیری ڕەوان

## (بۆتێگەیشتنی قورئان)

نوسینی:

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەرگی (دووەم)

جزمی (٤،٥،٦)

# تەفسیری ڕەوان

﴿بۆ تێگەیشتنی قورئان﴾

نوسینی:

مەلا مەحموودی گەڵاڵەیی

بەرگی ﴿دووەم﴾

جزمی ﴿٤، ٥، ٦﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان

نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ﴿٢١٤٠﴾ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.

چاپ و دیزاین: ﴿سامان محمد أمین﴾.

## رەددانەوەی جوولەکەکان دەربارەی حەرامیی بڕێ خواردەمەنی

﴿ ۞ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾.

ئایەتەکانی ئەم سوورەتە پیرۆزە، واتە: سوورەتی (ال عیمران) لە سەرەتاوە تا ئێرە بۆ چەسپاندنی بەڵگەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ)، نازڵ بوون هەروەها بۆ چەسپاندنی تاک و تەنیایی خوداو بەرپەرچدانەوەی ئەهلی کیتاب و بۆردانیان و پووچەڵ کردنەوەی ئەو داب و نەریتەی کە کردبوویانە ئایین و بەناوی ئایینەوە بە خەڵکیان دەسەلماند، بە درۆ و دەلەسە دەیانگوت: ئەمە لە خوداوە هاتووەو دەقی تەوراتە، لەڕاستیشدا بێ بناغە بوو. ئەم ئایەتانەی ئێرەیش کە بریتین لە ئایەتەکانی (٩٣ - ٩٧) کە لەمەدوا دەست دەکەین بە راڤەکردنیان، بۆ پووچەڵ کردنەوەی دوو شوبهەی تری جوولەکەکان هاتوون و لەو تەوەرەدا دەسووڕێنەوە.

١. گومانی یەکەم ئەوەیە کە بە پێغەمبەریان دەگوت: ئەتۆ لافی ئەوە لێ دەدەی کە لەسەر ئایینی ئیبراهیمی، ئەدی چۆن گۆشتی وشتر و شیری وشتر دەخۆی؟؟ لەکاتێکدا کە ئەو جۆرە خواردەمەنییە لە ئایینی ئیبراهیمدا حەرام بوون؛ واتە: تۆ شتێکت حەڵاڵ کردووە کە لەسەر ئەو حەرام بووە، ئەدی تۆ چۆن خۆت تەصدیقی ئەو دەکەی و لەگەڵ

ئیبراهیمدا هاوڕاو هاو ئایینی؟؟ کەوابێ تۆ بۆت نیە بڵێی: من لە هەموو کەس بە ئیبراهیم نزیکترم!!

ئیتر پەروەردگار بەرپەرچی دانەوە بەوە کە فەرمووی: هەموو خواردەمەنییەك بۆ بەنو ئیسرائیل حەڵاڵ بووەو پێش ئەوانیش بۆ ئیبراهیم حەڵاڵ بووە، دوایی بڕێ خواردەمەنییان لێ حەرام کرا وەکوو سزادانێك بۆیان.

٢- گومانکاری دووەم ئەوە بوو: کاتێك ڕۆگەی موسوڵمانان لە قودسەوە گۆڕا بۆ کەعبەو موسوڵمانان لەجیاتی ئەوەی روو بکەنە بەیتولمەقدیس روویان کردە کەعبە، جوولەکەکان تانووتیان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەداو دەیانگوت: بەیتولمەقدیس لەپێش کەعبەدا دروست کراوەو زەوییەکەشی دەبێتە گۆڕەپانی مەحشەر، هەموو پێغەمبەران لەنەوەی ئیسحاقن‌و هەموویان ڕێزیان لێ گرتووەو لە نوێژدا روویان تێ کردووە، ئەی مەحەممەد! تۆ ئەگەر راست بکەی کە لەسەر ئایینی ئەوانی ڕێزی ئەو ڕۆگەیەت دەگرت کە پێغەمبەرانی پێشوو ڕێزیان لێ گرتووەو، رووت لە قودس وەرنەدەگێڕاو، ڕۆگەیەکی ترت هەڵنەدەبژارد!؟ ئیتر پەروەردگار بەرپەرچی دانەوە بەوە کە یەکەم خانوویەك بۆ خودا پەرستی دروست کرابێ کەعبەیە کە ئیبراهیم‌و ئیسماعیلی کوڕی بۆ خودا تێداپەرستن دروستیان کردووەو لەکاتی نوێژو دوعا کردندا روویان تێ کردووە.

جا بۆ بەرپەرچدانەوەی گومانکاری یەکەم فەرمووی: ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ﴾ هەموو خواردەمەنییەك بۆ نەتەوەی ئیسرائیل حەڵاڵ‌و رەوا بووە، دوایی بڕێ خواردەمەنی بە گوێرەی تەورات لە جوولەکەکان یاساغ کرا، وەکوو سزایەك‌و تەمبێ کردنێك بۆیان، چونکە ئەوان ستەمیان لەخۆیان کردو شیاوی ئەو تەمبێ کردنە بوون وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ اللّهِ كَثِيرًا – النساء/١٦٠﴾ واتە: بەهۆی ستەمکردنی جوولەکەکان خۆیان بڕێ خواردەمەنی – کە لەوەپێش بۆیان حەڵاڵ بوو – لێمان حەرام کردن.

مەبەست بە (اسرائیل) لێرەدا – بەگوێرەی ڕای هەندی لە ڕاڤەکەران مەبەست نەتەوەی ئیسرائیلە نەك یەعقووب بێ، بەڵام بەگوێرەی ڕای جەماوەری ڕاڤەکەرانی

قورئان پێیان وایە مەبەست بە ئیسرائیل یەعقووبە. مەبەستیش بە حەرام کردنی نەتەوەی ئیسرائیل بڕێ خواردەمەنی لەسەر خۆیان، ئەوە نیە کە خۆیان لە خۆیانیان حەرام کردبێ، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە ئەو گەلە ملیان لە تاوانکردن ناوە، گوناهی زۆرو زەبەندەیان کرد تا خوداوەند بە سزادانیان لەسەر ئەو تاوانانە بڕێ خواردەمەنی لێ قەدەغەکردن، وەکوو لەو ئایەتەی پێشوو ئاماژەی بۆ کرا.

پوختەی ئەم وەڵامەی قورئان ئەوەیە: کە ئەصڵ لە خواردەمەنیدا ئەوەیە کە حەڵاڵ بێ، ئەوەی لەسەر نەتەوەی ئیسرائیل حەرام کرا بۆ تەمبێ کردن بوو، ئاکامی ئەو تاوانانە بوو: کە ئەنجامیان دان، دەی خۆ پێغەمبەرو ئومەتەکەی هیچ جۆرێکیان لەم تاوانانە ئەنجام نەداوە، کەوابێ ئەو خواردەمەنییە پاکانەیان لێ قەدەغە ناکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ﴾ واتە: پێش هاتنە خوارەوەی تەورات بۆ مووسا هەموو جۆرە خواردەمەنییەك حەڵاڵ بووە بۆ نەتەوەی ئیسرائیل بەڵام پاش نازڵبوونی تەوراتو ئەنجامدانی ئەوان بۆ چەند تاوانێك ئیتر جۆرەها خواردەمەنییان لێ قەدەغە کراو هۆی حەرامکردنەکەشی روون کردۆتەوە، ﴿قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ ئەگەر ئێوە دڵنیان کە راست دەکەن! دە تەورات بهێننو بیخوێننەوە سەیری بکەن بزانن ئاخۆ ئەوەی تێدایە کە دەڵێن: ئەو خواردەمەنییانەی لەئێوە حەرام کراوون لە ئیبراهیمیش حەرام بوون؟! دە بێنن دەقەکانی تەورات سەیر بکەنو بیکەن بە حەکەم با راستو درۆی قسەکانتان دەربکەوێ! خۆ تەورات کتێبی خۆتانەو بڕواتان پێیەتی.. دڵنیابن ئەگەر سەیری تەورات بکەن بۆتان دەردەکەوێ کە ئەو شتانەی لە نەتەوەی ئیسرائیل قەدەغەکران هۆیەکەی ئەنجامدانی چەند تاوانێکی بەنو ئیسرائیلییەکان خۆیان بوو، ئەو حەرامکردنەش تەمبێ کردنو سزادانیان بوو، کە وابێ کەسێك ئەو جۆرە تاوانانەی نەکردبن ئەو خواردەمەنییانەی بەشێوەی حەڵاڵ بۆ دەمێنێتەوە! چونکە ئەصڵ لە خواردەمەنیدا حەڵاڵییە نەك حەرامی.

﴿فَمَنِ افْتَرَىَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ﴾ کەسێك درۆو دەلەسە بەدەم خوداوە هەڵبەستێو پێی وابێ کە یاساغبوونی ئەو خواردەمەنییانە – گۆشتی وشترو شیرەکەی – لەسەر پێغەمبەرانی پێشوو گەلەکانیان لەپێش هاتنەخوارەوەی تەوراتدا بووەو، لەم

هەڵوێستەیان پەشیمان نەبنەوەو تۆبە نەکەن ﴿مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ دوای ئەوەی کە بۆیان روون کرایەوە کە حەرامبوونەکە بەهۆی گوناهو تاوانی خۆیانەوە بووەو دوای هاتنە خوارەوەی تەورات بووە، یان دوای ئەوەی داوایان لێ کرا تەورات بهێنن و سەیری بکەن، ئەوانیش لەترسی ئەوە کە درۆکەیان دەرکەوێ نەوێران تەورات بێنن ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ئەوانە ستەم لەخۆیان دەکەن و شیاوی سزای دۆزەخن و خودا نەفرەتیان لێ دەکا، چونکە ئەوان راستی پێشێل دەکەن و درۆو دەلەسە دەخەنە روو.

دەگێڕنەوە دەڵێن: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم تەحەدایەی لێ کردن، ئیتر نەوێران تەورات بێننە پێشەوەو بۆڕیان خوارد، ئەمەش بەڵگە بوو، لەسەر ئەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە نیگا ئەو زانیاریانەی تەوراتی زانیوە، چونکە ئەو نەخوێندەوار بووەو نەخوێندەوارییەکەشی مەشهوور بووە، جا کە راستی و حەق دەرکەوتن و بەتاڵ تێکشکاو ئاکام زاندرا ﴿قُلْ صَدَقَ اللَّهُ﴾ ئەی موحەممەد! بڵێ: پەروەردگار راستی لەگەڵ کردم لەوەدا کە هەواڵی پێدام کە هەموو خواردەمەنییەك حەڵاڵ بووە، ئەو رستەیە ﴿قُلْ صَدَقَ اللَّهُ﴾ باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە گوتنی (صدق الله العظیم) لە کۆتایی خوێندنی قورئاندا سوننەتە، چونکە هەروەك (صلوا علیه وسلموا تسلیما) گشتایەتی شوێن و کات و کەس دەگرێتەوە، ئەمیش هەروەها، هەموو ئەمرێ لە قورئان و حەدیثدا، بۆ عوموومە مەگەر نیشانەو بەڵگەی لادەر لە عومووم هەبێ.

﴿فَاتَّبِعُوا مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا﴾ پێیان بڵێ: شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەون ئایینێکی پاك و خاوێن و بێ خەوشە، دەق وەکوو ئەم ئایینە وایە کە من بانگەوازیتان بۆ دەکەم بۆی، حەزرەتی ئیبراهیم بەهیچ جۆرێ گۆشتی وشترو شیری وشتری حەرام نەکردووە، ئایینێکی مامناوەندییە، توندڕەوی و زیادڕۆیی تێدا نیە، قورئان ئاوێنەی باڵانومایەتی، ئیبراهیم خوداپەرستێکی حەقناس بوو، وازی لەهەموو ئایینێك هێنابوو رێگای راستی ئیسلامی گرتبوو: کە لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی و بە حەڵاڵ زانینی خواردەمەنی پاك و خاوێن سەرچاوەی هەڵگرتبوو ﴿وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئیبراهیم هەرگیز

هاوەڵی بۆ خودا قەرار نەداوە، نە وەكوو قورەیشییەكان بتپەرستی كردووە، نە وەكوو جوولەكەو فەلە خۆی بە كوڕی خودا زانیوە.

ئایینی ئیبراهیم لەسەر بنەمای یەكتاپەرستی دامەزراوەو، ئەو شەریعەتو یاسایەیە كە قورئان هێناویەتیو پێغەمبەری ئیسلام بانگەوازی بۆ دەكا، كەوابێ ئایینی ئیبراهیم دەقی ئەم ئایینە ئیسلامەیە كە (موحەممەد) بانگەوازی بۆ كردووە، ئایینێكی حەقو راستەو هیچ شكو گومانی تێدا نیە، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ – الأنعام/١٦١﴾. یان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ – النحل/١٢٣﴾.

## ئایەتەكان ئەم دوو حوكمە دەگەیەنن:

١- یەكەم ئەو خواردەمەنییانەی كە یەعقووب لەسەر خۆی حەرام كرد بە ئیجتیهادو رەئی خۆی بوو نەك بە نیگای خودایی، چونكە لە ئایەتەكەدا نیسبەتی كرداری (حرم) بۆلای یەعقووب دراوە. پێغەمبەریش ئەگەر ئیجتیهادی كردو گەییشتە شتێكو پەسەندی كرد دەبێتە ئایینو دەبێ پێیەوە پابەند بێ! مەگەر پەروەردگار تەقریری نەكا لەسەری، وەكوو ئەوە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هەنگوینی لە خۆی حەرام كرد، بەلام پەروەردگار تەقریری نەكردو رەخنەی لێ گرتو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ – التحريم/١﴾. ئەی پێغەمبەر! بۆچی شتێك خودا بۆی حەلاڵ كردووی لەخۆتی حەرام دەكەی؟!

٢- دووەم ئەو خواردەمەنییانەی كە خودا لەسەر نەتەوەی ئیسرائیلی حەرام كردن وەكوو بەزو چەند جۆرە خواردەمەنییەكی تر بە مەبەستی تەمبێ كردنو سزادانیان لەسەر گوناهو تاوان، وەكوو خودا دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ –النساء/١٦٠﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ

حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ... – الأنعام/١٤٦﴾ تا دەگاتە ئەوەی کە دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِبَغْيِهِمْ وإِنَّا لَصَادِقُونَ – الأنعام/١٤٦﴾

ئایەتەکان بەصەراحەتو بێ پەردە ئەوەشیان تێدایە کە یاسای قورئانو ئایینی ئیبراهیمو هەموو ئایینەکانی تر لە بنەمادا یەکنو هەموویان بانگەوازییان بۆ یەکتاپەرستیو خودا بەیەکناسین کردووە.

## باسی ڕێزو شکۆمەندی کەعبەو واجب بوونی حەج

﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾.

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴾ بێگومان ئەو خانووەی کە ڕۆگەی موسوڵمانانە لەنوێژو پاڕانەوەدا، ئەوە یەکەم خانوێکە بۆ خوداپەرستی دروست کراوە، ئەو خانوەیە کە ئیبراهیمو ئیسماعیل دروستیان کرد بۆ خوداپەرستی، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ –البقرة/١٢٧﴾. ئەمجار پاش ئەو مێژووە بەچەند چەرخێك ساڵی (١٠٠٥)ی پێش زایین حەزرەتی سولەیمانی کوڕی داوود (عليهما السلام) مزگەوتی قودسی دروست کردووە. ئیبراهیم کە کەعبەی دروست کرد، کردی بەیەکەم ڕۆگەی خوداپەرستان، کەوابێ پێغەمبەری ئیسلام لەسەر ئایینی ئیبراهیمە کە ئەویش لەکاتی نوێژو خوداپەرستیدا ڕووی دەکردە کەعبە.

**بەکورتی**: یەکەم پەرستگایەکی راستو دروست کە پێغەمبەران دروستیان کردبێ کەعبەی پیرۆزەو لەسەر زەوی پێش کەعبە پەرستگایەکی تر دروست نەکراوە، دێر زەمانیشی دەبێتە مایەی زۆر رێزی.

**ئەم خانووە پیرۆزە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە**:

١- پیرۆزو خێرو بەرەکەت ئامێزە، ئەم شارە پیرۆزە هەرچەندە لە دۆڵێکی رەقەنو رووتەن دایە، کەچی میوەو بەروبوومی هەموو شتێکی لە هەموو لایەکەوە بۆ دێ وەکوو خودا دەفەرموێ: ﴿يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ – القصص/٥٧﴾. زیاد لەوە خێرو بەرەکەتی چاکەشی هەیە، خێرو خێرات تێیدا پاداشی چەند چەندانە دەدرێتەوەو دوعاو نزاو پاڕانەوە تێیدا گیرا دەبێ.

٢- ﴿وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەو ئاستانە سەرچاوەی شارەزایی کردنی خەڵکە، نوێژکەرەکان لەکاتی نوێژو پاڕانەوەدا رووی تێ دەکەنو دڵی موسوڵمانانی پێوە بەندە، ساڵانە بە سواریو بە پیادەیی ملیۆنەها خەڵکی بۆ دەکشێن، دەچن بۆ دیدەنی ئەم ماڵە پیرۆزە، لەهەموو لایەکەوە موسوڵمانان دەرژێنە ئەو بەستە (حەرەمە)وە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی حەجو عەمرە، ئەمەش بەبەرەکەتی نزاو پاڕانەوەی ئیبراهیم (علیه السلام) کە لە پەروەردگار پاڕایەوەو گوتی: ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ – إبراهيم/٣٧﴾. پەروەردگار وەڵامی پاڕانەوەکەی دایەوەو فەرمووی: ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ، لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ – الحج/٢٧ – ٢٨﴾.

٣- ﴿فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ﴾ لەو ماڵەدا نیشانەی ئاشکرای تێدا هەن، یەکێ لەو نیشانانە شوێنی راوەستانی ئیبراهیمە تێیدا (مقام ابراهیم) کە بۆ نوێژ لێی راوەستاوەو لە خودا پاڕاوەتەوە، وەکوو موعجیزەیەکی مێژوویش شوێن قاچی پیرۆزی لەسەر تاتە بەردەکە ماوە، عەرەبەکان بە تەواتور چین لە دوای چین ئەم چیرۆکەیان بۆ یەکتری گێڕاوەتەوە.

٤ـ ﴿وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا﴾ هەرکەسێك تینی بۆ هاتبێ‌و خۆی خستبێتە ناوی تا لەناویدا مابووبێتەوە پارێزراو بووە، کەس دەستدرێژی بۆسەر خۆی‌و ماڵی نەکردووە، تەنانەت پیاوکوژیش کەخۆی خستبێتە ناو کەعبەوە هەرچەندە موستەحەقی تۆڵە لێ ستاندن بووبێ تا لەوێدا بووبێ خوێنی پارێزراوە. چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا – القصص/٥٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً –البقرة/١٢٥﴾. یان پاڕانەوەکەی ئیبراهیم کە دەفەرموێ: ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا –البقرة/١٢٦﴾.

عومەری کوڕی خەطاب (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) دەیفەرموو: ئەگەر بکوژی خەطابی باوکم دەست بکەوێ لەناو کەعبەدا تا نەیەتە دەرێ دەستی بۆ نابەم.

ئەبو حەنیفەش دەفەرموێ: کەسێك کوشتنی پێویست بوو، وەکوو ئەوە بکوژ بێ‌و پێویست بێ تۆڵەی لێ بسێنرێ، یان لە ئیسلام هەڵگەڕابێتەوە یان زینای کردبێ‌و موستەحەقی بەردباران کردن بێ، خۆ بخاتە ناو کەعبەوە هیچی لێ ناکرێ، ئەوەندە هەیە خواردن‌و خواردنەوەو پێویستیاتی تری بۆ دابین ناکرێ بۆ ئەوەی بێتە دەرەوەو تۆڵەی لێ بستێندرێ!

بەڵام ئازادکردنی مەککە، لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەلایەن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کە بەشەڕو چەك گرتی، ئەوە لەبەر ناچاری‌و پاکردنەوەی کەعبە بوو لە بتپەرستی، بەمەبەستی ئەوە بوو، تەنها خودای تێدا بپەرسترێ، شەڕ کردن تێیدا بۆ پێغەمبەر ساتێك حەڵاڵ بوو، کە بریتی بوو لە رۆژی ئازادکردنی مەککە، دوای پێغەمبەر بۆ کەس دروست نیە؛ پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) پاش ئەو ساتە رایگەیاندو فەرمووی: هەرکەسێك بچێتە ناو کەعبەوە ئەمین دەبێ، هەرکەسێك بچێتە ماڵی خۆی شەڕی لەگەڵدا ناکرێ‌و ئەمین دەبێ، هەرکەسێك خۆی بخاتە ماڵی ئەبو سوفیانەوە ئەمین دەبێ. ئەم رووداوانەی کە لەسەردەمی حەجاجدا روویاندا شتێکی ناڕەوا بوون‌و لەچوارچێوەی ئایین‌دا جێگایان نابێتەوە.. ئەو هەڵوێستەی بەرامبەر عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر نوێنرا شتێکی کوفر ئاسا بووەو کەس بەلایەوە رەوا نەبووە. واتە: تەحەکومی حوکام بە حوکمی ئیسلام دانانرێ!

ئەو فتوایەی کە ئیمامی مالیكو ئیمامی شافیعی داویانە کە لەناو کەعبەدا دروستە تۆڵە لە بکوژی عەمدی بسێنرێ ئەوە سزادانێکی دادپەروەرانەیە قورئان فەرمانی پێ کردووەو دەستدرێژی بۆسەر کەس تێدا نیە!!

زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەرئەوە ئەگەر کەسێك لەناو کەعبەدا شەڕی کردو خەڵکی کوشت، شەڕی لەگەڵ دەکرێو دەشکوژرێ لەوێدا.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ - البقرة/١٩١﴾.

ئایەتەکە جیاوازی خستۆتە نێوان ئەو کەسەی لەناو کەعبەدا دەستدرێژی دەکاو خەڵك دەکوژێو ئەو کەسەی لە دەرەوەی کەعبە خەڵك دەکوژێو خۆی دەخاتە ناو کەعبەوە. لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو هاوەڵانی تری پێغەمبەرو (تابعین)یش ریوایەتیان کردووە فەرموویانە: ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشتو خۆی خستە کەعبەوە لەوێدا ناکوژرێتەوە! ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: بەڵام نابێ کەس لەوێدا هاونشینی بکاو یارمەتی بدا، خواردنو خواردنەوەی نادرێتێ بۆئەوەی ناچار ببێو بێتە دەرەوەو تۆڵەی لێ بسێنرێ! ئەگەر لەناو کەعبەدا مرۆڤی کوشت هەر لەوێدا تۆڵەی لێ دەستێندرێ.

٥- تایبەتمەندییەکی تری خانەی خودا ئەوەیە: کە ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکی بەتوانایە کە لەماوەی ژیانیدا - بەلای کەم - جارێك دیدەنی کەعبە بکا خودا دەفەرموێ: ﴿وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ پێویستە هەرکەسێك توانای دارایيو جەستەیی هەبوو لە موسوڵمانان لە ماوەی تەمەنیدا جارێك دیدەنی ماڵی خودا بکا بەمەبەستی حەج کردن بۆ خودا، ئەمەش رێزلێنانێکی تایبەتە بۆ ئەو خانە پیرۆزە، هەر لە رۆژگاری ئیبراهیمەوە تا سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام ئادەمیزادان ساڵانە دیدەنی ئەم خانوویان کردووە چین لەدوای چینو نەوە لەپاش نەوە - تەنانەت ئەوانەی بتپەرستو موشریکیش بوون - ئەم رێو رەسمەیان پەیڕەو کردووەو بەشێوەیەك لە شێوەکانی حەج کردن ئەم دابو نەریتەیان درێژە پێداوە، ئەمەش بەلگەیەکی (متواتر)و گێڕانەوەی کۆ لە کۆیە بۆ چەسپاندنی درووستکردنی ئەو خانووە لەلایەن ئیبراهیمەوە (علَيْهِ السلام)

هەر لەرۆژگاری هاتنی ئایینی ئیسلامیشەوە تا ئێستا سالأنە کۆمەڵێك لە موسوڵمانان لەهەر چوار لاوە لەکاتی دیاری کراودا بەرەو ماڵی خودا بەرێ دەکەون ئەم ئەرکە پیرۆزە (ئەرکی حەجکردن) ئەنجام دەدەن! ئینشائەڵلا تاکۆتایی تەمەنی جیهان ئەم ئەرکە پیرۆزە ئیسلامییە لەگەشەکردندا دەبێ.

ئایەتەکە بۆ واجب بوونی حەج مەرجی هەبوونی توانای داناوە، زانایان لە راڤەکردنو دیاریکردنی توانادا رای جیاجیایان هەیە: هەندێك دەڵێن: مەبەست لە (استطاع) هەبوونی تێشووی رێگاو هەبوونی هۆی گواستنەوەیە – ولاخ یان سەیارە یان تەیارە – بۆ ئەوەی شتو مەکەکانی لێ بار بکاو بۆخۆشی سواری ببێ رێگاشی ئەمین بێ، هەندێکیش دەڵێن: (ئیستیطاعە) برێتییە لە لەشساغیو توانای رۆیشتن بە رێگادا، هەندێکیش دەڵێن: برێتییە لە لەشساغیو نەبوونی ترس لە دوژمنو درندەو توانای دارایی بە جۆرێك بتوانێ تێشوو ولاخی سواری یان سەیارە.. بۆ گەشتەکەی دابین بکا، قەرزو قۆڵەی لەسەر نەبێ، ئەوەندەی هەبێ تا دێتەوە بژێوی خاو خێزانی؛ ئەوانەی بژێوییان لەسەریەتی دابین بکا!!

بەکورتی واجب بوونی حەج بەستراوە بە هەبوونی تواناوە، تواناش بە گوێرەی رۆژگارو ئادەمیزادەکان دەگۆڕێ.

﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ هەرکەسێك ئینکاری ئەوە بکا کە کەعبە یەکەم خانوێکە کە ئیبراهیم بەفەرمانی خودا بۆ خودا تێداپەرستن دروستی کردووە – گەردنکەچ نەبێ بۆ فەرمانی خوداو حەج کردنو رووتێکردنی لەکاتی نوێژداو بە رۆگەی نەزانێ، ئەوە خوا بێ ئاتاجەو هیچ پێویستی بە ئادەمیزادان نیەو لە خودایەتی خۆی ناکەوێ! برێکیش پێیان وایە مەبەست بە (کوفر) لە ئایەتەکەدا نەکردنی حەجە، واتە: کەسێك حەج نەکا خودا بێ ئیحتیاجە لە هەموو کەسو ج پێویستییەکی بە ئادەمیزادان نیە!! ئەمەش هەڕەشەیەکی توندە لەو کەسانەی حەج ناکەن، چونکە نەکردنی بە کوفر داناوە!!

لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَحُجَّ فَلْيَمُتْ إِنْ شَاءَ يَهُودِيًّا وَإِنْ شَاءَ نَصْرَانِيًّا» کەسێك حەجی لەسەر بێو بمرێو

حەج نەکا، ئارەزۆی خۆیەتی با بە جوولەکەیی یان گاوریی بمرێ! ئیمامی عەلی دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە وتارێکیدا فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاسُ! إنَّ اللّٰهَ فَرَضَ الحجَّ على مَنِ استَطَاعَ إلَيْهِ سَبِيلاً، ومن لم يفعل فليمت على أي حال شاء يهوديا أو نصرانيا أو مجوسيا». ئەی موسوڵمانینە دڵنیا بن لەوە کە خودا حەجی پێویست کردووە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، کە توانای ڕێگاو بانی هەبێ، جا هەرکەسێ حەجی لەسەر بێ‌و حەج نەکا، ئەوە خۆی سەرپشك بێ لەیەکێ لەمانە: کە بەجوولەکەیی، یان فەلەیی، یان ئاگر پەرستی بمرێ).

لە ئیمامی عومەرەوە دەگێڕنەوە دەیفەرموو: (لقد هممت أن أبعث رجالا إلى هذه الأمصار) نیازم هەبوو کە نوێنەر بنێرم کە بە شارە گەورەکاندا بگەڕێن، تا بە موسوڵمانان رابگەیەنن کە بچن بۆ حەج، هەرکەسێك توانای هەبێ‌و حەج نەکا سەرانەیان بخەنە سەر، ئەوانە موسوڵمان نین، هەر لەبەر ئەم بەڵگانە زۆربەی زانایانی شەرع گوتوویانە حەج پێویستەو هەرکەسێك توانای هەبوو دەبێ دەست بەجێ ئەنجامی بدا، بڕێکیش دەڵێن: دەتوانێ بە کاوەخۆی ئەنجامی بدا!!.

## سووربوونی خاوەن نامەکان لەسەر کوفرو کۆسپو تەگەرە دانانیان لەڕێگەی خودادا

﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار بەڵگەی لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام هێنایەوەو راوو بۆچوونی خاوەن نامەکانی پووچەڵ کردەوە،

فەرمان بە پێغەمبەر دەکا کە بەشێوەیەکی نەرم‌و نیان داوایان لێ بکا کە هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر بانگەوازی ئیسلامیی بگۆڕن‌و، بڕوا بە پەیامی قورئان بکەن‌و فەرمووی: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ﴾ ئەی موحەممەد! بە خاوەن نامەکان بڵێ: بۆچی بڕواتان بە خودایەتی خودا نیەو سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن‌و ئیمان بە پەیام‌و نیشانی راستی پەسەندو نێردراوی ناکەن؟؟ هۆی چیەو بەڵگەتان چیە کەوا هەڵوێستی واتان گرتووە بانگەوازی ئیسلامیی رەت دەکەنەوە؟؟ ﴿وَاللّهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا تَعْمَلُونَ﴾ خودا ئاگادارەو دەزانێ چی دەکەن‌و سزای شیاوی ئەو هەڵوێست‌و کردارانەتان دەداتەوە ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ﴾ پێیان بڵێ: ئەی خاوەن نامەکان! ﴿لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ مَنْ آمَنَ﴾ بۆچی‌و لەپای چی هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن کە موسوڵمانان لە رێگای راست‌و دروستی ئیسلام لابدەن؟؟ رێگای ئیمان‌و زانستیان لێ بشێوێنن؟ هەمیشە کۆسپ‌و تەگەرە دەخەنە بەردەم بڵاوبوونەوەی ئایین!!

ناهێڵن بە دڵی هۆشیارو چاوی وردبینییەوە لە بوونەوەر بڕوانن‌و دڵ‌و دەروونی خۆیان بە رەوشتی بەرز ئارایشت بدەن؟ ئاستی مرۆڤایەتی خۆیان بەرز بکەنەوە؟؟ ئێوە بەم هەڵوێستە دژایەتیکردنەتان کە لەسەر بنەمای حەسوودی‌و لوتبەرزی‌و چەواشەکاری بنچی بەستووە. ﴿تَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾ دەتانەوێ ئادەمیزاد لە رێبازی حەق لابدەن‌و بیانخەنە سەر رێگای گومڕایی‌و دەشزانن کە موحەممەد پێغەمبەرەو راستگۆیە لە پەیامەکەی داو، لە کتێبی ئێوە - تەورات‌و ئینجیل -دا مزگێنی بە هاتنی دراوە، نیشانەو ئەخلاق‌و رەوشتی دیاری کراوە، بەڵام ئێوە دەقەکانتان گۆڕیون‌و بەدەم خوداوە درۆو دەلەسەتان هەڵبەستووە ﴿وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ خودا بێ ئاگا نیە لە کردەوەو فرت‌و فێڵتان، تۆڵەتان لێ دەستێنێ!!

تێبینییەك: ئەم دوو ئایەتەی پێشوو یەکەمیان بە ﴿وَاللّهُ شَهِيدٌ....﴾ کۆتای پێ هات، چونکە ئەو کردەوەیەی لە ئایەتەکەدا باسی کراوە کوفرێکی ئاشکراو دیارە، ئایەتی دووەم بە ﴿وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ...﴾ کۆتای پێ هاتووە چونکە رێگە گرتنیان لە

ئیسلام لەڕووی فرتو فێڵەوە بوو. ئایەتی یەکەم بۆ وازهێنانی خاوەن نامەکانە لە گومڕایی، ئایەتی دووەم بۆ وازهێنانە لە گومڕایی کردنی خەڵکانی تر.

ئەم دوو ئایەتە هەڕەشەو ترساندنی بۆ خاوەن نامەکان تێدایەو جاڕدانێکی ئاشکرایە بۆ پووچەڵ کردنەوەی پیلانو بەدەرخستنی جۆرەها فرتو فێڵیانو چەواشەکردن. چونکە خودا ئاگادارو زانایە بە کردارەکانیانو سزایان دەداتەوە لەسەر کرداری خراپیانو هەڵوێستی نالەبارو درۆ ئاساو سەرپێچی ئامێز.

دوای ئەوەی پەروەردگار سەرزەنشتی خاوەن نامەکانی کرد لەسەر کافربوونیانو لەمپەڕ دانانیان لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامو بەبەڵگەی بەهێز بۆردراون، روو دەکاتە موسوڵمانانو لەوە دەیانترسێنێ کە بە فرتو فێڵی ئەو جوولەکانە هەڵنەخەڵەتێن، چونکە ئەوانە شیاوی ئەوە نین گوێیان لێ بگیرێو قسەیان ببیسترێ؛ ئەوانە ئاشووب گێڕنو فیتنە هەڵگیرسێنن.

جا وەکوو ئیبنو جەریری طەبەری لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: رۆژێك جوولەکەیەك (شاس)ی کوڕی قەیس بەلای کۆمەڵێك لە ئەوسو خەزرەجدا تێپەڕی، بینی بەیەکەوە بە برایەتی دانیشتوون، زۆری پێ ناخۆش بوو، لەدڵی خۆیدا وتی ئەگەر ئەمانە ئاوا بەیەکەوە تەبابن ئێمە ناتوانین لە ناویاندا بژین. بە کوڕە جوولەکەیەکی گوت: بچۆ لێیان نزیك بکەوەرەوە، هەر هەلت بۆ هەڵکەوت باسو خواسی رۆژی بوعاثو زاڵبوونی ئەوس بەسەر خەزرەجدا بێنە پێشەوەو برێ شیعرو خۆهەڵکێشانی یەکتریان یاد بخەرەوە، ئیتر کوڕەکە لێزانانە باسی (بعاث)ی هێنایە پێشەوەو ئەو دوژمنایەتیەی خستەوە بیری دانیشتووەکان، ئەوانیش کەوتنە خۆهەڵکێشانو شانازی کردنو تانووت لێکدان، هەتا دوو پیاو لە هەردوولا پەلاماری یەکیان داو یەکیان بە ئەوی تری گوت: ئەگەر حەز دەکەن با دایمەزرێنینەوە!! ئیتر هەریەکە لە عاست خۆیەوە پەلاماری چەکی داو وتیان: وادەمان (الظاهرة) بێ لەوێ یەکتر دەبینینەوە، ئەم هەواڵە گەیشتەوە پێغەمبەرو تەشریفی خێرا لەگەڵ کۆمەڵێك کۆچکاران (مهاجرین) چوە ناویانەوەو وتارێکی بۆدان، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ئەوە چۆن هەڵسو کەوتی وا نەزانانە دەنوێنن، خۆ من خۆم هێشتا ماووم لەناوتاندا؟! چۆن دەبێ دوای ئەوەی خودا

ڕێزی لێ ناونو ئایینی ئیسلامی بۆ ناردوونو دابو نەریتی سەردەمی نەفامی لێ یاساغ کردوونو براییو تەبایی خستۆتە نێوانتانەوە، کەچی دەتانەوێ بگەڕێنەوە بۆ ئەو سەردەمە نەفامییە، ئەڵلا ئەڵلا! کە کارێکی خراپ دەکەن! ئیتر خەڵکەکە تێگەیشتن کە ئەو ڕووداوە کارێکی شەیتانی بوو، پیلانێکی دوژمنکارانەی دوژمنانی موسوڵمانانە! ئیتر هەمووی چەکیان فڕێ داو بلاوەیان لێ کرد. ئەمجار پەروەردگار ئەم ئایەتانەی دوایی ناردە خوارێ.

## ڕێنومایی کردنی موسوڵمانان کە پارێزگاری کەسایەتی خۆیان بکەن، پابەندی قورئانو ئیسلام بن

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ۚ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ

عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ (١٠٣) ﴾.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوَاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ﴾ ئێوە ئەی گرۆهی موسوڵمانان! ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئەگەر گوێ بۆ ئەو قسە فیتنە ئامێزو ژەهراوییانەی جوولەکەکان بگرن‌و دڵیان بۆ بکەنەوەو بە گوێرەی ویستی ئەوان هەڵس‌و کەوت بکەن، دڵنیابن لە موسوڵمانییەوە دەتانگێڕنەوە بۆ سەردەمی نەفامی‌و خودانەناسی! وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئەم مانایە دووپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ ئاشکراشە خودانەناسی‌و گەڕانەوە بۆ داب‌و نەریتی سەردەمی نەزانی دەبێتە هۆی بەدبەختی هەردوو جیهان؛ لە دوونیادا دەبێتە هۆی دروستبوونی دژایەتی‌و دوژمنایەتی‌و خوێن ڕشتن، لە قیامەتیشدا دەبێتە هۆی چوونە ناو دۆزەخ‌و سزای بە ئێش!

﴿وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ﴾ چۆن ئێوە کافر دەبنەوەو مل لە خودانەناسی دەنێنەوە؟؟ خۆ ﴿وَأَنتُمْ تلَى عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللّهِ﴾ ئێوە ئایاتی خوداتان بەسەردا دەخوێندرێتەوە؟! هەر ساتە ناساتێك بەشێك لەو پەیامە پیرۆزە خودایيەتان بۆ دەنێردرێ ﴿وَفِيكُمْ رَسُولُهُ﴾ هاوکات لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەری خوداتان لە ناودایەو هەمیشە ئامۆژگاریتان دەکاو ئایەتەکانی قورئانتان بۆ شی دەکاتەوە، بیروباوەڕتان پتەو دەکاو ڕێگای ڕاست‌و خۆشبەختی‌و کامەرانیتان پێ دەڵێ: جا ئێوە لەگەڵ هەبوونی ئەم ڕەهبەرە دڵسۆزە لە ناوتاندا، نابێ گوێ بۆ ئەو تاقمە سەرلێشێواوە گومڕایانە بگرن‌و بە فیتی ئەوان هەڵبخەڵەتێن. ﴿وَمَن يَعْتَصِم بِاللّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ کەسێك دەست بە ئایینی خوداوە بگرێ‌و پەیڕەوی قورئان بکاو شوێن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بکەوێ، بێگومان ڕێگای ڕاستیان پیشان دراوەو، کەوتوونە سەر شەقامە ڕێگای ڕاست.

قەتادە دەفەرموێ: لە ئایەتەکەدا پەروەردگار دوو شتی باس کردن کە دەبنە هۆی خودا ناسینو دوورکەوتنەوە لە کوفر، یەکەمیان خوێندنەوەی قورئانە دووەمیان هەبوونی پێغەمبەر لە ناویاندا، پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) چووەتە بەر دیوانی خوداو لە دوونیا دەرچووە، بەلاّم قورئان ماوەتەوەو هەتا رۆژگار هەبێ ئەویش هەر دەمێنێ!

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕنو ئیمانتان هێناوە، تەقوای خودا بکەن بە تەقوا کردنێکی وا کە بەگوێرەی توانا واجبات ئەنجام بدەنو خۆ لەشتە نەهی لێ کراوەکان بپارێزن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ – التغابن/١٦﴾. بە گوێرەی تاقەتو توانا هەولّ بدەن تەقوای خودا بکەن.. پێغەمبەریش دەفەرموێ: «مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا بِهِ مَا اسْتَطَعْتُمْ» رواه الشيخان عن أبي هريرة.

ئیبنو مەسعوود دەفەرموێ: تەقوای خودا بریتییە لەوە بەگوێی بکەیو لێی یاخی نەبی، سوپاسی بکەی، نیعمەتەکانی نەشێریەوە، یادی بکەیو لە بیری نەکەی! ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: تەقوای خودا ئەوەیە کە لە پێناو خودادا کۆشش بکەیو لە پێناو ئایینی خودادا کابرا گوێ نەداتە هیچ لۆمەکردنێك، هەموو شتێك بەتەرازووی خودایی بەراورد بکا، چاولێك نانێك لێی بێ ئاگا نەبێ! ﴿وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ وا لەخۆتان مەکەن بە کافری بمرن، هەمیشە هەولّ بدەن بە موسولّمانی دونیا بەجێ بهێلّن، هەرگیز هاوەلّ بۆ خودا دامەنێنو بەشێوەی موسولّمانی پێشوازی لە مردن بکەن![1]

---

[1]- رافەکەرانی قورئان دەلّێن: کە ئایەتی (فاتقوا الله حق تقاته) هاتە خوارێ موسولّمانان تینیان لێ پەیدا بوو، عەرزی پێغەمبەریان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا کێ توانای بەسەر ئەوەدا هەیە؟؟ کێ دەتوانێ (حق تقاته) ئەنجام بدا؟؟ ئیتر پەروەردگار ئایەتی (فاتقوا الله ماستطعتم)ی ناردە خوارەوە، ئایەتی (حق تقاته) نەسخ کردەوە.

مقاتل: دەفەرمووێ: لە سوورەتی (ال عمران)دا هیچی تری تێدا نیە نەسخ کرابێتەوە جگە لەم ئایەتە!

﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ﴾ هەمووتان دەست بە کتێبی خوداوە – کە قورئانە – بگرن و پابەندی ئەو پەیمانە بن کە لەو قورئانەدا بۆی ناردوون، لەوێدا فەرمانی پێ کردوون بە یەکیەتی و تەبایی و گەردنکەچی بۆ خوداو گوێرایەڵی پێغەمبەرەکەی!

لە ئایەتەکەدا ئایینی خوداو قورئان بە (حبل) ناو براوە، لەو رووەوە، کە ئایین کاریگەریەکی تەواوی هەیە لە دڵ و دەروونی پەیڕەوکەرانیدا، بەگوێرەی یاساو پرۆگرامی خۆی ئادەمیزادان وەگەڕ دەخاو کاروباری خۆیان لە ژێر رۆشنایی ئەو پەیامەدا ئەنجام دەدەن، وەکوو ئەوە کەسێك دەستی پێوەبگرێ ئەمین دەبێ لە تەرەبوون و پەرتەوازە بوون و بەربوونەوە!!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (القرآن حبل الله المتين لاتنقضي عجائبه، ولا تفني غرائبه، ولا يخلق على كثرة الرد، من قال به صدق ومن اعتصم به هدى إلى صراط مستقيم) کەوابوو حەبلی خودا بریتییە لە بیروباوەڕو گەردنکەچی بۆ خوداو کارکردن بە قورئان.

یان لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ﴾.

ئەمجار پەروەردگار نیعمەت و بەخششی خۆی – کە بە موسوڵمانانی داوە – دەخاتەوە بیری موسوڵمانان و دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی موسوڵمانان! یادی نیعمەتی خودا بکەن بەسەرتانەوە. کە ﴿إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا﴾ ئەو کاتەی ئێوە دوژمنی یەکتری بوون، خودا یەکیەتی و برایەتی و تەبایی خستە ناوتانەوە، دوای ئەوەی کە دژایەتی یەکتریتان

---

بەڵام خاوەنی (التفسير المنير) دەفەرموێ: ئایەتی (فاتقو الله ماستطعتم) بەیان و روون کردنەوەیە بۆ ئایەتی (حق تقاته) واتە ماناکەی وای لێ دێ (فاتقوا الله حق تقاته ماستطعتم) تەقوای خودا بکەن بە تەقوایەکی حەقیقی و راست بەگوێرەی توانا چونکە نەسخ کاتێ دەبێ کە مانای دوو ئایەتەکە (دوو دەقەکە) پێکەوە نەگونجێن! دەی لێرەدا دەکرێ مانای هەردوو ئایەتەکان کۆبکرێتەوەو ماناکەش دژایەتی تێ نەکەوێ.

دەكردو پەرتەوازە بوون، ئەم ئەوی دەكوشت، بەهێز بێ هێزی دەچەوساندەوە! بەڵام بەهۆی نیعمەتی خوداوە – كە ئایینی ئیسلامە – هەمووتان بوون بە برای گیانی بە گیانی یەكتری، تەبایی‌و خۆشەویستیتان لە ناودا بڵاوبووەوە. ﴿وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا﴾ بەهۆی نەفامی‌و خودانەناسیەوە، ئێوە لەسەر لێواری چاڵە ئاگرێكی سوتمان بوون‌و خەریكبوو بەهیلاك بچن‌و، پەروەردگار رزگاری كردن‌و لە فەوتان‌و لەناوچوون‌و قوتار بوون!

﴿كَذَلِكَ﴾ ئا بەوشێوە روونكردنەوەی كە خودا بۆ ئێوەی روون كردەوە لەم ئایەتانەدا دەربارەی ئەو رق‌و كینەیەی جوولەكەكان بەرامبەر بە ئێوە هەیانە هەروەها ئەو شتانەی كە فەرمانتان پێ دەكاو ئەو شتانەی نەهیتان لێ دەكا هەروەها بۆ ئەو حاڵەتەی كە لەسەری بوون لە چاخی نەفامیتاندا، ئەو حاڵەتەی لەژێر سایەی ئیسلامدا بۆتان رەخساوە ﴿يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ هەر بەو شێوە ئایەتەكانی ترو بەڵگەو فەرمانەكانی دەنێرێ بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی شارەزا بكرێن‌و سات دوای سات شارەزایی كردنەكەتان پەرەبسێنێ! بۆ ئەوەی نەگەڕێنەوە سەر باروودۆخی پەرتەوازەیی‌و دژایەتی كردنی یەكتری‌و بتپەرستی‌و هاوەڵ دانان بۆ خوداو گومرایی لە عەقیدەو رەوشت‌و مامەڵەدا.

## فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ

وُجُوهٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿١٠٩﴾ ﴾.

ئەم ئایەتانە وەکوو شەرحو شیکردنەوە وەهان بۆ ئایەتی پێشوو ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ﴾ پەروەردگار لەوەپێش فەرمانی پێ کردین کە دەست بە قورئان بگرینو پابەندی ئیسلام بین، نەهی لێ کردین لەپەرتەوازە بوونو دژایەتی کردنی یەکتر.

ئەمجار رێگای دەست گرتن بە قورئانو پابەندبوونمان بە ئایین پیشان دەداو دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ پەروەردگار فەرمان دەکاو دەفەرموێ: با لەئێوە کۆمەڵێك هەبێ پسپۆڕو لێهاتوو تێکۆشەر تایبەت بن بە بانگەوازی کردنی خەڵك بۆ خێرو چاکەو فەرمان کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە، ئەوانە کۆمەڵی رزگاربووی دونیاو قیامەتن، ئاشکراشە تایبەتکردنی ئەم کۆمەڵە بەو ئەرکە نابێتە لەمپەڕو هۆی ئەوەی کە ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە ئەرکی سەرشانی هەموو کەس نەبێ! بەڵکوو فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکەو هەر کەسە لە عاست خۆیەوە دەبێ رۆڵی خۆی بگێڕێو لەم کارە پیرۆزەدا هاوبەشی بکا.

وەکوو ئیمامی موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ

الإِيمَانِ» لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: «وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ» ئەحمەدو تیرمزیو ئیبنو ماجە لە حوزەیفەی (الیمانی)یەوە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتیان کردووە: کە دەفەرموێ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلاَ يُسْتَجَابُ لَكُمْ».

بەڵێ پیاوچاکانی پێشین هیچ کاتێ ئەم ئەرکە پیرۆزەیان پاشگوێ نەخستووە، هەمیشە لە پێناو رازی کردنی خودا هیچ شتێکو لە هیچ کەس نەترساون! دەڵێن: عومەری کوڕی خەتاب لەسەر دوانگە وتاری دەداو دەیفەرموو: موسوڵمانینە! ئەگەر هەڵەو خوارییەکتان لە مندا بینی راستی بکەنەوە، یەکێك لە حوشترەوانان هەڵسایە سەرپێو وتی: ئەگەر خواریت تێدا ببینین بە شمشێر راستی دەکەینەوە.

پێویستە ئەو کەسەی ئەرکی بانگەوازی دەخاتە سەرشانی خۆی چەند مەرجێکی تێدا بێ!!

١- دەبێ شارەزایی تەواوی هەبێ لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا، ئاگاداری باشی لە ژیاننامەی پێغەمبەرو چوار جێنشینەکانیدا هەبێ.

٢- پێویستە ئەو کۆمەڵەی کە ئامۆژگارییان دەکاو وتاریان بۆ دەدا باش بیانناسێو بزانێ چییان پێ خۆشەو چییان پێ ناخۆشە، تا چ ئەندازەیەك ئامادەباشییان تێدایە بۆ وەرگرتنو پەیڕەو کردنی ئامۆژگارییەکانی.

٣- پێویستە زوبانی ئەو کەسانە بزانێ کە بانگەوازییان دەکا، دەبێ بە زاراوەی ئەوان ئاخاوتن بکا، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بە هاوەڵانی کرد کە فێری زمانی عیبری ببن، چونکە پێویستییان بە گفتو گۆکردن لەگەڵ جوولەکەدا هەبوو!

٤- پێویستە چۆنیەتی بیروباوەڕو رێبازی گەلو نەتەوەکانی تر بزانێ، بۆ ئەوەی لێیان بدوێ سەلبیاتەکانیان بخاتە ڕوو، راستیو ناراستی لێك هەڵهاوێرێ! ئیجابیاتەکانی ئایینی پیرۆز بخاتە روو، چونکە ئادەمیزاد ئەگەر هەڵەو چەوتی بیروباوەڕی خۆی بۆ دەرنەکەوێ روو ناکاتە بیروباوەڕێکی تر!

بەکورتی پێویستە ئەو کەسانەی ئەرکی دەعوەی ئیسلامیی دەخەنە سەرشانی خۆیان، کۆمەڵێکی تایبەت بن، زیرەكو زوبان رەوانو قسە لە مستو هۆشمەندو بیر

تیـژو قـسە شـیرین بـن، نهێنـی حوکمـە شـەرعییەکان بـزانن، حیکمـەتی تەشـریعو فیقهی ئیسلامی ئاگادار بن، بۆیە قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُـلِّ فِرْقَـةٍ مِّـنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾. ئەم کۆمەڵە بانگەوازیکەرە هـەوڵ بـدەن حـوکمی خـودا بـەکار بهێنـرێو بەرژەوەنـدی تایبـەتیو گـشتی خـەڵکی لەهـەموو کـاتو شـوێنێکدا بەرچـاو بگـیرێ، هـەوڵ بـدەن بـەگوێرەی زانیاری خۆیـان لـە مزگـەوتو یانـەو شـوێنە گـشتییەکانو لـەکاتی رەخـسانی هـەلو مەرجی پێویستدا حەقیقەتی ئایینی خودا بەخـەڵك بگەیـەنن، ئامۆژگـاری هـاوڵاتی خۆیـان بکـەن.. هـەر گـەلو نەتەوەیـەك ئـەم دیـاردە پـیرۆزەی تێـدا بـێ، ئـەوە کۆمەڵگایەکی بەختەوەرو دوورە شەڕو خێر ئاوەرن! دانیـشتوانی ئـەو وڵاتـە لەگـەڵ یەکتردا تەبا دەبنو هاریکاری یەکتری دەکەنو هەمیـشە ئامۆژگـاری یەکـدی دەکەنـە دابو نەریتی خۆیان.

هەر گەلو نەتەوەیەك ئەمە حاڵو چۆنیەتی بـێ، بەسـەر گەلانـدا سـەرکەوتوو دەبێ، بەیەکیـەتیو تـەبایی ئەندامـەکانی ئارەزووەکـانی دیـنو دونیایـان دەسـتەبەر دەکەن، سەروەری بەدەست دەهێنن.

کەوابێ پێویستە موسوڵمان وەکوو خاوەن نامەکان نەکـەن! ﴿وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّـذِينَ تَفَرَّقُـواْ﴾ ئـەی موسـوڵمانان! وەکـوو خـاوەن نامـەکان مـەبن ناکۆکیتـان تـێ بکـەوێو پارچـە پارچـە بـبن! ﴿وَاخْتَلَفُـواْ مِـن بَعْـدِ مَـا جَـاءهُمُ الْبَيِّنَـاتُ﴾ کێشەیان تێکـەوت بەتایبـەتی دوای ئـەوەی بەڵگـەی ئاشـکراو بـەهێزیان پـێ درا، ئەگـەر شـوێنی ئـەو بەڵگـەو نیـشانانە بکەوتنایـە دەگەیـشتنە مـراد، بـەڵام ئـەوان لـە بـەڵێنو پـەیمانی خۆیان پاشگەز بوونەوە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بانگـەوازی کـردن پشتیان هەڵکرد، وازیان لە فەرمان بە چاکەو نـەهی لەخراپـە هێنـا ﴿وَأُوْلَئِـكَ لَهُـمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ ئەوانە سزای گەورەو بە ئێشیان بۆ ئامادە کراوە، شیاوی سـزادانی بـە ئـێشو ریـسواکەرن لـە دونیـاو قیامەتـدا، لـە دونیـادا دژایـەتی نێوانیـان تونـد دەبـێ ریسواو بەدناو دەبن، لە قیامەتیشدا دەخرێنە دۆزەخەوە بۆ هەتا هەتایە! وەکوو لـە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿لُعِنَ الَّـذِينَ كَفَـرُواْ مِـن بَنِـي إِسْـرَائِيلَ عَلَـى لِـسَانِ دَاوُودَ

وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ. كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ –المائدة/٧٨ – ٧٩﴾.

ئەمە هەڕەشە کردنە لە خاوەن نامەکان‌و لە بەرامبەریشیدا مـوژدەی رزگـاری‌و سەرفرازییە بۆ خاوەن باوەڕان.

شـایانی باسـە: ئـەو ئیختیلافـەی کـە ناپەسـەندەو رەخنـەی لێ دەگـیرێ ئـەو ئیختیلافەیە؛ کە لەبنەماو لەئەصڵی ئاییندا بێ، هەواو هـەوەس بکرێتـە حـاکم بـۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی تایبەتی لەشتی گشتی‌دا.

بەڵام ئیختیلاف لە (فروع)دا واتـە: لـە لق‌و پـۆپی شـەریعەتدا، بـۆ چـوون‌و رای جیا جیا لە رێبازەکـانی شـەریعەتدا، لەچۆنیەتی ئەنجامـدانی عیبـادەت‌و چۆنیەتی مامەڵەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان...هتد ئەوە ئیختیلاف تییاندا جێگـای رەخنـە نیـە، بـەڵکوو ئـەوە نیـشانەی زینـدوویـەتی ئـەو شـەریعەتەیە چـونکە ئـەو مانـاو مەفهومانەی لە دەقە قورئانییەکان وەردەگیرێـن جیـا جیـان، کردارەکـانی پێغەمبـەر بۆ برێ شت بەچەند جۆرێك ریوایەت کراوە، فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەربارەی شتێك جاری وا هەیـە بەچـەند جۆرێـك چەسپاوەو بـە ئێمـە گەیشتووە؛ ئیتر هەرکەسـە لـە ئاکامی تێفکرین‌و لێکۆڵینـەوە لـەژێر رۆشـنایی ئـەو فەرموودانەو تێگەیشتن لێیان رێبازێکی فیقهی بۆخۆی هەڵبژاردووە.

ئەمجار لەئایەتی پێـشوودا فـەرمووی: ﴿وَأُوْلَئِـكَ لَهُـمْ عَـذَابٌ عَظِـيمٌ﴾ لەئایـەتی دواییدا کاتی ئەو سزایە دەستنیشان دەکاو دەفـەرموێ: ﴿يَـوْمَ تَبْـيَضُّ وُجُـوهٌ وَتَـسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ ئەو سزایە لـە رۆژێـك دایـە هەنـدێ دەم‌و چاو لەگەشـەو بـزەدان‌و خۆشـی‌و کامەرانییان پێوە دیارە، کەیف خۆش‌و روو گەش‌و گوشادن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَـاظِرَةٌ –القيامـة/٢٢ – ٢٣﴾. ئـەو رۆژەی ﴿وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ کە هەندێ دەم‌و چاوی تریش شەرمەزارو تـەڵخ‌و رەش دادەگیرێـن، ئەمانە ئەو کەسانەن کـە لـە بنـەمای ئاییندا نـاکۆکی‌و دووبـەرەکیان بـەرپاکردووە، ئەو خاوەن نامانەن کە لە ژیانی دونیایاندا فـەرمانیان بـە چاکەو نـەهی لـە خراپـە نەکردووە، هەروەها ئەو دوو ڕووانەی کە ژیانیان بە دووڕوویی بەسەر بردووە، ئـەو

روو ڕەشانە کە سزای بۆ ئامادەکراویان دەبینن، لەترسا ڕەنگیان ڕەش دادەگەڕێ!!
وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ، تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ – القيامة/٢٤ – ٢٥﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾ عبس/٤٠ – ٤١﴾. ئەمجار ئاکامی هەردوو کۆمەڵەکە دیاری دەکاو دەفەرموێ:
﴿فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكْفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُواْ الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ﴾
جا ئەوانەی کە روویان ڕەش دەبێ بەهۆی ئانەوەی دووبەرەکی لەبنەمای ئاییندا، لە ژیانی دونیایاندا کێشەو نیزاعیان بەرپا کردووە، پەروەردگار تانووتیان لێ دەداو لۆمەیان دەکاو پێیان دەفەرموێ: دە بچێژن! ئاری! پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد بەدرۆ دەخەنەوە؟ پێی کافر دەبن؟ دوای ئەوە لەپێشدا ئیمانتان پێ هێنا بوو، پاشگەز دەبنەوە؟ ئێوە دەتانزانی کەی پێغەمبەری ئیسلام پەیدا دەبێ، نیشانەو ڕەوشتەکانی لەکتێبی ئێوەدا روون کرابوونەوە! کەچی کە نێردراو بانگەوازی ئیسلامی دەست پێ کرد، لەبەر حەسوودی‌و دەمارگیری خۆتان، لەبەر دڵڕەقی‌و دەروون تاریکی خۆتان، پەشیمان بوونەوە دەستان کرد بە دژایەتی کردنی‌و لەمپەڕ دانان لەبەردەم پەیامەکەیدا، ئیتر پاداشتان ئەوە بێ کە سزای بە ئێشی جۆراو جۆر بچێژن! ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانی روو گەش‌و روو سپین بەهۆی ئەوەی کە لەژیانی دونیایاندا یەکیەتی‌و تەباییان بەرجەستە دەکرد، جیاوازییان لە ئاییندا نەدەکرد، ئەوانە هەتا هەتایە دەکەونە ژێر ڕەحمەتی خوداوە، لەبەهەشتا دەمێننەوە ئەوەندەیان بەلاوە خۆش‌و دڵگیرە نایانەوێ لێی دەربچن.

## تێبینی:

ئوسلوبی قورئانی پیرۆز وایە: هەرکەسێك دووبەرەکی لە ئاییندا بنێتەوە بە کافرو موشریکی حیساب دەکاو وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ – الروم/٣١ – ٣٢﴾. یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ – الأنعام/١٥٩﴾.

﴿تِلْكَ آيَاتُ اللّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ﴾ ئـەم ئایەتانـەی بەسـەرتا دەخوێندرێتـەوە ئایەتی خودان، بەسەرتا دەخوێنینەوە، حەق سەپێنن، شك‌و گومان‌و شەبهەیان تێدا نیە، ئیتر دووای پێڕاگەیاندن‌و خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە، کەس عوزری نامێنێ کە لە ئاییندا دووبەرەکی بەرپا بکاو قورئـان پاشگوێ بخـاو پابەنـدی فـەرمان‌و نـەهی‌و ئامۆژگارییەکانی نەبێ!

﴿وَمَا اللّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەوە بزانن: هەرچی خـودا فـەرمانتان پـێ دەکـاو نەهیتان لێ دەکا، ئەوە بـۆ ئەوەیـە کـە رێگـای راسـت بگرنـەبـەر، شـارەزا بـن بـۆ ئـەو شـتانەی کـە سروشـتان تـەواو دەکـا، یاسـای کۆمەڵایـەتییتان رێـك دەخـا، بـۆ ئـەوەی سـەرەڕۆ دەرنەچـن، راسـتاڵ‌و خوداپەرسـت بـن، خۆشـبەختی دونیـاو قیامـەتتان بـۆ دەستەبەر ببێ! کەوابێ ئەوانەی لەرێگای راست لایـان داوە تووشـی بـەڵاو نەهامـەتی بوون، ئەوە بۆخۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە، بەدەستی خۆیان خۆیان خستۆتە ناو ناڕەحەتیەوە، پەروەردگار هەرگیز ستەمی بۆ ئادەمیزاد ناوێ، بۆخۆی سـتەمکار نیە! ناشیەوێ کەس ستەم لە خودی خۆی‌و خەڵکانی تر بکا.

﴿وَلِلّـهِ مَـا فِـي الـسَّمَاوَاتِ وَمَـا فِـي الأَرْضِ وَإِلَـى اللّـهِ تُرْجَـعُ الأُمُـورُ﴾ چی لـە ئاسمانـەکان‌و زەویـدا هەیـە، مـوڵکی خودایـە، زاتـی پـاکی خـاوەنی بوونـەوەرو ئادەمیزادە، بەگوێرەی ویست‌و ئـیرادەی خـۆی کـارگێڕو هەڵسوڕێنەری کاروباریانـە، سوننەتی خودا هەرگیز گۆڕانکاری تێدا نیە، خودا بۆخۆی لە هیچ شتێکی کەم نیـە، تـا بـۆ قـەرەبوو کردنـەوەی ئـەو کـەم‌و کوڕییـە بیـەوێ سـتەم لـە ئـادەمیزادان بکـاو نەفسی خۆی پێ پڕ بکاتەوە، پـەروەردگار زۆر لـەوە بڵنـدترە، کـە سـتەمکاربێ، یـان سـتەمی بـوێ بـۆ بەنـدەکانی، چـونکە سـتەم لەگـەڵ حیکمـەت‌و کـەماڵی رەهـاو بـەرفراوانی زاتـی پاکیـدا ناگونجـێ! کەسـێك حیکمـەت‌و کـەماڵی هـەبێ لەیاسـاو نیظامیدا هەرگیز ستەمکاری لێ ناوەشێتەوە!

بەکورتی ئەو زوڵم‌و ستەمەی خودا لەخۆی دوور دەخاتەوە، ئـەو سـتەمەیە کـە لەگەڵ بەرژەوەندی بەندەکانی‌و رەهنومایی کردنیان بۆ دەسـتەبەرکردنی کامـەرانی دونیاو قیامەتیاندا نەگونجێ!

## هۆی باشیەتی ئۆمەتی موسوڵمانو خراپیو ریسوایی جوولەکەکان

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّا أَذًى ۖ وَإِن يُقَاتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوا إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الْمَسْكَنَةُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾.

عیکریمەو موقاتیل دەڵێن: ئایەتی (١١٠) لە شانی ئیبنو مەسعوودو ئوبەی کوڕی کەعبو موعازی کوڕی جەبەلو سالم (مەولای ئەبو حوزەیفەدا) هاتۆتە خوارێ، ئەوە بوو مالیکی کوڕی صەیفو وەهەبی کوڕی یەهوذای جوولەکە بەو هاوەڵانەیان گوت: ئایینی ئێمە لەو ئایینەی ئێوە بانگەوازی بۆ دەکەن باشترە، ئێمە خۆشمان لە ئێوە ڕێزدارترین، خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

دەربـارەی ئایـەتی (١١١)ش موقاتیـل دەڵـێ: کۆمـەڵێك جوولەکـە ئەزیـەتی عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیان دەدا چونکە موسوڵمان بـوو بـوو، ئـیتر پـەروەردگار ئـەم ئایەتەی بەو بۆنەوە نارده خوارێ.

پەیوەندی ئەم ئایەتانەش بە ئایەتەکانی پێشوو ئەوەیە ئەم ئایەتانەی ئێره بـۆ دامەزراندنی دڵی موسوڵمانانە لەسەر ئەو بیروباوەڕەی کە لـەوە پـێش فـەرمانی پـێ کردون‌و فەرمووی دەست بە قورئانەوە بگرن‌و پابەنـدی فـەرمان‌و نەهیـەکانی بـن‌و لەدەوری کۆببنەوە.

ئەمجار پـەروەردگار دوای ئـەوەی کـە فـەرمانی بـە موسـوڵمانان کـرد کـە دەست بگـرن بـە حـەبلی خـوداوە – کـە قورئانـە –و ترسـاندنی لـەوە کـە وەکـوو خـاوەن نامەکان – جوولەکەو گاور – گرۆ گرۆو پارچە پارچە بـبن، بەشـوێن ئـەوەدا باسـی گەورەیی‌و ڕێزداریی ئەوانە دەکا کە پابەندی فەرمانی خودان‌و دەفـەرموێ: ﴿كُنـتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِـالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَـوْنَ عَـنِ الْمُنكَـرِ﴾ ئێـوە ئـەی کۆمـەڵی موسوڵمانان! باشترین گەل‌و نەتەوەیەکن ئێستا هێنراونە ناو گۆڕەپانی ژیانـەوە! کـە ڕەوشتان وایە: فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە دەکەن. ﴿وَتُؤْمِنُـونَ بِاللّـهِ﴾ بـڕوای پتـەو ڕاسـتان لـە دەروونـدا هەیـە، کـە لـە شـەڕو فەسـاد دوورتـان دەخاتـەوە، بـۆلای خێرو چاکە کێشتان دەکا!

لە ئایەتەکەدا فەرمان بە چاکەو نـەهی لـە خراپـە پـێش بـڕوا بـە خـوا خـراوە، چونکە فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپە، دیاردەیەکی تایبەتی موسـوڵمانانە، بـەڵام ئیمان بە خودا پەیڕەوکەرانی ئایینەکانی تریش ئیدیعای دەکەن، هەروەها ئاماژەیـە بۆ ئەوە کە ئیمان بە خـودا – بـەبێ فـەرمان بەچاکەو نـەهی لـە خراپـە سـوودێکی ئەوتۆی نیە، کاریگەرییەکی لە کۆمەڵگادا نابێ، کۆمەڵێ موسوڵمانانیش هەتا لەگـەڵ هەبوونی بڕوا بە خودا، فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە ئەنجام بـدەن ئـەوە ئـەو چاکی‌و باشییە بۆ خۆیان پاوان دەکەن!

بە پێچەوانەوە گەل‌و نەتەوەکانی دیکە کاکڵەی بیروباوەڕیـان لێ شـێواوە، شـەڕو فەسادیان تێدا بڵاوبۆتـەوە، ئیمانیـان لەکـەی تێدایـە، فـەرمان بـە چـاکەو نـەهی لـە خراپەیان پاشگوێ خستووە!!

کە دەفەرموێ: ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ﴾ بڕوا بە خودای کردووە بە بڕوا بوون بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بەندەکان بڕوایان پێ هەبێ، یان بڕوابوونی بە هەموو شتێکی کورت هەڵهێناوە لە بڕوابوون بە خودا، چونکە کەسێك بڕوای بە هەندی لەو شتانە بێ کە پێویستە بڕوای پێیان بێ، بڕواکەی ئیعتیباری پێ نیەو بەخاوەن باوەڕ ناژمێردرێ! چونکە ئیمان دەبێ گشتیو ڕەها بێو هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە پێویستە ئیمانی پێیان هەبێ، بەڵگەش لەسەر ئەم رایە ئەوەیە کە قورئان دوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ﴾ ئەگەر خاوەن نامەکان – لەگەڵ هەبوونی ئیمان بە خودا کە ئیدیعای دەکەن – ئیمانێکی راستو دروستیان هەبوایە کە دڵو دەروونی ڕەوشەن بکردنایەوە جڵەوی نەفسیانی بکێشایە بۆ رێبازی راست. ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم﴾ ئەوە بێگومان ئەو ئیمانەیان باش دەبوو سوودیان لێ وەردەگرتو بەختەوەری دونیاو قیامەت دەبوون، ئەو مەبەستەی کە بە کەچە ئیمانەکەیان دەیانەوێ وەدەستی بێنن بە ئیمانە تەواوو راستەکەیان باشتر بۆیان دەستەبەر دەبوو؟! چونکە ئەو خاوەن نامانە ئایینی خۆیان بۆیە بەلاوە پەسەندە تاسەرۆکایەتی دەستەبەر بکەنو ڕەشە خەڵکەکە شوێنیان بکەوێ، دەی خۆ ئەگەر پەیڕەوی ئایینی ئیسلامیان بکردایەو بیروباوەڕی پێویستیان هەبوایە، کامەرانی هەردوو جیهانیان دەست دەکەوتو لە دونیاو قیامەتدا بەختەوەر دەبوون، ئەم بنەما سەرەکییانە – فەرمان بە چاکە، نەهی لە خراپە، ئیمانی تەواو بە خوا – ئیمان بە پێغەمبەرانو بە فریشەکانو نامە ئاسمانییەکانو بە رۆژی دوایی، ئەگەر دەستەبەر بوون دەبنە هۆکاری ئەو چاکیو باشییە بۆ هیچ گەلێك دەستەبەر نابن هەتا پارێزگاری ئەم بنەما سێ کوچکەیە نەکەن.

دەگێڕنەوە دەڵێن: عومەری کوڕی خەتاب لەکاتی حەجدا لە وتارێکدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ پاشان فەرمووی: هەرکەسێك دەیەوێ لەو ئوممەتە بێ بامەرجی خودا جێبەجێ بکا، واتە: فەرمان بە چاکەو نەهی لەخراپە، کەسێك ئەو مەرجە بەجێ نەهێنێ ئەوە وەکوو خاوەن نامەکان وایە، شیاوی لۆمەکردنی پەروەردگارە: کە دەرحەق بە خاوەن نامەکان دەفەرموێ: ﴿كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ–المائدة/٧٩﴾.

هەر بۆیە پەروەردگار کە مەدحی ئۆمەتی ئیسلامی کردو رەوشتەکانی باس کردن، هاتە سەر لۆمەکردنی خاوەن نامەکان‌و رەخنە لێ گرتنیان‌و فەرمووی: ئەگەر ئیمانیان بەو کتێبە بێنایە کە بۆ موحەممەد نێردراوە، پابەندی پەیامەکەی بوونایە ئەوە بۆ ئەوان باشتر بوو! بەڵام ئەو ئیمانەی پێویست بوو ئەوان نەیانبوو، چونکە ئەوان بڕوایان بەبڕێ لەنامە ئاسمانییەکان هەبوو، بڕوایان بە بڕێکیان نەبوو، هەروەها بڕوایان بەهەندێ پێغەمبەری وەکوو مووساو عیسا هەیەو بڕوایان بە هەندێکی تری وەکوو پێغەمبەری ئیسلام نیە! هەرچەندە کتێبەکانیان مۆژدەی هاتنی موحەممەدو رەوشتەکانی ئەویان لەخۆ گرتووە، کەچی موحەممەد نێردراو بانگەوازی ئیسلامی دەست پێ کرد ئەوان لە بەڵێنی خۆیان ژێوان بوونەوە.....

جا وەنەبێ ئەم لۆمەکردن‌و رەخنە گرتنە هەموو خاوەن نامەکان بگرێتەوە، زەم کردنەکە رووبەڕووی هەموانیان ببێتەوەو گشتی‌و سەرانسەری بێ، بۆیە دوابەدوای لۆمەکردنەکە بڕێ خاوەن نامەی لەو حوکمە دەرهاویشتن فەرمووی: ﴿مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانە هەنێکیان بیروباوەڕی رێك‌و پێکیان هەیە وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی سەلام‌و هاوەڵانی، نەجاشی‌و دارو دەستەکەی، کە ئەمانە بیروباوەڕی پتەویان بە پێغەمبەری ئیسلام هێناوەو لە مێژووی ئیسلامدا رۆڵی پیرۆزیان گێڕاوە.. بەڵام زۆربەی ئەو خاوەن نامانە فاسق‌و لە سنووری ئایینی خۆیان دەرچوون کەمیان بڕوای بە خوداو ئەو پەیامەی نێردراوە بۆ ئێوەو ئەو پەیامەی نێردراوە بۆ ئەوان! زۆربەیان لەسەر گومڕایی‌و کوفرو بێ دینین‌و لە خودا یاخی بوون. بۆیە فەرمووی: ﴿وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ زۆربەی ئەو خاوەن نامانە بێدین‌و گومڕاو لەخودا هەڵگەڕاوەن‌و چوونە باوەشی کوفرەوە!

هەموو ئایینێك سێ جۆر پەیڕەوکەری تێدان: رۆچوو، زێدەڕەو (متطرف) لە ئاییندا میانڕەو مامناوەندی، هەڵگەڕاوەو سەرپێچیکەر، هەموو ئایینێکیش لەسەرەتاوە پەیڕەوکەرو لایەنگری زۆری دەبن، کە ماوەی زۆری بەسەردا تێپەڕی‌و کۆن بوو پەیڕەوکەری کەم دەبنەوە، زۆربەی زۆری ئەو گەلە لە ئایینەکە هەڵدەگەڕێنەوەو دڵڕەش‌و بێ بڕوا دەبن، وەکوو پەروەردگار لە ئایەتێکدا ئاماژە بۆ ئەم راستیە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا

نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ- الحديد/١٦﴾. بەلام ئەم دیاردەیە لە ئایینی ئیسلامدا نابیندریّو هەرگیز ئەو لاوازییەی بەسەردا نایەو، سەرکەوتنو سەروەریو بالادەستی لەدوارۆژدا هەر بۆ ئەوە، چونکە ئایینێکی گشتیو جیهانییە، هەتا رۆژی قیامەت شیاوی هەموو کاتو شوێنێکەو هەمیشە زیندوویی تێدایە!

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە هیچ کاتێك قورئان ئەوە ناسەپێنێ بەسەر گەلێکدا کە سەد دەر سەد گومڕابن؛ بەڵکوو دەفەرموێ زۆربە، یان زۆرینەیان گومڕابوون، وەکوو دەربارەی بەنو ئیسرائیل دەفەرموێ: ﴿فَلاَ يُؤْمِنُونَ إِلاَّ قَلِيلاً – النساء/٤٦﴾. جارێکی تر دەربارەی گاورو جوولەکەکان دەفەرموێ: ﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَاء مَا يَعْمَلُونَ – المائدة/٦٦﴾.

بەکورتی قورئان کە بیەوێ وەصفی گەلو نەتەوەیەك بکاو بیروباوەڕیان روون بکاتەوە، زۆر بە وردیو بە تەرازوویەکی وردخوێنو بێ زیادەڕۆییو ئەملاو ئەولا هەڵوێستو حاڵو چۆنیەتییان سنووردار دەکا، بە جۆرێك کە ئەو ئوسلووبە لە هیچ کتێبو نووسراوێکی تردا بەرچاو ناکەوێ! تەنانەت ئەو حوکمو باسو چیرۆکانەی کە لەخاوەن نامەکانەوە گێڕاویەتیەوە، ئەگەر بۆ زاناو فەیلەسوفو مێژووزانەکانیان بخوێندرێتەوە، یەکسەر شایەتی حەقو راستی دەدەن!

جا کە لەئایەتی پێشوودا کۆمەڵی خودا نەناسی بەزۆرینە لەقەڵەم دان، وێ دەچێ ترسو بیمێك لەو زۆرینەیان بکەوێتە دڵو دەروونی موسوڵمانانەوە! بۆیە خێرا ئەو ترسەی رەواندەوەو فەرمووی: ﴿لَن يَضُرُّوكُمْ إِلاَّ أَذًى﴾ ئەو خودانەناسانە ناتوانن فرسەتتان لێ بێننو زیانتان پێ بگەیەننو قەلاچۆتان بکەن، مەگەر لێرەو لەوێ جنێوێك بدەن، تانەیەك لە ئاینەکەتان بدەن، هەڕەشەیەکتان لێ بکەن، شوبهەیەك فڕێ بدەنە ناو بیروباوەڕتانەوە، قسەیەك بەدەم یەکێکەوە هەڵبەستن، ئەگینا لەوە زیاتریان لەدەست نایە!

﴿وَإِن يُقَاتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الأَدُبَارَ﴾ خۆ ئەگەر بەزۆری خۆیان بنازنو شەڕتان لەگەڵدا بکەن ناتوانن بەرەو رووتان بوەستن، بەڵکوو بەبێ ئەوەی بتوانن زیانتان

پێ بگەیەنن پشتان تێ دەکەن‌و دەقوچێنن‌و گۆڕەپانی جەنگ جێ دێڵن ﴿ثُمَّ لاَ يُنصَرُونَ﴾ پاشانیش یارمەتی نادرێن‌و هەرگیز بەسەر ئێوەدا سەرکەوتوو نابن، بەمەرجێك ئەوان لەسەر گومڕاییی‌و فاسقی خۆیان بەردەوام بن‌و ئێوەش لەسەر چاکی‌و خێرخوازی خۆتان بن؛ واتە: فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بکەن‌و بڕوای پتەوو دامەزراوتان هەبێ.

ئایەتەکە سێ مزگێنی تێدان، کە بە هەواڵی غەیبی دەژمێردرێن تا ئێستا هاتوونە دی، ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئەم حوکم‌و سەرکەوتن‌و باڵادەستییە کاتێك بۆ موسوڵمانەکان دەستەبەر دەبێ کە خۆیان پابەندی ئایین‌و پەیامی خوداین‌و پارێزگاری ئایینەکەیان بکەن! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ - محمد/٧﴾. یان دەربارەی تێکۆشەرانی موسوڵمانان‌و گیان لەسەر دەستان دەفەرموێ: ﴿الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللّهِ—التوبة/١١٢﴾. هەتا موسوڵمانان فەرمان بە چاکەو نەهی لەخراپە بکەن‌و پارێزگاری سنووری خودا بکەن، سەرکەوتن‌و باڵادەستی دەستەبەر دەکەن، هەرکاتێ موسوڵمانان سەرکەوتوو نەبوون، ئەوە دیارە خەلەلەکە لە خۆیاندایەو پێویستە بە خۆیاندا بچنەوە!

﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُواْ﴾ ئەو خاوەن نامانە (ئەهلی کیتاب) زەلیلی‌و ژێر دەستەیی بووەتە مۆرك‌و بەناوچاوانیانەوە نراوەو ناتوانن خۆی لێ ڕزگار بکەن، لەهەر شوێنێك بن ئەوان دزێوو ڤیز لێ کراوو بەش خوراون، ﴿إِلاَّ بِحَبْلٍ مِّنْ اللّهِ﴾ مەگەر بەهۆی ئەو عەهدو پەیمانەی کە خودا لە شەریعەتی ئیسلامدا بۆی دیاری کردوون، فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە کە لە چوارچێوەی ئەو یاسایەدا هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا بکەن‌و مافیان بپارێزن ﴿وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ﴾ هەروەها ئەو عەهدو پەیمانەی ئادەمیزادان لەگەڵیاندا پەیڕەو دەکەن، کە هاوبەشی ژیان‌و جیرانەتی‌و هاوەڵی دەسەپێنێ، لەوەدا کەئێمە پێویستمان بە ئەوان هەیەو ئەوانیش پێویستیان بە ئێمە هەیە، وەکوو پێویستی بازرگانی‌و پیشەسازی...هتد هەروەها وەکوو ئەو

پارێزگارییە بەردەوامە تۆکمەیەی کە ئێستا بۆ جوولەکەی فەلەستین دابین کراوە لەلایەن ئەمریکاو خۆرئاواو حکومەتە زلهێزو ملهورەکانی جیهانەوە!!

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە ژیانی خۆیدا زۆر بە جوانی رەفتاری لەگەڵ ئەو خاوەن نامانە دەکرد، مامەڵەو قەرزو قوڵەی لەگەڵ دەکردن، چەند جار شتو مەکی لێ کڕیون، چەند جار قەرزی لێ کردوون لە دوای لە دوونیا دەرچوونیشی جێنشینەکانی یەك لەدوای یەك هەمان رەفتارو هەڵسو کەوتی پێغەمبەریان لەگەڵدا کردوون! بەکورتی ئەو جوولەکانە لە زاتی خۆیاندا هیچ رێزێکی مرۆڤایەتیو دەسەڵاتو خاوەنداریەتییان تێدا نیە، ئەگە رێزێکیان هەبێو دەسەڵاتێکیان بدرێتێ ئەوە بەهۆی کەسانی دیکەوە پێیان دەدرێو زاتی نیە، بەهۆی ئەو پەیمانەوەیە کە خودا بۆی چەسپاندوونو فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە کە بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام مافیان بپارێزن، هەروەها بەهۆی ئەو پەیمانەی کە موسوڵمانان لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە باریان پێوە گرتووە، ﴿وَبَآؤُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللّهِ﴾ شیاوی سزای سەختو غەزەبی خودا بوون، جێگای ئەوەن کە لێیان نارازی بێ، لە هەموو لایەکەوە زەلیلیو ژێردەستەیی دەورەی داون، هیچ کاتی رابەرایەتییان دەست ناکەوێ، هەمیشە شوێنکەوتووی خەڵكو نۆکەرو جاشی ملهورانی خودانەناسن! ئەم پێناسەیە پڕاوپڕی رەوشتی جوولەکەیە، لە هەموو کونو قوژبنێکی زەویدا، ئێستاکە لە فەلەستیندا بوونە رەبیەو جاسووسی کوفری عالەمیو داروەستەی ئیستیعمارو هەموو جیهانی کوفرو بێدینی یارمەتییان دەداو، موسوڵمانیش وازیان لەبەرنامەی خۆیان هێناوە، بۆیە حاڵ بە پێچەوانەوە سوڕاوە ئەگینا هەرگیز نەیان دەتوانی فەلەستین داگیر بکەنو موسوڵمانان لە زێدی خۆیان وەدەرنێن! زۆربەی جوولەکە بەسەر زەویدا بڵاوبوونەوە، وازیان لە نەخشەو پیلانی جەنگ هێناوە، کشتو کاڵو ئاژەڵداریو ئەو جۆرە شتانەیان پاشگوێ خستووە، خەریکی کۆکردنەوەی ماڵو دارایین لە ئاسانترین رێگەوە کە ئەویش مامەڵە کردنی ریبا ئامێزە!

﴿ذَلِكَ﴾ ئەوەی باسکرا لە ژێردەستەییو چەوساندنەوەیانو غەزەبی خودا لەسەریان ﴿ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ وَيَقْتُلُونَ الأَنبِيَاء بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ بەهۆی

ئەوەوەیە کە کافرو بێ باوەڕان، باوەڕی ڕاستییان نیە، بەبێ تاوانو بەئەنقەست پێغەمبەرانیان بە جۆرەها شێوەی دڕندەیی کوشتووە! مێژوویان پڕ کردووە لە کارەساتی ناڕەواو نامرۆڤانە ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو کافر بوونو دەستدرێژی کردنەیان ﴿بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ﴾ بەهۆی یاخی بوونو ڕۆچوونو زیادەڕەوی لە ئەنجامدانی گوناهی بچووك کە ڕێخۆشکەرە بۆ گوناهی گەورە، چونکە هەرکەسێك گوناهی بچووك بکات بە عادەتو پەیڕەوی بکا سەری پێ دەکێشێ بۆ کافربوونو کوشتنی پێغەمبەرانو بانگەوازیکەران!

جا هەرچەندە کوشتنی پێغەمبەران لەلایەن ئەو جوولەکانەوە نەبووە کە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان لە ژیاندا بوون، بەڵکوو باوكو باپیرو پێشینەکانیان ئەو تاوانانەیان ئەنجام داوە، بەڵام چونکە ئەمانیش دەست خۆشییان لە کردەوەکانیان کردووەو بەباشیان زانیوەو پێی ڕازین! لەبەرئەوە کردەوەی باوكو باپیرانیان پاڵ ئەمان داوە، چونکە ئەو هەڵوێستە نامرۆڤانەیان لێ بووەتە ڕەوشتو بەشێك لە سروشتیان، بەمیرات چین لەدوای چین لەیەکتریان وەرگرتووە، لەلایەکی ترەوە هەموو گەلو نەتەوەیەك لەناو خۆیاندا هاریکارو هاوکارن، ئیتر داب و نەریتێك تێیاندا بڵاوببێتەوە پاڵ هەموویان دەدرێ.

## باسی کۆمەڵێ لەخاوەن باوەڕانی ئەهلی کیتابو پاداشی کردەوەکانیان

﴿ ۞ لَيْسُواْ سَوَآءً مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ

فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَلَن يُكۡفَرُوهُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا وەصفی خاوەن نامەکانی بەو رەوشتە ناشیرینانە کردو، هەڵوێستو کردەوەو پاداشی شیاوی دیاری کردن، برێکی لێ دەرهاویشتنو جیای کردنەوەو فەرمووی: ﴿لَيۡسُواْ سَوَآءٗ﴾ خاوەن نامەکان هەموویان لەم رەوشتانەدا یەکسان نین، بەڵکوو هەندێکیان موسوڵمانو خوداناسو رەوشت بەرزن، زۆربەشیان فاسقو لە خودا یاخیو کافرن!

ئیتر لەم ئایەتانەی دوایدا وەصفی ئەو خودا نەناسانەی خاوەن نامەکان دەکاو هەشت رەوشتیان دەستنیشان دەکاو دەفەرموێ:

١- ﴿مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ﴾ لەناو خاوەن نامەکاندا کۆمەڵێك هەیە راستاڵو دامەزراو لەسەر حەق، دادپەروەرو حەقخواز، ستەم لەکەس ناکەنو پێچەوانەی فەرمانی ئایین ناجوڵێنەوە، مەبەست بەم کۆمەڵە – وەکوو ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە – ئەو کۆمەڵە جوولەکانەن کە موسوڵمان بوون وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی سەلامو سەعلەبەی کوڕی سەعنە (یان سەعیە)و ئوسەیدی کوڕی عوبەیدو هاوەڵانیان.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئایینی خودا لەسەر زوبانی هەموو پێغەمبەران یەك ئایینە، یەك مەبەستە، هەرکەسێك بە بڕواوە وەری بگرێو راستاڵانە کاری پێ بکاو فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەبکا ئەوە لە کۆمەڵی صاڵحانە! هەروەها ئایەتەکە تەماع خستنە بەر ئەهلی کیتابیشی تێدایەو دادوەری پەروەردگاریشی لەخۆ گرتووە، بەڵگە هێنانەوەشی تێدایە بۆ ئەوانەی کە مانای ئیمانو ئیخلاص دەزانن! چونکە ئەگەر ئەم دەقە نەبوایە دەیانتوانی بڵێن: ئەگەر ئەم قورئانە لە خوداوە بهاتایە ئێمەی خاوەن بڕواو فاسقەکانی بەیەك چاو سەیر نەدەکرد؟؟

٢ ـ ﴿يَتْلُونَ آيَاتِ اللّهِ آنَاء اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ شەوانە قورئان دەخوێننو خەریکی شەو نوێژو خوداپەرستین.

٣ـ ﴿يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ بیروباوەڕێکی پتەوو راستیان بە خوداو رۆژی قیامەت هەیە، بە جۆرێك کە کاریگەریی ئەو ئیمانە تۆکمەو پتەوە، ترس لە خوداو خۆ ئامادەکردن بۆ رۆژی قیامەتی تێدا رسکاندوون! نەك ئیمانێك کەهەر ئیدیعاو ناوبێ، بوونو نەبوونی یەکسان بێ، وەکوو ئیمانی جوولەکەکان کە دەڵێن: بڕوامان بە خودا هەیە کەچی دەشڵێن: عوزەیر کوڕی خودایە! بڕوایان بە رۆژی قیامەت هەیە بەڵام بەلایانەوە رۆژی قیامەت بەشێوەیەکی جیا لەو شێوەیە کە قورئان باسی دەکا!

٤ـ ﴿وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ ئەوانە زیاد لەوەش، قورئان خوێنو نوێژکەرنو ئیمانی پتەویان بە خوداو رۆژی قیامەت هەیە، فەرمان بە چاکەو نەهی لەخراپە دەکەن، دەیانەوێو هەوڵ دەدەن وەکوو ئەوەی بۆخۆیان باشن بۆ خەڵکی تریش باش بن!

٥ـ ﴿وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ ئیشی باش دەکەن، لەش سووكو چوستو چاپوکن بۆ ئەنجامدانی کاری خێر، هەرکارێکیان بەلاوە باش بێ پێشبڕکێی تێدا دەکەنو تەمبەڵی ناکەن؛ چونکە تەمبەڵی کردن لەکاری خێردا نیشانەی دووڕووەکانە؛ وەکوو خودا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى يُرَآؤُونَ النَّاسَ﴾ ئەو دوو ڕووانە کە هەڵدەستن بۆ نوێژ کردن بەتەمبەڵی دەجوڵێنەوەو بۆ ریبابازی نوێژەکانیان دەکەن! ئەم صیفەتە – پێشبڕکێ کردن بۆ کاری خێر – سەرچاوەی هەموو رێزداریەکی ئایینی رەوشتییە، هەموو کارێکی باش کۆدەکاتەوە، باسکردنی لێرەدا تانووت دانە لە جوولەکەکان، چونکە ئەوان بۆ کاری خێرو ئیشی چاکە تەمبەڵو لەش گرانن!

٦ـ ﴿وَأُوْلَئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ ئەوانەی کە ئەو رەوشتە بەرزانەیان هەیە لەو کەسانەن حاڵیان باشە، کردەوەیان چاکە، خودایان لێ رازییە، کۆتایی هێنانی

ئایەتەکە بەم رستەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو جوولەکانەیە کە دەیانگوت: بەس شەقاوەو پیاو خراپەکانمان بڕوایان بە موحەممەد هێناوە، ئەگەر ئەوانە باش بوونایە دەستیان لەئایینی باوك‌و باپیری خۆیان هەڵنەدەگرت. لەلایەکی ترەوە وەصفدار کردنی ئەو کۆمەڵەی ئیمانیان هێناوە، بە (صەلاح) ئەوپەڕی پێدا هەڵدان‌و ڕێزلێنانە بۆیان، چونکە صیفەتی (صەلاح) پەروەردگار لە قورئاندا بۆ پێغەمبەرە پایەبەرزەکانی چەسپاندووە، ئەوەتا دەربارەی ئیسماعیل‌و ئیدریس‌و ذیلکیفل دەفەرموێ: ﴿وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ – الأنبياء/٨٦﴾. حەزرەتی سولەیمانیش کە لەخودا پاڕایەوە دەڵێ: ﴿وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ – النمل/١٩﴾. صالح بوون پلەو پایەیەکی گەڵێ مەزنەو پێچەوانەی فەسادە، فەسادیش لەهەر شتێکدابێ لەناوی دەبا هەر بیرو باوەڕێك، هەر کردەوەیەك فەسادی تێدابێ سوودی نابێ، ﴿وَمَا يَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوْهُ﴾ ئەو خاوەن نامانەی موسوڵمان بوون‌و بەڕاستی بڕوایان هێناوە، هەر کردەوەو خودا پەرستییەك بکەن لە پاداشتی باش بێبەش نابن، پاداشی کەس فەرامۆش ناکرێ؛ چونکە ﴿وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ﴾ خودا ئاگادارو زانایە بەهەڵوێستی تەقواکاران‌و خودا پەرستان، هەموو کەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشی دەدرێتەوە، هەرکەسێك بیروباوەڕی صەحیح بێ‌و تەقوای خودا بکا بەموراد دەگا!

ئەم رستەیەی کۆتایی ئایەتەکە وەکوو بەڵگە وایە، بۆ مانای پێش خۆی، چونکە کەسێك کە پاداشی کەسێك پێشێل بکا یا لەبەر لەبیرچوونەوەیە، یان لەبەر نەزانین، یان لەبەر بەخیلی‌و حەسوودییە ئەمانەش هەموویان دەرحەق بەزاتی پاکی خودای تاك‌و تەنیا مەحاڵە.

## ڕۆژی قیامەت کافرەکان مایە پووچن‌و کردەوەکانیان بێ سوودن!

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۚ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا

يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٧﴾

ئەمجار دێتە سەر باس‌و حاڵو چۆنیەتی کافرەکانی ئەهلی کیتاب‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کافرن‌و وەکوو پێویست خودا ناناسن لەخاوەن نامەکان‌و موشریکەکانی مەکەو خەڵکی تریش لەو گروپانەی کە رەخنەیان لە پێغەمبەر دەگرت‌و تانووتیان لەخۆی‌و هاوەڵانی دەداو دەیانگوت: ئەگەر موحەممەد لەسەر حەق بوایەو خۆشەویستی خودا بوایە، خودا ئاوا هەژارو نەبوونی نەدەکردو بەم شێوە بەبێ کوڕو بەهەژاری نەیدەهێشتەوە! هەمیشە ئەو کافرانە خۆیان بەهۆی دەوڵەمەندی‌و منداڵی زۆرەوە هەڵدەنایەوەو لەخۆیان بایی بوو بوون‌و، پێیان وابوو زۆریی ماڵو دارایی کوڕو نەوەی زۆر لەسزای خودا دەیانپارێزێ! وەکوو پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا لەسەر زوبانی ئەوان دەفەرموێ: ﴿...نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ ئیتر پەروەردگار بۆ رەتکردنەوەی ئەم بۆچوونە هەڵانەیان فەرمووی: ﴿لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُم مِّنَ اللّهِ شَيْئًا﴾ ئەو ماڵو منداڵەی ئەوان پێی دەنازن‌و پێیان وایە: لەڕۆژی قیامەتدا لەئاگری دۆزەخ دەیانپارێزن، هیچ سوودیان پێ نابەخشن‌و فریایان ناکەون‌و لەسزای ئاگر رزگاریان ناکەن!

بۆیەش تەنها باسی (ئەموال‌و ئەولاد)ی کرد چونکە ئەم دوو نیعمەتە لەژیانی ئینساندا گرنگن‌و ئادەمیزاد کە تەنگانەیەکی بەردێ یان بە ماڵو دارایی لەکۆڵ خۆی دەکاتەوە یان پەنا دەباتە بەر منداڵو نەوەی خۆی، کەسێك لە لەزەت‌و خۆشی ئەم دوو نیعمەتەدا بێ ئیتر لەدونیادا هیچی تری وەبیر نایەتەوەو کەم وادەبێ روو لەحەق‌و راستی بکا! بۆیە دەبینین زۆر کەس بە ماڵی زۆرو منداڵو نەوەی زۆر

لەخۆ بایی دەبێ‌و تا سەری لەبەرد نەدا وەهۆش خۆی نایەتەوە ﴿وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانە دارو دەستەی دۆزەخن‌و دەخرێنە ناو ئاگرەوەو هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، چونکە دڵ رەشی‌و خراپەکاری‌و چەواشەکارییان لەژیانی دونیایاندا بەجۆرێك بووە کە شیاوی ئەو سزایەبن کە سووتەمەنییەکەی ئامادەمیزادو بەردە!! دوای ئەوەی کە پەروەردگار لەئایەتی پێشوودا ئەوەی روونکردەوە کە ماڵ‌و منداڵی ئەو کافرانە هیچ سوودێکیان بۆیان نابێ. باسی ئەوە دەکا کە ئەو ماڵ‌و داراییەی لەخۆش رابواردن‌و بۆ ریابازی‌و باسکردنی خەڵك‌و ناوبانگ پەیداکردن‌و پشتیوان پەیداکردندا دەیبەخشن‌و بەهیوای خێرو چاکەن، جێگای هیچیان بۆ ناگرێ، دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُنفِقُونَ فِي هِذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُواْ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ﴾ ئەو ماڵ‌و داراییەی دەیبەخشن بۆ ناوو شۆرەت‌و ریابازیی‌و پشت گرتن، ئەوە هیچ سوودێکی لێ نابینن‌و وەکوو زریان‌و رەشەبایەکی بەهێز وایە، کە سەرمایەکی زۆری پێوەبێ‌و لەکشتوکاڵی قەومێك بدا کە ستەمیان کردووە لەناوی بەرێ!

پوختەی قسەکە ئەوەیە دەڵێ: چۆنیەتی حاڵی ئەوانەی کافرن‌و ماڵ دەبەخشن، هەرچەندە بۆ کاری خێریش بێ وەکوو کشتوکاڵێك وایە کە زریانێکی سارد لێی بداو لەناوی بەرێ‌و بەروبوومی لێ پەیدا نەبێ!! ئەوانەش ئاوا هیچ سوودو قازانجێك لەبەخشینەکەیان ناکەن واتە: وەکوو چۆن خاوەن کشتوکاڵە سەرما بردووەکان هیچ سوودێك لەو کشتوکاڵە ناکەن، ئەو خودا نەناسانەش کە ماڵ‌و داراییی خۆیان دەبەخشن بۆ قەڵا دروستکردن‌و پرد رابەستن‌و رێگا خۆشکردن‌و یارمەتیدانی هەتیوو بێوەژن‌و هەژارو بێ نەوایان.. هتد بەهیوای پاداشی باش هیچ پاداشێکیان وەگیر ناکەوێ، رۆژیی قیامەت دەبینن کوفرەکەیان کردارە باشەکانیانی پووچ کردۆتەوە، خەسارەتمەند بوون، جگە لەپەشیمانی‌و پەنجە گەستن هیچیان بۆ نامێنێتەوە! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُورًا – الفرقان/٢٣﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاء حَتَّى إِذَا جَاءهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا – النور/٣٩﴾. ئەم

ئایەتانە پەندو ئامۆژگارین‌و ئاوێنەی باڵا نومـان بـۆ نائومێـدی کافرەکـان لـەڕۆژیی قیامەتدا، دەشگونجێ نموونـە هێنانـەوە بێ بـۆ ناهومێـدی دونیایـان. ﴿وَمَـا ظَلَمَهُـمُ اللَّهُ﴾ خـودا سـتەمی لێ نـەکردوون بـەوەی کەسـوودیان لەبەخـشینەکانیان نـەبینی‌و بەخشینەکانی لێ وەرنەگرتوون. پاداشی کردەوە خراپەکانیانی بەسزا دانەوە ﴿وَلَكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکوو بۆ خۆیان زوڵمیان لەخۆیان کرد کەماڵ‌و دارایی خۆیانیـان لەڕێگەیەکەوە بەخشی کەسـوود بـەخش نـەبێ، بۆخۆیـان تووشـی نائومێـدی‌و زیـان ببن!

دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی دانیشتوانی مەکە یان جوولەکەکان هاتۆتـە خـوارێ کەماڵی خۆیان دەبەخشی بۆ دژایەتیکردنی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ)! هەندێکیش دەڵێن: دەربـارەی ئـەو مـاڵ بەخـشینەی دوو رووەکـان نـازڵ بـووە کـەبۆ ریبابازی‌و ناوو شـۆرەت ماڵیـان دەبەخـشی، بـرێکیش دەڵـێن: ئایەتەکـە هـەموو ئـەو کەسـانە دەگرێتـەوە کـە خـودا نەناسـن‌و مـاڵ‌و دارایـی خۆیـان لەڕێگـەی باشـدا دەبەخشن‌و بەهیوای خێر، بەڵام خێریان وەگیر نابێ؛ چونکە مەرجی پاداش بۆ ئەو کردەوانە ئەوەیە: دەبێ کابرا بڕواداربێ‌و بەگوێرەی یاسای یەزدانی‌و بۆ رەزامەنـدی خودا مـاڵ ببەخـشن کـەوابێ ئـەوان سـتەمیان لـەخۆیان کـردووە بـەوە کـە ئینکـاری خودایان کردووە، گوێیان بۆ بەڵگەو ئامۆژگاریی ئایینی حەق نەگرتووە!

### نابێ بتمانە بەکافران بکرێ‌و نابێ بهێڵدرێ بەسەر نهێنی موسوڵماناندا ئاگاداربن

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ۖ إِن كُنتُمْ

تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾﴾.

ئیبنو جەریری طەبەریو ئیبنو ئیسحاق لە ئیبنو عەبباسەوە: دەڵێ کۆمەڵێك لە پیاوانی موسوڵمان پەیوەندییان بەچەند جوولەکەیەکەوە هەبوو، چونکە لەپێش موسوڵمان بوونیاندا جیرانی یەکتر بوون، یان هاوپەیمانی یەکتریو سوێندخۆری یەکتر بوون، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ﴾ ئەی ئەوانەی موسوڵمان بوونو باوەڕتان هێناوە؛ هەرگیز دوژمنانتان بەسەر نهێنی خۆتاندا ئاگادار مەکەن، نەچن دۆستایەتی لەگەڵ خودا نەناساندا بگرنو چی پلانو نهێنی موسوڵمانان هەیە پێیان رابگەیەنن! چونکە ئەوان دۆستی ئێوە نین خۆشبەختیو سەربەرزی ئێوەیان ناوێ، ئەوانە هەمیشە لەسەنگەردان بۆ ئێوە!

١- ﴿لاَ يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً﴾ کەمتەرخەمی ناکەن لەزیان پێگەیاندنتان، ئەوەندەی بتوانن هەوڵ دەدەن کاروبارتان بشێوێنن!

٢- ﴿وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ﴾ ئاواتەخوازی ئەوەن ئێوە تووشی ئەوپەڕی زەرەرو زیان ببن له دینو دونیادا.

٣- ﴿قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاء مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾ رق‌و کینەیان دەرحەق بەئێوە ئەوەندە زۆرە ناتوانن لەدەروونـدا بیشارنەوە، بەدەم ئاشکرای دەکەن، بێ پەردە پێغەمبەرو قورئانەکەی بەدرۆ دەخەنەوە، بە گێل‌و نەزان‌و کەم ئەزموونتان لە قەڵەم دەدەن!

٤- ﴿وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ ئەوەی بەدەم ئاشکرای دەکەن لە قین‌و ناخۆشەویستی بەرامبەرتان زۆر کەمترە لەوەی لە دڵدا شاردوویانەتەوە.

ئەم رەوشتانە لەمپەرن بۆ دۆستایەتیکردنی ناموسوڵمان‌و تێکەڵاو بوون لەگەڵیاندا، جا ئەگەر گۆڕانکاریی بەسەر ئەم رەوشتانەیاندا هات‌و فەرمانڕەوای موسوڵمان دڵنیابوو لە دۆستایەتیکردنی ناموسوڵمانان‌و متمانەی پێ کردن، دروستە هاریکارییان لەگەڵدا بکەین! داوای کۆمەکییان لێ بکەین، بڕێ نەخشەو پیلانی خۆمانیان بخەینە بەردەست، وەکوو جوولەکەکان لەسەرەتای بانگەوازیی ئیسلامییدا دوژمنی بابە کوشتەی موسوڵمان بوون، کەچی دوایی بۆ رزگارکردنی ئەندەلووس رۆڵی پیاوانەیان گێڕا، یان قیبطییەکان لەرزگارکردنی میصرو رۆمدا رۆڵی مەردانەیان هەبوو، ئەگەر لەزیانی ئەو ناموسوڵمانانە ئەمین بووین دۆستایەتیکردنیان‌و تێکەڵاوبوون‌و هاموشۆکردنیان رەوایە، بەڵکوو ئەوکاتە دروستە لە ئیدارەی دەوڵەتیشدا دابمەزرێن؛ ئەوەتا عومەری کوڕی خەتاب (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) کاربەدەستانی رۆمی لە دیوانەکانی حکوومەتی ئیسلامییدا دامەزراند! دوای ئەویش جێنشینەکانی موسوڵمانان هەر لەسەر ئەم داب‌و نەریتە رۆیشتن، هەتا سەردەمی عەبدولەلیکی کوڕی مەروان کە دیوانەکانی لە زاراوەی رۆمییەوە وەرگێڕانە سەر زوبانی عەرەبی، واتە: شێوەی نووسینی لیستەکانی دەوڵەتی گۆڕین بۆ زوبانی عەرەبی...

خەلیفەی عەبباسییەکان‌و فەرمانڕەوای موسوڵمانان لەهەموو کون‌و قوژبنێکی وڵاتی ئیسلامدا هەر بەم شێوە زۆربەی کاروباری کارگێڕی دەوڵەتیان بەکەسانی جوولەکەو مەسیحی دەسپارد، تەنانەت لەسەردەمی خەلافەتی عوسمانییەکاندا زوربەی سەفیرو جێگری باڵیۆزخانەکانی خەلافەتی عوسمانی مەسیحی بوون، وێنەو مانای ئەم ئایەتە دوو ئایەتی ترە کە دەفەرموێ: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ﴾ تا دەگاتە ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ —

المتحنة/ ٨-٩﴾. کە زۆر بەوردی ڕێو ڕەسمی دۆستایەتیکردنو نزیک بوونەوە لە ناموسوڵمانانی بۆ ڕوون کردووینەوە.

ئەمجار قورئان دێتەوە سەر باسەکەو موسوڵمانان دەترسێنێو پێیان دەفەرموێ: ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الآيَاتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ بێگومان بۆمان ڕوون کردوونەوەو ڕێگامان پیشان داون، بەڵگەو پەندو ئامۆژگاریمان بۆ شیکردوونەوە، کە ئەگەر گوێیان بۆ ڕابگرنو، پابەندیان بن، شارەزاتان دەکەن بۆ خێرو ڕێگای ڕاستو ڕەوانتان بۆ دەستنیشان دەکەن، کەچۆن جیاوازی بخەنە نێوان دۆستو دوژمنەوە، کێ باشە بکرێتە کاربەدەستو نهێنی لەلا بدرکێندرێ، کێ بەکارنایە - ئەگەر ئێوە هەست بەو حەقیقەتانە بکەن کە دەستنیشانی دۆستو دوژمنتان بۆ دەکا!!

ئەمجار قورئان جەخت لەسەر ترساندنەکەی پێشوو بۆ موسوڵمانان دەکاتەوە کە نابێ ناموسوڵمانان بکەینە ڕازگرو شوێنی نهێنی دانانی خۆمان! بۆ ئەم مەبەستە سێ هۆکار دەچەسپێنێ، هەریەکەیان داخوازی ئەوەیە: کە خۆمان بگرینەوە لە دۆستایەتی کردنی ناموسوڵمانان لەکاتی متمانە پێ کردن پێیانو ئەوسێ هۆیانەش ئەمانەن کە ئایەتەکە دەستنیشانیان دەکاو دەفەرموێ:

١- ﴿هَاأَنتُمْ أُوْلاء تُحِبُّونَهُمْ وَلاَ يُحِبُّونَكُمْ﴾ ئێوە ئەو کافرە خودانەناسانەتان خۆش دەوێن کە ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێو لەهەموو کەس زیاتر ڕقیان لێتانە، هیچ کەمتەرخەمی ناکەن لە شێواندنی ئایینو ئابووریو دەسەڵاتو وڵاتان، ئاواتە خوازی ئەوەن تووشی ناخۆشی ببنو بەئاشکرا دژایەتیو دوژمنایەتیتان دەکەن، چاوەڕوانی ئەوەن بکەونە گێژاوێکەوەو ئەوانیش لەپشتەوە دەستان لێ بوەشێنن! دەی ئێوە چۆن تاقەو دارو دەستەی ئاواتان خۆش دەوێن؟!

٢- ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ﴾ ئێوە بڕواتان بەهەموو نامە ئاسمانییەکان هەیەو ئینکاری هیچ کتێبێکی ئاسمانی ناکەن، بڕواتان بە هەموو پێغەمبەرو ڕەوانەکراوان هەیە، کە برێ لەو نامەو پێغەمبەرانە تەوراتو ئینجیلە، مووساو عیسایە! دەی ئەوان بڕوایان بەبەشێ لە نامە ئاسمانییەکان نیە، بڕوا بەبرێ پێغەمبەر دەکەنو هەندێکی تر بە پێغەمبەر نازانن.

٢- ﴿وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ﴾ ئەگەر لە ڕێگەو بانو شوێنی کۆڕو کۆبوونەوەدا تووشی موسوڵمانان دەبن لەترسی خۆیان مەرامییتان لەبەردا دەکەنو بەزمانی لووس دڵی ترساوەوە دەڵێن: ئێمەش موسوڵمانینو بڕوامان بە ئایینی ئیسلام هەیە، ئیمانمان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد هێناوە، کە دەڕۆنەوە ماڵو لای دارو دەستەی خۆیانو دڵنیادەبن کە موسوڵمانان ئاگایان لێ نین دوژمنایەتیو ڕقو کینی خۆیان دژی ئێوە هەڵدەڕێژن! تەنانەت کار دەگاتە ئەوە کە لەبەر پەشیمانی یان لەقینان پەنجەی خۆیانتان لێ بگەزن، چونکە دەبینن موسوڵمانان بەیەکەوە کۆکن، قسەیان یەکە، نێوانیان خۆشە، خودا یارمەتییان دەدا بەجۆرێك کە دوژمنیان فرسەتیان لێ نابینیو ناچارە مەراییان لەبەردا بکا!

کەوابێ ئێوە ئەی موسوڵمانینە! لەوەدا بەهەڵەچوون کە دۆستایەتی دووڕوو کافرەکان دەکەن، ئەوان بە ئایینی بەتاڵو بڕوای پووچیانەوە بەرامبەرتان جەربەزەو سەر ڕەقن، کەچی ئێوە بە ئیمانی ڕاستو بڕوای پتەوەوە بەرامبەریان نەرمو نیانو خۆش باوەڕن.

﴿قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: بەو داخو خەفەتەوە بتلێنەوە تا لەناو دەچن، چەندێك پێتان ناخۆش بێو خەفەتی پێ بخۆن! ئەوە بزانن خودا ئایینی خۆی تەواو دەکاو سەری دەخا، گەشەی پێ دەکا، پەیڕەوکارانی زۆرو بەهێز دەکا، بەڕاستی ئەمە پەندو ئامۆژگارییە بۆ موسوڵمانان بەڵکوو وەهۆش خۆ بێنەوەو بەخۆیاندا بچنەوەو، بزانن ئەو نەهامەتیەی بەسەر شانیاندا دێ هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە لەناو خۆیاندا یەکیەتیو تەباییان نیەو لێك ترازاونو گرۆ گرۆ بوون!

﴿إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ بێگومان خودا ئاگادارەو دەزانێ دڵو دەروونتان چ حیقدو ڕقو کینەیەکی تێدایە، ئەوەی بە نهێنی لەناو خۆتاندا دژی موسوڵمانان دەیڵێن، ئەو پیلانو فرتو فێڵانەی دژیان ئەنجامی دەدەن لەخودا بزر نابێ! هەروەها ئەو خۆشەویستیو دڵنەرمیو خێرخوازییەی موسوڵمانان بەرامبەر ئێوە

هەیانە لێی گووم نابێ، پاداش و سزای کوفرو ئیمانی هەردوولاتان هەر یەکەتان بەگوێرەی خۆی چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە دەداتەوە!

ئەی خاوەن باوەڕان! ئەو خودا نەناسانە دوژمنی راستەقینەی ئێوەن چونکە ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ﴾ ئەگەر سەربەرزی و سەرکەوتوویی و سەروەرییەکتان بەدەست هێنا، وەکوو: ئەوە بەسەر دوژمندا زاڵ ببن، یان خەڵك روو بکاتە ئیسلام و پاڵتان لێ بدا یان هەرزانی و خێرو فەڕتان لەناودا بڵاوبێتەوە! ئەوان پێی ناڕەحەت دەبن غەم و خەفەت دایان دەگرێ — دەبنە پیرە ژنی دۆڕاو؟!-.

﴿وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُواْ بِهَا﴾ ئەگەر ناخۆشییەکتان بێتە پێش وەکوو تێکشکانێك لەشەڕدا، یان هاتنی بەڵایەك بەسەرتاندا، یان کەوتنەوەی دووبەرەکی و ناکۆکی لەنێوانتاندا، ئەوە ئەوان پێی کەیف خۆش دەبن و تووکەی سمێڵیان دێ.

﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾ ئەگەر ئارام بگرن لەسەر ناخۆشی زیان و خۆڕاگربن لەبەرامبەر پیلانی دوژمنانی ئایین و پابەندی فەرمانی خودابن و، هەرچی نەهیتان لێ کراوە لێی دوورە پەرێزبن کە یەکێ لەو شتانەی نەهیتان لێ کراوە دۆستایەتی کردنی خودا نەناسانە — ئەوە فرت و فێڵی ئەوان زیانتان پێ ناگەیەنێ، چونکە ئێوە پەیمانی بەندایەتی خۆتان بەرامبەر بەخودا بەجێ هێناوە، خوداش پەیمانی خودایەتی خۆی دەربارەی ئێوە ئەنجام دەدا، لەداوو نەخشەو پیلانی گڵاوی ئەوان دەتانپارێزێ! ﴿إِنَّ اللّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ بێگومان خودا ئاگادارە بەو هەڵوێست و کردەوانەی هەردوولا ئەنجامی دەدەن، دەزانێ هۆکاری کردارەکان چین و پێشەکی و ئاکام و ئامانجی کردەوەکانتان چییە.

بەکورتی خودا ئێوەی شارەزا کردووە بۆ ئەو شتانەی — ئەگەر پەیڕەوییان بکەن — لە فێڵی دوژمنان رزگارتان دەکا، پێویستە بزانن کە خودا ئاگادارە بە کردەوەی دوژمنان و دەتوانێ نەهێڵێ ویستی خۆیان لە ئێوەدا بهێننە دی!

**تێبینی**: **ئایەتی (١١٨) چوار حوکمی سەرەکی لەخۆ گرتوون**:

١- جەخت کردن لەسەر پەنا نەبردن بۆ خودا نەناسان.

٢- نەهی كردن لە موسوڵمانان لەوە كە كافرو جوولەكەو گرۆهی هەوەسباز بكەنە موستەشارو ئەمینداری خۆیان، لە گۆڕینەوەو دانوسانی راوو هەڵوێستی گرنگدا بیانكەنە نوێنەرو وتەبێژی خۆیان!

هەروەها نەهی كردن لە دامەزراندنیان لەشوێنی گرنگو حەساسی فەرمانگەی دەوڵەتدا، بەڵام دامەزراندنیان لە كاروباری ئاسایی دەوڵەتدا بە مووچە خۆرو كارگوزار لەشوێنی ناگرنگدا خراپی تێدانیە، چونكە جێنشینەكانی پێغەمبەر هەر لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتابو دوایش فەرمانڕەوای موسوڵمانان پەیڕەوی ئەم كارەیان كردووە.

٣- ئەو نەهیەی لە ئایەتەكەدایە، روودەكاتە بەكارهێنانی ناموسوڵمانان بۆ رازگریو سپاردنی كاری گرنگ پێیان!

٤- ئایەتەكە بەڵگەیە لەسەرئەوە كە شایەدی دوژمن لەسەر دوژمن وەرناگیرێ، زانایانی مەدینەو حیجاز ئەم فتوایەیان داوە، ئەبو حەنیفە دەڵێ: وەردەگیرێ.

## جەنگی ئوحودو رێكخستنی سوپای ئیسلامی

﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾ إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ

ءَالَفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾

ئەم کۆمەڵە ئایەتانەی سوورەتی (ال عمران) لە ئایەتی (١٢١ - ١٢٩) دەربارەی رووداوی جەنگی بەدرو ئوحود دەدوێن، بۆیە جێی خۆیەتی کەپێش ئەوەی بچینە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان بەسەرپێیەکەوە کورتەیەك باسی رووداوەکە بکەین.

جا وەکوو مێژوونووسان‌و توێژەرانی ژیاننامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نووسیویانە دەڵێن: جەنگی بەدر لە حەڤدەی رەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی بەرپابوو، ئەمەش پاش ئەوەی کە موسوڵمانەکان هەواڵیان پێ گەیشت کە کاروانێکی قورەیشییەکان لە شامەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەکە، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلم) هێزێکی ناردنە سەر رێگا بۆ ئەوە پێشیان پێ بگرن‌و کاروانەکە رووت بکەنەوە.

موسـوڵمانەکان ویـستیان ئـەو کـاڵاو شـتو مەکـەیان لێ بـستێنن بـە مەبەسـتی ئابلۆقــەی ئــابووری خــستنە ســەریانو بژاردنــەوەی ئــەو مــاڵو ســامانەی کــە قورەیـشییەکان لەمەککە لـە موسـوڵمانە کۆچـکەرەکانیان داگیرکردبـوو، بـەڵام ئـەبو سوفیان کە سەرکردەی کاروانەکە بوو، زووتر هەستی بە جمو‌جوڵی موسـوڵمانەکان کردبوو، ڕێگەی کاروانەکەی گۆڕیو بەکوێرە ڕێیەکدا لە قەراخی دەریاوە تێپەڕبوو، لەچـنگی موسـوڵمانەکان قوتـاربوو، پـێش ئـەوەش ئـەبو سـوفیان تەتـەرێکی بەپەلـە نـاردبوو بـۆ مەکـە بـۆ ئـەوەی فریایـان بکـەون! جـا قورەیـشییەکان هەرچـەندە کاروانەکەیان بەسەلامەتی ڕزگـاری بووبـوو، بـەڵام ئـەم ڕێ پێگرتنـەیان زۆر لەسـەر شان گران بوو، هەستیان بەوە کرد: کـە خەتـەریان لەسـەرەو موسـوڵمانەکان بـەهێز بوونو هەوڵی لەناو بردنیان دەدەن، ئەوەندەی تر ڕقو کینەیان دەربارەی هـاوەڵانی پێغەمبەر زیادی کرد، دڵیان لێ پڕ بوون، پەیوەندیان بە خێڵە عەرەبەکانـەوە کـردو زۆربــەی زۆریــان ئامادەباشــی خۆیــان پیــشاندا، لەشـکرێکیان کۆکردبـووەوە، لــە قورەیشییەکان – کەمێکیان نەبێ – هەموویان خۆیـان بـۆ شـەڕ تـەیار کردبـوو، زیـاد لەهەزار جەنگاوەریان کۆبوبووەوە، پاڵەوانو سوارچاکو شەڕکەری ئازایان تێدا بـوو، بڕیاری شەڕکردن لەگەڵ موسوڵمانەکانیان داو بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ!

لەولاشەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)و هاوەڵانی دەیانویـست هـەواڵی کاروانەکـە بـزاننو ئاگایـان لـەم لەشـکرە گەورەیـەی قـورەیش نـەبوو، کاتێـك کـە پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەر بــێ) بــەم هەواڵــەی زانــیو لــە هەڵوێــستی قورەیشییەکان حاڵی بوو، ڕاوێژی لەگـەڵ هاوەڵانیـدا کـردو بـارو دۆخەکـەی بـۆ شـی کردنەوە، چونکە ئەوان لە مەدینە بە هومێدی دەستگیر کردنی کاروانەکە دەرچـوو بوونو ئێستا وا ڕووی داستانەکە گۆڕاوە، سوپای موسـوڵمانەکان سـێ سـەدو سـیانزە کەس بوون، تەنها دوو ئەسپ سوارو حەفتا وشتریان پێ بوو، ئـەوانی تـر هـەموویان پیـادە بـوونو چـەكو سـیلاحی پێویستیـشیان پـێ نـەبوو، ئـەوان بەتـەمای گرتنـی کاروانێك بوون کە سی چل کەسی لەگەڵدا بێ؛ ئێـستە وا ڕوو بـەڕووی سـوپایەکی گەورەی قورەیش دەبنەوە، بەهـەر حـاڵ دوای ڕاوێـژو گفـتو گۆیـەکی زۆر بڕیـاری بەرەنگاربوونەوە درا!!

ئیتر موسوڵمانەکان بەرەو مەکە کەوتنە ڕێ، لە نزیک بیرێك کە هی بەدر ناوێك بوو پێك گەیشتن، دوایی ئەو شوێنە بەناوی ئەو بەدرەوە ناوبانگی دەرکرد، بڕێکیش دەڵێن: بیرەکە ناوی بەدر بووە شوێنەکە بەناوی بیرەکەوە ناوی ڕۆیشتووە، شەڕ دەستی پێکردو موسوڵمانەکان سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێناو قوڕەیشییەکان بەتەواوی تێشکان‌و بوونە پەندو عیبرەت، جەنگێکی یەکلاکەرەوە بوو، ئاکامی دواڕۆژی هەردوولای دیاری کرد، لەناو دورگەی عەرەبدا دەنگی دایەوە! قورئانی پیرۆز لە شوێنێکی تردا ڕۆژی بەدری بە (یوم الفرقان) ناو بردووەو دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – الأنفال/٤١﴾.

لەو شەڕەدا تاقمی کەم‌و خاوەن بڕوا بەسەر تاقمی زۆرو بتپەرستدا سەرکەوتن ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ لەو شەڕەدا خودا فریشتەی نارده یارمەتی موسوڵمانان، جەنگێك بوو خۆڕاگری‌و ئازایەتی موسوڵمانانی تێدا دەرکەوت. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی بەشداری تێدا کرد، لەو شەڕەدا لایەنی ئیمان‌و عەقیدەو پشت بەخودا بەستن لەکاتی لێك ڕاکێشان‌و تێکڕژاندا دەرکەوت. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەماوەیەکی کەم پێش دەست پێکردنی جەنگەکە کەوتە پاڕانەوەو دوعا کردن‌و دەیفەرموو: خودایە! ئەوەی بەڵێنت پێداوم بۆم بهێنە دی، خودایە! داواکاری یارمەتی تۆین! هەردوو دەستی بەرز کردبووەوە بۆ ئاسمان بەجۆرێك کە ڕیداکەی سەرشانی کەوتە خوارێ، ئەبوبەکر هەڵیگرتەوەو خستیەوە سەرشانی موبارەکی‌و لەدواوەی وەستا! تەنانەت پاڕانەوەکەی پێغەمبەر ئەوەندە بەکوڵ‌و بەسۆز بوو، ئەبوبەکر بەزەیی پێداهاتەوە ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ – الأنفال/٩﴾.

ئیتر قوڕەیشییەکان بەم تێکشکانەو ئابڕوچوونەیان لەجەنگی بەدردا ئەوەندەی تر شێتگیر بوون‌و ڕقیان هەڵسا! ئەبو سوفیان سەرۆکی قوڕەیشییەکان، زیاتر پەرەی بە دژایەتیکردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی دا، لێبڕا بۆ هەڵنان‌و تەیارکردنی خەڵك بۆ

تۆڵە سەندنەوە لە موسوڵمانان، ماڵو داراییەکی زۆری کۆکردەوە، سوپایەکی سێ هەزار کەسی پێکەوە نا، حەوت سەد زرێپۆشو دووسەد سواریان تێدا بوو یەکێ لەو شەڕکەرانە صەفوانی کوڕی ئومەییە بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەدینە بەم هەواڵەی زانیو لەشکرکێشی قوڕەیشییەکانی پێ گەیشتەوە، خێرا راوێژی لەگەڵ هاوەڵانیدا کردو راوو بۆچوونی خەڵکەکەی وەرگرت، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی (سەرۆکی دووڕووەکان)و ریش سپی جوولەکەکان رایان وابوو موسوڵمانەکان لەشار نەچنە دەرێو ئەگەر هاتنە سەریان لەناو ماڵاندا شەڕیان لەگەڵدا بکەن! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆخۆی چوونە دەرەوەی شاری بەلاوە باش نەبوو، بەڵام گەنجە موسوڵمانەکان بەتایبەتی کە هەندێکیان ساڵی پێشوو ئامادەی جەنگی بەدر نەبووبوون حەزیان لەوە بوو؛ بەرەو روویان بچنو لە دەرەوەی مەدینەدا شەڕیان لەگەڵدا بکەن! وتیا ئەی پێغەمبەری خوا! پێشمان بکەوەو بمانبەرە دەرەوەی شار با لەوێ بەرەنگاری دوژمن ببین! با نەڵێن ترسنۆكو بێ هێزن، نەوێران بەرامبەرمان بوەستن! ئیتر ئەوەندە لە پێغەمبەر پاڕانەوەو تکایان لێ کرد کە بەرەو پیریان بڕۆنو پێشیان پێ بگرن، هەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رۆیشتەوە ماڵەوەو چەکی جەنگی لەخۆ بەستو هاتە سەر رای ئەوانەی کەداوای شەڕکردنیان دەکرد لەدەرەوەی شار!!

کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتە دەرەوەو چەکی جەنگی لەخۆ بەستبوو، ئیتر ئەوانەی کە داخوازی ئەوە بوون بڕۆنە دەرەوە بۆ بەرنگاربوونەوەی قوڕەیشییەکان پەشیمان بوونەوەو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ) زیادە ڕۆیمان کردو زیاد لە ئەندازە پێکیشیمان لێ کردی، ئێمە پەشیمانین ئەگەر دەفەرمووی با نەچین!!! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر پێغەمبەرێك چەکی شەڕی هەڵگرتو زرێی پۆشی؛ هەتا جەنگەکە نەکا نابێ چەکەکەی دابنێتەوە، ئیتر بە سوپایەکی هەزار، یان نۆسەدو پەنجا کەسێکەوە، لە مەدینە دەرکەوتو بەرەو کێوی ئوحود کەوتنە رێ، سوپاکە دووسەد زرێپۆشو دوو ئەسپ سواری تێدا بوو، رۆژی شەممە حەوتی مانگی شەوالی ساڵی سێیەمی کۆچی بە مەسافەی سێ کیلۆمەتر لە شیمالی مەدینە لەدامێنی کێوی

ئوحود بارگەی لێ خستو پاڵی دا بە کێوی ئوحودەوەو، جەنگاوەرانی دابەش کردن، پەنجا تیرهاوێژی دەستنیشان کردو عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کردە فەرماندەیانو لەسەر کێوەکە دایمەزراندنو پێی فەرمووی: پارێزگاریمان لێ بکەنو، مەهێڵن دوژمن پشتمان لێ بگرێ، ئامۆژگاریشی کردنو پێی فەرموون ئێمە سەربکەوین یان بشکێین، ئێوە ئێرە بەجێ مەهێڵن! تەنانەت ئەگەر دیتان باڵندە زەلام دەرفێنێ؛ ئێوە هەر مەجوڵێنو ئێرە چۆڵ مەکەن!

سوپای ئیسلام بەرەو رووی دوژمن وەستاو هەڵگیرسانی شەڕ نزیک بووەوە، ئاڵای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەدەستی موصعەبی کوڕی عومەیر بوو، زوبەیری کوڕی عەوام سەرکردەی باڵێکی لەشکرەکە بوو، باڵێکیشیانی بەسەرکردایەتی مونذیری کوڕی عەمر بوو، لەشکری کافرەکانیش لای راستی لەژێر فەرماندەی خالیدی کوڕی وەلیدا بوو، لای چەپیشی لە ژێر سەرکردایەتی عیکرمەی کوڕی ئەبو جەهلدا بوو، ئاڵاکەشیان بەدەستی طەلحەی کوڕی طەلحەوە بوو، تیر ئەندازەکانیان سەد کەس بوون عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو رەبیعە سەرکردەیان بوو!

هێشتا شەڕ دەستی پێ نەکردبوون سەرۆکی دووڕووەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بە خۆیو سێ سەد کەس لەهاوەڵانی مەیدانی جەنگیان بەجێهێشتو گەڕانەوە، وتی: پێغەمبەر بەقسەی منداڵو پاڵ دەکاو گوێ بۆ ریش سپی وەکوو ئێمە ناگرێ! بەگەڕانەوەی دووڕووەکان تەنها حەوت سەد کەس لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) مانەوە.

لەلایەکی ترەوە بنەماڵەی (بەنو سەلەمە)و بنەماڵەی (حاریثە) کە لە یاریدەدەران بوون خەریک بوون ئەوانیش هاوبەشی جەنگی ئوحود نەکەن، بەڵام خودا یارمەتی دانو رایان گۆڕیو هاوبەشییان کرد، قورئان ئاماژە بۆ ئەم هەڵوێستەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ– آل عمران/١٢٢﴾.

شەڕ دەستی پێ کرد، هیندی کچی عوتبە: کە ژنی ئەبو سوفیان بوو لەگەڵ کۆمەڵێك ئافرەتی تر لە دوای قورەیشییەکانەوە تەپڵو دەفیان لێ دەدا،

جەنگاوەرانیان هان دەدا بۆ تۆڵە ساندنەوەی کوژراوانی بەدر! لەم لاشەوە ئەبو دوجانە کە شمشێرەکەی پێغەمبەری وەرگرتو پەیمانی دا مافی خۆی بداتێ، شەڕێکی باشی پێ کرد، هەرکەسێك بەرەنگاری دەبوو دەیکوشت! حەمزەی مامی پێغەمبەر شەڕێکی جەربەزانەی کردو کۆمەڵێکی لە پاڵەوانانی قوڕەیش کوشت، کە موصعەبی کوڕی عومەیر – هەڵگری ئاڵا – شەهید بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاڵاکەی دا بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب.

وەحشی کە نۆکەرو بەندەی (موطعیم)ی کوڕی جوبەیر بوو، هەلی بۆ هەڵکەوتو فرصەتی لە حەزرەتی حەمزە هێناو حەربەیەکی بۆ هاویشتو شەهیدی کردو بوو بەسەروەری شەهیدان!!

سوپای کافرەکان تێکشکاو ئاڵاکەیان کەبەدەست طەڵحەوە بوو کەوتە خوارێ؛ کوڕەکەی هەڵیگرتەوە، دوایی براکەی، وەرەی جەنگاوەرەکانیان روخاو نزیك بوو سەرکەوتن بۆ موسوڵمانەکان دەستەبەر بێ، ئەگەر تیرهاوێژەکانی سەر کەژەکە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەریان نەکردایەو شوێن‌و سەنگەری ستراتیجی خۆیان چۆڵ نەکردایەو نەهاتنایەتە خوارێ! بۆ کۆکردنەوەی تاڵان‌و دەستکەوتی جەنگ! بەڵێ تیرهاوێژەکان تەماعیان بەرکەوتو – کەمێکیان نەبێ لەگەڵ عەبدوڵلا مانەوە – ئەوانی تر شوێنەکەی خۆیان بەجێهێشتو هاتنە خوارێ...

خالیدی کوڕی وەلید کە سەرکردەی هێزێکی کافرەکان بوو، هەستی بەو کەلەبەرە کردو لەگەڵ کۆمەڵێك لە سوارەی قوڕەیش لەپشتەوە هەڵمەتی بۆ بردن‌و شوێنی تیرهاوێژەکانی گرتو ئەو چەند کەسەی لەسەنگەرەکاندا لەگەڵ عەبدوڵلا مابوونەوەو شوێنەکانیان بەجێ نەهێشتبوو شەهیدیان کردن، ئەمجار هەر ئەم تاقمەی خالید لەپشتەوە هەڵمەتی لەناکاویان هێنایە سەر موسوڵمانەکان‌و شپرزەیان کردن، هەر لەو ماوەدا دەنگ بڵاوبووەوە کە پێغەمبەر شەهید کرابێ، موسوڵمانەکان ئەوەندەی تر بڕشتیان لێ بڕاو کەوتنە پاشەکشەو هەڵاتن، کافرەکان ئەوەندە لەپێغەمبەر نزیك بوونەوە بەبەرد پێدادان شپرزەیان کرد، چەند بەردێکی بەرکەوت، دانی موبارەکی شکا، سەری شکا، لێوی بریندار بوو، خوێن بەدەم‌و چاویدا هاتە خوارێ، هەردوو ئەژنۆی ئازاریان پێگەیی، ئیتر خوێنی لە دەم‌و چاوی

دەسـرِیو دەیفـەرموو چـۆن ئـەو نەتەوەیـە سـەرکەوتوو دەبـن دەمو چـاوی پێغەمبەریان خوێناوی کردبێ؟؟ بانگەوازی موسوڵمانانیشی دەکرد بۆلای خودا، ئیتر عەلی کوڕی ئـەبو تالیب دەستی گرتو طەڵحەش هەڵی ستاندەوە، مالیکی کوڕی سەنان خوێنی دەمو چاوی پێغەمبەری بە زمان دەلێستەوەو قووتی دەدا!

ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدوواوە دەستی کرد بە بانگ کردنـی موسـوڵمانانو دەیفـەرموو: بەنـدەکانی خـودا، وەرن بـۆلای مـن، ئـەمن پێغەمبەرم، شەهید نەکراوم، ساغو سەلامەتم، بگەڕێنەوە هەڵمەیەن! لە شوێنێکی تردا قورئان وێنەی ئەمەی کێشاوەو دەفەرموێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلاَ تَلْوُونَ عَلَى أحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ فَأَثَابَكُمْ غُمَّاً بِغَمّ لِّكَيْلاَ تَحْزَنُواْ عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ مَا أَصَابَكُمْ وَاللّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ - آل عمران/١٥٣﴾.

ئـەبو سـوفیان لەبەرزاییەکـەوە بـەدەنگی بـەرز دەینەڕانـدو دەیگـوت: کێتـان موحەممـەدی کوشـتووە.؟ بـا بیناسـین دووایـی خـەڵاتی بـدەینێ! عـەمری کـوڕی قومەیئـە وتـی: مـن کوشـتوومە. کـەعبی کـوڕی مالیـك یەکـەم کـەس بـوو مـوژدەی رزگاربوونی پێغەمبەری بە موسوڵمانەکان راگەیاند! ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەچنگی کافرەکان رزگاری بوو ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ -المائدة/٦٧﴾. لەو شـەڕەدا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) بەدەسـتی خـۆی ئوبەی کوڕی خەڵەفی کوشت کەلەوەپێش پیلانی شەهید کردنی پێغەمبەر لەلایەن ئەوەوە نەخشەی بۆ کێشرابوو، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لـە هـەموو ژیانیدا تەنها ئەم خودا نەناسەی کوشتووە، ئایـەتی ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللّهَ رَمَى - الأنفال/١٧﴾. دەربارەی کوشتنی ئەم کابرایە هاتۆتە خواریّ!

بەراسـتی رۆژی ئوحـود بەڵایـەکی سـامناك بـوو بـۆ موسـوڵمانان! حـەفتا جـەنگاوەریان لێ شـەهید کـرا! لـەکافرەکان تـەنها بیـستو دوو کـەس کوژرابـوون دیمەنەکە سامناك بوو: لە گۆڕەپانی شەڕدا ئیمامی حەمزە بە کوژراویی هیندی

کچی عوتبە سکی هەڵدڕی بوو، بە دان جەرگی جوو بوو، ئەبو سوفیان بە هەموو هێزی خۆی دەینەڕاند دەیگوت: ئەمە تۆڵەی شەڕی بەدرە!

ئەی بتی (هبل) ئایینی تۆ سەرکەوت، ئەمجار وتی: مەوعیدمان بەدر بێ لە ساڵی داهاتوودا لەوێ خۆتان دەبیننەوە دەبێ لەوێشدا شەڕێکی ئاواتان لەگەڵ بکەین، تێکتان بشکێنین! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پێی بڵێ: باشە با مەوعیدمان بەدر بێ!

ئەمجار شەڕ کۆتایی هاتو مەیدان چۆڵ بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەشوێن لاشەی حەمزەدا گەڕاو دۆزییەوە، ورگی هەڵدڕابوو، لووتو گوێیان بڕی بوو، زۆری پەرۆش بوو، بۆی خەمناك بوو، وتی: ئەگەر خودا جارێکی تر بەسەر ئەواندا سەرم بخا، دەبێ دەمو لووتی سی کەسیان ببڕم! دەبێ سی کەسیان ئاوا لێ ئەتك بکەم! ئەمجار بە عەباکەی داپۆشیو نوێژی لەسەر کردو حەوت جار ئەڵلاهوئەکبەری لەسەر کرد! شەهیدەکانی تری لەپەنا ئەو ریزکردنو یەك لە دوای یەك نوێژی لەسەر کردن، تا حەفتاو دوو نوێژی لەسەر کردن، ئەمجار حەمزەیان ناشتو فەرمانی دا شەهیدەکانی تریش هەریەکەی لەو جێگایەی لێی شەهید کراوە بنێژرێ.

هۆی تێکشکانی موسوڵمانەکان لە جەنگی ئوحودا - وەکوو دەرکەوت - بەگوێ نەکردنی تیرهاوێژەکان بوو بۆ فەرمانو ئامۆژگاری پێغەمبەرو بەجێ هێشتنی سەنگەرەکانیان بوو، بۆ کۆکردنەوەو گرتنی تاڵان! دیارە ئەم نەبەردە تاقیکردنەوە بوو بۆ موسوڵمانەکان، پاڵفتەکردنو پەروەردە کردن بوو بۆ خاوەن باوەڕان، خودا پێی زاناندن کە سەرکەوتن بەستراوە بەدەستەبەرکردنی هۆکارەکانیو تێشکانیش نابێ ببێتە هۆی رووخانی بیروباوەڕو شێوانی عەقیدە!

ئەمجار پاش ئەم رانواندنە سەرپێییەی جەنگی بەدرو ئوحود دێینەوە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ﴾ ئەی موحەممەد! ئەوە بۆ هاوەڵانت باس بکە کە لەماڵی خۆت هاتیە دەرەوە رۆژی شەممە حەوتی شەووالی ساڵی سێیەمی کۆچی بەرەو کێوی ئوحود کەوتیتە رێو لەوێ پیلانی شەڕت دادەنا، موسوڵمانانت دابەش دەکردن سەنگەرو شوێنی

جەنگەکەت بۆ دیاری دەکردن، بەسەر شوێنەکاندا دابەشت دەکردن، ئامۆژگاری جەنگاوەرانت دەکرد، ورەت بەرز دەکردنەوە، کۆمەڵێك تیرهاوێژت لەسەر کەژەکە دامەزراند، تاقمێك جەنگاوەرت لەلای راستو دەستەیەك لەلای چەپەوە دامەزراندن، شوێنی تایبەتیت بۆ سوارەکان دیاری دەکرد ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا شنەوابوو بۆ ئەو راوێژەی لەگەڵ هاوەڵانتدا کردت لە مەدینە، کە کۆمەڵێك وتیان: لەشار دەرنەچین تا دێنە سەرمانو تاقمێکیشتان وتتان: با بڕۆینە دەرەوەو لە دەرەوەی شار بەرەنگاریان ببین، خودا زانایە بە هەموو نییەتو مەبەستو کردەوەیەك، دەزانێ کێ راستەو بەدڵ قسەی دەکردو دڵسۆزی ئایین بوو، کێ هەڵە بوو، کێ دووڕوو بوو – با رایەکەشی راست بووبێ وەکوو عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیو هاوەڵانی دووڕووی – هەروەها خودا ئاگاداری ئەوەش بوو ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ ئەو کاتەی کە دوو تاقم لە یاریدەدەران کە دەستەی بەنو سەلەمە لە هۆزی ئەوسو دەستەی بەنوو حاریثە لە هۆزی خەزرەج کە دوو باڵی لەشکری موسوڵمانان بوون، سێیەکی سوپاکەش بوون ویستیان لاوازی بنوێنن ترسنۆکی پیشان بدەن، خۆپاش دەنو هاوبەشی جەنگەکە نەکەن، ئەوەش لە کاتێکی زۆر حەساسو ناسکدا بوو لەو کاتەی بینییان دووڕووەکان گەڕانەوە، بەڵام خودا یارمەتیدان، چونکە ئەوان دووڕوو نەبوون، ئیمانیان راست بوو، ئەو ریسواییەی بەسەردا نەهێنانو لە ترسو هەڵاتنو گەڕانەوە پاراستنیو ئەو خەتەرەی بە دڵیاندا هات بە تاوان بۆی حسێب نەکردن، چونکە ویستی خراپەکردن تا بە کردەوە ئەنجام نەدرێ بە تاوان دانانرێ، ئاماژە بەوە کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾ خودا پشتیوانو پەنایانە.

﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ با موسوڵمانان هەر بە خودا پشت ئەستوور بنو تەوەکولیان هەر لەسەر زاتی پاکی بێ، هەرگیز بە هێزو بازوی خۆیان نەنازن، بەڵکوو دوای – دەستەبەرکردنی هۆکارەکانو ئامادەکردنی پێویستییەکانو پێکەوەنانی سوپاو دابین کردنی چەكو تەقەمەنی پێویست بە گوێرە رۆژگار – دەبێ پشت بەستنیان بە خودا بێ، نەك بەتوانای خۆیانو کۆمەکیکارانیان بنازنو

پشت ئەستوور بن! چونکە ئەوە لەسەر ئادەمیزاد پێویستە کە هۆکار بەدەست بێنیو ئەمجار ئاکامو ئامانجەکان بداتە دەست خودا!

پەروەردگار بەویستی خۆی هەمیشە یارمەتیدەری کۆمەڵی کەمو باوەڕدارە، زاڵیان دەکا بەسەر کۆمەڵی زۆری بێ بڕوادا، وەکوو چۆن لە جەنگی بەدردا موسوڵمانانی بێ چەكو کەلوپەلی جەنگی — بەڵام خاوەن بڕواو ورە بەرزی بەسەر سوپای کوفری قوڕەیشیدا زاڵ کرد!! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە خۆڕاگربن تەقوای خودا بکەنو پشت بەهێزی بێ سنووری ئەو ببەستن! ئەوە پیلانو تێکۆشانی بێ دینان بۆ لەناوبردنتان چ نرخێکی نیەو هیچ ترسێکی لەسەر ئێوە نابێ، خودا یارمەتیتان دەدا، وەکوو چۆن لە بەدردا سەرکەوتووی کردن بەسەر دوژمندا، لە حاڵێکدا ئێوە ئەو ڕۆژە کەمو بێ چەكو سلاحی پێویست بوونو کەس کۆمەکی پێ نەدەکردن! کەچی خودا زاڵی کردن بەسەر ئەو دوژمنە سەر سەختەی کە خۆیان بۆ لەناو بردنتان تەیارو ئامادەباش کردبوو، بە ژمارە لەئێوە زۆرترو لە چەكو ئەسبابی شەڕ زۆر لە ئێوە پۆشتەترو بە تواناتر بوون.

جا کە ئێوە خۆگربن بۆ فەرمانی خوداو پابەندی فەرمانو نەهییەکانی بن، ئەوە یارمەتیتان دەداو سەرکەوتووتان دەکا، وەکوو چۆن لەجەنگی بەدردا یارمەتی دانو سەرکەوتووی کردن ﴿فَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ تەقوای خودا بکەن، لە خودا بترسن بەوە پابەندی فەرمانەکانی بنو خۆ لە نەهییەکانی بپارێزن، بۆ ئەوەی دڵو دەروونتان رام بکەن بۆ سوپاسگوزاریی لەسەر یارمەتیدانتان بەسەر دوژمندا، سەرخستنی ئایینەکەتانو شارەزایی کردنتان بۆ ڕێبازێکی پیرۆز کە ناحەزانتان لێیان گوم بووە، چونکە کەسێك خۆی رام نەکا بۆ تەقواکاری، ئەوە هەواو هەوەس بەسەریدا زاڵ دەبێو ئومێدی سوپاسکردنی نیعمەتەکانی خودای لێ رەچاو ناکرێ!

بێگومان خودا یارمەتی دان ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوکاتەی ورەی موسوڵمانانت بەرزکردەوەو پێت دەگوتن ﴿أَلَن يَكْفِيكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلاَثَةِ آلاَفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ ئایا بەستان نیە کە پەروەردگارتان بەسێ هەزار فریشتە یارمەتیتان بدا؟ بەستان نیە سێ هەزار فریشتە بنێرێتە خوارێ بۆ کۆمەکی پێ کردنتان؟؟

ئیبنو ئەبو شەیبەو ئیبنو مونذیرو هی تریش لە (الشعبی)یەوە دەگێڕنەوە کە لە ڕۆژی جەنگی بەدردا موسوڵمانەکان هەواڵیان پێ گەییشت کە کورزی کوڕی جابیر (المحاربی) دەیەوێ یارمەتی کافرەکان بداو کۆمەکییان پێ بکا، ئەمە زۆر لەسەر شانی موسوڵمانان گران بوو، ئیتر خودا ئەم موژدەیەی دا بە پێغەمبەرو موسوڵمانان!

ئیمامی فەخری ڕازی لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: هەموو زانایانی تەفسیرو شارەزایانی ژیاننامەی پێغەمبەر لەسەرئەوە کۆکن کە ڕۆژی بەدر خودا فریشتەی ناردوونە خوارێ بۆ شەڕکردن لەگەڵ کافرەکانداو یارمەتیدانی موسوڵمانان.

ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فەرموویەتی: فریشتە – کە یارمەتی خوداناسانیان داوە تەنها ڕۆژی بەدر شەڕیان لەگەڵ خودانەناسان کردووە، جگە لە ڕۆژی بەدر یارمەتیدانەکەیان ڕواڵەتی بووە، بۆ چاوترسان بووە، یارمەتی دانێکی مەعنەوی بوو ﴿بَلَى إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ بەڵێ: ئەگەر خۆڕاگربن‌و ئارامتان هەبێ، لەسەر بەرەنگاربوونەوەی دوژمن‌و خۆپارێز بن لە تاوان‌و سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا نەکەن ﴿وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَذَا﴾ کافرەکان بێنە سەرتان‌و شەڕتان لەگەڵ بکەن ﴿يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلافٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ پەروەردگارتان کۆمەکیتان پێ دەکا بە پێنج هەزار فریشتەی نیشانەکراو.

قەتادە دەفەرموێ: یارمەتیدانی موسوڵمانان بە فریشتە، ڕۆژی بەدر بووە! لەسەرەتاوە هەزار فریشتە، دوایی بوون بە سێ هەزار، دووایی بوون بە پێنج هەزار، قورئان ئاماژە بۆ ئەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ – الأنفال/٩﴾. یان دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلاَثَةِ آلاَفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾. یان ﴿بَلَى إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلافٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾.

ئەوە بوو موسوڵمانان لە ڕۆژی بەدردا خۆڕاگر بوون‌و تەقوای خودایان کرد. پەروەردگار یارمەتی دان بە پێنج هەزار فریشتە وەکوو بەڵێنی پێدابوون، ئەمانە هەموویان ڕۆژی بەدر بوون.

ئـەم كۆمـەكی كردنـە كۆمەكییـەكی مـادیو فیعلـی بـووە. فریـشتە هاوبەشـی شەڕیان كردووە. زۆر ریوایەتو فەرموودە هەن ئەم راستییە دەچەسپێنن! بوخاریو موسـلیم چـەند فەرموودەیـەكیان لـەم بـارەوە گێڕاوەتـەوە، ئـەم كۆمـەكی كردنـە كۆمەكی كردنێكی مەعنەوی نـەبووە وەكوو خـاوەنی تەفـسیری مـەنار بـۆی چووەو رایەكی برێ موفسیری ترە، كەلە كۆندا ئەم رایەیان دەربڕیوەو وتوویانـە: سوود لـە زۆری فریشتە ئەوە بووە كە نزابكەنو تەسبیحات بكەن شەڕكەران زۆر بكـەن. ئـیتر بەپێی ئەم رایە فریـشتە رۆژی بـەدر بـە فیعلـی بەشداری جەنگەكـەیان نـەكردووە، ئامادەبوونەكەیان تەنها بۆ ورە بەرز كردنەوەو پاڕانەوە بووە.

رای یەكەم؛ رای زۆرێك لە راڤەكەرانی قورئانـە، ئـەم مانایـە لـەم رووەوە دەبـێ؛ كە بڵێین: ئایەتی ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيكُمْ﴾ بیرخـستنەوەیان بـێ بـەرووداوی بەدرو هاوبەشی كردنی فریشتە لە جەنگەكەدا. كەچی لـە عەكرەمـەو ضـەحاكـەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویانە: ئەمە رۆژی جەنگی ئوحود بووە، پەروەردگار بەڵێنی بـە موسوڵمانان داوە ئەگەر خۆڕاگر بنو سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) نەكـەن یارمـەتییان دەدا، دەی ئەوانـە صـەبریان نـەگرتو پـەروەردگاریش بـە فریـشتە یارمـەتی نـەدان! چـونكە ئەگـەر فریـشتە بهاتایـە كۆمەكییان، موسوڵمانەكان تێكنەدەشكان!

پوختەی قسە ئەوەیە: راڤەكەرانی قورئان لـەو بەڵێنـەی كـە ئایـەتی ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ...﴾ دەیگەیەنێ كەوتوونەتە راجیاییەوە، ئایا رۆژی بـەدر بـووە یـان رۆژی ئوحود؟؟

رای یەكەم: رای حەسەنی بەصریو كۆمەڵێك موفەسیرینەو طەبەری پەسەندی كردووە، دەفەرموون: ئایەتی ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ...﴾ پەیوەندی بـە ﴿وَلَقَـدْ نَـصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ﴾وە هەیە.

رای دووەم: رای موجاهیدو كۆمەڵێك لە زانایانی تـرە، كـە دەفـەرموون: بـەڵێنی خودا لـە ئایەتەكەدا پەیوەنـدی هەیـە بـە ئایـەتی ﴿وَإِذْ غَـدَوْتَ...﴾ ئـەویش رۆژی جەنگی ئوحود بووە.

ئەمجار پەروەردگار دەفەرموێ: سێ هەزار فریشتە بەستانە بۆ یارمەتیدان، خۆ ئەگەر خۆڕاگرو بە ئارام بن‌و تەقوای خودا بکەن ژمارەیان زیاد دەکەین، دەیانکەین بە پێنج هەزار فریشتە کە خۆیان یان وڵاخەکانیان نیشانەدار کراون، یان بۆخۆیان مێزەری زەردیان لەسەر بووە، لکی مێزەرەکانیان بەسەر شانیاندا شۆڕ بوو بووەوە!

ضەحاك دەڵێ: نیشانەی وڵاخەکانیان ئەوە بوو پەڵە خوری سپی بەناوچاوان‌و کلکیانەوە بوو.

قەتادە دەڵێ: وڵاخەکانیان بەڵەك بوون!

بە کورتی‌و پوختی: قورئان ئاماژە بەئەوە دەکا کە موسوڵمانان ڕۆژی بەدر بە هەزار فریشتە یارمەتی دراون! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ – الأنفال/٩﴾ بەڵێ کۆمەکی پێکردنی موسوڵمانان بە سێ هەزار یان بە پێنج هەزار، بڕێ لە زانایانی ئیسلام چەسپاندوویانە، بەڵام طەبەری دەفەرموێ: ئایەتەکە ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە بە سێ هەزار یان بە پێنج هەزار کۆمەکی کرابن، هەروەکوو چۆن ئەوەشی لێ وەرناگیرێ کە کۆمەکی نەکرابن! کەوابوو دەتوانین بڵێین: کۆمەکی کراون کە چەسپێنەرەکان (مثبتین) بۆی چوون: دەتوانین بڵێین کۆمەکی نەکراون بەو شێوەیەی کە ئەوانەی ئینکاری کۆمەکییەکە دەکەن! فەرموودەیەکی واش نیە کێشەکە یەکاڵا بکاتەوەو تەرجیحی لایەك بدا، بۆیە چاك وایە ئێمەیش بێ بەڵگەی حاشاهەڵنەگر پارسەنگ نەخەینە لایەکی تەرازووەوەو لایەك پاساو نەدەینەوە!!

بەڵام دەربارەی جەنگی ئوحود لایەنی ئەوە کۆمەکی نەکرابن باشتر لە دڵدا دەچەسپێ چونکە ئەگەر موسوڵمانان بە فریشتە یارمەتی بدرانایە نەدەشکان‌و ئەو حاڵەی بەسەریان هات بەسەریان نەدەهات، ئەم ڕایە پەسەندی ئەهلی عیلمەو دەڵێن: مژدەی یارمەتیدان وابەستە بووە بە سێ مەرج (صەبر، تەقوا، هاتنی دوژمن بۆیان لەناکاو) دەی ئەم مەرجانە نەهاتنە دی‌و کۆمەکییەکەش نەهاتە دی!

﴿وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى لَكُمْ﴾ پەروەردگار کۆمەکی کردنی ئێوەی بە فریشتە کردە مزگێنی بۆتان بەوەی کە ئێوە سەرکەوتوو دەبن! ﴿وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ﴾ هەروەها بۆ

ئەوەی صەبرو ئارامی بچێتە دڵتانەوەو بزانن کە یارمەتیو کۆمەکی خودا هەر بۆ ئێوەیە، واتە: کۆمەکی پێکردن بە فریشتە دوو مەبەستی سەرەکی لە خۆ گرتووە:

ا - مزگێنی بە سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، دڵخۆشبوونتان بەو مزگێنییە.

ب — دڵنیاکردنی موسوڵمانان بەوەی کە خودا لەگەڵیانەو یارمەتییان دەداو ئیتر لەشەڕکردن نەترسن ﴿وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ سەرکەوتنی راستەقینە هەر لای خودای بەتواناو بالاّ دەستە، کە هەرگیز کەس بەسەریدا زاڵ نابێ، داناو کارسازێکی وایە، هەموو کارێك بەباشترین شێوەو نەخشەکێشانو هۆکار ئەنجام دەدا، سەرکەوتن دەبەخشێ، کاتێکیش پێویست بوو لێیان بگرێتەوە لێیان دەگرێتەوە، وەکوو زللەیەکی میهرەبانیو تەمبێ کردنێکی یەزدانی بۆ ئەوەی بە خۆیاندا بچنەوە!

ئەی موسوڵمانینە! سەیر بکەن پەروەردگار لە جەنگی بەدردا سەرکەوتنو زاڵبوونی بۆ دەستەبەر کردن، کۆمەڵێك فریشتەی ناردنە خوارێ بۆ کۆمەکی پێکردنتان ﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بۆ ئەوەی قەلاچۆی کۆمەڵێك لەسەرانی کوفر بکاو دوابڕاویان بکا، بە کوشتن یان بە دیل کردنیان، ئەوەتا لە جەنگی بەدردا حەفتایان لێ کوژرا، حەفتاشیان لێ بەدیل گیرا، زۆربەشیان لەسەرانو پاڵەوانەکانیان بوون! ﴿أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ﴾ یان ریسوایان بکا، بەهۆی تێکشکانەوە دڵ پڕ داخو خەفەت بن، بە دۆڕاویو شکاوی بگەڕێنەوە، نەیانتوانیبێ ئامانجی خۆیان بەجێ بێننو بە مراد بگەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا — الأحزاب/٢٥﴾.

ئەمجار رستەیەکی موعتەرەضە دەهێنێو دەیکاتە ناواخن لە نێوان باسی پێشوو دوواوەو دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ﴾ ئەی موحەممەد! لەبارەی موسوڵمانانو ئیمان نەهێنانی ئەو ئادەمیزادانەوە ئەتۆ هیچت بەدەست نیە! ئەوەی لەسەر تۆ پێویستە ئەوەیە؛ فەرمانی پەروەردگارت جێبەجێ بکەی، پابەندو ملکەچی فەرمانی ئێمە بی!! تۆ تەنها راگەیاندنت لەسەرە، ئێمە خۆمان حیساب بۆ

ئەوانە دەکەین‌و تۆڵەیان لێ دەستێنین، بە هەڵوێستی سەر ڕەقانەیان دڵگران مەبە! دوعای لەناوچوونیان لێ مەکە، بەڵکوو هەیان بێ تۆبە بکا، موسوڵمان ببێ!! بێگومان ئەبو سوفیان‌و ئەلحارثی کوڕی هیشام‌و سوهەیلی کوڕی عەمرو صەفوانی کوڕی ئومەییە دوایی موسوڵمان بوون‌و هاتنە ریزی موسوڵمانانەوە، ئاگاداربەو بزانە ئەی موحەممەد! کاری ئەوان بەدەست خوایە ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ یان تۆبەیان لێ وەردەگرێ، ئەگەر موسوڵمان بوون‌و گەڕانەوە بۆلای خودا، یان سزایان دەدا ئەگەر لەسەر هەڵوێستی سەر ڕەقانەو دوژمنکاری خۆیان بەردەوام بن، ئەوکاتە ستەم لە خۆیان دەکەن!.

ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی موسلیم لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دانی موبارەکی لە رۆژی ئوحودا بەبەردی کافرەکان شکا، سەری موبارەکی شکا، خوێن بە دەم‌و چاویدا هاتە خوارێ! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چۆن نەتەوەیەك ئاوا رەفتار لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا بکەن رزگاریان دەبێ‌و سەرکەوتوو دەبن!؟؟ ئیتر ئایەتی ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ﴾ هاتە خوارێ.

ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی بوخاری‌و تیرمیذی‌و نەسائی لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە – خوایان لێ رازی بێ – دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رۆژی جەنگی ئوحود دەیفەرموو: خودایە! نەفرین لە ئەبو سوفیان بکە، خودایە! نەفرین لە (الحارث)ی کوڕی هیشام بکە، خودایە! نەفرین لە سوهەیلی کوڕی عەمر بکە، خودایە! نەفرین لە صەفوانی کوڕی ئومییە بکە، ئیتر ئایەتی ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ﴾ نێردرایە خوارێ، خودا تۆبەی لێ وەرگرتن‌و موسوڵمان بوون!

﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەر بۆ خودایە چی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە، هەموو بەندەو دروستکراوی خودان، چۆنی بوێ ئاوا هەڵیان دەسوڕێنێ، ئەوەی بیەوێ لێی خۆش بێ لێخۆش بوون دەکاتە خەڵاتی، ئەوەی بیشیەوێ سزای بدا، بە دانایی‌و دادوەرانە

سزای دەدا، پەروەردگار خودایەکی ئەوەندە بە رەحمەو خاوەن لێخۆشبوونە، تاوانی خۆشەویستانی خۆی دادەپۆشێ، رەحمەو سۆزی هەیە بۆ ئەو کەسانەی فەرمانبەردارو ملکەچی فەرمانەکانی، لە گوناه خۆش دەبێ، چاوپۆشی لە تاوان دەکا، سزا دوا دەخا!

ئەمەش ئامۆژگاری کردنە بۆ پێغەمبەرو پێ زاناندنیەتی کە دوعاکردن لە موشریکەکانو نەفرین لێکردنیان هەڵوێستێك بوو نەدەبوو بنوێندرێ!! چونکە هەموو ئیشێك بەدەستی خودایە، بۆ هیچ کەس نیە لە ئەهلی ئاسمانو زەوی راوو تەگبیری خۆی دەربڕێ تێیاندا، تەنانەت ئەگەر فریشتەی نزیك بارەگای ئەقدەسیش بێ، یان پێغەمبەرێکی رەوانەکراو بێ، مەگەر کەسێك خودا ئیزنی دابێ شەفاعەت بکا، ئەویش بە گوێرەی سوننەتی خودا لە بوونەوەرداو بە گوێرەی ویستو ئیرادەی رەهاو بێ سنووریو؛ لەبەر حیکمەتی خودایی کە ئێمە تا رۆژی قیامەت هۆکەی نازانین!

## ئایەتەکان زۆر حوکمو ئامۆژەیان تێدایە، بڕێ لەو حوکمو ئامۆژانە ئەمانەن:

ا- کۆمەکی کردنی موسوڵمانان لەجەنگی بەدردا بە فریشتە بە شێوەیەکی فیعلی شتێکی چەسپاوە، چونکە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر لەسەر یارمەتی دانەکە لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە، یارمەتیدانەکە مزگێنی بوو بۆ موسوڵمانانو دڵنیاکردنیان بوو لە سەرکەوتن!

ب- بریندار بوونی پێغەمبەرو شکانی دانو سەری موبارەکی کاریگەرییەکی زۆری هەبوو؛ هەم لەسەر خودی پێغەمبەر خۆیو هەم لەسەر موسوڵمانان، تەنانەت – وەکوو لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە – کە تەشریفی خوێنی لە دەمو چاوی دەسڕی، دەیفەرموو: چۆن نەتەوەیەك رزگاری دەبێ سەری پێغەمبەری خۆیان بشکێننو دانی بشکێنن؟ لە پاساوی ئەوەدا کە بانگەوازییان دەکا بۆلای خودا؟؟! ئیتر یەزدان ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ﴾ ضەحاك

دەڵێ: پێغەمبەر ویستی دوعا لە موشریکەکانی مەککە بکا، خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ﴾.

هەندێك دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئیزنی وەرگرت کە دوعا لە کافرەکان بکاو لە بێخ دەریان بێنێ! کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ هەستی بەوە کرد کە تێیاندا هەیە موسوڵمان دەبێ – هەروایش بوو – زۆریان موسوڵمان بوون – لەوانە خالیدی کوڕی وەلیدو عەمری کوڕی عاصو عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل... هتد.

تیرمیذی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دوعای لە چوار کەس دەکرد خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ئیتر دوایی خودا هیدایەتی دانو موسوڵمان بوون!

بەهەرحاڵ ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر ئەوە کە قورئان لە خوداوە هاتووە، هۆشیارکردنەوەی پێغەمبەرەو تێگەیاندنیەتی کە جڵەوی هەموو شتێك بەدەست خودایە، جا پێغەمبەر دوعای کردبێ یان نەی کردبێ؟!

ج- بەگوێرەی رای ئەوانەی دەڵێن: پێغەمبەر دوعای لە کافران کردووە لە نوێژی بەیانییدا، زانایانی ئیسلام دەربارەی خوێندنی قنووت لە نوێژی بەیانییدا رای جیا جیایان هەیە:

١- حەنەفییەکانو حەنبەلیەکان قونووت خوێندنی نوێژی بەیانییان بەلاوە نەچەسپاوە، چونکە لە مووطەئدا ریوایەتێك لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە ئەوە دەچەسپێنێ کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەهیچ نوێژێکدا قونووتی نەخوێندووە!

(نەسائی)ش ئەوەی ریووایەت کردووە کە پێغەمبەرو جێنشینەکانی هەرگیز قونووتییان نەخوێندووە.

٢- حیجازییەکان، واتە: مالکیەکان. هەروەها شافیعییەکانیش قونووت خوێندنیان بەلاوە چەسپاوە، ئەمجار بەلای مالکییەکانەوە قونووت پێش روکوعە بەلای شافیعییەکانەوە دوای هەستانەوە لە روکوعە، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە کە دارەقوطنی بە سەنەدی راست گێڕاویەتیەوە، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی

خـوای لەسـەر بـێ) تـا لەژیانـدا بـوو، هـەرگیز قونـووت خوێنـدنی نوێـژی بـەیانی پاشگوێ نەخستووە!

## ڕێنموونی موسوڵمانان بۆ چاکەکردنو وازهێنان لە خراپەکاریو پاداشی کردەوەی چاکو خراپ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٣٠ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ١٣١ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٣٢ ۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم

﴿مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴿١٣٦﴾﴾.

ئەمجار دوای ئەوە کە لە ئایەتی پێشوودا موسوڵمانانی ترساند لەوەی کە ناموسوڵمانان بکەن بە راوێژکارو رازگرو لێپرسراوی کاروباری ستراتیژیو داوای لێ کردن کە خۆڕاگرو تەقواکار بن، تا دوژمنان فرسەتیان لێ نەهێنن، نموونەیەکی خۆڕاگریو تەقواکاری هێنایەوە لەجەنگی بەدرو ئوحودا، موسوڵمانانی هۆشیار کردەوەو ترساندنی لە بڵاوبوونەوەی رەوشتێکی جوولەکەو کافرەکان کە ئەویش رەوشتی ریباخۆرییە.

فەریابی لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەسەردەمی پێش ئیسلامدا خەڵکەکە کاڵایان دەفرۆشت بەقەرز، کە وەختی قەرز دانەوەکە دەهات، کابرای قەرزدار نەیدەبوو قەرزەکە بداتەوە، ئەوکاتە پارەکەیان زیاد دەکردو ماوەکەشیان درێژ دەکردەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً﴾ هەر فەریابی لە عەطاوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: هۆزی ثەقیف پارەیان لە هۆزی نەضیر وەرگرت، کە وەختی قەرزەکە دەهات دەیانگوت: ژمارەی پارەکە زیاد دەکەین ئێوەیش ماوەکەیمان بۆ درێژ بکەنەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً﴾ واتە: ئەی بڕواداران! خۆتان بپارێزن لە خواردنی ریبا، وەکوو ئەوەی ئادەمیزادان لەسەردەمی نەزانیدا دەیانکرد.! ئەمە نەهییەکی ئاشکراو روونە ئاراستەی موسوڵمانان کراوە: کە نابێ ریبا خۆری بکەن، سەوداو مامەڵەی ریبا ئامێز ئەنجام بدەنو دووچەندانەو چەن چەندانە زیاد وەربگرن وەکوو لەسەردەمی نەزانیدا دەیانکرد؛ کە وەختی قەرزەکە دەهات خاوەن قەرزەکە بەقەرزدارەکەی دەگوت: یان قەرزەکەم بدەوە، یان ماوەکە درێژ بکەرەوەو پارەکە زیاد دەکەم، جا ئەگەر کابرای قەرزدار قەرزەکەی

دابایەوە، ئەوە باش بوو ئەگینا قەرزدار چەند قەرزدانەوەکەی بوەغراندایە خاوەن قەرزەکە ئەوەندە سوودی قەرزەکەی زیاد دەکرد!

زۆرجار قەرزی کەم بەم شێوەیە زۆر بووە تا وای لێ هاتووە قەرزدار لە بنی دەرنەهاتووەو نەیتوانیوە بیداتەوەو بەقەرزداری سەری ناوەتەوە.. ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ لە خودا بترسن، تەقوای خودا بکەن، واز لە سەوداو مامەڵەی ریبائامێز بێنن بەڵکوو سەرفرازی دونیاو قیامەت ببن؛ لە دونیادا تووشی کێشەو عەداوەت بن، لە قیامەتیشدا تووشی سزای ئاگرین نەبن!! ﴿وَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾ خۆتان بپارێزن لە سزای ئەو ئاگرەی بۆ بێ بڕوایان ئامادەکراوە، واتە: ئەگەر ئێوە ریباخۆر بن شیاوی ئەوە دەبن کە مامەڵەی کافرانتان لەگەڵ بکرێ! ﴿وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ پابەندی فەرمانی خودا بن، بە گوێی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر بکەن، مامەڵەو سەودای ریبائامێز مەکەن، سوود مەخۆن، بە گوێرەی پەیامی پیرۆزی خودا رەفتار بکەن، بەڵکوو رەحمتان پێ بکرێ، خودا بەزەی پێتانا بێتەوە!!

خوێنەری هێژا! لە سوورەتی بەقەرە لەکاتی راڤەکردنی ئایەتی (٢٧٥ — ٢٧٦ — ٢٧٨ - ٢٧٩) وتمان: ریبا بەچەند قۆناغێك یاساغ کراوە: ئەم ئایەتەی ئێرە بەقۆناغی سێیەم دەژمێردرێ، ئەوەشمان گوت: کە سوود خواردن کەم‌و زۆری حەرامە، ئایەتەکانی قورئان: کە لەسوورەتی (البقرة) دان دواترین ئایەتی حوکمی ریبان کە هاتوونەتە خوارێ‌و دوو جۆر ریبا حەرام دەکەن: (ریبا النسیئة) زیادە وەرگرتنەوەی قەرز (ریبا الفضل) زیاد وەرگرتنی دەست بەجێ، یاساغ کردنی ریبا بەهەردوو جۆرەکانیەوە بۆ بەرژەوەندی تاك‌و کۆمەڵە، چونکە کار پێکردنی یاسای ریبا خەتەری بۆ تاك‌و کۆمەڵە!! ئەوەش گوترا: کە یاساغ کردنی (ریبا الفضل) بۆیە بووە کە نەبێتە ریخۆشکەرە بۆ (ریبا النسیئة) هەر قەرزێکیش سوود راکێش بێ، ئەوە ریبایەو حەرامە، جا سوودەکە پارەی زیاد بێ یان شتی تر بێ!

(ریبا النسیئة) کە ئەمرۆ لە بانقەکاندا بە ریبای فاحیش ناوزەد دەکرێ یان پێی دەڵێن: سوودی چەن چەندانە، کە بە گوێرەی وەغرانی قەرزەکە زیاد دەکا،

ئەوە حەرامەو بە هیچ شێوەیەك حەلاڵ ناكرێ، قورئان راستەوخۆ بە شێوەیەكی صەریح حەرامی كردووە قەید داركردنی بەچەند چەندانە (أضعافا مضاعفة) لە ئایەتەكەدا بۆ بەیانی واقیعەو وێنەكێشانی ئەو حاڵەتەیە كە ئەو كاتە ئادەمیزاد لەسەری بوون‌و، رەخنەگرتنە لەو دیاردەیەو زەم كردنی ئەو سەوداو مامەڵەیەیە كە دیاردەیەكی ستەمكاری‌و چەوساندنەوەیەكی زەق‌و ئاشكرای هەزارانی ئەو رۆژگارە بووە! واتە: قەیداركردنی ریبا بە (أضعافا مضاعفة) ئەوە ناگەیەنێ كە ریبای كەم حەلاڵ بێ‌و ریبای فاحیش واتە: چەند چەندانە حەرام بێ نەخەیر ئەوە مەبەس نیەو ئایەتەكە ئەوەی مەبەس نیە، ریبا كەم‌و زۆری حەرامەو تاوانی گەورەیەو گوناهی فەوتێنەرە، ریبا حەلاڵ نیە مەگەر بۆ موحتاجێك كە بە ئەندازەی پێویستییەكەی مامەڵە ریبا ئامێز بكا! واتە: بگاتە حاڵەتێك لێی مەعلووم بێ ئەگەر بە ریبا مامەڵەی نەكا لە برسا بمرێ، یان بێ مەسكەن‌و شوێنی حەوانەوە بمێنێتەوە، خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی بكەونە دەشت‌و سارا، بەلام قەرز كردن بە ریبا بۆ بازرگانی‌و پیشەسازی‌و كشت‌و كاڵ كردن ئەوە حەرامە، مەگەر لێی روون بێ كە ئەگەر پارەكە وەرنەگرێ موفلیس‌و مایە پووچ دەبێ، یان كشت‌و كاڵەكەی بفەوتێ كەسێكیش نەبێ بەقەرز پارەی بداتێ، ئەو كاتە بۆی هەیە بە ئەندازەی پێویستییەكە پارە بە سوود وەربگرێ‌و خۆی رزگار بكا!

ئەوەی ئێستا دڵخۆشكەرەیە ئەوەیە: كە لە ژێر سایەی ئەم رابوونە ئیسلامییەی ئێستا برێ بانق‌و شەریكەی تەئمینی ئیسلامی پەیدا بوون كە لەسەر بنەمای سەودای موضارەبەو قازانج بە سێ یەك‌و قازانج بە نیوەو ئەم جۆرە مامەڵانە كە زانایانی ئیسلام فتوایان بە حەڵاڵی داوەو ریباو هەڵخەڵەتاندن‌و قوماری تێدا نیە!

فەرمانی پەروەردگار جەختی لەسەر نەهی كردن لە سەودای ریبا ئامێز كرد بەوەی كە فەرمانی بە موسوڵمانان كرد، بە تەقواو خۆپاراستن لەو شتانەی نەهی لێ كردووین – كە یەكێك لەوانە ریبایە – بۆ ئەوەی سەركەوتن‌و خۆشبەختی لە دونیادا بۆخۆمان دەستەبەر بكەین! هاریكاری یەكتری بكەین، بەزەییمان بەیەكتریدا بێتەوە، چونكە هاریكاری سەردەكێشێ بۆ یەكتر خۆشەویستن،

خۆشەویستی بناغەی خۆشبەختییە، لە قیامەتیشدا بە مراد گەیشتن و زەفەر بردنە بە رەزامەندی خودا لەبەهەشتا!!!

ئەمجار جەختەکەی دووبارە کردەوە؛ بەوە کە موسوڵمانانی ترساند لەوەی کە ئەگەر پابەندی فەرمان و نەهییەکە نەبن، واز لە ریباخۆری نەهێنن بە ئاگر سزایان دەدا؛ ئەو ئاگرەی خودا بۆ کافرەکان – کە ریباخۆران بەشێکن لەوان – ئامادەی کردووە.

جا ئەگەر روو نەکەنە تەقواکاری و خۆتان لە گوناه نەپارێزن، ئەوە دەچنە ریزی ئەوانەی بە ئاگر سزا دەدرێن.

ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە ترسناکترین هەڕەشەی قورئانە!! چونکە خودا هەڕەشە لە موسوڵمانەکان دەکا بە ئاگرێك کە بۆ کافران دانراوە، ئەگەر خۆ لە سوودخۆریی نەپارێزن و لە شتەحەرام کراوەکان دوور نەکەونەوە،! ئەوەشمان بێتەوە یاد کە پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة)دا دوژمنایەتی خۆی و پێغەمبەری خۆی دژی سوودخۆران راگەیاند!

ئەمجار پەروەردگار بەمەبەستی جەخت کردن لەسەر تەقواو خۆپارێزیی فەرمان دەکا بە موسوڵمانان کە پابەندی فەرمانی خودا بن، گوێڕایەڵی ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەی بکەن و ریبا نەخۆن، مامەڵەی سوود ئامێز نەکەن، بەڵکوو لە دونیادا بێ گیرو گرفت ژیان بگوزەرێنن، لە قیامەتیشدا پاداشی کردەوەی باشیان وەربگرنەوە!

دەفەرموێ: ﴿وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ پەلە بکەن بۆ وەدەستهێنانی لێخۆشبوونی خودایی و چوونە ناو بەهەشتێك کە تا بڵێی: فراوان و گوشادە، پانتایی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە و ئامادەکراوە بۆ خاوەن بڕوایان!

ئیمامی ئەحمەد (رضيَ اللهُ عنهُ) لە موسنەدەکەیدا دەگێڕێتەوە: کە هیرقەلی رۆم نامەیەکی بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نووسی عەرزی کرد بوو کە تۆ بانگەوازی منت بۆ بەهەشتێك کردوە کە پانتایی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، ئەدی دۆزەخ لە کوێیە؟؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی:

«سُبْحَانَ اللَّهِ فَأَيْنَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ؟؟» پاکی بۆ خودا! کە رووناکی دێ تاریکی بۆ کوێ دەچێ؟؟ واتە: ئەگەر فەلەك هەڵدەسوڕێ نیوەی (نیوەی زەوی) رووناکە نیوەکەی تریشی تاریکە، هەربەو جۆرەش بەهەشت لای سەرووی بوونەوەرەو دۆزەخیش لای خواروویەتی!!

دەشتوانین بڵێین: پێویست ناکا لەوەی کە کاتێ رۆژ دادێ ئێمە شەو نابینین، لە شوێنی تر شەو نەبێ! هەرچەندە کەوا ئێمە نایزانین، هەر بەو جۆرەش دۆزەخ لە شوێنێك بێ کە خودا بۆخۆی دەزانێ‌و زانیاری ئێمە دەرکی ناکا!!

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئەم مەعنایە وێ چووترە، لەبەر ئەو فەرموودەیەی ئەبو هورەیرە کە بەزاز پەسەندی کردووە، دەڵێ پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) گوتی: قوربان! پێم نالێی ئایەتی ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ﴾ چۆنە؟ ئەگەر وابێ بەهەشت هەمووی داگرتبن ئەدی دۆزەخ لە کوێیە؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی ئەتۆ نابینی کە شەو هات هیچ شتێك لە رووناکی رۆژ دیار نیە؟ دەی باشە ئەو کاتە رووناکایی رۆژ لە کوێیە؟! وتی: لەو شوێنەیە کە خودا بۆی دیاری کردووە، پێغەمبەر فەرمووی دەی دۆزەخیش لەو شوێنەیە کە خودا بۆی داناوە.

**ئەمجار خودای مەزن‌و زانا باسی رەوشتی بەهەشتییان دەکاو دەفەرموێ:**

١- ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ﴾ ئەوانەی ماڵ‌و دارایی خۆیان دەبەخشن لە خۆشی‌و ناخۆشیدا، لە هەرزانی‌و گرانیدا، لە ساغی‌و نەخۆشیدا، بە گەنجی‌و بە پیری، بەشەوو بەرۆژ، بە نهێنی‌و بە ئاشکرا! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً -البقرة/٢٧٤﴾. واتە: ئەو خودا پێداوانە هیچ شتێك لە خوداپەرستی بێ ئاگایان ناکا، هەموو کاتێك خەریکی خوداپەرستی‌و ماڵبەخشین‌و سەرگەرمی چاکە کردنن لەگەڵ بەندەکانی خودادا، جۆرەها چاکەو پیاوەتییان لەگەڵدا دەکەن، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ» ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم لە عەدییەوە ریوایەتیان کردووە.

**فەرمانکردن بە ماڵبەخشین دوو مەبەستی سەرەکی تێدایە!**

١- ماڵبەخشین یارمەتیدانی موحتاجەو باربوو کردنیەتی، سوود خواردن چەوساندنەوەی هەژارە لەلایەن دەوڵەمەندەوە.

٢- ماڵبەخشین لە هەموو بارێکدا؛ لە خۆشیو ناخۆشیدا بەڵگەیەکی بە هێزە، لەسەر خوداپەرستیو یارمەتیدانی هەژارانە بەشێوەیەکی هەمیشەیی، نە دەوڵەمەندەکە تینی پێ دەگا، نە هەژاریش پاشگوێ دەخرێ، پەندی پێشینانیشە دەڵێ: (أعط القليل فالحرمان أقل منه) کەمیش ببەخشی لە هیچ باشترە، خێرخوازیو یادی رۆژی قیامەت سۆزو بەزەیی لە ئادەمیزادا دەجووڵێنن: وا لە مرۆڤ دەکەن کە هەمیشە بەخشندە بێ، با بەخششەکەی کەمیش بێ، بەخشینی کەمو هەمیشەیی باشترە لە بەخشینی زۆرو هەڵشەیی‌و بڕاوە!! واتە: ئەگەر کەسێك لە ماوەی ساڵێکدا هەزار دینار ببەخشێ ئەو هەزار دینارە ئەگەر لە ماوەی ساڵەکەدا کەم کەمە بیبەخشێ باشترە لەوەی کە بە جارێك یان دوو جار بیبەخشێو وشکایی بێ!

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا –الطلاق/٧﴾.

رەوشتێکی تری بەهەشتیيان ئەوەیە ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ﴾ کە رقیان هەڵساو سوور بوونەوە رقەکەیان دەخۆنەوە، هەرچەندە دەسەڵاتیان هەیە رقەکەیان برێژن، بەڵام دان بە خۆیاندا دەگرنو بەرەنگاری نەفسو شەیتان دەبنەوە، پێغەمبەریش دەفەرموێ: «لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ وَلَكِنَّ الشَّدِيدَالَّذِى يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ» ئازاو بە هێز ئەو کەسە نیە پاڵەوانبازی بکا، بەڵکوو ئازا ئەو کەسەیە لە کاتی رق هەڵساندا جڵەوی نەفسی خۆی بگرێ!

رێگاچارەی رق هەڵسان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) کە ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داوود لە (عطية)ی کوڕی (سعدالسعدی)یەوە گێڕاویانەتەوە: دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی «إِنَّ الْغَضَبَ مِنَ الشَّيْطَانِ وَإِنَّ الشَّيْطَانَ خُلِقَ مِنَ النَّارِ وَإِنَّمَا تُطْفَأُ النَّارُ بِالْمَاءِ فَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ» واتە: رق هەڵسان لە شەیتانەوەیە، شەیتانیش لە ئاگر دروست

کراوە، ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە رقی هەڵسا با دەستنوێژ بگرێ.

٣- ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ ئەوانەی لە خراپەی خراپەکاران دەبوورن، کەسێك خراپەیان لەگەڵ دەکاو رقیان هەڵدەستێنێ، نەك هەر رقەکەیان دەخۆنەوەو بەس! بەڵکوو لێشیان خۆش دەبن، ئەمەش پلەیەکی مرۆڤایەتییە، نیشانەی پڕ عەقڵیو بیرورا راستیو بەهێزی ویستو ئیرادەو توندو تۆڵی کەسایەتییەتی! ئەم پەلەیە لە زوور پلەی پێش خواردنەوەیە، چونکە زۆرجار رق خواردنەوە کینەو بوغزاندن لە دڵو دەروندا دروست دەکا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ – الشورى/٣٧﴾.

حاکمو طەبەرانی لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر فەرموویەتی «من سره أن يشرف له البنيان، وترفع له الدرجات، فليعف عمن ظلمه، ويعط من حرمه، ويصل من قطعه».[1] ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إذا كان يوم القيامة نادى مناد يقول: أين عافون عن الناس؟ هلموا إلى ربكم، وخذوا أجوركم وحق على كل أمرىء مسلم إذا عفا أن يدخل الجنة».

٤- ﴿يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ خودا چاکەکارانی خۆش دەوێن، ئەو کەسانەی بە چاکە وڵامی خراپەی خەڵك دەدەنەوە، جا چاکە کردنەکەیان بەگەیاندنی سوود بێ بە خراپەکار، یان بە دوورخستنەوەی زیان دەبێ لێی، لە دونیادا بەوە دەبێ کە لە هەموو مافێکی کە لای خەڵك هەیبێ خۆش ببێ، ئەمەش پلەیەکە لە پلەکانی پێشوو بەرزترە!

بەیهەقی دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەلی کوڕی حوسەین (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) کارەکەرێکی هەبوو ئاوی بە دەستیدا دەکرد بۆ دەستنوێژ، مەسینەکە لە دەستی کەوتە خوارێ عەلی بریندار کرد! عەلی سەری بەرز کردەوە کارەکەرەکە لێی ترسا وتی: قوربان! خودا دەفەرموێ: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ﴾ عەلی وتی: وا رقم خواردەوە،

[1] حاکم دەڵێ ئەم حەدیثە صەحیحەو مەرجی شەیخەینی تێدا هاتۆتە جێ بەڵام دەریان نەهێناوە

کارەکەرەکە وتی: ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ عەلی وتی خوا لێت خۆش بێ، کارەکەرەکە وتی: ﴿وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ عەلی وتی: دەبڕۆ ئازادبەو ئەوا لەبەر ڕەزامەندیی خودا ئازادم کردی. ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً﴾ ئەوانەی کە کردەوەیەکی ناشیرین ئەنجام دەدەن وەکوو غەیبەت کردن ﴿أَوْ ظَلَمُواْ أَنْفُسَهُمْ﴾ یان تاوانێك دەکەن کە زیانەکەی هەر بۆخۆیانە وەکوو خواردنەوەی عەرەق ﴿ذَكَرُواْ اللّهَ فَاسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ﴾ خێرا یادی خودا دەکەنەوەو پەشیمان دەبنەوە، بۆلای خودا دەگەڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەن، دڵنیان کە بەس خودا لە تاوان خۆش دەبێو هەر ئەو کەریمی کارسازە، بە گوێرەی داناییو زانایی خۆی بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ. ﴿وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللّهُ﴾ کێ جگە لە خودا – لە تاوان خۆش دەبێ؟ (ئەمە جوملەیەکی) (معترضة)یە، واتە: جگە لە خودا کەس نیە لە گوناه خۆش ببێ! خودا بە گەورەیی خۆیو چاکەو ئیحسانی بێ سنووری، لە خراپەکاران خۆش دەبێ، چاوپۆشی لە تاوانباران دەکا، بەمەرجێ تاوانەکەی هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خودا نەبێ، چونکە خودا لە شەریك دانان بۆی خۆش نابێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ – النساء/٤٨﴾ ئەمە بە ڕەوا دانانی کردەوەی تۆبەکارانەو دڵنیاکردنیانەو مزگێنی پێدانیانە بە فراوانی ڕەحمەتو بەزەییو نزیکی لێخۆشبوونی خودا لێیانو بە ..زکردنەوەی پلەو پایەیانە.. چونکە هەستیان بەوە کردووە کە هیچ پەنایەك نیە جگە لە پەنای خودا، هەر کەرەمو ڕەحمەتی خودا فریای بەندەکانی دەکەوێو تۆبەی تۆبەکاریش لە گوناه وەکوو ئەو کەسە وایە کە تاوانی نەکردبێ.

بەڵام مەرجی قبووڵ کردنی تۆبە ئەوەیە: کە ﴿وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَى مَا فَعَلُواْ﴾ لەسەر تاوانەکانیان بەردەوام نەبن، واتە: تۆبەیان لە تاوانەکانیان کردووە، بۆلای خودا گەڕانەوە، بەردەوام نەبوون لەسەر تاوانەکانیان ئەو گوناهەی تۆبەیان لێ کردووە جارێکی تر بۆی نەگەڕانەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی «لا كبيرة مع الاستغفار ولا صغيرة مع الاصرار» مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەیە کە تاوانی بچووك ئەگەر لەسەری بەردەوام

بووی دەبێتە تاوانی گەورە، ئەمە بە مەرجێ ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانە بزانن ئەمەی کە دەیکەن تاوانە، ئەگەر نەیانزانی ئەوە گوناهیان ناگاتێ!!

﴿أُوْلَئِكَ﴾ ئەو موسوڵمانانەی کە ئەو ڕەوشتانەیان تێدایەو بەو شێوە هەڵس‌و کەوت دەکەن ﴿جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ پاداشیان لێخۆشبوونی پەروەردگارە بۆیان، وێڕای چەند باخ‌و باخاتێك کە بە ژێر دارەکانیاندا جۆگەو جۆبار دەکشێن هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە! ﴿وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ ئەم پاداشە باشترین پاداشە بۆ چاکەکاران کە بریتییە لە لێخۆشبوونی خوداو دڵنیابوونیان لە سزا نەدانیان‌و بە مراد گەیشتن بە بەهەشتی بەرین‌و رازاوە بە هەموو جۆرێکی زۆر رابواردن، بە هەموو جۆرێکی خواردن‌و خواردنەوە، تەنانەت خۆشی‌و لەزەتی وای تێدایە: نە چاو بینیویەتی‌و، نە گوێچکە بیستوویەتی، نە بەسەر دڵی هیچ کەسدا رابووردووە؟!

## سەرنجامی خوداپەرستان‌و سەرپێچیکاران، جیهاد نیشانەی شکۆمەندی موسوڵمانانە

﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ

ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾

ویستو ئیرادەو دابو نەریتی خودا یاسایەکی نەگۆڕی هەیە، هەرچەندە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هەموو شتێکی پڕ حیکمەتو کارسازانەیە، ئیشەکانی وا داناوە کە بەگوێرەی هۆو هۆکار (علە ومعلول) بێنە دی، پێشەکیو نەتیجەیان هەبێ! ئەو دابو نەریتە خودایيە بۆ رابووردو داهاتوو وەك یەك وایە، هەرکەسێك رێبازی خوداپەرستان بگرێ، پابەندی فەرمانی خوداو رێرەوی رێبازی راستی ئەو بێ، لە هەردوو دونیا بە مراد دەگا، سەرکەوتنو سەرفرازی بەدەست دێنێ، کەسێکیش رێبازی گومرایان بگرێ سەرپێچیکەرو دڵ رەقو رەوشت ناشیرین بێ، سەرەنجامی خەسارەتمەندیو تیاچوونو ولات وێرانیو خۆشی نەدیتووی هەردوو جیهانە!

لە کاتی ئاشتیدا ئەگەر ئادەمیزاد پەیڕەوی یاسای سروشتو زانیاریو ئەزموونی رۆژگار بکا، دەربارەی کشتوکاڵو بازرگانیو پیشەسازی...هتد بەگوێرەی هۆو هۆکار هەڵسو کەوت بکاو لە هەموو شتێکیشدا وێڕای دەستەبەرکردنی ئەسباب تەوەکولی بە خودا بێ، لە ژیندا سەرکەوتوو سەرفرازو بە مراد گەیشتوو دەبێ، تەنانەت خودانەناسیش ئەگەر پەیڕەوی یاسای ژیانی کرد، لە کاروباری ژیاندا دابو نەرێتی کارو کاسبی پەیرەو بکا بە مراد دەگا، ئەگەر بە پێچەوانەی دابو نەریتیش کار بکا – با خوداپەرستیش بێ – هەر سەرکەوتوو نابێ!

لە بارو زروفی جەنگیشدا، ئەگەر سەرکردە بە گوێرەی رۆژگار ئەسبابی جەنگ دەستەبەر بکا، مەشقو راهێنانو تاقیکردنەوە بە گوێرەی پێویست ئەنجام بدا سەرکەوتن بەدەست دێنێو بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێ، خۆ ئەگەر مەشقو راهێنان

پاشگوێ بخاو چەك و تەقەمەنی دەستەبەر نەكا! تووشی تێشكان و ژێركەوتن دەبێ، ئەمە یاسای خودایە لە بوونەوەردا، تۆو نەچێنی بەروبووم ناچنیەوە، نەمام نەچەقێنی شین نابێ كشتوكاڵ ئاوی نەدەی یان ئاو نەدرێ شین نابێ و پێ ناگا!!

﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ﴾ واتە: پێش ئێوە زۆر جار داب و نەریتی خودا دووبارە بۆتەوە، گەل و نەتەوەی جۆراو جۆر هاتوونەتە كۆڕی ژیانەوەو رۆیشتوون. دە بەسەر زەویدا گەشت و گوزار بكەن، لە شوێنەوارو پاشماوەی كۆنینە بڕوانن، سەیری رابودروی گەل و نەتەوە پێشینەكان بكەن، لە مێژوی ژیاریان تێبفكرێن، رووداوەكان بخوێننەوە ئەو كاتە راستیەتی تەرازووی خوداییتان بۆ ئاشكرا دەبێ، داب و نەریتی تایبەتی خۆیتان بۆ دەردەكەوێ كە بریتییە لە بەمراد گەیاندنی چاكەكارو خەسارەتمەندی خراپەكار ﴿فَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذَّبِينَ﴾ تێبفكرن سەرەنجامی ئەمانە چۆن بوو كە پێغەمبەرانیان بە درۆ خستەوە، چۆن تەفرو توونا كران و لەناو بران!!؟

ئەمە هۆشیار كردنەوەیە بۆ سەرپێچیكەران - كە تیرهاوێژەكانی سەر كەژەكەی ئوحودیش دەگرێتەوە - یادخستنەوەی موسوڵمانانە بەوەی كە سەركەوتنی رۆژی جەنگی بەدر بەهۆی خۆڕاگری و گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەرو پشت بەستنیان بە خوداو دەستەبەر كردنی هۆیەكانی شەڕو، متمانە بوونیان بە تواناو دەسەڵاتی خوداو رەحمەتی بەرفراوانی بوو!

﴿هَذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەمەی كە لەمەوپێش گوترا: لە قورئان و ئەوەی كە لەوە دوا دێ، هەمووی روونكردنەوەیە بۆ ئادەمیزدان بە گشتی و رێنموویی و ئامۆژگاری كردنە بۆ خوداپەرستان و تەقواكاران بە تایبەتی، چونكە هەر ئەمان سوود لە قورئان وەردەگرن، وەكوو لە سەرەتای سوورەتی بەقەرەدا دەفەرمووێ: ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ - البقرة/٢﴾ یان دەفەرمووێ: ﴿هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ - لقمان/٣﴾. ئاوا بەو شێوەیە قورئان رێڕەوی ژیان روون دەكاتەوە، داب و نەرێتی خودامان لە بوونەوەردا بۆ شی دەكاتەوە، پێمان دەڵێ: دەبێ بۆ هەموو شتێك لە رێگای خۆیەوە بۆی بچین، بەمەش قسەو گوتەی كافرو دوو رووەكان پووچەڵ دەبێتەوە كە دەڵێن: ئەگەر موحەممەد راست بكاو پێغەمبەر بێ،

لە شەڕی ئوحودا تێنەدەشکا؟! هاوەڵانی تووشی ئەو هەموو ئێش و ئازارو کوشتن و برینە نەدەبوون! ئەوەش دەردەخا کە سوننەتی خودا بەسەر پێغەمبەران و باقی رابەرو سەرکردەو خەڵکی تردا ئەوەیە: هەر سەرکردەیەك سەربازەکانی گوێڕایەڵی نەبن و سەرپێچی فەرمانەکانی بکەن تووشی تێشکان دەبن؟! جا کاتێك موسوڵمانان ئەم حەقیقەتەیان زانی: پێویستە تێشکانی جەنگی ئوحود نەبێتە هۆی نائومێدی و ترسان لەشەڕ، ناڕەحەت نەبن لەوەی کە تووشیان هات لە برینداری و شەهید بوون و ماندووبوون، چونکە کوژراوەکان شەهیدن و میوانی خودان، ئەو رووداوەش زللەیەکی میهرەبانی و دەرس و پەروەردەکردن و فێرکردنی موسوڵمانانە، کە تەمبێ بن و بە هیچ جۆرێك سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر نەکەن! هەربۆیەشە پێغەمبەر دەربارەی جەنگی ئەحود فەرموویەتی: «لو خيرت بين الهزيمة والنصر يوم أحد لاخترت الهزيمة» ئەگەر رۆژی جەنگی ئوحود خۆمیان سەرپشك بکردایە لە نێوان تێشکان و سەرکەوتندا تێشکانم هەڵدەبژارد ﴿وَلاَ تَهِنُوا﴾ ئێوە خۆتان بە زەبوون و لاوازترو ترساو لە شەڕ پیشان مەدەن، ﴿وَلاَ تَحْزَنُوا﴾ خەم و خەفەت بۆ کوژراوان مەخۆن، ئەوانە نەمرن و میوانی خودان ﴿وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ﴾ ئێوە سەربەرز و سەرفرازن، دوا رۆژو سەرکەوتن هەر بۆ ئێوەیە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەمەرجێك ئێوە خاوەن باوەڕی راست و دروست بن!

داب و نەریتی خودا وایە هەموو کات دوارۆژو سەرەنجام بۆ تەقواکارانە؛ کوژراوەکانیان لەبەهەشتدان، کوژراوی کافران لە دۆزەخدان،...

مەبەست بە نەهی کردن لە زەبوونی و خەم خواردن ئەوەیە کە تەسلیمی دوژمن نەبن، بە خۆیاندا بچنەوەو سەرلەنوێ خۆیان ئامادە بکەنەوە بۆ بەرنگاری دوژمن و جەنگان لەگەڵیدا، ئەمە وێڕای هەبوونی عەزیمەتی راست و هێزی ئیرادەو پشت بەستن بە خوداو ورە بەرزیی و هیوای سەرکەوتن.

چۆن ئێوە زەبوونی دەنوێنن! بەهۆی تێشکانتان لە جەنگی ئوحودا ورەتان دەڕوخێ؟؟ خۆ ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ﴾ ئەگەر لەو جەنگەدا ناڕەحەتیەکتان تووش بووبێ؛ بریندار بووبن، سەرتان شکابێ، لێتان کوژرا بێ، ﴿فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ﴾

ئـەوە دوژمنانیـشتان؛ كافرەكـانی قـوڕەیش هـەمان زەبـرو زەنگیـان بەركـەوتووە؛ ئەوانیش لێیان كوژراوە، لێیان برینداربووە، بـەڵكوو زیـاتریش، ئـەو تـا لـە جـەنگی بەدردا زیاتریان لێ كوژرا زیاتر تێشكان. كۆڵیان نەداو خۆیان بۆ شـەڕێكی تـر تـەیار كردەوە! جا كە ئێوە لە شەڕی ئوحـودا تێشكان ئـەوە لـە پێشدا لـە جـەنگی بـەدردا سەركەوتوو بوون، رۆژگاریش وەهایە، هەر رۆژە سەركەوتن بـۆ دەسـتەیەكە، رۆژێـك بـۆ ئێوەیـەو رۆژێـك بـۆ ئـەوان، هەمووشـی لەبـەر حیكمـەتێكی خودایيـە، دەسـەڵات دەدرێ بە دەستەیەكی بێ بڕواو رۆژێك بـەتاڵ فـەرمانڕەوا دەبـێ، چـەند رۆژێكیش حـەق باڵادەسـت دەبـێو حـوكمڕانی دەكا ﴿وَتِلْـكَ الأَيَّـامُ نُـدَاوِلُهَا بَـيْنَ النَّـاسِ﴾ ئـەو رۆژگارانـەی ئـاوا دەسـتاو دەسـت پـێ دەكـەین لـە نێـوان ئادەمیـزادانـدا هـەر رۆژەی شـانسو نگـین بـە تاقمێـك دەدەیـن، بـەڵام دوارۆژو سـەركەوتنی سـەرەنجام بـۆ پابەندانی رێبازی خوداییە!

بۆیەش ئاوا هەر رۆژە نگین دەدەین بە تاقمێك ﴿وَلِيَعْلَمَ اللّـهُ الَّـذِينَ آمَنُـواْ﴾ بـۆ ئەوەی پەروەردگار عەدڵو دادپەروەری خۆی دەربخـا، یاسـای بوونـەوەر بـچەسپێنێ، بۆ ئەوەی پەروەردگار زانیـاری خـۆی بـە موسـوڵمانان بزانێنـی بـەوەی كـە ئاگـاداری چۆنیەتی بڕوای بڕوادارانە، بۆ ئەوەی خۆڕاگران لەبەرامبـەر دوژمنانـدا دەربخـا، بـۆ ئەوەی خەڵك جیاوازییان بزانـێو لێكیـان جیـا بكاتـەوە.. بـۆ ئـەوەی راسـتی ئیمـانی ئیمانداران بچەسپێنێ، چونكە هەركاتێ ئیمانەكە پەیدا بوو خودا زانیاری دەربارەی هەیە، هەرشتێك خودا عیلمی پێ نەبێ ئەوە هەبوونی نیەو نەبووە، كـەوابێ مانـای ﴿وَلِيَعْلَمَ اللّـهُ﴾ ئەوەیـە كـە خـودا زانیـاری خـۆی بـە چۆنیەتی شتەكان بـۆ خـەڵكی دەربخا!

چونكە عیلمی خودا بە چۆنیەتی شـتەكان لەئەزەلـدا چەسـپاوەو هەیـە، ئـەوەی كە روودەدا دەق وەكوو ئەوە وایە: كە لە زانیـاری خـودادا هەیـە لەئەزەلـدا؛ زانیـاری خوداش هەموو كاتێ رەنگدانەوەی واقیعە، شتێك خودا زانیاری پێ نەبێ نە هەیـەو نە حەقیقەتی هەیە! وێڕای ئەوە دەرخستنو پێ زانانـدنـەو تێگەیاندیانـە ﴿وَيَتَّخِـذَ مِنكُمْ شُهَدَاء﴾ بۆ ئەوەش پەروەردگار تاقمێك ئامادەباش بكا بـۆ شـەهید بـوونو لـە رێگەی خودادا بكوژرێن، لە پێناو رەزامەندیی خـودادا گیـانی خۆیـان بـەخت بكـەن،

چونکە برێ موسوڵمان بەشداری‌و ئامادەبوونی جەنگی بەدریان لە کیس چوو بوو ئاواتەخوازی ئەوە بوون هەلێکیان بۆ هەڵبکەوێ‌و پلەی شەهید بوون‌و گیان بەخت کردن لە ڕێگای خودادا بەدەست بێنن!!

ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ئەهلی سوننەو جەماعەت کە دەڵێن: ئیرادەو ئەمری خودا لێك جودان، چونکە پەروەردگار نەهی لە کافران کردووە کە موسوڵمانان - حەمزەو هاوەڵانی - بکوژن‌و ویستوشیەتی بکوژرێن؛!! نەهی خواردنی داری گەنمی لە ئادەم کرد کەچی خواردنەکەشی ئیرادە کردووە. فەرمانی بە شەیتان کرد بۆ سوژدە بردن‌و ئیرادەی نەکرد سوژدە بەرێ؛ بۆیە شەیتان سوجدەکەی نەبرد.. فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە بە جیهادو تێکۆشان بەڵام تەمبەڵی تێدا دروست کردوون، ئەوە بوو برێك بەهۆی تەمبەڵی، یان ترسان‌و خۆ ویستی‌و هۆی تر نەچوون بۆ جیهادو ئەنجامیان نەدا!!..

بێگومان یەزدان ڕێزی شەهیدانی گرتووە، لە ژیانی بەرزەخیدا بە میوانی خۆی حسێب کردوون‌و دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ - آل عمران/١٦٩﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا - النساء/٦٩﴾.

هەر لەم ڕووەوەو بۆ زیادە ڕێزلێنان لە شەهیدان، باسی ستەمکاران دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار ستەمکارانی خۆشناوێن، سزایان دەدا، چونکە ستەمیان لە خۆیان کردووە ئاژاوەیان لە زەویدا ناوەتەوە، سەریان لە خەڵکی تێك داوە؛ لە پاساوی ئەوەدا پەروەردگار پەلە دەکا لە سەرنگون کردنیان، لە وەرگێڕانی تەخت‌و بەختیان! لەکاتی پێویست‌و ماوەی دیاری کراودا سەرەنگرێیان دەکا، لەم ڕووەوەیە: کە ستەمکاریی پایەدار نابێ‌و ئاکامی فەوتان‌و وەرگەڕانە!!

﴿وَلِيُمَحِّصَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ هەروەها بۆ هەڵبژاردن‌و جیاکردنەوەی بڕوادارانی ڕاستاڵ لە دوو ڕووەکان، واتە: ڕۆژگارو شانس‌و نگین ئاڵ‌وگۆڕ پێ دەکەین بۆ ئەوەی خاوەن باوەڕانی پاڵفتەکراو دیاری بکەین، لە موسوڵمانانی دەروون زەعیف هەڵیان هاوێرین، موسوڵمانانی ڕاستاڵ لە موسوڵمانانی بڕوا لێڵ‌و لەرزۆك جیا بکەینەوە!

بۆ ئەوەی ئەو موسوڵمانە پاڵفتەکراوە ببێتە پارچە زێڕێکی پاڵفتەو لە بۆ تەدراو، خەڵکی تر بیناسێ‌و ببێتە نموونەو هی تریش شوێنی بکەون، بۆ خۆشی خۆی بناسێ! چونکە زۆرجار ئادەمیزاد بۆخۆی خۆی ناناسێ‌و حەقیقەتی راستی خۆی نازانێ!! ئەزموون‌و تاقیکردنەوەی وەکوو جەنگی ئوحود ئامێز، پاڵفتەی دەکاو راستی‌و پیاوەتی دەردەکەوێ!! ئەوەتا لە جەنگی ئوحودا دووڕووەکان پاشگەزبوونەوەو گۆڕەپانی جەنگیان جێهێشت، بڕێ موسوڵمان لە ترسا هەڵهاتن، هەندێکیش لە تیر هاوێژەکان هەر بۆ مەبەستی کۆکردنەوەی تاڵان‌و غەنیمەت سەرپێچی فەرمان‌و ئامۆژگاری پێغەمبەریان کرد.

بڕێکیش لە دەوری پێغەمبەر مانەوەو ورەیان نەڕوخاو داکۆکیان لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کردو ئازایەتی‌و مەردایەتی خۆیان نواند!

لە صەحیحەیندا هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَسَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ».

ئاکامی ئەم ئەزموون‌و تاقیکردنەوەیە: لە جەنگەکانی دوایی دا دەرکەوت: ئەوەتا لە جەنگی (حمراء الاسد)دا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانیدا کە جگە لە ئەوانەی هاوبەشی جەنگی ئوحودیان کردووە کەسی تر شوێن کافرەکان نەکەوێ؛ ئیتر خاوەن باوەڕان پابەندی فەرمانەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بوون، کەس سەرپێچی نەکرد!

﴿وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ﴾ هەروەها ئەو تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوە بوو کە نائومێدی‌و نەمانی هیوا روو بکاتە دڵ‌و دەروونی خودانەناسان، هیچ بنەماو ماکی ئازایەتی‌و هەڵمەتیان تێدا نەمێنێ! چونکە ئەوان ئەگەر سەربکەون ئاوا زیادەڕەوی دەکەن، سەرباری کوشتن‌و بڕین؛ کوژراوەکان ئەتك دەکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی فەوتان‌و نەمانیان، ئەوان لە ئاست موسوڵمانانی راستەقینەدا هیچ وجوودێکیان نیە، بیروباوەڕی بەتاڵ‌و پووچی ئەوان کاتێ دیارە، کە حەق‌و راستی موسوڵمانان دیار نەبێ!

**سەرزەنشت کردنی جەنگاوەرانی شەڕی ئوحودو هەڵنانیان بۆ خۆگری‌و پێ سەلماندنیان کە مردن بەدەست خودایە**

﴿ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن

قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْأَخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾ ﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: چەند هاوەڵێك دەیانگوت: خۆزگە ئێمەیش بکوژراینایە!، وەکوو چۆن ئەصحابی بەدر شەهید بوون یان دەیانگوت: خۆزگە ئێمەیش ڕۆژێکی وەکوو ڕۆژی بەدرمان بهاتایە پێش‌و شەڕمان لەگەڵ کافرەکان بکردایەو خۆمان تاقی بکردایەوە: جا شەهیدبوون‌و بەهەشتمان دەست بکەوتایە! یان سەرکەوتن‌و غەنیمەت... ئەوەبوو پەروەردگار ئامادەی جەنگی ئوحودی کردن، چەند کەسێکیان نەبێ ئەوانی تر هەڵاتن؛ ئیتر ئایەتی ﴿وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ﴾ نازڵ بوو، پێش ئەومیش دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللّهُ الَّذِينَ جَاهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ﴾ ئایا وا گومان دەبەن کە بچنە بەهەشتەوە بەبێ ئەوەی لە ڕێگای خودادا تێکۆشان بکەن‌و لە پێناو بەرنامەو ئایینەکەیدا خۆتان بەخت بکەن؟؟ بەتەمای ئەوەن بەبێ تاقیکردنەوەو تووشبوونتان بەجۆرەها گیروگرفتی تاڵ‌و ناسۆری سامناك بەهەشتان دەست کەوێ؟! هێشتا خودا گیانی خۆ بەخت کردن‌و تێکۆشانی ئێوەی بۆ خەڵکی دەرنەخستبێ؟ تێکۆشەری‌و خۆڕاگری ئێوە دەرنەکەوتبێ! چۆن هەروا بە هەوانتەو بە قسە بەتەمای بەهەشتن!!؟

ئاشکراشە جیهادو تێکۆشان چەند جۆرێکی هەیە، جەنگان لەگەڵ هەواو هەوەس‌و شەیتاندا، بەتایبەتی لەسەردەمی گەنجی‌و لاوێتیدا، تێکۆشان بە گیان بۆ بەرزکردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله) بۆ بەرگری لە وڵات‌و ناموس. تێکۆشان بە ماڵ‌و دارایی بۆ بەرگری لە گەل‌و نەتەوەو بەرژەوەندی گشتی، بەرەنگاربوونەوەی بە تاڵ‌و ناحەق، یارمەتیدانی حەق‌و ڕاستی، هەوڵدان بۆ چەسپاندنی عەدالەت...

بەڕاستی خۆڕاگریی پێویستە لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکە ئاینییەکاندا، بەهەموو جۆرێکیانەوە، فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەر، لەکاتی تەنگانەدا، لەکاتی ڕاوەستان لە بەرامبەر دوژمندا... هتد.

ئینجا پەروەردگار ڕووی خیطاب دەکاتە ئەو موسوڵمانانەی کە ئامادەی جەنگی بەدر نەبووبوونو ئاواتە خوازبوون لە جەنگێکی تری ئاوەهادا لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئامادەبنو پلەو پایەی شەهیدبوون بەدەست بێننو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾.

بێگومان ئێوە بوون، ئاواتەخوازی شەهیدبوون بوون، لە پێش ئەوەدا کە شەڕەکە ببینن، بەڵام کاتێك جەنگ بەرپا بوو لەگەڵ دوژمن لە ئوحوداو چاوتان بە لێك دانو تێك ڕژان کەوت، بریسكو بریقی شمشێرو سەرە ڕمتان بینی، ڕیزی خۆڕاگریو ڕاوەستاوی جەنگاوەرانتان بینی، ئیتر ترسانو دڵە لەرزەتان پێ کەوتو پێغەمبەرتان لە کاتێکی زۆر ناسکدا بەجێهێشتو هەڵاتن، لە هەموو لایەکەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تیرباران دەکراو بەردی بۆ دەهاوێژرا، کافرەکان دەوریان دابوو؛ ئالەو کاتەدا ئێوە دەورتان چۆڵ کردو هەڵاتن!! ئەو بانگی ئێوەی دەکرد کە دەوری چۆڵ نەکەنو دژی دوژمن بجەنگێنو شەڕ بکەنو خۆڕاگر بنو ورە بەرزو دڵ قایمو گورجو گۆڵ بنو مەیدان چۆڵ نەکەن، بانگی دەکردن بۆ خوداپەرستیو خۆڕاگریو ورەبەرزیی! بەڵێ بە چاوی خۆتان هۆکاری مردنتان بینی، دیتان براو خزمو هاوەڵانتان کوژرانو لاشەیان کەوتە سەر زەوی، ئێوەش خەریك بوو بکوژرێن! ئەمە لۆمە کردنێکی بە هێزە، بۆ ئەوانەی کە لە پێش جەنگەکەدا خۆیان دەخواردەوەو ئاواتەخوازی بەرپابوونی شەڕێکی وەکوو شەڕی بەدر بوونو ئیلحاحیان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد کە خۆببەستێو بچێتە دەرێ بۆ شەڕ، کەچی کە تەنگانە هات بایدۆستیان لێ کردو هەڵاتنو کەمێکیان نەبێ کەسیان لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەمانەوە!

جا کاتێك ڕۆژی ئوحود موسوڵمانان شکانو ئەوانەی هەڵاتن هەڵاتن، ئەوەی لێیان کوژرا لێیان کوژرا، هەندێکیشیان بەدەوری پێغەمبەر مابوونەوە، بانگێکی

شەیتانی هەڵدرا کە موحەممەد کوژراوە!! ئیبنو قومەیئە گەڕایەوە بۆناو کافرەکانو وتی: من موحەممەدم کوشتووە: بۆیەش ئەم هەواڵەی بلاوکردەوە چونکە بەردێکی بە پێغەمبەردا دابوو سەری شکاندبوو، زۆربەی خەڵکەکە وایان زانیبوو: کە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) کوژراوە! ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ﴾ موحەممەد کە هەیە پێغەمبەرێکە ئادەمیزادە، نەخۆشیو کوژرانو بریندار بوونو مردنیشی بەسەردا دێ، وەکوو چۆن ئەو شتانە بەسەر پێغەمبەرانی پێش خۆیدا هاتوون، ئەوەتا پێش ئەو مووساو عیسا هاتوونەتە ژیانەوەو دوایی مردوون، زەکەریاو یەحیا کوژراون، لەگەڵ ئەوەشا ئایینەکانیان هەر ماون، پەیڕەوکەرانیان هەن، کەوابێ پێویستە لەسەرتان کە لەسەر ئایین بەردەوام بن، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەر بمرێ یان بکوژرێ، نابێ ئێوە هەڵبگەڕێنەوەو لە ئایین پەشیمان ببنەوە.

پێغەمبەر ئادەمیزادێکە وەکوو باقی پێغەمبەران، ئەرکی پێویستی خۆی لەسەرشانە، ئەرکەکەی کۆتایی دێ بەلە دونیا دەرچوونی، جا کەسێك موحەممەد بپەرستێ ئەوە بابزانێ ئەو دەمرێ، کەسێکیش خودا بپەرستێ، ئەوە خودا زیندووەو نامرێ.

﴿أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ﴾ ئایا ئەگەر موحەممەد مرد یان کوژرا!! ئێوە پاشگەز دەبنەوە؟! دەچنەوە سەر حاڵەتی نەفامیو گومڕایی؟! نابێ ئێوە هەرگیز بیر لە شتی وا بکەنەوەو هەڵوێستی ئاوا نەفامانە بنوێنن، خۆئەگەر پاشگەز ببنەوە، زیانەکەی بۆخۆتانە، چونکە ﴿وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا﴾ کەسێك دوای موسوڵمان بوونی پاشگەز ببێتەوەو لە ئایین پەشیمان بێتەوە، واز لە تێکۆشانو بەرەنگاری دوژمن بهێنێ، ئەوە با بزانێ هیچ زیانێك بە خودا ناگەیەنێ، بەڵکوو زیان بە خودی خۆی دەگەیەنێو بۆخۆی سزای دۆزەخ دەستەبەر دەکا. کەسێکیش خوداپەرست بێ بە مردنو کوژرانی پێغەمبەر واز لە ئایین نەهێنێو سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودا بێ، لە پێناو ئایینیدا شەڕ بکا، لە حاڵی ژیانو مردندا پەیڕەوی پەیامی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بکا، ئەوە شوکرانە ژمێرە ﴿وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ خودا پاداشی شوکرانە ژمێران دەداتەوە،

بە گوێرەی کردارو هەڵوێستیان بەهرەمەند دەبن! ئەم ئایەتە ڕێخۆشکەر بوو، بۆ لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)، یادخەرەوە بوو، بۆ ئەوانەی وەکوو ئیمامی عومەر بیریان لە مردنی پێغەمبەر نەکردبووەوە، تەنانەت عومەر (رضيَ اللهُ عنهُ) کە هەواڵی لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەری بیست، تاساو سەرسام بوو، تووشی صەدمە بوو، وتی: هەرکەسێ بڵێ: موحەممەد مردووە دەیکوژم، بەم شمشێرە دوولەتی دەکەم!

ئەنەسی کوڕی (النضر) (مامی ئەنەسی کوڕی مالیك) دەڵێ: لەو ساتە ناسکەدا کە لە جەنگی ئوحودا بەسەر موسوڵماناندا تێپەڕی ئەو کاتەی کە لەناو خەڵکدا بڵاوبووەوە کە موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) کوژراوە، بڕێ موسوڵمانی ورە ڕووخاو بڕوا لاواز دەیانگوت: فرصەتمان بوایە پیاوێکمان بناردایە بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، بەڵکوو ئەمانو لێبووردنی لە ئەبو سوفیان بۆ وەربگرتینایە! بڕێ دووڕووش دەیانگوت: ئەگەر ڕاستە موحەممەد کوژراوە بچنەوە سەر ئایینی پێشووتان.

جا ئەنەس دەڵێ: قسەکەیان نابەجێ بوو (خۆ ئەگەر موحەممەد کوژرا بێ خۆ خودای موحەممەد نەکوژراوە، چۆن دوای پێغەمبەر ژیان دەگوزەرێنن؟ بڕۆن شەڕ بکەن لەسەر ئەو بەرنامەو پرۆگرامەی ئەو شەڕی لەسەر کردووە، بمرن لەسەر ئەو شتەی ئەو لەسەری مردووە).

ئەمجار گوتی: خودایە! من بە گوتەی ئەوان نەگری، من بەریم لە هەڵوێستی ئەوان، بەریم لەوەی کە ئەوان دەیڵێن. ئەمجار شمشێرەکەی بەدەستەوە گرتو هەتا شەهید بوو شەڕی کرد!!

ئیمامی بوخاری لە ئەبو سەلەمەوە دەگێڕێتەوە: کە عائیشە بۆی گێڕاوەتەوە دەڵێ: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە دونیا دەرچوو ئەبوبەکر لە ماڵی خۆیان لە (سونح)[1] بەسواری ئەسپێك هاتو دابەزیو چووە ژوری

[1] شوێنێکە لە مەدینە بەگەڕەکی بەنو حاریثە مەشهور بوو یەك میل لە ماڵی پێغەمبەرەوە دوور بووە.

مزگەوت، لەگەڵ کەس قسەی نەکرد، تا چووە لای عائیشە کە لەنزیکیەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە بووردی یەمانی داپۆشرابوو، پەردەکەی لەسەر رووی لاداو خۆی بەسەردا داو ماچی کردو گریا، ئەمجار وتی: دایكو باوکم بە قوربانت بن، سوێند بە خودا دوو مردنت بەسەردا نایەن. ئەو مردنەی کە خودا لەسەری نووسیوی ئەوا رووی داوەو لە دونیا دەرچووی!

ئیمامی زوهری دەڵێ: ئەبو سەلەمە لە ئیبنو عەبباسەوە بۆی گێڕامەوە فەرمووی: ئەبوبەکر هاتە دەرەوە، عومەر قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد: (دەیگوت: هەرکەسێ بڵێ موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) مردووە زمانی دەبڕم) ئیتر ئەبوبەکر وتی: عومەر! کەسێك موحەممەدی دەپەرست، موحەممەد مردو بڕایەوە، کەسێکیش خودا دەپەرستێ؟ ئەوە خودا زیندووەو نامرێ، ئەمجار ئەم ئایەتە ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ﴾ی خوێندەوە، سوێند بە خودا وام زانی ئەو خەڵکە لەوەپێش ئەم ئایەتەیان نەبیستووە، وەك ئەوە وابوو کە نەیانزانیبێ کە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ! کە ئەبوبەکر خوێندییەوە خەڵکیش لە دەمی ئەوەوە هەموو خوێندیانەوە، ئیتر لەوەو دوا هەرکەسێکم دەبینی ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە!

ئیبنو ماجەش بەهەمان شێوە لە عائیشەوە گێڕاویەتییەوە![1]

ئەبولقاسمی طەبەری دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: ئیمامی عەلی لە ژیانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) کە ئەم ئایەتە ﴿أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ﴾ دەخوێندرایەوە دەیگوت: نە بەخوا دوای ئەوەی خودا شارەزای ئایینی کردووین پاشگەز نابینەوە، سوێند بەخودا ئەگەر بمرێ بکوژرێ تا گیانم تێدایە شەڕ دەکەم لە پێناو ئەو ئامانجەی ئەو شەڕی لە پێناودا دەکرد، سوێند بە خودا من براو میراتگرو کوڕی مامی ئەوم کێ لەمن بۆ ئەو لە پێشترە؟ ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلاً﴾ هیچ کەسێك نامرێ مەگەر بە

[1]- تفسير القرطبي ج٢/ ٢٢٢ - - ٢٢٣.

ویستی خودا نەبێ، هەتا ئەو ماوەیەی بۆی دانراوە تەواوی نەکا لە ژیان دەرناچێ، دەبێ خودا ئیزن بدا ویستو ئیرادەی لەسەر مردنەکەی بێ ئەمجار دەمرێ!

ئەمە شتێکی چەسپاوو سنووردار کراوە بە ماوەیەکی دیاری کراوەوە، کاتی دیاری کراوە، پێشو پاش ناکا! زۆر وادەبێ پیاوی ئازاو جەنگاوەر تووشی دەیەها شەڕو تێکرژانی سامناك دەبێو ناکوژرێ، ترسنۆکی وایش هەیە ناوێرێ لە پێستی خۆیدا بجووڵێتەوە کەچی لە ناکاوێك دەکوژرێ! قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ – فاطر/١١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ – النحل/٦١﴾.

تەمەن دیاری کراوە، کاتی مردن بڕاوەتەوە، قەزاو قەدەر فەرمانڕەوایە، هەڵسوڕێنەری هەموو کاروبار پەروەردگارە، هەموو گیانێك بە ئیزنی خودا دەردەچێ، بە گوێرەی زانستی ئەو – بەبێ پێشکەوتنو دواکەوتن – هەموو گیانێك لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا دەردەچێ!

دەی کەوابێ بۆچی دەبی مرۆڤ بترسێو لە تێکۆشان دوا بکەوێ؟!

﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ﴾ کەسێك هەوڵ بدا بۆ دونیاو ئامانجو مەبەستی بە دەستهێنانی دونیا بێ، ئەوە بە گوێرەی خۆی بەشی دەدەینو لە قیامەت بێ بەشە! کەسێکیش هەوڵ بۆ دوارۆژ بدا، ئامانجی پلەو پایەی قیامەت بێ بێبەشی ناکەین! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ – الشورى/٢٠﴾. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاء لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلاهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا، وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا – الإسراء/١٨ – ١٩﴾. ئایەتەکەی ئێرەیش بە ﴿سَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ﴾ کۆتایی هاتووە، واتە: ئێمە پاداشی شوکرانەژمێران دەدەینەوە، بەفەزڵو گەورەیی خۆمان لە دونیاو قیامەت بە گوێرەی شوکرو کردەوەیان لە پاداشی ئەوەدا کەلە شەڕدا هەڵنەهاتوون

پاداشی نەبڕاوەیان دەدەینەوە. بەڵام ئێوە ئەی ئەو کەسانەی هەڵپەی دونیاتانە، لە ڕۆژی جەنگی ئوحودا وازتان لەسەنگەری بەرگری هێناو سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەرتان کرد، ئەو دەستکەوتەی کە پێغەمبەر بانگەوازی بۆ دەکردن لە کیس خۆتان دا: کە خۆشبەختی دونیاو قیامەتە!

ئایەتەکە ئاماژە دەکا بۆ ئەوانەی ڕۆژی ئوحود هەڵپەی تالانی گرتن، شتی تری لەبیر بردنەوە، ئاماژە بۆ ئەوەش دەکا کە ئیرادەی ئادەمیزاد شێوازی سروشتی کردەوە – چاك یان خراپ – دیاری دەکا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدْ﴾ ئیسنادی فیعلەکە پاڵ شەخصەکە دراوە!! ئەوەش لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە بوخاریو موسلیم لە ئیمامی عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى» یەك دەگرنەوە جا کەوابێ ئەی خاوەن بڕوایان! وەنەبێ ئەم کارەساتە هەر بەسەر ئێوە هاتبێ. ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ زۆر لە پێغەمبەران لە ڕێگای خودادا جەنگاون، تێکۆشاون، پەیڕەوکەرانیشیان شان بەشانی ئەوان لە پێناو بەرزکردنەوەی شیعاری (لا إله إلا الله)دا شەڕیان کردووە، نموونەو ڕەهنومایی کەری ڕۆشنبیرو شارەزایی کەر بوون.

﴿فَمَا وَهَنُواْ لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَمَا ضَعُفُواْ﴾ ئەوانە زەبوونیو لاوازییان نیشان نەئەدا لەبەرامبەر شەڕو شۆڕو کوژرانی خۆیانو پێغەمبەرەکانیان، دەستەوئەژنۆ دانەنیشتوون ورەیان نەڕووخاوەو مل کەچی دوژمن نەبوون.

﴿وَمَا اسْتَكَانُواْ﴾ دونیاپەرستو خۆپەرست نەبوون، پشتیان لە دوژمن نەکردووە، بەڵکوو خۆڕاگرو بەئارام بوون. ﴿وَاللّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾ پەروەردگار خۆڕاگرانی خۆش دەوێن؛ ئەوانەی خۆیان خۆڕاگربوونو ورەی هاوەڵانیشیان بەرزکردۆتەوە، ئەوانە خودا ڕێنومایییان دەکاو پاداشی باشیان دەداتەوە! ئەمە سەرکۆنەکردنی موسوڵمانانی ئوحودی تێدایە! کە لەو ڕۆژەدا ورەیان ڕوخاو دڵەلەرزەیان پێکەوت، بە هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستیان لە کراسی هاتە دەرو، توانای بەرامبەری کردنی کافرەکانیان نەماو بیریان

لەوە کردەوە چۆن پەیوەندی بە ئەبو سوفیانەوە بکەن لێبوردنیان بۆ دەستەبەر ببێ!

دەی ئەوە کردەوەی و هەڵوێستی زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەرەکانی پێشوو بوو، ﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ لەکاتی تێکرژانو رووبەڕوو بوونەوەی خودا نەناساندا جگە لەنزاو پاڕانەوە لەخوا هیچی تریان نەدەگوت، هەر دەیانگوت: پەروەردگارا! لە گوناهو کەمتەرخەمیمان خۆشبە، عەیبو عارو سەرپێچی کردنی فەرمانی خۆتمان داپۆشە، ئەژنۆمان بەهێز بکە، نزاو پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوونیان لەخودا لەگەڵ ئەوەدا کە ڕەببانیو خوداویست بوون! ئەمە ئاماژەیە بە هەست کردنیان بە تەقصیرو کەمتەرخەمی، داواکردنی لێخۆشبوون لەپێش داوای ورەبەرزی و خۆڕاگری، بەو مەبەستەیە کە دڵو دەروونیان پاك بێو دوعاکەیان گیرابێ..

﴿فَآتَاهُمُ اللّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الآخِرَةِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئیتر خودا لە پاداشتی خۆڕاگریو نزاو پاڕانەوەیاندا سەرکەوتنو زاڵبوونیانی بەسەر دوژمندا پێ بەخشین. ناوو شۆرەتی پیاوەتی دونیایان دەست کەوت، وێڕای پاداشی باشی قیامەتیان کە ڕەزامەندیی خوداو ڕەحمەتو شادبوونیانە بە بینینی پەروەردگار لە بەهەشتدا، چونکە ئەوان لە دونیادا کردارو هەڵوێستیان بەگوێرەی ویستی خودا بووە، ویستوویانە سوننەتی خودا لەسەر زەوی بەرقەرار بکەن، خوداش چاکەکاری ئاوای خۆش دەوێن، پاداشی باشی ئەو کردارە چاکانەیان دەداتەوە!

ئەمەش ڕێنومایی کردنو پەروەردەکردنە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەرو سەرنج ڕاکێشانیانە بۆ ئەوەی کە ئەوانە شیاوترن بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ڕەوشتە باشانەو پێویستە پەیڕەوی ئەو کۆمەڵە خواویستە بکەن، لەبەرامبەر دوژمندا نەبەردو نەترس بن! لە کردارو گوفتاری باشیان دا شوێن ئەوان بکەون.

ئایینی خودا یەك ئایینەو بنەماکانی گۆڕانکارییان بەسەردا نایە، سوننەتو دابو نەریتی خودا لە بوونەوەردا گۆڕانی بەسەردا نایە.

## نابێ موسوڵمان بەگوێی کافران بکەن

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ ﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی کرد بە موسوڵمانان کە هاوەڵانی پێغەمبەرانی پێشوو بکەنە پێشەواو شوێنیان بکەون، لێرەدا موسوڵمانان دەترسێنێ لە شوێنکەوتنی کافرو جوولەکەو گاورەکان و دووڕووەکان؛ ئەوانەی کە پیلانیان لە بانگەوازی ئیسلامی دەگردو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوەو موسوڵمان بوون، ئەگەر گوێڕایەڵی ئەوانە بکەن کە بڕوایان بە ئایینی ئێوە نیەو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکەتان ڕەت دەکەنەوە، وەکوو ئەبو سوفیان و هاوەڵانی، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی دووڕووەکان و شوێنکەوتووانی، هەروەها سەرانی جوولەکەو گاورەکان، ئەوە بزانن دوای موسوڵمان بوونتان دەتانگێڕنەوە بۆ کوفرو خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبن، لە دونیادا زیللەتی کوفرو بێدینی بەسەر شانتاندا دێ، عیزەتی ئیسلامتان لە کیس دەچێ! دوژمن لە وڵاتاندا جێگیر دەبێ، لەزەتی سەرکەوتن و فەرمانڕەوایی و باڵادەستیتان نامێنێ، ئەو وادەیەی خودا پێی داون کە دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي

الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا – النور/٥٥﴾. بۆتان نایەتە جێو فەرمانڕەوایی سەر زەویتان لە کیس دەچێو بۆخۆتان دەبنە بۆرە پیاوو مسکێنو ژێر دەستە. لە قیامەتیشا خەسارەتمەندی ئەوە دەبن کە لە نیعمەتو خۆشی بەهەشت بێ بەش دەبنو تووشی سزای دۆزەخ دەبن. ﴿بَلِ اللّهُ مَوْلاَكُمْ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ﴾ ئێوە پشت بەوانە مەبەستن، بە هیوای یارمەتی بێ باوەڕان مەبن، بەڵکوو خودا سەرپەرشتیکاری ئێوەیە، ئەو یارمەتیدەرو پشتیوانتانە، ئەو باشترین یارمەتیدەرە؛ وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَوْلاَكُمْ نِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ – الأنفال/٤٠﴾. هەر ئەویش سەرفرازیو سەرکەوتنی بۆ خۆیو پێغەمبەرو موسوڵمانان داناوە، دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ – المنافقون/٨﴾.

یەکێکیش لە دیاردەی یارمەتیدانی پەروەردگار بۆ خاوەن باوەڕان ئەوەیە: کە ترسو لەرز بخاتە دڵو دەروونی کافرانەوە، چونکە بڕوایان دامەزراوو چەسپاو نیە، هەر ئەوەندەیە بەلاسایی کردنەوەی کوێرانە شەریك بۆ خودا دادەنێن، بت لە دارو بەرد دەتاشنو دەیانپەرستن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُواْ بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا﴾ ترسو لەرز دەخەینە دڵو دەروونی ئەوانەی کە خوانەناسنو گومڕاو کافرن، چونکە ئەوان شەریك بۆ خودا دادەنێن، بەردو دارێك دەکەنە هاوبەشی خودا، کە هیچ بەڵگەو دەلیلێك نە عەقڵیو نە هەستی (حسی)یان بەدەستەوە نیە، کە شیاوی پەرستن بن! تاکە بەڵگەیان لەپەرستنی ئەو بتانەدا لاسایی کردنەوەی باوكو باپیریانەو دەڵێن: ئێمە بیستوومانە ئەوانە ئەو بتانەیان پەرستووە، ئێمەش شوێن ئەوان دەکەوین ﴿بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّهْتَدُونَ – الزخرف/٢٢﴾.

دامەزرانی بیروباوەڕیان لەسەر ئەو بنەما پڕوپووچانە سەردەکێشێ بۆ پشێوی دڵو دەروونیان، شێوانی عەقڵو هۆشیان، تێکچوونی بیرو بۆچوونیان، پەیدابوونی ترسو لەرز لە دڵیاندا وێڕای ئەو بەدبەختییەی جیهانیان ﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ﴾ لە

قیامەتا جێگایان دۆزەخە، بەهۆی ستەمکارییان لە خودی خۆیان، بەهۆی کوفرو بێدینیو سەرپێچی کردنیانەوە.

﴿وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ﴾ دۆزەخ خراپترین پەناگەو شوێنی مانەوەی ستەمکارانە.

**ئەوەی لەو ئایەتە وەردەگیرێ:**

١- ترساندنو هەڕەشەکردن لە موسوڵمانانە کە بە هیچ جۆرێك گوێڕایەڵی کافرو خودانەناسان نەبنو بتمانەیان پێ نەکەن، چونکە هەرچەندە ئایەتەکە دەربارەی جەنگی ئوحود نازڵ بووە، بەڵام وەکوو دەڵێن: عیبرەت بە گشتی وشەکەیە، نەك بە تایبەتی هۆیەکەی.

٢- کافرو خودانەناسان هەمیشە لە قەلەقیو پشێواوی دانو ترسو لەرز لە دڵیاندا جێگیرە.

## هۆکارەکانی تێکشکانی موسوڵمانان لەجەنگی ئوحوددا

﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا

تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ

ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٥٥﴾ ﴾.

ئەمجار دێتە سەر روونکردنەوەی هۆیەکانی تێشکانی موسوڵمانان لە جەنگی ئوحوداو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ سوێند بە خودا بێگومان پەروەردگارتان بەڵێنی خۆی بەسەرکەوتنتان بەسەر دوژمندا هێنایە دی ﴿إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ﴾ ئەوکاتەی دەستتان کرد بە لێدانو کوشتنیانو قەلاچۆتان دەکردن یە پشتیوانی خوداو یارمەتیدانی ﴿حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ﴾ تا ئەوکاتەی ترسو خۆف دایگرتن، لەشەڕ ترسانو ئەژنۆتان شکا ﴿وَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ﴾ کێشەتان تێکەوت دەربارەی جێبەجێ کردنی فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لێتان بوو بە مقۆ مقۆ لەسەر کەژی ئوحود، هەندێکتان وتتان: با شوێنی خۆمان بەجێ بێڵینو فریای تالان بکەوین، هەندێکیشتان وتتان: بێ ئەمری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناکەین، لە سەنگەرەکاندا تەنها عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر (کە سەرکردەی تیرهاوێژەکان بوو) لەگەڵ چەند هاوەڵێکیدا مانەوەو ئەوانی تر شوێنەکانی خۆیان چۆڵ کرد ﴿وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ﴾ سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەرتان کرد دوای ئەوەی پێتان خۆش بوو ئەوەی دیتان! کە بریتی بوو لە تێکشکانی سوپای کوفرو سەرکەوتنی موسوڵمانانو هەبوونی دەستکەوتو غەنیمەت، ئیتر وادەی پەروەردگار بە یارمەتیدانتان دوا کەوت.

عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: پەروەردگار بەڵێنی پێدان کە ئەگەر خۆڕاگر بنو تەقوای خودا بکەن، خودا بە پێنج هەزار فریشتەی نیشانەکراو کۆمەکییان پێ دەکا، کە تیرهاوێژەکان سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەریان کردو سەنگەرەکانی خۆیان جێهێشتو بۆ تالان گرتن هاتنە خوارێ، یارمەتیدان بە فریشتەیان لێ سەندرایەوە، ئایەتی ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم﴾ ناردە خوارێ، خودا بەڵێنی خۆی

بەجێ هێنا، سەرکەوتنی پیشاندان، بەڵام کە سەرپێچیان کردو فەرمانی پێغەمبەریان شکاند تووشی ئەو تێشکان و ناڕەحەتییەی کردن.

ئەمجار پەروەردگار هۆی کێشەو سەرپێچی تیرهاوێژەکان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا﴾ هەتان بوو هەڵپەی دونیای بوو؛ دەیویست دەستکەوت و غەنیمەتی دەست بکەوێ!

ئیبنو مەسعود دەفەرموێ: هیچ کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر هەستی بەوە نەدەکرد کە دونیاویستیان تێدابێ! تا رۆژی جەنگی ئوحود هات! ئەوانە ئەو کەسانە بوون کە لەسەر کەژەکە سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵ کردو بەهیوای گرتنی تالان هاتنە خوارێ. ﴿وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الآخِرَةَ﴾ هەشتان بوو، پاداشی رۆژی قیامەتی دەویست، پابەندی فەرمانی پێغەمبەر بوون و شوێنی خۆیان جێ نەهێشت و لەگەڵ سەرکردەکەیان؛ عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر مانەوە، خالیدی کوڕی وەلیدو عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل – کە ئەوسا کافر بوون – هەڵمەتیان بۆ بردن دەوریان گرتن ئەوانەی مابوونەوە لەسەر کەژەکە شەهیدیان کردن!!

لۆمەکە روو دەکاتە ئەوانەی سەرپێچیان کردو شوێنی خۆیان بەجێ هێشت و هەڵاتن، روو ناکاتە ئەوانەی کە لەشوێنی خۆیان مانەوەو تا شەهید بوون بەرگرییان کرد، ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ﴾ دوای ئەوە کە لەسەرەتاوە سەرکەوتن، بەهۆی شکاندنی فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شکان و کوژران و هەڵاتنی بەسەردا هێنان ﴿لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بیروباوەڕتان تاقی بکاتەوە، بۆ خۆتان بزانن، تا چ رادەیەك خۆڕاگرن – چونکە خودا بۆخۆی پێش ئەوەش ئەوەی دەزانی – ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ﴾ دڵنیا بن خودا لەو تاوانەتان خۆش بووە، بەو ژێرکەوتن و تاقیکردنەوەتان شوێنەواری تاوانەکانتانی سڕییەوە، تۆبەی لێ قبووڵ کردن، پەشیمانیتان وەرگیرا، ﴿وَاللّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ خودا خاوەن فەزڵ و بەزەییە بۆ موسوڵمانان، چونکە بەهۆی تاوانەکانیانەوە لە بێخ دەری نەهێنان! وێ دەچێ هۆیەك لە هۆیەکانی بەزەیی هاتنەوەی خودا پێیان زۆری ژمارەو هەبوونی چەك و پێویستیاتی جەنگ لەلای کافرەکان، لەهەمان کات دا کەمیی موسوڵمانان و نەبوونی

پێویستیاتی جەنگ لایان، ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلاَ تَلْوُونَ عَلَى أحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ﴾ یادی ئەوە بکەنەوە کە کافرەکان بۆ سەر کێوەکە هەڵیان بڕینو راویان نان، ئێوە بە شکاوی راتان دەکردو ئاوڕتان لەکەس نەدەدایەوە، لەبەر ترسو لەرزو پەشۆکاوی خۆتان دەتان قوچاند، پێغەمبەرتان بەجێ هێشت بوو، لە دواوە بانگی دەکرد دەیگوت: هەڵمەیەنو وەرنەوە بۆلای منو لە دەورم کۆببنەوەو خۆڕاگرنو بەرگری بکەنو هەڵمەت بەرن؛ ئەوە من پێغەمبەرم ماوم، نەکوژراوم، کەسێك بگەڕێتەوەو هەڵمەت بەرێ بەهەشت بۆخۆی حەڵاڵ دەکا.

بەلام ئێوە گوێتان پێ نەداو نەگەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ).

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (بانگ کردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بریتی بوولەوە دەیفەرموو: ئەی بەندەکانی خودا هەڵمەیەن بگەڕێنەوە، بۆ گۆڕەپانی جەنگو شەڕ بکەن!

﴿فَأَثَابَكُمْ غُمَّاً بِغَمٍّ﴾ پەروەردگار سزای دانەوە بە غەمو نارەحەتیو تێشکان بەهۆی ئەو غەمو نارەحەتییەی خستانە دڵی پێغەمبەرەوە کە سەرپێچی فەرمانتان کرد. کەوابێ (خەم)ی یەکەم تێشکانی موسوڵمانانو لە کیس چوونی دەستکەوتو کوژرانی هاوەڵانی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ)، (خەم)ی دووەم کە هۆی خەمی یەکەمە، ئەو نارەحەتییەیە کە تووشی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو بەهۆی سەرپێچی کردنی ئێوەوە بۆ فەرمانەکەی!! خودا تووشی ئەو ناخۆشیو چەرمەسەرییەی کردن بۆ ئەوەی ئارام بگرنو لەسەر نارەحەتیو خۆ بۆ ناخۆشی رابگرن، لە ناو رووداوەکاندا قاڵ ببن!

﴿لِّكَيْلاَ تَحْزَنُواْ عَلَى مَا فَاتَكُمْ﴾ تا خەفەت بۆ ئەوە نە خۆن کە لە کیستان چووە لە سوودو تالانی جەنگ.

﴿وَلاَ مَا أَصَابَكُمْ﴾ هەروەها خەفەت نەخۆن بۆ ئەو زەرەرو زیانەی تووشتان بووە، ئەو ئێشو ئازارەی پێتان گەیشتووە لە دوژمنەوە وەکوو کوژرانو برینداریو ماندوبوونو برسیایەتیو تینوایەتی!

﴿وَاللّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ خودا ئاگاداری کردارو هەڵوێستو مەبەستانە لەسەر چاکەو خراپە پاداشتان دەداتەوە!

چونکە کردەوە هۆکارە بۆ سەرکەوتنو، هەل بەدەست هێنانە بۆ تەواوبوونی ئیمانو خۆڕازاندنەوەیە بە رەوشتی بەرز.

﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا﴾ ئەمجارە خودا دوای ئەو غەمو ناڕەحەتییە تووشیان هات، پاش ئەو ترسو لەرزەی پێتان گەیی، ئەمنو ئاسایشو ئارامی ناردە سەر دڵتان، تەنانەت ئەوەندە لە دوژمنتان بێ باك بوون وەنەوز دایگرتن، وەنەوزیش لەکاتی وادا نیشانەی بێ باکیو ئەهەمیەت پێ نەدانە، بۆ ئەوەی ئەو سەرشۆڕییە بشۆنەوە، رەدی ئیعتیبار بکەنەوە، ئەو زەبوونیو لاوازییە تووشی هاتوون نەمێنێ.

وەکوو لە سوورەتی ئەنفالدا هاتووە دەربارەی غەزای بەدر دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ – الأنفال/١١﴾.

ئەبو طەڵحە دەفەرموێ: من یەکێك بووم لەوانە کە لە جەنگی ئوحودا وەنەوز دایگرتم! تەنانەت شمشێرەکەم لەدەست دەکەوتە خوارێو هەڵم دەگرتەوە: چەند جارێك ئاوا شمشێرەکەم لەدەستم دەکەوتە خوارێو هەڵم دەگرتەوە[١].

﴿يَغْشَى طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾ بەڵێ، وەنەوز (خەوەنوچکە) کۆمەڵێکی داپۆشین کە بریتی بوون لە کۆچکەرانو زۆربەی یاریدەدەران واتە: ئەوانەی بڕوا قایمو گەشبین بوون، یان کۆمەڵی یەقینو خۆڕاگرو پشت بەستوو بە خودا بوون، ئەوانەی کە دڵنیا بوون لەوەی پەروەردگار یارمەتی پێغەمبەرەکەی دەداو ئاواتەکانی بۆ دێنیتە جێ. ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ کۆمەڵێکیش خەمی خۆیان هەموو شتێکی لە بیر بردبوونەوە، ترس دڵو دەروونی داگیر کردبوون، چونکە بتمانەیان بە یارمەتیدانی خودا نەبوو، بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەبوو ئەوانە کۆمەڵی دووڕووەکان بوون، وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیو مەعتەبی کوڕی قوشەیرو هاوەڵانیان، ئەوانە وەنەوزیان نەدەهاتێو لە ترسو دڵە

---

[١]- ئیمامی بوخاری ئەم رووداوەی لە (المغازی)دا ریوایەت کردووە.

ڕاوکـەو قەلەقـدا بـوون، هـیچ کۆڵێکیـان بـە پێغەمبـەرو ئایینـەوە هـەڵ نـەگرتبوو!!﴿يَظُنُّـونَ بِاللّـهِ غَيْـرَ الْحَـقِّ ظَـنَّ الْجَاهِلِيَّـةِ﴾ گومانیـان بـە خـودا دەبـرد بەشێوەیەکی ناڕەوا، دەیانگوت: ئەگەر ڕاست بوایە موحەممەد پێغەمبەرە کافرەکان ئاوا زاڵ نەدەبوون بەسەریدا!!! ئەم جۆرە وتانە جگە لـە کـافرو موشـریك کەسـی تـر نایڵـێ: ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ الأَمْرِ مِن شَـيْءٍ﴾ بڕێکیـان بـە بڕێکیبانیـان دەگوت: ئایا ئێمە لە سەرکەوتن‌و سەرفرازی بەشمان هەیە؟ پرسیارەکەیان بەشێوەیەکی ئینکاری ئامێز بوو، مەبەستیان ئەوەبوو کەهیچ سـەروەرێکیان دەسـت ناکـەوێ، ئـەوان وا لـە ئایین تێگەیـشتبوون کـە هـەر دەبـێ خـاوەن ئیمـان سـەرکەون، پێیـان وابـوو ئـایین‌و سەرکەوتن دوو شتی لێك جیا نەبووەوەن! بەڕاستی گومانەکەیان هەڵەبوو، چـونکە یارمەتیـدانی خـودا بـۆ پێغەمبـەرانی ئـەوە ناگەیـەنێ کـە دەبـێ هـەموو کاتێـك پـەیڕەوانی پێغەمبـەرانی سـەرکەون، بـەڵکوو ڕێ دەکـەوێ ژێـر دەکـەون، کاتێـك پەیڕەوی یاسایی سروشتیان نەکردبێ، بەڵام هەموو کاتێ کۆتای زێڕین‌و سـەرفرازی دوا ڕۆژی بۆ تەقواکارانە. ئەمجار ڕستەیەکی تێهەڵکێشی هێنـاو فـەرمووی: ﴿قُـلْ إِنَّ الأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ﴾ پێیان بڵێ: هەرکارێك ئەنجام دەدرێ، ئەوە بە گـوێرەی داب‌و نـەریتی خودایەو بە پێی یاسای ئەو هەڵدەسوڕێ!! لـە ئاکـامی پەیوەنـدی هـۆو هۆکـار (علـه معلـول)وە دێتـەجێ. سـەرکەوتن‌و هەڵسـوڕانی کاروبـار هـەمووی بەدەسـتی پـەروەردگارە، کـەس ڕایـەی ناکـەوێ بـەهی خـۆی بزانـێ، خـودا یارمـەتی بەنـدە موخلیصە باوەڕدارەکانی دەدا، وەکوو بەڵێنی داوەو دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُـلِي – المجادلـة/٢١﴾. یـان دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّ جُنـدَنَا لَهُـمُ الْغَـالِبُونَ – الصافات/١٧٣﴾.

ئەو کۆمەڵە خودانەناس‌و دووڕووانە ﴿يُخْفُونَ فِي أَنفُسِهِم مَّا لاَ يُبْـدُونَ لَـكَ﴾ لـە دڵی خۆیاندا بیروباوەڕێکیان شاردۆتەوە کە ناوێرن بۆتۆی ئاشکرا بکـەن؛ ئـەوان کـە پرسیارت لێ دەکەن‌و دەڵێن: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾ دەڵێن: کە سەرکەوتن‌و زاڵبوون بەدەست خوداو بەندە ڕاستگۆکانی بوایە وەکوو موحەممەد دەیڵێ: کە کاروبار بەدەست خودایـەو سـەرکەوتن بـۆ خۆشەویـستانیەتی، ئێمـە ئـاوا

ژێر نەدەکەوتین؟! ئەو هەموو موسوڵمانە نەدەکوژران، ئەگەر موحەممەد بەڕاستی پێغەمبەر بوایە، ئاوا ژێر نەدەکەوت؟ ئەمجار پەروەردگار بیروبۆچوونەکەیان رەت دەکاتەوە بەوە کە هەموو ئیش‌و کارێك لە بوونەوەردا بە گوێرەی سوننەتی خودا هەڵدەسوڕێن، ئەومیان لە بیر خۆ بردۆتەوە کە سەرکەوتن بە کۆمەکی ئەو دێتە جێ‌و تێشکان بەهۆی سەرپێچی موسوڵمانان پەیدا دەبێ! ئەوەشیان لە بیر خۆ بردۆتەوە: کە تەمەنی هەموو ئادەمیزادێك ماوەیەکی دیاری کراوی هەیەو پاش‌و پێش ناکا! بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد کە وەڵامیان بداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَى مَضَاجِعِهِمْ﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە لەماڵی خۆشتان بوونایە ئەوانەی کوژرانیان لە زانستی خودادا دیاری کراوە، دەهاتنە ئەم شوێنی کوژرانەیان‌و گیانیان دەردەچوو، ئەم دەشتە دەبووە شوێنی لە خوێندا گەوزانیان.

بە کورتی ترس، قەزاو قەدەر ناگێڕێتەوە، تەگبیر بەرامبەری تەقدیرو نەخشەکێشانی خودا ناکا، ئەوانەی کوژرانیان بۆ نووسراوە دەبێ بکوژرێن ئەگینا زانیاری خودا دەبێتە نەزانی!! ئەوانەی کوژران، بۆیە کوژران چونکە ئەجەلیان هاتبوو! بەگوێرەی نەخشەی (لوح المحفوظ) بوو. ﴿وَلِيَبْتَلِيَ اللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾ پەروەردگار ئەو تێشکانەی تووشی موسوڵمانان کرد بۆ تاقیکردنەوەی وورەی خاوەن باوەڕان‌و دەرخستنی رێژەی ئیخلاص‌و خۆڕاگریان. ﴿وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ﴾ بۆ لێك جیاکردنەوەو لێك هەڵاواردنی ئەوەی لە دڵیاندایە لە نەخۆشی‌و ختوکەدانی شەیتان‌و پاك کردنەوەی دڵ، تا بڕواو ئیمانتان بگاتە ترۆپکی یەقین. ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ خودا پێویستی بە تاقیکردنەوە نیە، هیچ شتێکی لێ ون نابێ، لە ئاسمان‌و زەویدا شتێك نیە خودا پێی نەزانێ! خودا زانایە بە نهێنی دڵ‌و دەروون، دەزانێ چییان تێدایە. ئەوەی بۆیە کرد، تا چۆنیەتی ئەو خەڵکە دەربخا، هەڵوێستی موسوڵمانانی خۆڕاگرو راستاڵ لە هەڵوێستی دووڕوو فێڵباز جیا بکاتەوە..﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا﴾ ئەو تیرهاوێژانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە جەنگی ئوحوددا

فەرمانی پێ کردن کە لەشوێنی خۆیاندا جێگیر بن‌و نەجوڵێن بۆ ئەوەی پارێزگاری پشتەوەی سوپای ئیسلام بکەن، شوێنی خۆیان بەجێ نەهێشت مەگەر بە ختوکەی شەیتان نەبێ بۆیان، شەیتان ئەو کارەی پێکردن‌و هەڵی خەڵەتاندن، چونکە بڕێ تاوانیان کردبوو.

واتە: ئەوانەی ڕۆژی جەنگی ئوحود شکان‌و هەڵاتن، هۆی تێشکان‌و هەڵاتنیان بە گوێکردنی شەیتان‌و ئەنجامدانی تاوان‌و خراپەکاری بوو کە پشتیوانی پەروەردگاری لێ بڕین‌و ورەیان ڕووخاو قوچاندیان. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە گوناه گوناه کێش دەکا، هەروەکوو چۆن تاعەت کردن تاعەت دەهێنێ! بەڵاو موصیبەت – کە شکان لە شەڕدا بۆخۆی بەڵایە – دەبنە ئاکام‌و بەروبوومی خراپە.. وەکوو چۆن پاداشی چاکەش چاکەیە.

ئەمجار ﴿وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ بێگومان خودا لە تاوانی هەڵاتنەکەتان خۆش بوو، لە قیامەتدا سزاتان نادا لەسەری!

سزای دونیاشیان کە ئاوا تێشکان‌و تووشی دەردی سەری هاتن ئەوە تاقیکردنەوەو پاڵفتەکردن‌و لە بۆتەدان بوون بۆیان ئەمەش دەرگای هومێدیان لێ دەکاتەوەو ناهێڵێ نائومێدیی دڵ‌و دەروونیان داگرێ ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ بێگومان خودا زۆر بە بەزەییە، دوای تۆبەکردن لە تاوانی گەورەو بچووکی بەندەکانی خۆش دەبێ، زۆر لەسەرخۆو هێدییە، تۆڵەی دەس بەجێ ناسێنێ! بەڵکوو مۆڵەتی بەندەی دەدا بۆ ئەوەی بە خۆیدا بچێتەوە، هەڵەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە چارەسەری کەم‌و کورتییەکانی بکا.

## هەڵنانی موسوڵمانان بۆ جەنگ‌و جیهادو وریابن دووڕووەکان کاریان تێ نەکەن

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُوا۟ غُزًّى لَّوْ كَانُوا۟

عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْۗ وَٱللَّهُ يُحْيِۦ وَيُمِيتُۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەم ئایەتانەی پێشوودا موسوڵمانانی لە وەسوەسەی شەیتان ترساند، ئەو وەسوەسەیەی کە موسوڵمانانی تووشی ئەو تێشکانە گەورەیە کرد، لە جەنگی ئوحودا!

ئەمجار لێرەدا دێ موسوڵمانان لە وەسوەسەو دەنەدەنەی درۆو کۆمەکیکارانی شەیاتین دەترسێنێو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي الأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان! ئەچن وەکوو ئەو بێ بڕوایانە بکەن: کە هەرکاتێ براو خزمو کەسو کاریان بچووونایە بۆ سەفەرێك، یان بۆ غەزایەكو بمردنایە؛ یان شەهید بکرانایە، دەیانگوت: ئەگەر نەچوونایەو لەلای ئێمە بمانایەوە نەدەمردنو شەهید نەدەکران! ئەی خاوەن بڕوایان ئێوە! بیروباوەڕی وا پەیڕەو مەکەن، بیروبۆچوونی وا لە دڵو دەروونی خۆتان دەربکەن، ئەوە سەرلێشێوانە بەرامبەر بە ئایینو گومڕاییە لە بیروباوەڕدا، چونکە ژیانو مردن بە دەست پەروەردگارن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلاً – آل عمران/١٤٥﴾.

پێویسته ئەوە بگوترێ: کە قەزاو قەدەر ئادەمیزاد ناچار ناکەن بۆ کردنی کارەکانی، چونکە قەزا (قضاء) بریتییە لە پەیوەندبوونی زانستی خودایی بە شتێکەوە، زانستو دەرخستنو ئاگاداری بەسەر شتدا کاریگەری تێدا ناگەیەنێ! قەدەریش بریتییە لە پەیدابوونی شت بە گوێرەی زانیاریو زانست. زانستی خودا هەمیشە لەگەڵ ڕووداوەکاندا چوون یەکە، هەرگیزاو هەرگیز ڕووداو بە پێچەوانەی زانستی خوداوە نابێ، ئادەمیزادیش لە کردارەکانیدا ئازادە بەڵام تواناو ویستو زانستی سنووردارەو ڕەها نیە، کەمو کوڕی تێدایە، جاری وا هەیە دەیەوێ ئیشێك بکا، کارێك پەسەند دەکا کردنی ئیشەکە، یان پەسەندکردنی کارەکە بە ویستو ئیرادەی خۆیەتی!! بەڵام ئادەمیزاد بە هیچ جۆرێك زانیاری بە کاتو شوێنو هۆیەکانی مردن نیەو نازانێ بە چ دەمرێ!

هەرکاتێ شتەکە ڕوویدا ئەو کاتە دەزانێ کە ئەو شتە بووە، جا کە ئینسان بڕوای بە یارمەتیدانی خوداو پاڵپشتی کردنی هەبێو بزانێ ئەو یارمەتی دەدا بۆ پەیڕەوکردنی هۆیەکانی خۆشبەختی، بە لەبەرچاو گرتنی ئەو هۆکارانەو وێڕای بڕوا دەروونییەکە، ئیتر لە کارەکانیدا چوستو چالاك دەبێو لە تێشکانو هەڵەنگوتن دوور دەکەوێتەوە!

کەواتە ئەی خاوەن باوەڕان! وەکوو ئەو خوانەناسانە مەبن کە دەربارەی مردوو کوژراوەکان ئەو جۆرە قسانەیان کردن.. ﴿لِيَجْعَلَ اللَّهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ﴾ بۆ ئەوەی سەرەنجامی ئەو جۆرە قسانە ببێتە داخو کەسەر لە دڵیانداو زیاتر بۆیان بە پەرۆش بن، ورەیان بڕوخێو پەشیمانی بنوێنن ئەگەر ئێوە پەیڕەوی ئەو خوا نەناسانە بکەن وەکوو ئەوان تووشی حەسرەت دەبن وەکوو ئەوان لە تێکۆشانو بەرنگاری کول دەبن!

پەروەردگار ئەو بیروباوەڕەی لەلای ئەو بێ بڕوایانە پەیدا کرد، بۆ ئەوەی زیاتر حەسرەتبار بنو، پڕ خەم بۆ مردوو کوژراویان بخۆن! بەڵام ئەوان نەزانو تێنەگەیشتوونو بەهەڵە چوون، چونکە ﴿وَاللَّهُ يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ خودا دەژێنێو دەمرێنێ.. واتە: دروستکردنو بەدیهێنان بەدەست خۆیەتی، لەناوبردنو مراندن بە ویستو فەرمانی ئەو دەبێ! کەس ناژیو کەس نامرێ بە ویستو ئیرادەی ئەو نەبێ!

تەمەنی کەس بەبێ ئیرادەو ڕەزامەندی ئەو لێی زیادو کەم نابێ ﴿وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خودا ئاگادارو بینایە بەو کردارو گوفتارەی ئەنجامیان دەدەن! هەرچی لە دڵتاندا شاردوتانەتەوە: لەو بیروباوەڕانەی کە کاریگەرییان هەیە لە گفتارو کردارتاندا، لای خودا نمایانە! هەوڵ بدەن دڵو دەروونتان پاك بكەنەوە لە وەسوەسەی شەیتانو دووڕووەکان، تا ئەو هەڵوێستانەی لە کافرەکان دەردەکەوێ لە ئێوە دیاری نەدا.

لێرەدا ئەمە هەڕەشە کردنە لە موسوڵمانان کە لە گوفتارو کرداردا لاسایی خودانەناسان نەکەنەوە!

ئەمجار مزگێنی بەختەوەریی دوا ڕۆژ دەدا بەو کەسانەی کە لە ڕێگای خودادا دەکوژرێنو دەمرنو دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ ئەگەر ئێوە لە ڕێگای خودادا بکوژرێن یان بمرن، ئەوە لێخۆشبوونی خودا بەدەست دێنن، لێخۆشبوونی خوداو ڕەحمەتو بەزەیی ئەو باشترە لەو ماڵو دارایییەی کافرەکان تێیدا ڕادەبوێرن، چونکە دونیا سێبەری بێ بەقایەو پایەدار نابێ.

مردن لە ڕێگای خودادا مردنێکە لە چوارچێوەی ئەو کارانەی کە ئینسان دەیانکا لە کاری چاکە کە خودا شارەزایی بۆ کردوونو پێیان ڕازییە، جەنگاوەر جاری وا هەیە لەکاتی شەڕدا دەمرێ بەهۆی ماندوبوون یان بەهۆی ئەنجامدانی کردەوەیەك شەڕ داخوازییەتی، ئەمە پێی دەگوترێ مردن لە ڕێگای خودادا...!

بەکورتی: ئەو لێخۆشبوونەی کە گوناهی جەنگاوەرانی موسوڵمان دەشواتەوە، ئەو ڕەحمەتەی پلەی جەنگاوەران بەرز دەکاتەوە، زۆر باشترە لەو ماڵو دارایییەی ئەو هەڵپەکەرانە هەوڵی بۆ دەدەنو خۆی بۆ ماندو دەکەن! کەوابێ جێگای خۆیەتی موسوڵمانان لێخۆشبوونی خودا بۆ خۆیان بەدەست بێنن، حەسرەتبار نەبن بۆ ئەوانەی لە ڕێگای خودادا دەمرنو دەکوژرێن چونکە ئەوەی لە دونیا دەستیان دەکەوێ زۆر باشترە لەوەی کە لە دونیادا تێیدان.

﴿وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لإِلَى الله تُحْشَرُونَ﴾ ئێوە ئەگەر بە هەر هۆیەك بمرنو لەناو بچن، بێگومان هەر بۆلای خودا دەگەڕێندرێنەوەو حەشرتان بۆلای ئەوە، هەرکەسە

بە گوێرەی کردەوەی خۆی پاداش‌و سزای دەدرێتەوە؛ چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە.. جگە لە زاتی یەزدان داوا لە کەس ناکرێ بۆ پاداش‌و لەکەسی تریش ئومێدی لابردنی سزا ناکرێ!

مەبەست لە حەشر بۆلای خودا ئەومیە: کە لەو رۆژەدا کە حەشری ئادەمیزادی تێدا دەکرێتەوەو هەموویان لە دەشتی مەحشەردا چاوەڕوانی ئەوەن ئاخۆ خودا چ پاداشێکیان دەداتەوەو، هیچ شتێك نیە لەو چاوەڕوانییە مەشغوڵی بکا، لێی عەیان‌و نومایانە کە هەموو شتێك بۆلای خودا دەگەڕێتەوە، هیچ شتێك خودای لە بیر ناباتەوە بەلاّم ئادەمیزاد لەم دونیایەدا جاری وا دەبێ لە خودا غافڵ دەبێ‌و هەیبەت‌و جەلالی پەروەردگاری لە یاد دەچێتەوە، دەسەلاّت‌و گەورەیی خودای لێ ون دەبێ، چونکە مەشغوڵ دەبێ بە داکۆکی بەلاّو موصیبەت لەخۆی‌و دابین کردنی لەزەت‌و خۆشی بۆ خۆی، جا ئەگەر ئاکام‌و سەرەنجامی هەموو زیندوێك مردن‌و گەڕانەوە بێ بۆلای خودا، ئیتر خۆ خەریك کردن بە بەرنگاری کردنی هۆکاری مردن بێ سوودە، ئەوەی شیاوی ئادەمیزادی خاوەن عەقڵ‌و هۆشمەندە ئەوەیە: کە گرنگی بدا بە پاشەرۆژو خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو رۆژەو کارکردن بۆ خۆشبەختی‌و کامەرانی دوا رۆژ!!

## مامەڵەکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوەڵانیدا بە شێوەی نەرم‌و نیان‌و ڕاوێژ

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ (١٥٩) إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن

يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ ۗ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾.

لە ئايەتەكانی پێشوودا باسی ئەو شتانەی كرد كە سوود بەخشن لە هەردوو دونيادا؛ يەكێ لەو شتە هەرە خۆشانە ئەوەبوو كە عەفووی كردنو لەو هەڵەيان چاوپۆشی كرد، ئەمجارزێدە فەزڵی خوای دەنوێنێ كە مەدحی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەكا بەوەی كە چاوپۆشی لێ كردن، تووڕەيیو قسەی ڕەقی لەگەڵدا بەكار نەهێنان، بەڵكوو بە هێدیو لەسەرخۆیی هەڵسو كەوتی لەگەڵدا كردن، تەنانەت راوێژی لەگەڵدا كردن بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان! ئەمەش نەوپەڕی لوتفو هێدييەتیو هێمنايەتيەو رەحمەتێكی يەزدانييەو دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەهۆی رەحمەتی يەزدانەوە بوو، تۆ لەگەڵ هاوەڵەكانتدا ئەوەندە نەرمو نيانو لەسەرخۆو لێبوردە بووی! هەڵسو كەوت لەگەڵياندا قورئانی بوو ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ - القلم/٤﴾.

پێغەمبەر بۆخۆی لە فەرموودەيەكدا فەرموويەتی: «لا حلم أحب إلى الله من حلم إمام ورفقه، ولا جهل أبغض إلى الله من جهل إمام وخرقه» هيچ لەسەرخۆييەك لای خودا لە هێدیو هێمنی فەرمانڕەوا لای خودا خۆشەويستر نيە، هيچ نەزانیو كەللەڕەقی لای خودا لە تووڕەيیو نەزانی فەرمانڕەوا رق لێ بووتر نيە.

﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ﴾ ئەگە تۆ ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) توندو تيژ بويتايە، قسە ڕەقو تووڕەو هەڵسو كەوت ناشيرين بوويتايە لەگەڵ هاوەڵانتدا، دەوريان چۆڵ دەكردی! لێت دوور دەكەوتنەوە، ئاوا ئاپوورەيان نەدەدای، ئەوەندە مل كەچو پابەندی فەرمانت نەدەبوون، نەتدەتوانی رێگای هيدايەتيان نيشان بدەیو قسەت لە ناوياندا كاريگەر نەدەبوو!!

چونكە مەبەست لە ناردنی پێغەمبەران، راگەياندنی شەريعەتی خودايە بە ئادەميزاد، ئەم مەبەستەش وەدی نايە تا خەڵكەكە وەگريان نەبنو خۆشيان نەوێن!

ئەمەش کاتێ وەدی دێ: کە پێغەمبەرەکە هێدیو لێبووردە بێ، لە تاوانو هەڵەی هاوەڵانی چاوپۆشی بکا، لە باتی هەڕەشە ئامۆژگاریو لە شوێنی توورەبوون زەردەخەنە بەکاربێنێ! پیاوەتیو چاکەیان لەگەڵدا بکا. کەوابێ ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! لێیان خۆش ببەو داوای لێخۆشبوونیان لە خودا بۆ بکە!

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ هەڵسو کەوت لەگەڵیاندا هەڵسو کەوتی راوێژکارانە بێ، بەردەوام بە لەسەر پەیڕەوکردنی راوێژ بۆ ئەو کاروبارانەی کە پێویستیان بە راوێژ هەیە، چونکە رام کردنی موسوڵمانان لەسەر راوێژ سوودی گرنگی دەبێ بۆ پاشەڕۆژی فەرمانڕەوایی موسوڵمانان،لەم رووەوە کە رای گەلو کۆمەڵ زۆر جار لە هەڵەوە دوورە! ئەو تەنگژەو ئاستەنگانەی تووشی نەتەوە دەبێو خەتەر دەخاتە سەر ڕەوڕەوەی بەرێوەچوونو هەڵسوڕانی کاروباری، ئەگەر بدرێتە دەست تاکە کەس – هەرچەندە عاقڵو کارامەش بێ – لەوانەیە نەتوانێ خۆیو گەل رزگار بکات، وڵات تووشی کارەساتی سامناك دەکا! جا لەبەرە ئەوەی کە راوێژ وادەبێ را جیایی تێدا بێ – بەتایبەتی کە راوێژکارەکان زۆر بوون – پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی کردووە کە بە کردەوە ئەم دیاردەیە پەیڕەو بکا لە واقیعی عەمەلی ژیانی خۆیدا ئەنجامی بدا، ئەوەبوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) مەشۆرەتی بە هاوەڵانی دەکرد بە ئەو پەڕی لەسەرخۆییو ئارامییەوە گوێی بۆ رای هەموو کەسێك دەگرت، رایەکی بەسەر رایەك هەڵدەبژاردو ئەوی بیزانیایە کە بەرژەوەندی گەلو کۆمەڵی تێدایە پەسەندی دەکردو بە گوێرەی توانا کاری بۆ دەکرد!!!

بێگومان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە ژیانی خۆیدا کاری بە راوێژ کردووە، راوێژی بە زۆربەی موسوڵمانان دەکرد، بۆ کاری گرنگو نهێنییەکانی دەوڵەتیش راوێژی بەچەند کەسێکی عاقڵو هۆشمەندو لێهاتوو دەکرد!

رۆژی بەدر راوێژی بە موسوڵمانان کرد، کاتێك کەزانی قوڕەیشییەکان لە مەککە دەرچوونو خەیاڵی شەڕ کردنیان هەیە، هەتا کۆچەرییەکانو یاریدەدەران رای

خۆیان دەرنـەبڕی، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) هەڵوێـستی خـۆی دیـاری نەکرد.

ڕۆژی غەزای ئوحودیش ڕاوێژی پێ کردن، هەروەها لـه هـەموو کـارێکی گرنگـدا ڕاوێژی پێ دەکردن، مەگەر نیگای لەو بارەیەوە بۆ بهاتایە!! چونکە ئەگەر نیگای بۆ بهاتایە دەبوایە بەبێ سێو دوو جێبەجێی بکردایەو پێویستی بـە ڕاوێـژ نـەدەبوو. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ژیـانی خۆیـدا بنـەماکانی ڕاوێـژی دانـەنان، چـونکە ئـەو بنەمایانـە بـە گـوێرەی ڕۆژگـارو شـوێنو بـاری کۆمەڵایـەتی گـەلان دەگـۆڕێن، هـەروەها ئەگـەر بنـەمای بـۆ دابنانایـە دوایـی موسـوڵمانان دەیـانکرد بـە ئایینو هەوڵیان دەدا لە هەموو کاتو زروفێکدا ئەنجامیان بدانایە، ئەی ئەوە نـەبوو هـاوەڵان پـاش کۆچـی دوایـی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەربـارەی هەڵبژاردنی حەزرەتی ئەبوبەکر وتیان: پێغەمبەر هەڵیبژاردووە بۆ ئایینمـان، چۆن ئێمە پێی ڕازی نابین بۆ دونیامان؟؟ مەبەستیان ئـەوە بـوو کـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی نەخۆشییەکەیدا فـەرمانی پـێ کردبـوو کـە پێـشنوێژی بـۆ موسوڵمانان بکا!!

بەڵام بەداخەوە پاش ماوەیەك جێنشینو فەرمانڕەوایانی موسوڵمانان پـەیڕەوی ڕێبازی ڕاوێژیان نەکردو بـۆ دانـانی جێنـشین ڕاوێـژیان بـەکار نـەهێنا!! بەتایبـەتی سەردەمی ئەمەوییەکانو لەوەدوا، کە جێنشینی بوو بە دانانو داگیر کردن، زانایانی ئایینیش لەم بارەوە پشتگیرییان کردنو لەم پێـشێل کردنـەی مـافی گـەل بـێ دەنـگ بوون. تا وای لێ هات زۆربـەی موسـوڵمانان وای بۆچـوون کـە دەسـەڵات لـە ئیـسلامدا ملـهوڕیو تـاکڕەویو ئیـستیبدادییە، ڕاوێـژکردن کـارێکی ئیختیارییـە! بـەڵام ئەمـە دوورە لـە ڕاسـتیەوە، چـونکە قورئـان مـەدحی موسـوڵمانانی بـەوە دەکـرد کـە کـاری گرنگ لە ڕێگەی ڕاوێژەوە چارەسەر دەکەن فـەرمانی بـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ) کردووە کە ڕاوێژ لەگەڵ هاوەڵانیدا بکا.

**ڕاوێژ چەند سوودێکی هەیە:**

۱- ئەندازەی عەقڵو تێگەیشتنو دڵسۆزیی هەموو کەسێك بۆ بەرژەوەندی گشتی دەردەخا.

٢- عەقڵ و هۆشی ئادەمیزادان لێك جیاوازن بیروبۆچوونیان جیایە، زۆرجار رای بەجێ لە کەسێکی رەشۆکی و بۆرە پیاوەوە سەر هەڵدەدا کە زانا و لێهاتوویەك پەی بەو رایە نابا!!

٣- راو بۆچوونەکان سەرو بن دەکرێن و رای گونجاو پەسەند دەکرێ و کاری پێ دەکرێ.

٤- لە راوێژدا یەکیەتی و یەکرایی پەیدا دەبێ لەسەر کارێکی تایبەتی، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێکی تایبەتی، هەر بۆیەشە کۆبوونەوە ئایینیەکان وەکوو جەماعەت و جومعەو حەج تەشریع کراون بۆ ئەوەی یەکیەتی موسوڵمانان تیایاندا رەنگ بداتەوە؛

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «ما تشاور قوم إلا هدوا لأرشد أمرهم» هیچ گەل و کۆمەڵێك راوێژ ناکەن مەگەر باشترین رێگای ژیانی خۆیان دەدۆزنەوە.

ئەبو هورمیرە دەڵێ: کەسم نەدیوە بە ئەندازەی هاوەڵانی پێغەمبەر راوێژ بەیەکتری بکەن!!

﴿فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر دوای راوێژ و راگۆڕینەوە دڵت هاتە سەر جێبەجێ کردنی کارێك، ئەوە پشت بە خودا ببەستەو شانی بەر بدە، بەڵام بۆ هەموو کارێك پێویستە هۆکارەکانی لەبەرچاو بگرێ، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: «إعقلها ثم توكل» وشترەکە ببەستەوەو تەوەکولیشت بە خودا بێ!

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە هەرکاتێ مەرجەکانی عەزیمەت بۆ کردنی کارێك هاتنە دی – کە راوێژ یەکێکە لە مەرجە گرنگەکانی – پێویستە ئەو کارە دەستی پێ بکرێ و هەوڵی ئەنجامدانی بدرێ و سستی تێدا نەکرێ!!

نهێنی ئەمەش ئەوەیە کە دوای عەزیمەت و سووربوون و بڕیاردان لەسەر کارێك ژێوان بوونەوەو پاشگەزبوونەوە ڕاڕایی لە دڵ و دەرووندا دروست دەکا، خاوەنەکەی وا لێ دەکا خەڵکی متمانەی پێ نەکەن لە قسەو کردەوەیدا، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسە فەرمانڕەواو سەرۆك دەوڵەت بێ.

واتە: دوای راوێژو بڕیاردان نابێ تەمبەڵی لە ئەنجامدان بکرێ!! هەر بۆیەش پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە بۆ غەزای ئوحود راوێژی کردو بڕیاری شەڕ کردنیان داو تەشریفی رۆیشتەماڵەوەو خۆی بەستو چەکی هەڵگرت، گوێی بۆ رای ئەوانە نەگرت کە پەشیمان بوونەوەو وتیان: با لە مەدینە دەرنەچین! چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی وابوو دوای راوێژ کردنەکە ئیتر دەست بەکارەکە کراوەو پاشگەزبوونەوە ناگونجێ.

بەمەش ئەوەی لە موسوڵمانان گەیاند: کە هەموو کردەوەیەك کاتێکی دیاری کراوی هەیە، کاتێ راوێژ تەواو بوو بڕیار درا ئیتر کاتی ئیشە، وە هەرکاتێ سەرۆك و پێشەوا کە بەگوێرەی راوێژ دەستی بە کار کرد، نابێ لێی پاشگەزبێتەوەو واز لەو شتە بڕیاردراوە بهێنێ، هەرچەندە بشزانێ کە راوێژ پێ کراوان لە بۆچوونەکەیاندا بەهەڵەچوون، وەکوو غەزای ئوحود پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیزانی کە راوێژکاران بەهەڵەچوون!! بەڵام هەر لەبەر رێزگرتنی راوێژەکە، لە ئەنجامدان و جێبەجێ کردنی بۆ شەڕ چوونەکە ژێوان نەبووە!!

سەیر ئەوەیە تا ئێستا پیاوە سیاسیە دەست رۆیشتووەکان، پیاوە سەربازەکانی قسە رۆیشتووی جەنگ لە وڵاتە خاوەن ژیارو شارستانییەکانی جیهاندا پابەندی ئەم یاساو داب و نەریتەن و کردوویانە بە رێبازو دەستوور بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری هاوڵاتیان و بە هیچ جۆرێك ئەوەی دوای راوێژ چەسپا ئیتر هەڵوەشاندنەوەی نیە!

تەنانەت گەورە رامیارییەکانی ئینگلیز دەڵێن: سیاسەت هەرکاتێ رای لەسەر دراو چەسپا، پێویستە پەیڕەو بکرێ و هەڵوەشاندنەوەی مەمنووعەو گەڕانەوە لێی هەڵەیە.

﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن و هیوایان پێیەتی، یارمەتییان دەداو شارەزاییان دەکا بۆ هەر شتێك سوودمەند بێ بۆیان.

ئایەتەکە بە راشکاوی ئادەمیزادە بەرپرسیارەکان هەڵدەنێ کە پشت بە خودا ببەستن و لە هەموو شتێکدا بۆلای ئەو بگەڕێنەوەو روو لەکەسی تر نەکەن!

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە مانای تەوەکول ئەوە نیە؛ کە ئادەمیزاد دەست لە خۆی بەربداو کاریگەریی خۆی پاشگوێ بخا وەکوو برێ نەفام تێی گەیشتوون!

خۆئەگەر وابێ فەرمان کردن بە راوێژ لەگەڵ فەرمان بە تەوەکول دژ دەوەستن! بەڵکوو تەوەکول لەسەر خودا پێویستە وەڵێ دەبێ وێڕای لەبەرچاو گرتنی هۆکارە رواڵەتیەکان بێ، بەلاّم نابێ بە دڵو بە گیان پشت بەئەو ئەسبابانە ببەستێو لایەنی تەوەکول لەسەر خودا پاشگوێ بخا! دەبێ لە هەموو کارێك وێڕای دەستو بازووی خۆیو دەستەبەر کردنی هۆکارە مادییەکان، تەوەکولیشی بە خودا بێ!

لە بارەی بژیوو هەوڵدان بۆ ژیان پێویستە وێڕای پشت بەستن بە خودا هەوڵو کۆششی خۆی ئەنجام بدا، وەکوو پەروەردگار فەرمان بە ئادەمیزادان دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ – الملك/١٥﴾ لەبارەی رامیاریو کاروباری جەنگ، پەروەردگار فەرمان بە موسوڵمانان دەکا کە هۆشیارو بە ئاگاو حەزەربنو پێداویستی پێویست بۆخۆیان دابین بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن بەرامبەریی دوژمنیان بکەن. وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ – النساء/٧١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ – الأنفال/٦٠﴾.

دەربارەی بەرژەوەندی دوونیاو قیامەتیش دەفەرموێ: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى – البقرة/١٩٧﴾.لە هەموو شتێکدا تەوەکول دەبێ وێڕای کۆششو تێکۆشان بێ؛ یان کۆشش وێڕای تەوەکول بێ.

ئەحمەدو تیرمذیو نەسائیو ئیبنو ماجە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لَوْ أَنَّكُمْ تَوَكَّلْتُمْ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا» ئەگەر ئێوە تەوەکولتان لەسەر خودا بێ وەکوو پێویست، ئەوە خودا رزقو رۆزیی ئێوە دەدا وەکوو چۆن باڵندە بەیانیان هێلانەکەی بەجێ دێڵێ بە برسیایەتی، ئێواران دەگەڕێتەوە بە تێروپڕی.

ئیبنو حیببان لە صەحیحی خۆیدا فەرموودەی ئەو پیاوە دەگێڕێتەوە کە هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ویستی وشترەکەی نەبەستێتەوە،

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا وشترەکەم ببستمەوە؟ یان بەرەڵلای بکەمو تەوەکولم هەبێ؟ پێغەمبەر فەرمووی: «إعقلها ثم توكل» بیبەستەوەو تەوەکولیشت هەبێ!

ئەمجار پەروەردگار کاتێ سەرچاوەی سەرکەوتنی راستەقینەمان نیشان دەداو دەفەرموێ: ﴿إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ فَلاَ غَالِبَ لَكُمْ﴾ ئەگەر خودا بیەوێ یارمەتیتان بدا لە جەنگی ئوحودا وەکوو لە جەنگی بەدردا یارمەتیدان ئەوە هیچ کەسێکی تر ناتوانێ بەسەرتاندا زاڵ ببێ! خۆ ﴿وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ﴾ ئەگەر بیەوێ ریسواتان بکاو بتان شکێنێو یارمەتی خۆی ببڕێ لێتان بەهۆی سەرپێچی کردنی خۆتانو دووبەرەکی نێوانتانو بەگوێ نەکردنتان بۆ پێشەواکەتان وەکوو لە رۆژی ئوحودا بەسەرتاندا هات، ئەوە هیچ کەس لە ئادەمیزاد ناتوانێ سەرکەوتنتان بۆ دەستەبەر بکا. ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ دەی با موسوڵمانان هەر پشت بە خودا ببەستنو وێڕای دەستەبەر کردنی ئەسباب، تەوەکولیشتان بە خودا بێ.

## دادپەروەریی پێغەمبەر لە دابەشکردنی دەسکەوتەکانی جەنگو ئیصلاحخوازیی لەناو هاوەڵانیدا

﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَن بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ

بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ (١٦٤)﴾.

﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ کولەبیو موقاتیل دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو تیر ئەندازانە هاتۆتە خوارێ کە لە جەنگی ئوحودا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر کەژەکە دایمەزراندن، بەڵام ئەوان بەمەبەستی تالانی گرتنەوە شوێنەکەیان بەجێ هێشتو وتیان لەوە دەترسێین کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەجەنگاوەران بڵێ: هەرکەسێك شتێکی گرت، ئەوە بۆ خۆیەتیو ئیتر تالانو دەسکەوتی شەڕ بەسەر هەموو جەنگاوەراندا دابەش نەکا؛ هەر وەکوو چۆن لە غەزای بەدردا بە ویستی جەنگاوەران دابەشی نەکرد: تەنانەت کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لۆمەی تیرهاوێژەکانی کردو پێی گوتن: من پێم نەگوتن: ئێوە ئەو شوێنە بەجێ مەهێڵن تا فەرمانی منتان بۆ دێ؟!

وتیان: (ترکنا بقية اخواننا وقوفا) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: نەخێر ئێوە پێتان وابوو: کە ئێمە بەخیلی دەکەینو دەسکەوتەکانی جەنگ دابەش ناکەین. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دادپەروەری پێغەمبەرو گرنگی پێدان بە کۆمەڵو کۆمەڵگای ئیسلام دەچەسپێنێو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ ناشێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە خیانەت بکا! چونکە خودا پێغەمبەرانی بە دوور گرتووە لە گوناه کردن، ناهێڵێ شتێك شایەنی پلەو پایەی ئەوان نەبێ لێیان روو بدا، چونکە پێغەمبەرایەتی پلەو پایەیەکی بەرزو بەرێزە لەگەڵ ئەنجامدانی تاوانو کاری پڕوپووچدا ناگونجێ.

﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ کەسێك خیانەت بکا شتێك لە غەنیمەتو دەستکەوتەکانی جەنگ باشقول بدا، رۆژی قیامەت کێشی دەشتی مەحشەری

دەکەین‌و ئەو شتە کە پاشقولی داوە بەسەر شانیەوەیەو تەحەممولی بەرپرسیاریی کردەوەکانی خۆی دەکا!!

بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندو تەهدیدێکی سامناکە، پێویستە موسوڵمانان زۆر گرنگی پێ بدەن!

بوخاری‌و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر ڕۆژێک هەستا لە ناوماندا وتارێکی بۆ داین‌و باسی خیانەتی کردو، زۆر گرنگی پێدا.. ئەمجار فەرمووی: «ألاَ لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ».

«لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ[1] فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ».

«لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ[2] تَخْفِقُ فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي. فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ».

ئەم فەرموودانە هەموویان قورسایی تاوان‌و سامناکی کارەکە دەنوێن‌و ئەوە دەگەیەنن کە هەموو کەس خۆی بەرپرسیاری تاوانی خۆیەتی وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ أَلاَ سَاء مَا يَزِرُونَ – الأنعام/٣١﴾.

وەرگرتنی هەر شتێك بە ناڕەوا دەبێتە هۆی سزادانی خودایی‌و پەروەردگار لەسەر هەموو شتێك پاداش‌و سزای هەیە. هیچ شتێکی لێ هوون نابێ.

﴿ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ ئەمجار هەموو ئادەمیزادێك پاداشی کردەوەکانی خۆی وەردەگرێتەوە، ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە: کە چاکەکارو خراپەکار چوون یەك نین‌و دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللّهِ كَمَن بَاء بِسَخْطٍ مِّنَ اللّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئایا کەسێك تەقواکار بێ عەودالی ڕەزامەندیی خوا بێ وەکوو ئەو کەسە وایە: کە خراپەکارەو خودا لێی ناڕازییە؟!

[1] - حمحمە: واتە دەنگی ئەسپ بەبێ حیلە.

[2] - رقاع: قەباڵە نامە یان هەر شتێك حەقی ماڵ‌و دارایی تێدا نووسرابێ.

دیارە ئەم دوو جۆرە ئادەمیيە چوون يەك نین، ئەوەی شوێن ڕەزامەندی خودا دەكەوێ و كردار چاكە، ئەوە شیاوی ڕەزامەندیی خوداو پاداشی باش و ئەمین بوون لەسزای دۆزەخە، كەسێكیش شیاوی غەزەبی خودابوو، كەس ناتوانێ ڕزگاری بكا لێی و ڕۆژی قیامەت جێگاو شوێنی حەوانەوەی ئاگری دۆزەخە. وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُونَ – السجدة/١٨﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ – ص/٢٨﴾.

ئەمجار قورئان دێ پلەو پایەی ئادەمیزادان دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللَّهِ﴾ بۆ هەموو كەسێك، چاك یان خراپ، پلەوپایەی تایبەتی هەیە، بەهەشتییەكان لە بەهەشتدا هەركەسە شوێنی جیای خۆی هەیە. دۆزەخییەكان لە جەهەنەم دا هەركەسە شێوو چاڵی خۆی هەیە، هەركەسە بە گوێرەی كردەوەی خۆی سزاو پاداشی دەدرێتەوە!

بەرزترین پلەوپایەی بەهەشت جێگاو مەكانی پێغەمبەری ئیسلامە (دروودی خوای لەسەر بێ)، نزمترین و ناخۆشترین شوێن لە دۆزەخدا شوێنی دووڕووەكانە، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا – النساء/١٤٥﴾.

چونكە دووڕوو زیانی بۆ خوداپەرستان لە زیانی كافرو خوانەناسی ئاسایی زیاترە بۆیە سزایان توندترە ﴿واللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ پەروەردگار بیناو ئاگادارە بە كردەوەی ئادەمیزادان، هیچ شتێكی لێ هون نابێ، بە هەموو كردەوەیەكیان دەزانێ.

ئەمجار پەروەردگار منەت دەكا بەسەر ئادەمیزادان و فەزڵ و گەورەیی خۆی بۆ موسوڵمانان بەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ بێگومان خودا منەتی كرد بەسەر موسوڵمانانداو فەزڵ و گەورەیی خۆی بۆ ئادەمیزاد نواند: كە فروستادەی خۆی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) نارد بۆ سەر هەموو ئادەمیزادو جنۆكە! فروستادەی خودا ئەم ڕەوشتانەی تێدایەو ئەم كارە گرنگانەشی لە ئەستۆدایە:

یەکـەم: ئـەو زاتـە لـە جـۆری ئـادەمیزادەو لـە نـەوەی ئیبراهیمـەو بـەرەی ئیسماعیله، ئەمەش زیاتر پاڵ بـە گەلو نەتەوەکەیەوە دەنـێ کە شوێنی بکەونو ئیمانی پێ بهێنن! بتمانـە بـە پەیامەکەی بکەن، زیاد لەوەش بـەهۆی ئـەو زاتـەوە گەلو نـەتەوەی قورەیش فەزڵو ڕێزیان بەدەست هێناوە وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ – الزخرف/٤٤﴾.

تایبەتمەنـدی کردنـی (ذیکـر) بۆیـان زیـادە سـوودمەندی دەگەیـەنێ بۆیـان، هەرچەندە پێغەمبـەری ئیسلام بۆسـەر هـەموو کـەس نێـردراوە وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ – الأنبياء/١٠٧﴾.

دووەم: ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾ نیشانەو بەڵگەی دەسـەڵاتو بـە توانـایی خودایـان بـۆ دەخوێنێتـەوە، تـاکو تـەنیایی خودایـان بـۆ دەچەسـپێنێ! زانـاییو صـیفاتەکانی پەروەردگاریان بۆ روون دەکاتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ – آل عمران/١٩٠﴾.

سێهەم: ﴿وَيُزَكِّيهِمْ﴾ پاکیـان دەکاتـەوە لـە پـۆخڵاوتی بتپەرستی، لـە پـشێوی بیروباوەڕی سەردەمی نەزانی، بیروباوەڕی ئەوە: کـە گوایـە بتـەکانیان ڕۆڵـی خۆیـان هەیـە لـە بوونـەوەردا، پێغەمبـەری دڵسۆز فـاڵ گرتنـەوەو بیروبـاوەڕی پڕوپـووچو نەشـازیان لـە کـۆڵ دەکاتـەوە، دەیانخاتـە سـەر بیروباوەڕی راسـتو فیکـری ڕۆشـنو شارسـتانیەتو ژیـاری پێشکەوتوو، دامەزرانـدنی دەوڵـەتو کـارگێڕیو رامیـاری لـەو جۆرەی کە ئەمڕۆ جیهانی پێشکەوتوو شـانازی پێوە دەکا. فـەرمانیان پـێ دەکا بـە چاکەو نەهیان لێ دەکا لە خراپە، بۆ ئەوەی دڵو دەروونیان پاك بکاتەوە لـە پـیسو پۆخەڵی بیروبۆچوونی کوفر ئامێز.

چوارەم: ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ قورئانو فـەرموودەی خۆیـان فێـر دەکا، زاناو نووسەرو پزیشكو سەرکردەو مامۆستای زانستو زانیارییان تێدا هەڵدەکەوێ. ﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ﴾ هەرچـەندە پـێش هـاتنی ئـەم پێغەمبـەرە (درووودی خـوای لەسـەر بـێ) لـە گـومڕاییو نـەزانیو سەرلێشێواویدا بـوون، گـەلو نەتەوەیەکی نەخوێندەوار بوون، بە هۆی نووری ئیسلامو زانستی قورئـانو عـەقڵو

هۆشی راستاڵانە گەلو نەتەوەیەکی شارستانیو پێشکەوتووخوازیان لێ پەیدا بوو. پێشبڕکێیان لەگەڵ گەلە خاوەن ژیارەکاندا کردو پێشیان کەوتن!

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە زانستی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بوون بە کلیلی دەرگای زانستو زانیاری هەمە جۆر بۆ گەلی عەرەبی دواکەوتوو، پاشان بۆ هەموو گەلانی جیهانو مێژووش ئەم راستییەی سەلماندووە.

## بڕێ هەڵەی موسوڵمانان لە جەنگی ئوحودداو بڕێ نەتواری ناشیرینی دووڕووەکان

﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ

لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلْ فَٱدْرَءُواْ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾ ﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە عومەری کوڕی خەتابەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: موسوڵمانان ڕۆژی ئوحــوود تۆڵــەی ڕۆژی بــەدریان لێ کرایــەوە، چــونکە ڕۆژی بــەدر فیدیــەیان وەرگرت، لە تۆڵەی ئەم تاوانەیاندا ڕۆژی ئووحود حەفتا کەسیان لێ کوژرا، هاوەڵانی پێغەمبەر شکان‌و هەڵاتن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دانی پێشەوەی شکا سەری شکاو خوێن بە دەموچاویدا هاتە خوارێ، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە بەشێکە لە زنجیرەی ئەو ئایەتانەی هەڵەی موسوڵمانەکان دەردەخەن، ئەو هەڵانەی کەلە غەزای ئوحوودا تێی کەوتن..! لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی ڕوون کردەوە کە دووڕووەکان خیانەت‌و غەدرو چڵێسییان پاڵ پێغەمبەر دەدا، خودای مەزن بە درۆی خستنەوەو پێغەمبەری لەو ڕەوشتە ناشیرینانە تەبرئە کرد.

لەم ئایەتانەی دوایشدا پەروەردگار هەڵەی موسوڵمانەکان – پێش ڕووداوی ئوحوودو دوای ئەویش – بیروبۆچوونی ناڕاستیان‌و قسەو کردەوەی هەڵەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا﴾ واتە: ئێوە بۆخۆتان هۆی ئەو بەڵاو تێشکانەن کە تووشتان هاتووە، چونکە ئێوە پێکێشیتان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد کە لە شاری مەدینە دەرچێ بۆ شەڕ، یان بۆخۆتان سەنگەرەکانی سەرشاختان چۆڵ کردو شوێنە ستراتیجییەکەتان بەجێ هێشت.

ئیمامی عەلی دەفەرموێ: چونکە فیدیەتان لە دیلەکانی بەدر وەرگرت پێش ئەوەی ئیزن بدرێن!

هەمزە لە (أَوَلَمَّا) بۆ تەقریرو تەقریعە؛ واتە: ناشێ بۆ ئێوە ئەی کۆمەڵی دووڕوو کۆمەڵی جەنگاوەر! کە ئیعتیزار بگرن ﴿قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا﴾ بەسەرسامییەوە بڵێن ئەم تێشکانە لە پای چی‌و بۆچی تووشی ئێمە بوو، لە کوێوە ئەم بەڵایەمان هاتە سەرو حەفتا کەسمان لێ شەهید بوو؟!

پێتان وانەبێ چونکە موسوڵمانن – تەنانەت سەرپێچی فەرمانی خوداش بکەن خودا هەر سەرتان دەخا، لەگەڵ ئەوەیشا ئێوە لە رۆژی بەدردا دوو ئەوەندەتان زیان بە ئەوان گەیاند. حەفتا کەستان لێ کوشتن، حەفتای ترتان لێ بە دیل گرتن، ئەوجا لە جەنگی ئوحوودا ئەو هەموو دەردەسەریەتان تووش هات. ﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنْفُسِكُمْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەوەی بەسەرتان هات بەهۆی تاوانی خۆتانەوە بوو، بەهۆی دەرچوونتان بوو لە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)؛ کاتێك پێی گوتن: شوێنی خۆتان جێ مەهێڵن! ئێوەی تیرئەنداز سەرپێچیتان کرد.

### جۆرەکانی سەرپێچی زۆر بوون:

دەرچوون لە مەدینە لە کاتێکدا رای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو هەر لە مەدینە بمێننەوە، کەچی رایەکەشتان لاوازبوو کێشەتان تێکەوت، سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەرتان کرد کە ئەو جێگایەی بۆی دانابوون بەجێتان هێشت. ئاشکراشە سزا ئاکامی کردارە، خودا وادەی سەرکەوتن‌و یارمەتیدانی پێدان بەمەرجێك تاوان نەکەن‌و فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەجێ بهێنن. ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ – محمد/٧﴾ دەی کە ئێوە یارمەتی خودا نەدەن واتە: پابەندی فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەبن، چۆن خودا یارمەتیتان دەدا؟ ﴿إِنَّ اللَّـهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگار بەتوانایە بۆ یارمەتیدانتان ئەگەر خۆگر بن‌و صەبرتان بێ، دەتوانێ یارمەتیتان لێ بگرێتەوە ئەگەر سەرپێچی فەرمانی بکەن‌و لێی یاخی بن، کەوابێ ئەوەی تووشتان هات لە ناڕەحەتی‌و کوژران‌و بریندابوون، سوچی خۆتان بوو!

ئەمجار پەروەردگار دڵخۆشی موسوڵمانان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ئەوەی کە رۆژی پێك گەیشتنی ئەو دوو سوپایە؛ سوپای موسوڵمانان‌و سوپای کوفر بەسەرتان هات هەمووی بە ئیزن‌و ویست‌و قەزاو قەدەری پەروەردگارە، لەئەمەشدا

حیکمەتێکی یەزدانی هەیە، هیچ شتێك نیە لە بوونەوەردا گەردنکەچی ویستو حیکمەتی خودا نەبێ.

﴿وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بەشێکیش لە دیاردەی حیکمەتی خودا ئەوەیە: کە زانستو عیلمی خۆیو چۆنیەتی بۆ موسوڵمانان دەبخا، پێیان رابگەیەنێ: کە هێزو لاوازی ئیمانیان، خۆڕاگریو صەبرو بێ صەبرییان دەزانێ!

﴿وَلْيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُواْ﴾ تا دەری بخا کە ئاگاداری هەڵوێستی دووڕووەکانە، کۆمەڵی عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول کە سێ سەد کەس بوون لە رێگای گەڕانەوە.

﴿وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ قَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَوِ ادْفَعُواْ﴾ ئەو موونافیقانە ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن لە رێگەی خودادا شەڕ بکەن، یان بەرگری لە خۆتانو ماڵو منداڵو نیشتمانتان بکەن، ﴿قَالُواْ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالاً لاَّتَّبَعْنَاكُمْ﴾ دەیانگوت: ئەگەر بزانین ئێوە لەم غەزایەدا تووشی شەڕ دێن شوێنتان دەکەوتینو لەگەڵتان دەبووین! بەڵام ئێمە دڵنیاین کە تووشی شەڕ نابن، کەوابێ بۆچی خۆمان ماندوو بکەین؟ ئەم هەڵوێستەیان بەڵگەیە لەسەر نوغرۆ بوونیان لە دووڕوویی دا مەبەستیان چەواشە کردنی راستییەو فیڵو تەڵەکەو ونکردنی راستییەکانە، چونکە هاتنی سوپای کافرەکان بۆ ئوحوودو دەرچوونی موسوڵمانەکان لە مەدینەو رۆیشتنیان بەرەو ئوحوود بۆ بەرەنگاریو رووبەڕوو بوونەوە، بەڵگەی حاشاهەڵنەگرن لەسەر بەرپابوونی شەڕو کوشتو کوشتار.

دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولو هاوەڵە دووڕووەکانی کە ژمارەیان سێ سەد کەس بوون لە رێگای چوونیان بۆ ئوحوود لەگەڵ سوپای ئیسلامدا، گەڕانەوە بۆ ئەوەی وورەی موسوڵمانەکان بڕوخێ هاتۆتە خوارێ! ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلإِيمَانِ﴾ ئەمانە بە گوتنی ئەم قسەیەیان کە دەیانگوت: ئەگەر بمانزانیایە شەڕ بەرپا دەبێ شوێنتان دەکەوتین!؛ ئەوان بەم قسەیان لە دووڕیانی کوفرو ئیمان دان، بەڵام لە کوفرەوە نزیکترن، چونکە ئەوان بە گەڕانەوەیان لە رێگا بە مەبەستی رووخاندنی وورەی موسوڵمانان خۆیان دەخەنە خانەی کوفرەوە بە خاوەن باوەڕ حلێب نین، کە وابێ کەسێك خۆ لە جیهادو

شەڕکردن لە ڕێگەی خودا بدزێتەوەو بەرگری نەکا لە وڵاتو بەرەنگاری دوژمن نەبێتەوە! بە موسوڵمان حسێب ناکرێ! چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ – الحجرات/١٥﴾. ئەو دوو ڕووانەی دەیانەوێ بە چەپو گوپو چاوو راو، حەقیقەتی خۆیان بشێرنەوە. ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ بەدەم شتێك دەڵێن: پێچەوانەی ئەوەیە کە لە دڵیاندایە.. جا خۆ وەنەبێ خودا بەم حەقیقەتەیان نەزانێ! بەڵکوو ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾ خودا زۆر زاناترە لە خۆیان بەو هەڵوێستو مەبەستانەی کە دەیشێرنەوە. ئەمە هەڕەشەیەکی توندە لێیانو جاڕدانێکی ئاشکرایە کە دووڕوویی دادیان ناداو سوودیان پێ ناگەیەنێو دوای کڵاوی بابردوو کەوتوون!

﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾ ئەوانەی دووای تەواوبوونی جەنگی ئوحوود دەربارەی ئەوانەی کوژرا بوون دەیانگوت: ئەگەر پەیڕەوی ئامۆژگاری ئێمەیان بکردایەو قسەی ئێمەیان ببیستایە کە پێمان گوتن: دانیشن، مەچن بۆ شەڕو لەگەڵ پێغەمبەر دەرنەچوونایە؛ ئاوا نەدەکوژرانو لە ناو نەدەچوون! ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەوان ئامۆژگاری هاوەڵەکانیان کردووە کە بگەڕێنەوەو نەچن بۆ شەڕ.

ئیبنو جەریری طەبەری لە سوودییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بە هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو ئوحوود کەوتەڕێ، بەڵێنی سەرکەوتنیشی پێدابوون، بەمەرجێ خۆڕاگر بن! کاتێ بەڕێ کەوتن لە ڕێگا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بە خۆیو سێ سەد کەسەوە گەڕایەوە، ئەبو جابیری سەلەمی دوایان کەوتو بانگی لێ کردن، وتی: بگەڕێنەوە ئێمە بەجێ مەهێڵن! عەیبە مەڕۆنەوە، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە شەڕ دەبێ بەجێمان نەدەهێشتنو شوێنتان دەکەوتین.

ئەمجار خودا ڕەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ فَادْرَؤُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەگەر لەماڵەوە دانیشتن پیاو لە

کوژران‌و مردن دەپارێزێ، ئێوە ئازا بن مردن لە خۆتان دوور بخەنەوە؛ واتە: دەبێ ئێوە نەمرن! دڵنیا بن مردنتان بۆ دێ، تەنانەت ئەگەر لە ناو قەصرو باڵەخانەشدا بن! دە ئەگەر راست دەکەن مردن لە خۆتان مەنع بکەن..!

**پلەو پایەی شەهیدان‌و تێکۆشەران لەڕێگەی خودادا**

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ

﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو حاكیم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: كاتێك براكانتان لە جەنگی ئوحودا شەهید بوون، پەروەردگار گیانەكانیانی خستنە ناو باڵندەی سەوزەوەو دەیانبردنە سەر جۆگاو چۆمەكانی بەهەشتو لە میوەكانیان دەخواردو دەگەڕانەوە بۆلای قەنادیلی زێڕین لە ژێر سێبەری عەرش.

جا: كە ئەم جۆرە خواردنو خواردنەوەیان دەدرێتیو ئەم جێگا خۆشە دەبینن دەڵێن: خۆزگا برایانمان بیانزانیایە خودا چی پێ بەخشیوین بۆ ئەوەی پشتیان لە جیهاد سارد نەبێتەوەو كۆڵ لە شەڕ كردن نەدەن، پەروەردگار پێی راگەیاندنو فەرمووی: من لە جیاتی ئێوە پێیان رادەگەیەنمو فەرمووی:

﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ پێتان وانەبێ كە ئەو كەسانەی لە پێناو ئایینی خودادا كوژراونو مردوونو لە ریزی نەبوانن، چونكە ئەو شەهیدانە هەرچەندە بە رواڵەت لە دونیادا كوژراون؛ بەڵام لە راستیدا گیانەكانیان زیندووە، لەو دونیا رزقو رۆزیی دەچێژنو لەزەتو خۆشی دەگوزەرێنن خیتابەكە لەگەڵ پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) یان رووی خیتاب لە هەموو كەسە! واتە: ئەی ئەو كەسانەی قسەی دووروومەكان دەبیسن! پێتان وانەبێ كە ئەوانەی لە رێگای خودادا كوژراون، مردوونو پاداشی ئەو كردەوانەیان نادرێتەوە كە كردویانن؟ بەڵكوو ئەوانە زیندونو لە جیهانێكی تردانو لە خودا نزیكنو رزقو رۆزیی وەردەگرنو وەكوو چۆن زیندووانی دونیا خواردنو خواردنەوەیان هەیە، ئەوانیش دەخۆنو دەخۆنەوە، ئەمە جەخت كردنە لەسەر ئەوە كە ئەوانە زیندوونو نەمردوون، لای خودای خۆیانو لە خۆشیدان!

بوونیان لەکن خودا کە دەفەرموێ: ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ بوونی شوێنی تایبەتییە، نزیکی ڕێزو تەقدیرە ئەوپەڕی نزیکی دەگەیەنێ نزیکی شوێنو مەسافە نیە.

ئەو ژیانەی قورئان چەسپاندوویەتی بۆ شەهیدان ژیانێکی غەیبییەو چۆنیەتییەکەی نازانین، دەبێ قورئان چۆن هەواڵی پێداوە ئاوا بڕوامان پێی هەبێ. ئەو شەهیدانە کەیف خۆشن بەو نیعمەتو لەزەتە بەردەوامەی پێیان دراوە، ئەو زێدە ڕێزەی دراویانەتێ بەهۆی شەهید بوونەوە، هەروەها کەیف خۆشن بە تێکۆشانی برا جەنگاوەرەکانیان، ئەوانەی کە هێشتا شەهید نەبوونو لە ڕێگای خودادا دەجەنگێن. شوێن پێی شەهیدەکانیان کەوتوون، لە پێناو ئەو بەرنامەیەی ئەوان بۆی شەهید بوون، ئەوانیش پیادەی هەمان ڕێبازن. جا کاتێك ئەو نازو نیعمەتە دەبینن کە بۆیان دانراوە کە بریتیە لە ژیانی هەتا هەتاییو لەزەتو خۆشی هەمیشەیی کە بە هیچ جۆرێك غەمو ناخۆشی تێکەڵاو نابێ، نیتر ئەوەندەی تر خۆشییەکەیان زیاد دەکاو دڵخۆشو ڕووگەش دەبن.

﴿فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ﴾ خۆشحاڵو تەڕدەماخن بەو پاداشەی خودا پێی داون، خۆشحاڵن بەوە کە سات دوای سات ئەو نیعمەتانە تازە دەبنەوە، لە نێو نازو نیعمەتو ڕێزی خوداییدا دەگوزەرێنن، مزگێنی دەدەن بەوانەی لە دوایانەوەنو هێشتا پێیان نەگەیشتوونو لە ژیاندان، مزگێنی نازو نیعمەتی خودایان پێ دەدەنو بەوە دڵخۆشن کە هەمان نازو نیعمەت بۆ ئەوانیش ئامادەکراوە ئەوەشیان پێ دەڵێن: ﴿أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ کە ئەوانە ترسی ناخۆشی داهاتوویان نیەو خەمی شتی لە کیس چووی رابوردوویان نیە.

﴿يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ مزگێنی بە ڕێزلێگرتنی خودا دەدەن، ئەوەشیان پێ ڕادەگەیەنن کە پەروەردگار بە هیچ جۆرێ پاداشی چاکەی چاکەکاران بە فیڕۆ نادات!

هەرگیز موسوڵمانان کرێی کردەوەکانیان پاشگوێ ناخرێ ﴿الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ﴾ ئەو موسوڵمانانەی بەپیر بانگەوازی خوداو

پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتن‌و ئامادەباشی خۆیان دەربڕی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن، وێڕای ئەو هەموو نارەحەتیەی تووشیان بوو لە جەنگی ئوحوودا، سەرباری ئەو هەموو برینداری‌و ماندوبوون‌و شەکەتییەی چەشتوویانەو هێشتا ماندوویان نەحەسابووەوە خێرا بۆ غەزای (حەمرائولئە سەد) کە دوابەدوای غەزای ئوحوود بوو، خۆیان حازر کردو هەڵیان کوتایە سەر دوژمن، ئەبو سوفیان کە بەمەی زانی بە خۆی‌و لەشکرەکەیەوە هەڵهات‌و بەرەو مەککە گەڕایەوە!

﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ جا بۆ ئەوانەی کە خێرا بە پیر بانگەوازەکەیەوە هاتن‌و خوداپەرست بوون پاداشی گەورە هەیە، کە شیاوی ئەو خۆبەخت کردن‌و تێکۆشانەیان بێ، بە وشەی (مِنْهُمْ) ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ئەوانەی بە پیر بانگەوازییەکەیەوە هاتن ڕێزو پاداشەکەیان دەست کەوت، ئەوانی تر عوزریان هەبوو عوزرەکەیان پەسەند بوو ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ﴾ ئەو موسوڵمانانەی کە لە پاش غەزای ئوحوودو ساڵی دوایی واتە: لە پێش غەزای بەدری بچووك نەعیمی کوڕی مەسعوودی ئەشجەعی کە ئەوکاتە کافر بوو، پێی گوتن: ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ﴾ ئەی موسوڵمانەکان! ئەوە ئەبو سوفیان‌و جەماعەتەکەی لەشکریان لە ئێوە کۆکردۆتەوە، دەیانەوێ لە ناوتان بەرن، لێیان بترسن‌و شەڕیان لەگەڵ مەکەن، خۆتان تووشی فەوتان‌و لەناوچوون مەکەن، مەچنە دەرەوە بۆیان، بەڵکوو بەزەییان پێدا بێنەوە، ئەگەر پێشیان بگرن ئەتان کوژن.

ئیتر موسوڵمانەکان بە بیستنی ئەو هەواڵە نەك بترسێن‌و ورەیان بڕوخێ بەڵکوو ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَاناً﴾ حەماسیان هەستاو بیروباوەڕیان بەهێز بوو، خۆڕاگری‌و صەبرو ئارام‌و جەربەزەییان زیادی کردو پشتیان بە خودا بەست‌و ﴿وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ وتیان: ئێمە خودامان هەیە، خودا پشتیوانمانەو باشترین کەسێکە کە پشتی پێ ببەسترێ، ئیتر ئەوەندەی تر عەزیمەت‌و ئازایەتییان زیادی کردو خۆیان ئامادە کرد بۆ بەرەنگاری دوژمن‌و بیریان لە ئاکامەکەی نەکردەوەو، وتیان:

خودامان بەسە، هیچ باکمان لە زۆری لەشکری دوژمـن نیـە، خـودا سـەروکاری ئێمـە دەکا، باشترین پشت پێ بەستراوو یارمەتیدەرمانە.

رستەی ﴿حَسْبُنَا اللّـهُ وَنِعْـمَ الْوَكِيـلُ﴾ نـزاو پاڕانەوەیـە کـە موسـوڵمان لـە کـاتی تەنگانـەدا دەیڵـێ. ئیـبراهیم کاتـێ خـستیانە ئاگرەکـەوە ئـەو دوعایـەی خوێنـد، پێغەمبەری ئیسلامیش کاتێ هەواڵیان پێدا کە لەشکری دوژمـن لێـی کۆبوونەتـەوەو دەیانەوێ زیانیان پێ بگەیەنن ئـەم دوعایـەی خوێنـد، ئیبنـو مـەردەوەیهی لـە ئـەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: کە لە تەنگانەیەك کـەوتن بڵێن ﴿حَـسْبُنَا اللّـهُ وَنِعْـمَ الْوَكِيـلُ﴾. ئیبنـو ئـەبی دونیـا لـە عائیـشەوە دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) کـە تووشـی ناخۆشییەك دەهات دەستی موبـارەکی بەسـەرو ریـشی خۆیـدا دەهێنـاو دەیفـەرموو: ﴿حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾.

جا هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کـە ئـاوا خۆیـان تەسـلیم بـە خـودا کـردو ئـاوا پـشتیان پـێ بەسـت، هـەموویان هاوبەشـی هەڵمەتەکـەیان کـردو بەرەنگاری دوژمن بوونـەوە، ﴿فَانقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُـوءٌ وَاتَّبَعُـواْ رِضْوَانَ اللّهِ﴾ گەڕانەوە بە چوار دەستکەوت: نـازو نیعمـەتی خـودایی، فـەزڵو ڕێـزی خودا، زیان پێ نەگەیشتنیان، شوێنکەوتنی ڕێبازێك کە ڕەزامەندی خودای تێدابێو خوداش لێیان رازییە. کاتێك پـشتیان بـە خـودا بەسـتو چـوونە دەر بـۆ بـەرەنگاری دوژمن، پەروەردگار رازو مرازی بۆ بەجێ هێنان، ئەزیەتـدانی پیلانگێڕانـی لێ دوور خـستنەوە، قازانجیـان کـردو کـوژرانو برینـدارییان نـەبینی، شایانی ئـەوەن کـە بـە گوێڕایەڵی فەرمانی خـوداو پێغەمبـەر لەقەڵەم بـدرێن. کـە دەسـتەبەر بـوونی ئـەم ڕەوشتە بناغەی سەرکەوتنو خۆشبەختی دونیاو قیامەتە ﴿وَاللّهُ ذُو فَـضْلٍ عَظِـيمٍ﴾ خـودا خـاوەنی فـەزڵو گـەورەیی زێدەیـە! چـونکە بـە گـەورەیی خـۆی بیروبـڕوای پتەوکردن، تۆفیقی دان بۆ جیهاد کردنو، لە پیلانـی دوژمـن پاراسـتنی، خێروبێـرو قازانجیشی بەسەردا ڕشتن.

بەیهەقی لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: نیعمەتەکە ئەوەیـە: کـە ساغو سـەلامەت بـوون، فەزڵەکەش ئەوەیـە: کـە لـەو کاتـەدا کاروانێـك لـەو دەفـەرە

تێپەڕی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاڵاکانیانی کڕین و قازانجێکی باشی لێ کردو، قازانجەکەی بەسەر جەنگاوەراندا دابەش کرد.

ئەمجار پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءهُ﴾ ئەو ترساندنەی ئێوە لە شەیتانەوە بوو، ئێوەی ترساند لە گرۆهەکانی خۆی و وای خستە دڵ و دەروونتانەوە کە ئەوان واتە: (کافرەکان) خاوەن چەك و جەنگاوەری زۆرن، بەهەڵمەت و مەردو نەبەردن، نەچن بچن بەرەو رویان ببنەوە! ﴿فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ بەلام ئێوەی موسوڵمان پێویستە لە فڕوفێڵی شەیتان ئاگادار بن و، هیچی بەگوێ نەکەن. ئەگەر شەیتان شتێکی وای خستە دڵتانەوە، هیچ لێیان مەترسن و پشتان بە من قایم بێ و خۆ بخەنە پەنامەوە، من یارمەتیدەرو پەنادەرتانم. ئایەتی ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ ئایەتەکانی دوابیشی ئەم حوکمانەی لێ دەردەهێنرێ:

١- کەسێك لەبەرامبەر دوژمنی خوداو پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆگر بێ، تا دەکوژرێ شەڕ بکا، لای خودا پلەو پایەیەکی گەورەی هەیە.کە پلەوپایەی تایبەتی شەهیدانە، کە بەڕێزەوە لای خودا ژیان بەسەر دەبەن، شەهیدان زیندوون و نامرن و لەبەهەشت دان و رزق و رۆزییان دەدرێتێ. گیانیان وەکوو گیانی موسوڵمانانی سەر زەوی باقییە! هەرچەندە بەرواڵەت مردوون و لاشەکانیان لە ژێر گڵدایە بەلام لە راستیدا نەمردوون، ئەوانە زێدە ریزیان لێ دەگیرێ و بە رزق و رۆزی و نازو نیعمەت درێژە بە ژیان دەدەن، بەلام چ ژیانێك؟ هەر خودا بۆخۆی دەزانێ چۆنەو چۆن نیە، هەرلەکاتێ کوژرانیانەوە ئەو رزق و رۆزیی و پلەو پایەیان بۆ فەراهەم دەهێندرێ هەروەکوو ئەوە بڵێی ژیانی دونیا بۆیان بەردەوامە، بەلام بەشێوەیەکی خۆشتر.

ئەوەی زۆربەی موفەسیرەکان لەسەری کۆکن ئەوەیە: کە گیانی شەهیدان شتێکی ثابت و بەردەوامە، بەلام ژیانەکەیان شێوەیەکی تایبەتییە، جا یان هەر گیانەکەیان لە گۆڕدا بۆ دەگەڕێندرێتەوەو هەر لەوێشدا لەزەتیان پێ دەگا، یان رزق و رۆزی بەهەشتیان دەدرێتێ و بۆنی بەهەشت دەکەن و لەوێشدا نین! بڕێکیش دەڵێن: مانای وایە: ئەوانە شیاوی ئەوەن کە لە داهاتوودا رزق و رۆزیی بەهەشتیان

بدرێتێ! رای راست ئەوەیە کە گیانەکانیان لە ناو سکی باڵندەدایەو لەبەهەشتدا دەخۆن و دەخۆنەوە وەکوو لەوە پێش ئاماژەمان بۆ کرد.

٢- دەربارەی شتنی شەهیدو کفن کردنیان و نوێژ لەسەر کردنیان زانایان دوو رایان تێیدا هەیە. حەنەفییەکان دەڵێن: شەهید لە جلی خۆیدا کفن دەکرێ و نوێژی لەسەر دەکرێ، بەڵام ناشۆرێ بەمەرجێ موکەلەف و پاك بێ. بەڵام لەش پیس و بێ نوێژو خوێنداری زەیستان، ئەگەر شەهید بوون بەرای ئەبو حەنیفە دەشۆردرێن وەکوو چۆن منداڵ و شێت دەشۆردرێن. موحەممەدو ئەبو یوسف – دوو هاوەڵی ئەبو حەنیفە بوون – دەڵێن: ناشۆردرێن. بەڵگە لەسەر نەشۆردن و کفن نەکردنیان فەرموودەکەی جابیرە کە بوخاری لێیەوە دەگێرێتەوە دەفەرموێ: (إدفنوهم بدمائهم).

شافیعی و ئەحمەدو بەیهەقی و نەسائی دەڵێن: فەرمووی: (فزملوهم بدمائهم) مەبەستی رۆژی ئوحوودە کە نەی شۆردن، بەڵکوو حەفتاو دوو نوێژی لەسەر شەهیدەکان کرد. زۆربەی (فوقەها) دەڵێن: شەهید نە دەشۆردرێ نە کفن دەکرێ، نە نوێژی لەسەر دەکرێ، بەڵام پیسی و پۆخەڵی – جگە لە خوێن – دەبێ لەجەستەی لابرێ! چونکە چڵك و پۆخەڵی لە شەهیدەکەوە پەیدا نەبووە، ئاماژە بە فەرموودەی جابیر کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە لە گۆرنانی شەهیدەکانی ئوحوود بە خوێنەکانیانەوەو نەشۆردنی و نە نوێژی لەسەر کردن.

هەروەها زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی شەهید کە بە زیندووی راگوێزراو لە گۆرەپانی جەنگدا نەکوژراو ماوەیەك ژیا، دوایی کە مرد دەشۆردرێ و نوێژی لەسەر دەکرێ، وەکوو لەگەڵ عومەریان کرد، خوا لێی رازیی بێ. بەڵام کەسێك بە ستەم لێکراوی بکوژرێ، وەکوو ئەوانەی خەواریج کوشتیانن، یان رێگرو چەتە بیکوژن، ئەبو حەنیفەو ئەوری دەڵێن: هەرکەسێك ئاوا بەستەم بکوژرێ، ناشۆردرێ، بەڵام نوێژی لەسەر دەکرێ و هەروەها نوێژ لەسەر هەموو شەهیدێك دەکرێ.. جەماوەری زانایان دەفەرموون: دەشۆردرێن وەکوو شۆردنی مردوو، مەگەر ئەهلی حەرب بیکوژن.

بەڵام ئەگەر دوژمن لە ناکاو بەسەر دانیشتوانی گوندێکیان دا داو لە لانەو خانەی خۆیاندا کوشتنیانن ئەوانە هەرچەندە شەهیدن وەلێ دەشۆردرێن و کفن دەکرێن و نوێژیان لەسەر دەکرێ.

## دڵخۆشکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە دوای جەنگی ئوحوودو، رەتدانەوەی کافرەکان و رژدەکان و جیاکردنەوەی پاک و پیس لەیەکتری

﴿ وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ

﴿يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾﴾.

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٧٩) سوودی دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو ئومەتی خۆم بەسەردا رانوێندران وەکوو چۆن بەسەر ئادەمدا رانواندران، زانیم کێ ئیمانم پێ دێنێو کێ ئیمانم پێ ناهێنێ. ئەم قسە بەرگوێی دووڕووەکان کەوتەوە، گاڵتەیان پێ هات، وتیان: سەیرە، موحەممەد پێی وایە: دەزانێ کێ ئیمانی پێ دەهێنێو کێ بڕوای پێ ناکا، ئێمە لەگەڵ خۆینیو بڕوای پێ ناکەین، کەچی نامان ناسێ، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ!

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (١٨٠) زۆربەی راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە دەربارەی زەکات نەدەرەکان هاتۆتە خوارێ.

(عطیة) لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا کە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو ماڵە جوولەکانە هاتۆتە خوارێ کە رەوشتو نیشانەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیان شاردۆتەوە. مەبەستیش بە (بخل) شاردنەوەی ئەو زانیاریانەیە کە خودا پێی داون.

جا وەکوو ئاشکرایە سەرکەوتنی کافرەکان لە غەزای ئوحوددا‌و تێشکانو زەرەرمەندی موسوڵمانەکان، سەری کێشا بۆ ئەوەی مونافیقەکان ئەم ئاکامە ئیستیغلال بکەن، ئەوەبوو دەیانگوت: ئەگەر موحەممەد پێغەمبەر بوایە ئاوای بەسەردا نەدەهات، لێی نەدەکوژراو تێنەدەشکا! بەڵکوو ئەو داوای فەرمانڕەوایی دەکا بۆیە جارێك سەردەکەوێو دەمێك تێدەشکێ! هەوڵیاندا یارمەتی کافرەکان بدەنو موسوڵمانان لە بەرەنگاریو تێکۆشان سارد بکەنەوە. پێغەمبەر (دروودی

خوای لەسەر بێ) بەم هەڵوێستەی دووڕووەکان زۆر دلگران بوو، ئیتر ئەم ئایەتانە نێردرانە خوارێو غەمو نارەحەتی لە دڵی پێغەمبەردا نەماو دڵی ئارامی گرت. هەروەکوو چۆن کاتێك کافرەکان روویان لە ئیمان هێنان وەرگێڕاو تانەیان لە قورئانو شەخصی پێغەمبەر خۆیدا. ئایەتی ﴿وَلاَ يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلّهِ جَمِيعًا – يونس/٦٥﴾. هاتە خوارێو غەمو نارەحەتی لە دڵی پێغەمبەردا نەهێشت. یان ئایەتی ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أَسَفًا – الكهف/٦﴾. کە ئەمیش بوو بە غەمڕەوێنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ).

جا هەر بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەروەردگار فەرمووی: ﴿وَلاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ﴾ با هەڵوێستی ئەو کافرانە تۆ غەمناك نەکا، ئەی پێغەمبەر! با سەرپێچی کردنو کێشەو بەرەو یارمەتیدانی خوانەناسان بۆ کوفر، تۆ دلگران نەکا، ئەو هاشو هوشەی ئەبو سوفیانو دانیشتوانی مەککەو دووڕووەکان ئەنجامی دەدەن با کار لەدڵی تۆ نەکا.

﴿إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ اللّهَ شَيْئاً﴾ بێگومان ئەوان ناتوانن زیان بە خۆشەویستانی خودا بگەیەنن، زیان بە پێغەمبەرو هاوەڵانی ناگەیەنن! ﴿يُرِيدُ اللّهُ أَلاَّ يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الآخِرَةِ﴾ ئەوانە زیان بە خۆیان دەگەیەنن، جەنگ لەگەڵ خوداو پێغەمبەر دەکەن، خودا دەیەوێ کەریسوایان بکا، بێ بەشی نازو نیعمەتی رۆژی قیامەت بن، لەوێدا هیچ بەشو باریان نەدرێتێ؛ سەرباری ئەوەش ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ سزای گەورەو سامناکیان دەدرێ چەندییەتو چۆنیەتی ئەو سزایە – خودا نەبێ – کەس نایزانێ، پەروەردگار لەسەر کردەوەی خراپی خۆیان سزایان دەداو ستەمیان لێ ناکا. بەڵکوو ئەوان بۆخۆیان زوڵمیان لە خۆیان کردووە، بەوە کەرێبازی کوفریان هەڵبژاردووەو خۆیان گومڕا کردووەو، یارمەتی گرۆهانی کوفر دەدەنو، دژی موسوڵمانان دەجەنگێن، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ – الفاطر/٤٣﴾. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە نابێ پێغەمبەر گرنگییان پێ بداو لێیان بترسێ، نموونەی ئەمە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قَالُواْ آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ –

المائدة/ ٤١﴾. جا وەنەبی ئەم حوکمە تایبەت بێ بە ئەبو سوفیانو دانیشتوانی مەکەو دووروەکان، بەڵکوو ئەمە حوکمێکی گشتیەو چەسپاوەو هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە جیاتی ئیمان کوفر هەڵدەبژێرن، لە جیاتی خوداپەرستی شتی تر دەپەرستن.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْكُفْرَ بِالإِيمَانِ لَن يَضُرُّواْ اللّهَ شَيْئًا وَلهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانەی کوفر بە ئیمان دەگۆڕنەوە، لە شوێنی ئیمان بە خوداو شوێنکەوتنی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) ڕێبازی کوفریان هەڵبژاردووە، ئەوان زیان بە خودا ناگەیەنن! بەڵکوو زیان بە خۆیان دەگەیەنن، ئەوان لە دونیاو قیامەتدا سزای بە ئێشو کوشندەیان دەدرێو خۆشیی لە ژیانی دونیاو قیامەت نابینن.

﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ﴾ با ئەو کافرانە وانەزانن کە ئێمە مۆڵەتیان دەدەینو تەمەنیان درێژ دەبێ، مۆڵەتدانەکەمان بۆیان سوودی هەیەو قازانجی لێ دەکەن! با گومانی وا نەبەن، بەڵکوو ﴿إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُواْ إِثْمًا وَلَهْمُ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ ئێمە کە مۆڵەتیان دەدەین بۆ ئەوە نیە تۆبە بکەنو بگەڕێنەوەو موسوڵمان ببن، بەڵکوو مۆڵەتدانەکەمان بۆیان بۆ ئەوەیە: زیاتر گوناه بکەنو لە گومڕایی دا نغرۆ بن! جا کە ئەوان تۆبە نەکەنو نەگەڕێنەوە، ئەوە مۆڵەتدانەکەمان بۆیان دەبێتە هاندەر بۆ زێدە ڕەوی لە گوناه کردن داو گومڕابوونی زیاتر!! ئەوانە سزای بە ئێشو سوکایەتی پێکردنیان بۆ ئامادەکراوە، چونکە لە جیاتی ئەوەی سامانداریو تەمەن درێژی خۆیان لە کاری خێردا بەکاربهێنن، لە کاری خراپەدا بەکاریان دەهێنن، ئاکامەکەشی کەڵەکەبوونی خراپەکاریی دەبێو پەروەردگاریش سزایان دەدا لەسەر هەڵوێستو کردەوەیان!

بەکورتی مۆڵەت دانو دواخستنی تۆڵەستاندن لێیان یارمەتیدانی خودایی نیە بۆیان، بەڵکوو ئەندازەکردنو نەخشەکێشانێکی خوداییە بۆیان، کە بەو نەخشەکێشانەی خۆی، بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، تەقدیری خودا وایە! هەر شتێك، کە تووشی ئادەمیزاد دەبێ، لە چاکەو خراپە، خۆشیو ناخۆشی؛ بەروبوومو ئاکامی کردەوەی ئادەمیزاد خۆیەتی. جا بەگوێرەی داخوازی ئەم سوننەتە خوداییە، ئادەمیزاد لە خۆی بایی دەبێو، بە مۆڵەتدانەکە کە خۆی لە خۆی دەگۆڕێو لە

گوناهو سەرپێچیکردنی فەرمانی خودادا رۆ دەچن، شیاوی سزای بە ئێشی دۆزەخ دەبن. ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە: کە بەڵاو موصیبەتو تەنگانە سەنگی مەحەكو بۆتەی تاقیکردنەوەنو راستی بیروباوەڕ دەردەخەن، شتێکی ئاساییە: کە خودا ئادەمیزادان تووشی ئاستەنگو بەڵاو موسیبەت بکا، بۆ ئەوەی موسوڵمانی راستاڵو ئادەمیزادی دووڕووو لێك جیا بکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ عادەتی خودا وا نەهاتووە واز لە کۆمەڵی موسوڵمانان بهێنێ کە بەو شێوە تێکەڵیو پێکەڵییەی کە لەپێش رووداني جەنگی ئوحودا لەسەری بوون بیانهێڵێتەوە، دووڕووەکان بتوانن بیرو باوەڕی پیسی خۆیان بشارنەوەو بنکۆڵی قەڵای ئیسلام بکەن. بەڵکوو خودای میهرەبان وازناهێنێ، هەتا موسوڵمانو دووڕوو لێك جیا نەکاتەوە! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ – محمد/٣١﴾.

مەبەست ئەوەیە کە رۆژی جەنگی ئوحوود بۆتەی پاڵفتەکردن بوو، موسوڵمانانو ناموسوڵمانی تێدا تاقی کرایەوە، پەروەردگار دەری خست کێ موسوڵمانو خۆڕاگرو ئازاو نەبەردو مەردو ملکەچی فەرمانی خوداو پێغەمبەرە، پەردەی لەسەر فڕو فێڵی دووڕووەکان هەڵدایەوە بۆئەوەی سەرپێچیو خراپەکارییان دەربکەوێ بۆ خەڵکی، خۆ پەنادانیان لەچوون بۆ غەزاو خیانەتکردنیان لەگەڵ خوداو پێغەمبەر دەربکەوێ، وێ دەچێ کە برێ کەس وا بیربکەنەوە بڵێن: دەگونجێ لێك هەڵاواردنی موسوڵمانی چالاك لە دووڕوو، بەنیگای خودایی ئەنجام بدرێ، خودا موسوڵمانان ئاگاداری کاری غەیب بکاو موسوڵمانانو ناموسوڵمانانیان بۆ دیاری بکا، ئیتر پەروەردگار لە وەڵامدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ﴾ عادەتی خودا وا دانەهاتووە کە هەموو موسوڵمانان بەسەر غەیبدا ئاگادار بکا، بەڵکوو خودا ئادەمیزادی دروستکردووە، رێگای چاكو خراپی بۆ دیاری کردووە، هێزو تواناو عەقڵو هۆشی پێداوە، بۆئەوەی هەوڵ بداو تێ بکۆشێو ئامانجی خۆی بەدەست بێنێ، بەکردەوەی سرووشت خوازو شارەزایی کردنی پێغەمبەران بە مرادی خۆی بگا! هەرگیز عادەتی خودا وا نەهاتووە کە هەموو

کەس بەسەر غەیبدا ئاگادار بکا، ﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِ مَن يَشَاءُ﴾ بەڵکوو پەروەردگار لە پێغەمبەرانی خۆی هەندێکیان هەڵدەبژێرێ بۆ ئەم کارەو بەنیگا ئەو جۆرە نهێنیانەیان پێ رادەگەیەنێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا، إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ – الجن/ ٢٦ – ٢٧﴾.

ئەمجار ئەو پێغەمبەرەی کە خودا بەسەر بڕێ شتی غەیبیدا ئاگاداری دەکا، هەواڵی نییەت پاکی‌و موسوڵمانی، یان ناپاکی مونافیقی کەسێك، یان زیاتر بەبڕێ کەس رادەگەیەنێ ئەوە سەرچاوەی ئەو ئاگادارییەیە کە لەخوداوەیە، خودا بەویستی خۆی هەندێ زانیاری دەدا بەو پێغەمبەرانە، نەك مانای وابێ کە ئەوانیش وەکوو خودا چی لەدڵ‌و دەرووندایە بیزانن‌و چۆنیەت‌و چەندێتی بیرو باوەڕی هەمووو کەسێك بزانن!! بۆیە خودا کە ئادەمیزادی دروستکردووە، رێگای باش‌و خراپی نیشان داوە، ئەمجار هۆکارو ئەسبابی مادیش دەخاتە گەڕ بۆ تاقیکردنەوەیان. ﴿فَآمِنُواْ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ کەوابێ ئێوە ئەی گرۆهی ئادەمیزاد! ئیمان بەخودایەتی خوداو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بهێنن، شوێن شەریعەت‌و یاسای ئاسمانی بکەون، بڕواتان وابێ کە پێغەمبەران لەخۆوە هەواڵ نادەن‌و چی خوا ئاگاداری نەکردبن ئەوانیش بەخەڵکی راناگەیەنن، ئەمە رەتدانەوەی کافرەکانە کە دەیانگووت: ئەگەر (موحەممەد) راست دەکا با خەبەرمان بداتێ‌و پێمان بڵێ: کێ لە ئێمە ئیمان دەهێنێ‌و کێ ئیمان ناهێنێ! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەگەر ئێوە ئیمان بێنن بەو هەواڵە غەیبییانەی پێغەمبەر پێتان رادەگەیەنێ‌و خۆتان لەسزای بەئێشی خودا بپارێزن، بەهۆی پەیڕەوکردنی فەرمانەکانی‌و دوورکەوتنەوە لەو شتانەی نەهی لێ کردووە، ئەوە بۆ ئێوە پاداشی گەورەو زۆرو زەبەندەی وا هەیە کە کەس ناتوانێ ئەندازەی دیاری بکا.

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە: هەمیشە قورئان ئیمان‌و تەقوا بەیەکەوە دێنێ، وەکوو چۆن زۆربەی کات نوێژو زەکات بەیەکەوە باس دەکا، چونکە لەنێوان ئیمان‌و تەقوادا پەیوەندی گەرم هەیە، هەروەها بۆ راگەیاندنی ئەوەشە کە ئیمان بەبێ تەقوا تەواو نابێ! هەروەکوو زۆرجار باسی بەخت کردنی نەفس‌و ماڵ‌و دارایی

بەیەکەوە ئەنجام دەدا. جا چونکە ئایەتەکانی پێشوو هەڵنان و هاندانیان تێدابوو بۆ گیان بەخشین، گونجاو بوو: کە ئەمجارە ئادەمیزادان هانبدا بۆ ماڵ و دارایی بەخت کردن و فەرمووی: ﴿وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ﴾ با کەس وا گومان نەبا، کە بەخیلی و چروکی ماڵ کۆکردنەوە، گرتنەوەی ماڵ و داراییەك کە خودا داویە پێیان لە خەڵك، کارێکی باشە و سوود ئامێزە، پێیان وانەبێ ماڵ بەخشین و کۆمەکی کردن بە هەژاران ئادەمیزادی دەوڵەمەند هەژار دەکا! با کەس گومانی وانەباو خەیاڵی وانەکا. بەڵکوو ئەوە شەڕو نەگبەتییە بۆ خۆیان و گەل و نەتەوەیان لەدونیاو قیامەتدا!! مەبەست بە بەخیلی نەدانی زەکاتی شەرعییە و خێرو صەدەقە نەکردنە بە خاوەن ئاتاجان و، بەرپابوونی ئاژاوەو ترس و نائاسایشی سەرتاسەریی...

زیانی بەخیلی لەدونیادا ئەوەیە: کە ماڵ و سامانی دەوڵەمەند دەبێتە شوێنی ئەوە کە هەموو کاتێ هەژار چاوی تێوەبێ و هەوڵ بدا بە تالان کردن، یان دزی، یان فەوتاندن، تۆڵەی هەژاریی خۆی لێ بستێنێ، لە رۆژگاری ئێمەدا ئەو هەموو هەڵمەتە نائاساییانە بۆ سەر دەوڵەمەندەکان و بلاوبوونەوەی بیرو باوەڕی سۆشیالیستی... هتد هەموویان بۆ رووخاندنی بناغەو کۆڵەکەی سەرمایەدارییەو ئاکامی بەخیلی رژدیی سەرمایەدارانە!

زیانی بەخیلی بۆ دین و قیامەتیش ئەوەیە، کە پەروەردگار هەواڵی داوە کە ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئاکامی بەخیلییەکەیان و ماڵ پەرستییەکەیان دەکرێتە تۆقەی ئاگرین و لەملیان دەکرێ و هەرچی بکەن خۆیان بۆ رزگار ناکرێ و تووشی لۆمەو پرسیارو سزای رژدییەکەی خۆیان دەبن.

ئیمامی بوخاری فەرموودەیەك لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوەدەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ ، مُثِّلَ لَهُ مَالُهُ شُجَاعًا أَقْرَعَ لَهُ زَبِيبَتَانِ،يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ – أي شِدْقَيْهِ – ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا

مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ». واتە: کەسێك خودا ماڵو سامانی دایەو زەکاتی پێویستی لێ دەرنەکرد؛ ئەو ماڵو سامانە بۆی دەبێتە مارێکی کەچەڵو دوو کەڵبەی تیژی هەنو رۆژی قیامەت لە ملی دەهاڵێو، قەپاڵی پێدا دەکاو، پێیەوە دەداو دەڵێ: من ماڵو سامانەکەتم من گەنجینەو خەزێنەکەتم.

﴿وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ سامانی ئاسمانو زەوی هی خودایە، هەر ماڵو دارایيەك كە ئەو خەڵقە بەمیرات وەری دەگرن هی خودایەو بەس، ئیتر چۆن دەگونجێ كە ئادەمیزادان رژدیو چروكی بكەن لەو ماڵو دارایيەی كە خودا پێی داون لەرێگای خودادا سەرفی نەكەن!؟؟ دڵنیابن كە لەسەر هەموو شتێك لێكۆڵینەوەتان لەگەڵ دەكرێ، كەوابێ پێش هاتنی قیامەتو لەدونیا دەرچوونتان لە ماڵو دارایی خۆتان ببەخشنو یارمەتی هەژارو نەدارایان بدەن، خودا ئاگادارو زانایە بە نییەتو كردەوەتان، هیچی لێ هوون نابێو هەموو كەس پاداشو سزای كردەوەی چاكو خراپی خۆی وەردەگرێتەوە.

### بڕێ خراپەكاریی جوولەكەكان، كە هەژاریی پاڵ خودا دەدەنو پێغەمبەریش بەدرۆ دەخەنەوە

﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ

تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾﴾.

ئایەتەکانی پێشوو رووداوەکانی جەنگی ئوحودیان باس کرد، فێڵو تەڵەکەی دووڕووەکانو هەوڵو کۆششیان بۆ پشت ساردکردنەوەی موسوڵمانان لە جیهادو خودا پەرستییان روونکردەوە، لێرە بەدواوە لەم چەند ئایەتانەی داهاتوودا فێڵو تەڵەکەی جوولەکەکانو دژایەتی کردنیان بۆ موسوڵمانان باس دەکا! پەروەردگار موسوڵمانان دەترسێنێ لە نیەتو مەبەستو هەڵوێستی جوولەکە، هەر وەکوو چۆن لەوەپێش هەمان موسوڵمانانی ترساند لە فرتو فێڵی دووڕووەکان.

ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: حەزرەتی ئەبوبەکر چووە خوێندنگایەکی جوولەکەکانەوە، بینی کۆمەڵێك جوولەکە، لە جوولەکەیەکی تر کۆبوونەتەوە؛ ناوی (فینحاص) بوو، ئەم فینحاصە رووی لە ئەبوبەکر کردو وتی: ئەی ئەبوبەکر! ئێمە هیچ پێویستیمان بە خودا نیەو ئەو پێویستی بە ئێمە هەیە! ئەگەر خودا دەوڵەمەند بوایە قەرزی لە ئێمە نەدەکرد! وەکوو پێغەمبەرەکەتان دەڵێ: ئاماژەیە بە ئایەتی ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ ئیتر ئەبوبەکر رقی هەڵساو مستەکۆڵەیەکی لە دەموچاوی دا، فینحاص چوو بۆلای پێغەمبەرو شکاتی کرد وتی: ئەی موحەممەد! بڕوانە هاوەڵەکەت چی لێ کردم؟ پێغەمبەر بە ئەبوبەکری گوت: چی پاڵی پێوەنای لەو کابرایە بدەی؟؟ وتی: قوربان قسەیەکی زۆر گەورەی کرد! دەڵێ خودا هەژارە.

فینحاص لە قسەکەی ژیوان بووەوە وتی: من شتی وام نەگوتووە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ:

﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاء﴾ بێگومان خودا قسەی ئەو کەسانەی بیست کە گوتیان: خودا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین! بەراستی قسەیەکی ناڕەواو ناحەقیان گوت، خودا لەسەر ئەو بوختانەیان سزایان دەداو تۆڵەیان لێ دەستێنێ.

﴿سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ﴾ ئەمە هەڕەشەیەکی توندو تیژە، لەسەر ئەو بوختانەی کە خودا بە هەژار دەزانن‌و خۆیان بە دەوڵەمەند حسێب دەکەن، بەڵام با بزانن کە خودا لەسەر ئەو وتەیان سزایان دەدا، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: وتەکەیان دەنووسین‌و هەڵی دەگرین، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە سزادانی لەسەر بێ، جا ئەوان هەر ئەم تاوانەیان نیە بەڵکوو تاوانێکی تریان ﴿وَقَتْلَهُمُ الأَنبِيَاء بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ ئەوەبوو کە پێغەمبەرانیان بە ناڕەوا کوشتووە، بەشێوەیەکی دڕندەیی لەناویان بردوون، نیسبەتدانی پێغەمبەر کوشتن بۆ جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هەرچەندە باوك‌و باپیری ئەوان ئەنجامیان داوە، لەم ڕووەوەیە: کە ئەمان ڕازی بوون بە کردەوەکەی ئەوان پێی لێ دەنێن‌و هاوسۆزی خۆیان لەگەڵیاندا پیشان دەدەن، جا لەبەر ئەم هەڵوێستەیان‌و ڕەزامەندییان بە کردەوەکەیان پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ پێیان بڵێن: سزای ئاگری سووتێنەر بچێژن؛ واتە: خودا لەسەر کردەوەکانیان بە سەخترین سزا تۆڵەیان لێ دەستێنێ، پێیان دەڵێن: ﴿ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ ئەم سزا سووتێنەرەتان بەهۆی تاوانە جۆراوجۆرەکانتانەوەیە، وە کوشتنی پێغەمبەران‌و خودا بە هەژار زانین‌و یارمەتیدانی کوفرو بێ دینان. ئەم سزایەتان کە دەدرێ بەهۆی ئەوەیە: کە بەدەستی خۆتان کردووتانە.. کردەوە پاڵ دەست دەدرێ، چونکە زۆربەی کردەوەی ئادەمیزاد بەدەست ئەنجام دەدرێ، هەروەها لەبەر ئەوەیە کە کردەوەکان بە حەقیقەت لەوانەوە پەیدا بووە، نەك هەر ئەوە بەڵکوو هەوڵیان داوە پێغەمبەر تیرۆر بکەن ویستیان دیواری بەسەردا بڕوخێنن، ژەهریان بۆ کردە ناو خواردنەوە، گۆشتە مەڕەکەیان بۆ ژەهراوی کرد؛ کەوابێ ئەم سزا ئامادە کراوە

بۆیان له شوێنی خۆیدایه. ﴿وَأَنَّ اللّـهَ لَيْسَ بِظَـلاَّمٍ لِّلْعَبِيـدِ﴾ خـودا بـه هـیچ جۆرێـك ستەم له بەندەكانی ناكا، كەس بە ناڕەوا سزا نادا.

بـه كـورتی پێیـان دەگـوترێ: بـچێژن سـزای ئـاگر بـەهۆی ئـەو كردەوانـەی كـه بەدەستی خۆتان ئەنجامتان داونو خودا ستەمكار نیەو له خۆڕایی سـزاتان نـادا، جـا ئەم پێگوتنـەیان لـه دۆزەخـدا دەبـێ، یـان لـەكاتی مـردن یـان لـه كـاتی لێكۆڵینـەوەو حیـساب لەگـەڵ كردنـدا دەبـێ، بێژەرەكـه، پـەروەردگارە یـان فریـشتەیه؟! ئـەمجار پەروەردگار درۆیـەكی تـری جوولەكـەكان ڕەت دەكاتـەوە دەفـەرموێ: ﴿الَّـذِينَ﴾ ئـەو جوولەكانه كەسانێكن كه ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿إِنَّ اللّهَ عَهِدَ إِلَيْنَـا أَلاَّ نُـؤْمِنَ لِرَسُـولٍ حَتَّـىَ يَأْتِيَنَـا بِقُرْبَـانٍ تَأْكُلُـهُ النَّـارُ﴾ بێگومـان خـودا فـەرمانی پێكـردووینو بـەڵێنی لێمـان سـەندووە كـه بـڕوا بـه هـیچ پێغەمبـەرێك نەكـەین، هـەتاوەكوو بڕێـك لـه موعجیزاتـەكانی ئـەوە نـەبێ: كـه یـەكێك لـه ئومەتەكـەی قوربـانی بكـاو ئاگرێـك بیسوتێنێ، واته: موعجیزەی پێغەمبەرەكه ئـەوە بـێ؛ ئەگـەر یـەكێك قوربانییـەكی كرد یان خێرێكی كرد، نیشانەی قبووڵ بوونەكەی ئەوە بێ شتەكه دابنێنو ئاگرێـك بێته خوارێ بیسوتێنێ! مەبەستیان ئەوە بوو: ئیمان به پێغەمبەر نـەهێنین، بۆیـە: ئەو جۆرە درۆیەیان هەڵبەستووە.

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: ئـەم ئایەتـه دەربـارەی كـەعبی كـوڕی ئەشـرەفو مالیكی كوڕی صەیفو فینحاصی كوڕی عازوراءو كۆمـەڵێكی تـر هاتۆتـه خـوارێ كه هاتنه خزمەت پێغەمبەرو وتیان: ئەی موحەممەد! تۆ بەلای خۆتەوە پێغەمبـەریو لافی فروستادەیی لێ دەدەیو پێت وایه: خودا نیگات بۆ دەكـاو كیتـابی بـۆ نـاردووی! ئەمه له لایەكەوە، له لایەكی ترەوە خودا پـەیمانی لـه ئێمـه سـتاندووە لـه تەوراتـدا بـەڵێنی ئـەوەی لێ وەرگرتـووین كـه ئیمـان بـه هـیچ پێغەمبـەرێك نـەهێنین، هـەتا قوربانییەك نـەهێنێ بۆمـانو نـیشانەی قبـووڵ كردنەكـەی ئـەوە نـەبێ ئاگرێـك لـه ئاسمانەوە بێ بیسوتێنێ، ئاگرەكه كه له ئاسمانەوە دێ دەنگێكی به سپایی لێ بێ، جا ئەگەر تۆ ئەمەمان بۆ دەكەی، ئەوە بڕوات پێ دەكەینو ئیمانت پێ دەهێنین.. ئـیتر ئەم ئایەته هاته خوارێ!

بەڵێ ئەم ئیدیعایەو باس‌و خواسی ئەم بەڵێن‌و پەیمانە دەست هەڵبەستی خۆیان بوو، لە خەزێنەی خەیاڵی پوچی خۆیان هەڵیان هێنجا بوو! بۆیە پەروەردگار بە درۆی خستنەوەو ڕەدی دانەوەو فەرمووی:

﴿قُلْ قَدْ جَاءكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِي بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالَّذِي قُلْتُمْ﴾ هاتنە خوارەوەی ئاگر موعجیزەیەو موعجیزەش بۆ چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرە ڕەوانە کراوەکەیە، دەی خۆ زۆر پێغەمبەری خاوەن موعجیزە هاتوونە سەرتان‌و وەکوو یەحیاو زەکەریاو هی تریش موعجیزەی ڕاست‌و حەقیان نیشان داوە، لەو جۆرە موعجیزەی کە ئێوە دەیڵێن نیشانیان داوە، ئەدی ﴿فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ﴾ بۆچی کوشتانن‌و بەشێوەی درندەیی لە ناوتان بردن؟ بۆچی بڕواتان پێ نەکردن؟ ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن شوێن حەق‌و ڕاستی دەکەون‌و پابەندی فەرمانی پێغەمبەران دەبن!!

جا وەکوو گوترا: ئەم کردەوانە پاڵ جوولەکەکانی سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان دراوە، لە کاتێکا باوك‌و باپیریان کردوویانە نەك ئەمانە! بەڵام چونکە ئەوانیش بەو کردەوانە ڕازین‌و پێیان وایە: لەسەر حەق بوون، بۆیە کردەوەی باپیرانی ڕابوردوویان پاڵ ئەمان دراوە!! گەل‌و نەتەوە لە عادات‌و داب‌و نەریتدا وەکوو تاکە کەس وان ئەو تاوانەی یەکێکیان بیکا پاڵ هەموویان دەدرێ لای عەرەبەکانیش ئەم داب‌و نەریتە باو بوو تاوانی یەکێك لە هۆزێك پاڵ هەموو هۆزەکە دەدراو تۆڵەیان لە هۆزەکە دەستاند.

بەکورتی پێشینانتان سەر ڕەق‌و نا پەسەند بوون، ئێوەش وەکوو ئەوان وان‌و هەمان هەڵس‌و کەوت‌و بیروباوەڕتان هەیە.

ئەمجار پەروەردگار دڵخۆشی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآؤُوا بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَالْكِتَابِ الْمُنِيرِ﴾ ئەگەر کافرو خوانەناسانی هاوچەرخت بە درۆیان کردیەوەو بڕوایان پێ نەکردی‌و موعجیزەو بەڵگەی ڕاستی پێغەمبەرایەتیت کاری تێ نەکردن؛ ئەوە دلگران مەبە. چونکە زۆر پێغەمبەری پێش تۆ بە موعجیزەو بەڵگەی ڕاستیی پێغەمبەرایەتیانەوە هاتوونە ناو گەل‌و هۆزەکانیانەوە، کتێبی ئاسمانییان لەگەڵدا

بووە، وەکوو ئەو پەڕاوانەی کە بۆ پێغەمبەران نێردراونەتە خوارێ، کتێبی وەکوو تەورات و ئینجیل و زەبووریان پێ بووە کەچی بڕوایان پێ نەکردوون و بە درۆیان خستوونەوە، گاڵتەیان پێ کردوون، ئازاریان داون، ئەوانیش صەبرو ئارامیان لەسەر ئەو ئەزیەتدانە گرت و خۆڕاگرو بارقووڵ بوون و لەسەر ڕێبازی خۆیان بەردەوام بوون و پەیامی خۆیان گەیاند! ئەمە سروشتی ئادەمیزادە لەهەموو کات و سەردەمێکدا، هی وا هەیە گوێ بۆ حەق و ڕاستی دەگرێ، هی وا هەیە بەرەنگاری حەق دەبێ و گاڵتە بە هەڵگرانی پەیامی ڕاستی دەکا! کەوابێ تۆ سەرسام مەبە لە بەرگری کردنی کافرەکان بۆ بانگەوازییەکەت! چونکە دڵ و دەروونیان ئامادە نیە بە حەق بگەن و خێرو خۆشییان ناوێ»

## مردن سەرەنجامی هەموو گیاندارێکە، دونیا گۆڕەپانی تاقیکردنەوەیەو قیامەت شوێنی پاداشە

﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ

أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًاۚ وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾.

هەر لە روانگەی دڵدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەروەردگار ئەوە دەچەسپێنێ کە مردن سەرەنجامی هەموو زیندوویەکە؛ تاقیکردنەوە لە دونیاداو پاداش دانەوە لە قیامەتدایە! هەموو کەس ئاکامی کردەوەکانی خۆی دەبینێتەوە! بۆیە بەم شێوە گشتییەو بەم قاعیدە موطلەقە، دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾ هەموو نەفسێك تامی جودابوونەوە لە لاشە دەچێژێ‌و رۆژێك لە رۆژان ئەم حاڵەتەی بەسەردا دێ، کەس رزگاری نابێ. هەموو کەس دەبێ کاسەی مردن بچێژێ!! ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە نەفس نامرێ، لاشە دەمرێ، چونکە ئەوەی دەچێژێ مەوجوودە، مردوو ناچێژێ، چەشتن هەستێکە زیندوو هەستی پێ دەکا. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ، وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ – الرحمن/٢٦ – ٢٧﴾. هەموو کەسێك لە جنۆکەو ئادەمیزادو فریشتەو تەنانەت هەڵگرانی (عەرش)یش دەمرن... تەنها خودا دەمێنێتەوە، هەر ئەو زیندو راوەستاوو نەمرە، بەردەوام‌و باقییەو هەر دەبێ، وەکوو هەر بووە! ئایەتەکە دڵدانەوەی موسوڵمانانیشی تێدایە، چونکە ئەوە دەچەسپێنێ کە هەرچی زیندوویەك هەیە لەسەر رووی زەوی‌و لە ئاسمانەکان، هەموویان مردن دەچێژن. هەموو نەفسێك تامی جودابوونەوە لە لاشە دەچێژێ. ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ پاداشی کردەوەکانتان بەسەرجەمی‌و تەواوی لە رۆژی قیامەتدا وەردەگرنەوە، هەموو نەفسێك پاداش‌و سزای کردەوەکانی – خێرو چاکە، تاوان‌و حراپە – بە تەواوی‌و بەشێوەیەکی دادوەرانە وەردەگرێتەوە، کەس تۆزقاڵێك ستەمی لێ ناکرێ!

ئایەتەکە باسی وەرگرتنەوەی پاداش‌و سزای تەواو دەکا، ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە برێ پاداش‌و سزا جاری وا دەبێ لە دونیادا یان لە گۆڕدا دەگاتەوە بە

ئینسان!! هەروەها ئەو فەرموودەیەی کە تیرمیذیو طەبەری لە پێغەمبەرەوە (درووودی خوای لەسەر بێ) دەیگێڕنەوە کە دەفەرموێ: «إِنَّ الْقَبْرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ أَوْ حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النَّارِ» پشتگیری راستی ئەو ئاماژەیە دەکا.

جا ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ﴾ کەسێك لە ئاگر دوورخرایەوەو رزگاری بوو خرایە بەهەشتەوەو بە مراد گەیشت، ئەوە بەختەوەرو خۆشنوودە، گەیشتۆتە ئەو پەڕی پلەی خۆشیو کامەرانیو داخوازی هەرە بەرزی خۆی بەدەست هێناوە.

پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: کەسێك دەیەوێ لە ئاگری دۆزەخ دوور بکەوێتەوەو بچێتە بەهەشتەوە با وابکا بە موسوڵمانی بمرێ، کاتێك مردن یەخەی پێ دەگرێ بڕوای بە خوداو رۆژی قیامەت بێ، شتێك بۆ خەڵك بێنێ کە پێی خۆشە خەڵك ئەو شتەی بۆ بێنن، چی بۆخۆی پێی خۆشە بۆ کەسانی تریش پێی خۆش بێ، واتە: لەژیان دا پارێزگاری مافی خوداو ئادەمیزاد بکا، بەگوێرەی توانا ئەرکی سەرشانی بەرامبەر خوداو بەندەکانی جێبەجێ بکا، بۆ ئەوەی بە مراد بگاو، بە بەهەشتی بەرین شاد ببێ!!

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی «مَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا» ئەگەر دەتانەوێ دڵنیابن لە ئەمە، دە بڕۆن ئایەتی ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ﴾ بخوێننەوە.

﴿وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ ژیانی دونیا کە هەیە بە هەموو خۆشیو لەزەتێکەوە بریتییە لە هۆکاری لە خۆبایی بوونو هەڵخەڵەتاندن، خۆشییە جەستەییەکان؛ وەکوو خواردنو خواردنەوە، هەروەها خۆشییە مەعنەوییەکان وەکوو پلەو پایەو رێزداری! وەکوو کاڵایەکی هەڵخەڵەتاندن وانو پاش ماوەیەك دەردەکەوێ هیچو پووچو کەم بایەخنو، ئادەمیزاد لە ژیاندا پێیان هەڵدەخەڵەتێو، بە باشیان دەزانێو، هەڵیان دەبژێرێ، بەڵام ئەو ژیانەی لای خودایە ئەوە ژیانەو حەق وایە هەوڵی بۆ بدرێ! وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا،

وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى – الأعلى/١٦ – ١٧﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى – القصص/٦٠﴾.

پێویستە ئەوە بزانرێ: کە دونیا کاتێك ئاوا هیچو پووچە، کە بەسەر قیامەتدا تەفضیل بدرێو بکرێتە غایەو مەبەست، بەڵام ئەگەر دونیا بکرێتە وەسیلەو ئامێر بۆ بەدەستهێنانی پلەو پایەی قیامەت، ئەوە دونیا شتێکی خاوەن بایەخەو کاڵایەکی بەنرخە، جا کەسێك تەفضیلی دونیا بدا بەسەر قیامەتدا وەکوو کەسێك وایە: سەودایەکی کردبێو فێڵیان لێ کردبێ، دوایی بۆی دەربکەوێ کە دەستیان بڕیوەو غەشیان لێ کردووە، دەستی لە بنی هەمانەوە دەربچێو هیچی بۆ نەکرێو دەسخەڕۆ ببێ!! ئەمجار پەروەردگار دوای تەواوبوونی جەنگی ئوحوود، دەیەوێ بڕێك دڵدانەوەی موسوڵمانەکان بداتەوەو، تێیان بگەیەنی کە لەسەر تاڵو ترشی رام ببنو بۆ ناخۆشیو بەڵاو موصیبەت خۆگرو خۆڕاگر بن، دەفەرموێ: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ أَذًى كَثِيرًا﴾ ئەی پێغەمبەرو کۆمەڵی موسوڵمانان! بزانن: دونیا خانووی تاقیکردنەوەو کارکردنو تێکۆشانە، ئێوە دەخرێنە بۆتەی تاقیکردنەوەو ئیمتیحانەوە، تووشی جۆرەها بەڵاو موصیبەت دەبن، لە ماڵو دارایی دا تاقی دەکرێنەوە، ماڵو دارایيتان دەفەوتێ، لە دەوڵەمەندییەوە هەژار دەکەون، یان فەرمانتان پێ دەکرێ ماڵو سامانتان ببەخشنو لە ڕێگای خێردا سەرفی بکەن، لە جەستەو لاشەی خۆتانو منداڵو خزمو کەسو کاردا ئیمتیحان دەکرێن، تووشی کوشتنو برینداریو نەخۆشیو ترسو لەرز دەبن، جۆرەها نەخۆشیو بەڵاو ئافات روو دەکاتە خۆتانو منداڵو کەسو کارتان. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ – البقرة/١٥٥﴾.

جا موسوڵمانانو پێغەمبەرەکەیان، لە جوولەکەو فەلەو عەرەبە کافرەکان شتی زۆر ناخۆش دەبیستن، بوختانو قسەی ناشیرینو بێ بناغەتان ئاراستە دەکەن، جنێو بە ئایینتان بە پێغەمبەرتان دەدەن، دژیان دەدوێن، هەوڵی لەناوبردنتان

دەدەن، بەلاّم ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتقُواْ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ﴾ ئەگەر صەبر بگرن‌و تەقوای خودا بکەن، چیتان فەرمان پێ کراوە، ئەنجامی بدەن، چیتان لێ قەدەغە کراوە خۆتانی لێ دوور بخەنەوە؛ ئەوە کار دروستییەو راستاڵییە، شایانی ئەوەن دووچەندانە پاداش بدرێنەوەو پێویستە هەریەکێ لە ئێوە بەو شێوە رەفتار بکا.

ئەم ئایەتە یەکێکە لەو ئایەتانەی موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ بارقووڵی‌و جوڵانەوەی رامیاری‌و هەڵکردن لەگەڵ دوژمنانداو پەیڕەوکردنی ململانێی سیاسی‌و خەباتکردنی دان‌و سان. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەرچەندە فەرمانی پێکرابوو کە شەڕ لەگەڵ کافرەکان بکا، لەگەڵ جوولەکەکان مەدارای دەکردو زۆرجار چاوپۆشی لە هەڵەو تاوانی مونافیقەکان دەکرد.

## پەیمان‌و بەڵێن وەرگرتن لەخاوەن نامەکان

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ ﴾.

وەکوو زانیمان پەروەردگار لە سوورەتی (ال عمران)دا موناقەشەیەکی زۆری لەگەڵ فەلەکاندا ئەنجام دا، زۆر سەرگورشتەی سەیرو سەمەرەی لە جولەکەکانەوە

گێڕایەوە، دوا بەدوای ئەوە باسی غەزای بەدرو ئوحوودی کرد، ئەمجار دێتە سەر هەڵوێستێکی تری جوولەکەو فەلەکان کە ئەمیش سەرسوڕهێنەرو سەیرە، ئەویش بریتییە لە تانەدان لە ئایینو لە کەدارکردنی پەیامی ئیسلام، لە کاتێکا لە تەوراتو ئینجیلدا فەرمانیان پێ کراوە، کە زانیاری کتێبەکانیان نەشارنەوە، کە برِێ لەو زانیاریانە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (درووودی خوای لەسەر بێ)و راستی پەیامە پیرۆزەکەی،، بەڵکوو بەڵێنی لێ وەرگرتوون کە ئەم راستییانە بۆ خەڵك روون بکەنەوەو بە هیچ جۆرێ پەردەپۆشییان بۆ نەکەن! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ﴾ یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە پەروەردگار پەیمانو بەڵێنی لە خاوەن نامەکان — جوولەکەو فەلە وەرگرت: کە — تەوراتو ئینجیل — بەبێ دەست لێدان بە خەڵکی رابگەیەنن‌و هیچیان لێ نەشارنەوە، ناوەڕۆكو حەقیقەتیان چۆنە ئاوا بۆ خەڵکیان شی بکەنەوە، نامەی خودا نابێ کەمو زیادی تێدا بکرێ، بەڵکوو دەبێ چۆن هاتووە ئاوا بۆ ئادەمیزادان روون بکرێتەوە، گۆڕانکاریو پێچو پەنای تێدا نەکەن، مەبەستەکانی چۆنەو بۆچی هاتووە شی بکرێتەوە،، بە تایبەتی باسو خواسی پێغەمبەری ئیسلام چۆنەو رەوشتو نیشانەی بۆ خەڵکی ئاشکرا بکەن‌و ئیمانیشی پێ بێنن‌و بانگەوازی ئایینەکەی بکەن‌و، خۆ ئامادە بکەن: هەرکاتێ ڕەوانە کرا، خێرا ئیمانی پێ بێنن! کەچی ئەوان ئەو زانیاریانەیان شاردەوەو بەهایەکی بێ نرخیان لە پاساویدا وەرگرت. ئەوەیان لە بیر چووەوە کە بەڵێنیان داوەو بەڵێنی کامەرانی هەردوو جیهانیان پێ دراوە، بەڕاستی سەوداکەیان زیان بەخشەو کڕین‌و فرۆشتنەکەیان زەرەر مەندییە.

ئەمە خۆی لەخۆیدا هەڕەشەیەکی توندو تیژە، بۆ زانایانی هەموو رۆژگارێك کە نەچن لاسایی ئەو جوولەکەو فەلانە بکەنەوە، بۆ ئەوەی ئەو نەفرین‌و تانەو لۆمەو سزایەی تووشی ئەوان بووە تووشی ئەمان نەبێ!

بەڵکوو هەوڵو تێکۆشان ئەنجام بدەن، ئەو زانستو عیلمەی دەیزانن بەشێوەیەکی سوودبەخش بەخەڵکی رابگەیەنن، هیچی لێ حەشار نەدەن‌و پەردەپۆشی نەکەن، پێغەمبەریش (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی

هەرکەسێك داوای زانستییەکی لێ کراو شاردیەوە، پەروەردگار رۆژی قیامەت لغاوی ئاگرینی لەدەم دەکاتو سزای دەدا، ﴿فَنَبَذُوهُ وَرَاء ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْاْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً﴾ بەڵێ ئەو عالمە جوولەکەو قەشە مەسیحییانە هیچ پابەندی تەوراتو ئینجیل نەبوونو پاش گوێیان خستن.

کۆمەڵێکیان تەوراتو ئینجیل دەخوێنن بێ تێگەیشتنو نازانن مەبەستەکانیان چینو چی نین! کۆمەڵێکیان بە ئەنقەست دەقەکان دەگۆڕنو لە خۆیانەوە زیادو کەمی تێدا دەکەن، بە جۆرێك لایانداونو گۆڕانکاریان تێدا کردوون، بۆ پڕوپیتاڵی دونیای بێ بایەخ گۆڕانکارییان لە دەقەکانیان کردووە، هەنێکیان شاردۆتەوە، هەندێکیان گۆڕیوە بۆ پلەو پایەیەکی کاتیو دونیایی، یان ناوبانگو شۆرەتی قەڵب، یان بۆ دەستکەوتنیماڵو دارایی بێ بایەخ!! خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان لە کیس خۆیان داوە، لە راستیدا ئەوان لەو سەوداو مامەڵەیەدا زەرەرمەندو دۆڕاون، خۆشبەختیو کامەرانی هەردوو جیهانیان واز لێ هێناوەو خەریکی کۆکردنەوەی شڕو پیتاڵی کەم نرخی دونیانو هەڵپەی بەرتیل وەرگرتنو رووتاندنەوەی هەژارو بێ نەوایانن، دەیانەوێ بە چەپو گوپ پلەو پایەی خۆیان بیارێزن! ﴿فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ خراپ کاڵایەکە، ئەوەی کڕیویانە. چونکە ئەوان لە شوێنی خۆشیو کامەرانی بەردەوامو بەهەشت، جیهانی بێ بەقایان پەسەند کردووە!

ئەمە بەڵگەیە، لەسەر ئەوە کە زانستو بڵاوکردنەوە پێویستەو فێرکردنی خەڵك واجبە، چۆن پێویستە نەزان هەوڵی فێربوون بدا، هەروا پێویستە زاناش هەوڵی فێرکردن بدا، ئیمامی عەلی فەرموویەتی (ما أخذ الله علی أهل الجهل أن يتعلموا حتى أخذ على أهل العلم أن يعلموا).

حەسەنی بەصری دەیفەرموو: ئەگەر ئەو بەڵێنە نەبوایە کە خودا لە زانایانی وەرگرتووە زۆر لەو شتانەی کە پرسیارم لێ دەکەن وەڵامم نەدەدانەوە!

تا ئێرە قسە لەگەڵ خاوەن نامەکان بوو، کە پەروەردگار پەیمانی لێ وەرگرتن، بەوەی کە تەوراتو ئینجیل بۆ ئادەمیزادان شی بکەنەوە، بەڵام کەمتەرخەمییان تێدا کردو کاریان بە ناوەرۆکی نامە ئاسمانییەکان نەکردو، کاڵایەکی بێ نرخیان لە جیاتی ئەوە هەڵبژارد، ئەمجار دێتە سەر روون کردنەوەی حاڵەتێکی تر لە

هەڵوێستەکانیان بەمەبەستی ترساندنی موسوڵمانان لە لاسایی کردنەوەیان، هەڵوێستەکەشیان ئەوە بوو: کە شانازییان بەوە دەکرد کە لە دەقەکانی تەوراتو ئینجیل دا گۆڕانکاریی دەکەنو، تەئویلو تەحریفی تێدا دەخەنە ڕو، شایان بەخۆیان بوو، کە دەتوانن سەر لە خەڵکی بشێوێنن، خۆیان پێ پێشەواو رابەر بوو، زۆر بەم کردارەیان کەیف خۆش بوون! ئیتر پەروەردگار فەرمووی: ﴿لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ﴾ ئەی موحەممەد! وا گومان مەبە کە ئەوانەی وا دڵخۆشن بە کردەوە ناڵەبارەکانی خۆیانو شانازی دەکەن بەوەی کە توانیویانە سەر لە خەڵکی بشێوێنن، راستییەکەیان هەڵگێڕاوەتەوە، زانیاری راستو دروستیان شاردۆتەوە، خۆیان بە خاوەن پلەو پایەی علیمو زانست دەزانن، پێیان وایە: کە شیاوی ئەوەن کە سوپاس بکرێن، چونکە تەوراتو ئینجیل خوێننو راڤەکەری دەقەکانیانن دەیانەوێ تۆ سوپاسیان بکەی لەسەر شتێك کە نەیان کردووە، - تۆ ئەی موحەممەد! وا مەزانە ئەوان لە سزای جیهانی رزگاریان دەبێ، ئەوانە هەرگیز رزگاریان نابێو بەختەوەر نابن، بەڵکوو سزای بە ئێشیان بۆ دیاری کراوە لە دونیادا ریسوا دەبن، تووشی جۆرەها بەڵاو موصیبەت دێن، جۆرەها بومەلەرزەو زریانو لافاو دەردو بەڵاو تاعونو نەخۆشی سامناك روویان تێ دەکا! ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لە قیامەتیشا راپێچی دۆزەخ دەکرێنو تۆڵەی بوختانو سەرپێچییان لێ دەسێنرێ، لەسەر گۆڕانکاری دەقەکانی تەوراتو ئینجیلو هەڵەو گێڕانەوەی مەبەستو ماناکانیان سزا دەدرێن.

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! غەمناك مەبن، لاواز مەبن، حەق بێژ بن، هیچ کاتێ راستی مەشێرنەوە، بە ئایەتی خودا کاڵای بێ بایەخ مەکڕن، ئایین فرۆش مەبن، دڵخۆش مەبن بەوەی مەدح بکرێن لەسەر کارێك کە نەتان کردووە، جگە لە خودا لەکەس مەترسێنو گوێ بە هیچ مەدەن خوداتان بەسە، ئەو فریاتان دەکەوێ! قسەو قسەڵۆکی ئەوان کارتان تێ نەکا کە دەڵێن: خودا هەژارە، ئێمە دەوڵەمەندین، چونکە موڵكو سامانی ئاسمانو زەوی هەمووی هی خودایەو بە ئارەزوی خۆی ئاڵو

گۆڕی تێدا دەكا، پەروەردگار بەسەر هەموو شتێكدا دەسەڵاتی هەیەو هیچ شتێك لێی عاسی نابێ، كەوابێ لێی بترسن‌و سەرپێچی فەرمانەكانی مەكەن! ترستان لە غەزەب‌و تۆڵەی هەبێ.

### سەرنج ڕاكێشانی ئادەمیزاد بۆ بیركردنەوە لە بوونەوەر، پاداشیش بۆ نێرو مێیە

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ

ﭐلۡمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾.

طەبەرانی ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: قورەیشییەکان هاتنە لای جوولەکەکان، وتیان: مووسا کە کرا بە پێغەمبەر موعجیزەی چی بۆ هێنان؟ جوولەکەکان وتیان: عەساکەی دەستی نوورانی بوو کە دەیخستە ناو باخەڵییەوە کە دەری دەهێنا دەدرەوشایەوە. هاتنە لای مەسیحییەکان وتیان: عیسا موعجیزەی چۆن بوو؟ وتیان: لاڵو بەڵەکی چاك دەکردەوە، مردووی زیندوو دەکردەوە، ئەمجار هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) وتیان: ئەی موحەممەد! بۆمان لە خودا بپاڕێرەوە کێوی (صەفا)مان بۆ بکا بە زێڕ، پێغەمبەر لە خودا پاڕایەوە ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ بێگومان لە بەدیهێنانو دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا، ئاسمانەکان بەو هەموو بەرزییو فراوانییەوە زەوی بەو هەموو نزمیو پەستەییەوەو گونجانی بۆ ژینگەی گیانداران تێیدا، وێڕای هەبوونی ئەو هەموو یاساو نیظامە رەنگینانەی کە کاروباری کەونو کائیناتیان پێ هەڵدەسوڕێ هەموو شتێك لە چوارچێوەی سنووری خۆیداو لە کاتی خۆیدا کاری خۆی ئەنجام دەدا.

(فەلەك هەمووی) تەوەرەكان، ئەستێرەكان، ئەستێرە كاكەشەكان دەرياو كێووو چۆمەكان، داری بەردارو گژو گیاو ئاژەڵ، كانو سەروەتو سامان.

﴿وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ هاتووچۆی شەوورۆژ یەك بەدوای یەكدا، دەمێك شەو درێژەو رۆژ كورت، كاتێك بە پێچەوانەوە دەبیٚو چاخی واش دەبیٚ بەرامبەرو بە ئەندازەی یەكترین، ئاوا بەو جۆرەو بە گوێرەی وەرزو كاتو شوێن، گۆڕانكاریان بەسەردا دیٚ، هەموو ئەمانەو هی تریش ﴿لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ﴾ بەڵگەی چەسپێنەرن لەسەر هەبوونی خوداو تواناو دەسەڵاتی رەهاو گەورەییو تاكو تەنیایی، بۆ كەسانێك خاوەن هۆشو فام بنو بە وردی لە بوونەوەر ورد ببنەوەو بە هۆشو فامی تەواوەوە تێبفكرێن، نەك كەرِو لاڵو ناعاقڵانە تێبفكرێنو ئاژەڵ ئاسا هەڵسو كەوت لەگەڵ بوونەوەردا بكەن، وەكوو ئەوانەی پەروەردگار لە ئایەتێكی تردا دەربارەیان دەفەرمویٚ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ، وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللّهِ إِلاَّ وَهُم مُّشْرِكُونَ – يوسف/١٠٥ – ١٠٦﴾.

ئەمجار پەروەردگار پێناسەی ﴿لِّأُوْلِي الألْبَابِ﴾ دەكاو دەفەرمویٚ: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ﴾ ئەو هۆشمەندانەن: كە هەمیشە یادی خودا دەكەنو لە بوونەوەر دەفكرن، لە هەموو كاتو شوێنێكدا لە گشت بارو زروفێكیاندا، بە راوەستاوی بە دانیشتوویی، بە راكشاوی، بە دڵو بەزوبان، یادی خودا لە یاد ناكەن، هەمیشە خودایان لە بیرە، وێڕای ئەو یادە هەمیشەییە ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ لە بوونەوەر ورد دەبنەوە، لە دیاردەكانی ئاسمانو زەوی دەفكرن، نهێنیو دەستی قودرەتی خودایان تێدا دەبینن، لە هەموو شوێنێكدا گەورەیی خوداو بە تواناییو زانیاری فراوانو بەزەیی پەروەردگار بەدی دەكەن...

تێفكرین دەبیٚ لە دروستكراوەكانی خودا بیٚ نەك لە خودی پەروەردگار خۆی!! چونكە مەحاڵە كەس بتوانیٚ حەقیقەتو چۆنیەتی زاتو صیفاتی خودای بۆ روون ببێتەوە.

دەگێڕنەوە رۆژێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بیٚ) چووە ناو كۆمەڵی یارانەوە خەریكی بیركردنەوەو تێفكرین بوون پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر

بێ) پێی فەرموون: بیر لە دروستکراوی بکەنەوە، هەرگیز فکر لە دروستکەر مەکەنەوە، چونکە ئێوە توانای ئەوەتان نیە چۆنیەتی خودا بزانن، حەسەنی بەصری فەرموویەتی: سەعاتێك بیرکردنەوە لە بوونەوەر لە شەونوێژی شەوێك خێرترە!! جا ئەو خواناسە عاقڵو هۆشمەندانە کە ئاوا لە بوونەوەر ورد دەبنەوەو لە فراوانی بوونەوەرو کارسازیی پەروەردگارو دەست رەنگینی زاتی بێچوونی تێ دەفکرن، بە زوبانی حاڵو مەقال دەڵێن: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـذا بَـاطِلاً﴾ خودایە! ئەم بوونەوەرت بە خۆڕایی دروست نەکردووە، ئەم کەونو کائینانەت بە هەوانتە وەگەڕ نەخستووە، زاتی تۆ زۆر لەوە بەرزترە کاری نابەجێ بکا، هەموو دروستکراوێك لە شوێنی خۆیدایە، حیکمەتو نهێنییەکی یەزدانی تێدایە.

واتە: موسوڵمانی بیرکەرەوە دوای لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە روودەکاتە بارەگای پەروەردگارو دەستی زەلیلیو پاڕانەوە بەرز دەکاتەوە، بڕواو قەناعەتی خۆی دەربارەی بوونەوەر ئاشکرا دەکاو دەڵێ: خودایە! تۆ بەبێ هوودە ئەم بوونەوەرت دروست نەکردووە. ﴿سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَـذَابَ النَّـارِ﴾ ئیشو کارت هەمووی پاكو بێ عەیبە، بۆخۆت پاكو بێ خەوشی، تاكو تەنیاو کەریمی کارسازی، خودایە! پەنامان بدەو لە سزای ئاگر بمانپارێزە! یارمەتیمان بدە بۆ کردنی کاری چاك، بیروباوەڕمان راستو دامەزراو بکە، تووشی پشێوی بیروباوەڕو گومڕاییو سەرلێ تێکچوون نەبین!!

﴿رَبَّنَا إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ النَّـارَ فَقَـدْ أَخْزَيْتَـهُ﴾ پەروەردگارا! هەرکەسێك بە دادوەری خۆتو بەهۆی سەرپێچی کردنو گومڕاییو لادانی خۆی لە رێگای راست، بیخەیە دۆزەخەوە بێگومان ریسوات کردووە، زەلیلو داماوت کردووە، چونکە کەسێك لە تۆ یاخی بێ ناتوانی بەربەرکانی تۆ بکا، هەرکە ویستت داماوی دەکەیو کەسیش نیە بتوانێ کۆمەکی پێ بکا. ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ ئەوانە ستەمکارن، ستەمکارانیش کەس نیە بتوانێ یارمەتییان بداو لە سزای دۆزەخ رزگاریان بکا، سزادانیان بە ئاگری دۆزەخ تۆڵەستاندنێکی دادوەرانەیەو ئاکامی ستەمکاریو سنوور بەزێنی خۆیانە!

﴿رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلإِيمَانِ أَنْ آمِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا﴾ خودایە! ئێمە گوێمان لێ بوو؛ بانگەوازیکەرێك کە پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) بانگی دەکردو

داوای لێ کردین بۆ موسوڵمان بوونو بڕواهێنان بە خودا، بانگی کردین کە ئیمان بە خودای خۆمان بێنین، ئێمەش بڕوامان پێ کردو موسوڵمان بووینو شوێنی کەوتین، بڕوامان بە تاکو تەنیایی خوداو دەسەڵاتی ڕەهاو بێ سنووری هێنا، هەروەها ئیمانمان هێنا بە هەموو ئەو حوکمو شەریعەتو دابو نەریتو ڕەوشتانەی پێغەمبەر بۆی هێناوین، هەموویمان وەرگرتو قبووڵمان بوو! ﴿رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الأبْرَارِ﴾ خودایە! لە تاوانە گەورەکانمان خۆش ببە، تاوانی بچووکمان بپۆشە، گوناهی گەورەو بچووکمان ڕەش بکەرەوە، بمانخەرە ریزی پیاوچاکانەوە، لەگەڵ ڕاستاڵان بمانمرێنە، لە کۆمەڵی صالحو خوداپەرستان حسێبمان بکە، شەرمەزاری ڕۆژی قیامەتمان مەکە، ﴿رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَى رُسُلِكَ﴾ خودایە! ئەوەی کەلەسەر زوبانی پێغەمبەر (درروودی خوای لەسەر بێ) بەڵێنت پێ داوین لە پاداشی باش، وەکوو سەرکەوتن لە ژیانی جیهانداو، چوونە ناو بەهەشت لە قیامەتدا بماندەرێو بۆمان جێبەجێ بکە! ئێمە تاوانبارینو کەمتەرخەمین، یارمەتیو تۆفیقی تۆ نەبێ هیچمان بۆ ناکرێ، خودایە! ﴿وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لێقەوماو شەرمەزاری بەرچاوی خەڵکی دەشتی مەحشەرمان مەکە، ئیمانمان بە هێز بکەو، کردەوەمان چاك بکەو، پاداشی باشمان لەسەریان بدەرەوە، تۆ وادە ڕاستو بەڵێن دروستی، لە دونیادا پێشکەوتوو سەرکەوتوومان بکە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ – النور/٥٥﴾.

لە قیامەتیشدا بە بەهەشتی بەرین شادمان بکە، وەکوو فەرمووتە: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ – التوبة/٧٢﴾. ئەمانە وادەو بەڵێنی خۆتن ﴿إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ بێگومان تۆ وادە ڕاستو بەڵێن دروستی، هەرگیز وەعدە بە خیلاف نەبوویو نابێ ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى﴾ پەروەردگاریان نزاو پاڕانەوەکەیانی لێ وەرگرتن، چونکە پاڕانەوەکەیان بە دڵ بوو، لە دڵو دەروونێکی پڕ لە ئیمانو ئیخلاصەوە سەرچاوەی گرتبوو! پێی فەرموون: کە من کردەوەی هیچ کەسێك بە فیڕۆ نادەم

پاداشی نێرو مێ؛ هەرکەسە بە گوێرەی خۆی دەدەمەوە! نێرو مێ شان بەشانی یەکتری لە ماف و ئەرکدا یەکسانن. پاداشیان لەسەر کردەوەی چاك و سزا لەسەر خراپەرکارییان وەکوو یەك وایە. ﴿بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ﴾ بڕێکتان لە بڕێکتان پەیدا دەبن، ئەمەش شتێکی غەریب نیە؛ نێرو مێ لەیەك رەگەزن و رەچەڵەکیان یەکە. مێ لە نێر پەیدا دەبێ و نێر لە مێ دەبێ! جا ﴿فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ ئەو ئادەمیزادانەی لە پێناو ئایینی خودادا کۆچیان کردووە، زێدو نیشتمانی خۆیان بەجێ هێشتووە ﴿وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ﴾ لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەرکراون، لە نیشتمانی دڵگیری خۆیان وەدەرنراون ﴿وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي﴾ لە پێناو رێبازی مندا سزایان چەشتووە ﴿وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ﴾ کوژراون و گیانیان بەخت کردووە؛! لە رێگای خودادا تێکۆشاون، ئەوانە هەموویان چاکەکارن و خودا پاداشی باشیان دەداتەوە، لە پاداشی کۆششی دڵسۆزانەیاندا ﴿لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ﴾ تاوانەکانیان پەردەپۆش دەکەم و لە گوناهیان خۆش دەبم ﴿وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ دەیانخەمە بەهەشتێکەوە کە بە ژێر دارو درەختەکانیدا جۆگەی ئاوی صاف دەکشین، هەتا هەتایە لەو لەزەت و خۆشییەدا دەمێننەوە ﴿ثَوَابًا مِّن عِندِ اللّهِ﴾ پاداشێکە خودا دەیداتەوە بە بڕواداران لە بری کردەوەی باشی دونیایان ﴿وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ﴾ خودا هەرە پاداشی باشی لایە بۆ کردار باشان ئەویش بەهەشتە.

**ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنن کە:**

١- پێویستە ئینسان لە مەخلوقاتی خودا وردبێتەوەو تێیان بفکرێ.

٢-زانایان فەرموویانە: وا باشە کەسێك لە خەو هەڵسا دەست بە دەم و چاویدا بێنێ، ئەم دە ئایەتەی سوورەتی ئالی عیمران بخوێنێ، چونکە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) وای کردووە، ئەمجار نوێژی بەیانی سوننەتی پێشەوە بکا وێڕای تاعەتکردن، بیر لە بوونەوەر بکاتەوە.

٣- موسوڵمان دەبێ هەموو کات یادی خودا بکاو لە هەموو کات و شوێنێکدا خودای لە بیر نەچێتەوە، لە کاتی راکشان و دانیشتن و راوەستاندا خودای لە یاد بێ!

ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە نوێژکەر بە راوەستانەوە دەبێ نوێژ بکا، ئەگەر نەیتوانی بە دانیشتنەوە، ئەگەر بۆی نەکرا بە راکشانەوە.

## سزاو پاداشی هەریەکێ لە کافرەکان‌و موسوڵمانان‌و باوەڕدارانی خاوەن نامەکان

﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَـٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَـٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾﴾.

پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا بەڵێنی پاداشی گەورەی بە موسوڵمانان دا، موسوڵمانان هەژارو نەدارا بوون، کافرەکان دەوڵەمەندو خاوەن سامان بوون، لە

لەزەت‌و خۆشیدا دەتلانەوە، ئەمجار صەبرو خۆڕاگریان دەخاتە دڵەوە، لە روانگەی بەراوردکردن لە نێوان لەزەتی دونیای بێ بەقاو لەزەتی بەهەشتی هەرگیز نەبڕاوەدا. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە دەڵێن: دەربارەی کافرەکانی مەکە بوو کە لە خۆشی‌و رابواردندا دەتلانەوە، برێ موسوڵمان گوتیان: بڕوانن خوانەناس‌و بێ بڕواکان چۆن لە خۆشیدا دەژین‌و ئێمەیش خەریکین لە برسا بمرین!!

ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە فەرمووی: ﴿لاَ يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُواْ فِي الْبِلاَدِ﴾ ئەی ئەو کەسەی کە ئەو جۆرە بیروڕایە بە دڵتاندا گوزەر دەکەن! یان ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) تۆ ئەمەیان پێ رابگەیەنە بڵێ: با ئەو حاڵەت‌و چۆنیەتییەی کافرەکان تێیدان لە لەزەت‌و خۆشی رابواردن؛ تۆ هەڵنەخەڵەتێنێ، واقیعت لێ چەواشە نەکا، چونکە ئەو خۆشی‌و کامەرانییە کاتییەی ئەوان تێیدان درێژخایەن نیەو، زۆر نامێنێتەوە رادەگوێزرێن بۆ کوشندەترین سزا! پێویستە موسوڵمان چاو ببڕێتە ئەو پاداشەی کە خودا بۆی داناوە کە خۆشی‌و کامەرانییەکی هەمیشەیی‌و بەردەوامە لە ژیانی بەهەشت.

﴿مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ ئەو بەرەڵلای‌و هاتووچۆو رابواردنەیان خۆشییەکی کاتی‌و ماوە کورتە، زۆر نابا کۆتایی پێ دێ پاشان گەڕانەوەو حەوانەوەیان لە دۆزەخدا دەبێ، کە خراپترین شوێنی حەوانەوەیە!

ئەمجار دوای ئەوەی حاڵی کافرەکانی دیاری کردو ئاکام‌و سەرەنجامی ئەوانی روون کردەوە، سەرەنجامی موسوڵمانان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بەڵام ئەوانەی تەقوای خودایان کردووە، پابەندی فەرمانەکانی بوون‌و خۆیان لە نەهی لێکراوەکانی پاراستووە، ئەوە لە پاداشی ئەوەدا چەند باخێکی بەهەشتیان دەدرێتێ کە بەژێر دارەکانیدا جۆگای ئاوی صاف دەکشێن‌و بە ئارەزووی خۆیان لەزەت وەردەگرن‌و خۆشی دەچێژن‌و لەم نیعمەت‌و لەزەتەدا هەتا هەتایە دەمێننەوە.

﴿نُزُلاً مِّنْ عِندِ اللّهِ﴾ میوانی رێزلێگیراوی پەروەردگارن، بە لوتف‌و کەرەمی خۆی دایان دەپۆشێ، لە کەرەم‌و بەخششی خۆی بەهرەمەندیان دەکا، ئەم شوێن‌و مەنزڵگاو بەهەشتە رازاوە لەزەتێکی جەستەیی لێ وەردەگرن.

﴿وَمَا عِندَ اللّـهِ خَيْـرٌ لِّلأَبْـرَارِ﴾ ئـەوەی لای خودایـە لـە ڕێـزو تەقـدیر، زیـاد لـەو خۆشیانەی باسکران، ئەوە بۆ پیاو چاکانو هەڵوێـست پاکـان زۆر چاکترە لـەوەی کـە خوانەناسان تێیدا ڕادەبوێرن.. بۆیە پێیان دەگوترێ: (ابرار) چـونکە لەگـەڵ بـاوكو دایكو کوڕو کچیان چاکەکار بوون.

ئەمجار باسی کۆمەڵێك لە خاوەن نامەکان دەکا: کە بەهۆی قورئانەوە هیدایـەت دراونو بڕوایان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کردووە، هەر وەکـوو چـۆن لەوەپێش بڕوایان بە پەیامی پێغەمبەرانی پێشوو کردووە!

وەکوو عەبدوڵلای کوڕی سەلامو هاوەڵانیو نەجاشـی (مـەلیکی حەبەشـە)و هـی تریش، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَمَا أُنـزِلَ إِلَـيْكُمْ﴾ بێگومـان لـەو خـاوەن نامانـە هەیـە: کـە بـڕوای بـە خـودا هێنـاوە، موحەممـەد بـە پێغەمبـەر دەزانێو ئیمانی پێ هێنـاوە، بـڕوای بـەو قورئانـە کـردووە کـە بـۆ ئێـوە نێردراوەتـە خوارێ ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَـيْهِمْ﴾ هـەروەها ئیمانیـان بـەو نامانـەش هێنـاوە کـە بـۆ خۆیـان نێردراوە — کە تەوراتو ئینجیلە — ئەوانە چەند ڕەوشتێکی ناوازەیان هەیە.

١- بڕوایان بە خودا بڕوایەکی پتەوو چەسپاوو دامەزراوە!

٢- بڕوایان بە هەموو قورئان هەیە: کە نێردراوە بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ)و تاقە پەڕاوێکی ئاسمانییە کە بەبێ دەست لێدانو گۆڕانکاری ماوەتەوە.

٣- بڕوایەکی ئیجمالیو پوختەیان بە تەوراتو ئینجیل هەیە.

٤- ﴿خَاشِعِينَ لِلّهِ﴾ ترسو خۆفێکی تەواویان لەخودا هەیە کە بـەروبومی بـڕوای ڕاستو پتەوە، چونکە هەرکاتێ دڵ لەخودا ترسا، هەموو جەستە ئـەو ترسـەی تێدا ڕەنگ دەداتەوە.

٥- ﴿لاَ يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ کاڵای پڕوپووچی دونیایی بە ئـایینو بیرو بـاوەڕ نـاکڕن... پارێزگـاری نیگـای خـودایی دەکـەنو هـیچی لێ ناشـێرنەوە، ئـەو موژدەیەی کە لە تەوراتو ئینجیلدا دراوە بە هاتنی موحەممەد (پێغەمبـەری ئـاخر زەمان)و ڕەوشتو پێغەمبەرایـەتی نیـشانەکانی خۆیو نیـشانەی ئومەتەکـەی چـۆن پێیان گەیشتووە ئاوا بڵاوی دەکەنەوەو بە خەڵکی تری دەگەیەنن.

﴿أُوْلَئِـكَ لَهُـمْ أَجْـرُهُمْ عِنـدَ رَبِّهِـمْ﴾ ئەوانـە: کـە ئـەو رەوشـتانەیان تێدایـە — جوولەکـەبن یـان گـاور — پاداشـی تـەواوی کـردەوەی خۆیـان وەردەگرنـەوە، لەسـەر هەموو کردەوەیەکی چاکیان پاداشی تەواویان لای خودایەو پەزمەندە کراوە بۆیـان، ﴿إِنَّ اللّهَ سَرِيعُ الْحِسَـابِ﴾ خودا زۆر خێرایانـە لێکۆڵینـەوەو حیسابو سـەرژمێری کردەوەی ئادەمیزادان دەکا، لەماوەیەکی زۆر کورتو کەمـدا حیـسابو لێکۆڵینـەوەی بـێ هەڵـەو بـێ سـتەم بـۆ بەنـدەکانی خـۆی دەکـا، حـوکمو فـەرمانی خـودا پێداچوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی تێدا نییە.

ئـەو رەوشـتانەی باسـکران لـەبرێ جوولەکـەدا هـەبوونو کـە موسـوڵمان بـوون؛ وەکـوو عەبـدوڵلای کـوڕی سـەلامو هـاوەڵانی کـە ژمارەیـان لـە دە کـەس تێپـەڕی نەدەکرد، بەڵام مەسیحییەکان زۆریان موسـوڵمان بـوونو پابەنـدی فـەرمانی خـوداو پێغەمبەر بوون، وەکوو پـەروەردگار لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الَّـذِينَ قَالُوَاْ إِنَّا نَصَارَى ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ، إِذَا سَمِعُواْ مَا أُنـزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ، وَمَا لَنَا لاَ نُؤْمِنُ بِاللّهِ وَمَا جَاءنَا مِنَ الْحَـقِّ وَنَطْمَـعُ أَن يُـدْخِلَنَا رَبَّنَـا مَـعَ الْقَـوْمِ الصَّالِحِينَ، فَأَثَابَهُمُ اللّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ جَـزَاء الْمُحْسِنِينَ — المائدة/ ٨٢ — ٨٥﴾.

ئەمجار پەروەردگار کۆتایی بەم سوورەتە هێنا بە ئامۆژگاری کردنێکی گشتی بۆ موسوڵمانان کەوایان لێ بێ نزاو پاڕانەوەیان گیرا بێ، لە دونیادا بەسەر دوژمندا زاڵ بنو لە قیامەتیشدا پاداشی باش وەربگرنو بە مراد بگەن؛ بۆیە روویـان تـێ دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـواْ اصْـبِرُواْ﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی کـە بڕواتـان هەیـەو ئیمانتان هێناوە، خۆڕاگرو بەردەوام بن لەسەر بـەجێ هێنـانی ئەرکـە پێویـستەکانی ئایین، وەکوو ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکان.

هەروەها خۆڕاگربن لەبەرامبەر بەڵاو نەخۆشـیو ناخۆشـیو هـەژاریو نـەداری، ﴿وَصَـابِرُواْ﴾ پێـشبڕکێی صـەبرو ئـارامگرتن بکـەن لەگـەڵ دوژمنـدا، بەرامبـەریی

نەفس‌و ئارەزۆ بکەن.. ﴿وَرَابِطُواْ﴾ لە سەنگەردابن بۆ دوژمن؛ هەموو کاتێ خەریکی خۆ ئامادەکردن بن بۆ جیهادو بەرگریی لە ماڵو نامووس‌و نیشتمان‌و ئایین، هەموو کاتێ حازرو ئامادە باش‌و گوێ لەمست بن بۆ فەرمانی فەرمانڕەوایی موسوڵمان!!

ئیمامی بوخاری لە سەهلی کوڕی سەعدی (الساعدی)یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا». ئیمامی موسلیمیش فەرموودەیەکی لە سەلمانەوە گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ». هەردوو فەرموودەکە پشتگیری یەکتری دەکەن‌و یەك مانا دەبەخشن.

﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ تەقوای خودا بکەن، بترسن لە تۆڵەو سزای، بەنهێنی‌و بە ئاشکرا خوداتان لەبەرچاو بێ! پابەندی فەرمان بن‌و خۆپارێزبن لە نەهییەکانی، بەڵکوو سەرفراز بن، ئاشکراشە کەسێك پابەندی ئەم ئامۆژگارییانە بێ بە موراد دەگاو لەناخۆشی ڕۆژی قیامەت ڕزگاری دەبێ! سەرفرازی دونیاو قیامەت دەبێ!

# سوورەتی النساء
# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

ئەم سوورەتە چوارەم سوورەتی قورئانو دوای سوورەتی (البقرة) درێژترین سوورەتی قورئانی پیرۆزە.

ئەم سوورەتە، مەدینەییە، واتە: پاش کۆچ کردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بۆ مەدینە هاتۆتە خوارێ، هاتنە خوارەوەکەی لەچەند کاتو وەرزی جیاجیادا بووە، ئیمامی بوخاری لە عائیشەوە فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: «مَا نَزَلَتْ سُورَةُ النِّسَاءِ إِلاَّ وَأَنَا عِنْدَ رسول الله» (درودی خوای لەسەر بێ). ئاشکراشە خاتوو عائیشە ژیانی ژنو مێردایەتی لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە مانگی شەوالی ساڵی یەکەمی کۆچیدا دەست پێکرد. دەربارەی فەزڵو گەورەیی ئەم سوورەتە حاکم لە موستەدرەکدا لە (عبدالرحمن)ی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: لە سوورەتی (النساء)دا پێنج ئایەتی تێدا هەن ئەگەر هەموو دنیاو چی تێدایە هی من بێ بە ئەندازەی ئەو پێنج ئایەتە دڵم پێ خۆش نین!!

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ، إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ، إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء، لَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ﴾.

حاکم دەڵێ: ئەم فەرموودەیە ئیسنادەکەی راستو دروستە، ئەگەر (عبدالرحمن) لە باوکی بیستبێ؟!؟

**موناسەبەو پەیوەندی ئەم سوورەتە بە سوورەتی ئالی عیمرانەوە لەچەند روویەکەوەیە:**

١- سوورەتی ئالی عیمران کۆتایی هات بە فەرمانکردن بە موسوڵمانان بۆ تەقوا کردن، سوورەتی (النساء)یش بەهەمان فەرمان دەستی پێ کرا؛ کە فەرمان بە هەموو ئادەمیزاد دەکا بە تەقوا کردن.

٢- ئایەتی ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ ...﴾ دەربارەی غەزای ئوحوود هاتە خوارێ، لە سوورەتی ئالی عیمرانیشدا شەصت ئایەت دەربارەی غەزای ناوبراو

هاتوونە خوارێ، ئاشکرایە دانانی سوورەتو ئایەت هەریەکە لەشوێنی خۆی بە دەستنیشانکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) خۆی بووەو کارێکی تەوقیفییە.

بۆیەش ناونراوە (سورة النساء) چونکە زۆر باسی حوکمە شەرعییەکانی ئافرەتی تێدایە.

**ئەو حوکمو ئامۆژگاریو یاسا ئیسلامییانەی ئەم سوورەتە لەخۆی گرتوون ئەمانەن:**

١- ئەم سوورەتە یاسای خێزانو کۆمەڵگای ئیسلامییو پەیوەندی بە کۆمەڵگای ئادەمیزادەوە شیی دەکاتەوە، بەشێوەیەکی کورتو پوخت باسی رەگەزو رەچەڵەکی ئادەمیزاد دەکاو ئەوە دەچەسپێنێ کە هەموو ئادەمیزاد لە یەك رەگەزو یەك تاکە کەس پەیدابوون، لە بنەماو رەچەڵەکدا کەس لەکەس زیاتر نییە، ئەمجار بۆئەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکە رێكو پێك بێ، فەرمانی بەهەموو ئادەمیزاد کردووە کە خۆیان لەبێ فەرمانی خودا بپارێزن، کارێك نەکەن خۆیانو ماڵو منداڵو خزمو کەسوکار تووشی بەڵاو ناسەنگ ببن. ئەوەیان بۆ ئاشکرا دەکا کە خودا چاودێرە بەسەریانەوە ئاگاداری هەموو هەڵسو کەوتێکیانە.

٢- سوورەتەکە بەشێوەیەکی دوورو درێژ باسی یاسای ئافرەت دەکا، حوکمی کچو ژنو خوشكو پوورو دایك روون دەکاتەوە، ئەوە دەچەسپێنێ کە ئافرەت لەبارەی خاوەنێتی ماڵو داراییەوە کەسایەتی سەربەخۆی هەیەو دەتوانێ بە ویستو ئارەزووی خۆی ماڵو دارایی خۆی هەڵبسوڕێنێ!، هەروەها لە خێزاندا مافی کەسایەتی خۆییو مارەییو بژێوو کەلەپوور گرتنی هەیە!

هەروەها باسی پیرۆزیی پەیوەندی ژنو مێردایەتیو پەیوەندیی خزمایەتیو ژنو ژنخوازی شی دەکاتەوە! باسی رێکخستنەوەی ژنو مێردی لێك زوویر بوو دەکاو گرنگی عەقدی نیکاحو سوور بوون لەسەر پەرمپێدانی رێز لێ دەنێ، باسی ئەوە دەکا کە سەرۆکایەتی پیاو لە خێزاندا دەسەڵاتێکی ملهوڕیو دیکتاتۆری نییە، بەڵکوو لێپرسراویو ئەرك خستنە ئەستۆیەو بۆ ئاسانکردنی هەڵسووڕانی کاروباری خێزانە.

٣- ئـەمجار سـوورەتەکە تـەرازووی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان دەستنیـشان دەکاو ئەوە دەچەسپێنێ کە پەیوەندییەکە دەبێ لەسەر بناغەی ئامۆژگاری کردنـی یەکتری‌و هاریکاری‌و سەرپەرشتی‌و خۆشەویستی‌و یارمەتیدانی یـەکتری دابمـەزرێ! بۆئەوەی بنەمای گەل‌و نەتەوە بە پتەوی رەنگ رێژ بکرێ.

٤- هـەروەها شێوەی پەیوەنـدی کۆمـەڵگای ئیـسلامیی بـە کۆمـەڵگاو دەوڵـەتانی جیهانـەوە نەخـشە کێش دەکـا، یاسـاو رەوشـت‌و مامەڵـە کـردن لەگـەڵ دەوڵـەتانی جیهانـدا روون دەکاتـەوە، بـڕێ یاسـای جـەنگ‌و رەوشـتی جـەنگاوەران‌و چـۆنیەتی مامەڵـەی سـەلام‌و شـێوەی موناقەشـەو دەمـە دەمـێ لەگـەڵ خـاوەن نامەکانـداو هەڵمەتی کاریگـەر بـۆ سـەر دووڕووەکـان بەشـێوەیەکی پوخـت‌و کـورت دەستنیـشان دەکا.

ئەمە هەمووی بە مەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی بێ غەل‌و غەشی پاك‌و خاوێن لە وڵاتی ئیسلامدا بـۆ پاکردنـەوەی ئـەو کۆمەڵگایـە لەپـشێوی بـیرو بـاوەڕو، لانەدان لە عەقیدەی یەکتا پەرستی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی بیرو باوەڕێکی صاف‌و بێگەردو یەکتا پەرستییەکی زانستییانەی خودا ویست!!

جا بۆیە لەسەرەتاوە بۆ چەسپاندنی یەکێتی رەگەزی ئـادەمیزادو یـەکێتی ژن‌و مێردو نێرو مێ لە رەچەڵەکداو پەیوەندی خێزانی، فەرمووی:

## ئادەمیزاد هەموویان لەیەك بنەمای ئادەمیزادیی پەیدابوون ژن‌و مێرد لەیەك کانن

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ ئەی ئادەمیزادانی هۆشمەند! خۆتان لەسزای پەروەردگارتان بپارێزن بەوە کە پابەندی فەرمانەکانی بن‌و لە نەهیلێکراوەکان دوور بکەونەوە، لەهەموو شتێکدا کە پەیوەندی بەخودا پەرستی‌و مافی بەندەکانی خوداوە هەیە، بەگوێرەی بەرنامەی خودا رەفتار بکەن، خۆتان بپارێزن لەسزای ئەو پەروەردگارەی ئێوەی دروست کردووە لەیەك تاکە کەس، کە باوە ئادەمە هەمووتان لە ئادەم کەوتوونەتەوەو ئەویش لەگەڵ دروستکراوە.

﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ هەر لەو رەچەڵەك‌و رەگەزەی باوە ئادەمی لێ دروستکرد، دایکە (حەوا)شی دروستکردووە، کە خێزانی ئادەمە! یان وەکوو دەڵێن: لە پەراسووی چەپی ئادەم دایکە (حەوا)ی دروستکرد! ﴿وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء﴾ لەو ژن‌و مێردە کە (ئادەم‌و حەوا)ن ئادەمیزاد کەوتۆتەوە، پیاوی زۆرو ئافرەتی فرمیان لێ کەوتوونەوە، ئەمجار لەو وەچەو نەوانەی لە ئادەم‌و حەوا کەوتوونەوە پەیوەندی خزمایەتی‌و خێزانی تێدا رسکاندون؛ بۆئەوەی بەزەییان بە یەکتردا بێتەوەو، هاریکاری یەکتری بکەن‌و زەوی ئاوەدان بکەنەوەو کۆمەڵگای بەختەوەرو خودا پەرست پێکەوە بنێن، بۆیە جارێکی تر جەختی لەسەر تەقواو خۆپاراستن لەسزای پەروەردگار کردەوەو فەرمووی: ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ﴾ خۆتان بپارێزن لەسزای ئەو خودایەی کە بەناوی ئەوەوە داوای شت لەیەکتری دەکەن – وەکوو دەڵێی بۆ خاتری خودا وابکە، یان توخودا وامەکە.... هتد! –

﴿وَالأَرْحَامَ﴾ هەروەها خۆتان بپارێزن، لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، چونکە هەبوونی خزمایەتی نیعمەتەو داخوازی وەفاو ئەرکە دەبێ سوپاسی خودای لەسەر بکرێ! خزمایەتی پەیوەندی‌و خۆشەویستی‌و هاریکارییە، مرۆڤ لەژێر سایەیدا هەست بە خۆشبەختی‌و کامەرانی دەکا، هەست بە پشت‌و قووەت‌و هێزی مەعنەوی دەکا، لەناو کۆمەڵدا کەیف خۆش دەبێ بە کامەرانی خێزان‌و خزمانی، خەمناك دەبێ بە ناخۆشییان. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (فاطمة بضعة مني يقبضني ما يقبضها ويبسطني ما يبسطها) بە یادکردنەوەی ئەوە کە

رەچەڵەکی ئادەمیزاد یەکێکە، ئاماژە بەوە دەکا کە دەبێ سنووری مرۆڤایەتی بپارێزرێ، ئادەمیزاد هەموویان برای یەکترین خۆشیان بێ‌و ترشیان بێ!

برایەتیش داخوازی ئاشتی‌و هاریکاری‌و نەفرین کردنە لە شەڕو شۆڕو کێشەو دووبەرەکی.

مەبەست بەو تاکە نەفسەی کە ئادەمیزادی لێ کەوتۆتەوە باوکە ئادەمە، زۆربەی زانایانی ئیسلام پێیان وایە ئەو ئادەمە باوکی هەموو ئادەمیزادە، جگە لەو ئادەمە ئادەمی تر نەبوون، برێك زانا پێیان وایە پێش ئەم ئادەمە چەند ئادەمی تر هاتوونە کۆڕی ژیانەوە! بەڵام ئەم رایە لەگەڵ ظاهیری قورئان دژ دەوەستێ!

مەبەست بە (زوج) دایکە حەوایەو وەکوو دەڵێن: لە پەراسووی چەپی ئادەم دروستکراوە، لەوکاتەدا ئادەم نوستبوو کە بەخەبەر هات‌و حەوای بینی حەزی لێ کردو وەگری یەکتری بوون! فەرموودەیەك هەیە ئیمامی موسلیم‌و بوخاری ریواتیان کردووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ».

برێ لە زانایان وەکوو ئەبو موسلیمی ئەصفەهانی دەڵێن: مەبەست لە ﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ ئەوەیە: پەروەردگار حەوای لە رەگەزی ئادەم بەدیهێناوە، ئادەم‌و حەوا یەك رەچەڵەکن‌و لەیەك سروشتن، دەڵێن: چ گرنگییەك لەوەدا هەیە کە حەوا لە پەراسووی چەپ دروستکرابێ؟ پەروەردگار دەتوانێ حەوا وەکوو ئادەم لە گڵ دروست بکا! بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا – الروم/ ٢١﴾.. مانای (مِّنْ أَنفُسِكُمْ) یان بە (من جنسكم) کردووە.. یان دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ – التوبة/١٢٨﴾.. بەڵام ئەم رایەی ئەبو موسلیم رەت کراوەتەوە بەوە کە پێچەوانەی مانای فەرموودە راستەکەی بوخاری‌و موسلیمە، حیکمەتیش لەوەدا کە حەوا لە پەراسووی ئادەم دروستکرابێ. دەرخستنی بە توانایی خودایە، کەوا دەتوانێ زیندوو لە زیندوو دروست بکا بەبێ زاووزێ هەر وەکوو چۆن دەتوانێ زیندوو لەمردوو دروست بکا!

ئەمجار کۆتایی ئایەتەکە بەوە دەهێنێ، کە پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ بێگومان خودا بەسەر هەموو کردەوەیەکی ئێوەدا چاودێرو ئاگادارە، بناغەی هەموو هەڵوێستو بیرو باوەڕێکتان دەزانێ وە زانایە بە ئەندازەو چۆنیەتی کاریگەری ئەو کردارو هەڵوێستانەتان لەسەر دڵو دەروونتانو هیچی لێ ون نابێ، هیچ حوکمو یاسایەکتان بۆ دانانێ مەگەر بەرژەوەندیو خۆشبەختی دونیاو قیامەتتانی تێدا بەدی نەکرێ!

## ئەوەی لەم ئایەتەوە وەردەگیرێ ئەمانەن:

١- تەقواو خۆپاراستن لە سزای خودا پێویستە.

٢- ئادەمیزاد هەموویان لەیەك دایكو باوك کەوتوونەوەو هەموویان لە ئادەمو ئادەمیش لە گڵ دروستکراوە.

٣- ئافرەت بەشێکە لەپیاوو لەو دروست کراوە، بەیەکەوە ژیان بەسەر دەبەنو وەگری یەکتربوونو بێ یەك هەڵناکەن، پێویستە هەردووکیان هاریکاری یەکتری بن، بێ هاریکاری نێوانیان رەچەڵەکی ئادەمیزاد لەسەر زەوی پەرە ناسێنێ!

٤- دەشێ بەناوی خودا داوای شت لە خەڵك بکەی.

٥- گرنگی پەیوەندی خزمایەتیو هەوڵدان بۆ بەجێهێنانی صیلەی رەحمو نەپچڕاندنی، چونکە خودا صیلەی رەحمی بەناوی خۆیەوە لکاندووە.

زانایانی موسوڵمان هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن، کە بەجێهێنانی صیلەی رەحم واجبەو پچڕاندنی حەرامە، ئەوەش راستە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتی (ئەسماء)ی خێزانی عەرزی کرد وتی: ئایا من هاموشۆی دایکم بکەم؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ هاتوچۆی دایکت بکەو صیلەی رەحمی لەگەڵدا بەجێ بێنە، دایکیشی بت پەرست بوو.

## پێدانەوەی ماڵی هەتیوان بە خۆیانو خواردنی ماڵیان

﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ ﴾.

جا کە لەئایەتی پێشوودا فەرمانی کرد بە ئادەمیزادان بۆ تەقواکردن بەگشتیی، موناسیب بوو، کە دەست بکا بە دەستنیشانکردنی جۆرەکانی تەقوا کە بەشێك لە تەقوا پاراستنی ماڵی هەتیوانەو فەرمووی: ﴿وَآتُوا۟ الْيَتَامَى أَمْوَالَهُمْ﴾ موقاتیلو کولەبی دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی کابرایەکی غەطەفانی هاتۆتە خوارێ: کە برازایەکی هەتیوی هەبوو ماڵو داراییەکی زۆری هەبوو لای مامەکەی، کاتێ هەتیوەکە باڵغ بوو پێگەیشت، داوای ماڵەکەی کردەوە، مامەکەی نەیدایەوە، چوونە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: کە کابرای غەطەفانی ئایەتەکەی بیست، وتی: فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەرم، پەنا دەگرم بەخودا! لەتاوانی گەورە، ئیتر ماڵەکەی دایەوە بە برازاکەی.

﴿وَآتُوا۟ الْيَتَامَى أَمْوَالَهُمْ وَلاَ تَبَدَّلُوا۟ الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ﴾ ئەی سەرپەرشتیاری هەتیوان! هەرکاتێ هەتیو باڵغ بوو، پێگەیشت، ماڵو دارایی خۆیان کە لەژێر دەستی ئێوەدایە بیان دەنەوەو هیچی لێ گل مەدەنەوە، لەسەردەمی منداڵیشیدا لە ماڵو دارایی خۆی نەفەقەی بۆ دابین بکەن، هیچ ئەندازەیەکیش لە ماڵی هەتیوەکە تێکەڵ بە ماڵی خۆتان نەکەن، ماڵو سامانی حەلاڵی خۆتان پیسو حەرام نەکەن، بەهۆی تێکەڵاوو بوونی ماڵی هەتیوان. ﴿وَلاَ تَأْكُلُوا۟ أَمْوَالَهُمْ إِلَى أَمْوَالِكُمْ﴾ ماڵی هەتیوان لەگەڵ ماڵی خۆتان مەخۆن، بۆیەش لەجیاتی هەموو تەصەڕوفێك کە لەماڵدا دەکرێ وشەی (اکل = خواردن)ی بەکارهێنا چونکە زۆربەی تەصەڕوفو هەڵسو کەوتی ماڵو دارایی بە مەبەستی خواردنە. وشەی (إلى) بەمانا (مع) هاتووە واتە: ماڵو دارایی هەتیوان مەخەنە پاڵ ماڵو دارایی خۆتان بە مەبەستی خواردن! ئێوە ئەگەر وا بکەن ماڵی حەلاڵی خۆتان گۆڕیوەتەوە بە ماڵی حەرام کەهی هەتیوەکانە، ئەمەش تاوانێکی گەلێك گەورەیەو خۆتانی لێ بپارێزنو توخنی

مەکەون، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾ بێگومان خواردنی ماڵی هەتیو تاوانێکی گەورەیە!

**بەکورتی ئایەتەکە دوو شت دەگەیەنێ:**

أ- پێویستە ماڵی هەتیو پارێزگاری بکرێ، هەرکاتێ هەتیوەکە باڵغ بوو ماڵو دارایی خۆی پێ هەڵدەسوڕا ماڵەکەی تەسلیم دەکرێتەوە.

ب- هەموو جۆرە سوود وەرگرتنێك لە ماڵی هەتیو حەرامە گوناهی گەورەیە، مەگەر بۆ کەسێك ناچاربێ، ئاماژە بە ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ – النساء/٦﴾.

## فرەژنی تا چوار رەوایە بۆ پیاو بەلاَم بەمەرج! مارەیی پێدانیش واجبە

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا (٣) وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا (٤) ﴾.

ئەمجار دێتە سەر باسی فرەژنیو مارەییو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ﴾ ئەگەر لەدڵی خۆتاندا هەستان کردو ترسان لەوەی کە ماڵی ژنی چەتیوە بخۆنو مافی پێشێل بکەن: ئەوە نابێ مارەیان بکەن، چونکە خودا لەباتی مارەکردنی ئەوان بۆی حەلاڵ کردوون کە ژنی تر مارە بکەن دوو، سێ، چوار.

مەبەستى ئايەتەكە بە گوێرەى هۆى هاتنەخوارەوەكەى ديارى دەكرێ، جا يان دەربارەى مارەكردنى ئافرەتى ناچەتيومە، واتە: ئەگەر چەتيوێكتان لەلابوو ترسان لەوەى كە مارەيى هاوشانى خۆى نەدەيتێ، واز لەو بێنەو هەوڵ بدە ئافرەتێكى تر مارە بكە، ئافرەتى تر زۆرن، دەتوانن مارەيان بكەن، دوو، سێ، چوار، واتە: زياد لەژنێك تا چوار دروستە، بەڵام بەمەرجێك دادپەروەرانە هەڵس و كەوتيان لەگەڵ بكەن و مافيان پێشێل نەكەن.

﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً﴾ ئەگەر ترسى ئەوەتان هەبوو دادوەرانە لەگەڵياندا نەجووڵێنەوە تەنها بە يەك ژن دابين ببن و قەنيات بكەن!

﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ يان كە ويستان زياد لە ئافرەتێكتان هەبێ، ئەوە ئافرەتى كۆيلە پەيدا بكەن، چونكە ئەو ئافرەتە كەنيزەكانە ئەگەر زۆريش بن رەوايە! ﴿ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ﴾ ئەمە گونجاوترە بۆئەوەى ستەم نەكەن.

يان دەربارەى دادوەرييە لەنێوان ژنەكاندا ئەگەر پياوەكە فرەژن بوو، واتە: كاتێك ئايەتى ﴿وَآتُواْ الْيَتَامَى أَمْوَالَهُمْ﴾ هاتە خوارەوە سەرپەرشتيارى هەتيوەكان كەوتنە ئەمرى واقيعەوە، هەرچەندە دەربارەى عەدالەت كردن لەگەڵ ئافرەتاندا بەلايانەوە مەبەست نەبوو، پياوى وا هەبوو دە ژنى هەبوو بە عەدالەتيش لەگەڵياندا نەدەجولايەوە، ئيتر بەم ئايەتە پێيان راگەيەنراو پێيان وترا: ئەگەر ترسى عەدالەت نەكردنتان هەيە دەربارەى مافى هەتيوو تووشى حەرەج بوون، دەى ئەگەر دەربارەى عەدالەت نەكردن لەنێوان خێزانەكانتاندا ترستان هەبێ، ژمارەى ژنەكانتان كەم بكەنەوەو لەگەڵيشياندا بە عەدالەت بجولێنەوە، چونكە پێشێل كردنى مافى ژنانيش وەكوو پێشيل كردنى مافى هەتيوان تاوانە.

بوخارى و موسليم و نەسائى و بەيهەقى و هى تريش لە عورووەى كوڕى زوبەيرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پرسيارم لە پوورە عائيشەم كرد؛ (دايكى موسوڵمانان) دەربارەى هاتنە خوارەوەى ئەم ئايەتە لە وەڵامدا وتى: ئەى خوشكەزاى خۆم! وا رێ دەكەوت ئافرەتى چەتيوەى خاوەن سامان لەماڵى سەرپەرشتيارەكەيدا دەبوو، كابراى سەرپەرشتيار تەماعى ماڵ و سامانەكەى و جوانييەكەى دەيگرت، دەيويست مارەى بكا بەبێ ئەوەى مارەيى بداتێ، يان وەكوو هاوشانى خۆى مارەيى بۆ ديارى

بكا، ئیتر ئەومیان لێ قەدەغە كراو، فەرمانیان پێ كرا كە بچن بە ئارەزووی خۆیان ئافرەتی تر مارە بكەن لە یەكەوە تا چوار.

بەكورتی مانای ئایەتەكە بەم جۆرەیە: ئەگەر زانیتان‌و لەدڵی خۆتاندا هەستان كرد كە ستەم لە چەتیوەكان دەكەن؛ بەوە كە مارەییان نەدەنێ یان ماڵی هەتیوان بخۆن بەخۆڕایی، ئەوە پێویستە كە ئەو چەتیوانە مارە نەكەن، بچن ژنی تر مارە بكەن، یەك یان دوو، یان سێ یان چوار، یان پێویستە كە لە كاتی فرە ژنیدا دادپەروەر بن، زیاد لە چوار مارە نەكەن، بەڵكوو بتوانن عەدالەت بەكاربێنن، عەدالەتەكەش بە گوێرەی توانای پیاوەكەیە وەكوو ئەوە لە شوێنی حەوانەوەو پۆشاك‌و مانەوە لایان یەكسانی بنوێنێ، بەڵام شتێك كە لە توانایدا نەبێ وەكوو خۆشەویستی دڵ‌و ئەو جۆرە شتانە، ئەوە پیاو بەرپرسیار نیە كە یەكسانی بكا لە نێوانیاندا، چونكە خۆشەویستی‌و مەیلی دڵ شتێك نیە دەسەڵاتی ئینسانی تێدا بێ!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ئاخرو ئۆخری ژیانیدا، دڵی زیاتر پەیوەست بوو بە عائیشەوە، بەڵام بێ رەزامەندی خێزانەكانی تری هیچ زێدە شتێكی مادی بۆ تەرخان نەكردووە، بەڵكوو دادوەرانە هەڵس‌و كەوتی لەگەڵدا دەكردن‌و دەیفەرموو: «اَللّٰهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ فَلاَ تؤاخذني فِيمَا لاَ أَمْلِكُ» مەبەستی خۆشەویستی دڵ بووە!

ژیانی كامەرانی ژن‌و مێرد لەوەدایە كە پیاو یەك ژنی هەبێ ئەمە ئەوپەڕی ئاستێكی خۆشبەختی خێزانەو پێویستە خەڵكی لەسەر پەروەردە بكرێ‌و قەناعەتیان پێی پەیدا بێ، بەڵام جاری وا دەبێ كە لەم راستە رێیە لابدەین لەبەر بەرژەوەندییەك كە پەیوەندی بە ژیانی ژن‌و مێردەوە هەیە، یان بەرژەوەندی گەل‌و نەتەوە داخوازی ئەوەیە: كە فرەژنی رەوابێ‌و برێ كەس بتوانن زیاد لەژنێك تا چوار مارە بكەن!

١- وەكوو ئەوە پیاو ئافرەتێكی نەزۆك مارە بكاو حەزی لەوەبێ كە منداڵی هەبێ! كەوابێ لە بەرژەوەندی ئافرەتەكەیە یان بەرژەوەندی هەردووكیانە كە وێڕای مانەوەی ئەم ژنە نەزۆكە لەژێر نیكاحی پیاوەكەدا ژنێكی تر بێنێ! بەتایبەتی ئەگەر پیاوەكە خاوەن پلەو پایەو ماڵ‌و سامان بوو.

٢- ئەگەر ژنەکە بەتەمن بێ‌و لە سکوزا وەستابێتەوە، پیاوەکەش حەزی لە منالْ بێ‌و بشتوانێ بژێوی زیاد لەژنێك بدا.

٣- ئەگەر پیاوەکە هێزی پیاوەتی زۆربێ‌و بزانێ کە ژنێك بەشی ناکاو بەم جۆرە پیاوەکە میزاجێکی پیاوەتی تایبەتی هەبێ‌و ژنەکە بە پێچەوانەوە بێ، یان ئافرەتەکە ماوەی بێنوێژی دوورو درێژ بێ‌و بەشێکی زۆری مانگ لە حەیزدا بێ! ئەوکاتە پیاوەکە لەبەردەم دوو ڕێگادایە یان ژنێکی تر بێنێ یان تووشی داوێن پیسی ببێ‌و ئاین‌و مالْ‌و تەندروستی بفەوتێ! ئەمەش دەبێتە کارەسات بەسەر ژنەکەوەو زۆر لەوە خەتەرترە بۆی کە ژنی بەسەر بێ.

٤- هەرکاتێك لە کۆمەڵگادا ژمارەی ئافرەت لە پیاو زۆرتربێ بەشێوەیەکی بەرچاو، وەکوو لە ئاکامی شەڕی گەورەدا جاری وا دەبێ بە هەزاران گەنج‌و لاو دەبنە خۆراکی دێوەزمەی جەنگەکەو پیاو کەم دەبن‌و ئافرەت زۆرو هیچ ڕێگا چارەیەکیش نیە بۆ دابین کردنی ژیانی جگە لە فرۆشتنی شەرەفی کە ئەمەش دەبێتە بەلایەکی سامناك تر! چونکە ئەوکاتە ئەرکی بژێوی خۆی‌و بژێوی ئەو منداڵەش کە باوکێکی دیاریکراوی نیە بژێوی بکێشێ لە ئەستۆیدا دەبێ، بەتایبەتی لەکاتی حەمل‌و دوای منداڵ بوون‌و ماوەی شیر خواردنی!!

ئەوەی کە دەبینرێ لە وڵاتە پیشەسازی‌و پێشکەوتووەکاندا کە لە کارگەو فەرمانگەکاندا ژن‌و پیاو تێکەڵن، زۆرجار وادەبێ دەست درێژی دەکرێتە سەر ئافرەت‌و گەنجینەی کچێنی پێشێل دەکرێ‌و کارەساتی ناخۆش ڕوو دەدەن! تەنانەت چەند ئافرەتێکی نووسەری ئینگلیزی ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە کە ئەو ڕەوشت نزمییەی ئافرەتی ئەوروپا تێی کەوتوون هیچ چارەیەکی نیە جگە لەوەی یاسای فرەژنی (تعد الزوجات) بخەنە کار هەرچەندە ئافرەت قێزی لەوەیە کە ژنی بەسەر بێ!!!؟

پوختەی قسەی ئیسلام ئەوەیە: فرەژنی پێچەوانەی خۆشەویستی‌و ئارامی خێزانە، زۆرجار دژایەتی لەنێوان ژنەکاندا، لەنێوان منداڵەکانیاندا، لەنێوان ئەوان‌و باوکەکەیاندا پەیدا دەکا، پێویستە موسوڵمان پەنا بۆ فرەژنی نەبا مەگەر زەروورەت پاڵی پێوە بنێ‌و متمانەی بە خۆشی هەبێ کە دادوەرانەو بەگوێرەی

فەرمانی خودا لەگەڵیاندا دەجوڵێتەوە ئەگینا کارەکەی ستەم کردنە لە خۆیو لە ژنەکەیو لە گەلەکەشی. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە خێزانی زۆربوون، لەبەر بەرژەوەندییەکی ئایینی بووە، لە مارەکردنی هەر خێزانێکیدا بەرژەوەندییەکی تایبەتیی ئیسلامیی تێدا بووە، ئەوەبوو: لەرێی ژن خواستنەوە هۆزە گەورەکانی کردنە خزمی خۆیو بە سوودی ئیسلام شکایەوە، بە فیعلی موسوڵمانانی فێری ئەوە کرد کە چۆن رێز لە ئافرەت بگرنو عەداڵەتیان لەنێواندا ئەنجام بدەنو رێز لە خزمو کەسو کاریان بگرن.

کاتێ وەفاتی کرد نۆ دایکی بۆ موسوڵمانان بەجێ هێشت، کە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە خەریکی فێرکردنی ئافرەتانی موسوڵمانان بوون، بەتایبەتی ئەو ئەحکامە تایبەتیانەی کە پێویستە ئافرەت فێری ئافرەتی بکا، خۆ ئەگەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەنها ژنێکی هەبوایە نەیدەتوانی ئەو کارە ئەنجام بدا.

پوختەی قسە ئەوەیە کە هیچ کاتێك بەهیچ جۆرێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مارەکردنی ژنی زۆردا ئەو مەبەستەی نەبووە کە پاشاو فەرمانڕەواکانی دونیا هەیانە.. واتە: فرەژنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە مەبەستی رابواردنو لەزەت بینین لەژنان نەبووە، چونکە ئەگەر وابوایە دەبوو ئافرەتی جوانو کچۆڵەی مارەبکردنایە، نەك بێوەژنو ئافرەتی بەساڵاچوو، مێژوو شایەتە کە: زۆربەی ئەو ئافرەتانەی مارەی کردوون بێوەژن بوون، لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تا تەمەنی (٤٥) ساڵی تەنها خاتوو خەدیجە خێزانی بووە، کە لەخۆی بە تەمەنتر بوو! بە عادەتیش کەسێك تەمەنی گەیشتە پەنجاو چوار ساڵ حەزی جنسی کەم دەبێو ئارەزووی ئافرەتی کەم دەبێتەوە.

بەکورتی فرەژنی لە ئیسلامدا کارێکە بە ناچاری پەنای بۆ دەبرێ، یان بەرژەوەندییەکی تایبەتی یان گشتیی تێدایە! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مارەکردنی هەر ژنێکیدا وەکوو وتمان: بەرژەوەندییەکی ئیسلامیی تێدا بووە، بۆ نموونە سەودەی کچی زەمعەی حەبەشی لەبەرئەوە مارەکرد چونکە کۆچکاری دەستەی دووەمی حەبەشە بوو، مێردەکەی مردبوو، ئەگەر بگەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی لەوانەبوو سزای بدەنو کافری بکەنەوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای

لەسەر بێ) بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی مێردەکەی مارەی کردەوە، عائیشەو حەفصەی بۆ ڕێزنان لە باوکیان – ئەبوبەکرو عومەر – مارە کردن، زەینەبی کچی (جەحش)ی مارەکرد بۆئەوەی قانون‌و یاسای بەکوڕ کردن (التبني) هەڵوەشێنێتەوە، جووەیرییە کچی (الحارث)ی سەرەك هۆزی (موصطەلەق)ی بۆیە مارەکرد بۆ ئازادکردنی دیلەکان، چونکە جووەیرییە لە غەزای بەنی موصطەلەقدا ڕفێنراو کەوتە بەشی ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس ئەویش موکاتەبەی لەگەڵدا کرد، هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای یارمەتی لێ کرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر رازی بی پارەی ئازادکردنەکەت بۆ دەدەم‌و مارەت دەکەم ئافرەتەکە زۆری پێ خۆش بوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مارەی کرد، سەد کەس لە خزم‌و کەس‌و کاری ئافرەتەکە دیل بوون کرابوونە کۆیلەو بەش کرابوون بەسەر موسوڵماناندا.. ئیتر خەڵکەکە هەموویان ئازادکردن‌و وتیان: ئەمانە بوونە خەزورانی پێغەمبەرو ناگونجێ بە کۆیلەیی بیان هێڵینەوە.[1]

هەر ئەوەش بوو بەهۆی ئیسلام بوونی هۆزی موصطەلەق، زەینەبی کچی خوزەیمەی بۆیە مارەکرد بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی مێردەکەی کە عەبدوڵلای کوڕی جەحش بوو، لە غەزای ئوحوودا شەهید بوو، ئوممو سەلەمە کە ناوی هیند بوو ئەویشی بۆیە مارەکرد بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی مێردەکەی کە کوژرابوو، هەروەها چونکە ڕۆژی حودەیبییە ڕایەکی پەسەندی دا. ئوممو حەبیبە؛ ڕەملەی کچی ئەبو سوفیانی بۆیە مارەکرد چونکە لەگەڵ مێردەکەیدا عەبدوڵلای کوڕی جەحش جاری دووەم کۆچیان کرد بۆ حەبەشە لەوێ عەبدوڵلا بوو بە گاور، بەڵام ئەم لەسەر ئایینی ئیسلام مایەوە. صەفییەی کچی حوصحی بۆیە مارەکرد چونکە سەرۆکی بەنی قورەیظەو نەضیر بوو، لە ڕفێنراوانی خەیبەر بوو، بۆیە مارەی کرد تا لە دیلی ڕزگاری بکا.

مەیموونەی کچی (الحارث)ی هیلالی کە ناوی (برة) بوو بۆیە مارەکرد چونکە لەگەڵ بەنو هاشم‌و بەنو مەخزومدا خزمایەتی هەبوو!!

[1] - رفع الخفا .. شرح ذات الشفا/ احمد بن الحاج اللانی/ لێکۆڵینەوەی حەمدی عەبدولەجیدی سەلەفی ج٢/١٣.

ئەمجار پەروەردگار رووی خیطاب دەكاتە پیاوانو پێیان دەفەرموێ: ﴿وَآتُواْ النِّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾ بە دڵ خۆشیو دڵ فراوانییەوە مارەیی بدەن بە خێزانەكانتان، هیچ گیریو منجە منجی تێدا مەكەن.. چونكە مارەیی نیشانەی خۆشەویستی نێوان ژنو مێردە. نیشانەی رێزلێنانی ئافرەتە...

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: خیطابەكە بۆ مێردەكانە چونكە سەردەمی نەزانی پیاوی وا هەبوو بەبێ مارەیی ژنی مارە دەكرد پیاو بە ئافرەتی دەگوت شووم پێ بكە میراتت لێ دەگرمو میراتم لێ بگرە، ئیتر ئەم ئایەتە فەرمانی پێ كردن كە زوو مارەییان بدەنێ.

برێك لە زانایان دەڵێن: خیطابەكە بۆ كەسو كاری ئافرەتەكەیە، چونكە پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە كەسوكاری مارەییان وەردەگرت، نەیان دەدا بە ئافرەتەكە، بەڵكوو بۆ خۆیان دەیانخوارد، واتە: مارەییەكەیان دەكردە شیربایی‌و بۆ خۆیان هەڵیان دەگرت.

پەروەردگار بەم ئایەتە ئەو ماف پێشێل كردنەی لێ قەدەغە كردن؛ بەلام ﴿فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا﴾ ئەگەر ئافرەتەكان بە ویستو ئارەزووی خۆیان بەبێ فرتو فێڵو هەڕەشە، برێكیان لەو مارەییە پێدان، ئەوە حەڵاڵەو بە نەوشی گیانی بیخۆنو هیچ گوناهی تێدا نیەو حەڵاڵو زوڵاڵە.

## قورمتینە دانان لەسەر بێ عەقڵو مندالو هاووێنەیان، ماڵو سامانی خۆیان نادرێتێ تا تێگەیشتوو و پێگەیشتوو نەبن

﴿ وَلَا تُؤْتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ وَٱبْتَلُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ

﴿أَمْوَالَهُمْ وَلَا تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی پێدانەوەی ماڵی هەتیوان دوای باڵغ بوون‌و پێدانی مارەیی بە ژنانی کرد، لێرە بەم لاوە دێ دوو مەرج دادەنێ، هەرکاتێ مەرجەکان نەیەنەدی ماڵەکەیان تەسلیم ناکرێ!

جا وەکوو دەڵێن: ئەم ئایەتە ﴿وَابْتَلُواْ الْيَتَامَى....﴾ دەربارەی ثابیتی کوڕی ریفاعەو مامی هاتۆتە خوارێ، ئەوەبوو (رفاعة) کۆچی دوایی کرد (ثابیت)ی کوڕی منداڵ بوو مامی ثابیت هاتە خزمەت پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ)و عەرزی کرد؛ وتی: قوربان! ئەم برازایەم هەتیوەو لەماڵی مندایەو من سەرپەرشتیاریمی، چی بۆ من رەوایە لەماڵی ئەوو کەی ماڵەکەی بدەمەوە؟ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُؤْتُواْ السُّفَهَاء أَمْوَالَكُمُ﴾ خیطابەکە بۆ کۆمەڵی موسوڵمانانە، یان بۆ سەرپەرشتیارانە نەهییەکە گشتییە بۆ هەموو ماڵ‌و سامانێك کە دەدرێتە مرۆڤی گێل‌و نەزان.

واتە: هەموو هەتیوێك کە باڵغ بوو هەموو ماڵەکەی بدەنەوە، هەموو ژنێکیش مارەیی بدەنێ، مەگەر گێل‌و نەفام بن، ئەوکاتە ماڵ‌و دارایی خۆتان مەخەنە ژێر دەستی گێل‌و نەفامان، جا ئەو گێل‌و نەفامانە نێر بن یان مێ، گەورە بن یا بچووك هەتیوو بن، یان باوك‌و دایکیان هەبێ.

واتە: ئەو جۆرە کەسانە نابێ سەروکاری ماڵی خۆیان بکەن، کەسایەتی سەوداو مامەڵەیان نیە، جا هەرچەندە لەڕاستیدا ماڵ‌و سامانەکە بە رواڵەت هی ئەو گێل‌و نەفامانەیە؛ کەچی ئایەتەکە ناڵێ ماڵەکانیان مەدەنێ؛ بەڵکوو دەڵێ: ماڵەکانتانیان مەدەنێ! ئەمەش لەم رووەوەیە ئەو (حیجر) لەسەر دانراوانەی ئەگەر ماڵەکانیان بدرێتێ‌و بیفەوتێنن دەبێ سەرپەرشتیارو کەسەکانیان بەخێویان بکەن ئەوکاتە

ئەوان زەرەرمەند دەبن، کەوابێ وەکوو ماڵەکە هی خۆیان بێ وایە، یان لەم ڕووەوەیە ئەوانە ئەگەر ماڵەکانیان بە ژێری ڕەدام بێنن سوودیان پێ دەگاو سەرپەرشتیارو کەسەکانیان لێیان بەهرەمەند دەبن، کەوابێ وەکوو ماڵەکە هی خۆیان بێ وایە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿أَمۡوَٰلَكُمُ﴾ ماڵو داراییەکەتان واتە: ماڵەکەی پاڵ سەرپەرشتیارەکان داوە، بۆئەوەی بەرپرسیاریو سەرپەرشتیاری خۆیانو ماڵیشیان بخاتە ئەستۆ، ئایەتەکە ڕاستەوخۆ ئەوەی قەدەغە کردووە کە (سوفەها) ماڵو دارایی خۆیان سەرو بەر بکەن، جا ئەو نەزانییە یا بەهۆی بچووکیو منداڵییەوەیە یان بەهۆی شێتی یان بەهۆی گێلیو نەفامییەوەیە یان هۆی قەدەغەکردنەکە موفلیسییە؛ وەکوو ئەوە کابرا قەرزدار بێ بەجۆرێك قەرزەکانی هەموو ماڵەکەیانی داگرتبێو خاوەن قەرزەکان داوایان لە دادوەر کردبێ حیجری لەسەر دابنرێ ئەو کاتە هەرچەندە کابرا عاقڵو هۆشمەندە بەڵام بە گێلو نەفام لە قەڵەم دەدرێو حوکمی ئەوانی بەسەردا دەدرێو دەسەڵاتی بەسەر ماڵەکەی خۆیدا نامێنێ.

﴿ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا﴾ ئەو ماڵو داراییەی کە پەروەردگار بۆ ئێوەی کردووە بەهۆی درێژە پێدانی ژیانو هۆکاری خۆش گوزەرانو ڕێكو پێك کردنی کاروبار، چونکە ماڵو سامان ڕەگی ژیانە، بەهۆی ماڵو داراییەوە گەلو نیشتمان پێش دەکەوێ قەڵای ژیانو شارەستانی بینا دەکرێ، تاکو کۆمەڵ خۆشبەختو کامەران دەبن بە ماڵو سامان دەتوانین بەسەر دوژمندا زاڵ ببین.

سەلەفی صالح فەرموویانە: ماڵو سامان چەکی موسوڵمانە، هەروەها فەرموویانە: ئەگەر ماڵو سامان پێکەوە بنێینو دوایی بەجێی بهێڵینو خودا لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا بکا لەسەری، باشترە لەوەی ئاتاجی خەڵکی بینو سواڵ بکەین. سەفیان کاڵایەکی هەبوو بازرگانی پێوە دەکرد، وتیان: ئەم بازرگانی کردنە لە دونیات نزیك دەکاتەوە، فەرمووی ئەگەر لە دونیام نزیك بکاتەوە لەبێ ڕێزی دونیاش دەمپارێزێ! هەروەها سەلەفی صالح فەرموویانە: بازرگانی بکەنو کاسبی

بکەن چونکە ئێوە لە ڕۆژگارێك دان ئەگەر یەکێکیتان موحتاج بوو پێش هەموو شتێك ئابینەکەی لەکیس دەچێ.[1]

﴿وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ﴾ واتە: ماڵو سامانەکەیان بکەنە شوێنی وەدەستهێنانی رزقو ڕۆژیو پۆشاكو پێداویستی ژیان بۆیان، ماڵو داراییەکەیان بۆ بخەنە ئیشو بازرگانییان بۆ پێوە بکەنو بژێوو پێداویستییان لەبەرو بوومو قازانجی ماڵەکەیان بۆ دابین بکەن، نەك لە خودی ماڵەکە نەفەقەو پێداویستییان بۆ دابین بکەن!

چونکە ئەگەر وابکەن پاش ماوەیەك ماڵەکەیان کۆتایی دێو دەخورێ! هەر بۆیەشە ئایەتەکە فەرمووی: (فیها) نەیفەرموو: (منها) تا ئاماژەبێ بۆئەوەی کە ماڵو سامانەکەیان بکرێ بە شوێنو کانو سەرچاوەی بژێو بۆیان، بازرگانی پێوە بکرێو لە قازانجی ماڵەکەیان پێداویستییان بۆ دابین بکرێ.

﴿وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلاً مَّعْرُوفًا﴾ با هەموو سەرپەرشتیارێك بەو سەفیهو گێلو (حیجر) لەسەر دانراوەی ژێر دەستی خۆی قسەی باشو هیوا بەخش بڵێ: ئەگەر منداڵ بوو بڵێ ڕۆڵە: ماڵ ماڵی خۆتەو من وەکیلو سەرپەرشتیارم بەسەر ماڵەکەتەوە، هەر کە پێ گەیشتی ماڵەکەت دەخەمەوە ژێر دەست، ئەگەر گێلو نەفام بوو ئامۆژگاری بکاو هەڵی بنێ بۆئەوەی ماڵی خۆی بەفیڕۆ نەداو تێی بگەیەنێ کە سەرەنجامی ماڵ بەفیڕۆدان هەژاریو نەدارییە، هەمیشە ڕێگای ڕاستی نیشان بدا، گەشبینی فێربکا، دڵخۆشی بداتەوە، هەڵی بنێ بۆ کارکردنو بۆ ڕاستاڵی.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بەوە کرد کە هەتیوان دوای پێگەیشتنو باڵغ بوون ماڵەکەیان بدرێتەوە، دێتە سەر ڕوون کردنەوەی چۆنیەتی ماڵ پێدانەوەکەیانو کاتی ئەنجامدانی ئەو کارەو فەرمووی:

﴿وَابْتَلُواْ الْيَتَامَى حَتَّىَ إِذَا بَلَغُواْ النِّكَاحَ﴾ هەتیوەکان تاقی بکەنەوە پێش باڵغ بوون، یان دوای باڵغ بوون، چونکە بەلای ئەبو حەنیفەو شافیعییەوە پێش باڵغ بوون بەلای مالیکەوە دوای باڵغ بوون تاقیکردنەوەکە ئەنجام دەدرێ.

---

[1] - التفسير المنير ج ٤/٢٤٩.

بە مەبەستی تاقیکردنەوە بەشێك لەماڵەکەیان بدەنەوە بۆئەوەی ئاڵو وێری پێوە بکەن، چاودێرییان بکەن بزانن هەڵسو کەوتیان چۆنە، جا ﴿فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُواْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ ئەگەر عاقڵو لێزانینتان تێدا بەدی کردنو، زانیتان سەوداو مامەڵەیان رێكو پێکە، هەڵسو کەوتیان هۆشمەندانەیە، ئەوە ماڵەکەیان وێ بدەنەوە با بۆ خۆیان کاروباری خۆیان هەڵسورێنن.

- بلوغ النكاح — ئەو تەمەنەیە کە کوڕ بیر لە ژنهێنان دەکاتەوە، تەمەنی ئەوەیە کە بەرپرسیار بێو حوکمی شەرعی لەسەربێ! رەسیدەبوونی کوڕ بەلای شافیعیی‌و ئەحمەدەوە تەمەنی پانزە ساڵییەو بۆ ئافرەت بێنوێژبوونە، هەروەها ئیحتیلام بوونیش نیشانەی باڵغ بوونە، ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: هەتیو کە تەمەنی گەیشتە (٢٥) ساڵ ماڵەکەی دەدرێتەوە با هۆشمەندیش نەبێ، بەلگەشی ئایەتی ﴿وَآتُواْ الْيَتَامَى أَمْوَالَهُمْ﴾ە هەروەها دەڵێ: کەسێك گەیشتە ریزی پیاوانو باڵغ بوو، ئیمانو باوەڕو بێدینی بەرچاو گیرا، قەدەغەکردنی ماڵو دارایی خۆی لێی جۆرێکە لەستەمو ماف پێشێلکردنیەتی‌و شێواندنی کەرامەتی مرۆڤایەتیەتی!

ئەمجار پەروەردگار جارێکی تر رووی خیطاب دەکاتە سەرپەرشتیکارانو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ﴾ ماڵو سامانەکەیان بە هەوانتەو بێ جێو رێ مەخۆن بتانەوێ پێشبڕکێ بکەنو پێش ئەوەی باڵغ ببن ماڵەکەیان بخۆنو دەست پێش خەری بکەنو بڵێن تا لێیان نەستاندووینەوە، بادەستی خۆمان بووەشێنین، واتە: بەهیچ جۆرێك خواردنی ماڵی هەتیوو رەوا نییەو نزیکی مەکەونەوە..

ئەمجار ئەوە دەمێنێتەوە ئایا سەرپەرشتیار دەتوانێ حەقی ماندووبوونی سەرپەرشتیاری‌و چاودێرییەکەی لەماڵی هەتیوەکە هەڵبگرێ؟

لە وەڵامی ئەوەدا دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ﴾ کەسێك دەوڵەمەند بوو پێویستی پێ نەبوو، با دەست درێژی نەکاتە سەر ماڵەکەی‌و هیچی لێ هەڵنەگرێ بەڵام ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ کەسێك هەژار بوو، سەرپەرشتی کردنەکەش دەستی دەگرتو رێگای بڕێ ئیشو کاری لێ دەگرت، با

لەماڵی هەتیوەکە بە ئەندازەی پێویستییەکەی هەڵبگرێو پێداویستی خۆی پێ دابین بکا، زێدەڕەوی تێدا نەکا!

ئەمجار لێرەدا زانایانی شەریعەتو ئوصولو تەفسیر ئەم پرسیارەیان هەڵستاندوەو دەڵێن: ئایا ئەو ئەندازە ماڵەی سەرپەرشتیار لەماڵی هەتیوەکە هەڵی دەگرێ کرێیە یان نا؟ حەنەفییەکان دەفەرموون: کرێ نیە، جگە لەوان زانایانی تر دەڵێن: کرێیەو جوداوازیی نێوان هەژارو دەوڵەمەندیش نیە، سەرپەرشتیار ئەگەر دەوڵەمەندیش بێ هەر دەتوانێ کرێی خۆی هەڵبگرێ! ئایەتەکەش کە دەفەرموێ: (فَلْيَسْتَعْفِفْ) ئەمرێکە بۆ وجووب نیەو سوننەتو ئەدب دەگەیەنێ، قاعیدەی (فیقهی)یش داخوازی ئەوەیە: ئەو کرێیە کرێیەکی عادەتیو (اجرة المثل) بێ جا ئەو کرێیە بەشی پێداویستی سەرپەرشتیارەکە بکا یان نەیکا ﴿فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾ ئەی سەرپەرشتیاران! کە ماڵەکانتان دایەوە بە هەتیوەکان، شایەتییان لێ بگرن بەوەی کە ماڵەکانتان داونەوەو هیچتان لە ئەستۆدا نەماوە، چونکە ئەم شایەت گرتنە – دوای بەرچاو گرتنی دوو مەرجی پێشوو کە باڵغیو ژیرییە – گومان دوور خەرەوەیەو کێشە لابەرە، حەسپێنەرە بۆ ئەمانەتەکە! خودای مەزنو زانا باشترین شایەتو چاودێرە، ئاگای لەچۆنیەتی سەرپەرشتی کردنو ماڵ پێدانەوەکەیان هەیە، حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەموو کەس دەکا، پاداشتو سزای هەموو کردەوەیەك دەداتەوە.

## مافی میراتگران لەماڵی میراتداو مافی ئاتاجانو هەتیوانو خزمانی تر

﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ

وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار باسی حەرامی خواردنی ماڵی هەتیوانی کردو فەرمانیدا کە هەرکاتێ پێگەیشتنو باڵغ بوون ماڵەکەیان وێ دەنەوە، ئەمجار دێ ئەوە روون دەکاتەوە، کە ئەو کەلەپوورەی لە مردوو بەجێ دەمێنێو سەرپەرشتیار پارێزگاری دەکەن، نێرو مێ تێیدا هاوبەشن، لەسەردەمی پێش هاتنی ئیسلام میراتیان نەدەدا بە ئافرەتو منداڵ، باوەڕیان وابوو کەسێك شەڕە شمشێر نەکاو تاڵان نەگرێ میرات وەرناگرێ!!

سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادە دەڵێن: خوانەناسو موشریکەکان کەلەپووریان دەدا بە پیاوی گەورەو بەشە میراتیان بۆ ئافرەتو منداڵ دانەدەنا.

ئیبنو حیببانو عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی نەصفەهانی لە باسی (فرائض)دا لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەزانی بەشە میراتیان نەدەدا بە کچو بە نێرینەی بچووك تا گەورە نەبوایە، پیاوێك لە یاریدەدران مرد، ناوی ئەوسی کوڕی ثابیت بوو، دووکچو کوڕێکی لە پاش بەجێما؛ ئامۆزاکانی (خالیدو عەرفەطە) کە عەصەبە بوون، هەموو کەلەپوورەکەیان بردو هیچیان بۆ کچو کوڕو ژنەکەی نەهێشتەوە، خێزانەکەی (ام کحلة) هاتە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)و ئەوەی بۆ روون کردەوەو سکاڵای خۆی لەلا

کرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نازانم چیت پێ بڵێم؟ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ﴾ پیاوان بەشی خۆیان هەیە لەو کەلەپوورەی باوك‌و دایك‌و خزم بەجێی دێڵن، هەروەها ئافرەتان بەشی خۆیان هەیە لەو کەلەپوورەی دایك‌و باوك‌و خزم بەجێی دێڵن، واتە: ئەگەر هەتیوەکانماڵیان هەبوو لەو کەلەپوورەی باوك‌و دایك‌و خزم بەجێی دێڵن؛ ئەوە هەموویان تێیدا هاوبەشن، جیاوازی نێوان نێروس مێ نیە، ماڵە بەجێ ماوەکە زۆر بێ یان کەم بێ، هەرکەسە بە پێی خۆی بەشە کەلەپووری دەدرێتێ.

﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ ئەوە بەشێکی دیاری کراوو حەقێکی چەسپاوو دانراوە، کەس بۆی نیە لێی کەم بکاتەوە یان مەنعی بکا.

ئەمجار قورئان لایەنێکی دەروونی چارەسەر دەکا، ئەویش ئامادەبوونی ئەو خزمانەیە – کە لەبەر خزمە نزیکەکان میرات نابەن – ئەوانە بۆ کۆڕی میرات بەشکردنەکە دێنە پێشەوەو، داوای میرات دەکەن، وەکوو برای باوکی لەگەڵ هەبوونی برای دایك‌و باوکیدا، یان مام لەگەڵ هەبوونی باوك...هتد بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُواْ الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم﴾ ئەگەر خزمە میرات لێ زەوت کراوەکان ئامادەی کۆڕی دابەشکردنی میرات بوون‌و، داوایان کرد بەشیان بدرێ، شتێکیان بدەنێ، تەنانەت ئەگەر کەمیش بێ بێ بەشیان مەکەن، با بەدڵ شکاوی نەگەڕێنەوەو دڵیان نەئێشێ‌و دژایەتی لە ناو بنەماڵەدا پەیدانەبێ! قسەی نەرم‌و نیانیان لەگەڵدا بکەن، بۆ ئەوەی ئەو ماڵە کەمەی دەیاندرێتێ بە زۆری بزانن‌و خزمایەتی‌و دۆستایەتی زیاتر پێ پتەو بێ.

مەبەست بە وشەی ﴿الْقِسْمَةَ﴾ لە ئایەتەکەدا بەشکردنی ماڵی جێماوی مردووە لە نێوان میراتگرەکاندا. مەبەست بە ﴿أُوْلُواْ الْقُرْبَى﴾ ئەو خزمانەن کە خزمی نزیکتر مەنعیان دەکەن‌و حەجب دەبن یان (ذوی الأرحام)ن...

زۆرینەی ڕاڤەکەرانی قورئان کە ئیبنو عەبباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیریشیان لەگەڵدان، دەڵێن: ئایەتەکە موحکەمەو نەسڕاوەتەوە، فەرمانەکەش وجوب دەگەیەنێ، بەڵام خەڵك چۆن لەکاتی چوونە ماڵدا، ئیزن وەرگرتنیان بۆ

کرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نازانم چیت پێ بڵێم؟ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ﴾ پیاوان بەشی خۆیان هەیە لەو کەلەپوورەی باوك‌و دایك‌و خزم بەجێی دێڵن، هەروەها ئافرەتان بەشی خۆیان هەیە لەو کەلەپوورەی دایك‌و باوك‌و خزم بەجێی دێڵن، واتە: ئەگەر هەتیوەکانماڵیان هەبوو لەو کەلەپوورەی باوك‌و دایك‌و خزم بەجێی دێڵن؛ ئەوە هەموویان تێیدا هاوبەشن، جیاوازی نێوان نێروس مێ نیە، ماڵە بەجێ ماوەکە زۆر بێ یان کەم بێ، هەرکەسە بە پێی خۆی بەشە کەلەپووری دەدرێتێ.

﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ ئەوە بەشێکی دیاری کراوو حەقێکی چەسپاوو دانراوە، کەس بۆی نیە لێی کەم بکاتەوە یان مەنعی بکا.

ئەمجار قورئان لایەنێکی دەروونی چارەسەر دەکا، ئەویش ئامادەبوونی ئەو خزمانەیە – کە لەبەر خزمە نزیکەکان میرات نابەن – ئەوانە بۆ کۆڕی میرات بەشکردنەکە دێنە پێشەوەو، داوای میرات دەکەن، وەکوو برای باوکی لەگەڵ هەبوونی برای دایك‌و باوکیدا، یان مام لەگەڵ هەبوونی باوك...هتد بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُواْ الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم﴾ ئەگەر خزمە میرات لێ زەوت کراوەکان ئامادەی کۆڕی دابەشکردنی میرات بوون‌و، داوایان کرد بەشیان بدرێ، شتێکیان بدەنێ، تەنانەت ئەگەر کەمیش بێ بێ بەشیان مەکەن، با بەدڵ شکاوی نەگەڕێنەوەو دڵیان نەئێشێ‌و دژایەتی لە ناو بنەماڵەدا پەیدانەبێ! قسەی نەرم‌و نیانیان لەگەڵدا بکەن، بۆ ئەوەی ئەو ماڵە کەمەی دەیاندرێتێ بە زۆری بزانن‌و خزمایەتی‌و دۆستایەتی زیاتر پێ پتەو بێ.

مەبەست بە وشەی ﴿الْقِسْمَةَ﴾ لە ئایەتەکەدا بەشکردنی ماڵی جێماوی مردووە لە نێوان میراتگرەکاندا. مەبەست بە ﴿أُوْلُواْ الْقُرْبَى﴾ ئەو خزمانەن کە خزمی نزیکتر مەنعیان دەکەن‌و حەجب دەبن یان (ذوی الأرحام)ن...

زۆرینەی ڕاڤەکەرانی قورئان کە ئیبنو عەبباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیریشیان لەگەڵدان، دەڵێن: ئایەتەکە موحکەمەو نەسڕاوەتەوە، فەرمانەکەش وجوب دەگەیەنێ، بەڵام خەڵك چۆن لەکاتی چوونە ماڵدا، ئیزن وەرگرتنیان بۆ

چوونە ژوورەوە پاش گوێ خست، ئاواش کارکردنیان بەم ئایەتەیان پاش گوێ خستووە!!

حەسەنی بەصری و نوخەعی دەفەرموون: فەرمانی ئایەتەکە تەنها بۆ ماڵی گوێزراوە (منقول)یە، زەوی و زارو خانووبەرە ناگرێتەوە، واتە: ﴿أُوْلُواْ الْقُرْبَى﴾ هیچیان لە ماڵی نەگوێزراوە نادرێتێ بەڵکوو بە قسەی خۆش ئیقناع دەکرێن!!

(فوقەها) شەرعزانەکان، پێیان وایە: بەشدانی میرات بە ﴿أُوْلُواْ الْقُرْبَى﴾ سوننەتەو رووی خیطابەکە لە میرات گری گەورەیە، چونکە ئەگەر ئەو جۆرە خزمانە ﴿أُوْلُواْ الْقُرْبَى﴾ بەشێکی دیاری کراویان هەبوایە پەروەردگار وەکوو باقی مافەکانی تر شی دەکردەوە، جا کە شاریع روونی نەکردۆتەوە ئەوە دەگەیەنێ کە بەشدانەکەیان پێویست نیە، دووبارە ئەگەر بەشدانەکەیان واجب بوایە، دەبوایە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەکردەوە دەقاو دەق تەنفیذی بکردایەو لە فەرموودەدا روون بکرایەوەو بە تەواتور بە ئێمە بگەیشتایە، چونکە پەیوەندی هەیە بە بەشی هەژارو نەدارەوە، دەی کە ئەمانە هیچیان نەبوون، دەزانین کە بەشداری میرات بۆ ﴿أُوْلُواْ الْقُرْبَى﴾ واجب نیەو بەڵکوو سوننەتە.

ئەمجار بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکی تری دەروونی کە تووشی سەرپەرشتیاری هەتیوان دەبێ کە بریتییە لە ئەزیەتدان و لێ توورە بوون و پاشگوێ خستنی هەتیوەکان، دەفەرموێ: ﴿وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُواْ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُواْ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللّهَ وَلْيَقُولُواْ قَوْلاً سَدِيدًا﴾ با ئەو سەرپەرشتیاری هەتیوانە بترسێن، رێزی هەتیوان بگرن؛ قسەی خۆشیان لەگەڵدا بکەن، بە رۆڵەو کوڕە بچووکەکەم بانگیان بکەن. واتە: وەکوو چۆن بە نەرم و نیانی بە خۆشەویستی بانگی منداڵی خۆیان دەکەن با بەو شێوە بانگی ئەوانیش بکەن، با ئەوە بخەنە یادی خۆیان کە ئەوانیش لەوانەیە بمرن و منداڵەکانیان بە هەتیوی بکەونە ژێر دەستی خەڵکی تر، منداڵی ئەوانیش پاشگوێ بخرێن و زەبرو زەنگیان لەگەڵدا بەکار بهێنرێ!

جا با ئەو سەرپەرشتیارانە لە خوا بترسن و تەقوای خودا بکەن و خۆ بپارێزن لەوەی کە بە خراپی هەڵس و کەوت لەگەڵ هەتیوی ژێر دەستیان بکەن، با

بەشێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن کە پێیان خۆشە لەگەڵ منداڵی خۆیان پاش مردنیان بکرێ.

مەبەستی ئایەتەکە هەڵنانی سەرپەرشتیارانە بۆ پارێزگاری ماڵی هەتیوانو هەڵسو کەوت کردنی باش لەگەڵیانداو روو خۆشیو قسەی خۆش کردن لەگەڵیاندا، ئەمەش لە روانگەی ئەوەوە کە ئەوەیان دەخاتە خەیاڵەوە کە نزیکە منداڵی ئەوانیش هەتیو ببنو ئاوا مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ.

دەی با چییان پێ خۆشە بۆ منداڵی خۆیان بکرێ بە هەتیویی، ئەوەش بۆ هەتیوی ژێر دەستیان بکەن! ئایەتەکە پەیوەندی بە ئایەتی پێشەوە هەیە چونکە لەوێ دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ...﴾ وەکوو فەرمان وایە بە میراتگرەکان، واتە: ئەو هەتیوانە مافی خۆیان بدەنێو سەرپەرشتیاریان بۆ دیاری بکەن، ئەمجار ئەو سەرپەرشتیارانە با ئاگاداری ماڵەکەیان بۆ بکەن، هەڵسو کەوتی راستو لە باریان لەگەڵدا بکەن، وەکوو چۆن پێیان خۆشە هەمان هەڵسو کەوت لەگەڵ منداڵی خۆیان بە هەتیوی بکرێ.

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر فەرمانو نەهییەکانی پێشوو دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا﴾ دڵنیابن، ئەوانەی ماڵی هەتیوان بە ناڕەواو بێ جێ دەخۆن، ئەوە با بزانن: ئەوانە ئاگر دەخەنە ورگی خۆیانەوە، ورگی خۆیان پڕ دەکەن لە ئاگر، واتە: شتێك دەخۆن کە دەبێتە هۆی چوونە ناو ئاگرو سووتاندیان! ﴿وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾ لەوە بەولاوە دەخرێنە ناو دۆزەخەوەو بە ئاگر دەسووتێندرێن؛ ئاگرێکی سووتێنەر: کە (وقود)و کەرەسەکەی ئادەمیزادو بەردە.

هێنانی وشەی (بُطُون) لە ئایەتەکەدا بۆ جەختو زیادەڕەوییە، یان مەبەست بۆ پڕکردنو لیپاو لیپ کردنە، بۆیە نەیگوت: ﴿إِنَّمَا يَأْكُلُونَ نَارًا﴾ فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا﴾.. لەم جۆرە تەعبیرەش لە قورئاندا زۆرەو ئوسلووبی عەرەبی پێی ئاشنایە. ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ - آل عمران/١٦٧﴾ دەی خۆ قسە هەر بەدەم دەکرێ. یان ﴿وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ - الحج/٣٨﴾. دڵ هەر لەناو سنگدایە. یان ﴿وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ - الأنعام/٣٨﴾.

دەی خۆ باڵندە هەر بەباڵ دەفڕێ، وشەی (بِأَفْوَاهِهِم) و(فِي الصُّدُورِ) و(بِجَنَاحَيْهِ) بۆ جەختو موبالەغە هێنراون.

پوختەی قسە ئەوەیە: هەتیو لاوازو بێ دەسەڵاتو دڵ شکاون، شیاوی هەموو سەرپەرشتیەكو چاودێری كردنێكن و پێویستە بەرزەوەندیان بەرچاو بگیرێو سەرپەرشتییەك بكرێن كە پاساوی بێ باوكیان بداتەوە؛ بۆیە قورئان گرنگی پێداونو هەر لەسەرەتای سوورەتی (النساء)دا تا ئێرە نۆ ئایەتی دەربارە ناردوونە خوارێو جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە ماڵو دارایی هەتیو پارێزگاری بكرێ نەهێڵدرێ ماڵو سامانی بە ناڕەوا بخورێو مافی پێشێل بكرێ!

## یاساو چۆنیەتی میراتگرتن

﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ

عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ ۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾

﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ﴾ دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە دوو ریوایەت هەیە: یەکەمیان: فەرموودەی جابیری کوڕی عەبدوڵلایە: کە دەڵێ: نەخۆش بووم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ ئەبوبەکر هاتنە

دیدەنیم،، کە هاتبوونە لام من لە هۆش خۆم چووبووم، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای ئاوی کردبوو، تۆزێکی لێ رشاندبووم، وەهۆش خۆم هاتمەوە، عەرزم کرد وتم: چی لەم ماڵو دارایەم بکەم؟! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ.....﴾.

دووەم: ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیذیو حاکم لە جابیرەوە دەگێرنەوە: گوتی: خێزانی سەعدی کوڕی رەبیع هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمانە دوو کچەکەی سەعدی کوڕی رەبیعن باوکیان لە ئوحوودا لە خزمەت جەنابتدا کوژرا، مامیان هەموو ماڵەکەیانی بردووە، هیچی بۆ نەهێشتوونەوە! ماڵو سامانیشیان نەبێ کەس مارمیان ناکا، چارم چیە؟

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا ئەمە روون دەکاتەوە، ئیتر ئایەتی ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ هاتە خوارێ.

ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ناردی بە دوای مامەکەیانداو فەرمووی: لەو ماڵو سامانەی سەعدی برات دوو بەش لەسێ بەشی بدە بە کچەکانی سەعد، هەشت یەکیش بدە بە دایکیان، ئەوەی کە مایەوە بۆخۆت بیبە!، ئەمە یەکەم بەشکردنی میرات بوو لە ئیسلامدا.

لە ئایەتی پێشوودا بە کورتی باسی میراتگرتنی خزمانی کرد، ئەمجار لەم ئایەتەدا دێ بەشی هەریەکێك لە میراتگرەکان دیاریی دەکا، بەشی کوڕو کچو نەوە، باوكو دایكو نەنكو باپیر، ژنو مێرد، خوشكو برای باوکی ئەوە لە کۆتای سوورەتەکەدایە

## هۆیەکانی میراتگرتن لەپێش ئیسلامدا سێ شت بوون:

ا- خزمایەتی، بەڵام بە زۆری دەدرا بە پیاوی شەڕکەر، ئافرەتو منداڵ هیچیان نەدەدرایە!

ب- کوڕ کردن (التنبی) هەڵگرتنەوە!

ج- پەیمان بەستنو سوێند خواردن بۆ یەکتریی بەو شێوە پیاوێك بەیەکێکی تر بڵێ: خوێنی من خوێنی تۆیە خوێنی تۆ بە فیرۆ چوو مانای وایە: خوێنی من بە فیرۆ چووە. میراتت لێ دەگرمو میراتم لێ بگرە.

ئیتر ئیسلام جگە لە – بەکوڕ کردن (التنبی) کە بەئایەتی ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءكُمْ أَبْنَاءكُمْ – الأحزاب/٤﴾. بەتاڵ کردەوە. میرات گرتنی خزمایەتی بە ئایەتی ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ – النساء/٣٣﴾. چەسپاند. دوو هۆی تریشی زیاد کردن، کۆچ کردنو برایەتی، بەڵام دوایی بە ئایەتی ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ – الأنفال/٧٥﴾. هەڵیوەشاندەوە.

لە کۆتایی دا هۆی میراتگرتن لە ئیسلامدا لە سێ شتدا کۆبووەوە، خزمایەتی، ژنو مێردایەتی، ئازادکردن، ئیتر پەروەردگار سەرەتا دەستی کرد بە روون کردنەوەی بەشی کوڕو کچو نەوەو فەرمووی: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ﴾ پەروەردگار دەربارەی میراتگرتنی منداڵەکانتان بەم شێوەیە فەرمانتان پێ دەکاو بەشەکانیان دیاری دەکا ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ ئەگەر یەکێك مرد کوڕو کچی لە دوا بەجێمان، ئەوە بۆ هەر نێرینەیەك دووچەندانەی مێینە هەیە! چونکە پیاو بەرپرسیارە بە بژیوی‌و خێزانی‌و کارکردنو چەشتنی جۆرەها ناڕەحەتی‌و مارەیی پێدانی خێزانی.

بەڵام ئافرەت داوای دابین کردنی بژێوی کەسی لێ ناکرێ، کچ بێ، خوشك بێ، دایك بێ، خێزان بێ یان پوور بێ، بژێوی کەسی لەسەر نیە مارەیی بەکەس نادا، جا ﴿فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ ئەگەر میراتگرەکان هەموویان ئافرەت بوون دوو یان زیاتر، ئەوە دوو بەش لە سێ بەشی ماڵەکە بۆخۆیان دەبەن.

﴿وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾ ئەگەر میراتگر تەنها مێینەیەك بوو، ئەوە نیوەی ماڵەکە دەبا. دەربارەی بەشە میراتی دوو کچ ئەگەر نێرینەیان لەگەڵدا نەبوو، چەند واتایەك هەیە: ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: حوکمی دوو کچ حوکمی کچێکە واتە نیوەی ماڵەکە دەبەن! چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ واتە: لە دوو زیاتر نەبن هەر نیومیان دەکەوێ. جەماوەری زانایان دەفەرموون: حوکمی دوو کچ حوکمی دوو خوشکە، واتە: دوو بەش لە سێ

بەش دەبەن، چونکە قورئان دەربارەی دوو خوشك دەفەرموێ: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ هەروەها چونکە خوشك لەگەڵ براکەیدا سێیەك دەبا دەی دەبێ لەگەڵ خوشکیشیدا سێیەکی بەرکەوێ. هەروەها چونکە ئیبنو مەسعوود بۆ دابەشکردنی میراتی کابرایەك کە کچێك‌و کچی کوڕو خوشکێکی لە پاش بەجێ مابوون، بەم شێوەیە دابەشی کرد، شەش یەك بۆ کچی کوڕەکەو نیوە بۆ کچەکە بۆ ئەوەی بەشی هەردووکیان بکاتە دوو بەش لەسێ بەش، جا ئەگەر کچ لەگەڵ کچی براکەیدا دوو لە سێیان بەرکەوێ، دەبێ لەگەڵ خوشکی خۆیدا هەمان بەش بەرن؛ واتە:

بە کورتی ئەگەر منداڵەکان نێرو مێ بوون ئەوە هەموو نێرینەیەك دوو هێندەی مێینە دەبا، ئەگەر یەك کچ بوو نیوەی ماڵەکە دەبا، ئەگەر دوو کچ یان زیاتر بوون، ئەوە بە ڕای جەماوەری زانایان دوو بەش لە سێ بەش دەبەن، ئەگەر یەك کوڕ بوو هەموو ماڵەکە دەبا، ئەگەر چەند برایەك بوون، بەیەکسانی ماڵەکە لە ناویاندا دابەش دەکرێ!

﴿وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ﴾ باوك‌و دایکی مردوو هەریەکەیان شەش یەکی دەکەوێ لەو کەلەپوورەی لە مردووەکە جێماوە، بەمەرجێ مردووەکە منداڵی لە پاش جێمابێ!

﴿فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ﴾ ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبوون ﴿وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ﴾ باوك‌و دایکی هەبوون ﴿فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾ ئەوە سێیەکی میراتەکە بۆ دایکیەتی.

﴿فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ ئەگە مردووەکە وێڕای باوك‌و دایکی خوشك‌و برای هەبوون، ئەوە دایکەکە شەش یەکی ماڵەکە دەبا.

بەکورتی دایك سێ یەك دەبا، ئەگەر نەوەی میراتگر نەبوو، یان دوو یان زیاتر لە خوشك‌و برا نەبوون. ئەگەر نەوەی میراتگر هەبوو، یان ژمارەیەك لە خوشك‌و برا هەبوون، ئەوکاتە شەش یەك دەبا.

باوك شەش یەك دەبا ئەگەر نەوەی میراتگر هەبوون، جا ئەگەر نەوەکە کچێك بوو، ئەوە نیوەی دەبا، نیوەکەی تر باوکەکە بە فەرض‌و بە تەعصیب دەیبا.

دایك ئەگەر یەکێ لە ژن‌و مێردی لەگەڵدا بوو، سێ یەکی باقی ماندە دەبا، وەکوو ئەوە ژنێك بمرێ مێردو دایك‌و باوکی هەبن، ماڵەکە دەکرێ بە شەش بەش، سێ بەشی بۆ مێردەکەیە، سێیەکی باقی ماندە کە بەشێکە لە شەش بەشەکە بۆ دایکەکەیە، دوو بەشەکەی تر باوکەکە بە شێوەی عەصەبەیی دەیبا. یان ئەگەر پیاوێك بمرێ ژنێك‌و باوك‌و دایکی لە دوا بەجێ بمێنن! ماڵەکە دەکرێ بە دوانزە بەش، ژنەکە چواریەك دەبا، دایك سێ یەکی باقی ماندە دەبا ئەوی تری کە شەش بەشە بۆ باوکەکەیە بەشێوەی عەصەبەیی دەیبا، ئەم دوو مەسەلە پێیان دەگوترێ (العمرية) یان (الغراوين)..

ئەم میراتگرتن‌و بەش کردنە ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ لە دوای جێبەجێ کردنی وەصیەتی مردووەکەو دانەوەی قەرزەکانیەتی!

واتە: دوای مردنی ئادەمیزاد ئەگەر ماڵ‌و دارایی لە پاش بەجێ ما، پێش هەموو شتێك حەقی کفن‌و دفنی لێ دەدرێ، ئەمجار قەرزێك کە پەیوەندی بە ذیممەی مردووەکەوە هەبێ لێی دەدرێتەوە، دوایی ئەگەر وەصیەتی کردبوو، تا ئەندازەی سێ یەکی ماڵ وەصیەتەکەی ئەنجام دەدرێ، ئەمجار ئەوەی مایەوە بەسەر میراتگرەکاندا بە گوێرەی شەرع دابەش دەکرێ!

ئەمجار پەروەردگار رستەیەکی ناواخنی هێنا بۆ هۆشیار کردنەوەی ئادەمیزاد کە خودا ئاگامی هەموو ئیشێك دەزانێ‌و پێویستە هەرکەسە بەشە میراتی خۆی بدرێتێ‌و دەفەرموێ:

﴿آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً﴾ ئەوانەی میراتیان بۆ دیاری کراوەو خودا دەربارەیان وەصیەت‌و ئامۆژگاری کردن، دایك‌و باوك‌و کوڕو کچی خۆتانن لە کاتی بەشکردنی میراتدا ستەمیان لێ مەکەن؛ هەرکەسە بەشە میراتی خۆی بدەنێ، نەچن وەکوو سەردەمی پێش ئیسلام ئافرەت‌و منداڵ بێ بەش بکەن! ئێوە نازانن کامەیان زیاتر سوودی دونیاو قیامەتان پێ دەگەیەنێ، ئەم بەش کردنە بەشکردنێکە خودا دیاری کردووە، کەس بۆی نیە گۆڕانکاری تێدا بکا، خودا بۆخۆی دەزانێ چی لە بەرژەوەندیی بەندەکانیدایە، هەموو شتێك لە شوێنی شیاوی خۆی دادەنێ، میراتی لە نێو ئێوەدا بەش کردووە بەشێوەیەکی عادڵانەو بەرژەوەندی

هەموو کەسی لەبەرچاو گرتووە ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيما حَكِيمًا﴾ بەراستی خودا زاناو دانایە، هەموو کارێکی لە جێی خۆیدایە، ئێوەش بە گوێرەی ئەو یاسایە میرات بەشبەش بکەن، ستەمکاری تێدا مەکەن.

﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ﴾ بۆ ئێوەی مێرد هەیە نیوەی ئەو ماڵو دارایییەی کەژنەکانتان بەجێی دێڵن بەمەرجێ منداڵیان لەدوا بەجێ نەمێنێ، جا ئەو منداڵە لەم مێردەی بێ یان لە مێرێکی تری بێ، ئەو منداڵە نێر بێ یان مێ، یەك بێ یان زیاتر، منداڵی خۆی بێ یان منداڵی منداڵی بێ، مەرجیش نیە ئەو ژنە گواسترابێتەوە بەڵکوو تەنها مارە کرابێ بەسە؛ ﴿فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ ئەگەر ئافرەتەکە منداڵی هەبوون، ئەوە مێردەکە چواریەکی هەیە ئەوی تری بۆ خزمو کەسو کاریەتی، ئەگەر کەسی تری نەبوو دەدرێ بە (بيت المال).

ئەمە دوای دانەوەی قەرزو جێبەجێ کردنی وەصیەتەکەی ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ ژن چواریەکی ماڵی بەجێماوی مێردی دەبا، ئەگەر مێردەکەی منداڵی بەجێ نەهێشتبوو، هەشت یەکی دەکەوێ، ئەگەر مێردەکەی منداڵی لەپاش بەجێ مابێ، تەنانەت ئەگەر کابرای مێرد زیاد لە ژنێکی هەبێ، هەر هەموویان هاوبەشن لە چواریەك، یان هەشت یەکەکەدا، ئەمە دوای دانەوەی قەرزو جێبەجێ کردنی ئەو وەصیەتانەی دەیانکەن!

﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ﴾ پەروەردگار لەم ئایەتانەدا میراتگرانی کردوون بە سێ تاقم. تاقمێك راستەوخۆ پەیوەستن بە مردووەکەوە ئەوانیش باوكو دایكو کوڕو کچن، تاقمێك پەیوەندیان بە مردووەکەوە هەیە، بەهۆی عەقدی مارەیی، ئەوانیش ژنو مێردن.

تاقمێك پەیوەندیان بە مردووەکەوە هەیە بەهۆی ناوەندی (واسيط)وە ئەمەیان پێیان دەگوترێ (كَلاَلَةً) کەوابێ (کەلالە) خزمێکە جگە لە باوكو دایكو کوڕو کچە، جا چونکە تاقمی یەکەم خزمایەتیان بۆ مردووەکە زۆر بە هێزەو قەت لە میراتگرتن ناکەون پێش هەموانی خست، ئەمجار باسی تاقمی دووەمی کرد.

ئەمجار هاتە سەر باسی تاقمی سێیەم بە (كَلاَلَةً) ناو دەبرێنو خزمی جگە لە باوكو دایكو كوڕو كچن.

حوكمی میراتگرتنی (كلالة) ئەوەیە: ئەگەر مردووەكە خوشكو برای دایكی هەبوون هەریەكەیان شەش یەكی هەیە.

﴿فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾ ئەگەر زیاد لە یەكێك بوون ئەوە لە سێیەكدا هاوبەشن، بەلگە لەسەر ئەوەی كە مەبەست بە خوشكو برا لە ئایەتی (كلالة)دا خوشكو برای دایكین، قیرائەتی سەعدی كوڕی ئەبی وەققاصە كە دەفەرموێ: (ولـه أخ أو أخـت مـن أم). هەروەها چونكە لێرەدا بەشەكەیان شەش یەكە، یان سێ یەكە، ئەم دوو بەشانەش بەشی دایكن كەوابێ دەشێ كەسێك بەهۆی دایكەوە بگاتە مردوو هەمان بەشی بەربكەوێ.

**بەكورتی براو خوشكی دایكی دوو حاڵەتیان هەیە:**

١- ئەگەر برا، یان خوشك، بەتەنها بوو، هەریەكەیان شەش یەكی هەیە.

٢- ئەگەر زیاد لە یەكێك بوون، هاوبەشن لە سێ یەكدا، فەرقی نێرو مێیان نیە. ئەمانە هەموو ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾ دوای جێبەجێ كردنی وەصیەتو دانەوەی قەرزەكان ﴿غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ﴾ بەمەرجێك دانەوەی قەرزو جێبەجێ كردنی وەصیەتەكەی زیان بە میراتگرو خاوەن قەرزەكان نەگەیەنێ!

**هەڵبەتە زیان گەیاندن لە وەصیەتو قەرزدا چەند جۆرێكی هەیە:**

١- كابرا دان بە قەرزداریدا بنێ بۆ بێگانەیەك بە جۆرێك قەرزەكە هەموو ماڵەكە، داگیر بكات، یان هەندێكی! مەبەستی دان پیانانەكە ئەوە بێ زیان بە میراتگرەكان بگەیەنێ.

٢- دان بەوەدا بنێ ئەو قەرزەی كە لەلای فلاَنەكەس هەیەتی وەری گرتۆتەوە.

٣- زیاد لە سێ یەكی ماڵ بكا بە وەصیەت.

٤- سێیەكی ماڵ بكا بە وەصیەت بەلاَم مەبەستی خێرو ڕەزامەندی خودا نەبێ. بەڵكوو مەبەستی كەم بوونەوەی بەشی میراتگرەكان بێ.

﴿وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾ ئەمە وەصیەتو فەرمانی خودایە فەرمانتان پێ دەكا كار بەم یاسایە بكەنو جێبەجێی بكەن، خودا زاناو ئاگادارە بە

بەرژەوەندی بەندەکانیو زیان پێگەیاندنیان، دەزانێ کێ شیاوی میراتگرتنەو کێ شیاوی نیە، هەرکەسە چەندی دەکەوێ! وێڕای ئەوە حەلیمو لەسەرخۆیە، پەلە ناکا لە سزادانی ئەوانەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن!

پەروەردگار کە بەم شێوە هەست بزوێنە کۆتایی بە ئایەتەکە هێنا، ئاماژە دەکا بۆ ئەوە کە خودا یاسای میراتی بەوشێوە داناوە، دەزانێ چی بەرژەوەندیو خێرو بێری ئادەمیزادی تێدایە! کەوابێ پێویستە پابەندی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی بینو بە گوێرەی یاساو شەرعی ئەو، میراتەکە بەش بکەین.

نەچین دەستدرێژی بکەینو مافی ئەمو ئەو پێشێل بکەین! یان بێین تەعدیل لە یاسای میراتدا بکەین، وەکوو ئەوە، بەئەندازەی پیاو بەشی ئافرەت بدەین، وەکوو لە برێ وڵاتی بەناو ئیسلامیدا پەیرەو دەکرێو شوێن برێ دابو نەریتی پڕوپووچ کەوتوونو لاسای یاسای رۆژئاوا دەکەنەوەو یاسای دانراو (وضعی) بەسەر خۆیاندا دەسەپێننو پێیان وایە: ئەمە یەکسانیو دادپەروەرییە لە نێوان ئافرەتو پیاودا! چونکە ئەوە لەگەڵ دەقەکانی قورئاندا ڕووبەڕوو دەبنەوە، دژی یاسای خودا دەوەستن، ئاشکراشە هیچ دادوەریو یاساناسیو بەرژەوەندی دروستییەك ناگاتە دادوەری پەروەردگار، کەس بەئەندازەی خودا بەڕەحمو بەزەیی نیە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «اللَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَـٰذِهِ بِوَلَـدِهَا» دڵنیابن خودا بەبەزەیی ترو بەڕەحم ترە لەم دایکە بۆ جگەرگۆشەکەی!

## سنوورەکانی پەروەردگار

﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾

وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَـٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾

﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾ ئەو یاسایانەی باسکران دەربارەی ماڵو سامانی هەتیوان، یاسای ژنو مێردایەتی، شێوەی میراتگرتنو بەشە جۆراوجۆرەکانی میرات، هەموو سنوورو فەرز کراوو ئەندازەدار کراوو حوکمی خودان، کە کردوونی بە یاساو فەرمانی کردووە کاروباری خێزانو پەیوەندی ژنو مێردو بەشکردنی میرات ئەندازەی بەشەکانی لەو سنوورەدا جێبەجێ بکرێن! هەرگیز سنووربەزێنی مەکەنو یاساشکێن مەبنو ئاگاداری فەرمانەکانی شەریعەت بنو پێشێلیان مەکەن.

﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ کەسێك پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بێ، بە گوێرەی قورئان پەیڕەو بکا، شوێن شەریعەتی ئیسلام بکەوێ، ئەوە خودا لە پاداشی هەڵوێستی باشیدا دەیخاتە ناو باخو باخاتی بەهەشتەوە، کە بە ژێر باخەکاندا جۆگەی ئاوی صافو بێ گەرد دەکشێنو بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە ﴿وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەوە بە مراد گەیشتنێکی گەلێك مەزنەو سەرفرازیو رزگاربوونە لە هەموو ناخۆشییەك، لەزەتو خۆشی بەهەشت لەزەتی جەستەییو گیانییە.

﴿وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ﴾ کەسێك لە خوداو پێغەمبەری خودا یاخی بێ، سنوور ببەزێنێو یاسای خودا پێشێل بکا ﴿يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ خودا دەیخاتە ناو ئاگرێکەوە کەرەسەی سووتاندنەکەی ئادەمیزادو بەردە، بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە، وێڕای ئەوەش سزایەکی سووکانە پێکردنی دەدرێو سەرباری ئازارو بەردەوامی سووکایەتیشی تێدایە!

جیاوازیی زۆر هەیە لە نێوان مانەوەی هەتاهەتایی ناو بەهەشت لەزەت وەرگرتنو رابواردنو خۆشگوزەرانی تێیدا، لەگەڵ مانەوەی هەتاهەتایی ناو دۆزەخو چەشتنی جۆرەها سزاو ئەشکەنجەو سووکایەتی پێکردنی!

بەڕاستی ئەمە ڕەحمەتو سۆزی خودایە بەبەندەکانی، کەوابێ لە پێشەوە حەڵاڵو حەرامی بۆ دیاری کردوون، یاساو نیظامی بۆ داناون، بۆ خێر هەڵیناونو لە شەڕ تەکاندونیەوە، مزگێنی داونیو ترساندوونی! جا کەسێك فەرمانبەرداری خودا بێو، شوێن ڕێبازی پێغەمبەر کەوتبێ، خۆی لە تاوانو سەرپێچی کردن پاراستبێ، ئەوە پاداشی بەهەشتەو هەتاهەتایە تێیدا دەگوزەرێنێ! کەسێکیش لە خودا یاخی بێو شوێن ڕێبازی پێغەمبەر نەکەوێو سەرپێچییەکەی بگاتە پلەی کوفر، ئەوە لە دۆزەخدا بۆ هەتاهەتایە دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر ئیمانی هەبوو، تاوانی کردو، سنووری ئایینی بەزاند، ئەوە شیاوی سزای دۆزەخە بۆ ماوەیەك، دوایی دەردەهێندرێو دەخرێتە بەهەشتەوە.

## سزای داوێن پیسی ئافرەتان

﴿وَٱلَّـٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار یاسای ژنو مێردایەتیو میراتگرتنی روون کردەوە، هەڕەشەی لەوانە کرد کە سنوور بەزێنی دەکەن، ئەمجار لێرەدا دێ سزای ئەو ژنانە دیاری دەکا کە یاساشکێنی دەکەنو دەفەرموێ: ﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ﴾ ئەو ژنانەی تاوانیان لێ روو دەدا لە خێزانی ئێوە ﴿فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ﴾ چوار شایەتی پیاویان لێ بە شایەت بگرن، جا ﴿فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ

فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ ئەگەر چوار شایەتە پیاوەکان شایەتیان لەسەر دان ئەوە لە ماڵدا بەندیان بکەنو مەهێڵن لەماڵ دەربچن، تا دەمرن، یان خوا چارەسەرێکی تریان بۆ دیاری دەکا.

ئەمە لەسەرەتادا حوکمی ئیسلام بەو جۆرە بووە، ئافرەت کە زیناکردنی لەسەر بچەسپایە چوار شایەت شایەتیان لەسەر بدایە، لەماڵ بەند دەکراو چوونە دەرەوەی لێ قەدەغە دەبوو تا دەمرد، سزای پیاوانیش جنێو پێدانو لێدان بە نەعلو ئەو جۆرە شتانە بوو، هەتا پەروەردگار ئەو حوکمەی هەڵوەشاندەوەو بە جەڵدە لێدانی کوڕو کچ، بە بەردەباران کردنی ژن کە مێرد چووبێتە لای هەروەها پیاو کە ژنی هێنابێ! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ – النور/٢﴾.

ئەگەر موحصەنیش بوون (واتە: ژن مێردی هەبوو، پیاو ژنی هەبوو) ئەمەش ئەو چارەسەرە بوو کە لە ئایەتی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرابوو.

ئیمامی موسلیمو خاوەنی کتێبە فەرموودەکان لە عوبادی کوڕی صامیت دەگێڕنەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: «خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ». رای زانایان لەسەر ئەوە جێگیر بووە، کە بەشی کۆتایی فەرموودەکە هەڵوەشاوەتەوە، وە ئەو رێگا چارەیەی خودا بۆی دیاریی کردوون، ئەوەیە: بێوە، چ ژن چ پیاو بێ، بەردەباران دەکرێ، نەك جەڵدەی لێ دەدرێ. چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بە کردەوە لێیەوە چەسپاوە کە بەردەبارانی کردووە نەك جەڵدە لێدان! ﴿وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ ئەو دوو پیاوەی نێربازی دەکەن، یان ئەو کوڕو کچەی زینا دەکەن، بە جنێوو تانەو تەشەر سزایان بدەن، جا ئەگەر تۆبەیان کردو صاڵح بوونو سروشتی خۆیان گۆڕیو وازیان لەو کردەوە ناشیرینە هێنا، ئیتر تانەو تەشەریان لێ مەدەن، چونکە کەسێك لە تاوان کردن تۆبە بکا وەکوو کەسێك وایە: تاوانی نەکردبێ،

بێگومان پەروەردگار تۆبە گیرایەو تۆبە قبوول دەکاو بەرحەمو سۆزە بۆ بەندەکانی، خیطابی ئایەتەکە روو دەکاتە لێپرسراوانو فەرمانڕەوایان، ئایەتەکە حوکمی بێوەژنی زیناکەری روون کردۆتەوە هەروەها حوکمی کوڕو کچی زیناکەری بەیان کردووە، بەڵام باسی حوکمی بێوە پیاوی زیناکاری نەکردووە، دیارە حوکمی بێوەژنی هەیە.

ئەبو موسلیمی ئەصفەهانی کە بەلایەوە لە قورئاندا نەسخ نیە دەڵێ: ئایەتی یەکەم مەبەستی پانپانۆکەی نێوان مێینەیە، ئایەتی دووەم مەبەستی هەتیو بازییە، ئیتر لەسەر ئەم رایە حوکمی هەردوو ئایەتەکان نەسڕاوەتەوەو نەسخیان تێدا نیە.

## مەرجو کاتی تۆبەکردن

﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾ ﴾.

لە ئایەتی پێشوودا پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە ئەو کەسانەی تۆبە دەکەن ئیتر سزادانیان لەسەر نامێنێو وازیان لێ دەهێنرێ؛ ئیتر لێرەدا گونجاو بوو

کە باسی مەرجو کاتی تۆبە کردن بکا، بۆیە فەرمووی: ﴿إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّـهِ لِلَّـذِينَ يَعْمَلُونَ الـسُّوءَ بِجَهَالَـةٍ ثُـمَّ يَتُوبُـونَ مِـن قَرِيـبٍ﴾ واتـە: خـودا بەگەورەیی‌و فـەضل‌و ئیحسانی خۆی تۆبە لەو کەسانە وەردەگرێ کە بـە نـەزانی تووشـی کردنـی تاوانێـك دەبن‌و نازانن ئاکام‌و سەرەنجامی چی دەبێ، واتە، هەڵەیەکە پێیـان دەکرێ‌و دوایـی لەسەری سوور نابن‌و وازی لێ دێنن زوو پەشیمان دەبنـەوەو تۆبـە دەکـەن، تەنانـەت ئەگەر تۆبە کردنەکەیان پـێش غەرغـەرەی سەرە مـەرگ بـێ هـەر تۆبەکـە گیرایـە! مەبەست بە نەزانی ئەوە نیە نـەزانێ کـەوا حەرامـە، چونکە هـەموو موسـوڵمانێك پێویـستە حـەرام‌و حـەڵاڵ بزانـێ، بـەڵکوو مەبەسـت ئەومیـە هـەواو هـەوەس‌و شـەهوەت‌و ئـارەزوو بەسـەریدا زاڵ بـبن‌و تاوانەکـەی پـێ بکـەن‌و دوایـی پەشـیمان ببێتەوە!

موجاهید دەڵێ: هەرکەسێ بە هەڵە یان بەئەنقەست لە خودا یاخی بـێ‌و تـاوان بکا ئەوە نەزانە هەتا وازی لێ دێنێ!

قـەتادە لـە (ابـی العالیـە)وە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: وا دەبـوو هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیانگوت: هەر تاوانێك بەندە بیکا جەهالەت‌و نەزانیە.

عبدالرزاق دەڵێ: (معمر) لە قەتادەوە ریوایەتی کردووە کە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رایان لەسەر ئەوە چەسپیوە کـە هـەرکارێك، هەرشـتێك سەرپێچی خودای تێد بێ نەزانییە. جا بە ئەنقەست بیکا یان بە هەڵە! ئاماژە بـەو ئایەتە کە دەفـەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُـوا مِـن رَّحْمَـةِ اللَّـهِ – الزمـر/٥٣﴾. ئـەی موحەممـەد! بـەو بەندانـەی مـن بڵـێ: کـە بـە نـەفامی زێدەڕەوییان کردووەو ستەمیان لە خودی خۆیان کردووە بەوە کە تاوانیـان ئـەنجام داوە، پێیـان بڵـێ: بـا لـە رەحمـەت‌و بەخشـشی خـودا نائومێـد نـەبن، تۆبـە بکـەن‌و پەشیمان ببنەوەو داوای لێخۆشبوون لە ئێمە بکەن! کەوابوو مەرجی یەکەم ئەومیە تاوانەکە بە نـەفامی بکـا، مـەرجی دووەم ئەومیـە: بـە ماومیـەکی کـەم دوای کردنـی تاوانەکە پەشیمان ببێتەوە، زانایانیش ماوە کەمەکەیان داناوە: بەو ماومیەی نێـوان کردنی تاوانەکەو مردن. واتە کەسێك پێش غەرغەرەی مـردن تۆبـە بکـا بـەر مـاوە کەمەکە دەکەوێ! ﴿فَأُوْلَئِكَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمـاً حَكِيمـاً﴾ ئەوانـەی بـە

نەزانی تاوانیان لێ روودراوە دوای ماوەیەکی کەم تۆبە دەکەن ئەوە خودا تۆبەیان لێ وەردەگرێو عەفوویان دەکا، چونکە بەردەوامو سوور نەبوون لەسەر گوناە کردن، پەروەردگار زانایە بە زەعیفی بەندەکانی لە بەرامبەر شەهوەتو ئارەزوودا، داناو حەکیمە لە وەرگرتنی تۆبەکەیان، لە دوای بەیانکردنی حاڵو چۆنیەتی ئەوانە تۆبەیان لێ وەردەگیرێ، ئەمجار حاڵو چۆنیەتی ئەوانەی کە تۆبەیان لێ وەرناگیرێ بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الآنَ﴾ تۆبە بۆ ئەوانە نیە کە خراپەکاری دەکەن دەست لە تاوانکردن هەڵناگرن هەتا مردن یەخەیان پێ دەگرێو دەزانن کار لە کار ترازاوە ئەو کاتە بە ناچاری دەڵێ: من ئێستا تۆبە دەکەمو پەشیمانم لە کردارەکانم، ئەو کاتە تۆبە کردن هیچ سوودێکی نیەو هیچ هومێدێکی لێ ناکرێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا – غافر/٨٥﴾.

یان لە باسی سەرگوزەشتەی فیرعەوندا کاتێك خەریك بوو بخنکێ وتی: ﴿وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَاْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، آلآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ – یونس/٩٠ – ٩١﴾.

چونکە گەیشتۆتە حاڵەتی نائومێدیو لە دونیای تێکۆشانو هەوڵدان دەرچووە، کەوتۆتە دونیای پاداشو تۆڵە، ئەوەی لێ چاوەڕوان ناکرێ کە ماوەی هەبێ واز لە خراپەکاری بێنێو بڕیاری پەشیمانیو گەڕانەوەو هەڵوێست گۆڕینی لێ بکرێ.

﴿وَلاَ الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ﴾ هەروەها تۆبە لەوانەش وەرناگیرێ کە بەبێ بڕوایی دەمرن ﴿أُوْلَئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ئەو دوو تاقمە کە تۆبەیان لێ وەرناگیرێ سزای بە ئێشو کوشندەمان بۆ ئامادە کردووە، لە تۆڵەی تاوان کردنو بەردەوام بوونیان لەسەر خراپەکاریو بێ بڕواییان هەتا مردن. ئا بەو جۆرە پەروەردگار یەکسانی خستۆتە نێوان ئەوانەی تۆبەیان دوادەخەن تا دەگەنە حاڵەتی غەرغەرەو کۆتای ژیانی دونیاو ئەوانەی بەبێ بڕوایی دەمرن، یەکسانی خستۆتە نێوانیانەوە لەوەدا کە تۆبەیان لێ وەرناگیرێ، چونکە هەروەکوو چۆن ئەو کەسەی

لەسەر بێبڕوایی دەمرێ دەرگای تۆبەی لەسەر خۆی داخستو یەقینی خۆی خستۆتە حاڵەتی دژوارەوە، هەربەو جۆرەش ئەو کەسەی کە تۆبە کردنی دواخست، تا کاتی غەرغەرە سنووری دیاری کراوی تۆبەکردنی پێشێل کردووە خۆی بەفەتارە داوەو تازە کاتی بەرپرسیاریو هەڵبژاردن بەسەرچووەو کاتی تۆڵەو سزایە.

## مامەڵکردن لەگەڵ ئافرەتدا لەڕوانگەی ئیسلامەوە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًاۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْـًٔاۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ ﴾.

ڕاڤەکـەرانی قورئـان دەڵـێن: دانیـشتووانی مەدینـە پـێش هـاتنی ئیـسلام‌و لەسەرەتای ئیسلامدا، داب‌و نەریتێکیان هەبوو ئەگەر پیاوێك بمردایەو ژنی لە دوا بەجێ بمایە، کوڕێکی پیاوەکە کە لەو ژنە نەبوایە، یان خزمی تری پیاوەکـە، خێـرا کراسـێکی خـۆی بەسـەر ئافرەتەکـەدا دەدا، ئـیتر ئـەو کەسـە دەبـووە خـاوەنی ئـەو ئافرەتە، ئەگەر بیویستایە مارەی دەکرد بەبێ مـارەیی، ئەگـەر بیویـستایە بەشووی دەداو مارەییەکـەی بـۆ خـۆی وەردەگـرت‌و هیـچی نـەدەدا بـە ئافرەتەکـە؛ یـان نەیدەهێـشت شـوو بکاتـەوە بـە خـەڵکی تـر مەگـەر ئافرەتەکـە بـەو میراتـەی لـە مێردەکەی بۆی ماوەتەوە، یان لەهی تر هەی بووە، خۆی بکڕیایەوە، یان ئافرەتەکە بمردایـەو میراتەکـەی بـۆ خـۆی بگرتایـە. جـا وەکـوو دەڵـێن: ئـەبو قەیـسی کـوڕی ئەسلەتی ئەلئەنصاری مرد (کبیشە)ی کچی موعەنی ئەنصاری خێزانی بوو، لەدوای بەجێ ما، ئەبو قەیس کوڕێکی هەبوو لە ژنێکی تری بـوو نـاوی (حصن) بـوو هـەر لەگەڵ باوکی مرد خێرا کراسێکی خۆی بەسەر زڕداکەیدا داو کـردی بـە مـیرات‌و ئەمجار نە لێی نزیك بووەوە نە بژێویشی دایە، تـەنگی پـێ هەڵـچنی بۆئـەوەی بـەو ماڵـەی هەیـەتی خـۆی بکڕێتـەوە، ئـیتر ئافرەتەکـە سکاڵای خـۆی هێنایـە خزمـەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئـەویش فـەرمووی: لەماڵی خـۆت دانیـشە تـا خودا دەربارەی ئەم نەرێتە نیگام بۆ دەنێرێ، ئیتر خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهًا﴾ ئـەی ئـەو کەسانەی بڕواتان هێناوە! ڕەوا نیە بۆ ئێوە کـە ئـافرەت بـە کەلـەپوور داگـیر بکـەن، ڕەوا نیـە کـە چـاو لەسـەردەمی نـەزانی بکـەن، ئـافرەت بـە کـاڵاو شـتومەك حـسێب بکـەن، بـە نـاوی میراتـەوە داگـیری بکـەن‌و بـە ئـارەزۆی خۆتـان تەصـەڕوفیان تێـدا بکەن‌و بۆ خۆشیان ناڕازی بن، ویستان مارەیـان بکـەن، یـان لـە خـەڵکی تریـان مـارە بکەن‌و شیربایيان بخۆن، یان شوکردنیان لێ قەدەغە بکـەن‌و ناچـاریان بکـەن خۆیـان بکڕنەوە یان بە ناڕەحەتی ژیانی کولەمەرگی بەسەر بەرن ﴿وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ﴾ نەچـن شـووکردنیان لێ قەدەغـە بکـەن‌و تـەنگیان پـێ هەڵـچنن بۆئەوەی ئافرەتەکە ناچار ببـێ ئـەو مـیرات‌و مارەییـەی وەری گرتـووە بتانداتـەوەو خۆی ڕزگار بکاو خۆی بکڕێتەوە.

ئیبنو جەریر لە ئیبنو زەیدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: قوڕەیشییەکان لە مەککە پیاوی وایان هەبوو، ئافرەتێکی شەریفی مارە دەکرد بەهومێدی ئەوە لەگەڵی هەڵ نەکا، لێی جیابێتەوە، بەڵام بەمەرجێك بەبێ رەزامەندیی ئەم شوو نەکاتەوە، ئیتر شایەتیان دێنان‌و سەنەدیان پێ دەنووسی، جا ئەگەر خوازبێنی کاری بهاتنایە، ئەگەر ئافرەتەکە ماڵ‌و سامانی بدایە بە پیاوەکەی پێشووی‌و رازی بوایە، ئەوە ئیزنی دەدا، ئەگەر رازی نەکردایە ئەزیەتی دەدا نەیدەهێشت شووبکاتەوە!

زۆرجار وادەبوو ئەو جۆرە پیاوانە تەنگیان بەو جۆرە ژنانە هەڵدەچنی بۆئەوەی بە ماڵ‌و سامانی خۆیان خۆیان رزگار بکەن.

خیطابی ئایەتەکە، روو دەکاتە مێردەکان، یان روو دەکاتە کەس‌و کاری مردووەکە، ئەوانەی ژنی کابرای مردوویان بە کەلەپوور داگیر دەکردو نەیاندەهێشت بە حەزی خۆی شوو بکاتەوە، بەڵکوو ئاوا بەبێ مێردی دەیان هێشتەوە تا دەمردو ئەمجار ماڵەکەیان بە کەلەپوور دەگرت.

ئەو هەڵوێستە نامرۆڤانەیان لەگەڵدا مەنوێنن ﴿لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ﴾ بۆئەوەی بەشێك لەو مارەییەی پێتان داون وەربگرنەوە، یان مافێکی خۆیان کە لەسەر ئێوەیە لێیان داگیر بکەن‌و پێشێلی بکەن! ئەمجار حاڵەتێك لەوە دەردەکاو بەندکردن‌و تەنگ پێ هەڵچنینی ئافرەت تێیدا بەڕەوا دادەنێ ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێ:

﴿إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ مەگەر ئەو ئافرەتانە تاوانێکی حەیابەرە ئەنجام بدەن، بە ئاشکرا تاوانێکی وەکوو زینا، دزی، هەڵگەڕانەوە لەمێردو ئەو جۆرە شتانەی کە شەرع بە ناپەسەندیان دادەنێ بیکەن، ئا لەم حاڵەدا سزادان‌و تەنگ پێ هەڵچنینی ئافرەت رەوایە بە مەبەستی ئەوەی ئەو ماڵەی کە پێتان داون لێیان بستێننەوە، جا مارەیی بێ، یان ماڵی تر بێ، چونکە لەم حاڵەدا خراپەکارییەکە لە ئافرەتەکەوەیە‌و سووچی ئەوە، نەك هی پیاوەکە. بۆیەش فەرمووی: ﴿فَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ واتە: تاوانە حەیابەرەکە، چەسپاوو ئاشکرا بێ، بۆئەوەی رێگا لە پیاوان بگرێ، نەچن پێش چەسپانی تاوانەکەو ئاشکرابوونی، حوکمی ناڕەوا بەسەر ئافرەتەکەدا بدەن‌و بە خۆڕایی‌و بە هەوانتە ئافرەتێکی داوێن پاك لەکەدار بکەن.

ئەمجار داوا لە مێردەکان دەکا کە هاوڕێیەتی ژنەکانیان بکەن بەشێوەیەکی نەرم‌و نیان‌و بە قسەو بەکردەوە، ویژدانی خۆیان بخەنە کارو لەبڕێوو پۆشاك‌و شوێنی حەوانەوەیان بەگوێرەی توانا کەمتەرخەمییان لێ نەکەن، چونکە ئافرەت هەست‌و سۆزی ناسکە پێی خۆشە مێردەکەی چی لەو دەوێ ئەویش بۆ ئەوی بکا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ – البقرة/٢٢٨﴾.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: باشترین ئادەمیزاد لەمئێوە ئەو کەسەیە بۆ خێزانی باش بێ، من باشترین کەسم بۆ خێزانی خۆم). ڕەوشتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو خۆش ڕەوشت‌و دەم بە پێکەنین بوو، یاری لەگەڵ خێزانەکانیدا دەکرد، لەگەڵیاندا ڕووخۆش بوو، بژێوی بۆ دابین دەکردن، دەم بە پێکەنین بوو لەگەڵ خێزانەکانیدا تەنانەت پێشبڕکێی لەگەڵ عائیشەدا دەکرد، هەموو شەوێك خێزانەکانی لەو خانووەدا کۆدەکردەوە کە شەو تێیدا دەمایەوە، جاری وا دەبوو نانی ئێوارەی لەگەڵ دەخواردن، ئەمجار هەریەکەیان دەچووەوە بۆ ماڵی خۆی، عادەتی وابووە کە نوێژی عیشای دەکرد دەچووە ئەو هۆدەیەی کە شەو تێیدا دەنووست‌و پێش نووستن بڕێ یاری‌و سوحبەتی لەگەڵ خێزانی دەکردو ئەمجار دەنووست.

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ – الأحزاب/٢١﴾.

ئیبنو عومەر دەڵێ: پێغەمبەر لە حەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: (إستوصوا بالنساء خيرا فإنهن عوان عندكم، أخذتموهن ولكم عليهن حق ولهن عليكم حق، ومن حقكم عليهن ألا يوطئن فرشكم أحدا، ولا يعصينكم في معروف، وإذا فعلن ذلك فلهن رزقهن وكسوتهن بالمعروف).

پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەو تاوانانەیە: کە لەسەردەمی پێش ئیسلامدا بەرامبەر ئافرەت دەکرا، ئەوەبوو پیاوان خراپەیان لەگەڵ ئافرەتدا دەکرد، قسەی ناشیرین‌و ڕەقیان لەگەڵدا دەکردن، ئازاریان دەدان، بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کرد: کە هەڵس‌و کەوتیان

لەگەڵ ژناندا چاکەکاری بێ، تەنانەت ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ ئەگەر شتێکتان لەوان پێ ناخۆش بوو: بەم جۆرە عەیبێکتان لە رەوشتیان بەدڵ نەبوو، یان شێوەو روخساریانتان بەدڵ نەبوو، یان هەڵسوڕانو کاروباری ناو ماڵیانتان بەدڵ نەبوو، یان حەزتان لە ئافرەتێکی تر بوو: ئەوە صەبر بگرنو پەلە مەکەن لە جوودابوونەوە لێیان، یان لەتەنگ پێ هەڵچنینیان؛ چونکە لەوانەیە خودا مانەوەیان بکاتە خێرو بێر بۆتان، وایان لێ بکا ببنە جێگای رەزامەندی ئێوە، رەوشتی خۆیان باش بکەن، یان منداڵی رێكو پێكو صالحو خێر ئاوەرتان لێیان ببێو بۆتان پەروەردە بکەن، بەوە نەقصی خۆیان پڕبکەنەوە. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ» با مێرد ژنی ناخۆش نەوێ بەجۆرێك وا لەخۆی بکا ناخۆشەویستییەکە ببێتە هۆی لێك جیابوونەوەیان، ئەگەر رەوشتێکی تێدابوو، بەدڵی نەبوو، رەوشتێکی تری تێدایە جێگای رەزامەندی بێ. واتە: چاوپۆشی بکا لە رەوشتە خراپەکانی بەهۆی رەوشتە جوانەکانی.. بەڵێ ئەگەر پیاوان مانای ئەم ئایەتەو فەرموودانەیان هەزم بکردایەو کاریان پێ بکردنایە خێزانیان دەخستە کامەرانییەوەو خۆیان لەو کێشەو نیزاعانە دەپاراست کە دەبنە هۆی دەست لێك بەردانی ژنو مێردو هەڵوەشانەوەی خێزانو پەرتەوازە بوونی منداڵو زۆربوونی بێ سەرپەرشتان..

ئاشکرایە ستەمکاریی لە سروشتی ئادەمیزادا کۆنو ریشە داکوتراوو بەربڵاوە، پیاوی ستەمکار پشت ئەستوور بەهێزو توانای خۆیو بەوەی کە تەڵاقی بەدەستە، زۆرجار ستەمی لەژن دەکرد، هەر کەبیویستایە ژنەکەی تەڵاق بدا چی مارەییو پارەو پوولێکی پێی دابوو، لێی دەستاندەوە، بۆ ئەم مەبەستە جۆرەها بیانوو تەنگ پێ هەڵچنینی ناڕەواو بوختانو درۆو دەلەسەی بۆ هەڵدەبەست.

ئیتر پەروەردگار ئەو هەڵوێستو ستەمکارییەی لێ مەنع کردنو فەرمووی: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئًا﴾ ئەگەر ویستان ژنی نابەدڵتان بگۆڕن بە ژنێکی ترو تەڵاقی بدەن، بە ناڕەوا بوختانو پڕوپاگەندەیان بۆ بەرپا مەکەنو مارەییشیان لێ مەستێنەوە تەنانەت

ئەگەر ماڵێکی زۆریشتان پێ دابوون هەر هیچیان لێ مەستێننەوە، ﴿أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانـاً وَإِثْمـاً مُّبِينـاً﴾ ئایـا ئێـوە ماڵەکـەیان لێ وەردەگرنـەوە بـەهۆی بوختـانو درۆ هەڵبەستنەوە؟ بەستەمکاریەکی ئاشکرا... مارەییەکەیان لێ وەردەگرنـەوە؟ شـتی وا مەکەنو هەڵوێستی وا مەنوێنن ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ﴾ ئـەو هـەموو پێکـەوە نووسـتنو جـووت بوونـەتان پێکـەوە ئـەنجام داوە، خۆشـیتان لـە یـەکتری بینیـوەو منـداڵتان لەبەینـدا پەیـدابووە، دەی چـۆن ئـەو هەڵوێـستە وەردەگـرنو ئـەو پەیوەندییـە دەپـچڕێنن، هـەتکی نامووسـی ئافرەتەکـە دەکـەن، سومعەی خراپ دەکەن، تەماع لەماڵی ئەو بـێ دەسـەڵاتە دەکەن؟ خـۆ ئێـوە توانـای کـارکردنو مـاڵ پەیـداکردنتان هەیـە! چـۆن ئێـوە هەڵوێـستی ئـاوا بەرامبـەریان دەنوێنن؟ خۆ ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا﴾ عەهدو پەیمانیان لێ وەرگرتـوون بـەوەی کـە بـەڕێکو پێکـی مێردایـەتییان لەگەڵـدا بکـەنو هـەڵسو کـەوتان لەگەڵیانـدا راستاڵانە بێو هەرکاتێکیش بەیەکـەوە نـەگونجان بەشێوەیەکی عادڵانـەو مرۆڤانـە دەستیان لێ بەربدەنو ستەمو ناڕەواییان لەگەڵدا نەکەن.

قـەتادەو موجاهیـد دەڵێن: (میثـاق) ئـەو عەهـدو پەیمانەیـە کـە پـەروەردگار لەبارەی ئافرەتانەوە لە پیـاوانی وەرگرتـووە کـە دەفـەرموێ: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ – البقرة/٢٢٩﴾.

## ئەو ئافرەتانەی ناشێ مارە بکرێن

﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ

وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾.

لەوەپێش پەروەردگار حوکمی مارەکردنی چەتیوان‌و ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کە دروستە پیاو مارەیان بکا بەمەرجێ دادوەری بکاو بتوانێ بژێوییان دابین بکا دیاری کرد.

ئەمجار ئامۆژگاری ئەوەشی کرد کە بەرێك‌و پێکی هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا بکرێ، هەڕەشەی لەوە کرد کە بەناڕەوا مارەییان لێ بستێندرێ، ئەمجار دێتە سەر دیاریکردنی ئەو ئافرەتانەی کە ناشێ پیاو مارەیان بکا، جا هۆی نەشیانەکە خزمایەتی، یان خەسوو خەزورایەتی، یان شیرخواردن بێ: ئەم ئایەتە دەربارەی حصنی کوڕی ئەبو قەیس هاتۆتە خوارێ، کە ژنی باوکی خۆی واتە: زڕ دایکی خۆی کە ناوی (کبشە)ی کچی مەعەن بوو مارەکرد، هەروەها صەفوانی کوڕی ئومەیی

کوڕی خەلەف باوەژنی خۆی – فاخیتەی کچی ئەلئەسوەدی – مارەکرد، هەروەها مەنصوری کوڕی مازین باوەژنی خۆی – مولەیکەی کچی خاریجەی – مارەکرد. ئەشعەثی کوڕی سوار دەڵێ: ئەبو قەیس کە یەکێ بوو لەپیاو چاکانی یاریدەدەران، کۆچی دوایی کرد. قەیسی کوڕی کە لەژنێکی تری بوو، خوازبێنی کرد، زڕ دایکەکە وتی: من تۆ بەکوڕی خۆم دەزانم بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەچمە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی لێ وەردەگرم، چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم هەواڵەی بۆ گێڕایەوە ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

ئیبنو جەریری طەبەری لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کۆمەڵگای سەردەمی نەزانی مارەکردنی ئافرەتی مەحرەمییان بەلاوە یاساغ بوو، جگە لەزڕ دایكو کۆکردنەوەی نێوان دوو خوشك...

ئیتر بەمەبەستی بنبڕ کردنی ئەو دابو نەریتەو قەڵاچۆکردنی ئەم باوە پیسەو نەهێشتنی ئەو عادەتە ناشیرینە پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ ئەو ئافرەتانە مارە مەکەن کە باوکەکانتان مارەیان کردوون! واتە: زڕ دایکی خۆتان مارە مەکەنەوە، ئەوە کردەوەیەکی ناشیرینو قیز لێکراوە تەبیعەتێ ساغ بێ لێی نامۆیە، چونکە زڕ دایك وەکوو دایك وایە، مەگەر ئەوانەی کە لەوەپێش مارەیان کردبن، ئەوە گوناهیان ناگاتێو سزایان لەسەر نییە ﴿إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاء سَبِيلاً﴾ مارەکردنەوەی زڕ دایك کارێکی ناڕەوایەو ستەمو قیز لێکراوەو ڕێبازێکی خراپەو هەرکەسێك لەوە بەولاوە بیکا تاوانەو شیاوی سزادانە.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: کردەوەی خراپو پیس سێ جۆرە: یان قوبحی عەقلییە، یان قوبحی شەرعییە یان قوبحی عورفییە، پەروەردگار مارەکردنەوەی زڕ دایکی وا حسێب کرد: کە هەرسێ ناپەسەندییەکەی تێدان. چونکە فەرمووی: (فَاحِشَةً) کە ناشیرینییەکەی لای هەموو ژیرو هۆشمەندێك ئاشکرایە، فەرمووی: (وَمَقْتًا) کە بێزراوی لای خودایە واتە: قوبحی شەرعییە، فەرمووی: (وَسَاء سَبِيلاً) کە ئەویش بێزراوی ناو پیاوانە واتە: قوبحی عورفییە، ئەمجار دێتە سەر دەستنیشان کردنی ئەو ئافرەتانەی کە مارەکردنیان حەرامە، چونکە مارەکردنیان پێچەوانەی

ئەو پەیوەندییەیە کە لەنیکاح کردنی نێرو مێ چاوەڕوان دەکرێ، ئەو ئافرەتانەش شەش تاقمن‌و پەروەردگار بەم شێوەیە دیاری کردوون کە دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ﴾ یاساغ‌و قەدەغەیە لەسەرتان مارەکردنی دایك‌و نەنکتان با بەرەو ژووریش بچێ! ﴿وَبَنَاتُكُمْ﴾ کچەکانتان با داکەوێ واتە کچی کچی.. ﴿وَأَخَوَاتُكُمْ﴾ هەروەها حەرامە لێتان مارەکردنی خوشك جا خوشکی دایك‌و باوکی، یان خوشکی باوکی یان خوشکی دایکی بێ. ﴿وَعَمَّاتُكُمْ﴾ پوور: خوشکی باوك ﴿وَخَالاَتُكُمْ﴾ پوور: خوشکی دایك. ﴿وَبَنَاتُ الأَخِ﴾ کچی برا. ﴿وَبَنَاتُ الأُخْتِ﴾ کچی خوشك. ئەم سێ تاقمە بەهۆی نەسەبەوە حەرامن واتە: (أصول) بنەچە (فروع) نەوە (حواشی) نزیك‌و دوور.

تاقمی چوارەم: مارەکردنیان بەهۆی شیر خواردنەوە حەرام دەبێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ﴾ دایکی شیردەرو خوشکی شیری؛ واتە: هەموو خزمی ژنە شیردەرەکە دەبنە خزمی شیر خۆرەکە: ژنەکە دەبێتە دایکی، کچی ژنەکە دەبێتە خوشکی شیر خۆرەکە، مێردی ژنە شیردەرەکە دەبێتە باوکی شیر خۆرەکە، کوڕەکانی دەبنە برای شیرخۆر.

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم لە ئیبنو عەبباسەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکەن: دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای لێکرا کە کچی حەمزەی مامی مارەبکا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە بەمن ناشێ؛ چونکە ئەو کچی برای شیریمە! هەرچی بە نەسەب حەرام بێ، بەهۆی شیر خواردنیش حەرام دەبێ. دووبارە بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پرسیارکرا: دەربارەی پیاوێك کە دوو جارییەی هەبن یەکێکیان شیری دا بەمنداڵێکی نێرینەو ئەوی تریان شیری دا بە منداڵێکی مێینە، ئایا دەشێ دوایی ئەو دوو منداڵە ببنە هاوسەری یەکتری؟! پێغەمبەر فەرمووی: نەخێر نابێ.

چونکە (لقاح) مەتربەکردنەکەیان یەکە، واتە: چونکە مێردی دوو جارییەکان پیاوێکە هەردووکیان لە پیاوەکەوە شیرەکەیان بۆ پەیدابوو.

زاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کەشیر خواردن زۆرو کەمی چوون یەکە، حەنەفییەکان‌و مالیکییەکان ئەمەیان لە ئایەتەکە وەرگرتووە، کۆمەڵێکی تر لە (فوقەها) پێیان وایە دەبێ شیر خواردنەکە لەسێ جار کەمتر نەبێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَان وَلاَ تُحَرِّمُ الإِمْلاَجَةُ وَالإِمْلاَجَتَان» مژینێك‌و دوو مژین قومێك‌و دوو قوم حەرامی پەیدا ناکەن، شافیعی‌و ئەحمەد، پێیان وایە: بەکەمتر لەپێنج جار شیر خواردن حەرامی پەیدا نابێ.. لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە لە عائیشەوە ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: «كَانَتْ فِيمَا أُنْزِلَ الله مِنَ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ فَنُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (دروودی خوای لەسەر بێ) وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ». هەڵبەتە حەنەفییەکان دەڵێن: ئایەتەکە ماناکەی موحکەم‌و ئاشکرایە، مەبەستەکەی روون‌و بێ پێچ‌و پەنایە، فەرموودەکەش خەبەری واحیدە تەخصیصی ئایەتی ئاوا بە خەبەری واحید ناکرێ!

ئەبوبەکری رازی لە طاووسەوە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە: کە فەرموویەتی: خەڵك دەڵێن: ژەمێك‌و دوو ژەم شیر خواردن، حەرامی پەیدا ناکەن، فەرمووی: بەڵێ زوو وابوو بەڵام ئیمڕۆ تەنها ژەمێك دەبێتە هۆی حەرامی.

شیر خواردن نابێتە هۆی حەرامی ئەگەر تەمەنی منداڵە شیر خۆرەکە لە دووساڵ زیاتر بێ چونکە ماوەی شیر خواردن تا دوو ساڵە، لەوەدوا حسێب ناکرێ.

قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ – البقرة/٢٣٣﴾.

هەروەها دارەقوطنی لە ئیبنو عەبباسەوە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «لاَ رَضَاعَ إلاَّ مَا كَانَ فِي الْحَوْلَيْنِ».

تاقمی پێنجەم: ئەو ئافرەتانەن بەهۆی خەسوو خەزووریەوە حەرام دەبن کە یەکەمیان دایکی ژنە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ﴾ حەرامە لەسەرتان مارەکردنی دایکی ژنتان‌و نەنکی ژنتان.. مەرجیش نیە ئافرەتەکە گواسترابێتەوە، بەڵکوو تەنها بە مارەبڕینی ئافرەتەکە، دایکی‌و دایکی دایکی‌و بەرەو ژوور، لە پیاوەکە حەرام دەبن.

دووەم کچی ژن کە لە مێردێکی تری بێ بە مەرجێ ئافرەتەکە گواسترابێتەوەو مێردەکەی لەگەڵی جووت بووبێ، ئیتر ئەوکاتە کچی ئەو ژنەو کچی کچی.. هتد لە پیاوەکە حەرام دەبن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ حەرامە لێتان مارەکردنی (کۆلەبەس) کچی ژنەکانتان کە لە مێردی تریان بێو لەژێر چاودێریو سەرپەرشتیاری ئێوەدابن، بەمەرجێ چووبنە لای دایکەکەیان.. بەڵام ﴿فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ ئەگەر نەچووبوونە لای ئافرەتەکانو نەگواسترابوونەوە، هەر تەنها مارەیان برابوو لێك ترازان، ئەوە ئەگەر دایکەکە تەڵاق بدەن یان بمرێ دەشێ (ربیبە)کە مارە بکەن!

جا مەرج نیە (ربیبە)کە لەماڵی مێردی دایکیدا بێ، تەنانەت ئەگەر لای سەرپەرشتیاری تریش بێ هەر لەمێردی دایکی حەرام دەبێ.

سێیەم ژنی کوڕەکانتانو ژنی کوڕی کوڕ... هتد وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ﴾ حەرامە لەسەرتان مارەکردنی ژنی کوڕو ژنی کوڕی کوڕ ئەو کوڕانەی لەپشتی ئێوە کەوتوونەوە، بەڵام ژنی کوڕی هەڵگیراوەو بەکوڕ کراو واتە: (التبني) ئەوە ئەگەر مارەیان بکەن هیچی تێدا نیە. وەکوو چۆن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) زەید بە تەبەنی بووبووە کوڕی، کە زەینەبەی مارەکرد دوایی تەڵاقی دا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مارەی کردەوە، بەمە دابو نەریتی تەبەننی پووچ کردەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ – الأحزاب/٣٧﴾.

تاقمی شەشەم: ئەو ئافرەتانەن کە بەهۆی هۆکاری لاوەکی مارەکردنیان حەرام دەبێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ هەروەها لێتان حەرامە، کە لەیەك کاتدا دوو خوشك لەژێر نیکاحتاندا بن، یان ئافرەتێك لەگەڵ پووریدا یان لەگەڵ برازایدا یان لەگەڵ خوشکەزایدا ببن بەخێزانی پیاوێك، واتە: کۆکردنەوەیان لەژێر نیکاحی پیاوێکدا لەیەك کاتدا حەرامە. قاعیدەکەشی ئەوەیە: هەر دوو ئافرەتێك ئەگەر وای دابنێین یەکیان پیاو بێو یەکیان ئافرەت نیکاحیان لێك نەیە کۆکردنەوەشیان لەژێر نیکاحی کابرایەکدا دروست نیە، مەگەر لەپێش

هاتنە خوارەوەی ئەم حوکمەدا بووبێ ئەوە تازە تێپەڕیوە ﴿إِنَّ اللَّـهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ بێگومان پەروەردگار لێخۆشبووەو لە ئاساری ئەو جۆرە کردارانەی پێشووتان خۆش دەبێ، ئەگەر تۆبە بکەن‌و بۆ لای خودا بگەڕێنەوە، سۆزو بەزەیی زۆرە بۆیە ئەحکامی ژن مارەکردنی ئاوا بۆ شیکردنەوە بەجۆرێك کە بەرژەوەندی‌و خێرو سوودی تێدایە بۆ گشتی‌و دەبێتە هۆی بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان ئێوەی ئادەمیزاد.

**بەیارمەتی خودا لە نووسینەوەی جزمی چوارەمی تەفسیری رەوان بوومەوە.. خوا یاربێ بەبێ پچڕان‌و وەغران یەك بەدوا یەکدا هەموو بەرگەکانی ئەم تەفسیرە پیرۆزە دەکەونە بەردەستی شەیدایانی قورئانی پیرۆزو لێی بەهرەمەند دەبن، ئەمەش ئاواتی هەرەبەرزی بەندەیە**

**پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکەم کە ئەگەر توانای دارایی خۆم وەکوو پێویست هەبوایە دەمتوانی زووترو خێراتر هەموو بەرگەکانی یەك بەدوای یەکدا بەچاپ بگەیەنم.**

**بەڵام دەسەڵات هەر ئەوەندەیەو خودا بەزۆری نەزانێ!!**

**نرخاندنی ئەم تەفسیرە زێڕینە بە قەڵەمی مامۆستا نوری فارس**

ئەم تەفسیرە زێڕینە

قورئانی پیرۆز سەرچاوەی رۆشنی بەرنامەی ئیسلامە، مۆمێکی رۆشنە، چرایەکی درەخشانە، رێگەی ژیانی هەردوو جیهانی موسوڵمان، رۆشن دەکاتەوە، بەرنامەی ژیانی گەلی ئیسلام دادەڕێژێ، هەموو کون‌و قوژبنێکی ژین رۆشن دەکاتەوە، لە ئەرکی پیرۆزی سەرشانی موسوڵمانانە کە بەباشی لەبەرنامەی پیرۆزی ئیسلام حاڵی ببن، هەتا لەسەر شێوەیەکی رەوا خودا بپەرستن‌و لەسەر شێوەیەکی جوانی گونجاو لەگەڵ گیانی سەردەمدا مامەڵەی پێ بکەن‌و بەهرەی گیانی‌و ژیانی لێ وەربگرن. ئەمڕۆ لە سایەی خوداوە رابوونێکی گەورەی ئیسلامی هەیە، لەهەموو لایێ چاوی تێ بڕاوە، جێگەی ئومێدی جەماوەری موسوڵمانە، لاوە رۆشنبیرەکان‌و پیرە نوورانییەکانیش وەك پەروانەو مۆم بە پیرییەوە دەچن، خوێنی گەشیان زەمیتی بڵێسەی مەشخەڵەکەیەتی. خودا یاربێ ئەم رابوونە بە ئەنجام دەگا، ئاسۆ روونە، ئومێدی گەورە بە رەحمەتی خوا وایە کە هۆی تەوفیق‌و سەرکەوتنی بۆ

بڕەخسێنێ. دەی ئەم تەفسیرە، لەبابەتی خۆیدا، لەم گۆڕەپانەدا پێشەنگو سەرمەشقە، خوا یاربێ هۆکارێکی لەبار دەبێ لە هۆکارەکانی ئەو تەوفیقە خواییە، بەسە بۆ پەسنو ثەنا خوانی ئەم تەفسیرە کە لەم سێ بوارە گرنگەدا خزمەت بە گەلی کوردی سەرجەم موسوڵمانان دەکا:

١- گەوهەرێکی شەو چرایە لەبواری راڤەو تەفسیری قورئانی پیرۆزدا، بە کوردییەکی بە پێزی بەهێزی ئاسانی رەسەنی رەوان نووسراوە، بەباشی خوێنەری لە مەبەستو مەعناو رۆحی دەقە قورئانییەکە شارەزا دەکا، دوورە لەبابەتی لاوازو ئەفسانە گەری، دووریشە لەتوندڕەوی، لەسەر رێبازێکی نوێ باوە کە پابەندبێ بە یاساکانی عولوومی تەفسیرەوە، لەبەرئەوە هەموو مەرجەکانی تەفسیری رەسەنی تیادایە.

٢- یادگارییەکی شاکارە لەبواری خزمەتی ئەدەبو رۆشنبیریو نامەخانەی کوردیدا، زمانی پێ دەوڵەمەند دەبێ، کوردی پێ داناتر دەبێ.

٣- خزمەتێکی تایبەتە بە عاشقانی قورئانو مامۆستا ئایینییەکان، چونکە دەتوانن بەئاسانی لەپوختەی تەفسیرە کۆنەکانو تەفسیرە نوێیەکان بەهۆی ئەم تەفسیرەوە شارەزا ببن.

خودا پاداشتی مامۆستا مەحموود بداتەوە لەسەر ئەم کۆششە پیرۆزە، یەخوا لەهەموو بەرگەکانی تریدا ئاوا سەرکەوتووبێ، بەڕاستی وەکوو حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (الأناء يترشي بما فيه). دیارە دڵی مامۆستا مەحموود پڕە لە حوببی قورئانو موسوڵمانو کوردان، بۆیە لەم سێ بوارەدا نووری دڵی سەرڕێژی کردووە، مایەی شانازیو سەربەرزی بەندەی ناتەوانە کە بەشداریم لە پێداچوونەوەی ئەم بەرگەدا کردووە، دوا وتەم:

لخيرمـــا يهـــدى الى عبـــد وفي

لربـــه نظـــير ذا المؤلـــف

خادم القرآن

نوری فارس حەمەخان

١٩٩٧/١٢/٧

## ژنی مێردار مارە ناکرێ، ئافرەتی نامەحرەم مارە دەکرێ بەمەرجێ مارەیی هەبێ

﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۖ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ ۚ فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ بَعْدِ الْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا (٢٤)﴾.

ئیمامی موسلیمو ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائی لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە دەگێڕنەوە، دەڵێ: هەندێ ئافرەتی رفێندراوی (أوطاس)مان دەست کەوت: کە خاوەن مێرد بوون، دەڵێ: بەلامانەوە نەگونجاو بوو، کە دەستیان لەگەڵدا تێکەڵاو بکەین، چونکە پێش رفاندنەکەیان لە شوێنی خۆیان مێردیان هەبوو، لەم بارەوە پرسیارمان لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کرد، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ:

﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ طەبەری لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە رۆژی حونەین هاتۆتە خوارێ، ئەوە بوو خودا یارمەتی داین، حونەین رزگار کرا، موسوڵمانان زۆر ژنی ئەهلی کیتابیان گرت، کە مێرد دار بوون، ئەگەر یەکێك بیویستبایە دەستیان بۆ بەرێ دەیانگوت: مێردمان هەیە، لەم بارەوە پرسیار لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کرا، ئیتر ئایەتی ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ

النِّسَاءِ﴾ هاتە خوارێ: بۆ روون کردنەوەی حوکمی ئەو ئافرەتە رفێندراوانە.. دیاریشە ئەم دوو ئایەتە تەواوکەری ئایەتەکانی پێشوون، ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ﴾ عەطف کراوەتەوە: بۆ سەر ﴿أُمَّهَاتُكُمْ﴾ی ئایەتی پێشوو، بەلاّم ئەوان قورئانیان دابەش کردووە بە سی بەش (سی جوزء) ئەم دوو ئایەتەیان کردووە بەسەرەتای جوزئی پێنجەم، لایەنی لەفظیان بەرچاو گرتووە. موراعاتی مانایان نەکردووە، چونکە ئەگەر لایەنی مانایان بەرچاو بگرتایە دەبوو سەرەتای جوزئی پێنجەم ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ – النساء/٢٩﴾ بوایە.

﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ﴾ حەرامە لێتان مارە کردنی ژنی مێرد دار ﴿إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ مەگەر ئەو ژنە مێرد دارانەی کە بوونە موڵکی ئێوە بەهۆی رفاندنەوە کە لە غەزادا گرتووتانن مێردەکانیان لە وڵاتی کوفر دانو کافرن، بەرژەوەندیش وا دەخوازێ کە نەیاندەنەوە بە مێردەکانیانو نەیانگێڕنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. ئەو کاتە عەقدی ژنو مێردایەتیان دەپچڕێو بۆ ئێوە رەوا دەبێ کە بچنە لایانو بەو مەرجانەی کە لە کتێبی فیقهدا شی کراوەتەوە. حیکمەتی ئەمەش ئەوەیە: چونکە زۆرجار وا رێ دەکەوێ لە شەڕدا، بڕێ لە مێردەکانیان دەکوژرێن، بڕێکی تریان هەڵدێنو ناگەڕێنەوە بۆ وڵاتی موسوڵمانان. ئەو ئافرەتە رفێندراوانە پێویستە پێداویستیان بۆ دابین بکرێو نەهێڵدرێ تووشی رەوشت ناشیرینی ببن. جا لە بەرژەوەندی ئافرەتەکانەو کۆمەڵگای موسوڵمانانیش وا دەخوازێ کە بۆ هەریەکێکیان یان زیاتر بەخێوکەرێك هەبێ بژێوی بداو نامووسی بپارێزێو پێداویستیان دابین بکرێ.

ئیسلام رفاندنی ژنی نە بە واجب داناوە، نە حەرامی کردووە، زۆرجاری وا هەیە سەبیی کردنی ئافرەتەکانو رفاندنیان دەبێتە خێر بۆ خودی ئافرەتەکان، وەکوو ئەوە کە شەڕەکە لەگەڵ هۆزێکی دیاری کراو بێو هەموو پیاوەکانیان بکوژرێن.

مەرجە دەبێ ئەو شەڕە شەڕی ئایینی بێ لە نێوان موسوڵمانو کوفردا بێ. بۆ بەرگری لە ئایین بێ، شەڕی داگیر کردنو ئیستغلال نەبێ.

﴿كِتَابَ اللّهِ عَلَيْكُمْ﴾ خودا ئەوەی لەسەر چەسپاندوون‌و فەرزی کردووە، ئەو ئافرەتانەی مارە کردنیانی لێ قەدەغە کردوون، شتێکی چەسپاوو جەخت لێ کراوەو لەگەڵ بەرژەوەندی تاك‌و کۆمەڵدا گونجاوەو، گۆڕانکاری تێدا ناکرێ‌و، شك‌و گومانیشی تێدا نیە.

﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ﴾ رەوایە بۆتان جگە لەو ئافرەتانەی لێتان قەدەغە کراون: کە ﴿أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ﴾ ئافرەتی تر بخوازن‌و، لە ماڵی خۆتان مارەییان بدەنێ بەمەرجێ لە رێگای شەرعییەوە بیانکەن بە حەڵاڵی خۆتان‌و، بەشێوەی داوێن پیسی نەچنە لایان‌و ماڵ‌و دارایی خۆتان بە زینا کردن بە فیڕۆ مەدەن.

﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ هەر ئافرەتێك لەو ئافرەتانەی مارە کردنیان بۆتان رەوایەو، مارەتان کردن‌و لەززەتتان لێ بینین، مارەیی خۆیان بدەنێ ﴿فَرِيضَةً﴾ ئەم حوکمە، لە لایەن خوداوە دانراوەو، دیاری کراو فەرز کراوە، ئەو مارەییە خودا دایناوەو لە جیاتی خۆ تەسلیم کردنەو، بە چوونە لا واجب دەبێ.

﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ﴾ هیچ گوناهێکتان ناگاتێ‌و خراپەیەك لەسەر ئێوەی مێرد نیە، لە ئاکامی ئەو رێك کەوتن‌و گەردن ئازادی کردنەی کە لە نێوان ژن‌و مێردەکەدا روو دەدات، وەکوو ئەوە: ئافرەتەکە لە هەموو مارەییەکەی یان لە هەندێکی خۆش ببێ، یان پیاوەکە زیاد لە مارەییەکەی بداتێ، واتە: کەم کردن‌و زیاد کردن بە رەزامەندی خۆیان، شتێکی رەوایەو ناشەرعی تێدا نیە، چونکە مەبەست لە عەقدی ژن‌و مێردایەتی ئەوەیە: کە لەسەر بناغەی خۆشەویستی دابمەزرێ‌و هاریکاری‌و یارمەتیدانی یەکتری تێدا بێ ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ پەروەردگار زانایەو دەزانی چ لە دڵی بەندەکانی دایەو چ کارو هەڵوێستێك بەرژەوەندی ئەوانی لە خۆ گرتووە، حەکیم‌و دانایە، لەو حوکمانەی بۆیان دادەڕێژێ، هەر حوکمێك کە بۆیان دادەنێ خێروبێری ئادەمیزادی تێدایە.

### ئەم ئایەتە حەوت حوکمی شەرعی تێدایە:

أ- مارە کردنی ژنی بە مێرد. ئافرەت تا لە ژێر نیکاحی مێرد دابێ یان لە عیددە دابێ دروست نیە کەس خوازبێنیو مارەی بکات.

ب- ئافرەتی گیراو رفێندراو لە شەڕی کافراندا یان کۆیلەی کڕدراو، پاش رۆیشتنی عیددەی شەرعی، چوونە لایان دروستە. چونکە ئافرەتی رفێندراو رفاندنەکەی سەردەکێشێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی نیکاحی مێردی پێشووی، بەمەرجێ مێردەکەی کافر بێو لە وڵاتی کافران بێ.

ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: ئەگەر لەگەڵ ئافرەتەکە مێردەکەشی رفێندرا، لێك ناکرێن، چونکە ئەو کاتە کابرا عەهدو پەیمانی بۆ دروست دەبێو خاوەنییەتی پارێزراو دەبێ، ژنەکەشی بەشێکە لەو شتانەی کە ئەو خاوەنیەتی.

ج- حەڵاڵە جگە لەو ئافرەتانەی کە لە ئایەتی رابووردو ژمارە (٢٣) دا باس کرانو لە فەرموودەی پێغەمبەردا هی تریشیان خراونە پاڵ، جگە لەئەوانە حەڵاڵە مارەکردنی هەر ئافرەتێکی تر.

د- حەڵاڵە لەززەت بینین لە ئافرەت بە عەقدو نیکاحی شەرعیو لەسەر مارەیی.

ه- مارەیی واجب دەبێ بە چوونە لاو خۆ تەسلیم کردنی ئافرەتەکە بۆ پیاوەکە. چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ:

﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ئایەتەکە ئەوە دەچەسپێنێ کە مارەیی پێی دەگوترێ کرێو لە جیاتی چوونە لای ئافرەتەکەیە، هەر شتێکیش لە بەرامبەر سوودێك دابێ، پێی دەگوترێ: کرێ، وا دەردەکەوێ سەودا لەسەر کراوەکە جەستەی ئافرەتەکەو لەززەتی ئامێری مێینەکەیو حەڵاڵیەکەیەتی. چونکە سەوداکە داخوازی ئەمانەیە.

### زانایان دەرباری مەعنای ئایەتەکە، دوو رایان هەیە:

١- حەسەنو موجاهیدو هی تریش دەڵێن: مانای ئەوەی سوودتان پێ گەییو خۆشیتان لێ بینی بەهۆی جووت بوون لەگەڵ ئافرەتدا بە نیکاحی صەحیح ئەوە مارەیی خۆیان بدەنێ.

واتـە: ئەگـەر تـەنها جـارێکیش لەگەڵیـدا جـووت بـوو، مـارەیی تـەواوی لەسـەر پێویست دەبێ. ئەگەر ناوی مارەیی نەهاتبوو مارەیی هاو وێنەکانی دەکەوێ، واتـە: (مهر المثل). ئەگەر نیکاحەکە فاسید بـوو مـارەیی هـاو وێنـەکانی دەکەوێ چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ هەر ئافرەتێك بەبێ رێگا پێدانی (وەلی)یەکەی مارە کرا ئەوە مارەکردنەکەی بەتاڵە، ئەگەر پیاوەکە چوو بووە لای ئەوە (مهر المثل)ی دەکەوێ...[1]

بەڕای ئەمان دروست نیە ئایەتەکە بکرێ بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە نیکاحی (متعة) مارە کردنی کاتی – دروست بێ، چونکە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێ) نەهی کردووە لە نیکاحی موتعـەو بـە حـەرامی دانـاوە، هـەروەها چونکە خـوا دەفەرموێ: ﴿فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ – النساء/٢٥﴾

ئاشکراشە مارەکردن بە ئیزن و رەزامەندی کەس و کاری ئافرەتەکە مـارەکردنی شەرعییەو کە بە ئامادە بوونی وەلی و دوو شایەت ئەنجام دەدرێ!

٢- جـەماوەری زانایـان دەڵـێن: مەبەسـت لـە ئایەتەکـە نیکـاحی موتعەیـە، کـە لەسەرەتای پەیدا بوونی ئیسلامدا لە ناو موسوڵماناندا باو بوو، پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) جارێـك یـان دوو جـار لـە غـەزادا رێگـای بـە موسـوڵمانان دا کـە بەشـێوەی کـاتی ژن مـارە بکـەن، چـونکە جـەنگاوەرانی موسـوڵمان بـۆ ماوەیـەکی وا دەبوو لە مـاڵ و خێزانـی خۆیـان دوور دەکەوتنـەوە، ترسـی زینـا کردنیـان لێ دەکـرا، ئەویش لـە غـەزای (أوطاس) و سـاڵی رزگـارکردنی مەککـەدا بـوو، دوایـی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) یاساغی کردو، بۆ هەتا هەتایـە حـەرام کـرا، ئامـاژە بـەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُـمْ لِفُـرُوجِهِمْ حَـافِظُونَ، إِلَّـا عَلَـى أَزْوَاجِهِـمْ أَوْ مَـا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ – المؤمنون/٥ – ٦﴾.

دەی خۆ (موتعة) نیکاح نیەو کۆیلایەتی و خاوەنی (ملك اليمين)یش نیـە. دارە قوطنی لە ئیمامی عەلییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ:

---

[1] - أخرجه أصحاب السنن إلا النسائي عن عائيشة.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەهی لە مارەکردنی کاتی (نیکاح المتعة) کرد، ئیمامی عەلی دەفەرموێ: ئەمە بۆ کەسێك بوو کە نەبووبێ. کاتێك کە ئایەتەکانی (النکاح)و (الطلاق)و (العقد)و میرات لە نێوان ژنو مێردا هاتنە خوارێ حوکمی نیکاحی موتعە هەڵوەشایەوە. لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا لە ئیمامی عەلییەوە فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر نەهی لە نیکاحی کاتی کرد هەروەها نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی گوێ درێژی ماڵی، ئەوەش لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا بوو.

بە شێوە دەقێکی تر لە صەحیحی موسلیمدا لە ڕەبیعی کوڕی ئوسەیدی کوڕی مەعبەدی جوهەنییەوە لە باوکییەوە دەڵێ: ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا غەزام کرد پێغەمبەر فەرمووی: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الإِسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ ذَلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهُ وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا».

ئیمامی عومەریش لەسەردەمی خۆیدا نەهی لە نیکاحی موتعە کردووەو فەرموودەی زۆریش هەن لەسەر یاساغی نیکاحی کاتی تا ڕۆژی قیامەت هەن.

بەڵکوو نیکاحی موتعە بەو شێوەیەی کە شیعەی ئیمامی بە ڕەوای دەزانن: بە هەبوونو لەبەرچاو گرتنی چەند مەرجێك، ئیستا لە واقیعدا تەطبیق ناکرێن. چونکە ئەو کەسەی ئێستا ئەو جۆرە نیکاحە دەکا مەبەستی داوێن پاکی نیەو بەڵکوو مەبەستی نامووس فرۆشیو تێرکردنی جینسییە، پابەندی ئاکامی جووت بوونەکە ناکاو ئافرەتەکە عیددە ناگرێ.

ئیبنو عەرەبی دەڵێ: ئیبنو عەبباس فتوای بە ڕەوایی مارەکردنی کاتی دەدا، دوایی لە فتوای خۆی ژێوان بووەوە، ئەمجار ئیجماعی موسوڵمانان لەسەر یاساغ بوونی دامەزرا چوار مەزهەبەکەش جگە لە (زفر) بەلایانەوە نیکاحی موتعە بەتاڵە.

و- کە دەفەرموێ: ﴿فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ ماڵو سامانو شتی تریش دەگرێتەوە. جەماوەری زانایان ئەو ڕایەیان پەسەند کردووە، بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێ: ئەگەر ئافرەت لەسەر سوودو مەنفەعەتی ماڵ مارە کرا نیکاحەکە دروستە. وەکوو ئەوە

وایە ناوی مارەیی نەبرابێ ئەو کاتە ئەگەر مێردەکە چووبووە لای (مهر المثل)ی دەکەوێ، ئەگەر نەچووبووە لای ئەوە موتعەی بۆ هەیە.

ز- کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ﴾ ئەوەی لێی وەردەگیرێ کە زیادو کەم لە مارەییدا دروستە، ئەگەر دوای مارە بڕین رێك کەوتن و بە ڕەزامەندی خۆیان دەتوانن زیادو کەمی تێدا بکەن واتە: ئافرەتەکە دەتوانێ لە مارەییەکەی گەردنی ئازاد بکا. یان پیاوەکە دەتوانێ هەموو مارەییەکەی بداتێ ئەگەر پێش چوونە لای تەلاقی دا!

## مەرجەکانی مارەکردنی ئەمەتەو سزای ئەوانەی داوێن پیسی دەکەن

﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ۚ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۚ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾ ﴾.

ئەمجار لەم ئایەتەی ئێرەدا پەروەردگار حوکمی مارە کردنی (أمة) چەتیوە، کۆیلە دیاری دەکا، وێڕای حوکمی سزادانیان ئەگەر کارێکی حەیابەریان کردو

دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلاً أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ كەسێك ماڵو دارایی ئەوەی نەبوو كە ئافرەتی ئازاد (حرة)ی موسوڵمان مارە بكا ﴿فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ ئەوا دەتوانێ ئافرەتی كۆیلەی موسوڵمان بكاتە هاوسەری خۆی؛ ئەو ژنە (أمة)متانەی كە ملكی خۆتانن. بۆیەش بە (فتیات) ناوی هێناون بۆ ڕێزلێنان بۆ ئەو ئافرەتە كۆیلانەو، هەروەها بۆ ڕێنموونیی موسوڵمان كە ئافرەتی كۆیلەو پیاوی كۆیلە بە وشەی ( فتاة)و (فتی) – كچەكەو كوڕەكە – بانگ بكرێن بۆ ئەوەی هەست بە كەسایەتی خۆیان بكەنو دڵیان بە خۆ نەمێنێ.

بوخاری فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ عَبْدِي وَأَمَتِي وَلاَ يَقُولَنَّ الْمَمْلُوكُ رَبِّي وَرَبَّتِي وَلْيَقُلِ الْمَالِكُ فَتَايَ وَفَتَاتِي وَلْيَقُلِ الْمَمْلُوكُ سَيِّدِي وَسَيِّدَتِي فَإِنَّكُمُ الْمَمْلُوكُونَ وَالرَّبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ».

وەكوو ئاشكراشە مەبەست بە (المحصنات) ئافرەتی ئازادە چونكە لە بەرامبەرەكەیدا كۆیلەی هێنایە پێشەوە، بەڕواڵەتیش ئافرەتی ئازاد دەبێ بەشەرمو حەیاو نامووس بێ، كە ئەوە لە ئافرەتی كۆیلە چاوەڕوان ناكرێ، بۆیە (هیند) بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری لە پێغەمبەر كردو وتی: (أو تزني الحرة) چون؟ ئافرەتی ئازاد داوێن پیسی دەكا؟!

﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُمْ﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! ئێوە لەسەرتانە كە ظاهیری شتەكان بزانن‌و بەس، بەرپرسیاری ئەوە نین: كە نهێنییەكان بزانن، زانینی چۆنیەتی‌و نهێنی هەموو كارێك تایبەتە بە خوداوە، ئێوە كار بە ظاهیرەكە بكەن، بیروباوەڕی ڕواڵەتی لە ئافرەتی كۆیلەدا بەسەو، پێویست ناكا بچنە ناوەڕۆكی چۆنیەتی ئیمانەكەیان؛ چونكە ئەوە: لە توانای ئێوەدا نیە، ﴿بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ﴾ ئێوە لەگەڵ ئافرەتە كۆیلەكان یەك ڕەچەڵەكن كە ئادەمیزادیەتی‌و گەڕانەوەتانە بۆ یەك بنەچەو باوە گەورە كە ئادەمە، یان ئێوەو ئافرەتە كۆیلەكان هاوبەشن لە بیروباوەڕدا، بیروباوەڕیش گەورەترین ڕێزو پلەو پایەیە، كەوابێ لە كاتی پێویستدا كۆ لە مارە كردنی ئافرەتی كۆیلە مەكەن! بەمەش پەروەردگار لە شان‌و شكۆی ئافرەتە كۆیلەكانی بەرز كردۆتەوەو یەكسانی خستۆتە نێوان ئافرەتە كۆیلەو

ئافرەتە ئازادەکانەوە! ئەمجار پەروەردگار فەرمانکردنی بە مارەکردنی ئافرەتانی کۆیلە دووبارە کردەوە بۆ هەڵنانی پیاوان کە کۆ لە مارەکردنیان نەکەنەوەو فەرمووی: ﴿فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ﴾ بە ئیزن و رەزامەندی خاوەنەکانیان مارەیان بکەن.

برێ فوقەها دەڵێن: مەبەست لە (أهل) ئەو کەسەیە کە کەسایەتی مارەکردنی ئەو ئافرەتە کۆیلانەی هەبێ، با خاوەنیشیان نەبێ وەکوو باوك و باپیرو قازی و سەرپەرشتیار، چونکە هەریەکێ لە ئەمانە مافی ئەوەی هەیە چەتیوەی کۆیلە بە شوو بدا! شەرعزانان کۆکن، لەسەر ئەوە: کە مارەکردنی کۆیلە چ نێر بێ و ژن بێنێ، یان مێ بێ و شوو بکا، بەبێ ئیزن دانی خاوەنەکەی سەرناگرێ لەبەر ئەم ئایەتەو هەروەها لەبەر ئەو حەدیثەی ئیبنو عومەر کە ئیبنو ماجە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: «أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَهُوَ عَاهِرٌ» ئیتر ئەگەر ئیزن و رەزامەندی خاوەنی کۆیلەکان نەبوو، بەلای شافیعییەوە نیکاحەکە بەتاڵە، بەلای زانایانی ترەوە عەقدەکە رادەگیرێ تا ئیزنەکە نەدرێ نیکاحەکە دانابەسترێ.

ئافرەتی کۆیلە وەکوو ئازاد وایە لەوەدا کە پێویستە مارەیی بدرێتێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ بەشێوەیەکی رێك و پێك مارەیی خۆیان بدەنێ بە رەزامەندی خاوەنەکانیان چونکە مارەییەکەیان مافی خاوەنەکانیانە، لەم رووەوە کە کۆیلەکە ملکی خاوەنەکەیەو دەیدا بە یەکێکی ترو بە مارەکردن لێی بۆی حەڵاڵ دەکا، کەوابێ دەبێ مارەییەکەی بدرێ بەو، هەروەها چونکە کۆیلە مولکی نیەو نابێتە خاوەن! خودا دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً عَبْدًا مَّمْلُوكًا لاَّ يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ – النحل/٧٥﴾.

هەروەها پێغەمبەر فەرموویەتی: «العبد وما في يده لمولاه» ئیمامی مالیك دەفەرموێ: مارەیی مافی ژنە لەسەر مێرد، مارەیی کۆیلەش بۆ خۆیەتی.

﴿مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلاَ مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾ واتە: مارەییان بدەنێ ئەگەر مارەتان کردبوون نەك بەبێ مارە کردن بەکرێ بچنە لایان و بە ئاشکرا خۆفرۆشی و داوێن پیسی بکەن و هەرکەسی داوایان لێ بکا مەکەیان نەبێ، یان بە نهێنی دۆستیان

گرتبێ‌و ڕێگایان پێ بدەن بە نهێنی بچنە لایان بێگومان لەسەردەمی پێش ئیسلامدا دوو جۆر زینا هەبووە؛ ئاشكراو نهێنی:

زینای ئاشكرا ئەوە بووە، وەكوو ئیبنو عەبباس دەڵێ: ئافرەتە كۆیلەكان ئاڵای سووریان هەڵدەكرت بۆ ئەوەی بزانرێ كە ئەو ماڵە ئافرەتی خۆفرۆشی تێدایە هەركەسێ بچوویایە دەیتوانی بچێتە لایان.

زینای نهێنی ئەوە بووە كە ئافرەتەكە بە نهێنی پیاوێكی دەكردە دۆستی خۆی‌و داوێن پیسی لەگەڵدا دەكرد... ئەوە بوو: پەروەردگار هەردوو جۆرەكەی قەدەغە كرد بە ئایەتی ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ – الأنعام/١٥١﴾.

﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ – الأعراف/٣٣﴾.

كەوابی مەبەست بە (المحصنات) لێرەدا ئافرەتی داوێن پاكە، مەبەست (المسافحات) ئەو ئافرەتەیە كە لەشفرۆشی دەكا بە ئاشكرا.

﴿فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ﴾ جا ئەگەر ئەو ئافرەتە كۆیلانە دوای شووكردن‌و مارەكردن‌و گواستنەوەیان زینایان لێ ڕوویداو داوێن پیسیان لەسەر چەسپا ﴿فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ نیوەی سزای ئافرەتی ئازادی لەسەرە، ئەگەر داری حەددی ئافرەتی ئازاد سەد دار بێ هی كۆیلە پەنجا دارە بەردەبارانیش ناكرێ.

﴿ذَلِكَ﴾ ئەوەی باسكرا لەوەی كە دەشبێ كەسێك مارەكردنی ئافرەتی ئازادی بۆ هەڵنەسوورا ئافرەتی كۆیلە مارە بكا ﴿لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ﴾ بۆ كەسێك ترسی ئەوەی هەبێ ئەگەر ئافرەتی كۆیلە مارە نەكا نەتوانێ خۆڕابگرێ‌و سەرەنجام تووشی زینا بێ، یان ترسی ئەوەی هەبێ ئەگەر بەرەنگاری داخوازییە جنسییەكانی بكا، تووشی نەخۆشی تووڕەیی‌و نەخۆشی تر ببێ، وەكوو زانیاری (طب)ی تازە چەسپاندوویەتی. ئەمجار پەروەردگار وەسیەتێكی ئەدەبی‌و ڕەوشتی گشتی ئاراستەی موسوڵمانان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەگەر خۆڕاگرن‌و دان بە خۆتاندا بگرن‌و ئافرەتی كەنیزەك هەرچەندە مارەكردنیان حەڵاڵە –

مارەیان نەکەن ئەوە باشترە چونکە لە مارەکردنەکەیاندا وا دەبێ زیان هەیە، وەکوو ئەوەی کە منداڵیان دەبێ منداڵەکەیان دەبێتە کۆیلە، یان رەوشتی نزمی لێوە فێر دەبێ، هەروەها چونکە مافی خاوەن کەنیزەکەکە بەهێزترە لە مافی مێردەکەی، خاوەنەکەی هەرکاتێ بیەوێ دەتوانێ کەنیزەکەکە لەگەڵ خۆی بەرێ بۆ سەفەر یان بیفرۆشێ ئەمەش بۆ مێردەکانیان شتێکی ناخۆشەو بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الحرائر صلاح البيت والأماء هلاك البيت» ئیمامی عومەریش فەرموویەتی هەرکاتێ کۆیلەیەك ئافرەتێکی ئازاد مارە بکا مانای وایە نیوەی خۆی ئازاد کردووە، هەر پیاوێکی ئازادیش کەنیزەکێك مارە بکا نیوەی خۆی کردووە بە کۆیلە! وواتە کوڕەکەی دەبێتە کۆیلە.

﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خودا لێخۆشبوونی زۆرە، لەو کەسانە خۆش دەبی کە ناتوانن خۆڕابگرن‌و کەنیزەك مارە دەکەن، هەروەها لەو کەسانەش خۆش دەبێ کە وردە تاوانی لێ روودابن‌و وەکوو ئەوە سووکایەتی کردبێ بە کەنیزەکی موسوڵمان، خودا بەزەیی زۆرە؛ کە رێگای داوە بۆ ئێوە کە کەنیزەك مارە بکەن‌و، حوکم‌و یاسای چۆنیەتی هەڵس‌و کەوتی ئێوەی لەگەڵ ئەواندا روون کردۆتەوە.

## هۆکاری حوکمە شەرعییەکانی ئایەتەکانی پێشوو

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ﴿٢٨﴾ ﴾.

ئەمجار پەروەردگار عیلەتی حوكمەكانی پێشوو دیاری دەكا ئەو حوكمانەی پەیوەندیان بە ناومالْو خێزانو ژن هێنانو ئەو هۆیانەی كە لەبەرئەوان ئەو یاسایانە دانراون، روون دەكاتەوە بۆ ئەوەی دلْئارام بگرنو سوودی ئەو حوكمانە بزانرێ، بە دلێكی فراوانەوەو بە هەستێكی سۆزدارو بە حەماسەوە روویان تێ بكەن.

خاوەنی تەفسیری مەراغی دەلْێ: ئەم ئایەتانەی دوایی وەكوو وەلاّم دانەوەی چەند پرسیارێك كە لە دەروونی بیسەردا سەرهەلْدەدەن وایە، وەكوو ئەوە بلْێ: هۆی چییە پەروەردگار ئەو حوكمانەی پێشووی بۆ روون كردینەوە؟؟ سوودیان چییە؟ ئایا گەلە پێشینەكانیش وەكوو ئێمە ئەم ئەركەیان خراونە سەر؟ ئایا ئەوانیش وەكوو ئێمە بۆیان نەبووە هەموو ئافرەتێك مارە بكەن؟ ئایا ئەوەی كە خودا لەو ئایەتانەدا فەرمانی پێ كردووین یان نەی لێ كردووین ئەرك گران كردنە، یان بار سووك كردنە؟! جا بۆ وەلاّمی ئەم جۆرە پرسیارانە فەرمووی: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ پەروەردگار بە ناردنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە دەیەوێ ئەركی سەرشانتان بۆ دیاری بكاو حوكمی شەرعیتان بۆ روون دەكاتەوە، حەلاّلْو حەرامتان بۆ لێك جیا دەكاتەوە، باشو خراپتان بۆ دەست نیشان دەكا، شارەزاتان دەكا بۆ ئەو شتانەی بەرژەوەندی ئێوەی تێدایە، رێنموونیتان دەكا بۆ رێبازو پرۆگرامی پێغەمبەرانو راستالاّنی پێشوو، بۆ ئەوەی ئێوەش شوێن رێبازی ئەوان بكەون، شەریعەتو یاساكانی خودا هەرچەندە دەگۆڕێن بە گوێرەی شوێنو كات، بەلاّم هەموویان بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزادن!

﴿وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ﴾ هەروەها دەیەوێ كە بە هۆی كاركردن بەو حوكمانەی، بتانكاتە تۆبەكارو گەڕاوە بۆلای خوداو وازبێنن لەو جۆرە مارەكردنانە كە زیان بە كۆمەلْ دەگەیەنێو لادانە لە سروشتو ڕەوڕەوەی مرۆڤایەتی تێك دەدا، چونكە ئێوە لەوە پێش زڕدایكی خۆتان مارە كردووە، صیلەی رەحمتان دەپچڕاندو ئەو مانا بەرزانەی كە لە پێكەوەنانی خێزانو پەیوەندی نەژادیو خزمایەتیو تازە كردنەوەی پەیوەندی بە هۆی ژنو ژنخوازییەوە هەن پاشگوێتان خستبوونو گرنگیتان نەئەدا بە ئەو خۆشبەختیو كامەرانییەی كە لە نێوان ژنو مێردی

پێکەوە گونجاودا پەیدا دەبێ؛ ئێوە ئەو خۆشەویستیو سۆزو عەطفەی نێوان ژنو مێردتان بەرچاو نەدەگرت!!

لێکۆڵەرەوانی تەفسیر لایان وایە خیتابی ئایەتەکە گشتی نیە بۆ هەموو کەس، بەڵکوو روو دەکاتە کۆمەڵێك لەو کەسانەی کە ئەو جۆرە کارە ناشیرینانەیان کردونو وەکوو زڕدایك مارەکردنو کچ مارەکردنو باقی کردەوە ناپەسەندەکانی کە باو بوونو دەیان کردنو دوایی وازیان لێ هێنانو گەڕانەوەو خودا تۆبەی لێ وەگرتن! ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ پەروەردگار خاوەنی زانیاری گشتی رەهایە، دەزانێ چی بۆ کردوون بە یاساو چی سوودی بۆ کۆمەڵگای موسوڵمانان هەیەو، چی زیانبەخشە، پەروەردگار دانایە لە شەرعو یاسایدا، لە کردارو گوفتاریدا لە هەموو شتێکدا موراعاتی بەرژەوەندی ئادەمیزاد دەکا؛ ئەرکێك ناخاتە سەریان کە زیانی بۆیان هەبێ. هەر لە ژێر رۆشنای ئەو زانایی‌و داناییەدا تۆبە لە بەندەکانی وەردەگرێ‌و لە تاوانەکانیان خۆش دەبێ! ئەمجار پەروەردگار جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە تۆبەی بەندە پەشیمان بووەکانی وەردەگرێ‌و لە تاوان پاکیان دەکاتەوە، وێڕای ئەوەش بەراوردییەکی نێوان ویستی پەروەردگارو ویستی هەوەسبازەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ﴾ پەروەردگار بەو ئەرك خستنە سەرشانەتان دەیەوێ لێتان خۆش بێ، پاکتان دەکاتەوەو تۆبەتان لێ وەردەگرێ! ﴿وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلاً عَظِيمًا﴾ ئەوانەی هەوەسبازنو شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون، لە کوێ‌و چۆن ئامانجیان بە ئاکام بگا لەوێ دەکێڵن، هیچ بەلایانەوە گرنگ نیە صیلەی رەحم دەپچڕێ، جەمسەری خێزان تێك دەچێ، ئاژاوە بەرپا دەبێ، ئەوانە هەر مەبەستو هەوڵو تەقەلایان بۆ دابین کردنی شەهوەتو ئارەزووبازی خۆیانەو هۆگری تاوانو زینا بوونو چی خودا پێی ناخۆش بێ ئەوان ئەوە دەکەن، ئەوانەش جوولەکەو مەسیحی‌و ئاگرپەرستن. ئەوانەی بەلایانەوە حەڵاڵە پیاو خوشكو برازاو خوشکەزا مارە بکا!

ئەو تاقمە سەرلێشێواوە دەیانەوێ ئایین لەگەڵ هەواو هەوەسی ئەوان هەڵسوڕێ‌و ئاوێتەی بەتاڵ بێ‌و لە حەق لابدەی.

﴿يُرِيدُ اللّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ﴾ پەروەردگار بە ناردنو دانانی ئەو حوکمانە، بەو فەرمانو نەهیو ئامۆژگارییانە، دەیەوێ ئەرکی سەرشانتان سووك بکا! لەکاتی ئاتاجیو پێویستیدا مارەکردنی کەنیزەکی بۆ حەلاڵ کردوون، هەندێك دەڵێن: مانای ئایەتەکە ئەوەیە: کە پەروەردگار هەموو ئەرکێکی بۆ سووك کردوونو لە ئاییندا شتی قورسی لێ داوا نەکردون، شەریعەتی ئێوە شەریعەتێکی ئاسانکارییە.. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ – الحج/٧٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ – البقرة/١٨٥﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ – الأعراف/١٥٧﴾.

ئەوەتا پەروەردگار لەکاتێکا کە بڕێ ئافرەتی لێ حەرام کردوین، مارەکردنیانمان لێ یاساغە زۆربەی زۆری ئافرەتانمان بۆ حەلاڵە کە مارەیان بکەین، لە هەموو شتێکداو هەموو کاتێکیش حەلاڵ لە حەرام زۆرترە!!.

جا وەکوو یەکێك پرسیاربکاو بڵێ: ئەم سووك کردنو ئاسانکارییە بۆچی؟؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ﴿وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا﴾ ئادەمیزاد دروست کراوە بە جۆرێکی وا کە زەبوونو لاوازە لەبەرامبەر هەواو هەوەسدا خۆرانەگرە، بە تایبەتی لەبەرامبەر ئافرەتدا زوو دەست لەخۆ بەردەدا، عەقڵی لەلای خۆی نامێنێو دڵی لێ دەستێندرێو ناتوانێ بەرەنگاری هەواو هەوەسی خۆی بکا!! تەنانەت عوبادەی کوڕی صامیتو سەعدی کوڕی موسەییەب لەگەڵ ئەوەشا کە بەساڵا چووبوون دەترسان لە ئافرەت کاریان لێ بکا! بۆیە پەروەردگار ئەرکەکانی لەسەر شان سووك کردوون لە بڕێ ئەحکامدا سەنگو سووکی بۆ کردوون.

## ماڵ خواردنی یەکتری بە ناحەق حەرامە. مامەڵە بە رەزامەندی دەبێ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ

﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾﴾.

ئەمجار پەروەردگار یاسای ئاڵو وێری گشتی لەماڵو دارایىدا دیاری دەکا، لەوەپێش باسی چۆنیەتی مامەڵە کردنی لەگەڵ ماڵو دارایی هەتیوانداو مارەپێدانی ئافرەتاندا کرد، هۆیەکەش ئەوەیە ماڵو دارایی هاوتایەکی روحو گیانە، دەست درێژی کردن بۆ سەر ماڵو دارایی دوژمنایەتی دەخاتەوە؛ بەڵکوو جاری وا هەیە تاوانی گەورەی لەسەر روو دەدا، بۆیە پەروەردگار ئەوەی بە واجب داناوە کە بە شێوەیەکی رەزامەندیی ئاڵو وێری تێدا بکەنو ستەمو دەست درێژی تێدا نەکەنو کەس ماڵی کەس بە ناڕەوا نەخوا، فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە ئایینی ئیسلام هێناوە! ماڵی کەس بە ناڕەوا مەخۆن! هەروەها ماڵو سامانی خۆشتان لە کاروباری نەشیاودا خەرج مەکەن.. کە دەفەرموێ: ﴿أَمْوَالَكُمْ﴾ ماڵی خودی خۆیو ماڵی خەڵکی تریش دەگرێتەوە چونکە لە روانگەی ئیسلامەوە ماڵو دارایی موڵکی گەلەو ئەندامانی گەل تێیدا هاوبەشن، خواردنی ماڵی خۆی بەشێوەی بەتاڵ ئەوەیە: کە لە کاری ناڕەوادا خەرجی بکا. خواردنی ماڵی خەڵك بە بەتاڵ هەموو جۆرە دەست بەسەرا گرتنو مامەڵە ناڕەواکان دەگرێتەوە! وەکوو ریبا، قومار، داگیرکردنو هەڵخەڵەتاندن، بەتاڵ واتە شێوەی ناشەرعی .

ئیبنو عەبباسو حەسەنی بەصری دەڵێن: بەتاڵ ئەوەیە: کە ماڵی خەڵك بە شێوەی بە تاڵ بخۆی، ئیتر ئەوە هەموو ماڵێك دەگرێتەوە کە لە سەودای دانەمەزراو ناشەرعیدا لە باتی شت وەری بگرێ، وەکوو فرۆشتنی شتێك کە موڵکی نەبێ، ماڵێك کەڵکی سوود لێ وەرگرتنی نەمابێ وەکوو بەروبوومی گەنیو ڕزیو، یان بەهای شتێك کە نرخی نەبێو سوود وەرگرتن لێی حەرام بێ وەکوو مەیموونو

بەرازو مێشوو مردارەوە بـوو شـەراب. وەكـوو كرێـی وایـە شـێرەكەر؛ واتـە ئـافرەتی لاوێنەرەوە هەروەها دەستبڕینو خەڵكو هەڵخەڵەتاندیان.

جا كەماڵ خواردنی خەڵك بە شێوەی بـەتاڵو ناشـەرعی دروسـت نـەبێ، دیـارە بەشێوەی شەرعیو بەڕەزامەنـدیی یـەكتری دروسـتە بۆیـە پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾ واتـە: بـەلاَم ڕەوایـە مـاڵی یـەكتری بخۆن، كـە بەشێوەی بازرگانیو ڕەزامەنـدی یـەكتر ئـاڵو وێـری پێـوە دەكـەن، لـە چوارچێوەی یاسـاو شـەرعی خودایـدا كـڕینو فرۆشـتنی تێـدا دەكـەن، بازرگـانی هـەموو مامەڵەیـەك دەگرێتـەوە كـە گۆڕینـەوەی كـاڵای تێـدا بـێ بـە پـارە، بۆیـەش باسـی بازرگـانی كـرد چـونكە زۆربـەی مـاڵو دارایـی لـەو ڕێگـەوە وەدەسـت دێ، هـەروەها چونكە پاكترین بەرێزترین كاسبییە.

پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرموویـەتی: پـاكترین كاسـبی كاسـبی بازرگانە، ئەگەر قسەیان كرد درۆ نەكەن، ئەگەر وادەیـان دانـا بیبەنـە سـەر، ئەگـەر ئەمانـەتیان لادانـرا خیانـەت نەكـەن، ئەگـەر كاڵایـان كـڕی عـەیب داری نەكـەن، بۆ ئەوەی خاوەنەكەی پێش چاوی بكەوێ، ئەگـەر كاڵایـان فرۆشـت پێیـدا هەڵنـەنێن. ئەگەر پارەیان لەسەر بوو بە ئەنقەست دوای نەخـەن، ئەگـەر قـەرزیان لای خـەڵك بـوو قەرزدارەكـە تەنگـەتاو نەكـەن. جـا وەنـەبێ هـەموو ڕەزامەندییـەك شـەرع ئیعترافـی پـێ بكـاو ببێتـە هـۆی حـەلاڵی، بـەڵكوو پێویـستە ڕەزامەندییەكـە لـە سەودایەكدا بێ سەوداكە شەرعی بێو لە چوارچێوەی شەرعدا بێ، كەوابێ سوودێك كـە ڕیبـا وەردەگـرێو زیـادەی قـەرزو پـارەی قومـارو پێـشبڕكێ هەرچـەندە بەڕەزامەنـدی هـەردوولا ئـەنجام دەدرێ بـەلاَم حەرامـەو شـەرع بـە ڕەوای نازانـێ، هەروەها ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ﴾ خۆكوژی مەكـەن، مانـای ڕسـتەكە بـە ڕواڵـەت ئـەوە دەگەیەنێ: كە مەنعی موسوڵمانان دەكا لـەوە لـە حاڵـەتی ڕق هەڵـسانو نارەحەتیـدا خۆ ئینتیحار بكا، وەكوو شەیخان؛ موسلیمو بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر فەرموویەتی: كەسێك بـە ئاسـنێك خـۆی بكـوژێ ڕۆژی قیامـەت ئـەو ئاسنەی بەدەستەوە دەبێ لە ناو ئاگری دۆزەخـدا زگـی خـۆی پـێ هەڵـدەدڕێو هـەتا هەتایە لە ناو دۆزەخدا دەمێنێتەوە! بەلاَم زۆربەی ڕافەكەرانی قورئان پێیان وایـە

مانای ئایەتەکە ئەوەیە: دەڵێ! برێکتان برێکتان مەکوژن بۆیەش وتی: ﴿أَنفُسَكُمْ﴾ بۆ ئەوەی زیاتر یاساغ کردنەکە کاریگەر بێ‌و واتە: موسوڵمان دەبێ گیانی موسوڵمانی تر بە گیانی خۆی حسێب بکا، کەسێك کەسێك بکوژێ وەکوو خۆی کوشتبێ وایە، وەکوو چۆن دەربارەی ماڵ وتی: ﴿أَمْوَالَكُمْ﴾ مەبەستیش ماڵی خەڵکی تر بوو وێڕای ماڵی خۆی، هەروەکوو پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: موسوڵمانان وەکوو یەك گیان وان ئەگەر سەری ئێشا هەموو لەشی دێشێ، ئەگەر چاوی ئێشا هەموو گیانی دێشێ! ئایەتەکە ئەو مانایەشی لێ وەردەگیرێ کە نەهی بی لە خۆ کوژی‌و لە کوشتنی خەڵکی ترو دورکەوتنەوە بی لە هەرکارێك کە سەربکێشێ بۆ مردن وەکوو ژەهر خواردن‌و خۆخستنە ناو هیلاکەتەوە

هۆی وێکڕا هێنانی قەدەغە کردنی ماڵ خواردن بە بەتاڵ‌و خۆکوژی‌و خەڵك کوشتن لەم رووەوەیە کە ماڵ‌و سامان تای تەرازووی گیانن، جەستەو گیان بەبێ ماڵ‌و دارایی پەروەردە ناکرێن کەوابوو گونجاو بوو کە ئامۆژگاری‌و وەسیەت کردن بە پاراستنی جەستەو گیان وێکڕا ئاراستە بکرێن، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ پاساو دانەوەیە بۆ نەهییەکانی پێشوو، واتە: پەروەردگار کە نەهی لێ کردن لە خواردنی ماڵی حەرام‌و خۆکوژی لەبەر ئەوەیە چونکە خودا بەرەحم‌و بە بەزەییە بۆ ئێوەو نایەوێ تووشی تەنگ‌و چەڵەمە ببن!!

بێگومان خودا بە سۆزو بەزییە بۆ ئێوە هەر شتێکی لێ حەرام کردوون حیکمەت‌و دانایی تێدایەو ئەگەر بۆی حەلاڵ بکردنایە زەرەرو زیانێکی زۆری لێ دەکەوتەوە! تووشی جۆرەها تەنگ‌و چەڵەمەو ئاستەنگ دەبووون‌و زۆر نەخۆشی سامناکتان تووش دەبوون.

بەداخەوە داوێن پیسی رۆژ لە دوای رۆژ لە ناو کۆمەڵگای موسوڵمانانندا پەرەدەستێنێ، هەتاکوو خەڵکی لە ئایین دوور بکەونەوە ئەو دیاردە دزێ‌و سامناکە زیاتر بڵاودەبێتەوە، لە رۆژگاری ئەمڕۆدا برسێتی‌و ئافرەت زۆری وای کردووە کە پیاوی داوێن پیس زۆر بە ئاسانی نێچیری خۆی دەست بکەوێ، لە لایەکەوە پیاوی داوێن پیس‌و چاوچنۆك‌و بێ ویژدان دەست درێژی دەکاتە سەر ئافرەتی خاوەن

مێردو بە هۆی پارەو پوڵی زۆرەوە هەڵی دەخەڵەتێنێ‌و لە کەژاوەی مێردی خۆی دەری دێنێ، لە لایەکی ترەوە بەرەڵلایی ئافرەت‌و بڵاوبوونەوەی بێ رەوشتی‌و بانگەشەی مافی ئافرەت‌و برسیایەتی زۆربەی خێزانە هەژارەکان رێگا بۆ دەست درێژی کردنە سەر نامووس خۆش دەکا، بەرەڵلایی بڵاو دەکاتەوە.

خودا لە بێدەنی‌و بەد رەوشتی‌و داوێن پیسی دوورمان خاتەوە!

ئەمجار سزای سەرپێچیکەران دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا﴾ هەرکەسێك بە ناحەق ئادەمیزادێك بکوژێ‌و هیچ حەقی لەسەر نەبێ‌و بە ستەمکاری‌و دەست درێژی ئەو کارە ئەنجام بدا، ئەوا خودا دەیخاتە ناو ئاگرێکی سوتێنەرەوەو لەسەر تاوانەکانی سزای دەدا.

﴿وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا﴾ ئەو خستنە ناو ئاگرەو سزادانە بۆ خودا کارێکی ئاسانەو ئەرکی تێدا نیە، کەس نیە بتوانێ ببێتە بەربەست‌و لەمپەر لەبەردەم ویست‌و ئیرادەیدا! قەیدار کردنی هەڕەشەکە بە وشەی ﴿عُدْوَانًا وَظُلْمًا﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەگەر ئەو کارە بە سەهوو هەڵە روی دا ئەو حوکمەی نادرێتێ‌و ئەو سزایەی نیە.

## ئایەتەکان ئەم حوکمانەیان لێ وەردەگیرێن:

١- حەرامە بە ناڕەوا ماڵی خەڵکی تر بخۆی، هەر وەکوو چۆن حەرامە ماڵ‌و دارایی خۆت لە کاری ناڕەوادا خەرج بکەی. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە تەکالوفی کۆمەڵایەتی پێویستە لە ناو تاك‌و کۆمەڵدا هەبێ، پێویستە دەوڵەت لە کاتی پێویستیدا پێویستیاتی هەژارەکان دابین بکا، هەروەکوو چۆن پێویستە تاك یارمەتی دەوڵەت بداو ماڵ‌و دارایی خۆی لە رێگای خوداداو لە پێناو بەرژەوەندی گشتی ببەخشێ.

٢- هەموو بازرگانیەك حەڵاڵە بەمەرجێك فرۆشیارو کڕیار بەسەوداکە رازی بن‌و مەبەست سوودو قازانج بێ. لەمپەڕیکی شەرعی تێدا نەبێ. ئەو شتانە نەبێ کە لە کتێبە شەرعییەکاندا سەوداو مامەڵە تێیاندا حەرامە.

٣- هەڵنانی خەڵك بۆ بازرگانی کردن.

٤- خۆکوژیو خەڵك کوشتن بە ناڕەوا حەرامە.

٥- سزای ماڵ خواردنی خەڵك بە ناڕەواو ئادەمیزاد کوشتن بە ناڕەوا سزاکەیان دۆزەخە.

## پاداشی خۆپاراستن لەتاوانە گەورەکان

﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار نەهی کرد لە خواردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا هەروەها لە خۆکوژیو ئادەمیزاد کوشتن بە ناحەقو هەڕەشەی توند بە سزادانی دۆزەخی لێ کردن. ئەمجار لەم ئایەتەدا نەهییەکی گشتی کرد کە کەس تاوانی گەورە نەکاو هەرکەسێکیش پابەندی فەرمانەکانی خودا بێ پاداشتی بەهەشتەو دەفەرموێ: ﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيمًا﴾ ئەگەر خۆبپارێزنو دوور بکەونەوە لەو تاوانە گەورانەی نەهییان لێ کراوە لە تاوانە بچووکەکانتان خۆش دەبینو دەتانخەینە بەهەشتەوە. دەی بابزانین مەبەست بە تاوانی گەورە چییەو مەبەست بە تاوانی بچووك چییە؟!

جەماوەری زانایان کۆکن لەسەئەوە کە گوناه دوو جۆرە: گوناهی گەورە گوناهی بچووك. گوناهی گەورە: ئەو تاوانەیە کە هەڕەشەی گەورەی دەربارەی هاتبێ، یان حەددو تۆڵەی لەسەر بی لە دونیادا. هەندێ لە زانایان وتویان تاوانە گەورەکان حەوتن: بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە فەرموویەتی: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ » قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا هي قَالَ «الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ». واتە: خۆتان لەو حەوت تاوانە بە هیلاك بەرە بپارێزن. هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو حەت تاوانە کامانەن؟؟

فەرمووی: هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خودا، کوشتنی ئادەمیزاد بە ناڕەوا، سیحرو جادو ریبا خواردن، خواردنی ماڵی هەتیو، هەڵاتن لەبەرەکانی شەڕ لەگەڵ کافراندا، بوختان کردن بۆ ئافرەتی داوێن پاکی موسوڵمان، فەرموودەی تریش هەن، ئەزیەتدانی دایكو باوك، شایەتی بە درۆی بە تاوانی گەورە حلێب کردووە. چونکە پێغەمبەر لە زۆر موناسەباتدا باسی ئەم تاوانانەشی دەکرد. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە تاوانی گەورە هەر ئەوانە بن. بەڵکوو هی تریش هەن. بڕێك پێیان وایە تاوانی گەورە نۆن، هەنێکیان دەڵێن دەن، هەندێك دەڵێن زۆرترن.

عەبدول ڕەزاق لە ئیبنو عەبباس دەگێڕێتەوە کە لێیان پرسی ئایا تاوانی گەورە حەوت تاوانن فەرمووی: نزیکەی حەفتاش دەبن.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ حەوت سەدیش دەبن! گوناهی بچووك (بچکۆڵە): ئەو تاوانەن کە هەڕەشەی توندی لەسەر نەکرابێ تۆڵەو حەددی لەسەر نەبێ، وەکوو تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم، هەموو تاوانێکی بچووك بە دووبارە بوونەوەو بەردەوام بوون لەسەری دەبێتە تاوانی گەورە، تەرازووبازیو گەزومەتر ناتەواوی، قسە هێنانو بردن تانەدان لە ڕێزو نرخی ئادەمیزادانو، بەردەوام بوونو سوور بوون لەسەریان دەبنە تاوانی گەورە.

## خۆپاراستن لە تاوانی گەورە گوناهی بچووك ڕەش دەکاتەوە بەڵام بە دوو مەرج:

**یەکەم**: ئەگەر خۆپاراستنەکە لەگەڵ تواناو ویستدا بوو، وەکوو ئەوەی کەسێك ئافرەتێکی بۆ هەڵکەوێ داوای لێ بکاو ئەم بە گوێی نەکاو لە ترسی خودا خۆی لێ بپارێزێ! نەك لەبەر هۆی تر!

**دووەم**: ئەرکە پێویستییەکانی ئایین بەجێ بێنێ! چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ» جا کەسێك خۆ لە نەکردنی نوێژو کردنی تاوانی گەورە بپارێزێ، تاوانە بچووکەکانیشی ڕەش دەکرێتەوە، ئەو حەدیثە بەڵگەیە کە نەکردنی نوێژ تاوانی گەورەیە!

برێ جار وێ دەچێ تۆبەو پەشیمانی ببێتە کەفارەتی هەندێ تاوان کە لە ئاکامی نەزانیو رق هەڵسان ئەنجام دەدرێن!

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە تاوان دوو جۆرن: تاوانی گەورە، تاوانی بچووک. جەماوەری فوقەهاو راڤەکەرانی قورئان لەسەر ئەمە کۆکن.

ئایەتەکە ئەوەش دەگەیەنێ کە خودا لە تاوانی بچووک خۆش دەبێ بەڵام بەمەرجێك تاوانکارەکە ئەرکە پێویستییەکان ئەنجام بدا!

زانایانی عیلمی ئوصوڵ دەڵێن: نابێ دڵنیابین کە کەسێك خۆ لەتاوانی گەورە بپارێزێ خودا لەتاوانی بچووکی خۆش دەبێت!

ئەوە بە گوێرەی ویستی خودایەو ئارەزووی خۆیەتی خۆش دەبێ یا، نا، ئێمە دەبێ ئومێدی بە هێزمان هەبێو بەتەمای لێخۆش بوون بین.

هەندێ نموونەی تاوانی گەورە ئەمانەن: هاوبەش پەیدا کردن بۆ خودا، بێ بڕوایی بە قورئانو پێغەمبەر، سیحرو جادوبازی، منداڵ کوشتن، کەسێ بڵێ خودا منداڵو خێزانی هەیە، کوشتنی ئادەمیزاد بە ناحەق، داوێن پیسی، هەتیو بازی، قومار، عەرەق خواردنەوە، دزی، ماڵی خەڵك داگیر کردن، بوختان کردن، ریبا خواردن، بەرۆژو نەبوون لەرەمەزاندا بەبێ بەهانە، سوێندی بە درۆ، پچڕانی سیلەی رەحم، ئەزیەتدانی باوكو دایك، هەڵهاتن لەکاتی هێرش بردن بۆسەر دوژمنی کافر، خواردنی ماڵی هەتیو، خیانەت کردن لە کێشانو پێوانداەنوێژ پێش خستن لە کاتی خۆیو دواخستنی لە کاتی خۆی بەبی عوزر، لێدانی موسوڵمان بەبێ حەق، درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە بەئەنقەست، جنێودان بە هاوەڵانی پێغەمبەر، شایەتی بە درۆ، جنێودان بە دایكو باوك، شاردنەوەی شایەتی بەبێ بەهانە، بەرتیل وەرگرتن، زەکات نەدان، وازهێنان لەفەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپە، لە بیرچوونەوەی قورئان پاش فێربوونی، سووتاندنی ئاژەڵ بە ئاگر، هەڵگەڕانەوەی ژن لە مێردو خۆ بەدەستەوە نەدانی بەبێ هۆ، نائومێد بوون لە رەحمەتی خودا، ئەمین بوون لە مەکری خودا، ظیهار؛ ژن بە دایك حیساب کردن، خواردنی گۆشتی بەرازو گۆشتی مردارەوە بوو بەبی عوزر.

ئیبنو مەسعوود دەفەرموێ: لە سوورەتی (النساء)دا پێنج ئایەتی تێدان لە هەموو دونیام بەلاوە خۆشەویستترن.

﴿إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ.............الآية﴾

﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء............الآية﴾

﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ..................الآية﴾

﴿وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا...........................الآية﴾

﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ....................الآية﴾

## نەهی کردن لەحەسوودی!! بۆ هەموو شتێك داوا لەخودا بکەین

﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَۚ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾.

تیرمیذیو حاکم لە ئومو سەلەمەوە ریوایەت دەکەن: کە گوایە ئومو سەلەمە گوتی: پیاوان دەچن بۆ غەزا ئافرەتان ناچنو لە میراتگرتندا نیوەی پیاو وەردەگرن! ئیتر خودا ئایەتی ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ﴾ی نارده خوارێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتی ئەی پێغەمبەری خودا لە میراتگرتندا نێر دوو ئەوەندەی مێینەی هەیە، دوو ئافرەت شایەتیان بە شایەتی یەك پیاو حلێبە. ئایا لە کردەوەشدا وایە.

واتە: ئەگەر ئافرەتێك چاکەیەك بکا نیوەی بۆ دەنووسرێ؟؟ ئەوەبوو خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارێو فەرمووی: ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾

ئاواتەخوازی ئەوە مەبن کە ئەو ماڵو سامانەی خودا داویەتی بە هەندێ کەس بدرایە بە ئێوە، چونکە ئەوە حەسوودیو بەخیلییە، ئەو ماڵو ڕێزە کە دراوە بە برێ کەس دابەشکردنێکی خودایییە بە داناییو زانایی خۆی داینەوە بۆهەر کەسێك بەشی شیاوی خۆی بۆ داناوە، هەرکەسە بە گوێرەی شانو شکۆی خۆی ماڵو سامانو ڕێزو شکۆمەندی داوەتێ ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ – الشوری/٢٧﴾.

کەوابوو پێویستە هەرکەسە لە عاست خۆیەوە بەبەشی خۆی شکور بێو ڕازی بێ بەو ئەندازەیەی هەیەتی، بزانێ ئەو ئەندازەیەی پێی دراوە لە بەرژەوەندی ئەو دایەو ئەگەر زیاتری بدرایە، یان کەمتری بدرایە، دەبووە هۆی پشێوی دینو دونیای کەوابوو، با حەسوودی بە ماڵو سامانی برای خۆی نەباو چاوی لە ماڵی کەسەوە نەبێ!

ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە کەس بۆی نیە ئاواتەخوازی ماڵی خەڵك بێو چاو ببڕێتە ماڵو شکۆمەندی خەڵکی تر! چونکە ئەو بەشکردنە لە خوداوەیە ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ – الزخرف/٣٢﴾.

ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: نابێ کەس لە ئێوە بڵێ: خۆزگە ئەوەی دراوە بە فلانە کەس لە ماڵو حاڵو ژنی جوانو ڕێكو پێك بدرایە بە من، چونکە ئەوە حەسوودییە، بەڵکوو ئەگەر ویستی بڵێ با ئاوا بڵێ خودایە! وەکوو ئەو بەشی منیش بدە ئەوە پێی دەڵێن (غيبطة) نابێتە حەسوودی، کەوابی ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە کە بەبەشی خۆی ڕازی بێ! برێك پێیان وایە لە ڕستەکەدا وشەیەکی مەزندە کراو هەیە واتە ﴿وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ – مثل – مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ چونکە مەبەستەکە داواکردنی نیعمەتی تایبەتی نیە لە خەڵك بەڵکوو ئاوات خواستنو داواکردنی نیعمەتێکی تایبەتییە کە دەیەوێ بۆ ئەو بێ. کەوابوو داواکردنی ئەوە کە ئەوەی خەڵك هەیەتی تۆش بتبێ نەی لێکراوەو دروست نیە بۆ ئادەمیزاد کە بڵێ (اللهم أعطني دارا مثل دار فلآن ولا ولدا مثل ولده) بەڵکوو پێویستە نزاکەی ئاوا ئاراستە بکا بڵێ: (اللهم أعطني ما يكون صلاحا لي في ديني

ودنيـاي ومعـادي ومعاشـي) خودايـە شـتێكم بـەری كـەبگونجێ بـۆ ديـن‌و دونيـام بـۆ قيامەت‌و بۆ ژيانی ئێستام.

بـە كـورتی پـەروەردگار نـەيی لـەوە كـردووە كـە ئـادەميزاد ئاواتـەخوازو تەمەنناكار بێ بۆ ئەوەی كە خودا داويەتی بە كەسانی تـر بـدرێ بـە ئـەو. بـەڵكوو واجبـە لەسـەری كـە بـەگوێرەی تاقـەت‌و توانـا كۆشـش بكـاو هـەوڵ بـدا ئـەو كاتـە «لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبْنَ» پياوان بەشی خۆيان هەيـە لەوە كە بەرەنجی شان‌و عەرەقی ناوچەوان پەيدای دەكەن، ئافرەتانيش بە گوێرەی هەوڵ‌و تێكۆشانيان بەشی دياری خۆيان هەيە، هەردوولايان لە بەروبوومی خەبات‌و تێكۆشانی خۆيان دەخۆن.

پەروەردگار ئـەوەی كـە ديـاری كـردووە بـۆ ئـافرەت‌و پيـاو لـە بـەرزی‌و نزمـی‌و هەژاری‌و سامانداری كردوويەتی بە بەروبوومی خۆيان، ئەو كردارانەی تايبەتـە بـە پياوەوە پاداشی خۆی هەيە، ئافرەت تێيدا هاوبەش نيە، ئەو كردارانەی تايبەتە بـە ئافرەتەوە پاداشی خۆيان هەيە پياو بەشداريان نين.

واتە: پاداشی كـردەوەو كرێـی كـار بـە گوێرەی گونجانـە لەگـەڵ سروشـتی هـەر يەكێكيان‌و هەمووشی حيكمـەت‌و دانـايی تێدايـە. ئيبنـو عـەبباس دەڵـێ: مەبەسـت بەوە ميراتە، ئەوكاتە مانای (إكتساب)؛ (إصابة) دەبێ.

ئەمجار پەروەردگار دەيەوێ سـەرنجی بەنـدەكانی بـۆ ئـەوە رابكێشێ: كـە كـان‌و سەرچاوەی هەموو فەضل‌و چاكەيەك خودايەو فـەرمووی: ﴿وَاسْأَلُواْ اللَّهَ مِن فَضْلِهِ﴾ داوا لە پەروەردگار بكەن ئيحسان‌و نيعمەتی خۆيتان بەسەردا برێژێ، چـيتان دەوێ داوای لێ بكەن، ئەگەر مـەيلی لێ بـێ دەتانـداتێ، گەنجينـەی خـودا پـڕەو هـيچ كاتـێ خـاڵی نابـێ، ئاواتـەخوازی ئـەوە مـەبن بـەش‌و بـاری خـەڵكی تـر بـدرێ بـە ئێـوەو حەسوودی بەكەس مەبەن، ئاواتەخوازی ئەوە مەبن كە ناز‌و نيعمەتێ كە دراوە بـە كەسانی تر بدرێ بە ئێوە، چونكە تەمـەنناو ئاواتـەخوازی هـيچ سوودو قازانجێك نابەخشێ.

تيرميـذی‌و ئيبنـو مـەردەويهی لـە عەبـدوڵڵای كـوڕی مەسـعوودەوە دەڵـێ: پێغەمبەر دەفـەرموێ: «سَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ أَنْ يُسْأَلَ وَأَفْضَلُ

الْعِبَادَةِ انْتِظَارُ الْفَرَجِ» داوا لە خودا بکەن فەضل‌و نیعمەتی خۆیتان بەسەردا بڕێژێ، چونکە خودا پێی خۆشە داوای لێ بکرێ، بێگومان گەورەترین خوداپەرستی‌و عیبادەت چاوەڕوانی لابردنی بەڵاو ناڕەحەتی‌و هەڵهاتنی ئاسۆی رزگاربوونە.. ئیبنو ماجە لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللَّهَ يَغْضَبْ عَلَيْهِ» کەسێك داوا لە خودا نەکا خودا رقی لێ دەبێتەوە.

﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ بێگومان پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا، دەزانێ کێ شیاوی ئەوەیە ماڵ‌و سامان‌و پلەو پایەی دونیای بدرێتێ، کێ شیاوی ئەوەیە هەژار بێ، کێ شیاوی ئەوەیە کە پلەو پایەی قیامەتی بدرێتێ رام بکرێ بۆ کارکردن بۆ بەدەست هێنانی پلەو پایەی قیامەت، کێ شیاوی ئەوەیە ریسوا بکرێ‌و هەوڵ‌و تەقەلای کاری خێر نەدا، لەبەر ئەوە بڕێ ئادەمیزاد بەسەر بڕێکیاندا تەفضیل دراون، بە گوێرەی ئامادەباشی‌و جوداوازی پلەو پایەیان، جوداوازییەکە لایەنی جەستەیی‌و لایەنی ئەدەبی‌و زانیاری‌و شکۆمەندی دەگرێتەوە.

## هەموو میراتگرێك دەبێ بەشە میراتی خۆی بدرێتێ

﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ ۚ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا (٣٣)﴾.

﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ﴾ دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، ئەبو داود لە سوننەکەیدا لە داودی کوڕی جوهەینییەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبوبکرو کوڕەکەی هاتۆتە خوارێ، کە کوڕەکەی یاخی بووبوو بە هیچ شێوەیەك موسوڵمان نەدەبوو ئەبوبکریش سوێندی لێ خوارد کە

میراتی نەداتێو لە میرات بێ بەری بێ، جا کە موسوڵمان بوو فەرمانی پێ کرا کە بەشی خۆی بداتێ. سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوانە هاتۆتە خوارێ کە کوڕی خەڵکی تریان دەکردنە کوڕی خۆیانو میراتیان دەدانێ، پەروەردگار فەرمانی پێ کردن کە بە وەصیەت شتێکیان بۆ دابنرێو میراتەکەی بدرێ بە خزمی میراتگر! ئەوەی لێ قەدەغەیە کردن کە میرات بدرێ بەو کەسانەی کە بە ئیدیعاو هەوانتە کراون بە کوڕ، بەڵام لە وەصیەتدا بەشی بۆ داناون.

پەیوەندی ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتی پێشوو ئەوەیە: لە ئایەتی پێشوودا خودا نەهی لە خواردنی ماڵ کرد بە بەتاڵو ناحەق. هەروەها نەهی لێ کردن لە حەسوودیو ئاواتە خوازیو چاو لە ماڵی خەڵك بوون!!

ئایەتی پێشوو قاعیدەیەکی گشتی دانا بۆ سامان کۆکردنەوە: کە ئەویش کاسبی کردنە! ئەم ئایەتەش یاسایەکی تری خستەڕو بۆ ساماندارى کە ئەویش میراتگرتنە فەرمووی: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ﴾ بۆ هەر یەکی لە ژنو پیاو میراتگرمان بۆ دیاری کردوون، خزمو کەسوکاری ئەوەی کە جێی دێڵێ بە میرات دەیبەن.

﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ ئەوانەی سوێند خۆریان بوونو پێش هاتنی ئیسلام لەگەڵیاندا پەیمانتان بەستووە کە میرات لەیەکتری بگرن، ئەوە بەشی خۆیان بدەنێ چۆنتان پەیمان لەگەڵ بەستوون ئەنجامی بدەن.

﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ دڵنیابن خودا ئاگاداری ئەو پەیمانو بەڵێنانەی نێوەیەو چاودێرتانە.

شەرع زانان دەڵێن: ئەم یاسایە لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامدا بووەو پاشان بە ئایەتی ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ﴾ ئەو حوکمە هەڵوەشایەوە.

لەلایەکی ترەوە دوای کۆچ کردنی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بۆ مەدینە میرات لێك گرتن بەهۆی بەستنی برایەتی لە نێوان کۆچکەرانو یاریدەدەران باو بوو، ئەوە بوو کۆچکار (مهاجر) میراتی لە یاریدەدەر دەگرت نەك خزمو کەسو کاری. بەڵام ئەم یاسایە بە ئایەتی ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ واتە میرات

گرتن بە سوێندو پەیمان بەستن‌و برایەتی گرتن هەڵوەشایەوەو میرات تەرخان کرا بۆ میراتگران لە خزم‌و کەس‌و کار..

**ڕاڤەکەرانی قورئان لە شی کردنەوەی مانای ئەم ئایەتەدا چوار ڕایان هەیە:**

١- هەموو ئادەمیزادێکی میرات لێ گیراو میراتگری هەیە بۆ وەرگرتنی ئەو ماڵ‌و سامانەی کە بەجێی دێڵن.

٢- بۆ هەموو ئادەمیزادێکی کە باوك‌و دایك‌و خزم بەجێ دێڵن کردوومانن بە میرات لێ گیراو.

٣- بۆ هەموو گەل‌و هۆزێك کە کردوومانن بە میراتگر بەشیان هەیە لەو ماڵ‌و سامانەی کە باوك‌و دایك‌و خزم‌و کەس‌و کاریان بەجێی دێڵن.

٤- بۆ هەموو ماڵێك کە باوك‌و دایك‌و خزم بەجێی دێڵن میراتگرمان بۆ دیاری کردوون.

دیارە بە گوێرەی ماناکان دەبێ هەموو جارێك ئیعرابی ڕستەکە بە شێوەیەك بکرێ کە لەگەڵ ماناکەدا بگونجێ. کەسێك بیەوێ لەم بارەوە قوڵبێتەوە با بگەڕێتەوە بۆ تەفسیرە گەورەکان.

دەربارەی مەبەست بە ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ ڕاڤەکەرانی قورئان چەند ڕایەکیان هەیە:

١- دەڵێن مەبەست ئەوانەن کە بە سوێند خواردن بوونە هاوەڵ‌و پەیمانیان لەگەڵ یەکتریدا بەستووە، ئەوانە بەشیان لە میراتدا هەبوو، دوایی بە ئایەتی ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ – الأنفال/٧٥﴾ هەڵوەشایەوە.

٢- دەڵێن مەبەست بەوانە ئەو کوڕانەن کە بە ئیدیعا دەکران بە کوڕ، ئەمانە میراتیان دەگرت دوایی بە ئایەتەکەی سوورەتی ئەنفال هەڵوەشایەوە.

٣- مەبەست پێیان برای بە برا کردن (مواخاة)ە ئەوانەی کە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) لەسەرەتای چوونی بۆ مەدینە برایی دەخستە نێوان کۆچکارو یاریدەدەرانەوەو میراتیان لە یەکتر دەگرت دوایی بە ئایەتی ئەنفال ئەم حوکمە هەڵوەشایەوە.

٤- مەبەست پێیان بەلای ئەبو عەلی جەبائییەوە هاوپەیمانە، رستەی ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ﴾ عەطفە بۆسەر رستەی ﴿الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ﴾ واتە: بۆ هەر شتێك لەو شتانەی باوكو دایكو خزم بەجێی دێڵن هەروەها ئەو شتەی هاوپەیمانەكانتان جێی دێڵن میراتگر (موالي) خۆی هەیەو هەركەسە بە گوێرەی خۆی بەشی خۆی بدەنێ. ماڵەكە هەموو مەدەنە هاوپەیمانەكە.

٥- مەبەست پێیان بەلای ئەبو موسلیمی ئەصفەهانییەوە مێردەكانە (الأزواج) چونكە مارە كردن پێی دەگوترێ (عقد).

٦- مەبەست پێیان هاوپەیمانە بەشی خۆیان لە یارمەتیدەرانو ئامۆژگاریو هاوسێیەتی دەدرێتێ، بە وەصیەتیش دەتوانرێ برێ ماڵیان بۆ دیاری بكرێ، واتە: بە وەصیەت بەشیان دەدرێو میرات ناگرن. ئەم رایە لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە.

خاوەنی تەفسیری مونیر دەڵێ: رایی یەكەم پەسەندە!! بە كورتی ئایەتەكە ئەوە دەچەسپێنێ كە هەموو ئادەمیزادێك كە دەمرێ میراتگرو هاوپەیمانی هەیە، با هەركەسە بە گوێرەی خۆی بەشی خۆی بەرێو ئاواتەخوازی ماڵی خەڵكی تر نەبێ.

طەبەریو بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێ: رستەی ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ دامەزراو موحكەمە، ئەو حوكمەی هەڵنەوەشاوەتەوە، پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان كردووە كە هاوپەیمانان بەشی خۆیان بدرێتێ لە كۆمەكی پێ كردنو ئامۆژگاری كردنو لە وەصیەتدا بەشی خۆیان بۆ دیاری بكرێ بەلاّم لە میراتدانا. واتە: میرات دەدرێ بە میراتگر؛ ئەوانەی خودا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی ١١ – ١٢ – ١٧٦ – دا دیاری كردوون، جگە لەوان كەسی تر بە میراتگر حسێب ناكرێ، بەلاّم ئەگەر بە وەصیەت شتێكیان بۆ دیاری بكرێ ئەوە قەی ناكا. جا ئەوانە هاوپەیمانو سوێندخۆری سەردەمی پێش ئیسلام بن یان برای بە برا كراو بێ بە گوێرەی یاسای (المؤخاة) یان كوڕی بە كوڕ كراو بێ بە یاسای (تبني).

حەنەفییەكان ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ یان كردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوە كە سوێندخۆرو هاوپەیمان میرات وەردەگرنو ئایەتەكە موحكەمەو

حوكمەكەی بە ئایەتی ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ﴾ هەڵنەوەشاوەتەوە، بەڵكوو هەر ئەوەندە دەگەیەنێ ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ﴾ لە پێش ترن بۆ میرات گرتن، ئەگەر ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ﴾ نەبوون میراتەكە بۆ سوێندخۆرەكەیە. هەروەها بەڵگەیان بە حەدیثی تەمیمی (الداری) هێناوەتەوە كە پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كرد وتی: قوربان! رێو رەسمی ئیسلامی چیە بۆ كەسێك كە لەسەر دەستی موسوڵمانێك موسوڵمان ببێ؟؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاهُ وَمَمَاتِهِ».

زانایانی حەدیث وتویانە: مانای وایە ئەو كابرا موسوڵمانە بۆ ئەو تازە موسوڵمان بووە لەهەموو كەس لە پێشترە كە میراتی لێ بگرێ.

جەماوەری زانایان دەفەرموون میراتی هاوپەیمان (مولی المولاة) بۆ موسوڵمانانە واتە: ئەگەر كەسێك لەسەر دەستی موسوڵمانێك موسوڵمان بوو پەیمانی لەگەڵ بەستو سوێنیان بۆ یەكتری خواردو دوایی ئەو كابرایە مردو كەس میراتگری نەبوو جگە لەو كەسەی كە موسوڵمانی كردووە، ئەوا میراتەكەی بۆ موسوڵمانانە؛ چونكە رێنمایی ئایەتەكە بۆ ئەوە كە سوێندخۆر و هاوپەیمان میرات لە یەكتری بگرن پەیوەستە بە سێ بەشەوە:

یەكەم: دەبێ مەبەست بە ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ سوێند خۆر بێ.

دووەم: دەبێ مەبەست بە (نصیب) بەشە میرات بێ.

سێیەم: دەبێ ئایەتەكە حوكمەكەی هەڵنەوەشابێتەوە.

دەی راڤەكەرانی قورئان لەمەدا رایان جوداوازە.

حەدیثەكەی تەمیمی (الداری) نەص نیە لە میراتدا، بەڵكوو دەگونجێ مانای وابێ ئەو موسوڵمانە لە هەمووو كەس بۆی لە پێشترە بۆ چاودێری كردنو پاراستنی لە ژیانو دوا مردنی زیاد لەوەش دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی كە موسلیمو نەسائی لە جوبەیری كوڕی (موطعیم)ەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی كردووە كە فەرموویەتی: «لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ وَأَيُّمَا حِلْفٍ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ لَمْ يَزِدْهُ الإِسْلاَمُ إِلاَّ شِدَّةً» جا كە حەدیثەكان دژیەتیان لە بەینا ببێو ئایەتەكەش زیاد لە مانایەك هەڵبگرێ، باشتر وایە رووبكەینە ئەو رایەی كە

پێشینە راستاڵەکان (سلف الصالح)ی وەکوو ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو قەتادە کە فەرموویانە حوکمی ئایەتەکە بە ئایەتی ئەنفال هەڵوەشاوەتەوە.

## پیاو سالاری بەسەر ژندا، رێگا چارەی کێشەی نێوان ژن‌و مێرد

﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا (٣٤) وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا (٣٥)﴾.

﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ...﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم لە حەسەنی بەصرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا ئافرەتێك هاتە خزمەتی (دروودی خوای لەسەر بێ) سکاڵای ئەوەی کرد؛ کە مێردەکەی بە مستەکۆڵە لێی داوە، ئەویش فەرمووی: تۆڵەی لە مێردەکەی بستێنن: ئیتر ئەم ئایەتە هاتەخوارێ؛ ئافرەتەکە بەبێ ئەوەی تۆڵەی بۆ بستێندرێ گەڕایەوە.

(موقاتل)یش حەدیثیکی لەم جۆرە دەربارەی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکە ریوایەت کردووە.

جا وەكوو زانیمان پەروەردگار لە ئایەتەكانی پێشوودا بەشە میراتی پیاوو ئافرەتی دیاری كرد، نەهی ئەوەشی لە پیاوو ئافرەت كرد كە تەمەنناو ئاواتەخوازی ئەوە بن، ئەوەی دراوە بە لایەكیان بدرێ بەو لاكەی تریشیان، بەڵكوو فەرمانی پێ كردن، كە هەركەسە بە بەش‌و باری خۆی شوكر بێ‌و، چاو نەبڕێتە ئەو فەضل‌و رێزەی دراوە بەوی تریان! ئەمجار دێ هۆی لێپرسراوی پیاو بۆ ئافرەت‌و هۆی ئەوەی كە نێرینە دوو چەندانەی مێینە لە میراتدا دەبا روون دەكاتەوەو، دەفەرموێ: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾ پیاوان بالا دەستن بەسەر ژناندا، پیاو لیپرسراوی ئافرەتە، سەرۆك‌و بەرێوەبەریەتی، سەرپەرشتیارو پارێزەرو بەخێوكەریەتی، تێكۆشان‌و جیهاد لەسەر پیاوە، لەسەر ئافرەت نیە، پیاو دووچەندانەی ئافرەت میرات دەبا، چونكە پیاو بەرپرسیاری بەخێوكردن‌و بژێوی ئافرەتە. هۆی ئەم لێپرسراوییە دوو شتی سەرەكییە:

یەكەم: ﴿بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ یەكەمیان ئەو زێدە رێزو فەضلەی كە خودا خۆی داویەتی بە پیاو، كە لە بارەی فسیۆلۆجییەوە، لە پێكهاتنی جەستەو لەش‌و لاردا، زێدەی بەسەر ئافرەتدا هەیە، تەن قایم‌و دەمار گشت‌و ماسەلكە قەوی‌و بیر تیژە، خۆڕاگرو عاقڵ ترو لەش ساغ ترە، لە سۆزو عاطیفەدا مامناوەندی‌و لەبەرامبەر كارەساتی رۆژگاردا بە پشوترە.

لە بارەی ورەبەرزی‌و هۆشمەندی‌و هێزو تواناوە، پیاو زێدەی هەیە، بۆیە چەند پلەو پایەیەك هەیە، تایبەتە بە پیاو، وەكوو پێغەمبەرایەتی‌و فەرمانڕەوایی موسوڵمانان‌و قازییەتی‌و بانگ دان‌و قامەت كردن‌و ووتار خوێندنەوەی رۆژی جومعە، تەڵاقیش بەدەست پیاوە، پیاو بۆی هەیە ئەگەر مەرجی خۆی تێدا هاتنە جێ. زیاد لە ژنێك مارە بكا تا چوار، شایەتیدانی قەزیەی جینایات‌و تۆڵەستاندن تایبەتە بە پیاو، بەشە میراتیشی لە ژن زیاترە.

دووەم: ﴿وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ بەهۆی ئەوەی كە پێویستە پیاو بژێوی خێزانی خۆی‌و ئاتاجی كەس‌و كاری خۆی وەكوو باوك‌و مام‌و باپیرەو دایك‌و خوشك‌و پورو نەنك بدا، هەروەها پێویستە پیاو مارەیی بدا بە ژن، وەكوو رێز لێنانێك بۆ ئافرەت.

هەروەها زۆر ئەركی كۆمەڵايەتی تر هەیە كە لەسەر پیاوە لەسەر ژن نیە، وەك سەربازیی، جگە لەم جۆرە شتانە كە زۆربەیان لە قازانجی ئافرەتە لە ماف و ئەركدا پیاوو ئافرەت یەكسانن، ئەمەش لایەنێكی ئیجابی ئیسلامەو هیچ ئایینێك بەو جۆرە بەرژەوەندیی ئادەمیزادی لە هەردوو توخم لەخۆ نەگرتووە، هیچ ئایینێك وەكوو ئیسلام مافی ئافرەتی نەپاراستووە، خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ – البقرة/٢٢٨﴾.

**ئەمجار پەروەردگار لە ژیانی خێزانیدا ئافرەت دەكاتە دوو جۆر:**

**جۆری یەكەم**: ئافرەتی راستاڵ (صالحة)ن ئەوانەی گوێ بیستی فەرمانی مێردەكانیانن؛ وەكوو دەفەرموێ: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ﴾ چاكانی ژنان ئەوانەن كە خوداپەرستو فەرمانبەردارو پارێزەری ناموس و حەیای خۆیانن. كاتێ مێردەكانیان لە ماڵ نەبن پارێزگاری خۆیان و ماڵ و منداڵیان بەو پەڕی دڵسۆزییەوە دەكەن، كاتێكیش مێردەكانیان لە ماڵ بن دیارە باشتر ئەركی ژنیەتی خۆیان ئەنجام دەدەن ئەم پارێزگاری كردنەیان لە دیارو نادیار ﴿بِمَا حَفِظَ اللَّهُ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە كە خودا ئەوانی پاراستووە، بەهۆی ئەوەوە كە تەوفیقی پێداون كە فەرمانەكانی خودا لەم بارەیەوە جێبەجێ بكەن! جا لەبەر ئەم فیداكاریو پارێزگاریو خزمەتكردنەی ئافرەت بۆ مێردی، پێویستە مێردەكەی نەفەقەی بكێشێ، مارەیی بداتێ، هەڵس و كەوتی باشی لەگەڵدا بكاو رێزی لێ بگرێو، مافی پێشێل نەكا! خوداش مزگێنی داوە بە ئافرەتی پارێزگارو بەحەیا، وە هەڕشەی لە ئافرەتی داوێن پیس و خیانەتكار كردووە!!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: باشترین ژن ئەو ژنەیە كە سەیرت كرد، دڵت خۆش بكا، ئەگەر فەرمانت پێ كرد بە گوێت بكا، ئەگەر لێی دوور كەوتییەوە ناموس و ماڵت بپارێزێ: (تاج/٣ل – ٥٧ فەرمودەی/٧).

**جۆری دووەم**: ئافرەتی ناچیزەو خۆ بەزلزان و لاسارن، گوێ بە یاساو داب و نەریتی ژن و مێردایەتی نادەن، ئەرك و مافی خۆیان رەچاو ناكەن، ئەم جۆرە ژنانە خودا چۆنیەتی هەڵس و كەوت لەگەڵدا كردنیانی روون كردۆتەوەو دەفەرموێ:

﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ﴾ ئەو ژنانەی لە مێردەکانیان هەڵدەگەڕێنەوەو ناچیزە دەبن، یان دیاردەی ناچیزە بوونیان لێ دیاری دەدا، ئەوە دەبێ بە گوێرەی پێویست بەچەند قۆناغێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ:

١- ئامۆژگاری کردنو پەند دادان: وەکوو ئەوە نەصیحەتی بکاو پێی بڵێ: ئافرەت لە خودا بترسە، من مافم بەسەرتەوە هەیە، واز لە کەلەڕەقی خۆت بێنە، پێویستە بە گوێی من بکەی، خۆت گوناهباری دیوانی خوا نەکەی، ئەمجار هەڕەشەی ئەوەی لێ بکا کە بەردەوام بوونو سەرپێچی کردنی ئاکامی زیان دەبێ، بۆ خۆیو بۆ منداڵو کەسو کاری! هێلانەی ژنو مێردایەتیان تێك دەچێو تووشی سەرگەردانیو ماڵ وێرانی دەبن، ئەگەر وازی لێ نەهێنا ئەمجار پەنا دەباتە بەر رێگا چارەی دووەم کە ئەویش لەگەڵ نەنووستنە.

٢- لەگەڵ نەنووستن جێ لێ جیاکردنەوە:

بەم جۆرە لەگەڵی نەخەوێو، لەسەر سەرینێك لەگەڵیدا نەنوێ! بەڵام زیاد لە سێ رۆژ دروست نیە دەنگی لێ دابڕێ! ئەم هەڵسو کەوتە زۆر کاریگەرە لە دەروونی ژندا، لەوانەیە هەڵوێستی خۆی بگۆڕێو بیر لە دوارۆژی خۆی بکاتەوە، ئەمجار ئەگەر ئەوەش دادی نەدا، پەنا دەباتە بەر رێگا چارەی سێیەم.

٣- لێدان کە ئازاری پێ نەگەیەنێ: لێدانی بە ئەسپایی وەکوو ئەوە سووك سووك بەدەست لەسەر شانی بدا، یان بە سیواکێ، یان بە شوڵکێ بۆ تەمێ کردن لێی بدا، نەك بۆ ئێش پێگەیاندنو داخی دڵ پێ ڕشتن، چونکە مەبەستەکە ئێش پێگەیاندن نیە، بەڵکوو مەبەست عیلاج کردنە، تەنانەت ئەگەر مێرد زیادەڕەوی کردو بە لێدانەکە ئافرەتەکە مرد! ئەوە پیاوەکە بکوژەو سزای بکوژی لێ دەستێندرێ، هەروەکوو چۆن مامۆستا ئەگەر لە قوتابی داو بە لێدانەکە قوتابییەکە مرد. مامۆستاکە دەستەبەر دەبێو بە بکوژ حسێب دەکرێ!! پێویستە لێدانەکە هەمووی ئاراستەی یەك شوێن نەکرێ لە جێگە ناسكو بەڕێزەکانی نەدرێ، وەکوو دەمو چاو شەرمگاو سەرپەنجەکانو بە گۆچانو عەصا لێی نەدا! بە ئەسپایی لێی بداو کەر کوژی تێی نەسرەوێنێ!

جا هەرچەندە لەکاتی ناچیزەبوون دا لێدان لە ئافرەت لەسەر ئەم شێوەیە دروستە، بەڵام زانایان پێیان وایە تەرك كردنی باشترە.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە کێوی عەرەفات لە شیوەکەی دا، وتاری خوێندەوەو فەرمووی: (دەربارەی ئافرەتانیش لە خودا بترسن‌و بێ دادی‌و ناهەقیان لێ مەکەن رەفتارتان جوان بێ لەگەڵیان، چونکە ئەوان ئەمانەت‌و سپاردەی خودای گەورەن لای ئێوە، پیاو هەر خیانەت بکا نابی خیانەت لە ئەمانەتی خودای خۆی بکا. وە ئەوان لەسەر فەرموودەی خوداو بەپێی قسەی شەریعەتی ئەو حەڵاڵ بوون بۆ ئێوەو دێنە باخەڵتانەوەو دەچنە لایان‌و وە مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە: ئەو کەسەی ئێوە حەزی لێ ناکەن نەیهێننە سەر بەرەتان‌و نەهێڵن بێنە ماڵتان، جا ئەگەر شتی وایان کرد کە بە دڵی ئێوە نەبوو، ئەوا تا دەتوانن چاوپۆشیان لێ بکەن‌و بە نەرم‌و نیانی لەگەڵیاندا بجووڵێنەوە، بەبێ هۆیەکی رەوا تەلاقیان مەدەن، بەڵام ئەگەر بەم شێوە شیرینەش چاریان نەکرا، ئەوا شەریعەت رێگەتان دەدا بە ئەسپایی لێیان بدەن. ئیبنو سەعیدو بەیهەقی لە ئوموکەلثوم – کچی ئەبوبکری صدیق – دەگێڕنەوە دەڵێ: پیاوان لێدانی ئافرەتانیان لێ قەدەغە کرابوو لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سکاڵای خۆیان لەدەست ژنەکانیان کرد، پێغەمبەر رێگای پێدان کە لێیان بدەن، دوایی فەرمووی: «وَلَنْ يَضْرِبَ خِيَارُكُمْ» ئەوەی لە ئێوە پیاوی باش بێ لە ژنی خۆی نادا!

لە حەدیثیکی تردا هاتووە؛ کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەسەر سوڕمانەوە فەرموویەتی: «أَيَضْرِبُ أَحَدُكُمُ امْرَأَتَهُ كَمَا يَضْرِبُ الْعَبْدَ؟ ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ» (تاج/٣ل – ١٣٢ف/١).

ئایا یەکێك لە ئێوە لە خێزانی دەدا وەکوو لە کۆیلە دەدا؟ پاشانیش ئێوارە لەگەڵی رادەکشێ‌و کاری شەرعی لەگەڵ دەکا؟ ئەم فەموودانە بە تێکڕا، ئەوە دەگەیەنن کە لێدانی ژن باش نیەو وا باشە وازی لێ بهێنرێ: قورئانیش دەفەرموێ: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ – البقرة/٢٢٩﴾.

جا ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾ ئەگەر فەرمانبەردار بوونو بە قسەیان کردن، ئیتر رێگا چارەی تر مەگرنە بەرو بە شێوەیەکی تر سزایان مەدەن ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ بێگومان خودا بالاّ دەستەو بە تواناو دەسەلاّتە، ئەگەر ستەم لە نافرەتان بکەنو بە هێزو بازووی خۆتان بنازن، خودا تۆلّەتان لێ دەستێنێو سزاتان دەدا، ئەمە هەرِەشەیەکی توندە لە پیاوان، داکۆکی کردنە لە مافی ژنان. برِێکیش پێیان وایە ئایەتەکە هەلّنانی تێدایە بۆ مێردەکان کە تۆبە لە خێزانەکانیان قبوولّ بکەن، واتە: لە کاتێکدا خودای بالاّدەستو بە توانا، تۆبەی تاوانبار قبوولّ دەکا، ئێوە دەبێ زیاتر ئامادەباشیتان تێدا بێ بۆ تۆبە وەرگرتنو لێبووردەیی.

٤- جا ئەگەر ئەم رێگا چارانە کاریگەر نەبوون؛ پەنا دەبرێ بۆ رێگا چارەی چوارەم کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا﴾ ئەگەر زانیتان کە کێشەو ناخۆشی لە نێوان ژنو مێردەکەدا هەیەو گەیوەتە پلەیەك کە لەناو خۆیاندا بۆیان حەل ناکرێ، ئەوا دادووەرێك لە خزمی مێردو دادوەرێك لە خزمی ژنەکە بنێرنە لایان، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لە کێشەکەیان بکۆلّنەوە، هۆی ناکۆکییەکەیان دەست نیشان بکەن ﴿إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا﴾ ئەگەر ویستو نیازیان پاك بێو بە دلّسۆزی بە پیر کێشەکەوە بچنو ئامۆژگاری کردنیان بۆ خودا بێ، خودا کۆششیان بە پیرۆز دەگێرِێ، یارمەتیان دەدا، ئاکامی باش بەدەست دێننو رێکیان دەخەنەوەو خۆشەویستی دەکەوێتەوە نێوانیان ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾ بێگومان خودا هەمیشە زانایەو دەزانێ چۆنو بە چی ئاشت دەبنەوەو خۆشەویستی دەکەوێتەوە ناویانەوە!

ئەمجار فەرمانی (فابعثو) بۆ وجووبە، یان بۆ نەدبە؟ ئیمامی شافیعی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: فەرمانەکە بۆ وجووبە، چونکە هۆکاری لابردنی زولّمو ستەمەو فەرزی کیفایەو ئەرکێکی پێویستی سەرشانی قازییە.

بەلاّم ئایا مەرجە (حەکەم) ناوبژیکەرەکان خزمو کەسوکاری ژنو مێردەکە بن یا نا؟؟ ئەوە مەرج نیە، بەلّکوو واباشە خزمیان بن، ئەگەر بێگانەش بێ قەی ناکا، چونکە ئەوان کارەکەیان دەرخستنی هۆی کێشەکەیەو ئەمجار ناوبژیکردنو

ڕێخستنی نێوانیانەو شایەتی دانە لەسەر ستەمکارو خەتاباریان، ئەویش بە بێگانە دەستەبەر دەبێ، وەکوو چۆن بە خزم دەستەبەر دەبێ. بەلاّم چاك وایە ناوبژیکەرەکان لە خزمی ژنو مێردەکە بن، بۆ ئەوەی نهێنی نێوان ژنو مێردەکە زیاتر بپارێزرێو ناویان نەزڕێندرێ، هەروەها چونکە خزم ئاگادارترن بە حاڵو چۆنیەتی ژنو مێردەکەو باشتر گرنگی بە ڕێکەوتنەکەیان دەدەنو کۆڵی پێوە هەڵدەگرن، جێگای بڕوای ژنو مێردەکەن.

ئەرك و دەسەلاّتی ناوبژیکەرەکان بەلای ئیمامی مالیك و شەعبیو- بەپێی گێڕانەوەیەکیش لە ئیمامی عەلیو ئیبنو عەبباسەوە – ئەوەیە کە حەکەمەکان دەتوانن: دوای لێکۆڵینەوە بڕیار بدەن بە یەك خستنەوەیان یان لێك جیاکردنەوەیانو هیچ پێویست بە ڕەزامەندی ژنو مێردەکە ناکا؟! چیان بە لاوە باش بوو بەرژەوەندی ژنو مێردەکەیان تێدا ببینن دەتوانن بڕیاری لەسەر بدەنو دەسەلاّتێکی شەرعیو قەزائی خۆیانە بەلاّم هەر دەتوانن یەك تەلاقی بدەن، بە بینوونەی صوغرا، واتە: جیابوونەوەی بچووك.

ئیبنو عەرەبی دەڵێ: (حكما من أهله وحكما من أهلها) بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: کە ئەو دوو حەکەمە بریکار (وەکیل) نین بەڵکوو قازیو دەسەلاّتداران دەتوانن حوکم بکەن بەیەك کەوتنەوەیان، یان بە لێك جیابوونەوەیان! شافیعیو حەنبەلییەکان دەڵێن: حەکەمەکە بەبێ ڕەزامەندی ژنو مێردەکە، ناتوانن بڕیاری لێك جیابوونەوەیان بدەن، چونکە ئەوان (وەکیل)ن نەك قازی.

حەنەفییەکان دەڵێن: ئاکامی لێکۆڵینەوەکەیان ئەوەیە: بیروڕای خۆیان بەرامبەر بە کێشەکەیان دەکەنە ڕاپۆرتو بەرزی دەکەنەوە بۆ بەردەم قازیو لەبەر ڕۆشنایی ڕاپۆرتەکەی ئەواندا قازی فەرمانی تەلاق دەردەکا!

واتە: حەکەمەکان دەسەلاّتی تەلاقیان نیە، مەگەر قازی بەرەسمی ئەو دەسەلاّتەیان بداتێ: کەوابوو ڕای حەنەفییەکانیش هەروەکوو ڕای شافیعیو حەنبەلییەکانە.

ئایەتەکە شتێکی وای تێدا نیە، پشتگیری ڕایەك لەم ڕایانە بکا، بەڵکوو بۆ هەر یەکێ لەو ڕایانە دەتوانین تێڵنیشانو ئاماژەی لێ دەربێنین.

ڕای یەکەم پشت بەوە دەبەستێ، دەڵێ: قورئان ناوبژیکارەکانی ناو ناوە حەکەم، (حەکەم)یش حاکم‌و دادوەرە دادوەریش دەسەڵاتی بڕیاردانی هەیە!

ڕای دووەم لەم ڕوانگەوە بۆ باسەکە دەچێ؛ دەڵێ ئایەتەکە تەنها دەسەڵاتی ئیصلاح‌و ڕێکخستنەوەی پێداون‌و جگە لەوە دەسەڵاتی تریان نیە. جا هەرچەندە مەسەلەکە ئیجتیهادی‌و جێگای لێکۆڵینەوەیە، هەر ڕایەش بەڵگەو تێڕوانینی خۆی هەیە، بەڵام ڕای دووەم وێچوتر دێتە بەرچاو، چونکە ژن‌و مێردەکە پێش ناردنی حەکەمەکە ناچار نین کە تەڵاق‌و فیدییە ڕەچاو بکەن، دوای ناردنی حەکەمەکانیش لەو بارەوە ناچار ناکرێن. کەوابوو خستنی تەڵاق لە مێردەکەو ماڵ پێدان لە لایەن ئافرەتەکەوە پێویستی بە ڕەزامەندیی هەردووکیان هەیەو دەسەڵاتی حەکەمەکان نیە. ئەمجار ئەگەر حەکەمەکان خۆیان کێشەیان لە ناودا پەیدا بوو، ئەوە قسەی هیچ لایەکیان وەرناگیرێ هەر شتێك هەردوو لایان لەسەری کۆك نەبن بە هیچ حسێب دەکرێ.

ڕەوایە بۆ ژن‌و مێردەکە کە یەك کەس بکەن بە حەکەم‌و لە پێشەوە بە بڕیارەکەی ڕازی بن، ئەوکاتە ئەو چی بڕیار دەدا دەربارەیان حوکمەکەی ڕەوایەو دەبێ جێبەجێ بکرێ.

## ڕەوشتی قورئانی: یەکتاپەرستی، چاکە کردن لەگەڵ باوك‌و دایك‌و خزم‌و دراوسێدا، ماڵ بەخشین بۆ ڕیابازی ناپەسەندە

﴿ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ

مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَهُۥ قَرِينٗا فَسَآءَ قَرِينٗا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيۡهِمۡ لَوۡ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمۡ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾﴾.

ئـەمجار وەكـوو زانیمـان هـەر لەسـەرەتای سـوورەتەكەوە ئایەتـەكان دەربـارەی ڕێكخستنی خێزان دەدوێن‌و پەیوەندی نێوان ئەندامەكانی دیاریی دەكەن‌و، شێوەی هـەڵس‌و كـەوت لەگـەڵ یەكتریـدا روون دەكەنـەوە وەكـوو تـاقی كردنـەوەی هـەتیوو مەنع كردنـی گێل‌و نـەفام لـە سـەوداو مامەڵـە كـردن‌و چۆنیەتی مامەڵەو رەفتـار كردن لەگەڵ ئافرەتـدا، كـەوابوو گونجاوە خـوای گـەورە بـڕێ مـافی گشتی‌و بـەهێز كردنـی پەیوەنـدی خزمایـەتی‌و هاوسـێیەتی‌و دۆسـتایەتی‌و چـۆنیەتی مـاڵ خـەرج كردن‌و ماڵ بەخشین لە ڕێگای خـودادا دەست نیـشان بكـاو روونیـان بكاتـەوە، مـاڵ بەخـشینێك پەسـەندە بـۆ ڕیابـازی‌و نـاوو شـۆرەت نـەبێ، ئـەم ئامۆژگارییانـەی بـە فـەرمان كـردن بـە خوداپەرستی دەست پـێ كـردو فـەرمووی: ﴿وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا﴾ پاش ئەوەی پەروەردگار ژن‌و مێردی ئامۆژگاری كـردن كـە لەگـەڵ یەكتری مامەڵەیان باش بێ، فەرمانی بە حەكەمەكان كرد كە هەوڵی ڕێكخستنەوەی ژن‌و مێـردی لێـك زویـر بـوو بـدەن‌و كێـشەكەیان بـۆ حـەل بكـەن، ئـەمجار دێ ڕێنوومایی ئادەمیزادان بە گشتی دەكا بۆ پەیڕەوكردنی چەند ڕەفتارێكی جوان كـە

لەکاتی مامەڵەو پەیوەندی کردن بەیەکترەوە پابەندی بن‌و خۆیانی پێ ئارایشت بدەن، وە یەکە یەکە باسیان دەکەین:

١- ﴿وَاعْبُدُواْ اللّهَ﴾ بەندایەتی خودا بکەن، دەستە گوڵی هەموویان خوداپەرستییە، واتە: ئەوپەڕی گەردنکەچی بۆ خودای گەورە نیشان بدەین، هەرچی فەرمانێکی پێمان کردووە بەجوانی ئەنجامی بدەین، وە نەیی لە هەرچی کردووە لێی دوور بکەوینەوە.

٢- ﴿وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا﴾ دووەمیش پەروەردگار فەرمانمان پێ دەکا، کە کەس مەکەن بە هاوەڵ‌و هاوتای‌و جگە لە خودا کەسی تر بە خودا مەزانن. دیارە شەریك بۆ خوا قەراردان چەند جۆرێکی هەیە؛ جۆرێکیان وەکوو ئەوەی کە عەرەبەکانی سەردەمی نەزانی بتیان دەپەرست‌و بە خەیاڵی خۆیان ئەو بتانە لە خودایان نزیك دەکەنەوە، وەکوو قورئان دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللّهَ بِمَا لاَ يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلاَ فِي الأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ – يونس/١٨﴾.

جۆرێکی تری شەریك بۆ خوا قەراردان ئەوەیە کە خودا لە مەسیحییەکانەوە بۆمان دەگێڕێتەوە؛ کە ئەوان عیسایان بە خودا زانیوە، دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ – التوبة/٣١﴾

چەند جۆرێکی تریش هەیە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا باس کراوە.

٣- ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ چاکە کردن لەگەڵ باوك‌و دایکدا، پەروەردگار لەچەند شوێندا چاکە کردنی لەگەڵ باوك‌و دایك جوت کردووە بە عیبادەت کردنی خۆی‌و یەکتاپەرستی، وەکوو ئەم ئایەتەی ئێرەو ئایەتی ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا – الإسراء/٢٣﴾ یان ئایەتی ﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ – لقمان/١٤﴾.

چاکە لەگەڵ دایك‌و باوك بریتییە لە بەگوێ کردنیان‌و خزمەت کردنیان‌و هەوڵ دان بۆ دابین کردنی پێداویستیان‌و خۆپاراستن لە هەر شتێك کە زیانیان پێ بگەیەنێ! چونکە ئەوان هۆی دیارو سەبەبی ظاهیرن بۆ پەیدا بوونی منداڵ‌و

ئەوانــە ئێمــەیان پــەروەردە کــردووەو بــەخێویان کــردووین‌و باوەشــی ســۆزو خۆشەویستیان بۆ کردوینەوە.

ئیبنو عەرەبی دەڵێ: چاکە کردن لە گەل دایك‌و باوکدا پایەیەکی ئایینیە چاکە کردن لەگەڵیاندا بە گوفتارو کردار دەبێ، نابێ لە ڕوویانـدا وشـەیەك بڵێین دڵیـان ئـازاری پـێ بگـا؛ وەکـوو قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَـلاَ تَقُـل لَّهُمَـآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَـا – الإسراء/١٣﴾.

٤- ﴿وَبِـذِي الْقُرْبَـى﴾ چاکە کـردن لەگـەڵ خـزم‌و کـەس‌و کـاردا بـەجێ هێنـانی صیلەی رەحم لەگەڵ براو خوشك‌و مـام‌و خـاڵ‌و پـورو منداڵەکانیانـدا. پەیوەنـدی‌و هامشۆکردن‌و دڵدانەوەیان لە کاتی ناخۆشیدا، یارمەتیدان‌و بە پیرەوە چوونیان لـە کـاتی پێویـستیدا، ئەمـەش سەردەکێـشێ بـۆ پتـەوبوونی پەیوەنـدی خێـزان‌و دڵ بەیـەکتر خـۆش کـردن‌و یـەکگرتنی کۆمـەڵ‌و پێـشکەوتنی وڵات. هـەروەکوو چـۆن لەسەرەتای ئەم سوورەتەدا فەرمووی: ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ﴾.

٥- ﴿وَالْيَتَـامَى﴾ چـاکە کـردن لەگـەڵ هـەتیوان‌و بـێ باوکـان.. پـەروەردگار لەسەرەتای ئەم سوورەتەوە لە شوێنی تریشدا فەرمانی پێ کردووین کە چاومان لـە هـەتیوان بـێ‌و چـاکەیان لەگەڵـدا بکـەین، چـونکە ئـەوان بـاوك کـە پـشتیوان‌و یارمەتیدەری ئینسانە لە ژیانیدا – نـەیان مـاوە، دەبـێ وا هەڵس‌وکـەوتیان لەگەڵدا بکەین کەلێنی بێ باوکیان بۆ پڕ بکەینەوە!!

ئیبنو عەبباس دەڵێ: چاکە کردن لەگـەڵ هـەتیودا ئەوەیـە بـە هێـدی‌و هێمنـی لەگەڵیدا بجوڵێیەوەو بەجوانی بەخێوی بکەی‌و ئەگەر سەرپەرشتیاری بـووی مـاڵ‌و دارایی باش بپارێزی.

٦- ﴿وَالْمَـسَاكِينِ﴾ چاکە کـردن لەگـەڵ هەژارانـدا ئەوانـەی کـە نـاتوانن بـژێوی خۆیان دابین بکەن، چاکە کردن لەگەڵ ئەواندا بەوە دەبێ خێریـان پـێ بکـەی، یـان بەشـێوەیەکی جـوان بـەڕێیان بکـەی وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿وَأَمَّـا الـسَّائِلَ فَلَـا تَنْهَـرْ – الضحى/١٠﴾ ئەمەش لە بنەما سەرەکییەکانی هاریکاری (التکافل)ی کۆمەڵایەتییـە لە ئیسلامدا.

٧- ﴿وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى﴾ چاکە کردن لەگەڵ دراوسێی نزیك یان دراوسێی خزم یان هاوسای هاوئایین (هاوسێی وا هەیە هەرسێ جۆرەکەی تێدا کۆ دەبێتەوە) چاکە کردن لەگەڵ هاوسێدا بناغەی یارمەتیدان‌و بەستنی پەیوەندی‌و دروست بوونی خۆشەویستی‌و هەست کردن بە کامەرانییە.

٨- ﴿وَالْجَارِ الْجُنُبِ﴾ چاکە کردن لەگەڵ هاوسێی دوور یان هاوسێیەك کە خزم نەبێ.. بێگومان ئایینی ئیسلام موسوڵمانانی هەڵناوە بۆ چاکە کردن لەگەڵ هاوسێ دا تەنانەت ئەگەر ئەو هاوسێیە موسوڵمانیش نەبێ، ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەردانی جوولەکەیەکی هاوسێی کرد کە نەخۆش بوو! عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) مەڕێکی سەر بڕی دوو سێ جار لە خزمەتکارەکەی دووبارە کردەوە پێی گوت: بەشی ماڵە جوولەکەکەی هاوسێمانتان نارد؟!

ئیبنو عومەرو عائیشە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جوبرائیل ئەوەندە بەزۆری ئامۆژگاری‌و راسپێری کردم، سەبارەت بە مافی دراوسێ لەسەر دراوسێ، تەنانەت وام زانی کە دراوسێ کەلەپوورو میرات دەگرێ (ریاض/١ ل: ٣١٣).

موسلیم‌و بوخاری فەرموودەیەك دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ» واتە: هەرکەسێ باوەڕی ساغی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی دراوسێ بگرێ) ئەمجار ماوەتەوە ئەوە بزانین کێ بە دراوسێ دەژمێردرێ؟ ئەوە عورف‌و عادەتی وڵات دیاری دەکا، حەسەنی بەصری دەڵێ: تا چل ماڵ لە هەر چوار لاوە بە هاوسێ حسێب دەکرێ!

ڕێزگرتنی هاوسێ زۆر جۆری هەن وەکوو یارمەتیدان‌و کۆمەکی پێ کردن، ئەگەر هەژار بێ، وەکوو مامەڵەو هەڵس‌و کەوتی جوان لەگەڵدا کردنی‌و ئەزیەت نەدانی‌و زیان دوورخستنەوە لێی! دیاری بۆ ناردن‌و بانگ کردنی بۆ نانخواردن‌و دیدەنی کردن‌و چوون بۆلای نەخۆشی، ئەگەر نەخۆشیان هەبوو.

٩- ﴿وَالـصَّاحِبِ بِالجَنـبِ﴾ چاکەکردن لەگـەڵ هـاوڕێ، هـاوڕێیش جـۆری زۆرە، وەکوو هـاوڕێی خوێنـدنو هـاوڕێی سـەفەرو کـارو پیـشە، هـاوڕێی مزگـەوتو کـۆڕو کۆمـەڵ، ئیمـامی عـەلی دەفـەرموێ: مەبەسـت بـە ﴿وَالـصَّاحِبِ بِالجَنـبِ﴾ حـەڵاڵو هاوسەرە کەوا لەپاڵتا.

١٠- ﴿وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ چاکە کـردن لەگـەڵ ڕێبـوار، واتـە: کـە لـە مـاڵو نیـشتمانی خۆی دوور کەوتبێتەوە پارمـەتی بـدەی بگاتـەوە وڵاتـی خـۆی، یـان پارمـەتی بـدرێ بگاتە مەبەستی خۆی.

١١- ﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ چاکە کردن لەگەڵ کۆیلەکان چ مێینە بـن چ نێرینـە، ئـەوە بـوو پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لەسـەرە مـەرگا لـە دوا ئامۆژگارییەکەیـدا، داوای لـە موسـوڵمانان کـرد کـە لەگـەڵ کۆیلەکانـدا مامەڵـەو ڕەفتاریـان جـوان بـێ، بەگشتی ئامۆژگاری پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لەسەرە مەرگا ئەوە بوو فـەرمووی: «الصَّلاَةَ وَمَا مَلَكَـتْ أَيْمَـانُكُمْ» ((ئاگـاداری نوێـژ بکەنو چاوی خێرتان لە ژێر دەستەکانتان بێ)).

ئیمامی بوخـاریو موسـلیم فەرموودەیـەك دەگێڕنـەوە کـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەربارەی کۆیلەکان فەرموویـەتی: «هم إِخْوَانُكُمْ وَخَـوَلُكُمْ جَعَلَهُـمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ».

١٢، ١٣ – حەرامی خۆ بەزلزانیو خۆهەڵنانەوەو لـە خۆبـایی بـوون ﴿إِنَّ اللّـهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُورًا﴾ بێگومان خودا کەسێکی خۆش ناوێ کـە دەعیـە کـەرو خۆ بادەرو خۆبەزلزانو خود پەسەند بێ.

بە تەکەببورو فیزو دەعیە ناژمێردرێ: کەسێك ویقاری خـۆی بگـرێو ڕێـز بـۆ خۆی دانێ، نەفس بەرز بێ، لەگەڵ ئەدەبو حیشمەتدا، مـاڵو خـانوو بـەرەی خـۆی بڕازێنێتـەوە، خۆشـڕۆ (سـەیارە)و پۆشـاکی جـوانو نایـابی هـەبێ، ئـەبو داوودو تیرمیذی لە ئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ» واتە: (کەسـێ بەقـەدەر تۆسـقاڵێ فیـزو دەعیـەی لـە دڵـدا بـێ ناچـێتە بەهەشـتەوە) پیـاوێکیش عەرزی کرد وتی: قوربان! هەیە پێی خۆشە پۆشاکی خاوێن بـێ، پـێڵاوی جـوان بـێ

ئەی ئەوە چۆنە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ اللَّـهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ».

واتە: (ئەوە دانانرێ بۆ فیزو دەعیە، ئەوە خۆ جوان کردنە بە یەکێ لە نیشانەو سیفەتەکانی خودا، خودا خۆشی جوانەو جوانیی پێ خۆشە).

ئەمجار پەروەردگار رەوشتی لوتبەرزو خۆبەزلزانو لە خۆرازییانمان بۆ روون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾ ئەوانەی بەخیلی لە ماڵو دارایی خۆیاندا دەکەنو وەکوو خودا فەرمانی پێ کردوون لێی نابەخشن، چاکەی پێ لەگەڵ دایكو باوكدا ناکەن، یارمەتی خزمو هەتیوو هەژارو هاوسێیانی پێ نادەن زەکاتی شەرعی لێ دەرناکەن سەرەڕای ئەوەیش ئامۆژگاری خەڵکی تر دەکەن کە رژدو چرووك بن. ئەو ماڵو سامانەی هەیانە دەیشێرنەوەو نیشانەی نیعمەتی خودایان لەسەر دەرناکەوێ، دڵیان نایێ بۆ خۆشیان خەرجی بکەن، هەمیشە خۆیان بە هەژار دەخەنە بەر چاو، هەروا هەموو بەهرەو چاکەیێ کە خودا داوێتی پێیان دەشارنەوە، وەك زانستو دەسەڵاتو تواناییو شتی تری وا.

ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: کۆمەڵێك لە جوولەکەکان دەچوونە لای چەند کەسێك لە یاریدەدەران (الأنصار)و ئامۆژگاریان دەکردن کە ماڵو دارایی خۆیان نەبەخشن دەیانگوت: دەترسین ئێوە هەژار ببن، پەلە پەل مەکەن لە ماڵ بەخشیندا کێ دەزانێ رۆژگاری داهاتوو چۆن دەبێ؟ کێ دەڵێ: ئێوەش هەژار نابن. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿الَّـذِينَ يَبْخَلُـونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَـذَابًا مُّهِينًـا، وَالَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ رِئَاء النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَن يَكُنِ الـشَّيْطَانُ لَهُ قَرِينًا فَسَاء قِرِينًا، وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ آمَنُواْ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِـرِ وَأَنفَقُـواْ مِمَّـا رَزَقَهُـمُ اللّـهُ وَكَانَ اللّهُ بِهِم عَلِيمًا﴾. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) دژی بەخیلی بووە فەرموویەتی «وَأَىُّ دَاءٍ أَدْوَأُ مِنَ الْبُخْلِ» واتە: (چ دەردێ هەیە کە لە دەردی رەزیلی کوشندە تر بێ!)؟ ئەبو داوودو حاکم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «إِيَّاكُم وَالشُّحَّ، فَإِنَّهُ هَلَكَ مَنْ

كَانَ قَبْلَكُمْ بِالْبُخْلِ، أَمَرَهُمْ بِالْبُخْلِ فَبَخَلُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْقَطِيعَةِ فَقَطَعُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْفُجُورِ فَفَجَرُوا». بۆ هەموو ڕەوشتێك لەو ڕەوشتە ناشیرینانەی بەخیلی، پەروەردگار تۆڵەی بەئێشی ئامادە كردووەو دەفەرموێ: ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ ئامادەمان كردووە بۆ ئەوانە بەهۆی لوتبەرزیو بەخیلیو ناشكوری كردنیان سزایێ كە سەرباری ئێشو ئازاری زۆری – سووكایەتی پێ كردنیشی تێدایە، ئەو سزایە پڕاوپڕی كردەوە ناپەسەندەكانیانە، خودا ئەو لەخۆ ڕازیو بەخیلانەی بەكافر ناو بردووە، چونكە كردەوەكانیان كردەوەی كافرانە، نەك هی موسوڵمان، هەروەها چونكە (كفر) بەمانا داپۆشینو شاردنەوە هاتووە، بەخیلیش نیعمەتی خودا دەشارێتەوەو ئینكاری دەكا. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُحِبُّ أَنْ يُرَى أَثَرُ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ» واتە: (خودای گەورە پێی خۆشە كە نیشانەی نازو نیعمەتو چاكەی خودا لەگەڵ بەندەی خۆیدا بە بەندەكەوە دیاربێ).

(تیرمیذیو حاكم لە ئیبن عومەرەوە گێڕاویانەتەوە) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كە دەپاڕایەوە دەیفەرموو: «وَاجْعَلْنَا شَاكِرِينَ لِنِعْمَتِكَ مُثْنِينَ بِهَا عَلَيْكَ، قَابِلِيهَا وَأَتِمَّهَا عَلَيْنَا». خودایە! بمانكە بە سوپاسگوزاری بەهرەكانت، بیانكەین بە مایەی وەسپو ستایشی تۆ، پێیان ڕازی بینو لەقەیان لێ نەدەین، خودایە! تەواویان بكە بۆمان) هەندێ لە زانایانی سەلەف فەرموویانە مەبەست لەو بەخیلییەی ئایەتەكە باسی دەكا شاردنەوەی ئەو زانیارییە بوو كە جوولەكەكان دەربارەی ڕەوشتو نیشانەی پێغەمبەر لایان بوو دەیانشاردنەوە، بۆیە بەكافری ناوبردنو فەرمووی: ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ جا وەكوو ئاشكرایە ئەهلی فەخرو لەخۆ ڕازی بوو دوو جۆرن جۆرێكیان ئەوەبوو باسمان كردن كە ڕژدو بەخیلو چاو چنۆكن، نازو نیعمەتێك كە خودا پێی داون دەیشێرنەوە، جۆرێكی تر ماڵو دارایی خۆیان دەبەخشن بۆ ڕیابازیو ناوو شۆرەت ئەم تاقمەش لە تاقمی پێشوو باشتر نینو بۆیە دوا بەدوای كۆمەڵی پێشوو باسی ئەمانی كردووە، فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ رِئَاء النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەوانەی ماڵو دارایی

خۆیـان دەبەخـشن بـۆ ریـابـازیو نـاوو شـۆرەت، مەبەسـتیان بـە مـاڵ بەخـشینەکە، رەزامەنـدی خودا نیە، باوەڕیان بە حیسابو لێکۆڵینەوەی رۆژی قیامەت نیە.

لـە فـەرموودەی چەسـپاو لـە پێغەمبـەرەوە هـاتووە کـە سـێ کـەس یەکـەم جـار ئـاگری دۆزەخیـان پـێ دادەگیرسـێ - زانـاو غەزاکـەرو بەخـشندە — ئەوانەیـە بـە کارەکەیان ریابازی دەکەن، جا بەخشندە دەڵێ: خودایا مـن لـەدونیادا هـەر شـتێکی تـۆ پێـت خـۆش بووبـێ مـاڵی تێـدا ببەخـشم مـاڵم تێـدا بەخـشیوە پـەروەردگار دەفەرموێ: درۆدەکەی: تۆ بۆیە ماڵت بەخشیوە تا پێت بڵێن: سەخیو دڵ فـراوان، ئەوەشیان پێ گوتویو لە دونیادا پاداشتی خۆتت وەرگرتۆتـەوە، ئـەو ریابازانـە نـە بڕوایان بـەخودا هەیـە، نـە بڕوایـان بـە رۆژی دوایـی هەیـە. ئەوانـە شـەیتان هـەڵی خەڵەتاندوونو لەخشتەی بردوون! ﴿وَمَن يَكُنِ الشَّيْطَانُ لَهُ قَرِينًا فَسَاء قِرِينًا﴾ کەسێك شەیتان رێ پیشاندەرو هاوڕێی بێ ئەوە هاوڕێیەکی خراپی هەیە، واتـە: ئـەوەی کـە ئـەوانی هـەڵناوە بـۆ بـەخیلیو رژدی، بـۆ خراپـە کـردنو ریابـازی شـەیتانەو شـەیتانیش هـاوڕێو مامۆسـتایەکی خراپـەو ئەوانـەی بـەگوێی دەکـەن، لەشـەڕو نەگبەتیدا حاڵیان لەحاڵی شەیتان خراپترە!

ئەمە ئاماژەی ئەوەشـی تێدایـە کـە پێویـستە ئینـسان خـۆی لـە هـاوڕێی خـراپ دوور بخاتەوەو هەوڵ بدا برادەری صالحو باش بۆ خۆی پەیدا بکا.

﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ آمَنُواْ بِاللّهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ وَأَنفَقُـواْ مِمَّـا رَزَقَهُـمُ اللّـهُ﴾ ئەوانـە چ زیانێکیان تووش دەبوو ئەگەر بەڕاستی بڕوایان بەخودا بکردایەو رۆژی قیامـەتیان بـە حـەق بزانیایـەو کاریـان بـۆ ئـەو رۆژە سامناکە بکردایـە، لـەو مـاڵو داراییـەی کـەخودا پێـی داون بەخـشندە بوونایـەو لەبـەرخاتری خـوداو بەدەسـت هێنـانی رەزامەندی ئەو کاریان بکردایـە، ئـاوا خەسـارەتمەندی دونیـاو قیامـەت نـەدەبوون!!

﴿وَكَانَ اللّهُ بِهِم عَلِيمًا﴾ خودا ئاگاداری نیازو نیەتی باشو خراپی ئەوانەیە، دەزانـێ کێ شیاوی تەوفیقو یارمەتی دانە دەیخاتە سەر رێگای راست؛ کـێ شـیاوی نـەفرەت لێ کردنە وازی لێ دێنێو بەری بۆ بەرەڵلا دەکا، ئەمجار لە قیامەتـدا پـاداشو سـزای هـەموو کەسـێ بـەپێی کـردەوەی خـۆی دەداتـەوە، هیـچی لێ هـوون نابـێو هـەموو

کردەوەیـەك پاداشـی خـۆی دەدرێتـەوە، کـەوابوو پێویـستە موسـوڵمان کـردەوەو گوفتاری ساخ بۆ خودا بێ‌و هەر لە ئەویش چاوەڕوانی پاداش بێ.

## هەڵنان بۆ فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەر، ترساندن لەسەرپێچیکردنی فەرمانەکانیان

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا ﴿٤٢﴾ ﴾.

پوختەی مانای ئەم ئایەتانە بریتییە لە هەڵنانی خودایی بۆ بەندەکانی کە پابەندی فەرمانی خودا بن‌و ئەو شتانەی نەهییان لێ کراوە نزیکی نەکەونەوە، واتە: هەڵنانی ئادەمیزادانە بۆ پابەندبوون بەو فەرمان‌و نەهییانەی لە ئایەتەکانی پێشوودا ئاماژەیان بۆکرا. دەفەرموێ:

﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ دڵنیابن: کە خودا قەت زۆرو ستەم لەکەس ناکا، ئەگەر چی بەقەد دەنکە خەرتەلەیەکیش بێ، یا لەوەیش کەمتر بێ، تەنانەت بەقەد سەنگی گەردیلەیێ ناهەقی لەکەس ناکا، وەکی تریش ئەگەر چاکە بەقەد تۆسقاڵێکیش بێ، خودا بەرەکەتی تێ دەخاو پاداشی خاوەنەکەی دووچەندانەو چەند چەندانە دەداتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ - الأنبياء/٤٧﴾. یان لەم ئایەتەی تردا لەسەر زوبانی لوقمان دەفەرموێ: ﴿يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ

حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ – لقمان/١٦﴾ لە حەدیثی شەفاعەتدا کە موسلیم‌و بوخاری لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە هێناویانە حەدیثەکە دوورو درێژە ئەمەی تێدایە:

«فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ! أرجعوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلَةٍ مِنْ إِيمَان فَأَخْرِجُوهُ مِن النَّارِ». لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: «أَدْنَى أَدْنَى مِثْقَالِ ذرَّةٍ مِنْ إِيمَان، فَأَخْرِجْهُ مِنَ النَّارِ». ئیتر زۆر خەڵك لە دۆزەخ دەردەهێنن جا ئەبو سەعیدی خودری وتی: بۆ زیادە دڵنیایی بچن ئایەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ...﴾ بخوێننەوە بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە.

بە پوختی مانای ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە پەروەردگار لە پاداشی کردەوەی هیچ کەسێك تەنانەت ئەگەر زۆر کەمیش بێ – کەم ناکاتەوە! بە ناڕەواش سزای کەس نادا، چونکە ستەم نیشانەی ناتەواوی ستەمکارە، خوداش لە ناتەواوی بە دوورەو کەمالی موطلەقی هەیە.

ئەگەر کەسێك دوای ئەوەی کە خودا عەقڵ‌و هۆشی داوەتێ تاوانێك بکا ئەوا بۆ خۆی کردووە ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ – فصلت/٤٦﴾ جا لەگەڵ ئەوەدا پەروەردگار پاداشی هیچ کردەوەیەکی باش کەم ناکاتەوە تەنانەت ئەگەر بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێ – پاداشی چاکە دوو چەندانەو چەند چەندانە دەکاتەوە تا دەگاتە دە هێندەو حەوت سەد هێندەو زیاتریش، بەڵام خراپە هەر بە ئەندازەی خۆی سزای لەسەر دەدرێتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ – الأنعام/١٦٠﴾.

کە لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەمەش زیادە فەزڵێکە، کە هەر بەوەندە ناوەستێ پاداشی دوو چەندانە بکاتەوەو بەس، بەڵکوو پاداشی بێ بەرامبەریش دەدا واتە: پاداشی تریش دەدا بەبێ ئەوەی کابرا چاکەی لەبەرامبەریدا هەبێ! خودا خەزێنەی رەحمەتی فراوان‌و پڕە، چەندێکی لێ ببەخشێ لێی کەم نابێتەوە.

دەی کە ئەمە یاسای پاداش بێ‌و خودا ئەوەندە بە رەحم‌و سۆز بێ بۆ بەندەکانی، جێی خۆیەتی کە بەشێوەیەکی تەعەجوب دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاء شَهِيدًا﴾!! واتە: ئەو بێبڕواو جوولەکەو گاورو خوا نەناسانەی کە سەرپێچییان لە فەرمانەکانی پەروەردگاری بە رەحم‌و دادپەروەری خۆیان کردووە، دەبێ حاڵیان چۆن بێ لەو رۆژەدا کە هەڵەی خۆیان بۆ دەردەکەوێ‌و رووبەڕووی سزاو تۆڵەی سەختی تاوانی خۆیان دەبنەوە بەتایبەتی پاش ئەوە کە پێغەمبەری هەموو نەتەوەیێ، بە فەرمانی ئێمە دێ‌و دەبێ بە شایەت لەسەریان، ئەوجا تۆیش دێنین ئەی موحەممەد! دەبی بەشایەت بۆ پێغەمبەران کە ئەوان ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ هێناوە، جا نەتەوەکە چیان کردووە پێغەمبەرەکەیان شایەتیان لەسەر دەدا وەکوو لەسەر زوبانی عیسا دەفەرموێ: ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ – المائدة/١١٧﴾.

ئەمجار ئەی موحەممەد! تۆ دێنین‌و دەتکەین بە شایەت بەسەر ئەو خوا نەناسانەوە.. عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: سورەتی (النساء)م بۆ پێغەمبەر خوێندەوە تا ئەوەی کە دەفەرموێ: ﴿وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيدًا﴾ ئیتر پێغەمبەر گریاو فەرمووی: (حسبنا) ئەمەمان بەسە.. ئەمە ئاماژەو بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کردەوەی گەل‌و نەتەوەکان بەسەر پێغەمبەرەکانیاندا رادەنوێندرێ. هەر لەمانای ئەم ئایەتەدا ئایەتێکی تر هەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا – البقرة/١٤٣﴾.

واتە: ئەم گەلی ئیسلامە بەڕەوشتی جوان‌و ئیمانی پتەوبوونیان بەدوا گەل‌و ئاخر نەتەوەی بڕوادار، کە خاوەن عەقیدەیەکی پاک‌و پیرۆزی مام ناوەندی بن، بوون بە شایەت لەسەر گەل‌و پێشینەکان‌و چاودێرن بەسەریانەوە کە ئەوانە لە رێبازی پێغەمبەرەکانیان لایانداوە، پێغەمبەری ئیسلامیش لە روانگەی رەفتاری بەرزو ژینامەی پاک‌و سوور بوونی لەسەر هەڵوێستی راست‌و حەق، بەڵگەیە لەسەر ئەوانەی کە رێبازی ئەویان گوم کردووە؛ جا ئەو رۆژە کە ئێمە ئەوان راپێچی دەشتی مەحشەر دەکەین، پێغەمبەران دەبنە شایەت بەسەر گەلەکانیانەوە. موسوڵمانان دەبنە شایەت بەسەر نەتەوە پێشینەکانەوە.

پێغەمبەری ئیسلام دەبێتە شایەت بەسەر ئەوانەی کە لەرێبازی ئەو لایان داوە، (یَوْمَئِذٍ) رۆژێکە ﴿یَوَدُّ الَّذِینَ کَفَرُواْ وَعَصَوُاْ الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّى بِهِمُ الأَرْضُ﴾ ئەوانەی کافر بوون‌و سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەرەکەیانیان کردووە جا لەو رۆژەدا پەشیمان دەبنەوە، حاڵی شەڕی خۆیانیان بۆ ئاشکرا دەبێ، کافرو بێ بڕواو سەرپێچیکەران لە فەرمانی خواو پێغەمبەران خۆزگە دەخوازن کە وەك مردووی ناو گۆڕ بنێژرێن‌و ببنەوە بە خاك، هەتا لەو رۆژە رەشە رزگاریان ببێ، بەلاّم بۆ خۆیان دەڵێن! یان مانای وایە ئاواتەخوازی ئەوەن کە هەر زیندوو نەکرانایەوە، هەر لەژێر خاکدا بوونایە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَیَقُولُ الْکَافِرُ یَا لَیْتَنِی کُنتُ تُرَابًا – النبأ/ ٤٠﴾ ئەوانە تاوانیان کردووەو تاوانەکەیان بۆ ناشێردرێتەوە ﴿وَلاَ یَکْتُمُونَ اللّهَ حَدِیثًا﴾ ناتوانن تاوانەکانیان لەخودا بشارنەوە، چونکە ئەندامەکانیان شایەتیان لەسەر دەدەن، ناتوانن درۆبکەن، خۆ ئەگەر درۆبکەن خودا دەمیان مۆر دەکاو ئەوکاتە ئەندام‌و دەست‌و قاچیان دێنە قسەو شایەتیان لێ دەدەن‌و بەدرۆیان دەخەنەوە، جا لەبەر سامناکی ئەو وێستگەیە ئاواتە خوازی ئەوەن کە ببنەوە بە خاك‌و خۆڵ‌و دووچاری ئەو زەحمەت‌و مەینەتە نەبن.

پرسیار لە ئیبنو عەبباس کرا: چۆن تەوفیق لەنێوانی ئەو دوو ئایەتەدا دەکرێ، کە یەکێکیان بەدەق دەفەرموێ درۆ لەگەڵ خودادا دەکەن‌و دەڵێن: ﴿وَاللّهِ رَبِّنَا مَا کُنَّا مُشْرِکِینَ﴾ ئەوی تریشیان دەفەرموێ: ناتوانن شت لەخودا بشارنەوەو درۆیان لەگەڵ خوادا پێ ناکرێ؟

لە وەلاّمدا فەرمووی: کاتێك کافرەکان دەبینن کە هەر موسوڵمان‌و خودا ناس دەچنە بەهەشتەوە دەیانەوێ بەدرۆو دەلەسە خۆیان رزگار بکەن‌و دەڵێن: ﴿وَاللّهِ رَبِّنَا مَا کُنَّا مُشْرِکِینَ﴾ ئیتر ئەو کاتە خودا دەمیان مۆر دەکاو زمانیان دەبەستێ، دەست‌و قاچیان شایەتیان لەسەر دەدەن‌و ئیتر لەوەدوا هیچیان لەخودا بۆ حەشار نادرێ.

## یاساغ کردنی نوێژکردن بەسەرخۆشی، کە ئاو نەبوو بۆ دەست نوێژ تەیەمموم دەکرێ

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا (٤٣) ﴾.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بە ئایەتەکانی پێشوو ئەوەیە: لەوەپێش پەروەردگار نەهی لەشەریك دانان بۆ خودا کرد، ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ پابەند بوون بە فەرمانو نەهییەکانی یەزدان، ئەمجار لێرەدا نەهی لەوە کرد کە نوێژ لە حاڵەتی سەرخۆشیدا، یان لە حاڵەتی لەش پیسیدا ئەنجام بدرێ! چونکە نوێژ خۆی لە خۆیدا عیبادەتێکی یەکتاپەرستییە!

رووی خیطابی ئایەتەکە بۆ موسوڵمانانە، پێش سەرخۆش بوونیان، بۆ ئەوەی خۆیان لە عەرەق خواردنەوە بپارێزن، لە نوێژەکانیاندا بەتەواوی ئاگاداریو عاقڵ مەندیو هۆشدارییەوە روو بکەنە پەروەردگارو ئەو ئەرکە پیرۆزە ئەنجام بدەن، هەروەها جەستەو پۆشاكو بەرماڵیان لە هەموو پیسیو پۆخڵەواتێکی ماددیو مەعنەوی پاك کرابێتەوە. ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى...... ﴾ ئەبوو داوودو تورموزیو نەسائیو حاکم لە ئیمامی عەلییەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف خواردنی بۆ دروست کردینو داوەتی کردینو عەرەقی دەرخوارد داینو سەرخۆش بووین ئەمە پێش یاساغ

کردنی عەرەق بوو – وەختی نوێژ هات‌و منیان کردە پێش نوێژخوێن لە دوای فاتیحەوە سوورەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾م خوێندو وتم ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ، نحن أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ.....﴾ ئیتر خودا ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ی نارده خوارێ. ئیبنو جەریر لە ئیمامی عەلییەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێش نوێژ خوێن عەبدورەحمان بوو، نوێژەکەش نوێژی شێوان بوو، ئەمە پێش حەرام بوونی عەرەق بوو.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار نەهی لە هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خودا کردو موسوڵمانانی هەڵنا بۆ ئەوەی پابەندی فەرمانی خودا بن‌و خۆ بپارێزن لە شتە یاساغ کراوەکانی،، لێرەدا نەهی لە موسوڵمانان کرد کە لە کاتی سەرخۆشیدا توخنی نوێژ کردن نەکەون، چونکە نوێژ گەردنکەچییەکی تایبەتییە بۆ خوداو نابێ بەسەرخۆشی ئەنجام بدرێ.

خیطابەکە روو دەکاتە موسوڵمانان لەپێش سەرخۆش بووندا بۆ ئەوەی خۆیانی لێ بپارێزن‌و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە پەیامی ئیسلام کردووە! لە حاڵەتی سەرخۆشیدا نزیك نوێژ کردن مەبنەوە، واتە: لەپێش نوێژدا خۆتان لە عەرەق خواردنەوە بپارێزن، وا مەکەن کاتێ کاتی نوێژ دێ ئێوە سەرخۆش بن، چونکە بە سەرخۆشی ئێوە ئاگاتان لەخۆتان نیەو نازانن دەڵێن چی، نوێژیش رازو گفتوگۆی بەندەیە لەگەڵ خوای خۆیدا، دەبێ بەباشی دڵی لەلای بێ، کەواتە: هەر لەپێش کاتی نوێژەوە خۆتان لەسەرخۆشی بپارێزن ﴿حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ تا بزانن لەناو نوێژەکەدا چی دەڵێن ﴿وَلاَ جُنُبًا إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ بە لەش پیسی نزیك شوێنی نوێژ کردن کە مزگەوتە مەکەونەوە مەگەر وەك رێبوار بەسەر پێوە بەناویا، بەبێ راوەستان گوزەر بکەن، سەرەڕێگاتان بێ‌و لەم دەرگاوە تێی بچن‌و لەو دەرگاوە دەرچن! واتە: چوونە ناو مزگەوت‌و مانەوە تێیدا بەلەشی پیسەوە لێتان قەدەغەیە، تا خۆتان دەشۆن‌و غوصڵ لە خۆتان دەردەکەن. ﴿حَتَّىَ تَغْتَسِلُواْ﴾ هەتا لەش پیسی لەسەر خۆتان لادەبەن. بێگومان ئەم نەهییە کاری لە هاوەڵانی پێغەمبەر کرد، وە وای تێگەیشتن کە ئەوەی لێیان یاساغە نوێژ کردنە

بەسەرخۆشی: جا بەرەبەرە خۆیان لەبادە نۆشی دەکێشایەوە، چونکە تەنیا لە دوای نوێـژی خـەوتنان مـەودای ئـەوەیان مـابوو کـە شـتێ بخۆنـەوە، بـۆ کەسـێ مـەیلی خواردنەوەی هەبوایە، جا لەم بارو دۆخە ناسکەدا ئیمامی عومەر لـەخودا پاڕایـەوە گوتی: (اللهم بـين لنـا في الخمـر بيانـا شـافيا) (خودایـە! لـە بـارەی بـادە نۆشـییەوە روونکردنەوەیەکی تێرو تەسەلمان بۆ روون بکەرەوە) ئـیتر ئایـەتی ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُـمْ تُفْلِحُـونَ – المائـدة/ ٩٠﴾ هاتـە خـوارەوە، ئـیتر بەیـەکجاری وازیـان لـە بـادەو مـەی خواردنەوە هێنا.

زۆربـەی زۆری راڤەکـەرانی قورئـان لەسـەر ئـەوەن کـە وشـەی (الـصلاة) لـە ئایەتەکەدا مەبەسـت پێـی مانـای حـەقیقی خۆیـەتی کـە نوێـژ کردنـە، واتـە: کـە ویستتان نوێژ بکەن سەرخۆش مەبن، نوێژ مەکەن لە حاڵێکدا کە ئێوە سـەرخۆش بن.

مامۆستا (شێخ محمد عبده) دەفـەرموێ: (وأنـتم سـكارى) رسـتەیەکەو بوومتـە حاڵ، ئەوەی لێی وەردەگیرێ کە نەهییەکە لەسەرخۆش بوونێکە کە درێژە دەکێـشێ تا وەختی نوێژەکەو وا دەکا کابرا بەسەرخۆشـی نوێژەکـەی ئـەنجام بـدا! واتـە خـۆ بپارێزن لەوە کە نوێژ بکەن لە کاتی سەرخۆشیدا. پابەند بوون بـەم نەهییـە ئـەوە دەخـوازێ خۆیـان لەسەرخۆشـی بپـارێزن لـە کـاتی نوێـژداو لـە کـاتی نزیکـی پـێش نوێژیـشدا. واتـە: دەبـێ خۆیـان لـە عـەرەق خواردنـەوە بپـارێزن لـە پـێش نوێـژی بەیانییەوە تا دوای نوێژی خەوتنان.

بەم پێیە زۆربەی کات عـەرەق خواردنـەوەیان لێ قەدەغـە بـوو، رێ خۆشـکەرو رام کـردن بـووە بـۆ یاسـاغ کردنـی سەرتاسـەری! ئەمـەش پلـەی یەکەمـە لـەو سێ قۆناغەی کە عەرەقی تێدا حەرام کراوە.

شافیعیو ئیبنـو عـەبباسو ئیبنـو مەسعوودو حەسـەنی بەصـری پێیـان وایـە: وشەی (الصلاة) لەم شوێنەدا مەبەست لێی مەعنای حەقیقی خـۆی نیـە کـە نوێـژە، بەڵکوو حەزفی موضافی تێدایـە، واتـە: (مكـان الـصلاة) یـان (مواضـع الـصلاة) کـە

مەبەست مزگەوتە بەڵگەشیان ئەوەیە؛ کە ئیبنو عەبباس وشەی (وصلوات) لە ئایەتی (٤٠)ی سوورەتی حەجدا بە کەنیشتەی جوولەکە مانای لێك داوەتەوە:

کە جێگە نوێژی میللەتی جوولەکەیە وەك مزگەوتی خۆمان. وە دەفەرموون: چونکە ئەگەر مانای (الصلاة) بە مەجاز لێ نەدەینەوە ئیستثنای ﴿إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ ناگونجێ!

لەلایەکی ترەوە ئەگەر مەبەست بە (الصلاة) حەقیقەتی نوێژ بێ‌و مەبەست مزگەوت نەبێ دووبارە بوونەوە لە نێوان رستەی ﴿إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ رستەی ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ﴾ روو دەدا.

بۆیە دەبێ مانای وشەی (الصلاة) بە (مواضع الصلاة) لێ بدەینەوە؛ وەك گوترا (کەلام لە حەذفی موضاف بێ).

پوختەی قسە ئەوەیە: ئایین داوای ئەوەی کردووە، کە نوێژ کردن دەبێ لە کاتی تێگەیشتن‌و لەسەرخۆیی‌و ئاگاداری‌و هەبوونی هۆشی تەواودا ئەنجام بدرێ، ئەمەش ئەوە دەخوازێ نوێژکەر خۆ لەسەرخۆشی بپارێزێ؛ هەروەکوو چۆن داوای ئەوەی کردووە جەستەی پاك‌و پەنیشات بێ، ئەوەش دەخوازێ کە لەش گران نەبێ‌و لەش پیسی لەسەر خۆی لابەرێ.

جا لە کاتێکا نوێژ پێویستییەکی سەرەکی ئایینیەو کاتی دیاری کراوی خۆی هەیەو نابێ کەمتەرخەمی تێدا بکرێ، خۆشۆردنی لەشگرانی لەبرێ کات‌و شوێندا ئەرکێکی گرانەو بەزەحمەت هەڵدەسورێ‌و لە برێ حاڵدا هەر هەڵناسوورێ!! پەروەردگار رێگای پێداوین کە هەوڵی بەکارهێنانی ئاو واز لێ بێنین‌و لەباتی ئاو بە خۆڵی پاك تەیەمموم بکەین‌و فەرمووی: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَى﴾ ئەگەر نەساغ بوون، نەخۆشییەکتان پێوە بوو، بە بەکارهێنانی ئاو ترسی ئەوەتان هەبوو زیاد بکا؛ وەکوو نەخۆشی پێست‌و خروێلکەو ئاوەڵەو سورێژەو ئەو جۆرە نەخۆشییانە! ﴿أَوْ عَلَى سَفَرٍ﴾ یان لە سەفەردا بوون‌و لە ماڵ‌و شوێنی خۆتان دوور کەتبوونەوە ﴿أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ﴾ یان کەسێکتان لەسەراو گەڕایەوە، لەپێشەوە یان لە پاشەوە دەست نوێژی شکابوو ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء﴾ یان لەگەڵ خێزانەکانتان جووت بوون ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء﴾ ئاوتان دەست نەکەوت ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ ئەوە

قەستی گڵو خۆڵێکی پاك بکەنو لەباتی دەست نوێژ تەیەمومی پێ بکەن واتە: هۆی ڕەوا بوونی تەیەمموم چوار شتن:

نەخۆشی، سەفەر، دەرچوونی شت لە پاشو پێش، جووت بوون.

هەرکاتێ یەکێك لەم هۆیانە یان زیاتر هەبوون ئەوە بە گڵو خۆڵی پاکی ڕووی زەوی تەیەموم بکەن: دەمو چاو هەردوو دەستتان تا ئەنیشك بە گڵو خۆڵی پاك مەسح بکەنو ئەمجار نوێژ بکەن.

ئەم ئاسان کردنو ڕوخصەتە بۆ ئێوە لەبەر ئەوەیە تەنگەتاو نەبن، کەوابوو ﴿فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾ بەو خۆڵە پاکە مەسحی دەمو چاو دەستتان بکەن تا ئەنیشك، ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ کە بێگومان پەروەردگار خاوەن عەفوو لێخۆشبوونو لێبووردنە، گوناه دادەپۆشێ، زۆرجار وا دەبێ سزای گوناهبار نادا لەسەر گوناهەکانیان! تێبینی ئەوە دەکرێ کە ڕستەی ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء﴾ ڕوو دەکاتە ﴿أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّن الْغَآئِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء﴾ کەوابوو عوزری تەیەمموم سێ شتن:

سەفەرو نەخۆشیو نەبوونی ئاو بۆ کەسێ لە سەفەر نەبێ. سەفەر عوزری تەواوە بۆ تەیەمموم جا ئاو هەبێ یان نەبێ!

## هەڵسو کەوتی جوولەکەکان

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّواْ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُواْ

سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾ ﴾.

دوای ئــەوە پــەروەردگار لــە ئایەتــەکانی پێــشوودا ئــادەمیزادانی هــەڵنا بــۆ خوداپەرستیو پابەنـدبوون بـە ئـەحکامی شـەرعییەوە، سەرپێچیکارانی بـە سـزا ترسـان، باسـی حـاڵو چـۆنیەتی بـڕێ خـاوەن نامـەکانی کـرد، ئەوانـەی پابەنـدی ئـەحکامی ئـایینی خۆیـان نـەبوون گۆڕانکاریـان لـە کتێبـە ئاسمانییەکەیانـدا کـردو گومڕاییـان کـڕی بـە هیدایـەت، بۆیـەش ئـەم باسانەی هێنایـە پێشەوە بـۆ ئـەوەی موسوڵمانان هۆشیار بکاتەوە کە پێویستە پابەنـدی ئـەو فەرمانانـە بـبن کـە پێیـان کراوە، ترساندنی لەوە کـە ئەگـەر ئـەوانیش ئەحکامـەکانی ئایینەکـەیان پـاش گـوێ بخـەن، هـەمان سـزای کـە ئامـادە کـراوە بـۆ جوولەکـەکان ئـەوانیش دەگرێتــەوە، ئەوانیش ڕۆژی قیامەت ئاواتەخوازی ئەوە دەبن کە ژێر خـاك بکرێنو ئـەو سـزایە نەبینن.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ..﴾ هەنـدێك دەڵێن: ئـەم ئایەتـە دەربارەی جوولەکەکانی مەدینە هاتۆتە خوارێ، ڕیفاعـەی کـوڕی زەیـد یـەکێك بـوو لە پیاوو ماقوڵانی جوولەکە ئەگـەر پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) وتـاری بدایە ئـەم زمـانی بـادەدا دەیگـوت ئـەی (محمـد!) چـاوت لـە ئێمـە بـێ، وا قـسە بکـە ئێمەش تێت بگـەین. ئـەمجار تانـەی لـە ئیـسلام دەداو عـەیبی لێ دەگـرت ئیـتر ئـەم ئایەتە هاتە خوارێ.. ڕاڤەکەرانی تری قورئانیش دەڵێن: (کـەعبی کـوڕی ئەشـرەف) کە یەکێك بـوو لـە مالومـەکانی جوولەکـە، پـاش ڕوودانـی جـەنگی ئوحـوود لەگـەڵ حـەفتا کەسـدا چـوو بـۆ مەککە بۆ ئـەوەی لەگـەڵ قوڕەیـشییەکان پـەیمان لـە دژی پێغەمبەر ببەستنو ئەو پەیمانەی کە لە نێوان پێغەمبـەرو جوولەکەکانـدا هـەبوو هـەڵی وەشـێننەوە، کـەعب کـە چـوو بـۆ مەککـە میـوانی ئـەبو سوفیان بـوو، ئـەبو سوفیان پێی گوت: تۆ پیاوێکی زاناو تەورات خوێنی، ئێمە نەخوێنـدەوارو نـەزانین، پێمان بڵێ: ئێمە لەسەر حەقین یان محمد؟! کەعب وتی: ئادەی ئـایینی خۆتـانم بـۆ

یاس بکەن! ئەبو سوفیان گوتی ئێمە بۆ حاجیان وشتری دوگ گەورە سەردەبڕین، ئاویان دەدەینێ. دەعوەتی میوان دەکەین، دیل بەرەڵڵا دەکەین، صیلەی رەحم بەجێ دێنین، حەجو عومرە دەکەین، تەوافی کەعبە دەکەینو خاوەنی (حەرەم)ین. محمد ئایینی باوكو باپیری خۆی واز لێ هێناوە، صیلەی رەحمی بڕیوە لە مەککە دوورکەوتۆتەوە، ئایینی ئێمە کۆنە ئایینی (محمد) تازەیە، ئیتر کەعب سوێندی خواردو وتی (والله) ئایینی ئێوە راسترەو ئێوە لەسەر حەقن!! ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿أَلَـمْ تَـرَ إِلَـى الَّـذِينَ...﴾ مەبەستی ئایەتەکە کەعبو هاوەڵەکانیەتی[1]

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ﴾ ئەتۆ ئەی محمد! نارِوانی بۆ ئەوانەی کە بەشێکیان لە کتێبی ئاسمان دراوەتێ ﴿يَشْتَرُونَ الضَّلاَلَةَ﴾ گومرِایی دەکرِنو کوفر هەڵدەبژێرن ئیمانو هیدایەت پاشگوێ دەخەن، روو وەردەگێرِن لەو پەیامەی کە خودا بۆ پێغەمبەری خۆی ناردویەتی، ئەو حوکمو یاسایانەی لایانە پاشگوێی دەخەن، فەرمانیان پێ کراوە درۆ نەکەن، ئەزیەتی خەڵکی نەدەن، سوود نەخۆن، بەڵام ئەوان پابەندی ئەو حوکمانە نابن، زانیاریان دەربارەی رەوشتو ئایینی پێغەمبەر هەیە، دەیشێرنەوە بۆ ئەوەی برِێ کاڵای پرِوپووچی دونیایی پێ بکرِن ﴿وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّواْ السَّبِيلَ﴾ دەیانەوەێ ئێوەش لە گەڵیانا گومرِا ببنو رێگەی راستتان لێ هون ببێ، کافر ببن بەونامە پیرۆزەی کە بۆتان نێردراوە کە قورئانە، ئەو زانیاریو شارەزاییو بەختەوەرییەی هەتانە لە کیستان بچێو سەرتان لێ بشێوێ.

﴿وَاللّـهُ أَعْلَـمُ بِأَعْـدَائِكُمْ وَكَفَـى بِاللّـهِ وَلِيًّـا وَكَفَـى بِاللّـهِ نَـصِيرًا﴾ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! خودا لە ئێوە باشتر دوژمنانتان دەناسێو دەتانترسێنێ لێیان، ئێوە خوداتان بەسەو پارێزگاری ئەوتان هەبی پێویستتان بە هیچی تر نیە.

پارێزگاری خودا قەڵایە بۆ کەسێك پەنای بۆ بەرێ، کەسێك خودا یارمەتیدەرو هاریکاری بێ بەسیەتی! بێگومان پەروەردگار ئێوە شارەزای رێگایەك دەکا کە

---

[1] - اسباب النزول للواحدی ص/٨٩

سەرفرازیو خێرو خۆشی ئێوەی تێدایە، هەر ئەو بەسەر دوژمنانتاندا سەرتان دەخاو یارمەتیتان دەدا بۆ کردارێك کە بەرژەوەندی ئێوەی تێدا بێ، ڕێنموییتان دەکا بۆ وەدەستهێنانی هۆکارەکانی سەرکەوتن لە هاریکاریو ئامادە کردنی چەكو پێداویستییەکانی شەڕو بەرگری، کەوابێ جگە لە خوا لە کەسی تر داوای یارمەتی مەکەنو کەسی تر جگە لە خودا بە خودا مەزانن!!!

ئەمجار پەروەردگار مەبەس لەو کتێب پێدراوانەمان بۆ روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ﴾ لەوانەی کە جوولەکەن ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾ ئەوانە گەلو نەتەوەیەکن ئالّو گۆڕ بە وشەو رستە نێردراوانە دەکەن کە خودا لە تەوراتدا ناردوونی، لە شوێنی خۆیان لایان دەدەن، جا لادانەکەیان بەوە دەبێ کە مانای مەبەست لەرستەو وشەکان بشێرنەوەو مانای ناقولاو نادرووستیان بۆ دیاری بکەن، وەکوو لادانی ئەو مزگێنیو بەلێنو دیاردانەی کە دەربارەی پێغەمبەری ئیسلام هاتوون، یان لادانی ئەو دەقانەی دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم هاتوونو دەیبڕن بەسەر کەسێکی ترداو، بەقسەی خۆیان دەلێن: گوایە هەتا ئێستاش ئەو پێغەمبەرە رەوانە نەکراوەو تا ئێستاش هەر چاوەڕوانی هاتنی!! یان لادانەکە بەوە دەبێ کە وشەیەك یان رستەیەك لە شوێنی خۆی هەلبگرێو بیبەیتە شوێنێکی تر، وەکوو ئەوەی ئەو نووسراوانەی لە مووسا بەجێ مابوو تێکەلاو بەو نووسراوانەیان کردن کە زۆر دووای حەزرەتی مووسا نوسرابوونەوە، هەروەکوو قسەی نووسەرانی تەوراتیان تێکەلّ بە فەرمایشتەکانی خودی تەورات کردووە!! کە بە ئیعترافی خۆیان لە باتی تەوراتی فەوتاو نووسیویانەتەوە.

بە خەیالّی خۆیان بەم گۆڕانکارییە، ئیصلاحی تەوراتیان دەکرد ئەم گۆڕانکارییە لەوەوە سەری هەلّداوە کە دوای فەوتانی نوسخە ئەصلّیەکەی تەورات چەند پارچە کاغەزێ تەوراتیان لەسەر نووسرابوو مابوون، مالّەکانیان ویستیان لەم کۆتە کاغەزە تێکەلّو پێکەلانە، تەورات بنووسنەوە.. ئیتر زیادەو دووبارە بوونەوەو کەمو کوڕی تێدا پەیدا بووە. ئەمە راستییەکی مێژوویی چەسپاوو حاشا هەلّنەگرە، مێژوو نووسانو لێکۆلّەرەون ئەم راستییەیان چەسپاندووە.. لە راستیدا ئەو هۆزی جووە یاری کردن بە وشەو دەستکاری کردنی ئایەتەکانی خوداو بێ

ڕێزی کردن بە خوداو بەرنامەی‌و بە پێغەمبەرانی، پیشەی هەمیشەییانە تێکەڵاوی خوێن‌و مۆخیان بووە، بۆیان تەرك ناکرێ، ئەوەتا جوولەکەکانی سەردەمی تۆش ئەی محمد! یاری بە وشە دەکەن‌و وەك پێشینانیان‌و دژ بە تۆ، ڕووبەڕوو بە تۆ دەڵێن: ﴿وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ قسەکەتمان بیست‌و سەرپێچی فەرمانەکەت دەکەین.

موجاهید دەڵێ: بە پێغەمبەریان گوت: قسەکەتمان بیست بەڵام بە گوێت ناکەین. هەروەها لەم ڕوانگەیەوەو لە ڕوانگەی حەسوودی‌و ڕق لێ بوونیانە لە پێغەمبەر دەیانگوت: ﴿وَاسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ﴾ واتە: خودا قسەت لێ نەبیسێ‌و دوعات گیرا نەکا. هەروەها لە هەمان ڕوانگەو سۆنگەوە ﴿وَرَاعِنَا﴾ لە کاتی گوتنی ئەم وشەیەدا زمانیان بۆ خوار دەکردەوە بە جۆرێك دەهاتە بەر گوێچکە کە بە زمانی عیبری جنێو بگەیەنێ، چونکە وشەی (راعنا) وەرگیراوە لە (رعونة) کە بە مانا گێلی‌و گەوجییە، ئەم نامەردانە بە ناپاکی ئەم جۆرە وشانەیان بەکار دەهێنا، کە بە دیمەن قسەیەکی ئاسایی باشە، بەڵام بە مەبەست‌و مەعنا جنێوو ناماقوڵیە، چونکە بە دیمەن مەبەستیان لە (غیر مسمع) دوعای خێری (لاسمعت مکروها) بوو لە (راعنا) (أنظرنا)یە کە بە مانای چاوی خێرت لێمان بێ جا بۆیە پەروەردگار وتی ئەو وشانەی لە موسوڵمانان قەدەغە کردو بەدەقی ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتەی تریش کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقُولُواْ رَاعِنَا وَقُولُواْ انظُرْنَا - البقرة/١٠٤﴾.

ئەم سێ تاوانەیان لەگەڵ پێغەمبەردا کرد، جا یان لە کۆڕو کۆبوونەوەداو بەرەو ڕووی خۆی، یان لەپاش ملەو لە دووری پێغەمبەر! وەك گوتمان بە مەبەستی گاڵتە کردن بە پێغەمبەرو تانە دان لە ئایین دەهاتن‌و وشەیەکیان بەکار دەهێنا دوو مانای هەڵبگرتایە، مانایەکی جنێو سوکایەتی پێ کردن، مانایەکی ڕێزو ئیحترام، ئەوان مەبەستیان جنێو دان‌و سوکایەتی پی کردن بوو نەك ڕێزو ئیحترام ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ﴾ زمانیان خوار دەکردەوەو، وشەکەیان دەگورمان، بۆ ئەوەی لە مانای خێرو ڕێزی لابدەن‌و مانای شەڕو جنێو بگەیەنێ.. واتە: ئەوان بە زمان بادانەکەیان وشەکەیان وا لێ دەکرد، مانا جنێو ئامێزەکە بگەیەنێ: کە لە دڵدا ئەوەیان مەبەست بوو ﴿وَطَعْنًا فِي الدِّينِ﴾ بۆ ئەوەی تانە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام

بدەنو سوکایەتی پێ بکەن، بە ڕواڵەتیش گوایە مانای ڕێزو ئیحترامەکەیان مەبەستە، هەر بەم نیازە پیسە لە کاتی سڵاو کردنیشا لە حەزرەت زمانیان لار دەکردەوەو لە جیاتی (السلام علیکم) دەیانگوت (السام علیکم) واتە: مردن لەسەر ئێوە بێ بۆیە پێغەمبەریش (درووودی خوای لەسەر بێ) لە وەڵامیاندا دەیفەرموو: (وعلیکم)و بەس، واتە: (ئەوەی دەیڵێن لەسەر خۆیشتان بێ).

ئیبنو عەطییە دەڵێ: تا ئێستاش جوولەکەکان منداڵەکانیان فێری ئەو وشانە دەکەن کە دوو مانایان هەیە، مانایەکی ڕێزو باش، مانایەکی جنێوو شەڕ، بۆئەوەی وتو وێژیان لەگەڵ موسوڵمانان پێ ئەنجام بدەنو لە پەنا ئەم وشە دوو مانایانەدا تانەو تەشەر لە موسوڵمانان بدەن، پەروەردگار ئەم بۆنەیە بەهەل دەزانێو شێوەو شێوازی گفتوگۆو وتو وێژی پڕ لە ڕێزو سۆز فێری موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانظُرْنَا﴾ ئەگەر ئەوان بیانگوتایە بیستمانو فەرمانبەر دارین، گوێ بگرە بۆمان چیت پێ دەڵێنو مۆڵەتمان بدەو پەلەمان لێ مەکە با تێت بگەینو بزانین دەڵێی چی ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ﴾ ئەوە ئەو گوفتارە خێر ئامێز بوو بۆیانو وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: هەنگاوێکی ڕاستو دروست دەبوو سوودۆ ئەدەبیشی تێدا دەبوو ﴿وَلَكِن لَّعَنَهُمُ اللّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُونَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ بەڵام بە هۆی بەردەوامیان لەسەر کوفرو بێ باوەڕی کە لە پێشینانە سەرکەشەکانیانەوە بە میراتی بۆیان ماوەتەوە، نایەنە سەر ڕێگەی ڕاستو دینی ئیسلام قبووڵ ناکەن لەبەر ئەوە شایەنی نەفرەتو لەعنەتو ریسوای دونیاو قیامەتن! چونکە ئەوان کافرنو کوفریش دەبێتە لەمپەر لەبەردەم ئادەمیزاداو ناهێڵێ بیر بکاتەوەو فێری ئەدەبو ڕەوشتی باشو قسە کردنی عاقڵانە ببێ. ئەوان بڕوایەکی کەمو بێ بایەخ نەبێ وەدەستی ناهێنن، دڵیان لە خێرو چاکە بێزارەو لێی دوورە پەرێزن! بیروباوەڕێکی باشی سوود بەخشیان ناچێتە ناو دڵەوە کە بیروباوەڕی باشیان نەبوو هیوای کردەوەی چاکیان لێ ناکرێو عەقڵیان مشتتو ماڵ نابێو مێشکیان زاخاو نادرێو دڵو دەروونیان پاك نابێتەوە!

**پەروەردگار فەرمان بە خاوەن نامەکان دەکا ئیمان بە قورئان بهێنن**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾.

ئیبنو ئیسحاق لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) قسەی لەگەڵ سەران‌و ماڵەکانی جوولەکە کرد، کە لەناویاندا عەبدوڵڵای صوریاو کەعبی کوڕی ئەسەدیان تێدا بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! لەخودا بترسن، خۆتان لە سزای بە ئێشی بپارێزن! سوێند بە خودا ئێوە دەزانن کە ئەو ئایینەی من هێناومە راست‌و دروست‌و حەقە! وتیان ئەی (محمد!) شتی وامان نەبیستووە، ئاگامان لە پێغەمبەرایەتی تۆ نیە. ئینکاری زانیاری خۆیان کردو سوور بوون لەسەر کوفری خۆیان، جا پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خواری‌و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی نامەی ئاسمانیتان بۆ نێردراوە! کە تەورات‌و ئینجیلە، هەرچەندە لەجیاتی هیدایەت گومڕاییتان هەڵبژاردووە بڕێ لە ئایاتی نامەی خۆتان فەوتاندووەو بڕێکتان گۆڕیوە، ئێستاش دەرگای تۆبەو گەڕانەوەتان بۆ والآبە هەبوونی ئیمانتان بە تەورات‌و ئینجیل دەبێ سەربکێشێ بۆ بڕوا هێنان بەو کتێبەی کە پشتگیریان لێ دەکا، کە قورئانەو بۆ محمد نێردراوە، کەوابوو ﴿آمِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم﴾ ئیمان بێنن بەو کتێبەی کە ناردوومانە بۆ محمدو پشتگیری کتێبی ئێوەو کتێبە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەکاو لە بنەما سەرەکییەکاندا لەگەڵ ئەواندا یەك دەگرێتەوە، هەرچەندە لەگەڵ کتێبی دەست لێدراوی ئێستای ئێوەدا جیاوازی هەیە، بەڵام لەگەڵ ناوەڕۆك‌و بنەما سەرەکییەکانی هەموو کتێبە

ئاسمانییەکاندا یەك دەگرێتەوە کە بریتین لە یەکتاپەرستیو دوور بوون لە هاوەڵ پەیداکردن بۆ خوداو خۆپاراستن لە تاوانی ئاشکراو نهێنیو پشتگیری ئەو هەواڵانەی کە مژدەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامیان لە خۆگرتووە ئەمانەش بنەماو ئامانجی سەرەکی ئایینی خودان بە گشتی.

قورئان لێرەدا روو دەکاتە خاوەن نامەکان لەم رووەوە کە نامەی ئاسمانییان دراوەتێ، هاتوون هەندێکیان گۆڕیوەو هەندێکیان فەوتاندووە، کەوابوو نامە ئاسمانییەکەی خۆیان لەسەر دەقی خۆی نەماوە، تەزویرە، ئەمەش داخوازی ئەوەیە کە بڕوا بە قورئان بکەنو هەوڵ بدەن چی زووە تۆبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆلای خودا، چونکە ئەوان دەربارەی تەورات کەمتەرخەمیان کردووەو شیاوی سزان.

لەلایەکی ترەوە ئەوەی کە داخوازی ئیمان هێنانیانە بە پێغەمبەری ئیسلام ئەوەیە: کە هەموو ئایینە ئاسمانییەکان لەسەر بنەما سەرەکییەکان کۆکن! هەموویان بانگەوازی دەکەن بۆ یەکتاپەرستیو شەریك بۆ خودا قەرار نەدانو ئەخلاق بەرزیو دوور کەوتنەوە لە تاوان بە نهێنیو بە ئاشکرا.

قورئانی پیرۆز جەختی لەسەر پێغەمبەرایەتی داودو سلێمانو مووساو عیساو ئیبراهیمو نوحو پێغەمبەرەکانی تریشی کردووەو وەسپی داون، دەی چۆن شوێنکەوتوانی ئەو پێغەمبەرانە ئیمان بە قورئانو پێغەمبەرایەتی محمد ناهێنن؟؟ لەکاتێکا قورئان پشتگیری ئایینو پێغەمبەرایەتی ئەوان دەکاو یەکسان لەگەڵ ئایینی ئیبراهیم، کە لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی دامەزرا بوو، ئەی محمد! پێیان بڵێ: ئیمان بهێنن بەو کتێبەی ناردومانەتە خوارێ کە قورئانە، هەموو کتێبە ئاسمانییەکان لەیەك سەرچاوە هەڵگیراونو یەك ئامانجیان هەیە!

ئەمجار هەڕەشەیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا﴾ ئیمان بهێنن پێش ئەوەی دەمو چاویان بگۆڕێن، نیشانەی دەمو لێوو چاوو لوتیان بکوژێننەوە وەکوو پشتە ملیان سافو بێ نیشانە بێ، هیچ شوێنەواری دەمو لوتو گوێچکەیان نەمێنێ! ﴿أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ﴾ یان بە هیلاکیان بەرینو بیان فەوتێنین، یان سزایان بدەین بە مەسح کردنو گۆڕینیان بە بەرازو مەیمون، وەکوو چۆن نەیمان لێ کردن کە لە رۆژی شەممەدا راوەماسی نەکەن،

کەچی ئەوان پێچیان لێ داو لە جومعەدا دەچوون گۆماویان پڕ دەکردن و کە دەریا شەپۆلی دەهێنان و دەبردن گۆلاوەکان ماسییان تێ دەچوو، داویی کە ئاوەکە دەکشایەوە ماسییەکان لە گۆلاوەکاندا دەمانەوە، ئەمجار رۆژی یەك شەممەی دەچوون ماسییەکانیان راو دەکردن! ئێمەش لە تۆڵەی ئەم لاسارییانەیاندا مەسحمان کردن و کردمانن بە مەیمون و بەرازو نەفرینمان لێ کردن ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً﴾ فەرمانی خودا کەبە وشەی (كن فيكون): (ببەو دەبێ) دێتە کایەوە جێبەجێ کراو ئەنجام دراوەو کەس ناتوانێ ببێتە لەمپەرو پشتگیری لێ بکا. کە فەرمانی کرد کەس نیە بڵێ نابێ ببێ! یان مەرجی بۆ دانێ! کەوابێ بترسن لە هەڕەشەی و خۆ بپارێزن لە سزای! خودا دەسەڵات و توانای رەهایە، هەرکە ویستی شتێك ببێ، دەبێ.

ئیبنو عەبباس دەڵێ مانای وایە کەس نیە حوکمی خودا رەت بکاتەوە، فەرمانی هەڵبوەشێنێتەوە، ئەگەر ئیمان نەهێنن یەکێ لەو دوو سزایە روویان تێ دەکا. بێگومان ئەم هەڕەشەیە لەسەردەمی پێغەمبەردا هاتە دی، ئەوە بوو (بەنی نەضیر) تووشی ئەهامەتی هاتن و لە ماڵ و حاڵی خۆیان وەدەر نران، بەنو قورەیظەش بە هیلاك بران!

موبەرید دەفەرموێ: ئەو هەڕەشەیە بەردەوامەو چاوەڕوان کراوە، دەبێ پێش رۆژی قیامەت جوولەکە ئەم طەمس و مەسحەیان بەسەر بێ. بە کورتی پێیان دەڵێ: ئێوە دەزانن کە خودا دەرحەقی گەلە پێشینەکان هەڕەشەکانی هێناوەتە جێ ئێوەش بترسن و ئاگادار بن لە هەڕەشەکانی ئەمین مەبن.

## ئەوەی خودا چاوپۆشی لێ دەکاو ئەوەی چاوپۆشی لێ ناکا

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی لە خاوەن نامەکان کردو ترساندنی لەوە کە ئەگەر ئیمان نەهێنن ئەو هەڕەشەیەی لێی کردوون ئەنجامی دەدا.

ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەو هەڕەشە کردنە لەسەر کوفری صەریحو شەریك بۆ خودا قەرار دانە، بەڵام تاوانەکانی تر وێ دەچێ خودا لێیان خۆش ببێ بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء﴾ بێگومان پەروەردگار خۆش نابێ لە کەسێك شەریك بۆ خودا دابنێ، خودا خۆش نابی لە بەندەیەك بە موشریکی مرد بێ، مەبەست بە شیرك کوفری گشتییە کە شێوەی کوفری جوولەکەکانیش دەگرێتەوە، جگە لە تاوانی شیرك بەم مەبەستە گشتییە ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ لە تاوانەکانی تر خۆش دەبێ، کەسێك هاوەڵ بۆ خودا دابنێ تاوانی گەورەی ئەنجام داوەو ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتە بمرێ خودا لێی خۆش نابێ.

طەبەری دەڵێ: ئەم ئایەتە ئەوەی روون کردۆتەوە کە هەرکەسێك تاوانی گەورەی لەدەست قەومابێ دەکەوێتە بەر ئارەزووی خودا خۆی، مەیلی لێ بێ لێی خۆش دەبێو مەیلی لێ بی سزای دەدا بەمەرجێ تاوانەکەی هاوەڵ دانان بۆ خودا نەبێ.

﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا﴾ هەرکەسێك هاوەڵ بۆ خودا دابنێ، پێی وابێ جگە لە خودا کەسێکی تریش بەدیهێنەرە، یاسادانەرە، حەرامو حەڵاڵ دەست نیشان دەکا، ئەوە تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوەو تاوانەکانی تر لە ئاستیا خۆ بە بچووك دەنوێنن.

### پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە هاوەڵ بۆ خودا دانان دوو جۆرە:

یەکەم: شەریك بۆ دانان لە خودایەتی (الألوهیة)دا، وەکوو ئەوەی یەکێکی تر بکەی بە هاوەڵی خوداو دەسەڵاتی هەڵسوڕانو بەدیهێنەری بۆ دیاری بکەی.

دووەم: شەریکی لە ربوبیەتدا وەکوو ئەوە دەسەڵاتی یاسادانانو دەست نیشان کردنی حەڵاڵو حەرام جگە لە خودا بۆ یەکێکی تریش بە ڕەوا دابنێو پێت وابێ

کە جگە لە خودا بەبێ وەحیو نیگای خودا کەسێکی تر هەیە دەتوانی شەریعەت دابنێو حەڵاڵو حەرام دیاری بکا.

بەڵام ئەمە مانای وانیە کە دەوڵەتی ئیسلام بۆی نیە یاسای مەدەنی دابنێ بۆ بەڕێوە چوونی کاروباری گەلی ئیسلام، بەمەرجێ ئەو یاسا شارستانیانە لە جەغزی ئیسلام دەرنەچنو بۆ بەرژەوەندی گەلی ئیسلام بنو دژی دەقی قورئانو صەحیحی سوننەت نەبن، وەك یاسای هامشۆی ڕێگاوبانو خانووبەرە دروست کردنو ژن هێنانو کڕینو فرۆشتنو......هتد.

قورئان دەربارەی ئەهلی کیتاب دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ – التوبة/٣١﴾.

پێغەمبەر (درووردی خوای لەسەر بێ) ڕاڤەی ئەم ئایەتەی وا کردووە کە ئەوانە مالمو قەشەکانی خۆیانیان کرد بوو بە یاسا دانەرو فەرمانڕەوا، وەکوو خودا بە گوێیان دەکردنو شوێنیان دەکەوتنو ئەحکامی حەڵاڵو حەرامیان لێ وەردەگرتن. ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە خاوەن نامەکان بۆیە بە موشریك حسێب کراون چونکە عوزیرو عیسایان بە خودا داناوەو دەسەڵاتی بەدیهێنەریان بۆ چەسپاندوون ئولوهییەتیان بۆ قەرار داون. بۆ مالمو قەشەکانیشیان دەسەڵاتی حەڵاڵ کردنو حەرام کردنیان دابوونێ!

بۆیەش شیرك ئەوەندە قیزەونە چونکە درۆیەکی پەتییە بەختانێکی بێ پەردەیەو، هێلانەی هەمووشتێکی پڕوپووچو بە تاڵە، هەموو تاوانێك لەوەوە سەر هەڵدەدا، ژیانی تاكو کۆمەڵ دەڕوخێنێ، لەگەڵ عەقڵو هۆشدا دژایەتی هەیە، لەگەڵ دڵو دەروونی پاکدا ناگونجێو ناهێڵێ نووری ئیمان بچێتە ناو دڵەوە.

بە پێچەوانەشەوە یەکتاپەرستی دەروون بەرزیو سرووشتپاکی تێدایەو ئادەمیزاد لە بەندایەتی کردن بۆ ئادەمیزاد رزگار دەکاو بەرزی دەکاتەوە بۆ پایەی پیرۆزی خوداپەرستیو پشت بەستن بە خوداو ئیخلاصی بۆ زاتی پاکی، ئەمانەش هەموو ئارامی بە دڵو دەروون دەگەیەنن! روح مشتو ماڵ دەکەنو چرای دڵ رۆشن دەکەن وا لە ئادەمیزاد دەکەن یارمەتی خودای دەست بکەوێو پشت بە

سەرچاوەی هێزو دەسەلات ببەستێ‌و لە تەنگ‌و چەڵەمەی دونیاو قیامەت رزگاری ببێ.

زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە موخەصیص‌و تایبەتکارە بۆ ئایەتی سوورەتی (الزمر) کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ – الزمر/٥٣﴾.

دەڵێن: کە ئەم ئایەتەی سورەتی (الزمر) هاتە خوارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چووە سەر دوانگەو بەسەر خەڵکەکەدا خوێندییەوە، پیاوێك هەستایە سەر پێ‌و وتی ئەی پێغەمبەری خودا! شەریك بۆ خودا دانانیش لێخۆشبوونی هەیە؟؟ پێغەمبەر بێ دەنگ بوو، ئەمجار پیاوێکی تر هەستاو وتی ئەی رەوانە کراوی خودا! هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خوداش لێخۆشبوونی هەیە؟؟ پێغەمبەر بێ دەنگ بوو دوو جار یان سێ جار ئەم پرسیارەی ئاراستە کرا ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ....﴾ هاتە خوارێ.

## چەند نموونەیەکی تری خاوەن نامەکان‌و سزای ئەو کردەوانە

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَـٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ أَمْ

لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ ٱلْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۖ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: جوولەکەکان منداڵەکانیان پێش دەخستن نوێژیان پێ دەکردن‌و پێیان وابوو بێ گوناهن‌و تاوانیان لەسەر نیە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

کەلبی دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی چەند کەسێکی جوولەکە نازڵ بووە کە منداڵەکانیان هێنایە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتیان: ئەی محمد! ئایا ئەم منداڵە بچکۆلانەی ئێمە گوناهیان لەسەرە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نەخێر، وتیان: سوێندمان بەو کەسەی سوێندی پێ دەخۆین ئێمەیش وەکوو ئەوان بێ گوناهین!! هەر گوناهێکی بە ڕۆژ بیکەین شەو لەسەرمان ڕەش دەکرێتەوە، هەر تاوانێکی بە شەو بیکەین بە ڕۆژ لەسەرمان ڕەش دەکرێتەوە. ئەمەیە کە پاکانەیان بۆ خۆیان کردووە.

حەسەنی بەصری‌و قەتادە دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی جوولەکەو فەلە هاتۆتە خوارێ کە گوتیان ﴿نَحْنُ أَبْنَاء اللّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ – المائدة/١٨﴾ یان کە دەیانگوت: ﴿لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى – البقرة/١١١﴾.

بەهەرحاڵ هۆی هاتنەخوارەوە، ڕێ لە گشتایەتی‌و عومومییەتی دەق ناگرێ وەك زانایانی تەفسیرو ئوصووڵ دەفەرموون: (عیبرەت بە مانای گشتی دەقە، نەك بە هۆی هاتنی!)

ئیتر بۆ رەتدانەوەی ئەو خاوەن نامانە پەروەردگار فەرمووی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمْ﴾ ئایا نابینی تۆ ئەی محمد! سەیری حاڵو چۆنیەتی ئەوانە ناکەی؟ کە مەدحی خۆیان دەکەنو لافی رەوشتو رێزێك بۆ خۆیان لێ دەدەنو کە تیایانـدا نیە، دەڵێن: ئێمە کوڕی خوداین، خۆشەویستی خوداین، دەڵێن ئێمە گەلو نەتەوەی هەڵبـژێردراوی خـوداین، دەڵـێن: کەسـێك جوولەکـە یـان مەسـیحی نـەبێ ناچـێتە بەهەشـتەوە، دەڵـێن کوڕەکانمـان مـردوون بۆمـان بوونـە قوربـانی، بـاوكو باپیرمـان شەفاعەتمان بۆ دەکەنو پاکانەمان بۆ دەکەن، چونکە لای خـودا رێـزدارنو قسەیان وەردەگرێ! پەروەردگار رەدیان دەداتەوەو دەفـەرموێ: ﴿بَلِ اللّـهُ يُزَكِّـي مَـن يَـشَاءُ﴾ پاکانە کردن بۆ خۆیان هیچ نرخو بەهایەکی نیە، پاکانە کردن بە قسە نابێ، دەبـێ بە کردەوە بێ، خودا کەسـێکی بـوێ پـاکی دەکاتـەوە، یارمـەتی دەدا بـۆ ئەنجامـدانی کردەوەی باش، هیدایەتی دەدا بۆ بیروباوەڕی راستو ئەخلاقو رەوشتی بەرزی فێر دەکا ﴿وَلاَ يُظْلَمُونَ فَتِـيلاً﴾ پـەروەردگار هـیچ شـتێك لەپاداشـی کـردەوەی باشـی ئـەو پاکانە کەرانە کەم ناکاتەوە پاداشی خۆیان بە تەواوی دەداتەوە.

### ئایەتەکە دوو شتی سەرەکی لێ وەردەگیرێ:

١- پــەروەردگار پاداشــی کــردەوەی کرداریاشــان دەداتــەوە تەنانــەت ئەگــەر موشریكو خوانەناسیش بن! چونکە ئەو کردەوە باشە کاریگەری لـە دڵو دەروونـی خاوەن کردەوەکەدا هەیەو شایانی پاداشە، لـە دۆزەخـدا بـە هـۆی کـردەوەی باشـەوە سـزای لـەوانی تـر سـووکترە! لـە فـەرموودەی پێغەمبـەردا هـاتووە کـە بـڕێ لـە موشـریکەکان بـە هـۆی کـردەوەی باشـیانەوە لـە دۆزەخـدا سـزایان لەسـەر سـووك دەکرێ:

حاتـەمی طـائی بـەهۆی سـەخاوەتەوە، ئـەبو طـالیبی مـامی پێغەمبـەر بـەهۆی پشتگیریو سەرپەرشتیاری کردنی بۆ پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئـەبو لەهەب، چونکە کاتێ کـە جاریيەکـەی کـە نـاوی (ثـووەیبـە) بـوو مزگێنـی لـە دایك بوونی پێغەمبەری پێ دا (ثوومیبە)ی ئازاد کرد.

٢- موسوڵمانان دەترسێنێ لەوە کە بە ئایینی خۆیان نەنازنو وەکوو خاوەن نامەکان نەکەن، خۆیان بپارێزن لە پاکانە بۆ خۆکردنو قسە زلو کەشو فش. ئەوەش بزانن کە خودا محابات بۆ کەس ناکاو منەتی لەکەس نیە، نە موسوڵمانو نە جوولەکەو نە مەسیحی! ئەی ئەوە نەبوو سەروەری پێغەمبەران، خۆشەویستی خودا؛ حەزرەتی محمد لە جەنگی ئوحوود سەری شکا، ددانی شکاو کەوتە چاڵەوەو تووشی نارەحەتیو ناخۆشییەکی تەواو هات بەهۆی کەمتەرخەمی بڕێ لە جەنگاوەرانی، کە قسەو ئامۆژگاری پێغەمبەریان شکاندو سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵ کرد! هەروەها داوا لە موسوڵمانان دەکا کە قورئان بکەنە مەشخەڵی ڕێگای ژیانیانو شوێن وەسوەسەو چاووراوی دەجالو ڕەفتار جەجالەکانو هەلپەرستو لە خشتەبەران نەکەون.

ئەمجار پەروەردگار سەرسوڕمانو تەعەجوبی خۆی لە حاڵەتی ئەوانی دووبارە کردەوە، ئەو حاڵەتو چۆنیەتییە سەرنج ڕاکێشەی کە لە ئایەتی پێشوو وەرگیرا دووبارە کردەوەو فەرمووی: ﴿انظُرْ كَيفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الكَذِبَ﴾ سەیربکە: چۆن بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستنو پاکانە بۆخۆیان دەکەن! پێیان وایە زێدە ڕێزیان بەسەر خەڵکی ترەوە هەیە. ﴿وَكَفَى بِهِ إِثْمًا مُّبِينًا﴾ بەسە بۆ تاوانباریو خوانەناسییان ئەم درۆو قسە هەڵبەستنە ئاشکرایەیان، چونکە خودا هیچ کاتێك عادەتی وا نیە کە گەلو نەتەوەیەکی تایبەتی مامەڵەیەکی تایبەتی بۆ بکا، بەڵکوو خودا پاداشو سزا بە گوێرەی کردەوە دەداتەوە هەرگیز سەیری ئەوە ناکا ئاخۆ لە چ گەلو نەتەوەیەکەو کوڕی کێیەو کچی کێیە! ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾.

ئیبنو عەبباس دەڵێ: هەندێ مالی جوولەکە هاتنە لای قوڕەیشییەکان، پیاوانی قوڕەیش وتیان ئەمانە زاناو شارەزای ئایینو کتێبە ئاسمانییەکانن لێیان بپرسن ئاخۆ ئایینی ئێمە باشترە یان ئایینی محمد؟

پرسیاریان لێ کردن، مالەکان وتیان: ئایینی خۆتان باشترە لە ئایینی محمد، ئەو ڕێگایەی ئێوە لەسەرینی لە ڕێبازی محمد ڕاست ترە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خواری کە دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ بڕوانە ئەوانەی کە بەشێکیان لە کتێبی ئاسمانی پێ دراوەو تەورات دەخوێنن چۆن ماستاو بۆ کافرەکانی قوڕەیش دەکەنو ئیمان بە بتو صەنەم دێنن، یارمەتی کافرەکان دەدەن، دژی موسوڵمانان، هەموو پێداویستییەکیان بۆ دابین دەکەن، شایەتی بە درۆیان بۆ دەدەن.

﴿وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَـؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلاً﴾ دەڵێن: کافرو موشریکەکان ئایینەکەیان راستەو حەق ترە لە ئایینو رێبازی ئەوانەی ئیمانیان بە پەیامی محمد هێناوە، بەڕاستی ئەو خاوەن نامانە، ئەو مالەو خۆ بە زانا زانانە لە رێنومایی عەقل بێ بەش بوون، بناغەی ئایینی خۆیان روخاند لە حەق لایان داوە، بانگی ستەمکارییان هەڵدا کاتێك بوونە پاڵپشتو یارمەتی دەری شیركو بتپەرستیو خوداو پێغەمبەریان بە درۆ خستەوەو نەهاتنە سەر ئایینی راستو خوایان بە حەق نەناسی!!

﴿أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللّهُ وَمَن يَلْعَنِ اللّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا﴾ ئەوانە ئەو تاقمو کۆمەڵەن کە خودا نەفرینی لێ کردوونو لە رەحمەتو بەخششی خۆی دووری خستوونەوە، کەسێکیش خودا نەفرینی لێ بکا کەسی دەست ناکەوێ یارمەتی بدا، بێ پشتیوانو پشتگیر دەمێنێتەوە!

﴿أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لاَّ يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا﴾ ئەوان هیچ بەشو بارێکیان لە پادشاییو فەرمانڕەوایی دا نیە چونکە ستەمکارو ملهوڕو رژدو چروکن، خود پەسەندو خۆ خۆشەویستن، بە سروشت خۆپەرستو ماددە پەرستن، لە خۆرازیو درۆزنو بەخیلن! خۆ ئەگەر شتێکیان بەدەست بێ بە ئەندازەی (نەقیرێك) تویکڵی ناوکی دەنکە خورمایەکی لێ نادەن بە کەس، دەی خۆ فەرمانڕەواییو پادشایی پێویستی بە نەفس بەرزیو خۆ بەخت کردنو یارمەتیدانی خەڵكو جێبەجێ کردنی کاری لێقەوماوانو ئاتاجان هەیەو دەبی گیانی تەضحیەو فیداکاریو جوامێری تێدا بێ!

﴿أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ﴾ ئەمجار لۆمەیان دەکا لەسەر ئەو حەسوودیو چاو بڕینەیان لەماڵی خەڵك کە زۆر لە چروکییەکەیان خراپترە،

ئەوان ئەوەندە حەسوودن ئاواتەخوازی ئەوەن کە خێروبێری جیهان هەمووی بۆ ئەوان بێ، دەیانەوێ نازو نیعمەت هەمووی هەر بۆ ئەوان بێ، نایانەوێ کەسی تر نازو نیعمەت ڕێزێکی هەبێ، ئەوانە کۆمەڵێکی خۆپەرستو ئەنانین، دڵ پیسو حەسوودن، بۆیە حەسوودی بە پێغەمبەری ئیسلام (محمد) دەبەن کە خودا ڕێزی پێغەمبەرایەتیو زانستو فەرمانڕەوایی‌و دۆستو یارو یاوەری زۆر داوێ. جا باش بزانن کە دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی، ماڵو دارایی‌و ڕێزو پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی تایبەت نیە بە ئەوانەوەو پەروەردگار بە ئارەزووی خۆی دەیدا بە هەرکەسێك شایانی بێ.

﴿فَقَدْ آتَيْنَآ آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾ ئەوانە بە هەڵە چوون ناشێ حەسوودی بە محمد بەرن، چونکە وێنەی محمد زۆرن، بێگومان پەروەردگار پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی‌و ڕێزو نرخی داوە بە خانەوادەی ئیبراهیم کە عەرەبە قورەیشییەکان لە نەوەی ئەون، پەروەردگار کتێبی ئاسمانی داوە بە ئیبراهیم کە شەریعەتو یاسای تێدا بوو، حیکمەتو تێگەیشتنی تەشریعی، پێغەمبەرایەتی بۆ خۆی‌و کوڕو نەوەکانی، ملكو سەڵتەنەتی بەرفراوان بۆ کوڕو نەوەکانی! ئەمەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە موسوڵمانان موڵكو دەسەڵاتو سەڵتەنەتێکی گەورەیان دەست دەکەوێ! ئەمە جگە لەوەی کە بەرزترین پلەو پایەو بەهرە کە پێغەمبەرایەتی‌و قورئانو حیکمەتە دراوە بە پێغەمبەرەکەیان!

﴿فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ وَكَفَى بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾ ئەو پێغەمبەرە پێشینانە وەکوو ئیبراهیم‌و نەوەکانی لەگەڵ ئەوەشدا کە خانەوادەی پێغەمبەرایەتی بوونو موڵكو سەڵتەنەتیان درابوویە کەچی گەلەکانیان هەموویان بڕوایان بە پێغەمبەرایەتییەکەیان نەهێناوە، بەڵکوو هەیان بوو ئیمانیان پێ هێنانو هەیان بوو پشتیان هەڵکردو لەسەر کوفرو بێ دینی خۆیان مانەوە، کەوابێ سەرت سوڕنەمێنێ ئەی (محمد!) لە هەڵوێستی قەومەکەت، ئەمە دابو نەریتی گەلو نەتەوەکانە لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا ئەمەش دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی صەبرو ئارامی بە هێز تر بێ بەرامبەر بە ئازاردانی گەلەکەی‌و نائومێد نەبێ لە ئیمان هێنانیان.

قورطوبی دەفەرموێ: ﴿فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ﴾ واتە: هەنێکیان ئیمانیان بە پێغەمبەر هێنا. ﴿وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾ واتە: هەنێکیان ئیمانیان پێ نەهێنا.. بڕێکیش دەڵێن: ضەمیرەکەی (بِهِ) دەگەڕێتەوە بۆ ئیبراهیم، بڕێکیش دەڵێن: دەگەڕێتەوە بۆ (الكتاب).

جا ئەو گومڕایانەی کە نایەنە سەر ڕێگای ڕاست ئەگەر لەم دونیایەشدا سزایان وێ نەکەوێ ئەوا سزای قیامەتیان بەسەو ئاگری دۆزەخ کیفایەتە.

## سزای کافرانو پاداشی موسوڵمانان

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ﴾.

ئەمجار لەم دوو ئایەتەی دوایی دا سزاو پاداشی هەردوو تاقمی باسکراو لە ئایەتەکانی پێشوودا ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا﴾ ئەوانەی کافر بوون بەو ئایاتو بەڵگانەی ناردوومانە بۆ سەر پێغەمبەران بە تایبەتی ئەوانەی بڕوایان بە قورئان نەکردو گوێیان بۆ ئەحکامو ئامۆژگارییەکانی شل نەکرد، کە دوا کتێبی تەواوو بێ خەوشو نێردراوی خودایە بۆ سەر ئادەمیزاد، لە ئایندەدا دەیانخزێنینە ناو ئاگری سوتێنەری دۆزەخەوە، ئەو سزاو سوتاندنەیان هەمیشەیی‌و بەردەوامە ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا

غَيْرَهَا﴾ هەرکاتێ پێستیان سوتاو وای لێ هات هەستی ئازار نەگوێزێتەوە بۆ دەماغ، ئەوا پێستی تازەیان بۆ دروست دەکەینەوە کە هەست بە ئازار بکەن.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تبدل جلودهم كل يوم سبع مرات) هەموو رۆژێ حەوت جار پێستیان دەگۆڕدرێ.

خوالێخۆشبوو دکتۆر عەبدولعەزیز ئیسماعیل پاشا لە کتێبی (الإسلام والطب الحديث)دا دەفەرموێ: حیکمەت لە گۆڕینی پێستەکانیاندا ئەوەیە: ئەو رەگانەی ئازار دەگوێزنەوە بۆ سەنتەری هەست لە مێشکدا لە توێی پێستدان، بەڵام ماسولکەو ریشاڵەکانی ژێر پێست هەست کردن بە ئازار تێیاندا کەمە. بۆیە پزیشکەکان دەڵێن: سوتانی وا کە لە پێست تێپەڕ نەکا ئازاری زۆرە بە پێچەوانەوە سوتانی زۆر قووڵ کە بگاتە ماسولکەو ریشاڵەکان هەرچەندە سامناکەو ترسی مردنی لێ دەکرێ ئەو ئازارەی نیە.

گۆڕین و تازە کردنەوەی پێستەکان ﴿لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ﴾ بۆ ئەوەیە ئازارەکەیان بەردەوام بێ و کۆتایی پی نەیە، بەمەش ئەو وەهم و خەیاڵەی لابرد کە بگوترێ: ئەوانە لەگەڵ ئازارەکەدا رادێن و ئازارەکەیان بەلاوە ئاسایی دەبێ.

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر هۆی سزادان و بە توانایی خودا لەسەر ئەنجامدانی ئەو سزادانە دووبارە دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ دڵنیابن کە خودا باڵادەست و زاڵ و بە توانایە بەسەر ئەنجامدانی هەر سزایەك کە بیەوێ بیسەپێنێ بەسەر تاوانباراندا، دادوەرو دانایە دادوەرانە سزای تاوانباران دەدا. بە گوێرەی حیکمەت و دانایی نەبێ سزای کەس نادا، عەدل و دادیش ئەوە دەخوازێ کە کوفرو تاوان ببنە هۆی تۆڵەو سزای دۆزەخ؛ ئیمان و کردەوەی چاکیش ببنە هۆی دەستەبەرکردنی نازو نیعمەتی خودایی و چوونە ناو بەهەشت، هەموو کردەوەیەك سزاو پاداشی شیاوی هەیە، بۆیە لێرەدا پاداشی کردەوەی باشی موسوڵمانانی خستە پەنا سزای کردەوەی کافران بۆ جیاوازی خستنە نێوانیان و فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو بروایان هەیەو کردەوەی چاك دەکەن ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ بەزوویی دەیانخەینە ناو باغ و باغاتی بەهەشتەوە کە بە ژێر دارەکانیاندا جۆگەو جۆبار

دەکشێن‌و جوانی پڕ لە ئەفسوناوی دەبەخشن، خۆشی‌و لەززەت‌و رابواردنەکەیان بۆ قەشەنگ دەبێ، ئەم نازو نیعمەتە کاتی‌و دەمدەمی نیە بەڵکوو ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، بەجێی ناهێڵن‌و ناگوێزنەوە، دڵیان پێی خۆشە هەولی گواستنەوەو لێ دەرچوون لێی نادەن، لێ وەرز بوون‌و دۆش دامانی تێدا نابینن.

ئەمە پاداشی باوەڕو کردەوەی چاکیانە وێڕای ئەو جێ‌و شوێنە رازاوەو هەبوونی ئەو کەشە خۆش‌و هەوا سازگارو دیمەنە دڵڕفێنانە، ﴿لَّهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ خێزانی بێ عەیب‌و نەنگیان هەیە، پاکن لە نەنگی جەستەیی‌و بەدوورن لە خەوشی رەوشتی‌و سروشتی، شتێك نیە حاڵەتی کەیف خۆشییان لابەرێ، کۆنترۆڵی تەندروستی تێك بدا، ﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلاًّ ظَلِيلاً﴾ دەیانبەینە شوێنێکی سێبەری فێنکی دڵڕفێن‌و خۆش‌و سازگاری وا کە نەسەرمای لێ بێ نە گەرما، ئەمەش ئەوپەڕی خۆش رابواردن‌و نازو نیعمەتی رازاوەیە!

تێبینی ئەوە دەکرێ تەعبیری قورئان لێرەدا بۆ سزای کافرەکان‌و وشەی (سوف)ەی بەکار هێناوە کە لە زمانی عەرەباندا بۆ ئایندەی دوورە، وە بۆ پاداشی موسوڵمانانیش وشەی (س)ی بەکار هێناوە کە لە زمانی عەرەباندا بۆ ئایندەی نزدیکە، وەك ئەوە فەرمووی: (سندخلهم) ئەمەیش ئاماژەیە بۆ گەیاندنی ئەم مەبەستە ناسك‌و نازدارە کە هەر زوو دەستیان دەکەوێ‌و دەخرێنە بەهەشتەوەو بەو شوێنە شاد دەبن، بەڵام وێ دەچێ کافرەکان لە دەشتی مەحشەردا بۆ ماوەیەك بمێننەوە، گەرچی نارەحەتی‌و غەم‌و پەژارەی دەشتی مەحشەریش بۆ خوانەناسان زۆر ناخۆشە بەڵام لە چاو سزای دۆزەخدا، قەترە بە دەریایە، جا پاش مەینەت‌و سەخڵەتی دەشتی مەحشەر رەهەنەی ناو ئاگر دەکرێن‌و دەخرێنە ناو دۆزەخەوە!! خوا پەنامان بدا!

## یاسای حوکمڕانی لە ئیسلامدا: گەڕانەوەی سپاردەو مافەکان بۆ لای خاوەنەکانیان عەدالەتکاری، فەرمانبەرداری خوداو پێغەمبەر

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا پاداشی چاکەکارانی دیاری کرد، موناسیبو گونجاوە کە هەندێ لە کردەوە سەرەکییەکانیان دەست نیشان بکا کە بریتین لە پایە گرنگەکانی پرۆگرامو دەستووری حوکم لە ئیسلامداو فەرمووی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ پەروەردگار فەرمانتان پێ دەکا کە ئەمانەتەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەم ئایەتە هەرچەندە هۆی نازڵ بوونەکەی هۆیەکی تایبەتییە، بەڵام وەکوو دەڵێن: لە هەموو ئایەتەکانی قورئاندا (عیبرەت بە مانا گشتییەکەی وشەکەیە نەك بە تایبەتمەندی هۆکارەکەی) کە وابوو ئایەتەکە فەرمانێکی گشتییە بۆ موسوڵمانان کە سپاردەکان بدەنەوە بە خاوەنەکانیان، هەر سپاردەیەکت لە ژێر دەستدا بوو دەرحەق بە خودی خۆت، دەرحەق بە بەندەکانی خودا، دەرحەق بە پەروەردگار پێویستە بیگەڕێنیەوە بۆ خاوەنەکەی!

ریعایــەت کردنــی ئەمانــەت دەرحــەق بــە پــەروەردگار ئەوەیــە: پابەنــدی فەرمانەکانی بـین، خۆمـان لـە نەهییـەکانی بپارێزین، جەسـتەو ئەنـدامو هەسـتو شعورەکانمان لەوشتانە بەکاربهێنین کە دەبنە جێگای ڕەزامەندی ئەو.

ئەبو نەعیم لە (ئەلحولیـەدا) فەرمووده‌یـەکی مـەرفوعی لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسعوود کە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسـەر بـێ) بـە مـەرفوعی ڕیوایـەتی کردووە، دەگێڕێتەوە دەڵێ: فەرموویـەتی: «الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُكَفِّرُ الذُّنُوبَ كُلَّهَا» یان فەرمووی: «کل شيء إلا الأمانة».

واتە: شەهید بوون لە پێناو خودادا هەموو تاوانو گوناهێ دەسڕێتەوە، جگە لە ناپاکی لە سپاردە! خیانەت کردن لە ئەمانەت ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە، تەنانـەت شەهید بوونیش نایشۆرێتەوە، سپاردە جۆری زۆرە وەك:

ئەمانەت لە نوێژدا، ئەمانەت لە ڕۆژوودا، ئەمانەت لـە ئاخـاوتنو گفتوگـۆدا لـە هـەموانیش گـرنگتر سـپاردەی عادەتییـە، بەڵگـەی ئـەم فەرمایـشتەش ئەوەیـە کـە کۆمەڵێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (عەبـدوڵڵای کـووڕی مەسـعوودو بـەرڕائی کـوڕی عازیبو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسو ئوبەی کوڕی کەعب) فەرموویانە: ئەمانەت لە هەموو شتێکدا هەیە: لە دەست نوێژدا، لە نوێژدا، لە زەکاتدا، لـە لـەش پیـسیدا، لـە ڕۆژوودا، لە پێوانو کێشاندا لە سپاردەدا، ئیبنو عەبباس فەرموویـەتی: پـەروەردگار ڕێگەی نەداوە نە بۆ دەوڵەمەند نە بۆ هەژار کە سپاردە داگیربکا، عەبدوڵڵای کـوڕی عومـەر فەرموویـەتی: پـەروەردگار کـە شـەرمگای بـۆ ئـادەمیزاد دروسـت کـردووە فەرموویـەتی ئـەوە سـپاردەیە لـە تۆمـدا شـاردۆتەوە پارێزگـاری بکـەو مـافی خـۆی بدەرێ، پارێزگاری ئەمانەت دەرحەق بە خودی ئادەمیزاد خۆی ئەوەیە: کـە شـتێك بکا سوودی دینو دونیاو قیامەتی هەبێ.! خۆی لە هۆکارەکـانی نەخۆشـی بپـارێزێ، بەپێی یاسای زانستی پزیشکی ڕەفتار بکا، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێ) وەکوو ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو ئەبو داودو تیرمیذی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە گێڕاویانەتەوە: فەرموویەتی: «كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُـمْ مَـسْئُولٌ عَـنْ رَعِيَّتِـهِ». هـەمووتان وەك شـوان چـاودێرنو هـەمووتان بەرپرسـیارن لـە چـاودێر کراوانـی

خۆتان. یا دەفەرموێ: «إنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا». لەڕاستیدا خودی خۆشت مافت هەیە لەسەر خۆت، وەك خەوو خواردنو ئەمانە.

ڕیعایەت کردنی ئەمانەت دەرحەق بە ئادەمیزادانی تر گێڕانەوەی سپاردەکانیانە بۆیان، فێڵ نەکردنە لەگەڵیان لە مامەڵەو کارو کاسبیدا، تێکۆشان لە گەڵیانو ئامۆژگاریکردنیانە، نهێنی پاراستنو عەیب داپۆشینو ناو نەزڕاندنیانە!

دەربارەی سپاردەو ئەمانەت ئایەتی زۆر هەن کە جەختیان لەسەر پاراستنی کردووە؛ وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ ... – الأحزاب/٧٢﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ – المؤمنون/٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ – الأنفال/٢٧﴾.

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ وَلاَ دِينَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ» ناپاکی لە سپاردە چەپی لەبێ ئیمان کەمترە، بێ پەیمانیش وەك بێ دینی وایە. ئەحمەدو ئیبنو حەببان لە ئەنەس گێڕاویانەتەوە. موسلیمو بوخاریو تیرمیذیو نەسائی لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: «آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ». نیشانەی مرۆی ناپاكو دووڕوو ئەم سێ ڕەوشتەیە: لەکاتی گفتوگۆدا درۆزن بێ، لە بەڵێنی خۆی پاشگەز بێتەوە، گزیو ناپاکی لە ئەمانەت بکا.

کەوابوو گەڕاندنەوەی ئەمانەت پێویستو جەخت لەسەر کراوە بە تایبەتی کاتێ خاوەنەکەی داوای بکاتەوە، کەسێکیش ئەمانەتی لابێو لەدونیادا نەیداتەوە لە قیامەت حەقی ئەوەی لێ دەسێنرێتەوە! چونکە چەسپاوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الْقَرْنَاءِ». واتە: هەموو مافێ دەدرێتەوە بە خاوەنی، هەقی کەس لەسەر کەس نامێنێ تەنانەت مافی بزنی کۆڵ لە بزنی شاخدار دەستێنرێ!، رواه أحمد والبخاري في الأدب، ومسلم والترمذي عن أبي هريرة.

هەرکاتێکیش سپاردەکە فەوتا وەك ئەوە دزرا ئەگەر کەمتەرخەمی سپاردە لادانداروی تێدابوو، ئەوە بەرپرسیارەو دەبێ بیبژێرێ ئەگینا نا.

ئەمجار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ﴾ ئەگەر لە نێوان ئادەمیزاداندا دادوەریتان کردو فەرمانڕەوا بوون با بڕیاردانو حوکم کردنتان دادوەرانە بێ.

دانەوەی سپاردەو پارێزگاری کردنی بناغەی یەکەمی حوکمی ئیسلامییە، دادپەروەری بناغەی دوومیەتی، خیطابە کە روو دەکاتە جەماوەری گەل، ئەگەر فەرمانڕەوا نا عەدل بوو گەل بەرپرسیارە، دەبێ بەرەنگاری ببنەوە. عەداڵەتو دادپەروەری بناغەی فەرمانڕەواییە، ئاوەدانیو پێشکەوتنو شارستانیەت بێ دەستەبەر کردنی عەداڵەت نایەتە دی، عەقڵ داخوازییەتیو بانگەوازی بۆ دەکا، یەکێکە لەبنەما سەرەکییەکانی حوکم لە ئیسلامدا، کۆمەڵگا بەبێ عەدالەت بەڕێوە ناچێ، لە ڕێگای عەدالەتەوە لاوازو زەبوون مافیان پێشێل ناکرێ، زۆردار ستەم لە بێ دەسەڵات ناکا! بەهۆی عەدالەتەوە ئاسایشو نیظام بەرقەرار دەبن، هەموو ئایینە ئاسمانیەکان جەختیان لەسەر کردووە، ئەرکی سەرشانی فەرمانڕەواو کاربەدەستانیەتی کە پابەندی عەدالەت بن، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك مافی خۆی بدرێتێ، کەس مافی پێشێل نەکرێ!

بێگومان قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتدا فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە کە عادل ڕەوشت بنو عەدالەت لەسەر زەویدا بەرقەرار بکەن وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ – النحل/٩٠﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى – الأنعام/١٥٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى – المائدة/٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ – المائدة/٨﴾ قسط واتە: عەدل.

یان دەفەرموێ: ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ – ص/٢٦﴾.

پێغەمبەر فەرموویەتی: «لا تزال هذه الأمة بخير، ما إذا قالت صدقت، وإذا حكمت عدلت، وإذا استرحمت رحمت».

ئـەم نەتـەوەى ئيـسلامە بەختـەوەرە هـەتا لـە قـسەكردندا راسـتگۆ بـن، ئەگـەر حوكميان كرد دادپەروەر بن، ئەگەر داواى رەحمو بەزەييان لێ كرا بە بەزەيى بن.

بە پێچەوانەوە قورئان لە زۆر شوێندا هەرەشە لە ستەمكاران دەكاو لـە ئاكامى زولمو زۆر دەيانترسێنىێ! وەكوو دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّـهَ غَـافِلاً عَمَّـا يَعْمَـلُ الظَّالِمُونَ – إبـراهيم/٤٢﴾ يـان دەفـەرموێ: ﴿احْـشُرُوا الَّـذِينَ ظَلَمُـوا وَأَزْوَاجَهُـمْ – الصافات/٢٢﴾ سامناكترين شێوەى ستەمكاريش كارنەكردنە بـە شـەريعەتى خـوداو زولمو زۆرى فەرمانڕەوايـە، ئەگـەر حـاكم سـتەمكار بـوو ولات دەشـێوێ، ئـاوەدانى نامێنێ، كۆمەڵ تێك دەچێ شارو دێهات وێران دەبێ ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُـوا – النمـل/٥٢﴾ هـەروەها خەتـەرترين زولـم، زولمـى قـازىو دادوەرە! بۆيـە ئـەركى سەرشانى قازييە، كە بە جوانى لە بابەتەكە حالّى ببێ، لـە هـەموو رويەكـەوە لێـى ورد ببێتـەوە، لايـەنگيرى يـەكێ لـە دوولايـەنى كێـشەكە نـەكاو شـارەزاى حـوكمى شەرعى بێو بزانـێ خـودا چۆنى فـەرمان پـێ كـردووە ئـاوا رەفتـار بكـا، هـەروەكوو پێويستە پياوى زاناو لێهاتوو بكرێن بە قازى.

كـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا حَكَمْـتُم بَـيْنَ النَّـاسِ﴾ ئاماژەيـە بـۆ ئـەوە كـە پێويـستە موسوڵمانان فەرمانڕەوا بۆ خۆيان ديارى بكەن، تا بـە حـەقو عەدالـەت لـە ناويانـدا حوكم بكا.

ئەمجار پەروەردگار سوودى فەرمان بە عەدالەتو گەڕاندنەوەى سپاردەكان بـۆ خاوەنيان روون دەكاتەوە بۆمانو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّـهَ نِعِمَّـا يَعِظُكُـم بِـهِ﴾ بێگومـان ئـەو شـتانەى خـودا ئامۆژگاريتـان پـێ دەكـاو هـەڵتان دەنـێ بـۆ دەسـتەبەر كردنـى باشترين شتەو هەميشە هەوڵ بدەن بۆ دەستەبەر كردنيان، چونكە خـودا شـتێكتان پێ نالێ: كە سوودى دونياو قيامەتى ئێوەى تێدا نـەبێ، ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ واتە: پێويـستە پابەنـدى فـەرمانى خـودا بـن بـە گـوێرەى ئامۆژگـارى ئـەو هـەڵسو كەوت بكەن، چونكە خودا لە ئێوە زاناترە بـە هـەموو شـتێك، ئەگـەر دادپەروەرانـە حوكمتان كرد خـودا ئاگـادارەو دەبيـستێ، ئەگـەر سـپاردەتان گێرايـەوە بـۆ خـاوەنى خودا دەيبينێ! كە وابوو ئەمە وەعدو بەڵێنى خوداى مەزنە بـۆ ئەوانـەى پابەنـدى فـەرمانى خـودانو هەرەشـەيەكى گەورەشـە بـۆ ئەوانـەى سەرپێـچى دەكـەن،

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «أَعْبُدَاللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ» ( بە جۆرێ خودا بپەرستە وەك خودا بە بەسەر سەرتەوە راوەستابێو چاوت لێی بێ، خۆ ئەگەر تۆش خودا نابینی، خودا چاوی لە تۆیە) ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە دەبێ گرنگی بدرێ بە حوکمو بڕیاری قازیو فەرمانڕەوایان، چونکە بەرژەوەندی ئادەمیزادیان خراوەتە ژێر دەست.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار فەرمانی کرد بە گەڕاندنەوەی سپاردە بۆ خاوەنەکانیان، فەرمانی کرد کە دادپەروەرانە حوکم لە نێوان خەڵکدا بکەنو رووی خیطابەکەشی لە جەماوەری گەل بوو، فەرمانیان پێ دەکا کە ملکەچی فەرمانی خوداو پێغەمبەرو فەرمانڕەوا بن، چونکە بەبێ پابەند بوون بە فەرمانەکانیانەوە بەرژەوەندی خەڵکی ناپارێزێ. فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە فەرمانبەرداری یەزدان بن! پەیرەوی پەیامی پیرۆزو قورئانی مەزنی بکەنو بیکەنە پرۆگرامی ژیانتان، ﴿وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ﴾ گوێ بیستی پێغەمبەر بن، چی پێ گوتن پابەندی بن، چونکە پێغەمبەر روونکەرەوەی نیگای خودایەو ئەحکامو یاسای قورئانتان بۆ شی دەکاتەوە، سوننەتی خودا وا داهاتووە کە پێغەمبەران شەریعەتی خودا بە خەڵکی رابگەیەننو پێویستی سەرشانی ئێمەش ئەوەیە ملکەچو پابەندی ئامۆژگارییەکانیان بین. ﴿وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ﴾ گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری خاوەن بڕیار بن کە بریتین لە فەرمانڕەوایانو حاکمو زاناو لێپرسراوی لەشکرو باقی سەرکردەو فەرماندەکانی تر، ئەوانەی کاروباری خەڵکیان بەدەستە، ئادەمیزادان دەچنە لایان بۆ بەجێ هێنانی کارو باریان، ئەم لێپرسراوانە ئەگەر لەسەر رایەك، لەسەر حوکمو بڕیارێك یەکدیگیر بوونو حوکمیان کرد، پێویستە فەرمانبەرداریان بکرێ بەمەرجێ دڵسۆزو ئەمین بنو سەرپێچی فەرمانی خوداو رێبازی پێغەمبەر نەکەنو سەرفێرازو ئازاد بن لە وەرگرتنی هەڵوێستو بڕیار دان!

بەڵام چۆنیەتی ئەنجام دانی عیبادەتو چەندیەتیو هەرشتێك کە پەیوەندی هەبێ بە عەقیدەوە ئەوە بەس لە خوداو پێغەمبەرەوە وەردەگیرێو کەسی تر بۆی نیە لەم جۆرە شتانەدا رای خۆی دەربڕێو فەرزی بکا:

ئـەهلی حیلـل‌و عەقـد لـە موسـوڵمانان ئەگـەر كـۆك بـوون لەسـەر كارێـك لـە بەرژەوەندی موسوڵمانان‌و دەقێكی شاریع لەو بـارەوە نـەبوو، سەربەسـت‌و ئـازادیش بـوون لـە ڕادەربـڕین‌و كـەس زەختـی لێ نـەكردن‌و بڕیارێكیـان دا، ئـەوە بـە قـسە كردنیـان پێویـستە، وەكـوو ئیمـامی عومـەر مـشۆرەتی بـە ئـەهلی حیلـل‌و عەقـدی هـاوەڵان كـرد دەربـارەی دروسـت كردنـی دیوانـەكانی دەوڵـەت كـە لـە سـەردەمی پێغەمبەردا نەبوون، كەسیش لە زانایانی هاوەڵان بەرهەڵستیان نەكرد.

جا ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ﴾ واتە: ئەگـەر دەربـارەی ئـەو حوكمـە لـە قورئـان‌و حـەدیثـدا دەقێـك نـەبوو ئـەهلی حیلـل‌و عەقـد تێـی دەفكـرن ئەگەر لەسەر شتێك پێك هاتن‌و ئیجماعیان بەست پێویستە كار بەو حوكمـە بكـەن كە ئـەوان لەسـەری پێكهـاتوون، ئەگـەر كێشەیان تـێ كـەوت پێویـستە ئـەو حوكمـە ڕانوێنن بەسەر قورئان‌و حەدیثداو حوكمە گشتییەكانیاندا هەرچی لەگـەڵ ئـەوان یەكی گرتەوە، ئەوە وەردەگیرێ‌و كـاری پـێ دەكرێ، ئـەو حوكمـەی لەگـەڵ ئەوانـدا نەگونجا پاشگوێ دەخرێ، بەمەش كێشەی ناو موسوڵمانان بنـبڕ دەكـرێ، یەكیـەتی‌و یەكڕایی موسوڵمانان دەچەسپێ!

## لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ كـە ئایەتـە بنـەما ئایینیـەكان لـە دەوڵـەتی ئیسلامیدا دەست نیشان دەكا كە ئەمانەن:

١- بنەمای یەكەم قورئانی پیرۆزە كە كارپێكردنی تاعەتی پەروەردگارە.

٢- بنەمای دووەم سوننەتی پێغەمبەر كە بریتییە لە فەرموودەو ڕەفتـار‌و ڕەزا لەسەر بوونی پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) كـە كـارپێكردنی تاعـەت‌و بـە گوێ كردنی پێغەمبەرە.

٣- بنەمای سێیەم ئیجماعی ئەهلی حیلل‌و عەقدە: كە تاكە تاكـە‌و هەڵبـژاردەی كۆمەڵن؛ لە زانایان‌و سـەركردەو پیـاو مـاقوڵ‌و سـەرەك حیـزب‌و گـرۆ‌و لێپرسـراوی وڵات؛ تاعەت‌و بە قسەكردنیان (ألولوا الأمر)ە.

٤- بنـەمای چـوارەم ڕانوانـدن‌و بەرامبـەر كردنـی حوكمـە جیاجیـا‌و كێـشە تێكەوتووەكانە بە قورئان‌و سوننەت.

ئـەم چـوار بنـەما سـەرەكيانە سەرچـاوەی شـەريعەتی ئیـسلامینو پێويـستە تاقمێك هەبێ مەسەلە كێشە تێكەوتووەكان بەسـەر قورئـانو سـوننـەتدا رابنـوێنن، ئـەو تاقمــە لــە لايــەن ئــەهلی حيلــلو عەقــدەوە هەڵدەبــژێردرێن، پێويــستە كاربەدەستو فەرمانڕەواكان بڕيارەكانی ئەو كۆمەڵە زاناو پسپۆڕە جێبەجێ بكەن.

كـەوابێ دەوڵـەتی ئيـسلامی لـە دوو تـاقم پێـك دێ تاقمێـك ئـەحكامو ياسـاكان روون دەكەنـەوە، ئەوانـە ئێـستا پێيـان دەگـوترێ (الهيئـة التـشريعية) تـاقمی دووەم كۆمــەڵی فــەرمانڕەواو قــازیو دادوەرو كاربەدەســتەكانە ئەمانــەش ئێــستا پێيــان دەگوترێ (الهيئة التنفيذية) پێويستە موسوڵمانان بە تێكڕا ئەم حوكمانە وەربگرن، بە نهێنیو ئاشكرا گەردنكەچ بن بۆيان، چونكە ئەمانـە هـەموويان حـوكمی خـوداو پێغەمبەری خودان، يان حوكمی نەتەوەيەو كۆمەڵی زاناو پسپۆڕو لێهاتوو ئەوانەی گەل سيقەيان پێيانەو كردوونی بە نوێنەری خـۆی، ئـەو حوكمـەيان هەڵبـژاردووەو بەلايانــەوە گونجــاوە بــۆ كۆمــەڵو لەبــەر رۆشــنايی قورئــانو حــەديــثو ياســا گـشتييەكانياندا دەستنيـشان كـراوە. ئـەو مەسـەلەی كێـشەتان تێيـدا پەيـدا دەبـێ رابنوێرێن بەسـەر قورئـانو حـەديثـی پێغەمبـەردا ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەگەر ئێوە بەراستی باوەڕتان بە خوداو بە ڕۆژيی دوای هەيەو پێتان وايـە زيندوبوونەوەو لێپرسينەوەی رۆژی قيامەت دێتـە رێتـان. چونكە موسوڵمان هـيچ حوكمێــك پــێش حــوكمی خــودا ناخــاو زۆرتــر هــەوڵی دەســتبەركردنی پێداويستييەكانی رۆژی قيامـەت دەداو هـەموو كاتـێ قيامـەتی لا مەبەسـت تـرە لـە دونيـا. ئەمـە هەڕەشـەيە لەوانـەی كـە لـە رێبـازی خـوداو پێغەمبـەر لادەدەنو سەرپێـچی فەرمانـەكانيان دەكـەنو حـوكم ناگێڕنـەوە بـۆ لای قورئـانو سـوننـەتی پێغەمبەر.

وەكوو دەفـەرموێ: «فَـلاَ وَرَبِّـكَ لاَ يُؤْمِنُـونَ حَتَّـى يُحَكِّمُـوكَ فِيمَـا شَـجَرَ بَيْـنَهُمْ» بوخـاریو موسـليم فەرموودەيـەك لـە ئـەبو هورەيرەوە دەگێڕنـەوە كـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموويەتی: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّـهَ، وَمَـنْ عَـصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْـصِ الأَمِـيرَ فَقَـدْ عَـصَانِي» كەواتـە هەركەسێك شوێنكەوتنی قورئانو سوننـەتی پێغەمبەر پێش هەواو هەوەسـی خـۆی

نەخا موسوڵمانی راست نیە. ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ ئەو رانواندنەو پەیڕەو کردنەی کیتابو سوننەتە باشترە بۆ ئێوەو ئاکامی باشتر بەدەست دێنێ...

پاش ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی کرد بە موسوڵمانانو لەسەری پێویست کردن کە تاعەتی خوداو پێغەمبەر بکەنو گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای خۆیان بن. لەم ئایەتەی دوایی دا هەڵوێستی دوو ڕووەکان روون دەکاتەوە، ئەوانە دڵو دەروونیان نەخۆشە، ئیطاعەتی پێغەمبەر ناکەن، رازی نابن بە حوکمو بڕیاری خوداو پێغەمبەر! بەڵکوو دەیانەوێ جگە لە پێغەمبەر – دەست بڕو ملهوڕ حوکمو بڕیاریان بۆ دەربکەن.

## بیروبۆچوونی دووڕووەکانو هەڵوێستیان

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَاءُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا

فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِي أَنفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾﴾.

ئیبنو جەریر لە (الشعبي)یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە نێوان پیاوێکی جوولەکەو پیاوێکی دووڕوودا کێشەیەك ڕووی دا، کابرای یەهودی وتی: دادگایی دەکەین بە گوێرەی ئایینی خۆتان، یان وتی دەچینە لای پێغەمبەر دادگاییمان بکا، چونکە دەیزانی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەرتیل وەرناگرێ، لەسەر ئەوە ڕێك نەکەوتن دوایی هاتنە سەر ئەوەو بڕیاریاندا کە بچنە لای کاهینێکی جوهەینەیی، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ ئەمە نارەزایی دەربڕینی پەروەردگارە بەرامبەر کەسێك لافی ئەوە لێ دەدا کە بڕوای هەیە بە قورئانو ئەو نامە ئاسمانییانەی پێش ئەو بۆ پێغەمبەرە پێشینەکان نێردراون کەچی لەگەڵ ئەوەدا دەیەوێ بۆ بڕینەوەی کێشەو بەرە پەنا بۆ غەیری کیتابی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی بەرێ!

جا وەکوو چەندجاری دی گوتراوە: هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە تایبەتە، بەڵام بایەخ بە واتای گشتی دەقەو لۆمەی هەموو ئەوانە دەکا: کە لە ڕێبازی قورئانو سوننەت لادەدەنو بۆ دادگاییو کێشە حەل کردن پەنا بۆ شتی بەتاڵو پڕوپووچ دەبەن دەیانەوێ طاغووتو ملهوڕ حوکمیان بکەن.

واتە: ئەی محمد! سەیری ڕەفتاری ناهەمواری ئەو تاقمە بکە؛ کە بەقسەی خۆیان ئیمانیان بە پێغەمبەرایەتی تۆ هێناوە هەروەها باوەڕیان بە پێغەمبەرە پێشینەکانیش هێناوە، ئیمانی ڕاستو تەواویش بە پێغەمبەرانو نامە ئاسمانیەکان دەبێ سەر بۆ ئەوە بکێشێ کار بە شەریعەتی خودا بکرێ، کە بەهۆی پێغەمبەر بە ئادەمیزادان دەگا. هەرکاتێ لەوە لایاندا بە موسوڵمانی ڕاست حسێب ناکرێن سەیریان بکە چەند کرداریان دژی گوتاریانە، ئەوەتا ئەو دوو ڕووانە ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ﴾ کە ڕازی نابن بۆ حوکمو بڕیار بچنە لای پێغەمبەر

(دروودی خوای لەسەر بێ) دەچن دادگایی خۆیان دەبەنە لای طاغووتو گومڕایانی وەکوو ئەبو بەرزەی ئەسلەمی کاهین، یان کەعبی کوڕی ئەشرەفی جوولەکە، کە لەبەر زیادڕەوی لە گومڕاییو لادان لە ڕێبازی ڕاستو دژایەتی کردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نازناوی طاغووتی بەسەردا بڕا ﴿وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ﴾ وەلحاڵ لە قورئاندا فەرمانیان پێکراوە کەخۆ لە طاغووت بپارێزنو هیچ شتێکی بەقسە نەکەن، جا ئەوان ئەگەر ئەو فەرمانە وەرنەگرنو پابەندی نەبن، نیشانەی ئەوەیە باوەڕیان نییە، بەدەم لافی ئیمانداری لێ دەدەنو بەکردەوە کافرن، دەڵێن: بڕوامان بەخوداو بە پێغەمبەرە، کەچی حوکمو بڕیار لە طاغووت وەردەگرن، ئەمەش نیشانەی ئاشکراو روونە کە ئەوانە موسوڵمان نین: فەرمانێك لە فەرمانەکانی قورئان دەربارەی دوورە پەرێزیو خۆپاراستن لە طاغووت ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ – النحل/٣٦﴾ یان کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ – البقرة/٢٥٦﴾.

ئەوانە کەوا پابەندی حوکمو بڕیاری طاغووتن دەبن بەقوتابی شەیتانو ﴿وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ شەیتانیش دەیەوێ ڕێگایان لێ هوون بکاو گومڕایان بکاو لەخشتەیان بەرێو مەسافەیەکی دوورو درێژ لەڕێگای ڕاست دووریان بخاتەوە بەجۆرێك نەتوانن بگەڕێنەوە سەر راستە ڕێگا.

بەڵگە لەسەر ئەو هەڵوێستەیان ئەوەیە ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾ ئەگەر بەو بەناو ئیماندارانە بگوترێ: وەرن با حوکم بە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر بکەین، ئەوە بەرنامەو پرۆگرامی بێ خەوشو ڕێگەی ڕاستو ڕەوانە! ئەی محمد! ئەو دوو ڕووانە دەبینی رووت لێ وەردەگێڕنو گوێچکەیان لە ئاستی بانگەوازییەکەت دەهاخننو حوکمی تۆیان ناوێو سوورن لەسەر گومڕاییو بێ دینی، بە ئەنقەست خۆیانی لێ لادەدەن!

مانای ئەم ئایەتە وەکوو تەئکیدو جەخت کردنەوە وایە لەسەر مانای ئایەتی پێشوو، چونکە کەسێك روو لە حوکمی خودا وەرگێڕێ، بەبێ گومان دووڕوو بێ باوەڕە!

﴿فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ حاڵو وەزعی ئەو دووڕووانە چۆن دەبێ؟ ئەگەر خودا بەسەر هەڵوێستیاندا ئاگادارت بکاو پشت هەڵکردنو روو وەرگێڕانیان لە حوکمی خوداو پێغەمبەریانت پێ رابگەیەنێو ئەمجار لە ئاکامی تاوانەکانیان تووشی ئاستەنگو ناخۆشی ببن، بەهۆی کرداری ناشیرینو هەڵوێستی بێ شەرمانەو نالەبارییان بکەونە گێژاوی رووداوی ناخۆشەوەو ناچاربن بگەڕێنەوە بۆلای تۆو سکالای خۆیانت بۆ بکەن ﴿ثُمَّ جَآؤُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا﴾ ئەمجار سوێند دەخۆنو دەڵێن: ئێمە بەو پەنابردنەمان بۆ حوکمی طاغووت مەبەستمان چاکەو رازیکردنی دڵی دوژمنەکانمان بووە، ویستوومانە ئاشتیو تەبایی لەنێوان خۆمانو ئەواندا بچەسپێنین!

یان عوزر خواهی دەکەنو سوێند دەخۆنو دەڵێن: ئێمە بەچوونمان بۆلای ئەوان مەبەستمان مەداراو لاواندنەوە بووە، ئەگینا بەدڵ بڕوامان بە حوکمو بڕیاری ئەوان نییە چوونەکەمان بۆلای ئەوان کارێکی رواڵەتکاریو سیاسەت ئامێزە.

﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾ ئەم جۆرە ئادەمیزادانە کە تاقمی دووڕووەکانن خودا دەزانێ چییان لەدڵدایەو سزایان دەداتەوە، بێگومان هیچ شتێك لەخودا گووم نابێ، ئەو زاناو ئاگادارە بە ئاشکراو نهێنییان! ئەتۆ ئەی موحەممەد! ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِي أَنفُسِهِمْ قَوْلاً بَلِيغًا﴾ گوێیان مەدەرێ، گرنگییان پێ مەدە، لەسەر ئەو بیرو باوەڕەی کە لەدڵیاندایە قسەی رەقیان لەگەڵ مەکە، ئامۆژگارییان بکەو لایەنی دووڕوویی‌و نیاز خراپییان لێ ببڕە، بە ئاخاوتنی رەوانو کاریگەرو دڵ تەزێن قسەیان لەگەڵدا بکە، ئەوەیان تێ بگەیەنە ئەوەی کە لەدڵیاندایە لە دووڕوویی‌و نیاز پیسی لە پەروەردگار شاراوە نییە، ئەوانە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ کافردا نییە، ئەوان کە شەڕیان لەگەڵدا ناکرێ لەبەرئەوەیە کە بەرواڵەت ئیمانیان هێناوە، جا ئەگەر ئەوان هەر لەسەر هەڵوێستی خۆیان بەردەوام بنو زیان بە کۆمەڵگای ئیسلام بگەیەننو دەوڵەتی ئیسلامی بخەنە خەتەرەوە ئەوە دوور نییە کە بەشمشێر هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێو لەملیان بدرێ.

ئایەتەکە ئاماژە بە فەرمانڕەوایی‌و بەتوانایی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ئاخاوتن‌و قسە کاریگەرییدا دەکا، ئەوە دەچەسپێنێ کە پێغەمبەر لە فەساحەت‌و بەلاغەتدا گەیشتۆتە سەر ترۆپکی وێژەو وێژەریی! ئایەتەکە سێ پلەی ڕەفتارکردنی بۆ پێغەمبەری لەگەڵ دووڕووەکاندا دیاری کردووە:

یەکەم: گوێ پێنەدان‌و پشت تێکردن‌و بەهەند هەڵنەگرتنیان.

دووەم: ئامۆژگاری کردنیان بەخێرو چاکە بەڵکوو دڵیان بگۆڕێ‌و واز لەنیاز خراپی خۆیان بێنن‌و دڵیان نەرم ببێ.

سێیەم: ئاراستەکردنی قسەی بەلیغ‌و کاریگەر بۆناو دڵیان جارێك بە هەڵنانیان بۆ چاکەو جارێك بە ترساندنیان لەخراپە، (ترغیب‌و ترهیب)یان لەگەڵدا بەکاربێ، لەهەموو ڕوویەکەوە بەهانەیان نەمێنێ‌و بۆڕ بدرێن.

## بەگوێکردنی فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێویستە

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴿٦٥﴾ ﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا هەڕەشەی لە دووڕووەکان کردو تاوانباری کردن بەوەوە کە مل بۆ حوکمی خودا نادەن‌و پەنا دەبەنە بەر حوکمی طاغووت، ئەمجار لەم ئایەتەی دواییدا دێتە سەر چەسپاندنی بنەمایەکی گشتی ئەویش گوێڕایەڵی

کردنی فەرمانی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ)، چونکە ئەو لەخوداوە قسە دەکا بە گوێکردنی ئەو بەگوێ کردنی فەرمانی خودایە، کەسێك لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) یاخی بێ لەخودا یاخی دەبێ! بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ ئێمە هەر پێغەمبەرێکی ناردوومانە بۆ سەر گەلو نەتەوەیەك بە پێویستمان داناوە لەسەر ئەو گەلو نەتەوانە کە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرەکەیان بکەنو شوێنی بکەون، ئەو پێغەمبەرە بۆیە رەوانەکراوە کە قسەی وەربگیرێو طاعەتی بکرێ، لەم رووەوە کە پەروەردگار ئیزنی داوە کە بەگوێی بکرێ یان کە خودا توفیقی داوە بۆ طاعەت کردن.. موجاهید دەڵێ: مانای (بِإِذْنِ اللّهِ) ئەوەیە! کەس ناتوانێ طاعەتی پێغەمبەر بکاو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بێ بەبێ رەزامەندی خواو هۆکار سازدان بۆی. هەرکەسێ خودا توفیقی نەدا نایەتە سەر رێگای راست. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ - آل عمران/١٥٢﴾ ئەمجار پەروەردگار رێنمونی یاخی بووانو تاوانباران دەکا کە هەڵەیەکیان لێ روودرا پەنا بیەنە بەر پێغەمبەرو داوای لێ خۆشبوونی خودا بکەن لە خزمەتیا ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ ئەگەر ئەوان لەوکاتەدا ئەگەر هەڵەو تاوانیان کردو روویان لە حوکمی تۆ وەرگێڕا پەنایان بردە بەر طاغووت، بهاتنایە لای تۆو بپاڕانایەوە لەخودا داوایان بکردایە لە پێغەمبەر کە دوعایان بۆ بکا، بۆیان لەخودا بپاڕێتەوە کە لێیان خۆش بێ، ئەوان ئەگەر ئەوەیان بکردایە خودا لێیان خۆش دەبوو رەحمی پێ دەکردنو دەیانزانی پەروەردگار چەند تۆبە وەرگرو لێبوردەیە! ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە هەرکەسێك تۆبەی راستو دروست بکاو هەڵو مەرجی پێویست لە تۆبەکەیدا هەبن، واتە دوای تاوانەکە پەشیمان ببێتەوە، وا بڕیار بدا جارێکی تر بۆ ئەو تاوانە ناگەڕێتەوە، بەدڵ ژیوان بێتەوەو راستالانە تۆبەکەی بکا.

بەلام تۆبەی سەر زارەکیو بێ سەروبەر، بێ ئەوەی لە ناخەوە سەرچاوەی هەڵبگرێ هیچ سوودێکی تێدا نیە! پەروەردگار لە ئایەتەکەدا بە گوێ نەکردنی فەرمانی پێغەمبەری داناوە بە ستەم کردن لە خۆ، بە چەواشە کردنو شێواندنی

دڵو دەروونی حسێب کردووە، ئەمجار جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە گوێڕایەڵی پێغەمبەر پێویستەو نابێ نکۆڵی لێ بکرێ، فەرمووی: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر سوێند بە خودای تۆ ئەو دووڕووە سەرلێشێواوانەی کە بۆ بڕیارو حوکم نایەنە لای تۆو پەنا بۆ تاغووت دەبەن ئیمانی تەواویان نیەو بە موسوڵمانی راستاڵ حسێب ناکرێن، هەتا سێ مەرجیان تێدا نەیەتە جێ:

١- پێغەمبەر بکەن بە حاکمودادوەر بۆ حەل کردنی نیزاعو کێشەی نێوانیان، کەس ئیمانی نیەو بە موسوڵمان حسێب ناکرێ هەتا لە هەموو کاروبارێکیدا پێغەمبەر نەکا بە حاکمو رێبازی ئەو نەکاتە بەرنامەی ژیانی، هەرچی پێغەمبەر حوکمی پێ کرد ئەوەی بە لاوە راست بێو بە نهێنیو ئاشکرا پابەندی فەرمانو بڕیاری ئەو بێ.

٢- ﴿ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ﴾ ئەمجار هیچ دڵەڕاوکێو شکو گومانێکیان نەبێ دەربارەی ئەو بڕیارەی تۆ بۆت داون، بە دڵ ملکەچی فەرمانەکانت بنو رەزامەندی تەواوو قبووڵ کردنی بێ مەرجو موطلەقیان لا پەیدا ببێ.

٣- ﴿وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ گەردنکەچی تەواوو بە پیرەوە چوونو تەسلیم بوون بۆ ئەو حوکمو بڕیارانەی بەسەریاندا دەدرێ، بە نهێنیو بە ئاشکرا، بەبێ منجە منجو خۆ گرتنەوە، بەبێ بەرهەڵستیو دژایەتی کردن! ئەمە پلەی تەنفیذو جێبەجێ کردنە دەبێ بە کردەوە بیسەلێنن کە پابەندو ملکەچن، جاری وا دەبێ کابرا حوکمی بەسەردا دەدرێ حوکمەکەشی بەلاوە حەقە، بەڵام خۆ لە تەنفیذی دەدزێتەوە، ئەمە پێی ناگوترێ پابەند بوون!!

**خۆشویستنی نیشتمانو پابەند بوون بە فەرمانی خوداو پێغەمبەرەوە**

﴿ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا (٦٦) وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا (٦٧) وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا (٦٨) ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی روون کردەوە کە ئیمان تەواو نابێ هەتا بۆ هەموو کێشەو نیزاعێك پێغەمبەر نەکەنە حەکەمو دادوەر، ئەمجار کەمتەرخەمیو تەقصیری زۆرینەی خەڵك دەچەسپێنێ بەهۆی ئەوەوە کە بیروباوەڕیان لاوازە.

وەکوو دەڵێن: ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس لەگەڵ کابرایەکی جوولەکەدا شانازیان بەسەر یەکتردا دەکرد کابرای جوولەکە، وتی: خودا فەرمانی پێ کردوین کە خۆمان بکوژین خۆمان کوشت! ثابیتیش وتی: ئەگەر خودا فەرمانمان پێ بکا خۆمان بکوژین خۆمان دەکوژین ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُواْ مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلاَّ قَلِيلٌ مِّنْهُمْ﴾ ئەگەر ئێمە لەسەر ئەوانەمان پێویست بکردایە کە واز لەو کردارو هەڵوێستانەیان بهێنن کە لێیان یاساغ کراوە گوێڕایەڵ نەدەبوونو وازیان لێ نەدەهێنا، چونکە سروشتیان وایە: حەز بە سەرپێچی دەکەن، ئەگەر پەروەردگاریان لەسەری پێویست بکردنایە کە خۆ بکوژن وەکوو فەرمانی بە نەتەوەی ئیسرائیل کرد کە بۆ پاساودانەوەی پەرستنی گوێرەکە تێك بەربن و لێك راکێشنو خۆیان بکوژن بۆ ئەوەی تۆبەیان لێ وەربگیرێ! ئەگەر لەسەرمان پێویست

بکردنایە کە زێدی خۆیان جێ بێڵن‌و لە ڕێگای خودا کۆچ بکەن، کۆمەڵێکی کەم نەبێ، ئەو ئەرکە ئەنجام نادەن‌و پابەندی فەرمانەکە نابن!

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ ئەگەر ئەوان پابەندی ئەو نەصیحەت‌و ئامۆژگاریانە بوونایە: کە ئاراستەیان دەکرێ‌و فەرمانەکانیان جێبەجێ بکردایە‌و لە شتە یاساغ کراوەکان دوور بکەوتنایەوە ئەوە بۆ ئەوانە باشتر بوو، شیاو تر بوو، چاکتر لەسەر ئایین‌و بیروباوەڕ راگیری دەکرن، چونکە کردەوەیەکە: ڕەوشت دەچەسپێنێ.. بۆ نموونە مالّ بەخشین نیشانەی بیروباوەڕە، هەتا پەرەی پێ بدرێ‌و تێی قوڵ بێتەوە زیاتر بیروباوەڕ پتەو دەکا..

﴿وَإِذاً لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْراً عَظِيمًا﴾ واتە: ئەگەر ئەوانە ئەم کارە باشانەیان ئەنجام بدانایە، پابەندی فەرمانی خودا بوونایە، بە ئیخلاص‌و لێبووردوویی کاریان بکردایە، بێگومان پاداشی باش‌و نازو نیعمەتی زۆرو زەبەندەیان دەدانێ، ئەو پاداشە باشەش بەهەشتی پان‌و بەرین‌و ڕازاوەو قەشەنگە، وەکوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەربارەی بەهەشت فەرموویەتی: «فِي الْجَنَّةِ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ». واتە: نازو نیعمەتی وا خۆش‌و باش لە بەهەشتا هەیە، کە لە دونیادا شتی وا نەبینراوەو نەبیستراوەو نە بە خەیاڵی کەسدا هاتووە. ﴿وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ شارەزامان دەکردن بۆ ڕێگەی ڕاست لە دونیاو قیامەتدا ئەویش بریتییە لە کردەوەیەك کە سەر دەکێشێ بۆ خۆشبەختی دونیاو قیامەت‌و چوونە ناو بەهەشت‌و کامەرانی هەتا هەتایی!

### پاداشی گوێڕایەڵی بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ

وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡفَضۡلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمٗا ﴿٧٠﴾﴾.

ئەمجار پەروەردگار پاداشی پابەند بوون بە فەرمانی خوداو پێغەمبەر دەست نیشان دەکا، کە ئەوەش هیواو ئاواتی هەرە بەرزی خوداپەرستانەو نەفسی ئادەمیزاد هەوڵی بۆ دەدا!

لە دایکی موسوڵمانان خاتوو عائیشەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر وتی ئەی پێغەمبەری خودا تۆ لە لام لە خۆم خۆشەویست تری، تۆ لە لام لە کوڕەکەم خۆشەویست تری، من لە ماڵەوە یادت دەکەم خۆڕاناگرم تا نەیەمە خزمەتتو نەتبینم کە یادی مردنی خۆمو جەنابت دەکەمەوە دەزانم تۆ جێگاو پلەو پایەت بەرزەو لەگەڵ پێغەمبەراندا بەرز دەکرێیەوە بەڵام من ئەگەر بیشچمە بەهەشتەوە، پلەو پایەم زۆر دوور دەبێ لە تۆ، لەبەر ئەوە هەر لە ئێستاوە خەم دایگرتووم، دەترسم لە قیامەتدا بە دیدارت شاد نەبم؟!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوە تا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ:

﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم﴾ هەرکەسێك ئیتاعەی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بکاو پابەندی فەرمانو نەهیەکانیان بێ، ئەوە خودا دەیخاتە ناو بەهەشتی بەرینەوەو دەیکاتە هاوەڵی ڕێزلێنراوانی خۆی، ئەوانەی نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتوونو پلەو پایەی بەرزیان دراوەتێ ئەوانیش چوار تاقمن ﴿مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ﴾ پێغەمبەران، ڕاستگۆیان، شەهیدان، ڕاستاڵان، کەسێك لە جیهاندا ملکەچی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بێ لە قیامەتدا لە بەهەشتی ڕازاوەو قەشەنگدا لەگەڵ ئەو چوار جۆرە خودا پێداوانە ژیان بەسەر دەبێ، بە بینینیان شادمان دەبێ، لەگەڵیاندا ئامادەی کۆڕو کۆمەڵی ئەوان دەبێ، بەڵام لە پلەو پایەدا یەکسان نابن، چونکە گومان لەوەدا نیە پلەو پایەی بەهەشتییان جیا جیایە، بەرزو نزمی هەیە، هەرکەسەو بە گوێرەی کردارو

بیروباوەڕو تێکۆشانی خۆی پلەو پایەی دەدرێتێ، بەڵام یەکتر بینینو دیدەنی کردنی یەکتریان هەیەو هەرکەسەش بە پلەو پایەی خۆی رازییە. ﴿وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا﴾ بەراستی ئەوان باش هاوەڵو هاوڕێن، هەریەکەیان هاوڕێی باشو بێ خەوشە!

ئەوەی کە پاڵپشتی ئەم راڤەیە دەکا، فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) کە طەبەرانی بە مەرفوعی ریوایەتی دەکا دەفەرموێ: «مَنْ أَحَبَّ قَوْمًا حَشَرَه الله مَعَهُمْ» یان ئەو حەدیثەی کە موسلیمو بوخاری لە ئەنەسەوە دەیگێڕنەوە دەفەرموێ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ». (مرۆڤ لە قیامەتدا لەگەڵ خۆشەویستانی خۆی دەبێ!). خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکان ئەوەیە: سەربکێشێ بۆ ئیطاعەو بە گوێکردنیان.. دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ – آل عمران/٣١﴾. ﴿ذَلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ عَلِيمًا﴾ ئەم پاداشە گەورەو بە نرخە کە دانراوە بۆ ئەوانەی کە پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەرن، فەضلو بەخششێکی خودایە، خودا بۆخۆی لە هەموو کەس باشتر دەزانێ کێ شیاوی پاداشە، کێ تەقواکارو خواپەرستە، بەسە کە خودا بۆخۆی هەموو شتێك دەزانێو ئاگاداری هەموو چاکەو خراپەیەکە، دەزانێ کێ تەقواکارو پابەندە، کێ لادەرو ریاکارو دووڕووە، ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە بەهەشتییەکان ئەو پلەو پایەی بەهەشتیان بە طاعەتو خوداپەرستی رووت دەست نەکەوتووە، بەڵکوو بە فەضلو بەخششی خودا دەستیان کەوتووە، بەڵام گومان لەوەدا نیە کە بەخششو بەهرەی خودا بۆ ئەهلی ئیمانە، بۆ ئەهلی کوفر نیە.

قورطوبی ئەم ئایەتەی کردووە بە بەڵگە لەسەر راستیو شەرعییەتی جێنشینی حەزرەتی ئەبوبکر، دەڵێ: پەروەردگار لە قورئاندا پلەی خۆشەویستانی خۆی دەست نیشان کردن لە بەرەو ژوورەوە پێدا هاتنو یەکەمجار پێغەمبەرانی هێنان، ئەمجار لە پلەی دووەمدا راستگۆیانی هێنان، لە نێوان پێغەمبەرانو راستگۆیان ناوەندی دانەنا هەموو موسوڵمانیش رایان وایە: کە ئەبوبەکر نازناوی صدیق بووە (محمد)یش (رسول) بووە، دەی کە رەسولی پێغەمبەرو صدیقی ئەبوبەکر چەسپاو سەلێندرا، دەردەکەوێ کە ئەبوبەکر لە پلەی دووەمدایە،

کەواتە: نابێ دوای پێغەمبەر کەسی تر ببێتە جێنشین.. هەتا ئەو بێ کەسی تر شایانی جێنشینی نیە.

## یاسای شەڕ لەئیسلامدا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعٗا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنۡ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَالَ قَدۡ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيَّ إِذۡ لَمۡ أَكُن مَّعَهُمۡ شَهِيدٗا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنۡ أَصَٰبَكُمۡ فَضۡلٞ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمۡ تَكُنۢ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُۥ مَوَدَّةٞ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ مَعَهُمۡ فَأَفُوزَ فَوۡزًا عَظِيمٗا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلۡيُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشۡرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَن يُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٧٤﴾ وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ

﴿فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار موسولمانانی ترساند لە هەلوێستو پیلانی دووڕووەکانو فەرمانی کرد کە پێویستە پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بن، ئەمجار فەرمانی بە پەیڕەوانی ڕێبازی ئیسلام کرد، کە لە ڕێگای خوداداو بۆ بەرزکردنەوەی ئالای ئیسلام تێبکۆشنو جیهاد بکەنو هەمیشە حازرو ئامادەباش بن بۆ بەرگری لە خۆیانو بەرپەرچدانەوەی پەلاماری دوژمنو ئەمجار حالّو چۆنیەتی برێ لەو دووڕووانەی بەیان کرد کە خەریکی ئەوەن موسولمانان لە جیهاد سارد بکەنەوە، ئەمەش وەرچەرخانە لە رامیاری کۆمەلایەتییەوە بۆ رامیاری جەنگی، گواستنەوەی تێکۆشانە لە گۆڕەپانی ناوخۆییەوە بۆ مەیدا دیارییەکانی کۆمەلگای ئیسلامی، ئەوەتا لەم ئایەتانەی دواییدا دابو نەریتو یاسای جەنگ لە ئیسلامدا روون دەکاتەوە، هەلوێستی نەگۆڕی دەولەتی ئیسلامی دەربارەی پەیوەندییەکانی بە ولاتانی دەرەوە لە کاتی جەنگدا دیاری دەکا، دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان! وریاو ئاگادار بن! لە دوژمنتان ئەمین مەبن، هەمیشە حەزەری لێ وەربگرن، هەمیشە ئامادەی بەرەنگار بوونەوەی دوژمن بن، چونکە ئێوە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەتان لێ دەکرێ: کە دوژمن پەلامارتان بدا، شەڕی دژوارو چارەنووس ساز یەخەتان بگرێ، بۆیە پێویستە هەموو دەم خەریکی دابین کردنی کەرەسەو پێویستیاتی بەرگری بن، بەگوێرەی رۆژگار فێری مەشقو راهێنانو بەکار هێنانی چەك بکەن، لە بەرامبەر دوژمندا وره بەرزو چاونەترسو مەردو نەبەرد بن.

حەزرەتی ئەبو بکر لە شەڕی یەمامەدا بە خالیدی کوڕی وەلیدی فەرمووی: شەڕیان لەگەلّدا بکە بەو چەکەی شەڕت پێ لەگەلّ دەکەن! شمشێر بە شمشێرو رمب بە رمب، هەروا لە هەموو سەردەمو چەرخێکدا پێویستە موسولمانان بە گوێرەی پێویست چەكو تەقەمەنی دابین بکەن ﴿فَانفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُواْ جَمِيعًا﴾

کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو مەیدانی جەنگ راجمن، پەل پەلو کەرت کەرت بەرەو بەرەنگاری کردنی دوژمن بکەونە ڕێ، هەمووتان پشتی یەکتر بگرنو یەك دەستو یەك هەڵوێست بن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پێویستە گەلی موسوڵمانان هەموو کات ئامادەباش بن بۆ جیهادو بەرگری، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ – الأنفال/٦٠﴾.

به هیچ جۆرێك نابێ موسوڵمان لە چوونە ناو شەڕ بترسێ؛ چونکە مەرگی ئادەمیزاد ساتێك پاشو پێش ناکەوێ، پێویستە موسوڵمانان هۆکارەکانی هێزو توانا دابین بکەن! قەزاو قەدەر نەکەنە بەهانەی تێشکانو نسکۆ، نابێ نائومێدییان تێدا دروست بکا.

ئەو حەدیثەی حاکم لە عائیشەوە دەیگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: «لاحَذَرٌ مِنْ قَدَرٍ» دژایەتی لەگەڵ «خُذُوا حِذْرَكُمْ» ناگەیەنێ چونکە حەزەرو وریایی بەشێکە لە قەدەر، چونکە قەزاو قەدەر بریتییە لە رابوونی کارەکان بە گوێرەی هۆکارەکان، واتە: موسوبەب بە رواڵەت بە گوێرەی سەبەب دێتە کایەوە، کەوابێ حەزەر بەشێکە لە ئەسبابو کارکردنە بە گوێرەی قەزاو قەدەر!!

﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ بەلاّم برێك لە ئێوە لە گۆڕەپانی بەرەی ناوخۆییدا لە جیهادو تێکۆشان دوا دەکەوێ، یان کۆسپو تەگەرە دەخاتە بەردەم رۆیشتنی جەنگاوەران، یان وا دەبێ هەوڵ دەدا جەنگاوەران لە چوون بۆ شەڕ سارد بکاتەوە، ئەوانە دووڕووو بڕوا لاوازو ترسنۆکن.

دووڕووەکان بۆخۆیان نایانەوێ بچن بۆ جەنگو شەڕ بکەن، چونکە ئەوان ئایینو بڕوادارانیان خۆش ناوێن، بە سروشت دژی سەرکەوتنی موسوڵمانانو نایانەوێ سەرکەوتن بەدەست بێنن! بڕوا لاوازو ترسنۆکەکانیش سەرکەوتنی موسوڵمانانیان پێ خۆشە، بەلاّم بۆخۆیان دوو دڵن لە هاوبەشی کردن لە جیهادو بەرامبەری کردنی دوژمن، چونکە ترسنۆكو وره نزمو دونیا خۆشەویستن. ئەوانە لە ئاوی لێڵو قوڕاودا ماسی دەگرن! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ هی وا هەیە بە رواڵەت بە گرۆهی ئێوە حسێب دەکرێ لە ریزی موسوڵمانان

دەژمێردرێ بەڵام لە چوون بۆ شەڕو جیهاد خۆپاش دەداو خاوەخاو دەکا، وەکووو عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیو دووڕوو هاوەڵانی چاوەڕێی ئاکامو نەتیجەی شەڕەکە دەکەن جا ﴿فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ ئەگەر تووشی بەڵاو تێشکان بوون، لێتان کوژرا، بە ناچاری تووشی هەڵاتنو پاشەکشێ بوون، کەیف خۆش دەبن بەوەی کە ئەوان لەگەڵ نەبوونو تووشی ئەو ناخۆشیو کوشتنو بریندار بوونە نەهاتنو بە ئاشکرا دەڵێن: ئۆخەی کە ئامادەی جەنگی خۆ بە کوشت دان نەبووینو تووشی ئەو چەرمەسەرییە نەهاتووین، پێیان وایە: ئەوە نیعمەتی خودایە بەسەریاندا ڕژاوە، نازانن کە چ زەرەرو زیانێکیان لێ کەوتووە، کە پاداشی خۆڕاگریو نارەحەتیو شەهید بوونیان لەکیس چووە ئەگەر بکوژرانایە!

﴿وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللهِ لَيَقُولَنَّ - كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ - يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ ئەگەر خێروبێرێکتان تووش بێ، سەرکەوتنو دەستکەوتنی جەنگتان دەست دەکەوێ، دەڵێن: هەروەکوو لە گرۆهی ئێوە نەبنو لە ڕیزی ئێوە نەبن، خۆزگە هابەشی جەنگمان بکردایە بۆ ئەوەی بەشێکمان لە تاڵانو دەستکەوتی جەنگ بەربکەوتایە! گەشەو نەشەی سەرکەوتنمان بە خۆوە ببینایەو لافی ئازایەتیو نەبەردیو مەردایەتیمان لێ بدایە؛ ئەوانە لە هەردوو حاڵەتەکەدا عەقڵ سووكو کورت بینو بڕوا لاوازو ترسنۆکن، بۆیە پەروەردگار بە ڕستەیەکی پڕ ماناو کاریگەر لۆمەی کردنو ئەوەی گەیاند کە ئەوانە پەیوەندییان بە کۆمەڵی موسوڵمانانەوە نیە.. فەرمووی: ﴿كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ﴾ ئەمە ڕستەیەکی کاریگەرە لە دڵو دەروونی بیسەرداو هەست دەوروژێنێ، چونکە دەیخاتە سەر ئەوە بیر لە حاڵی خۆی بکاتەوەو عەیبو لەکەی خۆی بزانێ.

ئەمجار پەروەردگار باسو چۆنیەتی ورە لاوازو تەمبەڵو ترسنۆکەکان دەگوێزێتەوە دێتە سەر باسی کۆمەڵی ورە بەرزو ئازاو مەردو نەبەردان، ئەوانەی لە بازنەی دواکەوتنو خۆپاشدان دەردەچنو دەچنە پلەو پایەی ڕێزداران وخۆبەخت کەرانو دڵو دەروونی خۆیان لە تاوانی نەچوون بۆ شەڕو بەرگری نەکردن پاك دەکەنەوە، ئەوەتا لەم دوو ئایەتەی دوایی دا بەندە موسوڵمانەکانی هەڵدەنێ بۆ جیهادو کۆشش کردن لە ڕێگای خودادا، بۆ ڕزگار

کردنی ئەو ژن‌و منداڵ‌و بێ دەسەڵات‌و هەژارانەی کە لە مەککە مابوونەوە، هەروا بۆ رزگار کردنی موسوڵمانانی بێ دەسەڵات‌و نەدارا لە هەر شوێنێك بن، دەفەرموێ: ﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ﴾ با خاوەن باوەڕان شەڕ بکەن، لە ڕێگای خودادا بۆ بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلام‌و کەلیمەی (لا إله إلا الله) با ئەوانەی ژیانی دونیای بێ بەقا دەفرۆشن بە ژیانی جاویدانی نەبڕاوەی قیامەت، لە پێناو ئایینی خودادا بجەنگێن، بۆ سەرخستنی ئایین‌و چەسپاندنی یەکتاپەرستی‌و عەدل‌و سەرفرازی‌و ئازادی‌و سەربەستی خۆیان بەخت بکەن، وشەی ئیسلام سەربخەن‌و وشەی کوفر داگرن. ئەوانە لە ڕێگای ئایینی خودادا دەجەنگێن چ سەربکەون یان تێبشکێن بە مراز گەیشتوو بەختەوەرن، چونکە ﴿وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيُقْتَلْ أَو يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ کەسێك شەڕ بکا لە پێناو ئاییندا‌و لە ڕێگای خودادا، دوژمن بەسەریدا زاڵ بێ یان ئەو بەسەر دوژمندا سەربکەوێ، ئەوە بێگومان خودا لە هەردوو حاڵەتەکەدا پاداشی گەورە‌و زۆر‌و نەبڕاوی پێ دەبەخشێ؛ کە بریتییە: لە بەهەشت‌و پاداشی باش.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر گرنگی جیهاد‌و تێکۆشان، هەتا موسوڵمانان گیانی خۆبەخت کردن‌و جیهادیان تێدا بێ، دوژمن لێیان دەترسێ، وڵاتیان پارێزراو ئایینیان گەشەدار‌و شەریعەتیان کار پێ کراو چەسپاوە؛ هەرکاتێکیش وازیان لە جیهاد هێنا، دوژمن تەماعیان تێ دەکا‌و وڵاتیان داگیر کراو شەریعەتیان لە بیر کراوە، شان‌و شەوکەتیان نەماوە‌و ژێر دەستە‌و چەوساوەن!

ئەمجار پەروەردگار زیاتر جەختی لەسەر گرنگی جیهاد کرد‌و فەرمووی: ﴿وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ﴾ چی دەبێتە کۆسپ‌و تەگەرە ناهێڵێ ئێوە جیهاد بکەن؟ چ عوزر‌و بەهانەیەکتان بەدەستەوەیە؟ کە ناچن لە پێناو ئایینی خودادا بجەنگێن؟ بۆچی هەوڵ نادەن یەکتاپەرستی لە شوێن هاوەڵ دانان بۆ خودا بچەسپێنن؟ خێر لە شووێنی شەڕ‌و دادو بەزەیی لە جێی ستەم‌و دڵڕەقی دەستەبەر بکەن؟؟

چی دەستی ئێوەی بەستووە؟ بچن هەژار‌و لێقەوماوان؛ ژن‌و منداڵ‌و پیاوە موسوڵمان‌و ژێر دەستە بە جێماوەکانی مەککە لە چنگی کافرەکانی قوڕەیش رزگار

بکەن، کە ناهێڵن کۆچ بکەن، هەمیشە زەختیان لێ دەکەن لە ئیسلام ژێوان ببنەوە، ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَـذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا﴾ ئەو لێقەماو لاوازانە یارمەتیدەرو پشتیوانیان لە کیس چووە، ئەوان لە ژێر زەختی چەوساندنەوەدان، لەبەر ئازارو ئەشکەنجە دەڵێن: خودایە! لەم شارە رزگارمان بکە کە مەککەیەو دانیشتوانی کافرن، ستەم لە بەندە بێ دەسەڵاتەکان دەکەن‌و گەردن بۆ زاتی پاکت کەچ ناکەن‌و هاوەڵت بۆ دادەنێن ﴿وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾ خودایە! سەرکردەیەکمان بۆ بڕەخسێنە سەرپەرشتیمان بکاو کاروبارمان بەدەستەوە بگرێ؛ لەم جەورو ستەمە رزگارمان بکا، گیان‌و نامووسمان بپارێزێ، یارمەتیدەرێکمان بۆ بنێرە ستەم‌و زۆرمان لەسەر لابەرێ‌و بەسەریاندا سەرمان بخا، کۆمەکیمان بکا بۆ کۆچ کردن‌و رزگاربوونمان لەم ناخۆشیە. تەنها قاپی تۆمان هەیەو هەر تۆ فریادرەسمانی پشت‌و پەنای لێقەوماوو هەژارانی. ئەمجار پەروەردگار لە ئایەتی داهاتوودا موقارەنەو بەرامبەری یەك ساز دەدا مەبەستی هەردوو لایەنی کێشەو ناکامی شەڕەکە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ ئەوانەی خواناس‌و موسوڵمانن لە پێناو ئایینی خودادا شەڕ دەکەن، بۆ بەرز کردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله) جیهاد دەکەن‌و تێدەکۆشن، بۆ چەسپاندنی عەدل‌و دادپەروەری خەبات دەکەن، دەیانەوێ گەل‌و نەتەوەکان لە چەوساندنەوەو ژێردەستەیی رزگار بکەن مەبەستیان تاڵان‌و داگیر کردن‌و چەوساندنەوەی گەلان نیە، نایانەوێ زوڵم‌و ستەم لە کەس بکەن، ماڵ‌و سامانی کەس چەپاو بکەن (وەکوو ئێستا باوە).

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ﴾ بەڵام ئەوانەی کافرو خوانەناسن شەڕ دەکەن لە پێناو تاغووتدا بۆ مەبەستی خەیاڵی‌و بێ سەروبەرە، بۆ بەدەستهێنانی شتی ماددی کاتی‌و پڕوپووچ کۆشش دەکەن، دەیانەوێ بە پێی ویستی شەیتان هەڵس‌وکەوت بکەن، بت پەرستی پەرە پێ بدەن، یارمەتی کوفرو بێدینی بدەن، یان دەیانەوێ تاڵان‌و بڕۆ بەدەست بێنن، یان بۆ شانازی‌و خۆهەڵنانەوەو بە خۆنازین‌و بزەو نەشەی سەرکەوتن‌و بە ئازایی‌و دەرکردنی ناوو شۆرەت لە ناو هۆزو گەلاندا.

بەڵام سەرەنجامو ئاکام سەرکەوتنی حەقو راستییە بەسەر بەتاڵدا؛ چونکە حەقو راستی هەمیشە بە هێزو پتەوو دامەزراوە، رێڕەوانی خۆگرو کۆڵنەدەرن، بەتاڵ بێ هێزو تێشکاوە، ریرەوانی زەبوونو ترسنۆکن، هەمیشە حەق سەرکەوتووە، هیچ شتێك بەسەریدا سەرناکەوێ، بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردو فەرمووی: ﴿فَقَاتِلُواْ أَوْلِيَاء الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! شەڕ لەگەڵ کافرو پەیڕەوانی شەیتان بکەن؛ ئەوانەی شەیتان هەڵی خەڵتاندوونو وای تێگەیاندوون کە زوڵمو ستەمو وێران کردنی وڵات سەروەرییەو پلەو پایە دەدات بە ئادەمیزاد!!

ئەی گرۆهی موسوڵمانان! با هێزو تواناو ژمارەی زۆرو زۆری چەكو ئامێری جۆراو جۆریان ئێوە لە خشتە نەبا، چونکە ئەوە فێڵو تەڵەکەی شەیتانە، پیلانو وەسوەسەی ئەوە، فێڵو تەڵەکەی شەیتانیش لای هۆشمەندانو ڕووناکبیرانو خاوەن باوەڕان لاوازو بێ نرخە، شەیتان پیلانی هاوەڵو ڕیرەوانی هەمیشە تێشکاو ژێر کەوتوون. بەڵام ئێوە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! سەرپەرشتیارو گەورەو یارمەتیدەرتان خودای زاناو دانایە، ئەو پشتو پەناتانە، لەشکرو سەربازانی رێبازی خودا هەمیشە سەرکەوتوون حیزبو پارتی خودا سەرفرازو بە مراز گەیشتوون.

## حاڵو چۆنیەتی ئادەمیزادەکان لەکاتی فەرض کردنی جەنگ دژی کافران

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ

لِمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖۗ وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِكَۚ قُلۡ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلۡقَوۡمِ لَا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ حَدِيثٗا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ وَأَرۡسَلۡنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولٗاۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴿٧٩﴾ ﴾.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ....﴾ دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە نەسائیو حاکم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: (عەبدولرەحمان)ی کوڕی عەوفو چەند هاوەڵێکی هاتنە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتیان: قوربان! ئێمە پێش ئەوەی موسوڵمان ببین لەوپەڕی هێزو توانادا بووین، کە موسوڵمان بووین تووشی زەلیلیو چەوساندنەوە بووین، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی من فەرمانم پێ کراوە بە لێبووردنو لاشەڕی، دەبێ خۆتان بگرنو شەڕ لەگەڵ قوڕەیشییەکان نەکەن، پاشان: کە موسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینە فەرمانیان پێ کرا بەشەڕ کردن لەگەڵ کافران بڕێکیان خۆیان پەنا داو ئامادەی جیهاد نەبوون؛ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ.

حەسەنی بەصری دەڵێ: دەربارەی موسوڵمانان هاتۆتە خوارێ، موجاهید دەڵێ: دەربارەی جوولەکە هاتۆتە خوارێ، بڕێکیش دەڵێن: دەربارەی دووڕووەکان هاتۆتە خوارێ. بەهەر حاڵ رای حەسەنی بەصری رایەکی لاوازە، چونکە لە مێژووی هاوەڵانی پێغەمبەردا نەبیستراوە کە سەرپێچی لە ئەنجام دانی حوکمێکی قورئان بکەنو رەخنە بگرنو بەو شێوە زەقە هەڵوێستی ئاوا نالەبار بنوێنن!

پەیوەندی ئەم ئایەتە بە ئایەتەکانی پێشەوە ئەوەیە: لەوە پێش پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کرد خۆ ئامادە بکەن بۆ شەڕ لەگەڵ کافراندا باسی ئەوانەی کرد کە خۆ لە چوونە شەڕ پاش دەدەن، فەرمانی پێ کردن کە لە ڕێگای خوادا شەڕ بکەنو موسوڵمانە لێقەوماوەکانی مەککە لە دەستی قورەیشییەکان ڕزگار بکەن. ئەمجار لەم ئایەتەدا باسی حاڵو چۆنیەتی کۆمەڵێك دەکا: کە پێش کۆچ کردن ویستوویانە شەڕ لەگەڵ قورەیشییەکان بکەن لە مەککەدا، کاتێك پاش کۆچ کردن شەڕیان لەسەر واجب کرا پێیان ناخۆش بوو، ئیتر پەروەردگار سەرکۆنەی کردنو فەرمووی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّواْ أَيْدِيَكُمْ﴾ ئەتۆ سەیر ناکەی بۆ ئەو کەسانەی لە مەککە لە سەرەتای ئیسلامدا پێیان گوترا: ئاشتی بپارێزن، خۆتان لە تێوەگلانی شەڕ بپارێزن. لەبەر چەند هۆیەك بارودۆخ لەبار نەبوو بۆ شەڕ کردن کە هۆیەك لەوانە کەمی موسوڵمانانو زۆری کافرەکان بوو، هەروەها شوێنەکەشی شاری مەککە بوو: کە (بلد الحرام)ە ڕێزدارترین شوێنی سەر زەوییە، شەڕ کردن تێیدا قەدەغەیە! لەبەر ئەوە فەرمانیان بە جیهاد پێ نەکرابوو تا کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە ڕێگای شەڕ کردنیان پێ نەدرا، کەچی کە فەرمانیان پێ کراو جیهادیان لەسەر فەرز کرا ترس دایگرتنو لیوە لەرمیان پی کەوت!! بۆیە خوا بەو شێوە سەرزەنشت کردنە هەڵوێستەکەیان دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ئەو کاتە پێیان گوترا: ئاشتی بپارێزنو خۆتان لەشەڕ دوور بگرن ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ﴾ نوێژ بەجێ بێنن بە ڕێكو پێکی ئەنجامیان بدەن ﴿وَآتُواْ الزَّكَاةَ﴾ زەکاتی ماڵو داراییتان دەربکەن کە سەردەکێشێ بۆ پەیدا بوونی خۆشەویستی لە نێوان خەڵکدا، عەرەبەکان وەکوو هەموو گەلانی دوور لە خواپەرستی – لەسەردەمی نەزانیدا – زۆرجار بە بروبیانووی پڕوپووچ شەڕیان هەڵدەگیرساند، دڵیان پڕ بوو لەڕقەبەریو دژایەتیو دوژمنایەتی کردنی یەکتری، کەچی ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾ کە لە دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە شەڕیان لەسەر پێویست کرا کۆمەڵێك لە دووڕووەکانو موسوڵمانە ترسنۆکەکان بوون پێیان ناخۆش بوو، ترسان لەوە کە کافرەکان شەڕیان لەگەڵ بکەنو بکوژرێن، وەکوو چۆن لە سزای خودا دەترسێن بەڵکوو زیاتر لەوان

دەترسان. تەنانەت ترسانەکەیان بە ڕێژەیەك بوو؛ کە خۆیان پێ نەگیراو بانگیان لێ بەرز بووەوە ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ﴾ گوتیان، پەروەردگارا! بۆچی شەڕکردنت لەسەر پێویست کردین؟ بۆ لێمان ناگەڕێی بۆخۆمان بە مردنی سروشتی بمرین ﴿لَوْلا أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ بۆچ پێویست کردنی شەڕ لەسەرمان بۆ ماوەیەکی تر دوات نەخست، شەڕ کارێکی خراپە، خوێن ڕشتنی تێدایە، منداڵ هەتیو دەبن، دایكو باوك جەرگ سوتاو دەبن.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکا کە شوبهەکەیان رەت بکاتەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَتَاعُ الدَّنْيَا قَلِيلٌ﴾ داواکردنتان بۆ دواخستنی شەڕو خۆپاشدانو خۆشاردنەوەتان لە چوون بۆ شەڕ لە ترسی مردن لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە حەزتان لە کاڵای دونیاییەو دونیا پەرستن! لە کاتێکدا هەموو لەززەتو خۆشی دونیا هیچو پووچو بڕاوەو روو لە نەمانەو لە ئاست نیعمەتو لەززەتی قیامەتدا بە هیچو بێ بایەخ دەژمێردرێ، دوا رۆژی خواپەرست زۆر باشترە لە جیهانی بێ بەقا، نیعمەتەکانی دونیا کەمو فەوتاون، نیعمەتەکانی قیامەت زۆرو بەردەوامو بێ ئەرکو بێ نارەحەتییە، کەسێك تەقواکارو خودا پەرست نەبێ بەو لەززەتو خۆشییە ناگا! کەوابێ پابەندی فەرمانی خودا بنو خۆ بپارێزن لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی، ﴿وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَى﴾ قیامەت باشترە بۆ تەقواکاران ﴿وَلاَ تُظْلَمُونَ فَتِيلاً﴾ هیچ شتێك لە کردەوەکانیان کەم ناکرێتەوە، ئەگەر بە ئەندازەی داوە دەزووی درزی دەنکە خورماش بێ! پاداشیان دەدرێتەوەو پاش گوێ ناخرێ!

مردنیش کارەساتێکی گشتییەو هەموو کەس دەگرێتەوەو کەس لێی رزگار نابێ ﴿أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ لەهەر شوێنێك بن مردن دەستی پێتان دەگاو یەخەتان دەگرێ! تەنانەت ئەگەر لە قەڵاو باڵەخانەی قایمو پتەویشدا بن، چونکە فریشتەی مەرگ هاوەر (ئیزرائیل) هیچ لەمپەرێ بەری ناگرێو هیچ شتێك نایگێڕێتەوە، وەکوو خودا دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ – العنكبوت/٥٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ – الرحمن/٢٦﴾ یان

دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ – الأنبياء/٣٤﴾.

جا ئەگەر مردن سەرەنجامو ئاکامی هەموو زیندەوەرێك بێو هەرکەسە بەمەرگی دیاری کراوی خۆی بمرێ، ساتێك پاشو پێش ناکا! هەرکەسێك کە ئاکام (ئەجەل)ی هات دەبێ بمرێ! ئیتر دەبی بۆچی ئادەمیزاد لە مردن بترسێ، چونکە ئینسان بچێتە گۆڕەپانی شەڕ، یان نەچێ تەمەنی دیاری کراوی هەیە چوون بۆ شەڕ ییان نەچوون بۆ شەڕ هیچ لە مەرگو کۆتایی ژیان ناگۆڕێ! وەکوو خالیدی کوڕی وەلید لەسەرەمەرگا لەسەر نوێنی مردن فەرمووی: ئەو هەموو شەڕو جەنگەم بینین، شوێنێك لە جەستەمدا نیە کە سەرە ڕمو سەرە تیری پێوە نەبێ، کەچی ئەوەتا وا دەمرم لە ناو نوێندا. یاخوا ترسنۆکەکان خەویان لێ نەکەوێو داوەشێن!!

ئەمجار پەروەردگار باسی شتێك دەکا کە ئادەمیزاد سەری لێ سوڕ دەمێنێ بەهۆی وتەو قسەو چاووڕاوی ئەو دووڕووانە کە هەرگیز هەڵوێستێکی هۆشمەندانە نانوێننو قسەیەکی ڕاست ناکەن ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُواْ هَذِهِ مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ ئەگەر خۆشیو کامەرانییەکیان پی بگا، غەنیمەتو هەرزانیو رزقو ڕۆزییەکیان دەست بکەوێ، کشتو کاڵو بەروبوومیان باش بێ، کوڕو کچیان ببێ دەڵێن: ئەمانە لە خوداوە دەستمان کەوتووە، دەستی کەسی تێدا نیەو خودا پێی بەخشیوین ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُواْ هَذِهِ مِنْ عِندِكَ﴾ ئەگەر بەڵاو نەخۆشی روویان تێ بکا، تێشکانیان بەسەردا بێ، گرانیو نەبوونی ژیانیان بەسەردا بێ، بەروبوومو کشتو کاڵیان کەم بێ، بەری رەزیان بەر لافاو تەرزە بکەوێ، منداڵیان نەبێ، یان بمرن، ئەی محمد! بەهۆی شوێن کەوتنمان بۆ ئایینەکەی تۆ تووشی ئەم هەموو نەهامەتییە هاتووین، وەکوو چۆن دارو دەستەی فیرعەون هەمان هەڵوێستیان بەرامبەر بە مووسا هەبوو ﴿فَإِذَا جَاءتْهُمُ الْحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَذِهِ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَى وَمَن مَّعَهُ أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِندَ – الأعراف/١٣١﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ – الحج/١١﴾. هەر بەو جۆرە دووڕووە جوولەکەکان کە بە ڕواڵەت موسوڵمان بوو بوونو لەڕاستیدا دژی ئایینی ئیسلام بوون، ئەگەر تووشی بەڵاو ناخۆشییەك ببوونایە، دەیانداییە پاڵ

ئەوەی کە پەیڕەوی ئایینی ئیسلام دەکەن، پەیڕەوی (محمد)یان دەکرد بە مایەی ڕەشبینیو دەیانگوت: ئەی موحەممەد ئەمەمان بە هۆی تۆوە تووش هاتووە! واتە: بەهۆی وازهێنانمان لە ئایینی خۆمانو شوێنکەوتنی ئایینی تۆ تووشی ئەوە هاتووین! ئیتر پەروەردگار ڕەدی دانەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللّهِ﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: ئەو بۆچوونەتان هەڵەیە، ئەو ڕووداوانە لە لایەن خوداوەیە، هەموو شتێ بە قەزاو قەدەری خودایە، قەزاو قەدەری خودا لە هەموو شتێکدا کاریگەرە، چاکەو خراپە، خۆشیو ناخۆشی بۆ موسوڵمان، بۆ کافر، بەپێی قەزاو قەدەرە.

﴿فَمَا لِهَـؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾ ئەوە ئەو خەڵکە چیان لێ قەوماوە؟ عەقڵو هۆشیان تووشی چ شڵەژانێ بووە؟ بۆچی تێناگەنو بەهۆش خۆیانەوە نایەنەوە؟ بۆ لەو ئاخاوتنو وتوێژە حاڵی نابن کە ئاراستەیان دەکرێ؟ بۆ ئەوەندە کەودەنو نەفامو نەزانن؟!

﴿مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللّهِ﴾ ئەی محمد: مەبەستیش هەموو ئادەمیزادە هەر چاکەو خێرو خۆشیو هەرزانیو لەش ساغییەك تووشتان دێ ئەوە لە خوداوەیە، ئەوە لە فەضلو گەورەییو ڕەحمەتی خوداوەیە بۆ ئێوەی ئادەمیزاد بە هۆی ئەوەوەیە: کە تۆفیقی داون بۆ ئەوەی ڕێگای سەرکەوتنو خێرو خۆشی بگرنە بەر ﴿وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ﴾ ئەو بەڵاو تەنگو چەڵەمانەی تووشت دێن ئەوە بە هۆی هەڵوێستو کرداری خۆتەوەیە، لەم ڕووەوە کە ڕێبازی عەقڵو حیکمەتت نەگرتۆتەبەرو بە گوێرەی یاسای یەزدانیو بە گوێرەی زانیاریو تاقی کردنەوەی زانستی هەنگاوت نەناوە! تەنانەت دەڵێن: نەخۆشی بە هۆی هەڵسو کەوتی نالەباری ئادەمیزاد خۆیەتی وەکوو خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ - الشورى/٣٠﴾.

زۆر فەرموودە لە پێغەمبەرو فەرمایشت لە خواناسانەوە گێڕدراونەوە کە تاعەت کردن بۆ خودا دەبێتە هۆی نیعمەتو خۆشی هەردوو جیهانو سەرپێچیکردنیش بەڵاو موسیبەت ئاوەرە، تاعەتی خودا بەوە دەبێ کە بە گوێرەی یاسای نێردراوی ئەو ڕەفتار بکەی، هەموو شتێ لە جێگای سروشتی خۆی دابنرێو

بـەکار بهێنـرێ، ئـەم ئایەتـە بنەمایەکـە لـە بنـەماکانی زانیـاری کۆمەڵایـەتیو دەروونناسی، دەرمانی دەردی خەرافاتی نەزانیو بتپەرستییەو، رێزلێنانە بۆ خودی ئادەمیزاد ﴿وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولاً﴾ ئێمە تۆمان ناردووە ئـەی موحەممـەد! بۆسـەر ئادەمیزاد بە پێغەمبەر، پێغەمبەریش بەس راگەیانـدنو بانگـەوازی لەسـەرە، ئـەوە بەدەست تۆ نیە کە خـەڵك تووشـی خۆشـیو ناخۆشـی دەبـن! ئـەتۆ چ دەسـەڵاتێکت لەوەدا نیە، کە ئەوان تووشی باشە دەبن یان تووشی ناخۆشی دێن ئـەتۆ رەهبـەریو شەرعی خودا بەو مەردومگەلە رادەگەیەنی، ئەوەیان تێ دەگەیـەنی کـە خـودا پێـی خۆشـە یـان پێـی ناخۆشـە ﴿وَكَفَـى بِاللَّـهِ شَـهِيدًا﴾ بەسـە بـۆ تـۆ کـە خـودا شـایەدو گەواهیدەرە کە تۆ پێغەمبەرو رەوانە کراوی زاتی پاکی ئـەوی، ئاگـادارە بـەوەی کـە روو دەدا لە نێوان ئەتۆو ئەواندا، زانایە بەوەی پێیـان رادەگەیـەنیو بـە هەڵوێـستی بەرامبـەری ئـەوانو سـەررەقیو دژایـەتی کردنـی ئـەوان بـۆ پەیامەکـەت. تـۆ هـەر راگەیاندنو بانگەوازیت لەسەرە، خێرو شـەڕ هـەمووی بەدەسـتی خودایـە لـە رووی خەلقو ئیجادەوە، شـەڕو نەگبـەتیش لـە ئـادەمیزاد خۆیەوەیـەتی لـەڕووی کەسـبو ئیختیارەوە!! بە کورتی پێویستە ئێمەی ئادەمیزاد دوو شت بزانین:

یەکەم: هەموو شتێك لە خواوەیە، واتە: خودا بەدیهێنەری هەموو شـتێکە هـەر ئەو نیظامو یاسای بوونەوەری داناوە بۆ ئـەوەی ئینـسان بـە هـەوڵو کۆشـشی خـۆی کاریان تێدا بکا.

دووەم: هــەر شــەڕو خراپەیــەك کــە تووشــی ئــادەمیزاد دەبــێ بــەهۆی کەمتەرخـەمیو پـەیڕەو نـەکردنی یاسـای بوونـەوەرو نـەزانینو پـەیڕەو نـەکردنی رێگای راستو دروست تووشی دەبێ!

چ دژایەتییـەك لـە نێـوان ئایـەتی ﴿كُـلٌّ مِّـنْ عِنـدِ اللَّـهِ﴾ واتـە: هەمووچاکەو خراپەیەك لە خوداوەیـەو ئایـەتی ﴿ وَمَـا أَصَـابَكَ مِـن سَـيِّئَةٍ فَمِـن نَّفْـسِكَ﴾ دا نیـە چونکە ئایەتی یەکەم واتای دروست کردنو بەدیهێنانی لێ وەردەگیرێ واتـە: چاکەو خراپـە خـودا دروسـتیان دەکـاو بـە دییـان دەهێنـێ، ئایـەتی دووەم مەبەسـت لێـی هۆیەتیو ئەنجامدانە واتە: خراپەو ناخۆشییەك کە تووشت دەبێ بـە هـۆی تـاوانو

کورت بینی خۆتەومیە ئەی ئادەمیزاد! کە کۆڵەواری لە تێگەیشتنی یاساو دەستوورە گشتییەکان!

## گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر گوێڕایەڵی فەرمانی خودایە

﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾.

پەیوەندی ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتەکانی پێشودا ئەوەیە: لێرەدا پەروەردگار جەخت لەسەر فەرمانەکەی پێشوو دەکاتەوە کە فەرمانی کرد بە پابەند بوون بە فەرمانی خوداو پێغەمبەرو ئەوە روون دەکاتەوە کە بە گوێ کردنی فەرمانی پێغەمبەر لە راستیدا بە گوێ کردنی فەرمانی پەروەردگارە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە وەکوو موقاتیل دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو «مَنْ أَحَبَّنِي فَقَدْ أَحَبَّ اللَّهَ مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ» دووڕووەکان گەزافیان کێشاو گوتیان: نابیسن ئەم پیاوە چ دەڵێ: ئەوەتا نزیکە خۆ بکا بە خودا، لە کاتێکدا خودا نەهی لێ کردووین‌و داوامان لێ دەکا کە جگە لە خودا کەسی تر نەپەرستین، کەچی ئەم دەیەوێ بیکەین بە خودا وەکوو چۆن مەسیحییەکان عیسایان کردووە بە خودا، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ:

﴿مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّـهَ﴾ لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار دەربارەی بەندەو رەوانە کراوی خۆی حەزرەتی (محمد) دەفەرموێ هەرکەسێك بە قسەی بکا مانای وایە بە قسەی خودای کردووە. کەسێك لێی یاخی بێ ئەوە لە خودا یاخی بووە، چونکە (محمد) پێغەمبەری خودایە، قسەی لە هەواو ئارەزوو خەیاڵ سەرچاوە هەڵناگرێ بەڵکوو هەرچی دەیڵێ بە نیگاو سروشتی خودایییە، پیرانی فەرمووده: موسلیم‌و بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي» کەسێك بە گوێی من بکا، ئەوا پابەندی فەرمانی خودایە، کەسێك لە من یاخی بێ، ئەوا لە خودا یاخی بووە، کەسێك بە گوێی فەرمانڕەوایی موسوڵمانان بکا بە گوێی فەرمانی منی کردووە، کەسێك لە فەرمانڕەوای موسوڵمان یاخی ببێ لە من یاخی بووە!

پوختەی قسە ئەوەیە: ئایەتەکە مانای وایە: هەرکەسێك بە گوێی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بکاو پابەندی فەرمانەکانی بێ، ئەوا لە راستیدا پابەندی فەرمانی خودایە، چونکە لە راستی‌و حەقیقەت خودا فەرماندەرو نەهیکەرە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) راسپێراو راگەیەنەرە، بەڵام برێ کاری دونیایی هەیە، پێغەمبەر فەرمانمان پێ دەکا، وەکوو متوربە کردنی دارخورمای مێ لە تۆوی دارخورمای نێر، کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ (تأبیر) هەتا بەری باش بگرێ، کە جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە یارانی فەرموو: (ئەگەر نەیشیکەن قەیناکا) دوای خورماکەیان خراپ دەرچوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَنْتُمْ أَعْلَمُ بشؤون دُنْيَاكُمْ» واتە: خۆتان لە کاروباری جیهانیتان باشتر دەزانن.

یان خواردنی زەیت‌و خۆچەور کردن پێی، یان پێوانی خواردەمەنی وەکوو گەنم‌و شتی تر لە کاتی هاڕین‌و کردنی بە هەویر، ئەوە زۆربەی ئەم جۆرە گوتارو کردارانە بیروبۆچوونێکی رووتی دونیایی پێغەمبەرەو پابەند بوونی موسوڵمانان پێی واجب نیە! هەندێك جار هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە

فەرمانێکی پێغەمبەریان بە بۆچوونی خۆیان بزانیانە، بۆ ئەوەی بزانن: کە ئەو فەرمانە گفتوگۆو موناقەشە هەڵدەگرێ، عەرزیان کرد: ئەمەی دەیفەرمووی: راو بۆچوونی خۆتە، یان سروشە لە خوداوە هاتووە؟؟

جا ئەگەر فەرمانەکە نیگای خودایی بوایە، بەبێ ئەملاو ئەولا پابەندی دەبوون.. ئەگەر بیروبۆچوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی بوایە، ئەوە رایەکی باشتریان دەردەبڕی‌و داوایان لێ دەکرد کە لە راکەی خۆی دابەزێ!! وەکوو لە غەزای بەدرو ئوحوددا روویدا.. گەلێ جاری وایش بووە پێغەمبەر هاتۆتە سەر رای ئەوان.

﴿وَمَن تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ هەرکەسێك روو وەرگێڕێ لە فەرمانەکانی تۆ ئەی (محمد!) خەسارەتمەندو ماڵ وێرانە، تۆ بەرپرسیاری تاوانی ئەوان نی، رێگای ئەوەشت نیە کە بەزۆر ویستی خۆتی بەسەردا بسەپێنی، تۆ بەس پێ ڕاگەیاندنت لەسەرەو زۆرە ملێت نیە، زۆری پێ ناچێ زەرەرو زیانی سەرپێچی کردنەکەی خۆیانیان تووش دەبێتەوە، وەکوو لە حەدیثی صەحیحدا هاتووە «مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّهُ لاَ يَضُرُّ إِلاَّ نَفْسَهُ» (( کەسێ فەرمانی خوداو پێغەمبەری جێبەجێ بکا، سەرفراز دەبێ، کەسێکیش سەرپێچی لە فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری بکا، ئەوە زیان بە خۆی دەگەیەنێ)) ئەمجار پەروەردگار پەردە لەسەر پیلان‌و فێڵ‌و تەڵەکەی دووڕووەکان هەڵدەداتەوەو دەفەرمووێ: ﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ﴾ لەلای خۆت دەڵێن: فەرمانت بەجێیە، قسەت بیسراو لەسەر چاوە، کە ئەمەش دەڵێن: بە راستیان نیەو بە دووڕوویی‌و نیفاقەوە ﴿فَإِذَا بَرَزُوا مِنْ عِندِكَ﴾ کە لەلای تۆ رۆیشتن‌و لە تۆ هون بوون ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ﴾ شەو لەناو خۆیاندا رایەکی تر، جیاواز دەردەکێنن‌و هەڵوێستێکی تر وەردەگرن پابەندی وادەو پەیمانی خۆیان نین.

ئیبنو جەریری طەبەری لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەوانە واتە: دووڕووەکان – کەسانێکن لای پێغەمبەر دەڵێن بڕوامان بە خوداو پێغەمبەری خودا هەیە، بۆ ئەوەی ماڵ‌و گیانیان پارێزراو بێ، کە لای پێغەمبەر دەردەچن بە پێچەوانەی ئەوەی گوتوویانە لای پێغەمبەر قسە دەکەن‌و هەڵوێستی جوداوازیان

هەیە؛ بۆیە پەروەردگار لۆمەو سەرزەنشتیان دەکا. ﴿وَاللّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ﴾ خودا دەزانێ بە شەو چ قسەو باسێك دەکەن و چ پیلان و هەڵوێستێکیان هەیە، لەسەریان تۆمار دەکا بە فەرمانی خودا فریشتەی چاودێر هەموو هەڵس و کەوتیان تۆمار دەکەن. واتە: خودا بەم هەڕەشەیە ئەوە رادەگەیەنێ کە خۆی ئاگادارو زانایە بەو مەبەست و هەڵوێستەی کە لە دڵیاندایەو لە ناو خۆیاندا ئاشکرای دەکەن و ئەوەی بە شەو لەسەری رێك دەکەون لە بارەی دژایەتی کردنی پێغەمبەرو لێ یاخی بوونی، هەرچەندە بە رواڵەت لای خۆی ملکەچی نیشان دەدەن و گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەر رادەگەیەنن.. بێگومان خودا لەسەر ئەم دووڕوویی و نیفاقەیان سزایان دەدا!! تۆش ئەی محمد دلگران مەبەو بە هێدیی و لەسەرخۆیی هەڵوێست بنوێنە ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ گرنگیان پێ مەدە، لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەو هەڵس وکەوتەیاندا بە ئارام و خۆڕاگرو لەسەر خۆبە، سزایان مەدە، گرنگی بە پیلانەکەیان مەدە، ئەم حەقیقەتەیان بۆ خەڵکی ئاشکرا مەکەو هیچ لێیان مەترسێ، ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ وَكَفَى بِاللّهِ وَكِيلاً﴾ پشت بە خودا ببەستە، ئیشی خۆت بە ئەو بسپێرە، لە هەموو کاروبارێکدا ثیقەت بە ئەو بێ، خودات بەسەو پێویستت بەکەسی تر نیە، ئەو لە سرو پیلانی ئەو دووڕووانە دەتپارێزێ، کەسێك پشت بە خودا ببەستێ خودای بەسە بۆ یارمەتیدان و بەهانا چوونی!!

ئەمجار پەروەردگار فەرمانیان پێ دەکا کە لە قورئان ورد ببنەوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ﴾ ئەوە بۆچی لە قورئان ورد نابنەوە؟ بۆ لە مانا بەرزو وشە رەوانەکانی تێ نافکرێن؟؟ قورئان بە سیانە بۆ راست کردنەوەی بیروبۆچوون و بەرنامەو پرۆگرامیان، پێیان رادەگەیەنێ کە قورئان نووسراوێکی بی خەوشە، چەواشەیی و دژایەتی تێدا نیە، چونکە فەرمایشتی خوداوەندی داناو زاناو بالادەستە، قورئان حەقەو لە حەقەوە نێردراوە، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا – محمد/٢٤﴾ چونکە کەسێك چاوی کرابێتەوەو دەرگای دڵی دانەخرابێ، قورئان کاری تێ دەکاو رەفتارو کردارو گوتاری رێك و پێك دەکا ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا﴾ ئەگەر ئەم قورئانە دروست کراوو دەست کردو دەست هەڵبەست بوایە، وەکوو دووڕوو

خوانەناسەكان وا دەڵێن، چەواشەیی‌و جوداوازییەكی زۆریان تێدا دەدۆزییەوە! دەی خۆ قورئان ئەو جوداوازی‌و دژایەتییەی تێدا نیە، كە وابێ كەلامی خودایە كەلامی یەكێكی تر نیە.

ئەگەر قورئان كەلامی خودا نەبوایە، دەبوو دیاردەی چەواشەیی‌و دژایەتی لە ریزبەندی وشەكانیدا، یان لە مەبەست‌و ماناكانیاندا ببوایە.

لە ریزبەندی وشەكانیدا بەم جۆرە هەندێ ئایەت‌و سوورەتی بگەنە ئەندازەی ئیعجازو هەندێكی تریان نەگەنە ئەو پلەیە. لە ماناكانیشیدا بەم جۆرە هەندێ شوێنی مانای دروست‌و رەوان بن‌و هەندێ شوێنیش مانای نارێك‌و پێك بێ. بەڵام ئەگەر بە ئینصافەوە لە قورئان ورد ببینەوە دەبینین ئەم دیاردانەی تیایدا نین! ئەوەتا قورئان هەرچەندە پارچە پارچەو بەش بەش بۆ پێغەمبەر هاتووە، بە گوێرەی رووداو پێویست، لە ماوەی بیست‌و سێ ساڵدا نێردراوەتە خوارێ، كەچی ئەوپەڕی رێك‌و پێكی‌و وشەبەندی‌و رەوانی تێدایە، چونكە هەر ئایەتێك یان سوورەتێك یان بەشێك كە دەهاتە خوارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: بیخەنە فلان شوێن، فلان ئایەت بخەنە شوێنی فلان سوورەتەوە!

پێغەمبەریش بۆخۆی قورئانی لەبەر بوو، شوێنی هەموو ئایەت‌و سوورەتێكی دەزانی قەت چەواشەیی‌و تێكەڵاو بوون‌و سەر لێ شێوان بەسەر لەبەر بوونەكەیدا نەهاتووە، هیچ كاتێك وشەیەكی لێ تێك نەچووەو لە بیری نەچۆتەوە! قەت رستەیەكی لێ پاش‌و پێش نەبووە، وەك تۆمار لە ناو دڵیدا دەقی بەستووە خودا دەربارەی ئەمە دەفەرموێ: ﴿سَنُقْرِؤُكَ فَلَا تَنسَى – الأعلى/٦﴾. واتە: خۆمان قورئانت پێ لەبەر دەكەین‌و چۆنیەتی خوێندنەكەیت فێر دەكەین ئیتر لەبەر ئەوە قەت لەیادت ناچێ.

مەبەست لە ﴿اخْتِلَافًا كَثِيرًا﴾ دژایەتی‌و جوداوازی لە رێژەی رەوانبێژی‌و داڕشتنی سەرئاساییە، جوداوازی‌و دژایەتی لە فیكرەو ماناكانیدا لە هەواڵ‌و نهێنییەكانی كە ئاماژەی بۆ كردووین، لە دەستورو یاسای ژیاندا كە چەسپاندونی! دەی تۆ لە سەرانسەری قورئان ورد ببەرەوە.. هیچ جۆرە دژایەتییەك‌و جوداوازییەك لەم بارەوەی تێدا نیە: كتێبێكی بێ خەوش‌و بێ وێنەو سەرئاسایە،

لەترۆپێکی بەلاغەتو فەصاحەت دایە، بە ڕەوانێژیو رەوانیو پاراوی خۆی، هەموو رۆشنبیرو رەوانبێژو قسەزانانی عەرەبو ناعەرەبی سەرسام کردووە. راستییەکان وەکوو خۆیان دەخاتە روو، بە راستگۆیی رووداوەکانی مێژووی کۆنی زۆر کۆن دەگێڕێتەوە، رۆژ دوای رۆژ ئەو راستیانەی ئەو ئاماژەیان بۆ دەکا زانستو تاقی کردنەوەو لێکۆڵینەوە، دەیانچەسپێنن‌و راستییان ئاشکرا دەکەن.

باسی جیهانی ئێستاو مەبەستە نهێنییەکانی ناو دەروون دەکا، بە شێوەیەکی وا بیسەرو خوێنەر سەرسام دەکا، زمانی رەخنە لاڵ دەکا. باسی بڕێ ڕووداوی داهاتووی کردووە رووداوەکان دەقاو دەق وا هاتوونەتە دی! بنەمای بیروباوەڕو یاساو تەشریعی بە شێوەیەکی گشتی‌و تایبەتی لە خۆ گرتووە، باری رامیاری‌و جۆری هەڵس‌و کەوت کردنی گەل‌و هۆزو نەتەوەکان لەگەڵ یەکتریداو بەرژەوەندی ئادەمیزادی لەخۆ گرتووە، بە جۆرێك داینـاون‌و ئاراستەی کردوون تا ئێستا هیچ یاساو نیظامێك هیچ دەستورو تەشریعێك نەیگەیشتۆتێ! تا زانستو زانیاری پێش بکەوێ، تا تیۆرو تاقی کردنەوەی زانستی سەر هەڵدەن‌و پەیدا ببن، راستی‌و حەقانیەتی باشترو زیاتر دەردەکەوێ، جیهانی غەیبو مەشهەدەکانی رۆژی قیامەتی بۆ رەنگکێشاوین هەر دەڵێی جیهانی ماددی‌و شتی بەبەرەچاوەن، ئەوندە سەرنج راکێشە لە زەین داو نەخشە دەبەستێ‌و ئەوەندە کاریگەرو واقیعییە لە زەیندا ناسرێتەوە وەکوو لە شوێنێکی تردا لە وەسپو سەنای قورئاندا دەفەرموێ:

﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ – الزمر/٢٣﴾.

بەڵام بە داخەوە لە کاتێکا کە موسوڵمانان ئەمە پرۆگرامو بەرنامەیانە، ئەمە تەشریعو دەستوورو یاسای ژیانیانە، کەچی ئەوە حاڵیانە کە دەبینین، خۆ موسوڵمانان تۆزێك گوڕ بدەنە خۆیان‌و رابنن تۆزێ دیلی‌و ژێر دەستەیی لە خۆیان بتەکێنن سەرلەنوێ پێشڕەوی جیهان وەردەگرنەوە، ئەوەی کە دوێنێ رووی داوە دەشێ ئەمڕۆو سبەینێ روو بداتەوە!!

ئەگـەر موسـوڵمانان ویـژدانیان ببوایـە ئـاوا قورئانیـان پاشـگوێ نەدەخـستو یاساكانیان لەكار نەدەخستن! ئەگەر بە وردی لە قورئان ورد بوونایەوە لەو بەرنامە ژیانەی كە بۆی نەخشەكێش كردوون تـێ بگەیشتنایە! ئـاوا تووشـی ئـەم شكستییە نەدەبوون، ئاوا پارچە پارچەو پەرتەوازە نەدەكران!!

بێگومان قورئـان مەشـخەڵی رێگـای شارەزایی‌و هیدایەتـە، رۆشـناییە بـۆ گـەلو نەتەوە، رێبازی راستی خوداوەندە، كلیلـی دەرگـای خۆشـبەختی‌و رێگـای دەسـتەبەر كردنی بەرژەوەندی ئادەمیزادە، دروست كەری گەلو بنیاتنەری ژیارو شارسـتانییە! بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِـيَ أَقْـوَمُ وَيُبَـشِّرُ الْمُـؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا – الإسراء/٩﴾.

## بڵاوكردنەوەی هەواڵی جمو جۆڵی سوپای ئیسلام بەبێ لێ وورد بوونەوە یاساغە

﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾ ﴾.

ئەمجار پەروەردگار سەرزەنـشتی كۆمـەڵێك دەكا لەوانـەی بیروبـاوەڕی لاوازیـان هەبوو، ئەزموونو خـیبرەی تـەواویان بـەبارو زوروف نـەبوو، دوور بـینو كـار قـایم نەبوون هەر هەواڵێكیان دەربارەی سەربازانو لەشكری ئیسلام دەزانی خێرا بڵاویان دەكـردەوە، هـیچ لـە هەواڵـەكان ورد نەدەبوونـەوە، ئاكـام رەنگدانـەوەی هەواڵەكـە لەسـەر موسـوڵمانان چـی دەبـێو چـۆن دەبـێ، بەرچـاو نـەدەگرت. بەمـەش زیـانی گەورەیان بەدەوڵەتی ئیسلام دەگەیان! بۆیە دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْـنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ﴾ كـە هـەواڵێكیان دەربـارەی ئاسایش‌و شـەڕو رووداوەكـان پـێ

دەگەیشت خێرا بڵاویان دەکردەوە! ئەمە سەرزەنشتی پەروەردگارە بۆ هەر کەسێك کە بەبێ چوونە بنج و بناوان، بەبێ لێکۆڵینەوەو تێفکرین هەر هەواڵێك دەبیستێ خێرا بڵاوی دەکاتەوە! وادەبێ هەواڵەکە راست نابێ وا دەبێ ئەو هەواڵەی دەربارەی ئەمن و ئاسایش یان ترس و شەڕ لە سەرچاوەی ناڕاستەوە دەگاتە بڕێ نەفام و دووڕوو موسوڵمانی هەرزەو بڕوا لاوازو بێ ئەزموون ئەوانیش خێرا بڵاوی دەکەنەوەو پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن بەمەش زەرەرو زیان بە بەرژەوەندی موسوڵمانان و دەوڵەت و سوپای ئیسلام دەگەیەنن.

بۆیە پێویستە راگەیاندنی هەواڵ لەم بارانەوە بگەڕێندرێتەوە بۆ سەرکردەی موسوڵمانان: کە پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) یان بۆ لای فەرمانڕەوایان و پسپۆری بانگەشەو دیعایەو پیاو ماقوڵ و کاربەدەستانی تایبەت بە بەرژەوەندی رامیاری ﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ﴾ ئەگەر ئەوانە هەواڵەکان وا بە سادەیی نەگرن و بیگێڕنەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) و بۆ لای فەرمانڕەواو کاربەدەستانی تایبەت، ئەوە ئەوان دەیانتوانی هەواڵەکە بەراستی و بە گوێرەی پێویست بڵاو بکەنەوە، وای ئاراستە بکەن کە سوودی ئیسلامی تێدا بێ و زیان بە کارو باری دەوڵەتی ئیسلامی نەگەیەنێ، چونکە پێویستە هەواڵەکان کەو بێژنگ بکرێن و لێك هەڵهاوێردرێن، کورد گوتەنی (هەموو قسەیەك قسەی کردن نیە!!)

چونکە گێڕانەوەو بڵاو کردنەوەی هەر هەواڵێك کە دەبیسترێ بەبێ لێکۆڵینەوەو لێ ورد بوونەوە زیانێکی گەورە بە دەوڵەت دەگەیەنێ! بۆیە ئێستا دەوڵەتی هاووچەرخ چاودێری جۆراو جۆر دەخەنە سەر هەواڵ و رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن، بۆ ئەوەی شتێك بڵاو نەکرێتەوە زیان بە بەرژەوەندی گەل و نیشتمانەکەیان بگەیەنێ.

ئەمجار پەروەردگار منەت دەکا بەسەر خاوەن ئیمانی راست و پتەودا کە لە هەڵخلیسکان پاراستوونی دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لاَتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئەگەر بەهۆی فەضل و گەورەیی خودا نەبوایە کە بە زەیی پێتاندا هاتۆتەوەو شارەزای رێگای راستی کردوون و تۆفیقی داون بۆ بەگوێ کردنی

خوداو پێغەمبەرو ڕێنومایی کردوون بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی زانستی ڕاست کە پێغەمبەری ئیسلام‌و عەقڵ مەندو زاناو دانای موسوڵمانانن؛ ئەگینا لەوانە بوو شوێن وەسوەسەی شەیتان بکەون، یان هەر لەسەر بیروباوەڕی نەزانی‌و خوانەناسی بەردەوام بوونایە.

ئایەتەکە بە ڕوونی جەخت لەسەر ئەوە دەکا پێویستە دەزگایەك هەبێ ئەرکی بڵاو کردنەوەی هەواڵ لە ئەستۆ بگرێ، پێش بڵاو کردنەوەی هەر هەواڵێك لە سەرچاوەو چۆنیەتی بڵاو کردنەوەکە بکۆڵدرێتەوە، ئیجابی‌و سەلبی هەڵبسەنگێندرێ، بۆ ئەوەی پڕوپاگەندەی دوژمن هەڵی بۆ نەڕەخسێ‌و دەستی خۆی بوەشێنێ، هەروەها بۆ ئەوەی هەواڵی گرنگ‌و کاریگەر دەست دوژمن نەکەوێ‌و بیقۆزنەوەو نهێنی حکومەتی ئیسلامی دەربکەوێ. پێویستە ئەو دەزگا ئیعلامییە ئینسانی لێهاتوو زاناو دانا کاری تێدا بکەن‌و نەدرێتە دەست یەکێکی بودەڵەی هیچ لە بارا نەبوو!

## هەڵنانی موسوڵمانان بۆ جیهاد

﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ﴿٨٤﴾ ﴾.

ئەی محمد! تۆ تەنیا پشت بە خودا ببەستە هێزو توانای سەرکەوتن لەو داوا بکە ﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ پەروەردگار فەرمان بە بەندەو ڕەوانە کراوی خۆی حەزرەتی محمد دەکا کە بە خودی خۆی شەڕ بکا، لەگەڵ کافراندا بجەنگێ! دەفەرموێ ئەی محمد! لە پێناو ئاینی خوادا شەڕ لەگەڵ خوانەناسان بکە هەتا تۆ ببی بە سەرمەشق‌و پێشەوا بۆ موسوڵمانان‌و ئەوانیش چاو لە تۆ بکەن‌و بڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا بەسەرو ماڵ یارمەتیت دەدەین، ئێمە لەتۆ زیاتر نین، بەڵکوو تۆ بمێنی باشتر هەتا ئێمە.

﴿لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ﴾ بزانن كارەكە زۆر گرانە، ئەی موحەممەد! ئەوەی لەسەر تۆیە راگەیاندنەو بەس، تۆ بەس بەرپرسیاری لە خودی خۆت كە ئەم كارە بەجێ بهێنی ئەگەر دنیا بوو كەس هاوبەشی نەكردی، بەتەنیا خۆت مایتەوە تۆ بە تەنیا خۆت خەباتی خۆت بگێڕەو شەڕ لەگەڵ دوژمنانی خودادا بكە، بەلام بە زۆرە ملێ كەس مەبە بۆ شەڕ، خودا یارمەتیدەرتە، نەك جەنگاوەران؛ ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت بە تەنیاش بێت یارمەتیت دەدا، وەكوو چۆن تۆ لە سەرەتاوە بە تەنیا خۆت بوویت!

بەڵێ وەكوو چۆن ئەگەر بە هەزارانت لەگەڵدا بێ، خودا مەیلی لێ بێ سەركەوتن بەدەست دێنی، ئەگەر بە تەنیاش بێت خودا مەیلی لێ بێ سەردەكەوی!! جا ئەوانەش كە سكالایانە لە شەڕو دەڵێن: بۆچی شەڕ كردنمان لەسەر فەرز كراوە؟ بە ڕواڵەتو سەرزارەكی پابەندی فەرمانەكانتن‌و بە نهێنی هەڵوێستی تر وەردەگرن، ئەوە لێیان گەڕێ ئێمە لە وێزەیان دێین‌و سزای ئەو هەڵوێستو كردەوانەیان دەدەینەوە.

﴿وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ موسوڵمانان هەڵبنێ بۆ شەڕ كردن تۆ هەر هەڵنان‌و تەشجیع كردنت لەسەرە، زۆرە ملێ‌و زەختیان لێ مەكە ﴿عَسَى اللّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئومێدە كە خودا شەڕو خراپەی قوڕەیشت لێ دوور بخاتەوە، ﴿وَاللّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلاً﴾ خودا لە قوڕەیش‌و هەموو دوژمنێكی ئیسلام بەهێزترە، سزاو عیقابی بە ئێش ترە، بالا دەستە بەسەریانداو لە دونیاو قیامەتدا، دەتوانێ سزایان داو تۆڵەیان لێ بستێنێ، چونكە كافرو سەركەشن.. چاو نەترسی بۆ جەنگاوەر شتێكی چاكە، دژی ئەوانەی ئاوا بە ڕاشكاوی بێ شەرمانە دژی ئایینی حەق دەوەستن، ئەوە بوو: ئەبو سوفیان دوای ڕووداوی ئوحوود داوای ئامادە بوون بۆ شەڕی كرد، وتی: ساڵی داهاتوو لە بەدردا ئامادە بن بۆ شەڕ لەگەڵمان، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی باشە، كاتێك وادەی بەدری بچووك هات، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سوور بوو لەسەر دەرچوون بۆ شەڕ فەرمووی: « والذي نفسي بيده لأخرجن ولو وحدي» سوێندم بەو كەسە گیانی منی بەدەستە ئەگەر هەر خۆم بەتەنیا چووبم بۆ شەڕ دەچم، جا پێغەمبەر (دروودی

خوای لەسەر بێ) دەرچوو حەفتا کەسیشی لەگەڵدا بوو، سەرکەوتن بۆ موسوڵمانان بوو، چونکە ئەبو سوفیان وای بەباش زانی نەچێتە بەدر، پێی وابوو: ساڵەکە بۆ ئەوان نەهاتە، خواردەمەنی پێویستیشیان پێ نەبوو، لە ڕێگادا گەڕایەوە!

ئایەتەکە ئەوپەڕی هەڵنانی تێدایە بۆ جیهادو شەڕ کردن لەگەڵ کافراندا، تەنانەت ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر پێغەمبەر بەتەنیا مایەوەو کەسی لەگەڵ نەچوو بۆ شەڕ، پێویستە پێغەمبەر بە تەنیا دژی کافران بجەنگێو واز لە جیهاد نەهێنێ! چونکە خودا بەڵێنی سەرکەوتنی پێداوە!! ئەوەشی تێدا یە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە هەموو کەس ئازاترو نەبەرد ترو مەرد تر بووە، ئیمامی عەلی دەفەرموێ: کە شەڕ گەرم دەبوو تین دەهات ئێمە خۆمان دەخستە پەنای پێغەمبەرەوە، کەس بە ئەندازەی ئەو لە دوژمن نزیک نەدەبووەوەو لە جەنگا نەبەردو بەهەڵمەتو دلێر بوو!!

## باسی شەفاعەت کردنو وەڵام دانەوەی سڵاوو سەلماندنی زیندوبونەوەو تاکو تەنیایی خودا

﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۗ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾ ﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر کرد کە موسوڵمانان هەڵنێ بۆ شەڕ کردن لەگەڵ کافراندا، ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئەوان لەسەر ئەو فەرمانبەرداریيەی تۆ خێروبێرێکی زۆریان تووش دەبێ، تۆش ئەی پێغەمبەر! لەو خێروبێرە بەشی خۆت هەیە، چونکە هەڵنەرو رێپیشان دەریان بووی، دەفەرموێ: ﴿مَّن يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُ نَصِيبٌ مِّنْهَا﴾ هەرکەسێك لە کارێکی باشدا کۆشش بکاو بەهۆی ئەوەوە خەڵك تووشی خێرو خۆشی ببن، حەق بەسەر بەتاڵدا سەربکەوێ ئەوا ئەو رێ پیشاندەرە بەشێکی لەو خێروبێرە هەیە، لای خودا پلەو پایەی پێ بەرز دەبێتەوە، بەشی لەو رێزو پلەو پایە دونیاییە هەیە کە ئەوان بەدەستی دێنن هاوبەشی دەستکەوتو غەنیمەتیانە، بەشی لە پاداش‌و دەستکەوتی قیامەتیشدا هەیە، هەروەها ﴿وَمَن يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُ كِفْلٌ مِّنْهَا﴾ کەسێك هەوڵ بدا لە کارێکی خراپدا، خەڵکی بۆ بانگەشە بکاو هەڵیان نێ بۆ ئەو کارە، ئاکامی تاوانی کۆشش‌و هەڵدانەکەی لەسەریەتی‌و لە دونیاو قیامەتدا بەشی خۆی لە سزای پێویست وەردەگرێ! شەفاعەت کە خۆی بریتییە لە هەوڵ دان‌و یارمەتیدانی کەسێکی تر لە کارێکدا دوو جۆری هەیە، شەفاعەتی چاك‌و شەفاعەتی‌م خراپ.

شەفاعەتی چاك بریتییە لەو هەوڵ‌و تێکۆشانەی کە مرۆڤێکی موسوڵمان لە کاری مرۆڤێکی تری موسوڵماندا دەیدا بەمەرجێ مافی ئەو موسوڵمانە لەبەر چاو بگرێ؛ واتە: شەڕو خراپەی لێ دوور بخاتەوە یان خێرو خۆشی بۆ وەدەست بێنێ‌و مەبەستیشی رەزامەندی خودا بێ‌و بەرتیلی لەسەر وەرنەگرێ! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: کارەکەش کارێکی رەوابێ، دەربارەی لابردنی حەددێکی شەرعی وانەبێ کە گەیشتبێتە لای قازی‌و مەودای شوبهەی تیادا نەبێ‌و مافی یەکێکی تر پێشێل نەکرێ[1]!

برێ پێیان وایە: شەفاعەتی حەسەنە بریتییە لە نزاو پاڕانەوە لای خودا بۆ برای موسوڵمانت، چونکە ئەمەش لە راستیدا شەفاعەتە پێغەمبەر (دروودی خوای

[1]- سەیری تاجولئوصول ج/٣/لا ٢٦٠ – ٢٦٢ فەرمووده‌ی ژمارە/ ٥ – ٦ بکە.

لەسەر بێ) فەرموویەتی: «من دَعَا لأَخِيهِ المسلم بِظَهْرِ الْغَيْبِ، اسْتَجَيبُ له قَالَ الْمَلَكُ وَلَكَ مِثْلُ ذَلِكَ»[٢]

واتە: کەسێك پاشملە دوعا بۆ برای موسوڵمانی خۆی بکا، نزاکەی گیرا دەبێو فریشتەی تایبەت پێی دەڵێن: بۆ تۆش بە ئەندازەی ئەو پاداش هەیە.

شەفاعەتی خراپو نارەوا ئەوەیە: کە پێچەوانەی شەفاعەتی چاكو حەسەنە بێ، بەداخەوەو ئەو پشت گرتنەی کە ئەمڕۆ باوە زۆربەی شەفاعەتی سەییئەیە، زۆربەی پێشێل کردنی مافی موسوڵمانانە، بەرتیلو بەرتیلکارییە، داگیرکردنی ماڵو سامانی خەڵکی ترە، بەشێوەیەکی نارەواو روونو ئاشکرا!!

﴿وَكَانَ اللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقِيتًا﴾ پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارە، یاخ بە تواناو دەسەڵاتە، یان لەسەر هەمووشتێك حیساب لەگەڵ خەڵك دەکا، واتە: پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەسەر مەبەستی شەفاعەتکاراندا، هەریەکە بە گوێرەی مەبەستی خۆی پاداشیان دەداتەوە، تواناو دەسەڵاتی هەیە بۆ ئەوەی هەرکەسە بە ئەندازەی خۆی سزاو پاداشی بداتەوە.

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزادان فێری سەلامو دابو نەریتەکانی چاكو چۆنی دەکا، سەلام کردن لە یەکتری وەکوو شەفاعەتی حەسەنە دەبێتە هۆی پتەو کردنی پەیوەندی کۆمەڵگاو نزیك خستنەوەی ئادەمیزادان لە یەکتری. بنەمای سەلام کردن بریتییە لە ئاواتەخوازی ژیان بەسەر بردن بە ساغو سەلامەتی بۆ خەڵکی تر وا پەسەندە بە ڕستەی (السلام عليكم...) دەستی پێ بکرێ. دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا﴾ ئەگەر موسوڵمانێك سەلامی لێ کردن، ئێوەش وەڵامی سەلامەکەی بدەنەوە بە باشتر، یان کە هیچگە نەبێ بە ئەندازەی خۆی، زێدە وەڵام دانەوە باشترە، بە ئەندازەی سەلام کەر وەڵام دانەوە پێویستو فەرزە، ئەگەر یەکێك گوتی (السلام عليكم) سەلام لێ کراو دەبێ بڵێ (وعليكم السلام) یان (وعليكم السلام ورحمة الله) ئەگەر زیادی کردو گوتی (وبركاته) ئەوە باشترەو بە

[٢] موسلیمو ئەبو داود لە ئەبو دەرداوە گێڕاویانەتەوە بەڵام ڕستەکەی(من دعا لأخيه المسلم بظهر الغيب قال الملك الموكل به: أمين ولك بمثله)

هەموو وشەیەك دە چاكەی بۆ دەنووسرێ، واباشە بە روویەكی خۆشەوە وەڵامەكەی بدەینەوە.

ئیبنو جەریر لە سەلمانی فارسییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وتی: (السلام علیك یا رسول الله) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وعلیك السلام ورحمة الله) پیاوێكی تر هات وتی: (السلام علیك یا رسول الله ورحمة الله) پێغەمبەر پێی فەرمووی: (وعلیك سلام ورحمة الله وبركاته) پیاوێكی تر هات وتی: (السلام علیك یا رسول الله ورحمة الله وبركاته) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وعلیك) پیاوەكە وتی قوربان فلاّن و فلاّن هاتن و سەلامیان لێ كردی وەڵامی سەلامەكەت بۆ ئەوان لە هی من زیاتر بوو! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: تۆ كە سەلامەكەت كرد زێدەت بۆ نەهێشتینەوە تا بۆت زیاد بكەین خودا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا﴾ ئێمەش بە ئەندازەی خۆی وەڵاممان دایەوە.

﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا﴾ دڵنیا بن خودا لەسەر هەموو شتێك سەلام كردن و شتی تر – خیساجان لەگەڵ دەكا: ئەمە جەخت كردن و پی لەسەر داگرتنی پێویستی وەڵام دانەوەی سەلامە، ئەبو داود لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَفَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ: أَفْشُوا السَّلاَمَ»[٣]

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەكاتەوە: كە ئادەمیزادان پاداشیان دەدرێتەوە لەسەر رۆژباشی و چاك و چۆنی و تێكۆشان و جیهادو كاری تری چاكەو شەفاعەت كردن و فەرمووی: ﴿اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾.

پەروەردگار تەنیا خۆی خودایە، جگە لە زاتی پاكی هیچ خودای تر نین، گەڕانەوەی هەموو ئادەمیزاد بۆ لای خودای تاك و تەنیایە، زیندوو بوونەوەو سزاو پاداش وەرگرتنەوە لە قیامەتدا شتێكی چەسپاوو حاشا هەڵنەگرە، پەروەردگار لە

---

٣- ریاض الصالحین (وەرگێڕدراو بۆ كوردی) ب٢/ ٧٠٤.

رۆژی قیامەتدا ئادەمیزادان زیندوو دەكاتەوە، بۆ حیسابو تۆڵە ستاندنەوەو پاداش وەرگرتنەوە ﴿لاَ رَيْبَ فِيهِ﴾ هاتنی رۆژی قیامەت شكو گومانی تێدا نیەو راستییەكی حاشا هەڵنەگرە، ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا﴾ كێ بە ئەندازەی خودا وادەو بەڵێنو قسە راستە؟ واتە: كەس بە ئەندازەی پەروەردگار هەواڵی راست نین، وادەو بەڵێنو هەڕەشەی كەس وەكوو هی خودا نایەتە جێ! هیچ خودا نین جگە لە زاتی پاكی، پەروەردگار هەر خۆیەتیو بەس! زانستو زانیاری بەسەر هەموو بوونەوەردا هەیە، رابووردو داهاتووی ئاگا لێیەو هیچی لێ هون نابێ وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿لايَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى – طه/٥٢﴾.

ئەمجار دەگەڕێتەوە بۆ سەر روونكردنەوەی هەڵوێستو چاو ڕاوی دووڕووەكانو رۆڵی ریسوا ئامێزیان، سەرزەنشتی موسوڵمانان دەكا لەوەدا كە بوونە دوو بەشو دەربارەی مونافیقەكان دوو ڕایان هەیە، لەگەڵ ئەوەدا كوفرەكەیان ئاشكراو نمایانە، موسوڵمان بە یەكڕایی بە كافریان دانانێن!! دەفەرموێ: پێویستە بەبێ سێو دوو بە كافریان بزانن و شەڕیان لەگەڵدا بكەن؛ ئایەتەكانی پێشوو ژمارە (٦٠ – ٦٣ – ٧٢ – ٧٣) ئەو ئایەتانەی كە لەمەودوا دێن وەكوو ئایەتی (١٤٢ - ١٤٣) هەموویان دەربارەی هەڵوێستو هەڵسو كەوتی مونافیقو مونافیقەكانن، هەڕەشەو تووڕە بوونی یەزدانن لێیان!

## رەوشتی دووڕووەكانو چاوڕاویان، چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ كردنیان

﴿ ۞ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ﴿٨٨﴾ وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً ۖ فَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ فَإِن

تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَـٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَـٰتِلُواْ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُواْ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُواْ فِيهَا ۚ فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوٓاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ ۚ وَأُوْلَـٰٓئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا ﴿٩١﴾

جا وەكوو موسلیمو بوخاری لە زەیدی كوڕی ثابیتەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوەڵانیا بەڕێ كەوت بۆ ئوحوود كۆمەڵێك لە دووڕووەكان لە نیوەی ڕێ گەڕانەوە، هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەربارەیان دوو جۆر هەڵوێستیان هەبوو كۆمەڵێكیان وتیان: شەڕیان لەگەڵ دەكەینو دەیانكوژین وەكوو كافر مامەڵەیان لەگەڵ دەكەین! بڕێكیشیان وتیان نەخێر واناكەین! ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ...﴾ ناردە خوارێ.

ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: چەند کەسێك لە مەککە بە ڕواڵەت موسوڵمان بووبوون، کەچی زیارەتی کافرەکانیان دەکرد، لە دژی موسوڵمانان! موسوڵمانان دەربارەیان دوو ڕایان هەبوو؛ تێیاندا کەوتنە دەمەقاڵێ: ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم﴾ ئەوە چییە بۆ ئێوە؟ ئەی موسوڵمانینە! چیتان لێ قەوماوە؟ دوو هەڵوێستو راتان بەرامبەر بە کوفرو دووڕووەکان هەیە، خۆ بەڵگەی کوفرو خودانەناسینیان روونو ئاشکرایە، ئەوە چیتانە دەربارەیان بوون بە دوو کۆمەڵ؛ کۆمەڵێکتان پاکانەیان بۆ دەکەنو شایەدی خێرو باشەیان بۆ دەدەن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: کۆمەڵێکیشتان تانەیان لێ دەدەنو شایەدی ئەوەیان لەسەر دەدەن کە کافرن! ئەم دوو بەرەکییە چییە کەوتۆتە نێوانتانەوە؟ خۆ ئەوانە بە ئاشکرا کوفرەکەیان دیارە، خودا لە ڕێگای حەق لای داونو خستوونیە گومراییەوە ئەوانە بە هۆی یاخی بوونو سەرپێچی کردنی ئامۆژگاری پێغەمبەرو شوێن کەوتنیان بۆ ڕێبازی بەتاڵو هیچو پووچو دژایەتی کردنیان بۆ موسوڵمانانو پیلان گێڕان لێیانو خۆپاشدانو کۆچ نەکردنیان بۆ مەدینە دەڵێی لەسەر روو بە کێشیان دەکەنو سەر شۆڕو ریسواو بەد سرووشتن... وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ – الملك/٢٢﴾ واتە: ئەوانە بە هۆی هەڵگەڕانەوەیان لە ریزی موسوڵمانانو پەیوەندی کردنیان بە سوپای کوفرەوە، فێڵ کردنیان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) حوکمی کافریان بەسەردا دەدرێو لە ریزی موسوڵمانان حیساب ناکرێن ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ؟﴾ ئایا دەتانەوێ ئەوانە بگێڕنەوە بۆ سەر شەقامە ڕێگای ئیسلام؟ لە کاتێکا ئەوانە بە ئەنقەستو بە دەستی خۆیان خۆیان گومرا کردووە، ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً﴾ کەسێك خودا بە هۆی کردەوەو هەڵوێستی خۆی ڕێگای لێ هون بکاو گومرا بووبێ، تازە نایەتەوە سەر ڕێبازی ئیسلامو ڕێگای هیدایەت نادۆزنەوەو کەسیشیان دەست ناکەوێ لەم گومراییە رزگاریان بکا، چونکە ڕێگای حەق ئاشکراو نمایانە، پابەند بوونە بە پرۆگرامی سروشتو ڕێنومایی کردنی عەقڵی تەواو کامڵو بیر کردنەوەی زانستیو بێ لایەنو حەق خوازی، دەی کە

ئەوان ئەو هۆیانە بەکار نەهێنن‌و پابەند نەبن پێیانەوە هەرگیز لە گومڕایی رزگاریان نابێ.

ئەمجار پەروەردگار هەڵوێستێکی تریان روون دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە، دەفەرموێ: ﴿وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَاء﴾ ئاواتەخوازی ئەوەن کە ئێوەش گومڕا ببن‌و سەرتان لێ بشێوێ‌و بچنە خانەی ئەوانەوە لە کوفرو بێدینیدا یەکسان ببن‌و ئایینی ئیسلام لەناو بچێ، ئەم ئاواتەشیان لەوەوەیە: کە زۆر رقیان لێتانەو دوژمنی بابەکوشتەتانن‌و بە تەواوەتیش لە گومڕایی‌و کوفردا رۆچوون! ئەوە هەر بەوە رازی نابن کە بۆ خۆیان کافرن‌و گومڕان دەیانەوێ خەڵکی تریش وەکوو خۆیان ماڵ وێران بن! بۆیە پەروەردگار موسوڵمانانی وریا کردەوەو ترساندنی لە فێڵ‌و تەڵەکەی ئەوانە لە هەوڵ‌و تێکۆشانیان بۆ ئەو کارە ناپەسەندە.

﴿فَلاَ تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ أَوْلِيَاء حَتَّىَ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ کەوابێ تا لە بیروباوەڕیان دڵنیا نەبن دۆستایەتیان لەگەڵدا مەگرن،، تا بەڵگەی بی گومان‌و ساختان دەست نەکەوێ لەسەر موسوڵمانەتیان‌و کۆچ نەکەن بۆ مەدینەو بۆ خزمەتی ئیسلام لێ نەبڕێن، ئێوە پێیان باوەڕ مەکەن‌و هاوکاریان لەگەڵدا مەکەن. ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتَّمُوهُمْ﴾ ئەگەر بە ئاشکرا پشتیان لە ئایین هەڵکردو لە پێناو ئایینی خودادا کۆچیان نەکرد بۆ مەدینەو لە شوێنی خۆیان مانەوە ئەوە بیانگرن‌و لێیان بدەن‌و بیانکوژن، لە هەر کات‌و شوێنێك دەستتان گەیشتنێ کۆیان لێ مەکەن‌و دەستیان لێ مەپارێزن، لە حەرەمدا بن یان لە دەرەوەی حەرەم بن، هیچ کارگێڕی‌و لێپرسراوەتییان مەدەنێ‌و بەسەر کاروباری دەوڵەتدا ئاگاداریان مەکەن ﴿وَلاَ تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا﴾ مەیانکەنە یارمەتیدەری خۆتان بۆ لێدانی دوژمنی ترتان؛ پشتیان پێ مەبەستن‌و بڕوایان پێ مەکەن! ئەمجار پەروەردگار دوو جۆر ئادەمیزادی لەوانە ئیستثنا کردووە. فەرمووی: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىَ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾.

یەکەم: ئەوانەی پەیوەندییان بە گرۆهو تاقمێکەوە هەیە، کە لەگەڵ موسوڵماناندا هاوپەیمان‌و سوێند خۆرن! پەنا دێننە بەر ئەو کەسانەی لەگەڵ ئێوەدا عەهدو پەیمانیان هەیە، ئەوانە حوکمیان وەکوو حوکمی پەیمان لەگەڵ

بەستووەکانتانن، ئەمەش وەکوو ئەو بەندانە وایە کە لە پەیمان‌و رێککەوتنی حودەیبییەدا هاتووە کە دەڵێ: (کەسێك دەیەوێ بچێتە ناو پەیمانی قورەیشییەکانەوە با بچێ، کەسێکیش دەیەوێ بچێتە پەیمان‌و صوڵحی محمدو هاوەڵانییەوە با بچێ!).

ئەبوبەکری رازی دەڵێ: ئەگەر ئیمام‌و پێشەوای موسوڵمانان پەیمانێکی لە نێوان خۆی‌و کافراندا بەست هەرکەسێك پەیوەندی بەوانەوە هەبێ بە خزمایەتی یان بە هاوپەیمانی‌و سوێندخواردن‌و یارمەتیدەر، ئەو پەیمانە دەیگرێتەوە، بەڵام ئەگەر وا نەبوو نایگرێتەوە، مەگەر لە کاتی پەیمان بەستنەکەدا بە مەرجی دابنێن! ئەوە بە گوێرەی مەرجی ناو پەیمانەکە دەیانگرێتەوە وەکوو چۆن هۆزی کەنانە چوونە ناو پەیمانی قورەیشییەکانەوە.

﴿أَوْ جَآؤُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُواْ قَوْمَهُمْ﴾.

دووەم: کەس‌و تاقم‌و گرۆی بێ لایەن، ئەوانەی پێیان ناخۆشە شەڕتان لەگەڵ بکەن، بۆشیان ناکرێ یارمەتی ئێوە بدەن‌و لەگەڵتاندا شەڕ دژی ئەوان بکەن! واتە: بە گوێرەی پەیمان‌و بەڵێن، شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان ناکەن لەبەر پەیوەندی خزمایەتی‌و رەگەزایەتی‌و هۆزایەتیش شەڕ لەگەڵ ئەوان ناکەن عوزریان هەیە!!

ئەم دوو تاقمە بە پێی ئایەتی ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ – البقرة/١٩٠﴾ رەفتارو مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ، تا ئەوان شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان نەکەن‌و دەست درێژی نەکەنە سەریان، ئەوان شەڕیان لەگەڵ ناکەن! ئەمەش رەحمەت‌و بەخششی خودایە، کە ئاشتی خستۆتە نێوانتانەوەو وای کردووە دڵی ئەوانی لە شەڕ کردن لەگەڵ ئێوەدا لاداوە ﴿ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە بەسەر ئێوەدا زاڵی دەکردن‌و ئارەزووی شەڕو شەڕخوازی دەخستە دڵیانەوەو ئەوانیش پاڵیان دەدایە پاڵ دوژمنەکانی ترتان‌و سەنگەریان لێ دەگرتن ﴿فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ﴾ جا ئەگەر ئەوانەو هی تری واش گۆشەگیر بوون‌و شەڕیان لەگەڵ نەکردن ﴿وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ﴾ دەستی ئاشتیان بۆ درێژ کردن‌و زیانیان پێ نەدەگەیاندن ئەوە ﴿فَمَا جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾ ئێوە بۆتان نیە کە شەڕیان لەگەڵدا بکەن، خودا رێگەی

ئەوەتان نادا کە بەختو خۆڕایی دەست درێژی بکەنە سەریان، هەتا ئەوان لەسەر حاڵی خۆیان ئاوا بە گۆشەگیری بەردەوام بنو شەڕتان لەگەڵ نەکەن ئێوەش نابێ شەڕیان لەگەڵدا بکەن! بۆ نموونە کۆمەڵێك لە بەنو هاشم ڕۆژی جەنگی بەدر لەگەڵ کافرەکاندا هاتبوونو ئامادەی شەڕەکەش بوون بەڵام بە دڵیان نەبوو، لە ناخەوە هاوبەش کردنەکەیان لا ناخۆش بوو، وەکوو عەبباس (مامی پێغەمبەر) بۆیە کە دوایی عەبباس گیرا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە نەیکوژن بەڵکوو دیلی بکەن.

ئەمجار پەروەردگار حوکمی کۆمەڵێکی تری کافر دیاری دەکا، کە بە ڕواڵەت هەڵوێستیان وەکوو کۆمەڵی پێشوو وایە، بەڵام لە راستیدا نییەتو مەبەستیان جیاوازەو دەفەرموێ: ﴿سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُواْ قَوْمَهُمْ﴾ تاقمو کۆڕو کۆمەڵێکی تریش هەن مونافیقو دووڕوون، لای پێغەمبەرو هاوەڵانی بە ڕواڵەت لافی موسوڵمانیەتی لێ دەدەن، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە گیانو ماڵو منداڵی خۆیان بکەن، لە ژێرەوە لەگەڵ کافرەکاندانو چییان پێ خۆش بێ ئەوانە ئەوە دەکەن، کافرەکان چ بپەرستن ئەوە دەپەرستن، لای موسوڵمانەکان خوداپەرستن وەکوو تریش خوانەناسن. ﴿كُلَّ مَا رُدُّوَاْ إِلَى الْفِتْنِةِ أُرْكِسُواْ فِيِهَا﴾ هەرکاتێ قەومو هۆزەکانیان بانگیان بکەن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسوڵماناندا زوو ئامادەباشی پیشان دەدەنو پاڵ لە دوژمن دەدەنو دژی موسوڵمانان شەڕ دەکەن، لە هەموو دوژمنێك دوژمن ترن.

زومەخشەری لە تەفسیری کەشافدا دەڵێ مەبەست بە (الْفِتْنِةِ) هاوەڵ پەیداکردنە بۆ خودا. واتە: هەرکاتێك بانگ بکرێن بۆ شەریك پەیدا کردن بۆ خودا یەکسەر دەبنە موشریكو بە ئاشکرا دەچنە ڕیزی خودانەناسانەوەو کوفرو بێدینی خۆیان دەخەنە ڕوو! جا حوکمی ئەوانە ﴿فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ﴾ ئەگەر وازیان لە هەڵوێستی دوژمنکاریو دژایەتی نەهێناو گۆشەگیر نەبوون ﴿وَيُلْقُواْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ﴾ دەستی ئاشتیان بۆ درێژ نەکردنو، بە ملکەچی ئاشتییان نەخستە ڕوو ﴿وَيَكُفُّوَاْ أَيْدِيَهُمْ﴾ دەستیان لە شەڕ کردن نەکێشایەوەو هەر سوور بوون لەسەر جەنگ کردن لەگەڵتان ئەوە ﴿فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثِقِفْتُمُوهُمْ﴾ بیانگرن، لێیان

بدەن، بیانکوژن، لە هەر شوێنێك دەستان کەوتن، دەستیان لێ مەپارێزن‌و کۆیان لێ مەکەنەوە ﴿وَأُوْلَـٰئِكُمْ﴾ ئەوانەی ئاوا هەڵوێستیان دوژمنکاری‌و دووڕوویی‌و بێ وادەیی‌و بەڵێن شکێنی‌و دژایەتی کردنی ئیسلامە ﴿جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا مُّبِينًا﴾ گێڕاومانە بۆ ئێوە بەسەریانەوە بەڵگەی بەهێزو ئاشکرا، بەهانەی ڕەواتان بەدەستەوەیە بۆ کوشتن‌و بڕین‌و گرتنیان.

مامۆستا سەید قوطب لێرەدا دەفەرموێ: (ئادەمیزاد بەم شێوەیە لاپەڕەیەك هەڵوێستی نەگۆڕی ئیسلام دەبینین سوور بوونی لەسەر بەرنگاری کردن‌و بە گژا چوونەوە، وێڕای لێبووردن‌و چاوپۆشی کردن دەستەملان دەبێ! بەرەنگاری بوونەوە لە شوێنی خۆیداو، چاوپۆشی کردن لە کاتی خۆیدا! چۆنیەتی بارودۆخ‌و چۆنیەتی ڕووداوەکان دەستنیشانی یەکێك لەم هەڵوێستانە دەکا، ڕانواندنی ئەم دوو جۆرە هەڵوێستە بەو شێوەیە هاوکێشەیەك لە هەستی موسوڵماندا دەخوڵقێنێ، هەروەها هاوسەنگی‌و بەرامبەرییەك لە یاسای ئیسلامدا دەچەسپێنێ، میانە ڕەوی دروست دەکا، ڕێبازی ڕاست دەستنیشان دەکاو دەیەوێ ئادەمیزاد لەو شەقامە ڕێیە لانەدەن.

جا کاتێك کۆمەڵێك بێن زیادە ڕەوی بکەن‌و هەموو کارێکی ئیسلام سەر ڕەقانە ئەنجام بدەن، لە هەموو شتێکدا لە هەموو کات‌و شوێنێکدا تونڕەو سەرڕەق‌و سەرکەش بن، ئەوە ڕەنگدانەوەی ئیسلام نیەو ئەوانە ناشێ بکرێن بە نموونەی ئیسلام! لە هەمان کاتدا ئەگەر لە بەرامبەر ئەم جۆرە گرۆهانەدا کە توندڕەون تاقم‌و گرۆیەکی تر هەبن نەرم ڕەو بن بە پێچەوانە بیر بکەنەوە پێیان وابێ ئیسلام هەموو چاوپۆشی‌و لێبووردن‌و نەرم‌و نیانییە پاساو بۆ جیهاد لە ئیسلامدا بیننەوە بیانەوێ بەم هەڵوێستە نەرم‌و نیانەیان داکۆکی لە ئیسلام بکەن، وەکوو بڵێی ئیسلام خرابێتە قەفەزی تۆمەتەوەو ئەوانیش پارێزەرن‌و داکۆکی لێ دەکەن، ئەوانە کەوا دەیانەوێ وای نیشان بدەن کە هەموو هەڵوێست‌و هەڵس‌و کەوتێکی ئیسلام‌و موسوڵمانان چاو پۆشی‌و لێبووردن‌و نەرم‌و نیانی‌و ئاشتی‌و ئاشتی خوازی بێ، تەنانەت گوایە کە ئیسلام جیهادی داناوە هەر بۆ ئەوەیە بەرگری لە نیشتمانی موسوڵمانان بکاو بەس، ئەمانە بە هەڵەدا چوون؛ ئیسلام لەهەموو شتێکدا میانڕەو میانەکارە، نە ئەوەندە وشکە بشکێ نەئەوەندە تەڕە بگوشرێ، ئیسلام

بەرنامەو بیروباوەڕە، داکۆکی لە ئازادیی بانگەوازی ئیسلامی دەکا، لە هەموو گۆشەیەکی سەر ڕووی زەوی بەبێ کۆسپو لەمپەر = (حدود قیودو سدود). ئەمانیش لە ئیسلامدا هەن، ئیسلام دەیەوێ ئەمنو ئاسایش بەرقەرار بێ لە هەموو کوونو قوژبنێکی جیهاندا بۆ هەر کەسێك بیەوێ کە ئیسلام بکاتە بیروباوەڕو پرۆگرامی خۆی. ئەوانەی پێیان وایە کە ئیسلام بریتی نیە لە دابین کردنی ئازادی بۆ بیروباوەڕی ئیسلامیو هەوڵدان بۆ ڕامالینو لابردنی هەر ڕێگرێك ببێتە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئایینی خودادا، ئەوانەی پێیان وایە کە ئیسلام هەر بریتییە لە کوشتنو بڕینو شەڕو تاڵانو داگیر کردن، ئەوانەی پێیان وایە: کە ئیسلام بریتیە لە پەیوەندی نێوان خوداو بەندەو بەس! چ کارێکی بەسەر لایەنەکانی تری ژیانەوە نیە، ئەوانە هەردوو لایان بە باشی لە ئیسلام حاڵی نەبوون، لە مەنهەجی خودا نەگەیشتوون بە موسوڵمانی داناو زانا حسێب ناکرێن).

لەوەپێش باسی حوکمی شەڕکردن لەگەڵ دووڕووەکانی کرد، حوکمی ئەوانیشی روون کردەوە کە لەگەڵ موسوڵمانانندا پەیمان دەبەستنو کەچی پابەندی نابنو یارمەتی دوژمنی ئیسلام دەدەن؛ حوکمی هەر چوار تاقمو گرۆهەکانی روون کردەوە، باسی کەسانێکی کرد کە کوشتنو لەناوبردنیان رەوایە شەڕکردنو جەنگان لە دژیان غەزایە! ئەمجار دێتە سەر باسکردنی کۆمەڵێك کە بە هیچ جۆرێ کوشتنیان دروست نیە، نە بەئەنقەستو نە بەهەڵە، جا ئەو گرۆهو تاقمە موسوڵمان بن یان پەیمان لەگەڵ بەستراوو بەڵێن پێدراو بن.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن

قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞ فَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ وَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ تَوۡبَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ﴿٩٣﴾ ﴾.

ئیبنو جەریر لە عیکریمەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: حاریثی کوڕی یەزید لە تایەفەی بەنو عامر لەگەڵ ئەبو جەهل، عەییاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعەیان ئازار دەدا لەسەر ئەوەی موسوڵمان بووبوو! پاشان حاریث خودا دڵی نەرم کردو کۆچی کرد بۆ مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەرو پەیوەندی کرد بە موسوڵماناندەوە لە ڕێگای چوونی بۆ مەدینە لە شوێنێك کە پێی دەڵێن (الحرة) تووشی عەییاش بوو. عەییاش بەبێ سێو دوو لێ کردن بە شمشێر پەلاماری داو کوشتی، وای زانی هەر بە کافری ماوەتەوە: پاشان عەییاش هاتە خزمەت پێغەمبەرو ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە.. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَئًا﴾ ڕەوا نیەو ناگونجێ بە هیچ جۆرێك ڕێگا نادرێو نەدراوە کە موسوڵمان موسوڵمان بکوژێ! چونکە پەیوەندی موسوڵمان بە موسوڵمان پەیوەندی برایەتیو ڕوحییە، پەیوەندی عەقیدەو هەڵوێستو مەبەستە! کە وابێ زۆر ناسروشتییە، زۆر نەگونجاو ناڕەوایە، تاوانێکی گەورەو دەستدرێژیەکی بێ وێنەیە، کە موسوڵمان بکوژێ! مەگەر بە هەڵە موسوڵمانێك موسوڵمانێکی لەدەست بکوژرێ، کوشتنی بە هەڵە ئەوەیە بکوژ ئەو کردەوەیەی کە سەر دەکێشێ بۆ کوشتنەکە بە ئەنقەست نەیکاو مەبەستی نەبێ، یان مەبەستی بە

کردەوەکە کوشتنی کوژراوەکە نەبێ یان مەبەستی کردەوەکە گیان لەدەست دانی ئادەمیزاد نەبێ ئەوە لەم حاڵانەدا ئەگەر یەکێك یەکێکی لەدەست کوژرا بە بکوژی بەئەنقەست دانانرێ، حوکمێکی تایبەتی هەیە لەوە بەولاوە باس دەکرێ: کوشتنی ئادەمیزاد تاوانێکی فرە گەورەیەو ماڵ وێرانکەری دونیاو قیامەتەو پاساو دانەوەی نیە، سزای بە ئێشی دۆزەخی لەسەرە. خودا دەفەرموێ: ﴿مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا – المائدة/٣٢﴾.

بوخاریو موسلیم حەدیثیکیان لە ئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، والتَّارِكُ وَالْمَفارِقُ للجَمَاعَةَ» واتە: هەر موسوڵمانێ شایەتمان بهێنێو بڵێ: « أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَ أَشْهَدُ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ» بە دڵ باوەڕم هەیەو بە زمان دەڵێمو شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو بەس، خودای تر نیە، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلاَیش پێغەمبەری رەوانە کراوی خودایە، ئیتر خوێنی ئەو کەسە حەرامەو بە هیچ شێوەیێ خوێنی بەکەس رەوا نابێ، مەگەر لە یەکێ لەم کاتانەدا: بێوە پیاوێکی داوێن پیس بێ، یاخود بێوەژنی داوێن پیس بێ. یان کەسێ بە ناڕەوا کەسێ بکوژێ، یان لە ئایینی خۆی وەرگەڕابێو لە کۆمەڵەی موسوڵمانان تەرا بووبێ. شەیخان گێڕاویانەتەوە.

کەسێك یەکێ لەم سێ تاوانە یان زیاتر بکا، شیاوی لەناو بردنە، بەڵام جگە لەمیری موسوڵمانانو جێگری ئەو کەسی تر بۆی نیە تاوانبار بکوژنەوە!

ئیبنو ماجە لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ أَعَانَ عَلَى قَتْلِ مُسْلِمٍ بِشَطْرِ كَلِمَةٍ لَقِيَ اللَّهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَكْتُوبٌ عَلَى جَبْهَتِهِ آيِسٌ مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ» واتە: هەرکەسێ کۆمەکی بکا لەسەر کوشتنی موسوڵمانێ بە ناڕەوا با بە نیو وشەش بێ، رۆژی قیامەت کە دەچی بۆ مەیدانی خودا بۆ پرسینەوە، لە ناو چاوانی نووسراوە: ناهومێد لە رەحمەتی خودا. بەیهەقی لە بەڕای کوڕی عازیبەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای

لەسەر بێ) فەرمووی: «لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عِنْدَ اللّهِ مِنْ قَتْلِ مؤمن» تاج/٣ لا – ٢٠٢ جا (ومـن) ئەگـەر موسـوڵمانێك ئـەو كارەساتەی لەدەست قـەوما «قَتَـلَ مُؤْمِنًـا خَطَـأً» موسوڵمانێكى بە هەڵە كوشت «فَتَحْرِيرُ رَقَبَـةٍ مُؤْمِنَـةٍ وَدِيَـةٌ مُـسَلَّمَةٌ إِلَـى أَهْلِـهِ» ئـەبێ كۆيلەيەك - نێرينە يان مێينە – ئازاد بكاو خوێنيش بدا بە كەس و كارى كوژراو.

واتە: سـزاى كوشـتنى بـە هەڵـە دوو شـتە: يەكـەم دەبـێ كۆيلەيـەكى موسـوڵمان ئازاد بكا. دووەم خوێن و بەهاش بدا بە كەس و كارى كوژراو!

هـۆى سـزاى بكـوژى بـە هەڵـە ئەوەيـە هەرچـەندە بـە ئەنقەسـت كـابراى نەكوشتووە بەڵام لە كەمتەرخەمى و تەقصير خاڵى نيە! زێدەڕەوى لە كردەوەكەيدا هەيە، چونكە ئەگەر دووربينى بكردايەو لە شتەكە بەپەلە نەبوايە ئـەو هەڵەيـەى نەدەكرد. كۆيلە ئازاد كردنەكە بۆ كەفارەت و قەرەبووى ئەو گوناهە گەورەيەيـە كـە لە دەستى قەوماوە بەشێكە لە تەوبەكەى لـەلاى خـودا، پەيوەنـدى بـە مـافى خـوێن ڕەسـەكانەكەوە نيـە! خوێنەكـەش بـۆ دڵ دانـەوەى كـەس و كـارى كوژراوەكـەو پـڕ كردنەوەى ئەو كەلێنەيە كە تێيان كـەوتووە، ئەندازەكەشـى وەكـوو لـە فـەرموودەى پێغەمبـەردا (دروودى خـواى لەسـەر بـێ) هـاتووە سـەد وشـترە، خـوێنى ئـافرەتيش نيوەى خوێنى پياوە.

ئەگەر بكوژ خاوەنى وشتر نەبوو، دەبى هەزار دينارى زێڕ يان دە هەزار دينارى زيو بدا ئەمە لاى ئەبو حەنيفە وايە بەڵام جەماوەرى زانايـانى شـەرع دەفـەرموون: دوازدە هـەزار ديرهـەمى زيـو. ئيمـامى شـافيعى دەفـەرمووێ لـە هـەموو حاڵێكـدا خوێنى پياو سەد وشترە يان بەهاى سەد وشترە، جا چەندى گرتەوە لە زێـڕو زيـودا دەبێ بيدا. چۆنيەتى وشترەكان و شێوەى تەسليم كردن و ڕاى شارەزايانى شـەرع لـەم بارەوە لە كتێبە شەرعييەكاندا روون كراوەتەوە بە پێويستم نەزانى راگوێزى ئێـرە بكەم.

بە هيچ شێوەيەك بكوژ لـە خـوێن پێدانەكـە عـەفوو نـاكرێ ﴿إِلاَّ أَن يَـصَّدَّقُواْ﴾ مەگـەر كـەس و كـارى كوژراوبكـوژ عـەفوو بكـەن و گـەردنى ئـازاد بكـەن، ئـەو كاتـە لەسەرى لادەچێ چونكە ئـەو خوێنـە بۆيـە پێويـست كـراوە بـۆ دڵدانـەوەى ئـەوان و كەلێن پڕ كردنەوەى كوژراو بۆ ئەوەى دوژمنايـەتى نەكەوێتـە نێـوان كـەس و كـارى

کوژراوو بکوژەوە، ئەگەر کەس‌وکاری کوژراو بۆ خۆیان عەفووی بکەن‌و وازی لێ بێنن دەسەڵات‌و صەلاحییەتی خۆیانە! پەروەردگار ئەم لێبووردنەی ناو ناوە (تصدق)و خێرو چاکە بۆ شیرین کردنی ئەو کارە لای کەس‌و کاری کوژراوو هەڵنانیان بۆ لێبووردن!!

جا ﴿فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ ئەگەر ئەو کوژراوە لە خێڵ‌و هۆزێکی دوژمن بوو، کوژراوەکە بۆخۆی موسوڵمان بوو، وەکوو حاریثی کوڕی یەزید کە لە هۆزی قورەیش بوو ئەوانیش دوژمنی پێغەمبەرو موسوڵمانان بوون، موسوڵمانەکان لە حاڵەتی حەربدا بوون لەگەڵیاندا، موسوڵمانەکانیش بەوەیان نەزانی بووکە کوژراوەکە موسوڵمان بووە چونکە کۆچی نەکردبوو، کە کۆچی کرد لە ڕێگا عەییاش وای زانیبوو هەر لەسەر بیروباوەڕی بتپەرستیەو کوشتی؛ وەکوو لەوە پێش باسکرا. هەروەها هەرکەسێك لە وڵاتی کوفردا بێ‌و ئیمانی هەبێ‌و ئەوکاتەی کە موسوڵمان دەیکوژن نەزانن کە موسوڵمان بووە ئەوە خوێنی نیەو هیچ نادرێ بە کەس‌و کاری کوژراو، بەڵام ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ پێویستە بکوژ کۆیلەیەکی موسوڵمان ئازاد بکا بۆ کەفارەتی گوناهەکەی. بەڵام ﴿وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾ ئەگەر کوژراوەکە لە خێڵ‌و هۆزێك بوو، لە نێوان ئێوەو ئەواندا پەیمان‌و بەڵێن هەبوو کەس‌و کارەکەی ئەهلی زیممە بوون، یان ئاگر پەرست‌و حەربی بوون بەڵام ئاگر بەست هەبوو لە نێوان ئەوان‌و موسوڵماناندا ئەوە ﴿فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ﴾ دەبێ خوێنی کوژراوەکە بدەن بە کەس‌و کاری، جا کوژراوەکە بۆخۆی کافر بێ یان موسوڵمان بێ دەبێ بکوژ خۆی، یان خزمەکانی بەپێی جۆری کوشتنەکە خوێنی تەواو بدەن بە کەس‌و کاری کوژراوەکە، وێڕای ئەوەش ﴿وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ دەبێ بکوژ کۆیلەیەکی موسوڵمانیش ئازاد بکا... ئەمە رای ئەبو حەنیفەیە، بەڵگە لەسەر ئەمە زاهیری ئایەتەکەیە دەربارەی ئەوانەی کە پەیمان‌و بەڵێنیان لەگەڵ موسوڵماناندا هەیە، هەروەها چونکە لە تۆڵەی کوشتنەوەدا یەکسانی دەخرێ لە نێوان موسوڵمان‌و زیممیدا، کەوابێ لە خوێنیش دا بەیەك چاو سەیر دەکرێ.

ئیمامی مالیك دەفەرموێ: خوێنی كوژراوی پەیمان پێ دراو نیوەی خوێنی موسوڵمانە، جا كوژرانەكە بە ئەنقەست بێ یان بە هەڵە بێ، بەڵگەشی ئەم حەدیثەیە كە ئەحمەدو تیرمذی ریوایەتیان كردووە، دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (خوێنی كافر نیوەی خوێنی موسوڵمانە).

هەروەها عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكییەوە لە باپیرەیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: خوێن لەسەردەمی پێغەمبەردا هەشت سەد دیناری زێڕ بوو، هەشت سەد هەزار دیرهەمی زیو بوو، خوێنی خاوەن نامەكان (أهل كتــاب) نیوەی خوێنی موسوڵمان بوو، دەڵێ: بەو شێوەیە بوو، تا عومەر (رَضيَ اللهُ عَنهُ) كرا بە جێنشین، ئیتر وتارێكی بۆ خەڵكەكەدا وتی: وشتر گران بووە، ئەمجار ئەندازەی خوێنی بە پارەی زیو كردە دوازدە هەزار دیرهەم، بە پارەی زێڕ كردی بە هەزار دینار، بە ڕەشەوڵاغ كردی بە دوو سەد گاو مانگا، بە مەڕو بزن كردی بە دوو سەد مەڕو بزن، لەسەر ئەوانەی بازرگانن‌و سەوداو مامەڵەیان بە كوتاڵ‌و جل‌و بەرگە، دوو سەد قات جلە، بەڵام خوێنی خاوەن نامەكانی وەك خۆی هێشتەوە، خاوەنی سوننەكان (أصحاب السنن) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموودەیەكیان ریوایەت كردووە كە خوێنی پەیمان پێ دراو (معاهد) نیوەی خوێنی موسوڵمانە.

لە ئیمامی ئەحمەدەوە دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: خوێنی پەیمان پێ دراو وەكوو خوێنی موسوڵمان وایە، ئەگەر بە ئەنقەست كوژرا ئەگینا نیوەیە، شافیعی دەفەرموێ: خوێنی پەیمان پێ دراو سێیەكی خوێنی موسوڵمانە، كوژرانەكە بە هەڵە بێ یان بە ئەنقەست بێ، چونكە ئەمە كەمترین ئەندازەیە كە لەم مەسەلەیەدا گوترا بێ! هەروەها چونكە عومەر خوێنی (معاهد)ی بە چواردە هەزار دیرهەم قەبڵاند، ئەوەش دەكاتە سێیەكی خوێنی موسوڵمانان.

خوێنی كوژراوەكە میراتگرەكانی وەری دەگرن، كە وەرگیرا وەكوو میرات مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێ، پێش هەموو شتێك ئەگەر كوژراو قەرزدار بوو قەرزەكانی لێ دەدرێتەوە، وەسیەتنامەكانی لێ جێبەجێ دەكرێ، چی مایەوە بەسەر میراتگرەكانیدا دابەش دەكرێ!

دەگێڕنەوە دەڵێن: ئافرەتێك هاتە خزمەت ئیمامی عومەر داوای بەشی خۆی کرد لە خوێنی مێردەکەی، عومەر وتی وابزانم تۆ هیچت بەر ناکەوێ، خوێن بۆ ئەوانەیە کە خزمانی باوانن‌و خوێنی بۆ دەدەن، واتە: ئەگەر ئەو پیاوێکی لە دەستدا بەهەڵە بکوژرایە کێ خوێنەکەی بۆ دەداو بە (عاقلة) حسێب دەکرێ ئەوەش ئێستا خوێنەکەی وەردەگرێ!

ئیتر ئەوە بوو برێ لە هاوەڵان شایەتیان دا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردوون کە ژن لە خوێنی مێردی بەشی بدرێ، ئەمجار عومەر بڕیاری دا کە بەشی بدرێ! ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾ کەسێك کۆیلەی دەست نەکەوت بەم جۆرە کۆیلە هەر نەمابوو، کۆیلەیی بنەبڕ بووبوو، وەکوو سەردەمی ئێستا کە سەردەمی مافی مرۆڤەو گوایە لە سەرانسەری جیهاندا کۆیلایەتی‌و بە کۆیلە کردن قەدەغەیە، یان دەسەڵات‌و دارایی نەبووو بەندە ئازاد بکا، ئەوا دەبی دوو مانگ بەبێ ناوەند تێ خستن بە ڕۆژوو بێ ﴿تَوْبَةً مِّنَ اللَّهِ﴾ پەروەردگار، ئەم یاسایەی بۆ داناون کردویەتی بە تۆبە لێ قبووڵ کردن بۆتان‌و ڕەحمەت‌و بەزەیی‌و پاك کردنەوەی دڵ‌و دەروونتان لە ئاکام‌و ئەنجامی کەمتەرخەمی‌و گوێ پێ نەدان‌و کەم تێفکرینتان کە سەری کێشا بە وەدی هاتنی تاوانی ئادەمیزاد کوشتن بەهەڵە ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا﴾ پەروەردگار هەموو کات ئاگادارە بەسەر نیازو هەست‌و خوستی دڵ‌و دەروون داو دەزانێ بە چی لە چڵکی تاوان پاك دەبێتەوە، دەزانێ کە بگوژی بە هەڵە دەستی ئەنقەستی لە تاوانەکەدا نیە، تۆڵەی کوشتنەوەی لەسەر دانەناوە ﴿حَكِيمًا﴾ داناو حەکیمە لە دانانی شەریعەت‌و یاسادا، بێگومان دیاری کردنی خوێن لە کوژرانی بە هەڵەدا بۆ کەلێن پڕ کردنەوەی ئەوپەڕی حیکمەت‌و بەرژەوەندی تێدایە بۆ کەس‌و کاری کوژراو بۆ بکوژیش.

﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا﴾ کەسێك بە ئەنقەست موسوڵمانێك بکوژێ سزای تاوانی ئەو کوشتنەی ئاگری دۆزەخەو هەتا هەتایە، یان (ماوەیەکی دوورو درێژ) تێیدا دەمێنێتەوە، ﴿وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ خودا خەشم‌و غەزەبی لێیەتی‌و تۆڵەی ئەو تاوانە گەورەی لێ دەستێنێ‌و

ریسوای دەکاو لە رەحمەتو بەزەیی خۆی دووری دەخاتەوەو نەفرینی لێ دەکاو سزای گەورەو بەئێشی بۆ داناوە. ئایا تۆبەی بکوژی بە ئەنقەست وەردەگیرێ؟؟

ئیبنو عەبباس و کۆمەڵێ لە هاوەڵان و چینی دوا ئەوان (تابعین) پێیان وایە بکوژی بە ئەنقەست تۆبەی لێ وەرناگیرێ! بەڵگەیان چەند حەدیسێکە کە باس لە گەورەیی و بەسامی ئەم تاوانە دەکەن! وەکوو ئەو حەدیثانەی کە لەئیبنو عومەرو بەرائی کوڕی عازیب گێڕدراونەتەوە، (لەوەپێش نووسیمانن!)

تاوانی بکوژ لەم حاڵەدا جوداوازی هەیە لەگەڵ کەسێك تۆبە لە شیرك دەکا هاوکات لەگەڵ موشریکییەکەیدا ئادەمیزادیشی کوشتووەو زیناشی کردووە کەچی تۆبەی لێ وەردەگیرێ چونکە ئەوکاتە بڕوای بە شەریعەت و یاسایەك نەبووە کە ئەم شتانە حەرام بکا، جۆرە عوزرو بیانوویەکی هەیە.. هەروەها ڕێگە نەگرتن لە تۆبەی هاوبەش پەیداکەران هەڵنان و ڕێخۆش کردنی تێدایە بۆ موسوڵمان بوون. بەڵام موسوڵمانێك هەڵسێ بە ئەنقەست پیاوێك بکوژێ و بزانێ کە ئادەمیزاد کوشتن حەرامەو لەگەڵ ئەوەشا ئەو تاوانە ئەنجام بدا، ئەوا هیچ عوزری نییەو تۆبەی لێ وەرناگیرێ!

زۆربەی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە بکوژی بە ئەنقەست تۆبەی لێ وەردەگیرێ، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ – الزمر/٥٣﴾ ئەمەش شتێکی گشتییەو هەموو تاوانێك دەگرێتەوە، کوفر، شیرك، گومان، دووڕوویی، کوشتن هەرکەسێ تۆبە بکا خودا ئەگەر بیەوێ – تۆبەی لێ وەردەگرێ تەنها یەك تاوانی لاداوەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء النساء/٤٨﴾ ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە جگە لە شیرك پەروەردگار ئەگەر بیەوێ لە هەموو گوناهێك خۆش دەبێ!

لە بوخاری و موسلیمدا سەرگوزشتەی کابرای بەنو ئیسرائیلی هەیە کە سەد کەسی کوشتبوو دوایی پرسیاری لە زانایەکی ئایینی کردبوو، ئاخۆ ڕێگای تۆبەی هەیە یان نا؟ زاناکە پێی گوتبوو هیچ شتێك ڕێگەی تۆبەی لێ ناگرێ، ئەمجار پێی گوتبوو بچۆ بۆ فلان شار لەوێ خواپەرستی بکە، ئەویش بەرەو ئەوێ کەوتبووە

رێ، لەرێگا مردبوو فریشتەی رەحمەت دەیخەنە ئامێزی خۆیانەوە! واتە دوای ئەوەی بە ئەنقەست سەد کەسی کوشتبوو کە تۆبەی کرد خودا تۆبەی لێ قبوڵ کرد، دەی کە ئەمە بۆ کابرایەکی بەنو ئیسرائیل ببێ، بۆ ئوممەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان زیاتر جێگای ئومێدە، چونکە ئایینی ئیسلام ئایینی ئاسانکاریو میانڕەویو چاو پۆشیو لێبووردنە. هەروەها چونکە تاوانی کوفر زۆر ستەمترە لە تاوانی کوشتن، دەی کە تۆبە لە کوفر وەربگیرێ دەبێ لە کوشتن باشتر وەربگیرێ! زیاد لەوەش ئایەتی قورئان بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە تۆبەی بکوژ وەردەگیرێ وە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا، إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا – الفرقان/٦٨ – ٧٠﴾.

بۆ وەڵامی ئایەتی ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ ئەبو هورەیرەو کۆمەڵێك لە زانایانی سەلەف دەفەرموون: مەبەست لەم ئایەتە سزای رەوای بکوژ ئەمەیە کە لەم ئایەتەدا دەست نیشان کراوە، بەڵام مەرج نییەو فەرز نییە کە جێبەجێ بکرێ، وادەبێ بکوژ تەوبە دەکا کاری چاکە دەکا، خودا بەهۆی ئەوەوە کاری بۆ ئاسان دەکا، دەنا ئەم سزا دیاریکراوەی بەسەردا دەچەسپێ.

زۆربەی زانایان دەفەرموون: کاتێك بکوژ لە دۆزەخدا هەتا هەتایە دەمێنێتەوە کەهیچ کردەوەیەکی باشی نەبێ رزگاری بکا! کەوابێ بکوژ هەتا هەتایە لەدۆزەخ ناهێڵدرێتەوە بەڵکوو مەبەست بە ﴿خَالِدًا فِيهَا﴾ ماوەیەکی دوورو درێژە، فەرموودەی پێغەمبەریش بە تەواتور گەیشتوون کە فەرموویەتی: (يخرج من النار من كان في قلبه أدنى مثقال ذرة من إيمان) عیکریمەو ئیبنو جورەیج دەڵێن: حوکمی ئایەتەکە بۆ بکوژێکە کوشتنی موسوڵمانی لا رەوا بێ. تەنانەت وشەی (مُتَعَمِّدًا) یان بە (مُسْتَحِلاً) راڤە کردووە (مُسْتَحِلاً) واتە: کوشتنی بەناهەق بەرەوا بزانێ.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لەدوو شوێندا تەرخان (تخصيص) کراوە، واتە: حوکمە گشتییەکەی تایبەت کراوە:

یەکەمیان: بکوژ بە ئەنقەست بکوژرێتەوە لە تۆڵەی کوژراوی خۆیدا، ئەمە گەرچی کوشتنی بە ئەنقەستە بەڵام دەست درێژی تیانییە، بکوژ بەهەق کوژراوە نەك بەناهەق.

دووەم: کەسێ کەسێ بەناهەق بکوژێ، بەڵام دوایی تەوبەی لێ بکا. دەی کاتێ بەم دوو شێوەیە مانای گشتی ئایەتەکە تخصیص رووی تێکرد، هەڵ دەگرێ بە چەندین شێوەی تریش ئایەتەکە تەرخانو (تخصیص) بکرێ، وەك کاتێ لێبووردنی خوێن رەشەکان، کەواتە: مەرج نییە هەموو کاتێ بکوژ هەتا هەتایە لە دۆزەخدا بمێنێتەوە، ئەمەش فەرموودەی خودای گەورەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ – النساء/٤٨﴾.

## سووربوون لەسەر ئاشتیو پابەندبوون بە حوکمەکانی خودا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾ ﴾.

ئەمجار بۆ پارێزگاری کردنی گیانی ئادەمیزادانو بۆ پاڵفتە کردنی دڵو دەروونی جەنگاوەرانی موسوڵمان پەروەردگار فەرمان دەکا بە موسوڵمانان کە هەرکاتێ چوونە دەرەوە بۆ غەزاکردن لەسەرەتاوەو بەبێ تێفکرینو ووردبوونەوە کەس نەکوژن هەرکەسێ بە زوبان شایەتو ئیمانی هێنا دەبێ خوێنو ماڵی

پارێزراو بێ، فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ﴾ ریوایەتو سەرگوزشتەی زۆر دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە هاتوون پوختەکەیان ئەوەیە: کە مەفرەزەیەك کۆمەڵێك لە جەنگاوەرانی ئیسلام تووشی پیاوێك دەبن مەڕو ماڵاتی پێ دەبێو خزمو کەسو کاری ئەو ناوچەیە چۆڵ دەکەن کابرا پێیان دەڵێ: (السلام عليكم) واتە: ئەوە پیشان دەدا کە موسوڵمانە، بەڵام هەندێ لە جەنگاوەرەکان پێیان وابوو؛ ئەم وشەیە بەفێڵ دەڵێ بۆ هەڵخەڵەتاندنیانو بۆ ئەوەیەتی خۆی رزگار بکات، یەکیان پەلاماری دەداو دەیکوژێ مەڕو ماڵەکەشی دەکەنە تاڵانی، کە هاتنەوە ئەمەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو موسوڵمان بوون ﴿إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ ئەگەر رۆیشتن بۆ جەنگ لەگەڵ دوژمنان لەو دەڤەرو هەرێمانەی تێی دەچن، کەسانێکتان بینی لێیان کەوتنە گومانەوە ئاخۆ موسوڵمانە یان نا؟ ئاشتی خوازە یان شەڕخوازە؟ ﴿فَتَبَيَّنُواْ﴾ لێکۆڵینەوەی تێدا بکەن، هەوڵ بدەن بزانن چییەو چی نییە، کێیەو چ کەسە، موسوڵمانە یان کافرە؟ ﴿وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِناً﴾ بەو کەسە مەڵێن کە خۆی تەسلیمی ئێوە کردو سەلامی خوای لێ کردنو ئەوەی دەرخست کە موسوڵمانە پێی مەڵێن: تۆ موسوڵمان نیو بە فێڵ خۆت بە موسوڵمان نیشان دەدەی! ئەوە کاری ئێوە نییە، ئێوە لەسەرتانە کار بە ظاهیری حاڵیان بکەن نەك بیانوویان پێ بگرن بەوەش ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ بتانەوێ ماڵو سامانی دونیاتان دەست کەوێ! تاڵانی بگرن ﴿فَعِندَ اللّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ﴾ لای خودا رزقو رۆزیی زۆرو زەبەندە هەیە، نیعمەتو ماڵو سامانی بێ ئەندازەی هەیە گەنجینەی ئاسمانو زەوی لای ئەوە، هەوڵ بدەن بە رێگەی خودا پەرستی بەدەستی بێنن، ئەوە باشترە بۆ ئێوە، نابێ بە هیچ جۆرێك کارێك لەو شێوە کارەی کردوتانە بیکەنەوە، نابێ لەخۆتانەوە حوکم بدەن بەسەر خەڵکدا بە کوفرو خوێنی بە حەڵاڵ بزانن، بەبێ بەڵگە پێتان وابێ ئەو هەڵسو کەوتەی نواندی بەرامبەرتان بۆ خۆپاراستنو ماڵ پاراستن بووا ﴿كَذَلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ﴾ ئێوەش لەوەپێش وەکوو ئەو وابوون، بەنهێنی ئیمانتان هێنابوو موسوڵمان بوونی خۆتان لە موشریکەکانی مەککە

دەشاردەوە، دوايى موسوڵمان بوونى خۆتان ئاشكرا كرد، ئەم كابرايە ئێوە كوشتان ئەويش ئيمانى خۆى لە كافرەكان شاردبووەوەو لەوەپێش نەوێراوە لاى قەومەكەى ئيمانەكەى ئاشكرا بكا كە ئێوەى بينيوە بيروباوەڕى خۆى دەرخستووە ﴿فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ خودا منەتى خۆى بەسەر ئێوە باراند، ڕێگاى كۆچكردنى پێدان، بەهێزى كردن توانيتان بانگەوازى ئيسلامى بە ئاشكرا هەڵبدەن.

يانماناى وايە ئێوەش وەكوو ئەو كابرايەى كە بەتۆمەتى كوفر كوشتووتانە ئێوەش ئاوا كافر بوون، خودا منەتى خۆى بەسەردا كردن هيدايەتى دان بۆ موسوڵمان بوون هى واتان هەبوو هەر لەيەكەم جارەوە بە ڕێكو پێكىو لەناخەوە ئيمانى هێناو موسوڵمان بوو، هى واشتان هەبوو لەسەرەتاوە لەترسانو بۆ پاراستنى ماڵو منداڵو گيانى، موسوڵمان بوو، دوايى وردە وردە لە ئيسلام تێگەيشتنو ئيمانەكەيان جێگير بوو!

ئەمجار پەروەردگار جارێكى تر جەختى لەسەر توێژينەوەو لێكۆڵينەوەو وردبوونەوە كردەوەو فەرمووى: ﴿فَتَبَيَّنُوا﴾ روونى بكەنەوە بێ لێكۆڵينەوەو وردبوونەوە پڕكێشى هيچ كارێك مەكەن، هەركارێك تاوى دەدەنێ بەڵگەو نيشانەكانى بزانن باش بچنە بنجو بنەوانى، بە گومانى سەرپێيىو بێ بەڵگە كار مەكەن هەتا شتەكە روون نەبێتەوە بڕيار مەدەن! چونكە بۆ حوكم كردن بە ئيمانى ئادەميزاد شێوەو روخسارى دەرەكى كيفايەتە، بەڵام كوشتنى كەسێك لەسەر كوفر پێويستە دڵنيابن لە كوفرەكەيىو بزانن كابرا لەسەر كوفرەكەى ماوەتەوە! پێويستە هەڵسو كەوتتان لەگەڵ تازە موسوڵمان بووان هەمان هەڵسو كەوت بێ كە لەكاتى موسوڵمان بوونتاندا لەگەڵ ئێوە كراوە. تەنها موسوڵمانى رواڵەتى دەبێتە لەمپەر بۆئەوەى كە شەڕو كوشتاريان لەگەڵ نەكرێ ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ دڵنيابن كەخودا ئاگادارى كردەوەكانتانە، ئاگاى لە حاڵو چۆنيەتيتان هەيە، بە نيەتو مەبەستتان دەزانێ، پاداشو سزاتان دەداتەوە لەسەر نيەتو هەڵوێستو كردەوەتان حيسابتان لەگەڵ دەكا، ئەمە هەڕەشەيەكى توندو تيژەو ترساندنى موسوڵمانانە، جارێكى تر نەكەونە هەڵەى ئاواوەو بەبێ

لێکۆڵینەوە هەڵنەکوتنە سەر ئادەمیزادی موسوڵمانو بەبێ تێفکرینو وردبوونەوە کەسی ئاوا نەکوژن!

## جیاوازی نێوان تێکۆشەرانو ئەوانەی خۆیان لەجیهاد دەشارنەوە

﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار سەرزەنشتی ئەوانەی کرد: کە کابرای خاوەن مەڕیان کوشت، ئەو سلاوی ئیسلامی لێ کردنو ئەوان پێیان وابوو: کە لە ترسان ئەم سلاوە دەکاو کوشتیان، ئەمجار گەورەیی تێکۆشانو گیانو ماڵ بەخت کردن روون دەکاتەوەو ئەوانەی چوون بۆ غەزاو ئەوانەی خۆیان پاش داوە یان بەهانەی نەچوونیان هەیە، پلەو پایەو رێزیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ یەکسان نین ئەو موسوڵمانانەی بەهانەی نەچوون بۆ غەزایان نیەو کەم ئەندام نین لەگەڵ ئەو موسوڵمانە جەنگاوەرانەی بە ماڵو گیان تێدەکۆشنو خۆیان لە رێگەی خودادا بەخت دەکەن! دەچن بۆ بەرەنگاری کافرانو هەمیشە سەریان لە رێی دایە بۆ جەنگان لەپێناو بلاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامو بەرز کردنەوەی ئالای «لاَ إِلَـهَ إلاَّ اللّهُ، مُحَمَّد رَسُولُ اللّـه»، چۆن ئەوانەی لە غەزای بەدر خۆیان پاش داو بەبێ بیانووی رەوا ئامادەی غەزایەکە نەبوون دەچنە ریزی ئەو جەنگاوەرانەی کە بە حەماسو سەرگەرمییەوە بەشداری جەنگەکەیان کردو بەوپەڕی حەماسو

لێبووردەییەوە جەنگان و دوژمنیان شکاند؟! بەڵام پەروەردگار کۆمەڵێکی چەرت کرد لە چوون بۆ غەزا، کە بەهانەی ڕەوایان هەیە بۆ نەچوون، وەکوو نەخۆش و کوێر و شەل و سەقەت، ئەمانە هەرچەندە ئامادەی غەزاکە نەبوون بەڵام چونکە بە دڵ پێیان خۆش بوو ساغ بوونایەو بەشدارییان بکردایە، هەمان پاداشتی بۆ بەشدار بووەکان هەیە بۆ ئەوانیش هەیە.

بوخاری و ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوەو دەڵێن: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە غەزای تەبوك گەڕایەوەو لەکاتی چوون بۆ ناو مەدینە فەرمووی: «إنَّ بِالْمَدِينَةِ لَقَوْمًا مَا سِرْتُمْ مِنْ مَسِيرٍ، وَلاَ قَطَعْتُمْ وَادِيًا إلاَّ وَهُمْ مَعَكُمْ فِيهِ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ؟؟ قَالَ وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ».

لە ڕاستی دا لە مەدینەدا پیاو گەلێ بەجێ ماون، هەنگاو بە هەنگاوو قۆناغ بە قۆناغ لە ئەجرو پاداشدا لەگەڵ ئێوەدان یاران فەرموویان: قوربان! هەر ئێستا وان لە ناو مەدینەدا؟ فەرمووی: بەڵێ چونکە ئەوان بەدڵ لەگەڵ ئێوە بوون بەڵام بەهانەی ڕەوا لەوێ گلی داونەتەوە. تاج/٨ لا — ٧٧.

ئەمجار پەروەردگار ڕێزو پلەو پایەی جەنگاوەران دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً﴾ پەروەردگار پلەو پایەی جەنگاوەرانی زۆر بەرز کردۆتەوە بەسەر ئەوانەدا کە بەبێ عوزر خۆیان پاش داوە لە جیهاندا بە گەشەو بزەی سەرکەوتن و دەستکەوتی تاڵان و ناوبانگی مەردی و ئازایەتی، لە قیامەتیشدا بە پلەو پایەی بەرزی بێ وێنەی بەهەشت و پاداشی زۆر گەورەو فراوان.

﴿وَكُلاًّ وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى﴾ پەروەردگار بەڵێنی چاکەو پاداشتی باشی داوە بە ئەوانەی ئامادەی غەزاکە بوون و ئەوانەی لەبەر عوزرو بیانوی ڕەوا نەیانتوانیوە ئامادە بین و بەدڵ ئاواتەخواز بوون بچوونایەو بۆیان نەلواوە بچن. ئەم دوو تاقمە هەردوو لایان لەبەر بیروباوەڕی تەواویان، بەهۆی ئیخلاص و نیەتی ڕاستیان وێڕای کردەوەو هەڵوێستیان شایانی پاداشی باشی پەروەردگارن.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە جیهاد فەرزی عەین نیە، واتە: لەسەر هەموو کەسێ پێویست نیە، بەڵکوو فەرزی کیفایەیە، کە کۆمەڵێك پێی هەستان لەسەر ئەوانی تر لادەچێ.

ئەمجار پەروەردگار بە شێوەیەکی گشتی پلەو پایەی ئەوانە دیاری دەکا کە ئامادەی غەزا بوونو دەفەرموێ: ﴿وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ خودا پلەو پایەی جەنگاوەرانو خۆبەخت کەرانی بەرز کردۆتەوە بەسەر ئەوانەی کە بەبێ عوززرو رەوا خۆیان لە چوون بۆ غەزا پاش داوە، پاداشو بەخششێکی زۆرو گەورەی بۆ داناون کە بریتییە ﴿دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً﴾ پلەو پایەی بەرزو شکۆدار، خانوو باڵەخانەی دلگیرو بەرزو رازاوە، کە زانین ئەندازەو رێژەی خۆشیو باشییان لە توانای ئادەمیزاددا نیە!!

زێدەو جوداوازی لە پلەو پایەی دا، بە هۆی ئیمانی بەهێزەوە دەبێ بەهۆی خۆنەویستیو پێش خستنی رەزامەندی خودا بەسەر رابواردنو خۆشی دونیایی دا دەبێ، بە سۆنگەی پێش خستن پارسەنگ دانەوەی بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی تایبەتیدا دەستەبەر دەبێ!

لە صەحیحەینی موسلیمو بوخاریدا حەدیسێك هەیە ئەبو سەعید دەیگێرێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ، كُلُّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ» ئیبنو مەسعوودیش دەڵێ: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فَلَهُ أجره دَرَجَةٌ» پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (دەرەجە) پلەو پایە چییە؟ فەرمووی: «أَمَا إِنَّهَا لَيْسَتْ بِعَتَبَةِ أُمِّكَ، مَا بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ مِائَةُ عَامٍ». هەروەها ئەجرو پاداشی تریشیان دەداتێ وەکوو لێخۆش بوونو چاوپۆشی کردن لە تاوانیان، رژاندنی رەحمەتو بەرەکەتی خۆی بەسەریاندا، زیاد لە لێخۆش بوونو چاکەو پاداشی زۆرو فراوان!! چونکە دابو نەریتی خودا واهاتووە لێخۆشبوون بۆ کەسێك بە شیاوی لێخۆش بوونی بزانێ! رەحمەتو بەزەیشی بۆ کەسێکە بە پێویستی بزانێ. هەمووشیان دەکەونە بەر فەضلو گەورەیی خۆیو بە ویستی خۆیەتیو هیچ کاتێ ناچار ناکرێ شتێك بکا یان نەیکا.

دەربارەی راڤەکردنی ئەم ئایەتە زانایان سێ رایان هەیە! برێکیان پێیان وایە کە دەوڵەمەندی باشترە لە هەژاری، چونکە دەوڵەمەندی دەسەڵاتی پێوەیە هەژاری دەبێتە هۆی لاوازی‌و بێ دەسەڵاتی! دەی لە ئیسلامدا بە تەوانایی‌و دەسەڵات باشترە لە هەژاری‌و بێ دەسەڵاتی، وەکوو پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ» موسوڵمانی بە توانا لە موسوڵمانی بێ هێز باشترە، بە گشتیش هەردوو لایان هەر باشن. یان گوتراوە: دەوڵەمەندی سوپاس گوزار باشترە لە هەژاری صابرو خۆڕاگر. یان دەڵێن: نزیکە هەژاری سەربکێشێ بۆ کوفر....

برێکی تر رایان وایە کە هەژاری باشترە؛ بەڵگەشیان ئەوەیە: گوایە هەژار دونیا نەویستەو دەوڵەمەند هەڵەوگیری دونیایە، دونیا نەویستی باشترە لە دونیا ویستن.

برێکی تر پێیان وایە میانەڕەوی‌و مام ناوەندی باشترە، بەم جۆرە کابرا ئەوەندەی هەبێ لە ریزی هەژاری دەربچێ لە پلەی لای خوارووی دەوڵەمەندی دابێ! بەمەش لە خراپی هەردوو حاڵەتەکە رزگاری دەبێ... ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ پەروەردگار لێبووردوو لێخۆشبووە بۆ بەندەکانی، رەحم‌و بەزەیی بەرفراوانە.

## کۆچکردنی موسوڵمانانی بێ دەسەڵات

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ

ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ ﴾.

له ئایەتی پێشوودا باسی پلەو پایەی جەنگاوەرانی ئیسلامی کرد؛ ئەوانـەی لـە ڕێگای خودادا گیانو ماڵیان بەخت دەکەن! لێرە بـەولاوە باسـی کۆمـەڵێك دەکا کـە لەپێناو ئایینی خوادا کۆچ ناکـەن، خۆیـان لـە ژێـر چـنگی سـتەمکاراندا دەهێڵنـەوە، ڕێگای کۆچ کردنیانو دەرباز بوونیان هەیە بەڵام ناچنە سەریو نایکەن!

واتە: ئەوانە لە ڕاستیدا بێ دەسەڵاتو لاواز نین عوزرو بەهانەی مانەومیان لە وڵاتی کوفردا بەدەستەوە نیە...

وەکووچەسـپاوە ئـەو کاتـەی کافرەکـان تـەنگیان بـە موسـوڵمانان هەڵـچنیو ناچاریان کردن کە یەکەمجار کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، دوایی لەگەڵ پێغەمبـەردا بـۆ مەدینە کۆچ بکەن! جا برێك لە موسوڵمانان پێیان ناخۆش بوو مەککە بەجێ بێڵن، خۆشەویستی مەککە بـوو بـە هـۆی کـۆچ نـەکردنیان، هەنـدێکیش لەبـەر پـیری یـان نەشارەزایی، نەیانتوانی کۆچ بکەن، هەندێکیش کۆچیان کردو لە ڕێگا مردن!

جـا وەکـوو بوخـاری لـە ئیبنـو عەبباسـەوە دەگێڕێتـەوە: کەسـانێك هـەبوون موسوڵمان بوونو لە مەککە مابوونـەوە کۆچـیان نـەکردبوو، لەگـەڵ سـوپای کـوفردا ئامادەی جەنگ دەبوون، لەشکری کوفریان زۆر دەکرد، لـەکاتی شـەڕەتیرو لێـدان بـە شمشێر لێیان دەکوژرا، پەروەردگار ئەم ئایەتەی کە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَآئِكَةُ......﴾ دەربارەی ئەوان ناردووە!

ئیبنو جەریرو ئیبنو مونـذیر لـە ئیبنـو عەبباسـەوە دەگێڕنـەوە دەڵـێ: چـەند کەسێك لە دانیشتوانی مەککە بە دزی موسوڵمان بـوو بـوون ئیمـان هێنـانی خۆیـان

لای کافرەکـان ئاشـکرا نـەکردبوو، رۆژی جـەنگی بـەدر کافرەکـان لەگـەڵ خۆیانـدا هێنابوویـانن بـۆ شـەڕو هەنـدێکیان لێ کوژرا، موسـوڵمانەکان دوای گوتیـان: ئەوانـە موسوڵمان بوون بە زۆر هێندراون، داوای لێخۆشبوونیان بۆ کردن، ئیتر ئـەم ئایەتـە هاتە خوارێ ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَـةُ ظَـالِمِي أَنْفُـسِهِمْ...﴾ دوایـی موسـوڵمانەکان ئەم هەواڵەیان نارد بۆ موسوڵمانە دانیشتووەکانی مەککەو پێیان گوتن: کـە عـوزرو بەهانەی مانەوەتان لەوێ نیە، ئیتر موسوڵمانەکانی مەککە بـەرەو مەدینـە کەوتنـە ڕێو کافرەکان شوێنیان کـەوتن‌و ناچاریان کـردن کـە بگەڕێنـەوە بـۆ مەککـە، ئـیتر ئایـەتی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ – العنكبـوت/١٠﴾ هاتـەخوارێ، ئـیتر موسـوڵمانەکانی مەدینـە ئەمەشـیان بـۆ موسوڵمانەکانی مەککە نارد، ئـەوانیش زۆری پـێ خەفـەتبار بـوون، ئـەمجار ئایـەتی ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِن بَعْدِ مَا فُتِنُواْ – النحل/١١٠﴾ هاتەخوارێو ئەمەشـیان بۆ نـاردن ئـیتر موسـوڵمانەکانی مەککە کۆچیان کـردو بـەرەو مەدینـە کەوتنـە ڕێ کافرەکان دوایان کەتن هەندێکیان رزگاریان بوو، هەنێکیشیان کوژران!

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُـسِهِمْ﴾ ئەوانـەی فریـشتە لـە کـاتی تـەواو بوونی تەمەنیان گیانیـان دەکێشن‌و لـە بـارو زروفێکدا بـوون ستەمیان لـە خۆیـان کردووە، بەوە کە لە مەککە کۆچیان نـەکردووە، بـەبێ عـوزرو بەهانـەی رەوا رازی بـوون کـە لـە وڵاتـی کوفردا بمێننـەوەو پەیوەنـدیان بـە پێغەمبـەرو هـاوەڵانی نـە کردووە ﴿قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ﴾ فریشتەکان بە شێوەی تانەو توانج‌و تەشەر لێـدان پێیـان دەڵێن: دەربارەی ئایین وەزعتان چۆن بووە هەڵوێستان چـی بـووە؟ چـۆنتان رۆژگـار بەسەر دەبرد؟ واتە: ئێوە هیچ هەڵوێستێکی مەردانەتان نەبووە رێگای کۆچ کـردن‌و دەرباز بوونتان هەبوو کەچی کۆچتان نـەکرد ﴿قَـالُواْ كُنَّـا مُسْتَـضْعَفِينَ فِـي الأَرْضِ﴾ ئەوانیش لە کاتی گیانەڵاودا وەڵامێك دەدەنەوە ریسواییە پێیان وایـە عـوزرە، بـەڵێ عوزر دێننەوەو پاساوی کۆچ نەکردنەکەیان دەدەنـەوە بـەڵام عـوزر هێنانەوەکـەیان بـێ بـنج‌و بنەوانـە، دەڵـێن: ئێمـە لـە مەککـەدا بـێ دەسـەڵات‌و زەبـوون بـووین. نەمانتوانی‌و نەمانوێرا رێـوڕەسمی ئـایینی بـەجێ بێـنین، هەمیـشە لـە ژێـر زەبـرو

زەنگی ئەواندا بووین، کەس نەبوو لەسەرمان بە جەواب بێ، دەستی ستەمکارمان لێ دوور بخاتەوە، یارمەتیمان بدا!!

ئیتر فریشتەکان کە ئەم عوزرو پاساوەی ئەوانیان بەلاوە بێ بنج‌و بنەوانە زیاتر سەرزەنشتیان دەکەن ﴿قَالُوَاْ: أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا﴾ پێیان دەڵێن: ئایا زەوی خودا پان‌و پۆڕ نەبوو؟ ڕێگای کۆچ کردن‌و هەڵهاتننتان نەبوو؟! نەتاندەتوانی ئەو شوێنە بەجێ بێڵن‌و کۆچ بکەن؟! کەوا بوو هۆی راستەقینە کە ئێوە کۆچتان نەکردووە، بەو زەلیلی‌و ژێر دەستەیی‌و ماف پێشێل کراویە مانەوە، بێ دەسەلاتیتان نەبوو بەڵکوو خۆشەویستی ماڵ‌و سامان‌و خۆپەرستی‌و بەرژەوەندی تایبەتیتان ئێوەی لە ولاتی کوفردا هێشتبووەوە، ئەگینا دەتانتوانی کۆچ بکەن بۆ ولاتێك کە ولاتی ئیسلامە، بەسەر بەرزی‌و ئازادی ژیانی تێدا بەسەر بەرن، خواپەرستی تێدا بکەن؛ دەتانتوانی کۆچ بکەن بۆ مەدینەو پەیوەندی بکەن بە پێغەمبەرەوە ژمارەی موسوڵمانان زۆر بکەن‌و ترس بخەنە دڵی کافرانەوە، کە ئەوەتان نەکردووە خەتابارن، ستەمکارن، ستەمتان لەخۆتان کردووە، ئیتر مەشهەدەکە بە شێوەیەکی کاریگەرو سامناك‌و نائومێدی بۆ ئەو ستەمکارانە کۆتای پێ دێ ﴿فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ ئەو ستەمکارانە، ئەو کەمتەرخەم‌و گێل کەزابانە، شوێنی حەوانەوەیان دۆزەخە، چونکە کۆچ کردن لەسەریان فەرزی عەین بووەو نەیانکردووە، هەڵاتن لە ولاتی کوفر پێویست بووە ئەنجامیان نەداوە ﴿وَسَاءتْ مَصِيرًا﴾ دۆزەخ خراپ شوێنێکە هەرچی تێیدایە بۆیان خراپەو ئەزیەتیان دەدا، ئاگر دەیانسووتێنێ ئاوو هەوای هەمووی دوکەڵ‌و هاڵەو گڕو هەڵقرچانە، دەنگ‌و صەدای هەرناڵەو دادو فیغان‌و هاوار هاوارە!

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە ئینسانی موسوڵمان لە ولاتێکدا بوو نەیدەتوانی ڕێوڕەسمی ئایینی خۆی بە ڕێك‌وپێکی بەجێ بێنێ، یان پێی وابوو: کە لەولاتێکی تر دەتوانێ باشتر خوداپەرستی بکاو زیاتر مەجالی هەیە، ئەوە پێویستە ڕەو بکاو ئەو ولاتەی تێیدایە بەجێی بێڵێ! ئەگەر دەیتوانی کاروباری ئایینی بە ڕێك‌و پێکی لە ولاتی کوفردا ئەنجام بدا وەکوو ئەو موسوڵمانەی ئێستا دانیشتووی ئەمریکاو ئەورووپاو روسیاو ئەو جۆرە ولاتانەن، ئەوە کۆچ کردنیان بۆ ولاتی ئیسلامی

سوننەتە بەمەرجێ لەوێ کاری بانگەوازی ئیسلامیان نەبێ،ئەگەر هەیان بێ مانەوەیان واجبە.

ئەمجار قورئان ئەوانە لەو حوکمە ئیستیثنا دەکا کە ناچارن لەوڵاتی کوفردا بمێننەوە، ئەوانە توانای هەڵاتنو کۆچ کردنیان نیە وەکوو پیرو پەك کەوتەو ژنو منداڵ، ئەوانەی هیچ دەرەتانیان نیەو ناچارن لە وڵاتی کوفر ژیان بەسەر بەرن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ﴾ مەگەر زەبوونو بێ دەرەتانو پەك کەوتەکان نەبێ لە پیاوو ژنو منداڵ کە ﴿لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً﴾ توانای دەرباز بوونیان نیە، ناتوانن کۆچ بکەن، ﴿وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً﴾ شارەزا نین، لە رێگا ترسی تێدا چوونو بە هیلاك چوونیان هەیە، ئەوانە عوزریان هەیە.

چونکە بێ تواناو بێ دەرەتانن ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا – البقرة/٢٨٦﴾، خودا بۆ هیچ کەسێك جگە لە توانای خۆی داوای ئەنجام دانی کاری لێ ناکا.

﴿فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ﴾ ئەوانە هومێد هەیە کە خودا لێیان خۆش بێو لە تاوانی کۆچ نەکردن عەفوویان بکا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کۆچ کردن لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام کارێکی چەسپاوو جەخت لەسەر کراو بووە. تەنانەت ئەوانەی کە عوزری کۆچ نەکردنیشیان هەیە ئەگەر کۆچ نەکەن لێخۆش بوون لێیان لە نێوان خۆفو رەجا دایە!!؟

﴿وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ پەروەردگار هەمیشە خاوەنی عەفوی زۆرو بێ سنوورە لێخۆشبوو لێبووردووە، لەو تاوانو سەرپێچییانەی کە عوزرو بەهانەیان هەیە، گوناهەکانیان دادەپۆشێو خاوەنەکانان ریسوا ناکا!

ئەمجار پەروەردگار بێ دەسەڵاتو پەك کەوتەکان هەڵدەنێ کە گوڕ بدەنە خۆیانو هەوڵی کۆچ کردن بدەنو خۆیانی لێ تاقی بکەنەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ کەسێك کۆچ بکا لە پێناو سەرخستنی ئایینی خواداو مەبەستی رەزامەندی خودا بێ، پابەندی بەرنامەو مەنهەجی خودا بێ، خەرێکی ئەنجامدانی ئەرکە ئایینییەکان بێ وەکوو پێویستە ئەمە ﴿يَجِدْ فِي الأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا﴾ شوێنی کۆچ کردنی باشی دەست دەکەوێ، پەکی ناکەوێ، زەوی خودا

فراوان‌و پان‌و پۆڕە جێگای حەوانەوەی وەهای دەست دەکەوێ کوێرایی دوژمنانی دابێ، خەفەتی پێ بخۆن ﴿وَسَعَةً﴾ وێڕای ڕزگاری‌و ئازادی‌و سەرفرازی شوێنی پڕ خێرو بەرەکەتی دەستگیر دەبێ، دوور دەبێ لەو شتانەی کە ئازاری دەدەن تووشی خێرو خۆشی دەبێ!

ئەمە وادەو بەڵێنی خودایە بۆ کۆچ کەران کە ڕێگای ژیانیان بۆ ئاسان دەکا، دوژمنانیان خەفەتبارو ناڕەحەت دەکا، لە ئاکامیشا بەسەر دوژمندا سەرکەوتوویان دەکا!

ئەمجار یەزدانی مەزن وادەو بەڵێنی پاداش دەدا بەو کەسانەی لە پێناو وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودادا ماڵ‌و زێدی خۆیان بە جێ دێڵن کۆچ دەکەن بۆ وڵاتی ئیسلام، لە ڕێگا مردن یەخەیان پێ دەگرێ‌و پێش ئەوەی بگەنە جێگای مەبەست‌و مەدینەی (منەوەرە) دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّـهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ﴾ کەسێك لەجێگاو شوێنی خۆی دەربچێ‌و کۆچ بکا ماڵ‌و منداڵ‌و کەس‌و کارو زێدی بەجێ بێڵێ! پێش ئەوەی بگاتە مەدینەی (منەوەرە) یان وڵاتی ئیسلام — بمرێ ئەوە ﴿فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّـهِ﴾ خودا پاداشی باشی بۆ ئەو لەسەر خۆی پێویست کردووە، خودا بۆخۆی دەزانێ چۆن پاداشی دەداتەوە، تەنانەت ئەگەر هەر لە دەرگا چووە دەرێ‌و مردو تووشی هیچ دەردی سەری‌و گێرەو کێشەش نەبێ! چونکە نیەتی ڕاست‌و نیازی پاك بەسە بۆ دەست کەوتنی ئەو پاداشە گەورەیە کە خوا لەسەر خۆی بۆ ئەوی پێویست کردووە، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) لە حەدیسێکدا ئەم مانایە جەخت دەکاتەوەو دەیچەسپێنێ دەفەرموێ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ ينكحها فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ» تاج سەرەتای بەرگی/١ یەکەم لاپەڕە/٦٥ زنجیرە/١١ ژمارە/١.

تێبینی ئەوە دەکرێ پەروەردگار بۆ کۆچکەران وادەو بەڵێنی لێخۆشبوونی بەجەخت لەسەر کراوی داوە، بەڵام بۆ ئەوانەی لەبەر زەعیفی‌و بێ دەرەتانی کۆچ ناکەن‌و عوزریان هەیە، لێخۆش بوونەکەی لەنێوان خۆف‌و ڕەجادا هێشتەوەو

فەرمووی: ﴿فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ﴾ ئەوانە لەوانەیە خودا لێیان خۆش ببێو لە تاوانی پێشوویان پاکیان بکاتەوە! لەسەرەتای پەیدابوونی ئیسلامدا هۆی کۆچ کردن زۆر بوو لەوانە:

١- بۆ ئەوەی موسوڵمانان بتوانن ڕێو ڕەسمی ئایین بەسەفرازیو ئازادی ئەنجام بدەن.

٢- بۆ فێربوونی زانستو زانیاری کاروباری ئایینیو تێگەیشتنی ئەحکامە شەرعییەکان.

٣- خۆ ئامادە کردنو ڕێ خۆش کردن بۆ دروستکردنی حکومەتی ئیسلامیو دابین کردنی هۆکارەکان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایین بە هەموو کونو قوژبنی جیهانداو بەرگری کردن لە بیروباوەڕی ئیسلامی:

ئەم هۆکارانە هۆیەکی سەرەکی کۆچ کردنی موسوڵمانان بوون بۆ مەدینە هەتا مەککە رزگار کراو مرۆڤەکان کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمان بوونو ئیسلام گەشەی سەندو بڵاوبووەوە دورگەی عەرەبی لە بتپەرستی پاك کرایەوە، ئیتر لەوەدوا کۆچ کردن بۆ مەدینە پێویست نەما، پیرانی فەرمووده (موسلیمو بوخاری) لە ئیبنو عەبباسەوە حەدیسێك دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا» (لە پاش ئازاد کردنی مەککە کۆچ کردن لە خاکی کوفرەوە بۆ خاکی ئیسلام نەما، بەڵام خەباتگێڕانو نیاز پاکی هەتا هەتایە هەر دەمێنن، هەرکاتێکیش داوا کران بۆ خەباتو غەزا بڕۆن) ئەوەش تێبینی دەکرێ هەرکاتێ لە هەر ڕۆژگارو کاتو شوێنێکدا داخوازی کۆچ کردن پەیدا بوو؛ یەکێ یان زیاتر لەو هۆیانەی سەرەوە هەبوون کۆچ کردن واجبە.

ئیبنولعەرەبی لە ئەحکامولقورئاندا دەفەرموێ: جۆرەکانی کۆچ کردن شەشن:

یەکەم: کۆچ کردن لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام، ئەم جۆرە کۆچ کردنە لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) تا رزگار کردنی مەککە واجب بوو دوایی کە ئیسلام گەشەی سەندو بڵاوبووەوە پێویستی بە کۆچ کردن نەما. بەڵام هەرکاتێ لەهەر شوێنێك هۆکارەکانی هاتنە دی هەتا ڕۆژی قیامەت کۆچ کردن واجبە.

دووەم: کۆچ کردن لە ولاتێکەوە کە بیدعەتی تێدا بالآ دەست بێ؛ ئیبنولقاسم دەڵێ: لە ئیمام مالیکم بیستووە دەیفەرموو: دروست نیە بۆ کەس لە شوێنێك بمێنێتەوە کە تێیدا جنێو بە سەلەف بدرێ! ئیبنولعەرەبی دەڵێ: ئەوە راستە، چونکە لە هەر شوێنێك مونکەرو بیدعەتی تێدا بلاو بوو نەتوانی بیگۆڕی پێویستە ئەو شوێنە بەجێ بێڵی.

سێیەم: کۆچ کردن لە ولاتێك کە زۆربەی حەرام بێ چونکە هەوڵ دان بۆ وەدەست هێنانی حەلآڵ پێویستی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە.

چوارەم: کۆچ کردن لە شوێنێك کە بۆ تەندروستی خراپ بێ ئاوو هەوای پێی نەکەوێ.

پێنجەم: هەلاتن لە ولاتێك نەخۆشی تێدا بێ جگە لە نەخۆشی تاعوون – چونکە لە هەر جێگایەك تاعوون بلآو بووەوە نابێ دانیشتوانی ئەو شوێنە کۆچ بکەن، نابێ کەسی تریش کۆچ بۆ ئەو شوێنە بکا.

شەشەم: کۆچ لە شوێنێك کە ترسی لە ناو چوونی ماڵو سامانتی تێدا بێ چونکە پاراستنی ماڵو سامانی موسوڵمان وەکوو خوێنی پێویستە بیپارێزێ. ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ پەروەردگار هەمیشە لێخۆشبوو بە بەزەییە بۆ ئەو کۆچکارانەی ولآتی خۆیان بەجێ دێڵن.

## کورت کردنەوەی نوێژ لەسەفەرداو نوێژی ترس

﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟

فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ ﴾.

ئاشكرایە، تا ئێستا ئایەتەكان دەربارەی جیهادو چوونە غەزا دەدوێن جیهادیش خۆی لە خۆیدا پێویستی بە سەفەرو چوونە دەر لەماڵ هەیە، ئیتر یەزدانی مەزن لێرە بەولاوە ئەوەمان بۆ روون دەكاتەوە كە سەفەر نابێتە عوزری لەسەر لاچوونی نوێژ، هەروەها جیهادو شەڕ كردنیش دژی كافران ئەركی نوێژ كردن لەسەر شانی ئادەمیزاد لانابا!

جا وەكوو ئیبنو جەریری طەبەری لە ئیمامی عەلییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: چەند كەسێك لە هۆزی بەنی نەجار عەرزی پێغەمبەریان كرد وتیان: قوربان! سەفەر دەكەین‌و لە ماڵ‌و حاڵی خۆمان دوور دەكەوینەوە، چۆن نوێژەكانمان بكەین!؟ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ: كە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ

ﮋفِي الأَرْضِﮊ کاتێ لە ناو وڵاتا کۆچو کۆچبارتان دەکردو دەچوون بۆ سەفەر ﮋفَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِﮊ گوناهتان ناگاتێو چ خراپیەکی تێدا نیە: کە لە نوێژە چوار رکاتییەکان کورت بکەنەوە، لە جیاتی چوار رکات دوو رکات بکەن! ﮋإِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْﮊ ئەی پێغەمبەری خودا! گەر ترسی ئەوەتان هەبوو کافرەکان تووشی فیتنەتان بکەن: بتان گرن، یان بتانکوژن، یان هەر شتێکی کە دوژمن لەگەڵ دوژمنی دەکا، یان ترستان لە چەتەو رێگر هەبوو، بەم شێوە دوژمن، خەریك بوونتان بە نوێژەوە بە هەل بزانێ بۆ ئەوەی بەسەرتاندا زاڵ ببن، ئەوە ئەو هەلەیان بۆ مەڕەخسێنن، بەڵکوو نوێژەکانتان کورت بکەنەوە بە جۆرێك کە ماوەی نوێژ کردنەکانتان ئەوەندە نەبێ دوژمن بتوانێ تێیدا لێتان نزێك بێتەوەو پەلامارتان بدا!

دەگونجێ مانای ئایەتەکە بەم جۆرە بێ، ئەگەر ترسان لە کاتی رکوعو سوژدەدا کافرەکان فرصەتتان لێ ببینن، چونکە لەم دوو حاڵەتەدا ئێوە ئاگاتان لە جەمو جوڵی ئەوان نیە، ئەوا نوێژەکانتان بە راوەستانەوە یان بە سواری، چۆنتان بۆ کرا تەنانەت بەبێ رکوعو سوژدە ئەنجامیان بدەن، ئەگەر بۆتان گونجا لە کاتی رکوعو سوژدەدا جۆرە ئیماءو سەر نەوی کردنێك ئەنجام بدەن، ئەگەر نەشتان توانی قەیدی نیە! ئەمجار خودای گەورە جارێکی تر لە پیلانی دوژمنان دەمانترسێنێو دەفەرموێ: ﮋإِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًاﮊ چاك بزانن کە کافرەکان دوژمنی سەرسەختو راستەقینەی ئێوەن، هەرکاتێ هەلیان بۆ هەڵبکەوێ دەیقۆزنەوەو دەستتان لێ دەوەشێنن، پەلامارتان دەدەنو بەسەرتاندا زاڵ دەبن کەوابوو: هەلیان بۆ مەڕەخسێننو مەهێڵن بە مەبەستی پیسی خۆیان بگەن!

مامۆستا سەیید قوطب لێرەدا دەفەرموێ: (ئەو مانایەی کە ئێمە لە راڤە کردنی ئەم ئایەتەدا پەسەندی دەکەین ئەو مانایەیە کە ئیمامی جەصاص لە ئەحکامولقورئاندا پەسەندی کردووە؛ ئەویش ئەوەیە کە لێرەدا مەبەست بە کورت کردنەوەی کورت کردنەوەی نوێژی چوار رکاتی نیە؛ چونکە ئەمە بۆ هەموو کەسێك کە لە سەفەردا بێ دروستە، بەبێ ئەوەی ترسی پەلامارو شاڵاوی کافرانی هەبێ، بەڵکوو بۆ کەسێك لە سەفەردا بێ واباشە نوێژە چوار رکاتییەکان کورت

بکاتەوە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە هەموو سەفەرەکانیدا نوێژە چوارینەکانی کورت دەکردەوە تەنانەت بەهۆی ئەم کردارەی پێغەمبەرەوە لەسەفەردا، لەلای هەندێ زانای گەورە رای پەسەند ئەوەیە کە لەسەفەردا، لەلای هەندێ زانای گەورە بە تەواوی بکرێن! واتە لەسەر رای ئەوان کورت کردنەوە عەزیمەیە نەك روخصەت، کەوابوو ئەم روخصەتە تازەیەی کە ئەم ئایەتە دەیگەیەنێ لە کاتی ترسی پەلامارو شاڵاوی کافراندا مانایەکی تازەیە نەك کورت کردنەوە کە بۆ هەموو سەفەرییەك هەیە!

بەڵکوو کورت کردنەوەی شێوەو جۆری خودی نوێژەکەیە، وەکوو ئەوەی بە پێوە نوێژەکە بکەن، بەبێ رکوعو سوژدەو دانیشتن بۆ خوێندنی تەحیات، واتە بە راوەستانەوە، یان بە رۆیشتنەوە، یان بە سواری بەبێ چەمینەوە بۆ رکوعو سەر خستنە سەر زەوی بۆ سوژدەو دانیشتن بۆ تەحیات نوێژەکەیان دەکەن لە جیاتی چوونە رکوعو چوونە سوژدە تەنها بە هیما سەر نەوی کردنێك دەکەنو بەس!

ئابەم جۆرە تەنانەت لە کاتی شەڕو تێك ڕژانو ترسو بیمو پەلاماردانو بەرگریشدا نابێ موسوڵمان واز لەو پەیوەندیە پتەوە بێنێ کە لە نوێژدا ئەنجام دەدرێ، نابێ ئەو چەکە گیانیو مەعنەوییە کاریگەرە سەرەکییە پاشگوێ بخا، لە هەمان کاتیشدا هەل بۆ دوژمن نەرەخسێنێ پەلاماری بدا!

هەر بەبۆنەی باسی چۆنیەتی نوێژ کردنی کەسێکی سەفەری کە بترسێ لە شاڵاوی دوژمنو پەلاماری کافران، حوکمی نوێژی ترسو شێوەی ئەنجام دانی لە گۆڕەپانی شەڕگەدا روون دەکاتەوە، وێڕای روون کردنەوەی حوکمە شەرعییەکان، زەمینەی دەروونیو پەروەردەیی بۆ خۆش دەکاو لەمەساتی دەروونیو پەروەردەیی لێ کۆ دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ﴾ ئەگەر تۆ ئەی محمد! یان ئەو کەسەی جێگری تۆیە لە پێشەوایانی موسوڵمان، لە ناو کۆمەڵێك موسوڵماندا بوویتو لە بەرامبەر سوپای کوفردا وەستا بوون، ویستت نوێژیان پێ بکەی، کاتی نوێژ هاتبوو، بانگو قامەت درا بوو، سوپای موسوڵمانان بکە بە دوو تاقم ﴿فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ﴾ با کۆمەڵێکیان لەگەڵ تۆ رکاتی یەکەم بە جەماعەت بکەن ﴿وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ﴾ با چەكو پێویستیاتی شەڕو بەرگری

خۆیان پێ بێ! بۆ ئەوەی دوای تەواو بوونی نوێـژ یەکسەر بـچنە بەرامبـەر دوژمـن کە لەوانەیە پەلاماریان بدا!

﴿فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ﴾ ئەگەر ئەم تاقمـە (تـاقمی یەکـەم) چـوونە سوژدە با تـاقمی دووەم لـە پاشـەوە پارێزگارییـان بکـەن، چـونکە نوێژکـەری نوێـژی ترس بـە زۆری لـە کـاتی چـوونە سـوژدەدا پێویـستی بـە حـەرەس و پـارێزەر هەیـە، چونکە لـەو کاتـەدا دوژمنـی بەرامبـەر نابینـێ!! ئـەمجار کـە هەڵـسانەوە بـۆ رکـاتی دووەم ئەتۆ لەسەرەتای رکاتەکەوە رابووەستە با دەستەی یەکەم بـۆ خۆیـان رکـاتی دووەم و تـەحیات ئـەنجام بـدەن و سـەلام بدەنـەوە بـە چەکەوە بـچن بـۆ بەرامبـەر دوژمن و ئامادەی بەرگری بن! ﴿وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّواْ﴾ با دەستەکەی تـر کـە نوێژیان نەکردووە بێن لە پاش تۆوە نوێژ دابەستن بۆ جەماعـەت ﴿فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ﴾ بـا رکاتێـك لەگـەڵ تـۆدا بکـەن کـە بـۆ تـۆ دەبێتـە رکـاتی دووەم و بـۆ ئـەوان رکـاتی یەکەمـە، ئـەمجار تـۆ لـە تەحیاتـدا چاوەڕوانی ئـەوان بکـە بـا بۆخۆیـان هەڵـسنەوە رکـاتی دووەم تـەواو بکـەن و ئـەمجار تـەحیات لەگـەڵ تـۆ بخـوێنن و سـەلامیان پـێ بدەرەوە، بەم جۆرە دەستەی یەکەم شەرەفی (الله أكبر)ی نوێژ دابەستنیان پـێ بـڕا، دەستەی دووەمیش شەرەفی سەلام دانەوە لەگەڵ تۆیان پـێ بـڕا، ﴿وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ بـا ئـەم دەسـتەی دووەمـیش وریـابن و حـەزەری خۆیـان وەربگـرن و چەکەکانیان پێ بن و لە کاتی نوێژ کردندا دایان نەنێن!

تێبینی دەکرێ کە بۆ دەستەی دووەم وێڕای ئەوە کە فـەرمانی پـێ کـردن بـەوە کە لەکاتی نوێژەکەشدا چەکەکانیان پێ بێ، فەرمانی ئەوەشی پـێ کـردن کـە وریـاو ئاگاداریش بن دوژمن پەلاماریان نەدا!! حیکمەتەکەشی وەکوو راڤەکـەرانی قورئـان نووسیویانە – ئەوەیە دوژمن لە وانەیە بۆ تاقمی یەکـەم کـە نوێـژ دەکـەن وابزانـێ راوەستانەکەیان بۆ بەرامبەری و بەرگرییە، نەزانن بۆ نوێژە، جا کە دەچـنە سـوژدە ئەو کاتە دەزانن کە خەریکی نوێژن دەشزانن کە تاقمی دووەمیش نوێژ دەکـەن جـا کـە دەسـتەی دووەم دێنـە پێـشەوە بـۆ نوێـژکردن و ریـزدەبن لەسـەرەتاوە دوژمـن دەزانێ کە ریـز بوونەکـەیان بـۆ نوێـژە، بۆیـە زیـاتر وێ دەچـێ کـە لـەکاتی چـوونە سوژدەدا دوژمن پەلاماریان بداو غافڵ گیریان بکا!

پەروەردگار بۆخۆی بایس و هۆی فەرمان بە وریایی و هەڵگرتنی چەك لەكاتی نوێژدا دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ﴾ دوژمنی كافرو سەرسەختتان ئاواتەخوازی ئەوەیە: كە ئێوە بە هۆی نوێژەوە ئاگاتان لەچەك و پێویستییەكانی جەنگ نەمێنێ و غافڵ بن ﴿فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً﴾ هەڵمەتتان بۆ بێنن و غافڵ گیری پەلامارتان بدەن و هەڵكوتنە سەرتان و سەربكێشێ بۆ كوشتن و برینی خۆتان و تاڵان و بڕۆكردنی شت و مەكەكانتان. پەروەردگار دەیەوێ ئێوە سەركەوتوو سەرفراز بن، بۆیە فەرمانتان پێ دەكا بە وریایی و ئاگاداری.

ئەمجار پەروەردگار ئەو عوزرو بەهانەتان بۆ دیاری دەكا كە دەشێ لەگەڵ بوونیاندا چەك دابندرێ و هەڵنەگیرێ، دەفەرموێ: ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَى أَن تَضَعُواْ أَسْلِحَتَكُمْ﴾ گوناهتان لەسەر نیە ئەگەر هەڵگرتنی چەك تووشی نارەحەتییەكی زۆری دەكردن، یان لەش و لارتان بە باران تەڕ بووبوو، یان نەخۆش بوون، تاوانبار نابن ئەگەر چەكەكانتان دابنێن و خۆتان وشك بكەنەوە، یان تیماری برینتان بكەن، یان خۆتان بكەنەوە بۆ ئەوەی پزیشك فەحصتان بكاو ئەم جۆرە عوززانە! بەڵام وریاو ئاگادار بن دوژمن غافڵ گیرتان نەكاو فرسەتتان لێ نەهێنێ، هەموو كاتێ ترسی پەلاماری دوژمنتان هەبێ! كەمتەرخەم مەبن! ﴿وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾ خەزەر وەربگرن و وریاو ئاگادار بن ﴿إِنَّ اللّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ دڵنیا بن پەروەردگار سزای بە ئێش و ریسواكەری بۆ كافرەكان ئامادە كردووە، لە جیهاندا زاڵبوونی موسوڵمانان بەسەریانداو ژێر دەستە كردنیان كە ژێردەستەیی و تێشكان شتێكی زۆر ناخۆشە[1]، لە قیامەتیشدا سزای هەمیشەیی و نەبڕاوە لە ناو دۆزەخدا... ئەمە هەڕەشەیە بۆ كافرەكان بەوە كە خودا ریسوایان دەكاو دەیانپرووێنێ و هیچ كاتێ یارمەتیان ناداو زاڵیان ناكا، ئەوەش كە فەرمان بە موسوڵمان كراوە كە وریا بن و حەزەریان هەبێ لە كافرەكان ئەوە

[1] - شاعیر دەڵێ: وای لە رۆژی رەش، ئای لە بێ كەسی — ئای لە كەساسی كاتی ژێردەسی.

پەیڕەو کردنی سوننەتی خودایە، لەوەدا کە بۆ هەر شتێك هۆکارێکی داناوە، بۆ ئەوەی تەمبەڵی نەکەن‌و هۆکارەکان پاشگوێ نەخەن!

﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَاذْكُرُواْ اللّهَ﴾ هەرکاتێ نوێژی ترستان بەو شێوەی باسکرا ئەنجام داو سەلامتان دایەوە، ئەمجار لەبەر خۆتانەوەو لە دڵی خۆتاندا یادی خودا بکەن بە هەموو شێوەیەك ﴿قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِكُمْ﴾ بە ڕاوەستانەوە بە دانیشتنەوە بە ڕاکشانەوە، لە هەموو کات‌و شوێنێکدا یادی نیعمەت‌و بەخشش‌و بەڵێن‌و یارمەتی دانتان لە دونیاداو دەستکەوتی پاداشی قیامەت‌و بە مراد گەیشتنتان بکەن، بە زوبان (الله أكبر)و پاڕانەوە (أستغفر الله) بکەن، یاد کردنەوەی خودا دڵ بە هێز دەکا، ورە بەرز دەکاتەوە، بە خۆڕاگری‌و ئارام گرتن سەرکەوتن بەسەر دوژمندا دەستەبەر دەبێ ﴿فَإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ﴾ ئەگەر دڵنیا بوون‌و ترستان نەما بەم جۆرە شەڕ کۆتای هات، گەڕانەوە بۆ زێدو نیشتمانی خۆتان ئەوە ﴿فَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ﴾ نوێژەکانتان بە تەواوی‌و بە ئاسایی بکەن، روکن‌و شەرتەکانیان بە ڕێك‌و پێکی ئەنجام بدەن، چونکە نوێژ، روکنێکی گرنگی ئایینە، نابێ هیچ کاتێ کەمتەخەمی تێدا بکرێ! تەنانەت لە کاتی ترس‌و تەنگانەی تێك ڕژان‌و بەرامبەری کردنی دوژمنیشدا نابێ پاشگوێ بخرێ.

## ئەو حوکمانەی لەم ئایەتانە وەردەگیرێن بە پوختی ئەمانەن:

ئایەتەکان حوکمی کورت کردنەوەی نوێژی چوار رکاتی لەسەفەرداو چۆنیەتی ئەنجام دانی نوێژی ترس روون دەکەنەوە!

١- زانایانی ئیسلامی رایەکی جیاجیایان دەربارەی کورت کردنەوەی نوێژ هەیە.

کۆمەڵێك لە فوقەها، حەنەفییەکانیش لەگەڵدان، دەڵێن: کورت کردنەوەی نوێژ لە سەفەردا فەرزە، چونکە عائیشە (خوای لێ رازی بێت) دەڵێ: «فُرِضَتِ الصَّلاَةُ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ» قورطوبی دەڵێ: ئەم حەدیثە نابێتە بەڵگە چونکە عائیشە بۆخۆی بە پێچەوانەی مانای ئەم حەدیثە کاری کردووە.

چەسپاوە کە ئەو لە سەفەردا نوێژی بە کورتکراوەیی نەکردووە، ئەمەش حەدیثەکە لە بەڵگایەتی دێنێتە خوارێ، زیادلەوە فوقەها کۆکن لەسەرئەوە کە

ئەگەر ڕێبوار لەدوا كەسێكی نیشتەجێوە نوێـژی كـرد دەبێ نوێژەكەی بـە تـەواوی بكا.

ب- كۆمـەڵێكی تـر هـەن كـە (عومـەری كـوڕی خـەتتابو ئیبنـو عـەبباسو جوبەیری كوڕی موطعیم)ن دەڵێن: نوێـژی چوارینە لـە ماڵەوە چوار ركات فـەرز كراوە لەسەفەردا دوو ركات، لە نوێژی ترسدا یەك ركات!

ج- ئەوەی كە باوە لەرێباز (مذهب)ی مالیكیدا ئەوەیە: كـورت كردنـەوەی نوێـژ سوننەتە. شافیعیو ئەحمەد دەڵێن: كـورت كردنـەوەی روخـصەتە، ڕێبـوار دەتوانـێ كورتیـان بكاتـەوە یـان بـە تـەواوی بیـان كـا. ئایەتەكـەش ﴿فَلَـيْسَ عَلَـيْكُمْ جُنَـاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ﴾ ئەوە دەگەیەنێ! دەی باشە كامیان باشترە؟ ئەوەی لە مەزهەبی مالیكدا بە ڕاست زانـراوە ئەوەیـە: ڕێبـوار ئـازادە لـەوەی نوێـژ كـورت بكاتـەوە یـان تەواو بیان كا! بەلای حەنبەلییەكانـەوە كـورت كردنـەوەی باشـترە لـە تـەواو كـردن، چونكە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وای كردووە.

د- ئەو سەفەرەی كە كورت كردنەوەی تێدا ڕەوایە سەفەری درێژە، كـە زۆربـەی جار وا دەبێ ناڕەحەتی تێدا دەبێ، سەفەری درێژ بەلای حەنەفییەكانەوە سـێ ڕۆژە ڕێیە كە نزیكەی نەوەدو شەش كیلۆمەتر دەبێ، بـەلای جـەماوەری زانایـانی تـرەوە دەبێ درێژی سەفەرەكە چلو هەشت میلی هاشمی بـێ، یـان دوو ڕۆژە ڕێ بـێ بـەبێ شەوەكان یان دوو شەوە ڕێ بێ بـەبێ ڕۆژەكانیـان، یـان شـانزە فرسـەخ كـە نزیكـەی هەشتاو نۆ كیلۆمەترە.

هـ- یەكگرتنی زانایانی ئیسلام هەیە لەسەر ئەوە كە كـورت كردنـەوەی دروسـتە لە ڕێگای چوون بۆ غەزاو بۆ حەجو عەمرەو بەسەر كردنەوەی خزمو كەسو كارو ئەم جۆرە شتانە، بەڵام لە شتی تردا ڕای جیایان تێدا پەیدا بووە...!

جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن كە كورت كردنەوەی نوێژ لە سەفەری حەڵاڵدا ڕەوایـە، وەكـوو سـەفەری بازرگـانیو حـەجو جیهـادو ئـەو جـۆرە شـتانە بـەڵام لـە سەفەری گوناهدا وەكوو چوون بۆ چەتەییو دزی كورت كردنەوەی دروست نیە.

و- ئـەبو حەنیفـەو ئـەوزاعی دەڵێن: لـە هـەموو سـەفەرێكدا كـورت كردنـەوەی نوێژ دەبێ، تەنانەت ئەگەر كابرا بە سەفەرەكەی تاوانباریش ببـێ هـەر بـۆی هەیـە

نوێژەکە کورت بکاتەوە. ئەمجار زانایان رای جیاجیایان تێدا پەیدا بووە لەوەدا ئاخۆ رێبوار کەی دەست دەکا بە کورت کردنەوەی؟

جەماوەری زانایان رایان وایە: کە رێبوار تا لە ئاوەدانیو ئەو شوێنەی کە سەفەری لێوە دەکا، تێ نەپەڕێو لە سنوورەکەی دەرنەچێ، بۆی نیە نوێژ کورت بکاتەوە. لە حاریثی کوڕی رەبیعەوە دەگێڕنەوە: جارێك ویستی سەفەر بکا هەر لە ماڵی خۆیاندا دوو رکات نوێژی بە هاوەڵەکانی کرد! واتە: نوێژی کورت کردەوە، هاوەڵەکانیشی ئەسوەدی کوڕی زەیدو چەند کەسێك لە هاوەڵانی ئیبنو مەسعوود بوون! عەطای کوڕی ئەبو رەباحو سولەیمانی کوڕی موساش رایان وایە: کە هەر لە ماڵەوە دەتوانێ دەست بە کورت کردنەوەی بکا.

ئەو کاتەی مانای ئایەتی ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ﴾ دەبێ بەم جۆرە واتای بکرێ: (وإذا عزمتم على الضرب في الأرض = کە بڕیاری سەفەر کردنتان داو ویستتان بڕۆن).

جا ئەگەر یەکێك سەفەری کردو لە شوێنێك نیەتی مانەوەی هێنا، ئەوا ئیمامی مالیكو شافیعیو ئەحمەد دەڵێن: ئەگەر نیەتی مانەوەی چوار رۆژی هێنا لەو شوێنە، دەبێ نوێژەکانی بە تەواوی بکا، ئەحمەد رایەکی تری هەیە، دەڵێ: ئەگەر مانەوەکەی ماوەی بیستو یەك نوێژی فەرزی تێدا دەکرا واتە: چوار رۆژو چەند سەعاتێك، ئەوا نوێژەکانی کورت دەکاتەوە ئەگەر زیاتر بوو تەواویان دەکا.

حەنەفییەکان دەڵێن: ئەگەر نیەتی مانەوەی پانزە رۆژی هەبوو تەواویان دەکا، ئەگەر کەمتر بوو کورتیان دەکاتەوە. سەفەریی کە کەوتە سەفەرەوە سەفەرەکەی چەند ساڵێکیش بخایەنێ تا لە سەفەردا بێو نەگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی نوێژەکانی کورت دەکاتەوە، مەگەر شوێنێك بکاتە زێدی خۆیو تێیدا بمێنێتەوە.

نوێژی خەوف کە لە قورئاندا باس کراوەو بەو شێوە ئایەتەکە کردنەکەی دیاری کردووە، کاتێك وا دەکرێ کە دوژمن لە غەیری لای ڕووی قیبلەوە بێ، لە غەزای زاتوریقاعدا وارێکەوتبوو، دوژمن لە غەیری لای قیبلەوە بوو، بەلام لە عوسفانداو لە چەند غەزایەکی تردا، کە ئیبنو عومەر شێوەی نوێژ کردنەکەی

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)و هاوەڵانی دەگێڕێتەوە وا رێکەوتبوو کە دوژمن لە رووی بەری قیبلەوە بوو.

لەو فەرموودانەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) ریوایەت کراوە دەربارەی چۆنیەتی کردنی نوێژی ترس چەند جیاوازییەك هەیە، زانایانی ئیسلامیش بەهۆی جیاوازی ریوایەتەکان رای جیاجیایان بۆ پەیدا بووە.

ئیبنولقەصار دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە دە شوێن نوێژی ترسی لەگەڵ هاوەڵەکانی کردووە.

ئیبنولعەرەبی دەڵێ: ریوایەت کراوە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بیستو چوارجار نوێژی ترسی ئەنجام داوە.

ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: ئەوەی من شکی دەبەم لە شێوەی کردنی نوێژی ترسو گومانم تێدا نیە. ئەو فەرموودەیەیە: کە ثابیت لە ئەنەسەوە گێڕاویەتەوە لەم بارەیەوە، بەهەر حاڵ هەر موسوڵمانێ نوێژی ترس بکا بەپێی یەکێ لەو ریوایەتانەی تر کەوان لە کتێبەکانی حەدیثدا نینشائەڵڵا نوێژەکەی وەرگیراوو پەسەندە لای خودا.

١- ئەبو حەنیفەو ئەحمەد (رەحمەتی خودایان لێ بێ) دەڵێن: بەم شێوە نوێژی ترس دەکرێ: پێشەوا جەنگاوەران بکا بە دوو تاقم؛ تاقمێك لەگەڵ پێش نووێژ نوێژ دادەبەستنو تاقمێك لە بەرامبەر دوژمندا رادەوەستن، پێش نوێژ رکاتێكو دوو سوژدە بە تاقمی یەکەم ئەنجام دەداو ئەمجار دەچن بۆ بەرامبەری دوژمن. تاقمی دووەم دێن نوێژ دادەبەستن پێش نوێژ بەوانیش رکاتێكو دوو سوژدە ئەنجام دەدا، ئەو بۆخۆی سەلام دەداتەوە بەڵام نوێژکەرەکان سەلام نادەنەوە بەڵکوو دەگەڕێنەوە بۆ بەرامبەر دوژمن، ئەمجار تاقمی یەکەم دێنەوە بۆ شوێن نوێژی خۆیان، یان هەر لە شوێنی خۆیان بەبێ خوێندنی فاتیحە رکاتەکەیان دەکەنو تەحیات دەخوێننو سەلام دەدەنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ بەرامبەر دوژمن بۆ پارێزگاری، ئەمجار تاقمی دووەم دێنەوە رکاتی دووەمیان بە خوێندنی فاتیحەوە تەواو دەکەن بۆیەش فاتیحە دەخوێنن چونکە ئەمان لەگەڵ پێش نوێژدا لەسەرتاوە نوێژیان دانەبەستبووە، واتە: حوکمی مەسبوقیان هەیە، ئەم شێوە نوێژ

کردنە ئیمامی زوهری لە سالم ئەویش لە باوکییەوە ریوایەتی کردووە، هەر هەمان شێوە لە نافیع لە ئیبنو عومەرو لە حەدیسێکی (متفق علە)دا لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت کراوە.

٢- عەبدولرحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێ: ئەگەر دوژمن لەلای قیبلەوە بوو ئیمام جەنگاوەران دەکاتە دوو تاقم (دوو ریز) ئیمام نوویژ دادەبەستێ ئەوانیش لەگەڵیدا هەموویان نوێژ دادەبەستن، کە پێش نوێژ دەچێتە رکوع هەموویان لەگەڵیدا دەچنە رکوع، کە دەچێتە سوژدەوە ریزی یەکەم لەگەڵیدا دەچنە سوژدە، ریزی دووەم پارێزگاری دەکەن لە نوێژدا بەرامبەر دوژمن دەوەستن، کەریزی یەکەم سوژدەیان تەواو کردریزی دووەم دەچنە شوژدەوە، کە لێبوونەوە لە سوژدە هەڵدەستنەوە، ئیتر ریزی دووەم دێنە پێشەوەو ریزی یەکەم دەچنە دواووە، ئیمام رکاتی دووەم بە ریزی دووەم - کە ئێستا بوونە یەکەم — دەکا واتە ئەمانیش لەگەڵ ئیمام دەچنە سوژدەوە ریزی دووەم پارێزگاریان دەکەن.

ئەگەر دوژمن لە رووی لای قیبلەوە بوو ئیمام جەنگاوەران دەکا بە دوو ریز ریزێك لەگەڵ ئیمام روویان لە قیبلەو ریزێکیان روویان لە دوژمن، ئیمام (الله أکبر)ی نوێژی دابەستن دەکا ئەوانیش هەموویان (الله أکبر) دەکەن.. ئیمام دەچێتە رکوع هەموویان لەگەڵی دەچنە رکوع کە دەچنە سوژدە هەر ریزی یەکەم کە رووی لە قیبلەیە لە پاش ئیمامەوەن لەگەڵیدا دەچنە سوژدە دوو سوژدەی خۆیان ئەنجام دەدەن هەڵدەستنەوەو وەردەچەرخێن‌و روو لە دوژمن دەکەن‌و تاقمی دووەم دێن لە پاش ئیمامەوە بۆخۆیان دوو سوژدە دەبەن ئەمجار لەگەڵ ئیمامدا هەموویان رکاتی دووەم وەکوو رکاتی یەکەم ئەنجام دەدەن تەنها ئەوەندە هەیە ریزەکان گۆڕدراون ئەوانەی لە رکاتی یەکەمدا روویان لە دوژمن بوو ئێستا لە پاش ئیمامەوە روویان لە قیبلەیەو ئەوانەی لە رکاتی یەکەمدا لە پاش ئیمامەوە بوون روویان لە دوژمنە. کە رکاتی دووەم ئیمام دەچێتە سوژدەوە هەر ریزی یەکەم لەگەڵیدان دەچنە سوژدەوە، ریزەکەی تر پارێزگاری دەکەن ئەمجار کە ئەم ریزە سوژدەکانیان ئەنجام دا دەچنەوە بەرامبەر دوژمن‌و ئەوانی تر دێنەوە پێشەوە لەگەڵ ئیمامدا سوژدەکانیان تەواو دەکەن‌و ئەمجار هەموویان سەلام دەدەنەوە!

ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە عەسفان بەم شێوە نوێژی ترسی بە موسوڵمانان کرد! ئەحمەدو موسلیمو ئیبنو ماجە لە حەدیثی جابیرەوە ریوایەتیان کردووە. شافیعیەکانو حەنبەلییەکان ئیعتمادیان لەسەر ئەم حەدیثە کردووە ئەگەر دوژمن لە رووی قیبلە بێ!

ئیمامی مالیك دەڵێ: نوێژی ترس بەم شێوەیە دەکرێ: ئیمام تاقمێك پێش دەخا بەرەو رووی قیبلە، تاقمێکیش لە بەرامبەر دوژمن دادەمەزرێنێ، رکاتێكو دوو سوژدە بەو تاقمەی لەگەڵیدان ئەنجام دەدا، ئەمجار بۆخۆی بە پێوە دەوەستێو کۆمەڵەکەی لەگەڵیدا بوون بۆخۆیان رکاتەکەی تر تەواو دەکەنو تەحیات دەخوێننو سەلام دەدەنەوە، دەچن بۆ شوێنی ئەو تاقمەی کە نوێژیان نەکردووە، لە شوێنی ئەوان لە بەرامبەر دوژمن دادەمەزرێنو تاقمەکەی دێ نوێژ لە پاش ئیمامەوە دادەبەستن ئیمام رکاتێكو دوو سوژدەیان لەگەڵ دەکا. ئەمجار دادەنیشن بۆ تەحیات، تەحیات دەخوێننو ئیمام سەلام دەداتەوەو ئەوانیش هەڵدەستنەوە بۆخۆیان رکاتەکەی تریان تەواو دەکەن.

ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو خاوەنەکانی سونەن جگە لە ئیبنی ماجە وایان ریوایەت کردووە: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە رۆژی (ذات الرقاع)دا بەم شێوەیە نوێژی ترسی بە موسوڵمانان کردووە: ئەم شێوەیە بۆ حاڵەتێکە کە دوژمن لەلای راستی قیبلەوە نەبێ.

جوداوازی نێوان مالیكو زاناکانی دیکە لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە: ئەوان دەڵێن: پێش نوێژ سەلام ناداتەوە هەتا دەستەی دووەم نوێژەکەیان تەواو دەکەن ئەمجار لەگەڵ ئەوان سەلام دەداتەوە.

شەرع زانەکان دەربارەی کردنی نوێژی ترس شێوان (مغرب) راجیاییان هەیە؛ حەنەفیو مالیکیو شافیعییەکان دەڵێن: ئیمام بە دەستەی یەکەم دوو رکات دەکاو بە دەستەی دووەم رکاتێك، ئەمجار مالیکیو شافیعییەکان دەڵێن: پێش نوێژ لە رکاتی سێیەمدا بە پێوە چاوەڕوانی دەکا تا دەستەی دووەم دێنو نوێژەکەیان دادەبەستنو لە گەڵیاندا رکاتی تەواو دەکا، بەلای شافیعییەکانەوە چاوەڕوانی دەکات دەستەی دووەم نوێژەکەیان تەواو دەکەن ئەمجار بەیەکەوە سەلام دەدەنەوە.

ئایـەتی ﴿وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ﴾و ﴿وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ فـەرمان دەكـەن بە موسوڵمانان كە وریابن‌و حەزەریان هەبێ لە دوژمن بۆ ئەوەی دوژمن فرسەتیان لێ نەهێنێ‌و تەماعیان تێ نەكەن!

ئەوجا بابزانین هەڵگرتنی چەك لە نوێژی ترسدا واجبە یان سوننەتە؟ ئـەبو حەنیفە دەڵێ: چەك هەڵگرتن واجب نیە، چونكە ئەگەر واجب بوایـە، دەبوایـە بـێ چـەك نوێـژ دروسـت نەبوایـە، بەرپەرچـی ئـەبو حەنیفـە دراوەتـەوە بـەوە كـە هەڵگرتنەكە لەبەر نوێژەكە نیـە، لەبـەر بەرژەوەنـدی خۆیانـە، بـۆ بـەهێز كردنـی موسوڵمانانە زۆر كردنی سام‌و هەیبەتە لێیان... ئیبنولعەبدول بەڕ دەڵێ: زۆربـەی زانایـان بەلایانـەوە باشـە نوێژكـەری نوێـژ تـرس بـە چەكەوە نوێـژ بكـا، فـەرمانی ئایەتەكە ﴿وَلْيَأْخُذُواْ...﴾ سوننەت دەگەیەنێ!

ئیبنو عەرەبی كـە مـالیكی مەزهەبـەو ئیمـامی شـافیعی‌و ظاهیرییـەكان پێیـان وایە، هەڵگرتنی سیلاح بۆ نوێژ واجیە، چونكە خودا فـەرمانی پـێ كـردووە مـەگەر بۆ هەڵگرتنەكەی عـوزری هـەبێ ﴿إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا﴾ بێگومـان نوێـژ ئـەركی سەرشانی موسوڵمانانە بـە بڕیـاری خـودا لەسـەریان واجب كراوەو كاتی ئەنجام دانی هەمووی نوێژێك دیاری كراوە.

## هەڵنانی موسوڵمانان بۆ جەنگ‌و چاوەڕوانی یەكێ لەو دوو بەهرە

﴿ وَلَا تَهِنُواْ فِي ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِۖ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ ﴾

لـە ئایەتـەكانی پێـشوودا باسـی چـۆنیەتی كردنـی نوێـژی ترسـی كـردو موسوڵمانانی هـەڵنا كـە هەمیـشە وریـاو ئاگـادار بـن ترسـی ئـەوەیان هـەبێ دوژمـن هێرشیان بۆ بەرێ‌و پەلاماریان بدات.

لەم ئایەتەی دوایی دا نەهی ئەوەیان لێ دەکا کە لە شەڕو بەگژاچوونەوەی دوژمنان هەڵسڵەمنەوەو بترسێنو زەبوونی نیشان بدەن، چونکە ئێشو ئازاری شەڕ هەرچەندە هەردوولا تێیدا هاوبەشن بەڵام موسوڵمانان چاوەڕوانی یەکێ لە دوو شتە باشەکان دەکەن؛ یان سەرکەوتنو شەهید بوونو بە مراد گەیشتن لە بەهەشتدا. ئەم ئایەتە هەڵنانو ورە بەرنانە بۆ موسوڵمانان کە کۆ لە شەڕ نەکەنەوە باکیان لە بریندار بوونو تووش هاتنی تەنگو چەڵەمە نەبێ!

زانایان دەفەرموون: ئەم ئایەتە لە دوای شەڕی ئوحوددا هاتە خوارێ، ئەوەبوو: فەرمان کرا بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە شوێن کافرەکان بکەوێو پەلاماریان بدا، هەر ئەو جەنگاوەرانەی لەگەڵ دابن کە بەشداری شەڕەکەیان کردووە، تەنانەت برێکیش لە موسوڵمانەکان بریندارو ماندوو شەکەت بوون پێویستیان بەوە بوو ئیستراحەت بکەنو بحەسێنەوە، چونکە تازە شەڕەکە کۆتایی هاتبوو، هێشتا برینەکان برژانەوەیان بۆ نەکرابوو دەرمان نەکرا بوون، فەرمانیان پێ کراو رووی خیطابیان تێ کراو پێیان گوترا: ﴿وَلاَ تَهِنُواْ فِي ابْتِغَاء الْقَوْمِ﴾ زەعیفو لاواز مەبن لە ئاست شەڕ کردن لەگەڵ دوژمندا، کە لە نوێژ بوونەوە هەمیشە چوستو چالاكو پێشمەرگە بن، ئامادەی شەڕ کردنو هێرش بردنو بەرگری کردن بن، دوو دڵ مەبن لە چوونە گۆڕەپانی شەڕی یەك لا کەرەوە (حاسم) لەگەڵ دوژمن، بە بیانووی ئەوەی ماندوو دەبن بریندار دەبن، دەکوژرێن، ئەوانیش وەکوو ئێوە گۆشتو خوێنن ﴿إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمونَ﴾ ئەگەر ئەوە بکەنە بیانوو کە ئێشو ئازارتان پێدەگا، ئەوە بێگومان ئەوانیش ئێشیان پێ دەگا وەکوو ئێوە ئێشتان پێ دەگا، ئەوانیش ئادەمیزادنو خۆڕادەگرن ئەدی بۆچی ئێوە خۆڕاناگرن؟؟ خۆ ئێوە شیاوترن بۆ خۆ راگرتن! ئەگەر ئێوە ورد ببنەوە بۆتان دەردەکەوێ کە ئەوان لە شەڕکردندا ئامانجێکی پەسەند کراویان نیە، چونکە ئەوان لەسەر بەتاڵن، بەتاڵیش بەرەو نەمان دەڕواو نامێنێتەوە، ئێوە لەسەر حەقن خودا بەڵێنی سەرکەوتنی بە ئێوە داوە، بەوانی نەداوە، ئەوان پاداشیان نیەو کردەوەکانیان بەروبوومی نابێ، ئێوە خودا بەڵێنی بەهەشتی پێداوون، ئەوان پشتو پەنایان نیە، جگە لە بتەکان یارمەتیدەرێکیان نیە،

بتەکانیشیان نەزەرەرو نە سوودو نەهیچ شتێکیان پێ ناگەیەنن! ئێوە بە خوداناسیتان‌و بە یەکتاپەرستیتان پەنا دەبەنە بەر خودایەکی خاوەن دەسەڵات‌و بە تواناو باڵا دەست‌و خاوەن بەزەیی، خودایەکی وەها کە کلیلی گەنجینەی ئاسمان‌و زەوی بەدەستە، بە ویست‌و تواناو یارمەتیدانی ئەو سەرکەوتن دەستەبەر دەبێ وێڕای ئەوەش ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ اللّهِ مَا لاَ يَرْجُونَ﴾ ئێوە ئومێدەوارن کە خودا ئایینی حەق‌و راست‌و رێك‌و پێکتان بەسەر هەموو ئایینێکدا سەربخا، چاوەڕوانی پاداش‌و بەهەشتی بەرین‌و رازاوەن، خوداش بەڵێنی یەکێ لەو دوو شتە باشەکانی پێداون، یان سەرکەوتن‌و سەرفرازی‌و ئازادی یان شەهید بوون‌و چوونە ناو بەهەشت!!

بەڵام ئەوان کە هیچ ئومێدێکیان بە پاشە رۆژ نیە! بڕوایان بە خودا نیە پەنا بۆ بتەکانیان دەبەن‌و ئەوانیش هیچیان پێ ناکرێ، هەمیشە ترسنۆك‌و وەرە رووخاو شڵەژاون، شەڕ کردنیان یان لە ترسی سەرکردەکەیانە، یان لەبەر رەگەزپەرستی‌و دەمارگیرییە یان بۆ تەماعی داگیرکردن‌و خۆسەپاندن‌و چەوساندنەوەی گەلانە! ئەوانیش هیچیان هی ئەوە نین کە ئادەمیزاد خۆیان بۆ بەخت بکا. ﴿وَكَانَ اللّهُ عَلِيمًا﴾ پەروەردگار ئاگادارو زانایە بە حاڵی ئێوە ﴿حَكِيمًا﴾ دانایە لەو شتانەدا فەرمانتان پێ دەکا، یان نەهیتان لێ دەکا، شتێك ناخاتە سەر شانتان بەرژەوەندی دونیاو قیامەتی ئێوەی تێدا نەبێ، هەرچی پێتان دەڵێ: بە گوێرەی دانایی‌و زانایی خۆی سوودی ئێوەی تێدایە بۆ بەرژەوەندی ئێوەیە!

## قەزاوەت کردن بەحەق‌و راستی‌و عەدالەتکاری رەها

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ

يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ

عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ﴿١١٣﴾﴾.

﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ........﴾ تیرمیذیو حاکمو ئیبنو جەریر لە قەتادەی کوڕی نوعمانەوە دەگێڕنەوە: دەڵێ: ئەم ئایەتانە (١٠٥ - ١١٣) دەربارەی طوعمەی کوڕی ئوبەیریق کە پیاوێکی ئەنصاری بوو، هۆزی بەنوو ظوفەر بوو، زرێیەکی مامی قەتادەی کوڕی نوعمان کە (رەفاعە)ی ناوبوو بە ئەمانەت لای دانرا بوو، طوعمە دزیبووی کە پێی زانرا بوو گومانی لێ کرا بوو، چوو بوو خستبوویە ناو جەواڵێك کە ئاردی تێدا بوو، جەواڵەکە کونێکی تێدا بوو بردبووی لە ماڵی زەیدی کوڕی سەمین کە جوولەکە بوو دایناببوو؛ هەر ڕۆیشتبوو ئاردی لێ ڕژا بوو! دوایی داوای زرێیەکەیان لە طوعمە کردەوە، زرێیەکەیان نەدۆزییەوە طوعمە سوێندی خوارد کە ئاگای لێ نیەو پێی نازانێ، بەهۆی ئاردە ڕژاوەکەوە سۆراغیان هەڵگرت تا بردیانە ماڵی جوولەکەکە لەوێ زرێیەکەیان دۆزییەوە، کابرای جوولەکە وتی طوعمە هێناویەتییە ئێرە، چەند کەسێکی جوولەکەش شایەتیان لەسەر ئەوە دا!! بەڵام طوعمە ئینکاری کرد، هۆزی بەنو ظوفەر - کە کەسوکاری طوعمە بوون – وتیان با بچین بۆلای پێغەمبەر، کە چوونە خزمەتی وتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەم خزمەی ئێمە بەریئو بێ تاوانە، ئەوەی زرێیەکەی دزیوە زێدی کوڕی سەمینەو ئێمە ئاگادارین بە خۆڕایی ئەم بوختانەیان بە طوعمە کردووە، قەتادەو مامی بە ئەنقەست ماڵێکی موسوڵمانی وەکوو ئێمەیان تاوانبار کردووە هیچ بەڵگەو شایەتیشیان نیە، داوایان لە پێغەمبەر کرد کە دیفاع لە خزمەکەیان بکا، وتیان ئەگەر وانەکەی طوعمەی خزممان تێدا دەچێو دزییەکەی لەسەر دەچەسپێو کابرای جوولەکە رزگاری دەبێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خەیاڵی بوو وا بکا، چونکە پێی خۆش بوو ئەوان سەربکەونو جوولەکەکە سزا بدرێ، بە تایبەتی زرێ دزراوەکە لە ماڵی جوولەکەکە دۆزرابووەوە قەتادە دەڵێ: کە چووم لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) قسەم کرد فەرمووی چۆن ئێوە بەبێ

بەڵگەو شایەد ماڵێکی موسوڵمانو خواناس لەکەدار دەکەنو گومانی دزییان دەخەنە سەر؟؟ قەتادە دەڵێ: گەڕامەوە پێم خۆش بوو زۆربەی ماڵەکەمان بڕۆیشتایە بەڵام ئەم قسەیەم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەبیستایە!! ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنە خوارێ... ئەمە ریوایەتی زۆربەی راڤەکەرانی قورئانە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: طوعمە هەڵهات بۆ مەککەو پاشگەز بووەوەو لەکاتێکا کە خەریکی دزی بوو دیوارێکی بەسەردا رووخاو مرد.

بەڵێ لەم کاتو بارودۆخەداکە جوولەکەکان تیری ژەهراوی خۆیان ئاراستەی ئیسلامو موسوڵمانان دەکرد، لەو کاتەدا کە جوولەکەکان درۆو دەلەسەیان لە دژی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بڵاو دەکردەوە، کافرەکانیان دنەدنە دەدا، دووڕووەکانیان هەڵ دەنا، رێگای پیلانو دژایەتیان بۆ دەست نیشان دەکردن، پڕوپاگەندەیان بڵاو دەکردەوە، عەقڵو هۆشی خەڵکیان چەواشە دەکرد، تانەو تەشەریان ئاراستەی سەرکردایەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکرد، شكو گومانیان دەخستە سەر نیگاو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر، هەوڵی ئەوەیان دەدا کۆمەڵگای ئیسلامی لە ناخەوە گەندەڵ بکەن، سەرەڕای ئەم هەڵوێستە نامەردانەشیان دوژمنانی دەرەکیان هاندەدا کە هێرش بکەنە سەر موسوڵمانان... ئەمانەش هەموو لە کاتێکدا کە دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینەدا ساواو تازە رسکاو بوو، دابو نەریتی سەردەمی نەزانیو دەمارگیریو رەگەزپەرستیو پاشماوەی لە دڵو دەروونی هەندێ کەسدا مابوو، پەیوەندیو بەرژەوەندی خزمایەتیو تایەفەگەری لە نێوان هەندێ موسوڵمانو موشریکەکاندا، لە نێوان دووڕوو جوولەکەکاندا خەتەرێکی سامناکی هەبوو لەسەر یەك ڕیزی موسوڵمانان.

ئالەم کاتە ناسکەدا، لەم بارودۆخە سامناکەدا ئەم ئایەتانە نازڵ دەبن بۆ سەر پێغەمبەرو کۆمەڵی موسوڵمانان، بۆچی؟ بۆ ئەوەی بە ناڕەوا کابرایەکی جوولەکە تاوانبار نەکرێ، کابرایەکی جوولەکە کە لە خوتو خۆڕایی تاوانباریان کردووە بە دزی، ئایەتەکان هاتن بۆ ئەوەی پیلانێکی داڕێژراو لەلایەن بنەماڵەیەکی موسوڵمانی یارمەتیدەرەوە (أنصار) دژی کابرایەکی جوولەکەی بێ تاوان پووچەڵ

بکەنــەوە، لــە کاتێکــدا لــەو ڕۆژەدا ئەنــصارەکان پــشتو پــەنای پێغەمبــەر بــوون جەنگاوەرو یارمەتیدەری بوون!

بێگومان چەند هۆکارێك هەبوون کە ئەو شتە دابپۆشرایە، یان ئەوەندە بە توندی باس نەکرایەو ئاشکرا نەکرایە، بە گوێری یاسای سەر زەوی بە گوێری بیرو بۆچوونی بەشەر، بە گوێری بەرژەوەندی کاتیو دونیایی لە ڕوانگەی یاسای ئادەمیزادەوە دەبوایە ئەو شتە چاو پۆشی لێ بکرایەو پەردەپۆش بکرایە!

ئەمە چ ئاستێکە لە عەدالەتو بەرزی پاكو خاوێنی؟؟ چ ئاخاوتنێکە، چ قانوونو یاسایەك دەگاتە ئەم قورئانە، ئەم نیگا یەزدانیە کە هەموو شتێك بە تەرازووی خۆی دەکێشێ تەرازوویەکی تایبەتی کە بە موو بەرزیو نزمی تێدا ناکرێ! پرۆگرامو یاسایەك کە ستەمی تیا نیە تەنانەت ڕێگا نادا ستەم لە دوژمنیش بکرێ.

﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئێمە قورئانمان بۆ ناردووی کە بریتییە لە پرۆگرامو یاساو شەریعەتی حەقو عەدل: لایەنگیریو مامە حەمەیی بۆ هیچ لایەك قبووڵ ناکا، نایەوێ ستەم لە هیچ کەس بکرێ تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە موسوڵمانیش نەبێ! ئێمە ئەو قورئانەمان بۆ ناردوویتە خوارێ: کە بریتییە لە حەقو ڕاستی؛ هەموو شتێکی حەقو ڕاستە، هەواڵی ڕاستە، فەرمانی دروستە، حوکمی ڕەوایە، حەق بێژە ڕاستی خوازە ﴿لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ﴾ بۆ ئەوەی دادوەرانە لە نێوان ئادەمیزاداندا حوکم بکەی، بەو شێوە نیگات بۆ دەنێرمو فێرت دەکەم کێشەی خەڵك حەل بکەی، تەرازووی عەدالەت خوار مەکە، بە گوێرەی نیگا حوکم بکە، ئەگەر لەو بارەوە نیگات بۆ کرابوو.... یان بە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو وردبوونەوەی خۆت (إجتهاد) بە شەریعەتی خودا حوکم بکە! ﴿وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾ نەچی ببیە یارمەتیدەری خائینانو دیفاع لەو درۆزنانە مەکە، ئەگەر کەسێك داوای مافێکی خۆی لێ کردنەوە تۆ بەرپەرچی مەدەرەوە سستی مەکە لە گەڕان بە دوای حەقدا دەم لووسیو قسەزانی ئەوان با کارت تێ نەکەنو لە حەق لات نەدەن!

لە روانگەی ئەم ئایەتەوە زانایانی ئوصولی فیقھ وتوویانە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆی هەبووە بە گوێری ئیجتیهادو توێژینەوەی خۆی حوکم بکا، هەروەها ئەم حەدیثەشیان کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەو رایەیان، حەدیثەکە لە صەحیحەین دایەو لە ئوممو سەلەمەوە دەگێردرێتەوە دەڵێ: رۆژێك لەبەردەگای ژوورەکەی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) دەنگە دەنگو قرە قرێك پەیدا بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هاتە دەرێ بۆ ناویانو فەرمووی: خەڵکینە! «أَلا إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، أَنَا أَقْضِي بِنَحْوِ ما أَسْمَعُ، وَلَعَلَّ أحدكم أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ فَأَقْضِي لَهُ فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مسلم فَإِنَّمَا هي قِطْعَة مِنَ النَّارِ فليحملها أو ليذرها».

ئیمام ئەحمەد لە ئوممو سەلەمەوە ئەم حەدیثە بە شێوەیەکی تر دەگێرێتەوە بەڵام پوختەی ماناکانیان یەك دەگرێتەوە! هەرچەندە ریوایەتەکەی ئیمام ئەحمەد دوورو درێژە!

جا ئەوانەی کە رایان وایە: کە پێغەمبەر ئیجتیهادی بۆ هەبوو، کە زۆربەی زانایانی ئیسلامن. ئەوەشیان بەلاوە رەوایە: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هەڵەش بکا، بەڵام بەردەوام نابێ لەسەر هەڵە، بەڵگەش ئەم رووداوەو رووداوی فیدیە وەرگرتنی دیلەکانی بەدرە!!!؟

﴿وَاسْتَغْفِرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ داوای لێ خۆشبوون بکە لەو هەڵوێستەی کە خەریك بوو بینوێنی دەربارەی طوعمەو پاکانە بۆ کردنی لە شتێکا کە بە وردی لێت نەکۆڵیبووەوە دەتەویست بە هەوانتە کابرای جوولەکە تاوانبار بکرێو سزای بدرێ، بێگومان خودا لێبووردو لێخۆشبووە، لە تاوان خۆش دەبێ، بە سۆزو بەزەییە دەربارەی بەندەکانی، ئەگەر خزمو کەسو کاری طوعمە تۆبە بکەن تۆبەکەیان وەردەگرێ، چونکە لێخۆشبوونی زۆرە بۆ کەسێك داوای لێخۆشبوونی لێ بکا بەزەیی فراوانە بۆ کەسێك داوای بەزەیی لێ بکا.

فەرمان کردن بە پێغەمبەر کە داوای لێخۆشبوون بکا چ دژایەتیەکی لەگەڵ بێگوناهی پێغەمبەران (عصمة الأنبياء)و بێ هەڵەییان نیە، چونکە لێرەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) تەنها قەصدی بووە قەصدیش بە گوناه

حسێب ناكرێ، بەڵكوو ئەمە وەكوو ئەوە وايە كە دەڵێن: چاكەی باشان گوناهـە بـۆ نزيكانی بارەگای ئەقدەس (حسنات الأبرار سيئات المقربين) ئەوەی بەچاكە دادەنرێ بۆ بەندە باشەكان، بۆ نزيكانی بارەگای يەزدان بەخراپە دەدانرێ. بۆيەش فەرمانی پێكرد داوای لێخۆشبوون بۆ زێدە پاداش‌و شارمزايی كردنـی خـۆیی‌و ئوممەتەكـەی كە لەحوكم كردن‌و قەضادا زۆر لێكۆڵينەوەو توێژينەوە بكەن!

پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لـەم رووداوەدا پـێش هـاتنی ئايەتـەكان حوكمی خۆی بەسەردا نەدان، هەڵوێستێكی نوانـد كـەپێی وابـوو حەقـە، نيـاز پـاكی بەرامبـەر طـوعمـەو خزمـەكانی نيـشاندا، ئـەوەبوو پـەروەردگار حەقيقـەتی رووداوەكـەی بـۆ روون كـردەوە بـە پێـچەوانەی گومـانی خـۆی كـە لـەوەوە سـەری هەڵدابوو كە زۆربەی كات موسوڵمان راستگۆن‌و جوولەكە درۆزنن!!

ئـەمجار يـەزدانی خـاوەن رەحـم‌و بـەزەيی؛ هـۆزی طـوعمـەی هـەڵنا كـە داوای لێخۆشبوون بكەن‌و تۆبە بكەن‌و فەرمووی: ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ دڵنيابن كـە خودا لێخۆشبوونی زۆرە بۆ كەسێك داوای لێخۆشبوونی لێ بكـا رەحـم‌و بـەزەيی زۆر فراوانە بۆ كەسێك داوای رەحم‌و بەزەيی لێ بكا!

﴿وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەی محمد! تۆ بـەرگری‌و ديفـاع مەكـە لەو كۆمەڵە گومڕايانەی كە خيانەتيان لەخۆيان كردووە؛ بەوە كە دەست درێـژييان كردۆتە سەر ماڵی خەڵك‌و ماڵی خەڵكيان دزيـوە دەيانـەوێ بەناحـەق بيخەنـە سـەر يـەكێكی تـر لايـەنگيری ئـەو خائينانـە مەكـە لـەكاتی كێـشەو نيزاعـدا يارمـەتييان مەدە!

قورئان خيانەتكردنيانی لەخەڵك بە خيانـەت كـردن لـەخۆيانی دانـاوە چـونكە سەرەنجام زيانی خيانەتەكە دەگەڕێتەوە بۆ خۆيـان‌و خيانـەتيان لـەخۆيان كـردووە ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَـن كَـانَ خَوَّانًـا أَثِيمًـا﴾ بێگومـان خـودا دەبوغزێنـێ كەسێك زۆر خيانـەت بكـاو تـاوانكردنی لێ بووبێتـە خـوو و سرووشـت‌و خراپـەو خراپكـاری لێ بوبێتە عادەت‌و داب‌و نەريت! بە پێچەوانەوە ئەو كەسانەی خـۆش دەوێـن ئـەمين‌و دەسـت پـاك‌و زمـان شـيرين‌و بێـوەيين بـۆ ئـادەميزاد راسـتگۆو راسـتاڵن لـە هـەڵس‌و كەوتياندا.

دیارە (طوعمە) زۆر ناپاكو خیانەتكار بووە بۆیە قورئـان بەشـێوەی موبالەغـە (صیغەی فعّال فعیل) ئاوەڵنـاوی بـۆ هێنـاونو خـودا زانیویـەتی چـەند خیانـەتكارو تاوانبارو رووچوو بووە لە گومڕاییدا بۆیە بە (خوّان) و (أثیم) ناوزەدی كردووە.

زومەخـشەری دەفـەرموێ: دزە كـە هـەر (طـوعمـە) بـووە كەچـی قورئـان بـەكۆ باسی كردووە فەرموویەتی: (للخائنین)و (یختانون أنفسهم) لەبەر دوو هۆ:

١- هۆزی بەنو ظوفەر كە خزمو كەسوكاری طوعمە بوون دەیانزانی كە طوعمـە دزی كردووە كەچی چوون پاكانـەیان بـۆ كـردوو یارمـەتییان دا كـەوابوو بـوون بـە هاوبەشی لەخیانەتەكەدا.

٢- بۆیـە بـەكۆ نـاوی هێنـان بۆئـەوەی طـوعمـەو هـەر كەسـێك خیانـەت بكـا بگرێتەوە كەوابوو ئەی محمد! نە دیفاع لە خائین بكە، نە پشتی بگرە نـە لەسـەری بكەرەوە!

ئەمجار لەئایەتی داهاتوودا خودای زانـاو بـاڵا دەسـت حـاڵو چۆنیەتی خائینـان دیـاری دەكـا، رەوشـتو صـیفاتی ناشـیرینو قێزەونیـان دەردەخـاو دەفـەرموێ: ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ﴾ رەوشتی ناشیرینی ئەو خائینانە ئەوەیە: كە تاوان دەكەن لە خەڵكی دەشێرنەوە، تاوانەكانیان بەدزی ئەنجام دەدەن، جا یان لەترسانە یان پێیـان شەرمە كەچی ﴿وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللّهِ﴾ لەخودای ناشێرنەوە، شەرم لـە پـەروەردگار ناكەن، كـە ئـەو زانـاو ئاگاداری هـەموو نهێنـیو ئاشـكرایێكە، چ لـەزەویو ئاسمانـدا هەبێ گەورەو بچووكو كۆنو نوێ... هتـد هـەمووی لـەلای خـودا نمایانـەو ئاشـكراو عەیانە ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لاَ يَرْضَى مِنَ الْقَـوْلِ﴾ خودایـەكی وەهایـە لەگەڵیانـە كـە نەخـشە خیانەتكارییەكـەیان دەكێـشن... واتـە: ئاگـادارو خەبـەرداره بەسـەر كارەكەیاندا، هیچ شتێك لە نهێنی ئەوانی لێ ون نابێ، ئاگادارە چۆن پیلان دادەنێن، چۆن شـت هەڵدەگێڕنـەوەو چەواشـەی دەكـەن، ئاگـای لێیانـە ئـەو كاتـەی قـسەی وا هەڵدەبەستن كەخوا پێیان رازی نییە، وەكوو تەگبیری طوعمە كە زرێیەكەی خستە ماڵی كابرای جوولەكەوە بۆئەوەی ئەو تاوانبار بكرێ بەدز، بۆ خـۆی وەك بـەرزەكی بانان بۆی دەرچێ! با باش بزانن كە ئەو چەواشەكارییەیان بـۆ سـەر ناچـێ چونكە ﴿وَكَانَ اللّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾ پەروەردگار هەمیـشە ئاگـاداری كـردارو گوفتاریانـە،

چییان کردووەو چییان گوتووە لەسەریان نوسراوەو حیسابیان لەگەڵ دەکا، هیچ هیواو ئومێدێکی رزگاربوونیان لە چنگی سزای خودا نەبێ! هیچ تاوانبارێك لەدەستی رزگاری نابێ! چونکە خاوەنی هەردوو دونیایەو زاناو بەتواناو باڵا دەستی بێ ئەندازەو بێ سنوورە.

ئەمجار پەروەردگار موسوڵمانان دەترسێنێ لە یارمەتیدانی خائینانو بەزەیی هاتنەوە پێیانداو دەفەرموێ: ﴿هَاأَنتُمْ هَؤُلاء جَادَلْتُمْ عَنْهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ئەی ئەو کەسانەی دیفاع لە خائینان دەکەنو ویستتان تەبرییەیان بکەنو راستییەکان هەڵبگێڕنەوە، ئەوا گریمان لەدونیادا ئەمەتان بۆ سەرچوو بەڕواڵەت تاوانەکانیانتان بۆ پەردەپۆش کردن ﴿فَمَن يُجَادِلُ اللّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ کێ رۆژی قیامەت دیفاعیان لێ دەکا؟ کێ دەتوانێ بێ ئیزنی خودا شەفاعەتیان بۆ بکا؟ کێ رۆژی قیامەت دەبێتە داکۆکیکەرو پارێزەریان ئەوکاتەی کە دادوەر خودای زاناو داناو خەبەرداره بە کردارو گوفتاریان؟ ﴿أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً﴾ کێ زاتی ئەوە دەکا ببێتە محامی ئەوانو بەرگرییان لێ بکا؟؟ دەی با موسوڵمانان وریابن خۆیان بۆ وەڵامدانەوە لەو جۆرە وێستگانەدا ئامادە بکەن، بزانن ئاخۆ دەتوانن لەئەو مەوقیفە سامناکەدا ورتەیان لەدەم بێتە دەرێ؟؟؟ بێگومان ئەو رۆژە ﴿يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ – الإنفطار/١٩﴾ یان ماناکەی وا لێ دەدەینەوە دەڵێین: وای دابنێن ئێوە لەدونیادا داکۆکیتان لێ کردنو دیفاعتان لە طوعمەو خزمو کەسەکانی کرد! دەی باشە کێ دەتوانێ رۆژی قیامەت دیفاعیان لێ بکا؟ کەخودا بە غەزەبی خۆی گرتنیو سزای خۆی بەسەردا دان، کێ دەبێتە (محامی)و پەنادەر بۆیان؟ کێ دەتوانێ سزاو تۆڵەی خودایان لێ دوور بخاتەوە؟

ئایەتەکە بەئاشکرا لۆمەو سەرزەنشتی ئەوانە دەکا کەویستیان یارمەتی طوعمە بدەن کابرای جوولەکە تاوانبار بکەن..

ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: ئەگەر دادوەر رووی راستی لە بابەتەکەدا نەپێکێ، حوکمو بڕیارەکەی هەر بە رواڵەتو بە ظاهیر تەنفیذ دەبێ، حوکمی حاکم لەکاتی وادا هیچ لە حەقیقەتی شتەکە ناگۆڕێ، هیچ شتێکی حەرام بۆ حوکم بۆ دراو حەڵاڵ ناکا، کەسێك بزانێ شتێك هی خۆی نییە ئەگەر حاکم حوکمی بۆداو ئەو

شتەی کرد بە موڵکی ئەو نابێتە موڵکی‌و پێی حەرامە. ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزادان هەڵدەنێ‌و بۆ گەڕانەوەو تۆبەکردن. فەرمووی: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا﴾ کەسێك تاوانێکی کرد زیانی بەکەسێك گەیاند؛ دزی لێ کرد لێی دا، پاش ملە بەخراپە باسی کرد ﴿أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ﴾ یان تاوانێکی کرد زیانی بەخۆی گەیاندو ستەمی لەخودی خۆی کرد، وەکوو ئەوە سوێنی بەدرۆی خوارد، ﴿ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ﴾ دوایی پەشیمان ببێتەوەو تۆبە بکاو داوای لێخۆشبوون لەخودا بکا ﴿يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ دەبینێ خودا لە گوناهەکانی خۆش دەبێ، بە بەزەیی‌و بەرەحمەتی خۆی عەیب‌و لەکەکانی دادەپۆشێ! ئەمەش لەڕووی فەضل‌و ئیحسانی بێ شماری نەك واجب بێ لەسەری. لەمەدا هەڵنان‌و تەماع بەرنانی طوعمەو خزم‌و کەسوکارەکانی تێدایە بەوە کە تۆبە بکەن‌و داوای لێخۆشبوون لەخودا بکەن، شارەزایی کردن‌و ڕێ پیشاندانیانە بۆ ڕزگاربوون لەو تەنگەژەی تێی کەوتوون، لەهەمان کاتدا هەڕەشەیە لەوکەسانەی دژایەتی حەق‌و ڕاستی دەکەن‌و هەوڵ دەدەن ڕاستییەکان چەواشە بکەن‌و باڵەخانەی دادوەری بڕوخێنن.

ئەمجار پەروەردگار بەشێوەیەکی گشتی ئادەمیزادان دەترسێنێ لە گوناهو فەرمووی: ﴿وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ﴾ هەرکەسێ تاوان بکا بەکارو پیشەی خۆیی‌و بیەوێ لەم ڕێگەیەوە سوودو قازانج بکا ئەوا تاوانەکەی بارە بەسەر خۆیەوەو زیانی بۆ خودی خۆیەتی‌و هیچ سوودو قازانجێکی لێ وەگیر ناکەوێ، لەدونیاو قیامەتدا پێی زەرەرمەند دەبێ، لەدونیادا بێ ڕێزن‌و لەپێش چاوی خەڵك سووك‌و بێ نرخن! لەلای دادوەری دادپەروەر تاوانبارو شیاوی سزان، لە قیامەتیشدا ڕیسوای بەرقاپی دیوانی خودان‌و سووتەمەنی دۆزەخن، تۆڵەی تاوانەکەی لەخۆی دەکرێتەوەو یەکێکی تر لەسەر تاوانی ئەو سزا نادرێ! ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا﴾ هەمیشە پەروەردگار زاناو ئاگادارە، بەزانیاری فراوانی شەریعەتی بۆ ئادەمیزادان داناوە، یاساو سنووری بۆ دیاری کردوون، پێی ڕاگەیاندوون کە تێپەڕبوون لەو سنوورەو لادان لەو شەریعەتە زیانیان پێ دەگەیەنێ ﴿حَكِيمًا﴾ دانایە بەو حیکمەت‌و داناییەی سزای شیاوی داناوە بۆ ئەوانەی سنوور بەزێنی دەکەن، کەوابوو تاوانبار بە تاوانەکەی زیان بەخۆی دەگەیەنێ‌و خودا هیچ زیانێکی پێ ناگا! ﴿وَمَن يَكْسِبْ

خَطِيئَةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِ بَرِيئًا﴾ لەتاوانی گەورەیە کە ئادەمیزاد بە ئەنقەست یان بە هەڵە تاوانێك بکا، ئەمجار کابرایەکی بێ خەتا پێوەبکاو تاوانەکە بخاتە ملی ئەوو، کەسێك هەڵوێستی ئاوا بنوێنێ ﴿فَقَدِ احْتَمَلَ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ ئەوە بێگومان دوو تاوانی ئەنجامداوە تاوانی خودی تاوانەکەو تاوانی بوختانو خستنە ملی یەکێکی بێ تاوانو بێ ئاگا! ئەمڕۆ ئەم دیاردەیە لەناو موسوڵمانان بڵاو بۆتەوە، چەندان کەسی بێ تاوان رۆژانە تاوانبار دەکرێنو بەختو خۆڕایی راپێچی زیندانو کوونە رەشەکانی خوانەناسان دەکرێنو تاوانباری حەقیقیو سەرەکی وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێ، هۆی سەرەکی ئەم دیاردە دزێوە وازهێنانو دوورکەوتنەوەیە لە رەهنومایی ئایینو غافڵبوونو بێ ئاگاییە لە فەرمانو ئامۆژگارییەکانی شەریعەتی خودا! ئەمجار پەروەردگار فەضڵو گەورەییو رەحمەتو پارێزگاریو چاودێری خۆی بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاشکرا دەکات دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ﴾ ئەگەر خودا بە رەحمەتی خۆی چاودێری تۆی نەکردایە، ئەی موحەممەد! بەوە کە نیگای بۆ ناردیو نهێنی پیلانەکەیانی بۆ ئاشکرا کردی، حەقیقەتی رووداوەکەی تێگەیاندی ﴿لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مُّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ﴾ ئەوە کۆمەڵێك لە هۆزی بەنو ظوفەر (خزمو کەسوکاری طوعمە) دەیانویست لە دادگایی کردن بەحەق لات بدەنو رێگای دادپەروەریت لێ هوون بکەن، لەکاتێکدا دەیانزانی تاوانبار طوعمەیەو کابرای جوولەکە نییە.

بەکورتی ئەگەر فەضڵی خودات بەسەرەوە نەبوایە کە پلەی پێغەمبەری پێ داوی، دەتپارێزێ لە هەڵە، رەحمەتو بەزەیی فراوانی بۆ تۆ، کە راستی رووداوەکەی تێگەیاندی، ئەو کۆمەڵە خەریك بوون رێگات لێ گووم بکەن، حوکمی دادوەرانەت لێ بشێوێنن، بەڵام خواو راستان پێش ئەوەی تۆ بگەیە حاڵەتێك تەماعت تێ بکەن بۆ بڕیار دانی ئاوا، نیگات بۆ هاتو راستی رووداوی بۆ ئاشکرا کردی، لە بڕیاردانی هەڵەی پاراستی. ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلاُّ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانە لە حەقیقەتدا بەوە کە لەرێگای حەق لایانداوە تەنها خۆیان گومڕا دەکەنو سەر لەخۆیان دەشێوێننو ماڵی خۆیان وێران دەکەن، خۆیان تووشی تۆڵەو سزای دونیاو قیامەت دەبنو خودا لەخۆیان دەڕەنجێنن! ﴿وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيْءٍ﴾ زیانیان بەتۆ نەدەگەیاند چونکە تۆ کە

بڕیارت دەدا بەگوێرەی ظاهیری حاڵو شایەتیدانی خزمەكانی طوعمە حوكمت دەردەكرد، بەخەیاڵتدا نەدەهات كە ڕووداوەكە بە پێچەوانەوەیە، واقیع شتێكی ترە!

خودا تۆی پاراست لە پیلانی ئەو تاوانبارانەو شوێن هەواو ناحەقی نەكەوتی، لە حوكم كردنەكەتدا؛ هەر بەو جۆرە خودا لەهەموو كارێكی زیان بەخش دەتپارێزی!

﴿وَأَنـزَلَ اللّـهُ عَلَيْـكَ الْكِتَـابَ وَالْحِكْمَـةَ﴾ پەروەردگار قورئانی بۆ ناردووی حیكمەتو نهێنی شەریعەتی ئیسلامی تێگەیاندووی، قورئانو شەریعەتی فێركردووی ﴿وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُـنْ تَعْلَـمُ﴾ حەقیقەتو ڕاستی خستۆتە دڵتەوە كە لەوەوپێش پێی ئاشنا نەبووی، ئەگەر لەخوداوە نەبێ‌و تۆ كەی لەوەوپێش نیازی پەنامەكی‌و، مەبەستی شیردراوەی ناو دڵانو كاروباری ئایینی‌و شەریعەتت دەزانی!؟

﴿وَكَانَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًـا﴾ فەضلو بەخششی خودا بەسەر تۆوە زۆرو گەورەو هەمە چەشنەیە، كردویتی بە پێغەمبەرو ناردویتی بۆ سەر گشت ئادەمیزادان، كۆتایی پێغەمبەرانی‌و هیچ پێغەمبەر نابن لەدوای تۆ، ڕۆژی قیامەت دەبێتە شایەد بەسەریانەوە، لە خراپەكاری مەردوومان دەتپارێزێ، ئوممەتەكەت گەلێكی مامناوەندی‌و میانەڕەوە، چەندەها پلەو پایەی جۆراو جۆری تری پێ بەخشیوی؛؛ كەواتە سوپاسی خودا بكە با ئەوانیش سوپاسگوزاری خودابن لەسەر ئەو نیعمەتانە، هەتا ببنە باشترین گەلو كۆمەڵی پەیدابووی سەر ڕووی زەوی‌و ببنە نموونەو پێشەنگو كەسانی دیكە چاویان لێ بكەن.

## حاڵەتی سرتە سرتی باش‌و سزای ئەوانەی دژایەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەكەن

﴿ ۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ

ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾.

﴿لاَّ خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ﴾ ئەم ئایەتە دەربارەی چپە چپی شەوانەی خزمو کەسوکاری طوعمەی کوڕی ئوبەیریق هاتۆتە خوارێ، کە پیلانیان دارشتو بە نهێنیو سرتە سرت قسەی خۆیان کرد بەیەكو ویستیان طوعمە رزگار بکەنو زرێ دزینەکەی بخەنە ئەستۆی کابرای جوولەکە، دیارە چپە چپەکەیان بۆ کاری خێر نەبووە ئیتر لێرەدا پەروەردگار حوکمی قسەی سرتە سرت دیاری دەکاو دەفەرموێ: قسە کردنی ئادەمیزادو چپەچپ کردنیان خێرو قازانجی تێدا نیەو زۆربەی کات سرتە سرتەکانیان بێ خێرو بێرن سوودو قازانجی دونیاو قیامەتیان لێ دەست ناکەوێ، مەگەر لە سێ شتدا نەبێ.

١- ﴿إِلاَّ مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ﴾ کەسێك بە ئەسپاییو چپە بە کەسێك بڵێ فلان کەس نەبووەو پێویستی بە باربوویی کردن هەیە بەڵکوو یارمەتی بدەن، ئەمە ئەگەر بە نهێنی بێ باشترە، چونکە لە روپامایی‌و خۆڕانواندن دوورە، کابرای خێر پێ گراویش ناوی نازڕێ‌و رەنگە پێی ناخۆش بێ بە ئاشکرا ناوی ببرێ!

٢-﴿أَوْ مَعْرُوفٍ﴾ یان فەرمان بە چاکە بکا لە شوێنێك بە چپە نەبێ کارەکەی سەرناگرێ، یان وەکوو پەنادانی ستەم لێ کراوو هەڵاتوو لە دەستی ستەمکارو ئەو جۆرە شتانە واتە: هەر چپەیەك سوودی گشتی تێدا بێ شەرع بە کاری باشی دابنێ، وشەی (معروف) وشەیەکی گشتیە هەموو کارێکی خێر دەگرێتەوە.

ئەحمەدو ئەبو داودو نەسائیو تیرمیذیو ئیبنو ماجە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە دەگێڕنەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموی: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ وَإِنَّ مِنَ

الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ» هەموو كارێكی باشی ناو كۆمەڵ بە خێرو چاكە دادەنرێ، یەكێك لەو كارە چاكانە كە لە كاتی بەیەك گەیشتندا رووت خۆش بێ لەگەڵ برای ئایینی خۆت.

٣- ﴿أَوْ إِصْلاَحٍ بَيْنَ النَّاسِ﴾ یان وتو وێژی نێوان دوو كەس دوو كۆمەڵ كە ناكۆكیانە، بە چپە وتو وێژی ئەسپایی‌و پەنامەكی نەبێ نەتوانێ رێكیان بخاتەوە.

ئیبنو مەردەویهی‌و تیرمیذی‌و ئیبنو ماجە لە ئوممو حەبیبەوە حەدیسێك دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «كلام ابْنِ آدَمَ كله عليه، لا له إلا ذكر الله عز وجل أَو أَمْرُهُ بِالْمَعْرُوفِ أو نَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ» ئادەمیزاد هەر قسەیێ بكا لەسەری دەكەوێ‌و خێری بۆ نابێ، مەگەر قسەیێ كە یادو ذیكری خوابێ، یان فەرمان كردن بە چاكە، یان نەهی كردن بێ لە كاری ناشایستە... ئیمام ئەحمەد لە ئوممو كەلثومی كچی عوقبەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بیستم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: «لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِى يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، فَيَنْمِي خَيْرًا، أَوْ يَقُولُ خَيْرًا». هەر ئیمام ئەحمەد لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «أَفْضَلَ الصَّدَقَةِ إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ» ئەبوبەكری بەززارو بەیهەقی لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە ئەبو ئەیووبی ئەنصاری فەرموو «أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى تِجَارَةٍ» ئەویش وتی: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا شارەزاییم بكە، فەرمووی: «تسعى في إصلاح بين الناس إذا تفاسدوا، وتقارب بينهم إذا تباعدوا».[1]

ئایەتەكە فەرمووی: ﴿لاَّ خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ﴾ وشەی (كثیر)ی بۆیە خستە ناوەوە چونكە زۆرجار وادەبێ چپە كردن لە موباحدا دەبێ‌و پەیوەندی بە بەرژەوەندی تایبەتی خەڵكەوە دەبێ وەكوو باسی كشتو كاڵ‌و بازرگانی‌و پیشەسازی... هتد ئەمانە وەصفدار ناكرێن بەشەڕ لە چوارچێوەی خێریشدا نین،

[1] - وفي رواية ألا ادلك على صدقة خير لك من حمر النعم؟ فقال بلى يا رسول الله، قال تصلح بين الناس إذا تفاسدوا وتقرب بينهم إذا تباعدوا.

چپەکردن تیایاندا موباحە، کەوابوو ئەو چپەیەی کە خێری تێدا نیە چپەیەکە پەیوەندی بە کاروباری خەڵکەوە هەبێ.

پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا چپەکردنی کردووەتە شوێنی گومانی شەڕو خراپەو دەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ – المجادلة/٩﴾.

ئیمامی مالیك‌و موسلیم‌و بوخاری حەدیسێك لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «إذا كَانَ ثَلاَثَةٌ فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ وَاحِدٍ» چونکە چپە کردن لە نێوان ئەو دوو کەسەدا دڵی سێیەم دەخاتە گومانەوە ئەوەش زیان بەخشەو زیانیش بە ئیجماع دروست نیە.

هۆی ئەوەی کە زۆربەی چپە گومانی شەڕی لێ دەکرێ ئەوەیە کە دابو نەریت وا هاتووە بە زۆری ئادەمیزاد پێی خۆشە کارو گوفتاری خێر ئامێز بە ئاشکرا ئەنجام بدرێن، بە دەگمەن نەبێ کابرا قسەی باش‌و خێر ئاوەر بە چپە ناکا، بە پێچەوانەوە زۆر قسەی شەڕ ئاوەرو پیلان‌و داو دانانەوە بە شێوەی چپە چپ ئەنجام دەدرێن! باشیەتی ئەو سێ شتانەش (فەرمان بە چاکەو فەرمان بە بەخشین‌و باربوونی کردنی هەژاران‌و رێکخستنەوەی نێوا موسوڵمانان) بە شێوەی نهێنی دەبێ، واتە: چاك وایە: بە نهێنی ئەنجام بدرێن، چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاء فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ – البقرة/٢٧١﴾ ئەمجار پەروەردگار پاداشی دەست نیشان کراوی خۆی لە پاداشی ئەو سێ کردەوانەدا ئاشکرا دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتَغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ کەسێك بەمەبەستی رازی کردنی خوداو فەرمانبەرداری فەرمانەکانی‌و بە هیوای پاداشی کردەوەکانی لای یەزدانی مەزن بەو جۆرە رەفتار بکا! ئەوە با دڵنیا بێ کە خودا پاداشی زۆرو هەمە جۆرو فراوان‌و باشی دەداتێ!

بە پوختی هەوڵ دان بۆ وەدەست هێنانی رەزامەندی خودا دەبێ لە رێگای راستاڵی‌و نیاز پاکی‌و ئیخلاصەوە بێ، کە ئەو کارانە ئەنجام دەدا مەبەستی ناوو شۆرەت‌و دونیاو ریابازی‌و خۆهەڵنانەوە بەسەر خەڵکدا نەبێ، تەنها مەبەستی رازی کردنی خودا بێ، ئەوکاتە شیاوی ئەو پاداشە دەبێ!!

دوای ئـەوە بـەڵێن و وادە دانـە بـە خێـرو پاداشـی بـاش و بـۆ ئەوانـەی کـە چپەچپیان بـۆ کـاری خێـرەو بـە گوێرەی ئامۆژگاریـەکانی قورئـان رەفتـار دەکـەن، هەڕەشەی توندو سامناکی لەوانە کرد کە خەریکی پیلان نانەوەن و چپە چپیان بـۆ دروسـت کردنـی بـاڵی نـامۆو کۆمـەڵی شـەڕخوازو دروسـت کردنـی دووبـەرەکی و دژایەتی نانەوەی ناو کۆمەڵگای موسوڵمانانەو فەرمووی: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُـولَ مِـن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى﴾ کەسێك دوژمنایەتی پێغەمبەر بکاو پێچەوانەی ئـەو رێبـازو شەریعەتەی ئیسلام هێناویـەتی رەفتـار بکـا، دوای ئـەوەی کـە رێگـای راسـتی پـیشان دراو شارەزای ئایینی ئیسلام بوو، ئەمجار پەشیمان ببێتەوەو لە ئایین هەڵگەڕێتەوە وەکوو (طوعمەی کوڕی ئوبەیریق) کردی، دژایەتی پێغەمبەرو کۆمەڵی موسوڵمانان بکـا، پـیلان دابڕێـژێ و کۆمـەڵ و گرۆهـی دژ بـە ئیـسلام پێکـەوە بنـێ، لـە کۆمـەڵی موسوڵمانان جودابێتەوە، بۆخۆی بـە ئیختیـاری خـۆی ئـەم هەڵوێـستانە وەربگـرێ و رەچاوی ئەم کردەوانە بکا، ئـەوە ﴿وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُـؤْمِنِينَ نُوَلِّـهِ مَـا تَـوَلَّى﴾ شـوێن بەرنامەو رێبازی ناموسوڵمانان بکەوێ ئەوە دەست بە کاری دەکەین لە کارەکەیداو دەسەڵات و توانای ئەنجام دانی پێ دەدەین. بۆ زێدە گومڕا بوون رێبازی چەوتی لەلا خۆشەویست دەکەین ئەمجار بەرەڵڵای دەکـەین لـە زەلکاوی گـومڕا بوونـدا بۆخـۆی هەنگاوی کوێرانە هەڵێنێ و سەری لێ بشێوێ و نەزانێ چی دەکا!!!

وێڕای ئەوەش ﴿وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ رۆژی قیامەت فڕێی دەدەینە نـاو دۆزەخەوەو ئەو شوێنە ناخۆشەی بۆ دەکەین بە جێگای حەوانەوەو خـانووی هـەتا هەتایی، بەڕاستی ئەمەش خراپترین سەرەنجام و ئاکامە کـە تووشـی دەبـێ و بۆخـۆی بە ویستی خۆی و بە دەسـتی خـۆی بۆخـۆی خوڵقانـدووەو کەسـیش حەسـوودی پـێ نابا.

هەرکەسـێك لـە ئـایین پاشـگەز بێتـەوە رۆژی قیامـەت جگـە لـە رێگـای بـەرەو دۆزەخ رێگای تری نیە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَرَأَى الْمُجْرِمُونَ النَّـارَ فَظَنُّوا أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَـصْرِفًا – الكهـف/٥٣﴾ ئـەم ئایەتـە بـەروونی ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە هەرکەسێك بەویست و ئیختیـاری خـۆی رێبازێـك بگـرێ و بۆخۆی پەسەندی بکاو پێی رازی بێ خودای باڵادەست بەرەڵڵای دەکاو لێی دەگەڕێ

بە ئارەزووی خۆی چی دەکا بیکا، بەڵام ڕۆژی قیامەت سزاو تۆڵەی دادپەروەرانەی لێ دەستێنێ چونکە بۆخۆی ڕێگای شەڕو بەدبەختی گرتۆتەبەرو لە شەقامە ڕێگای خوداناسان لای داوە، بۆخۆی بە دەستی خۆی ماڵی خۆی وێران کردووە! جا کەسێك دژایەتی پێغەمبەر بکاو دووبەرەکی بنێتەوە لەنێوان کۆمەڵی موسوڵماناندا، لە ئایین هەڵگەڕێتەوە، ئەوە لەرەحمەتی خودا دوورەو لێخۆشبوونی بۆ نیە! چونکە ئەوە هاوبەش پەیداکەرە بۆ خودا.

## هاوەڵ دانان بۆ خوداو سەرەنجامی، شەیتانو ئەتوارە بەدەکانی، پاداشی کردەوە

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ

مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾ ﴾.

ئایەتی (١١٦) پەیوەندی بە چیرۆکی طوعمەوە هەیە، چونکە ئەگەر ئەو لە ئیسلام هەڵنەگەڕایەوە لەرەحمەتی خودا بێبەش نەدەبوو، چونکە هەموو تاوانێك لەوانەیە لێخۆشبوونی هەبێ جگە لەشیرك. زانایان فەرموویانە ئایەتی ﴿وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ – البقرة/١١٥﴾ ئایەتی ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ بەهۆی طوعمەی کوڕی ئوبەیریق هاتوونە خوارێ. ئەوە بوو کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کە بڕیاری لە ملدانی طوعمەی دا، هەڵات بۆ مەککەو لە ئایین هەڵگەڕایەوە، دوایی لەوێ کوژرا. پەروەردگار ئایەتی ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ تا دەڤطاتە ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ دەربارەی ئەو ناردە خوارێ.

﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ دڵنیابن خودا خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ دابنرێ، کەسێك شەریك بۆ خودا دابنێ خودا لێی خۆش نابێ، واتە: کەسێك بەبێ تۆبە کردن لەسەر ئەو گوناهە بمرێ، رەحمەتو لێخۆشبوونی خودا نایگرێتەوە. بەڵام ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء﴾ پەروەردگار ئەگەر مەیلی لێ بێ لە تاوانەکانی تر خۆش دەبێ – کەسێك تاوانی جگە لە شیرك –ی لێ روودابێ ئەوە دەکەوێتە بەر ویستو ئارەزووی خودا ئارەزووی لێ بوو لێی خۆش دەبێ ئارەزووی لێ نەبوو لێی خۆش نابێ.

چونکە هابەش پەیدا کردن بۆ خودا لە زوور هەموو تاوانێکەوەیە ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ کەسێك هاوبەشی بۆ خودا بە ڕەوا ببینێ ئەوە ڕێگای راستی لێ گوم بووە، زۆر لە حەقو راستی دوور کەوتۆتەوە، کەوتۆتە زەلکاوی

گومڕاییەوە، ڕۆشنایی لێ وون بووە، خۆی بە فەتارەت داوە خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بووە، خۆشبەختیو کامەرانی هەردوو جیهانی لەکیس چووە، چونکە هاوبەش دانان بۆ خودا گومڕاییەکە عەقڵو هۆش تێکدەدا، سەفای گیان لێڵ دەکا، هاوبەش پەیداکەر دەکاتە بەندەی ئەڵقە لە گوێی خەونو خەیاڵی پڕوپووچ، هاوەڵ دانان بۆ خودا ئەوپەڕی پیس بوونی گیانو چەواشە کردنی عەقڵە، مێشكو دڵو دەروونی هاوبەش پەیداکەر دەبێتە هێلانەی بیروبۆچوونی گەندەڵو خەیاڵی پڕوپووچ.

ئەم ئایەتە بەم دەقە لەگەڵ تۆزێك جیاوازی لەوەپێش رابووردو[1] بۆ مەبەستێکی تر هاتبوو لێرەدا جارێکی تر ئایەتەکەی دووبارە کردەوە چونکە شارەزایی کردنو ئامۆژگاری کردنی ئادەمیزادان لە روانگەی بەدەرخستنی مانای مەبەستو سەرەکیو جەخت لەسەر کردنی سوود بەخش دەبێ، دووبارە کردنەوەی ئەم دەقە لەم سوورەتەدا بۆ هەڵکەندنی رەگو ریشاڵی شیركو بتپەرستی بوو لە دەروونی ئادەمیزاددا، بۆ پاك کردنەوەی دڵە نەخۆشەکان بوو لەم شێرپەنجەیە، بەکورتی پوچەڵ کردنەوەی بیروباوەڕی شیركو بتپەرستی بە هەموو جۆرەکانیەوە سەنگەری دژایەتیو بەرامبەری کردنی ئیسلامە! کەوابوو چ رەخنەیەك لەم دووبارە کردنەوە ناگیرێ چونکە مەبەستەکە رواندنی بڕوا بە خواو هەڕەشە کردنە لە ئاکامی شەریك بۆ خودا دانانو دەرچوون لە یاسای سروشت کە پێچەوانەی داخوازی عەقڵو هۆشی ساغن لەگەڵ زانیاریدا یەك ناگرنەوە.

تیرمیذی دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئیمامی عەلی فەرموویەتی لە قورئاندا هیچ ئایەتێك بە ئەندازەی ئەم ئایەتە ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ... الآيَة﴾م لا خۆشەویست نیە.

بە کورتی تاوانی شەریك بۆ خودا دانان تاوانێکی هەرە گەورەو زێدەڕەوییە کە خودای مەزن بڕیاری لێ نەبوردنی لەسەر داوەو هەڕەشەی کردووە بەوە کە لێخۆشبوون لەو گوناهە نیەو نابێ هەرکەسێك موشریك بێو بەبێ تۆبە بە موشریکی بمرێ سزای دۆزەخەو هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە، لێخۆش بوون لە

[1] - سەیری ئایەتی (٤٨) بکە لەم سوورەتەدا.

تاوانی تر - جگە لە شیرك — ئەوە پابەندە بە ئارەزووی خوداوە؛ ئارەزووی لێ بوو خۆش دەبێ ئارەزووی لێ بوو خۆش نابێ. ئەو موشریکانە سەیرەکەیان لەوەدایە ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ إِنَاثًا﴾ کە تاعەت دەکەن، کە داوای ئەنجامدانی کارێك دەکەن، یان هاوار دەکەن، روو ناکەنە خودای بالا دەستو بە تواناو دەسەلات! بەڵکوو روو دەکەنە گۆڕی مردووێك کە تازە دەسەلاتی زەرەرو زیانی هیچی نەماوە! یان پەنا دەبەنە بەر یتە مێینەی وەکوو (لات)و (عوزا)و (مەنات)و ئەم جۆرە بتانە.

حەسەنی بەصری دەڵێ: (إناث) لێرەدا بە مانای هەر شتێك مردوو بێ‌و گیانی تێدا نەبێ، وەکوو بەردو دارە وشکەڵ! بێگومان لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا هەموو بنەماڵەو هۆزێك بتێکیان هەبوو: پێیان دەگوت: (أنثى بني فلآن).

یان هاوار دەکەنە فریشتەکان کە قورئان دەڵێ کافرەکان پێیان وابوو کچی خودان! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثًا — الزخرف/١٩﴾.

مامۆستا سەید قوطب دەفەرموێ: عەرەبەکان لەسەردەمی نەزانیدا پێیان وابوو: فریشتەکان کچی خودان ئەمجار هاتوون وێنەی ئەم فریشتانەیان لە بەردو دار دروست کردووەو ناوی مێینەیان لێ ناون وەکوو (اللآت، العزى، المناة)و ئەم جۆرە ناوانە، ئەمجار لە روانگەی ئەوەوە کە ئەم تیمسالانە نموونەو وێنەی کچی خودان پەرستوویانن بۆ ئەوەی بە خەیاڵی خۆیان لە خودایان نزیك بکەنەوە، ئەمە بیروباوەڕی سەرەتاییان بووەو بەم بۆنەوە پەرستشی بتەکانیان کردووە دوایی ئەم بنەما ئەفسانەو خورافاتەیان لە بیرچۆتەوەو خودی بتەکانیان پەرستووەو راستەوخۆ طاعەتی ئەوانیان کردووە.

ئا بەوجۆرە ئەو نەفامانەیان دارو بەردیان دەپەرست، یان شەیتان‌و ئەو جۆرە شتانەیان دەپەرست! کەلبی دەفەرموێ خێڵی (بەنو مولەیح) لە هۆزی خوزاعە جندۆکەیان دەپەرست کە شەیتانیش لەو توخمەیە!

بەلام لە واقیعدا ئەوانە بەردو دارو فریشتە ناپەرستن بەڵکوو ﴿وَإِن يَدْعُونَ إِلاَّ شَيْطَانًا مَّرِيدًا﴾ عیبادەت‌و پەرستش ئەنجام نادەن بۆ کەس جگە لە شەیتانێکی بەد

رەفتارو راهاتوو لەسەر لەخشتەبردنی ئادەمیزادان. کە ئەو ماکی هەموو شەیتانەکانەو سەرچاوەی هەموو خراپەو خراپەکاریەکە، ئەو وا لە ئادەمیزادان دەکا بتپەرستی بکەن، فریشتەکان بە خودا بزانن! کەوابوو: لە حەقیقەتدا ئەو خەڵکە شەیتان دەپەرستن و فەرمانبەرداری ئەون، ئەو شەیتانەی ﴿لَعَنَهُ اللّهُ﴾ خودا نەفرینی لێ کردووەو لە رەحمەتو بەزەیی خۆی دووری خستۆتەوە، سوکایەتی پێ کردووە، لەهەموو شتێك بێ رێزو بێ نرخترە، چونکە ئەو نەفرین لێ کراوە بانگەوازیکەری شەڕو فەسادەو بیروباوەڕی پڕوپووچو چەواشەکاری دەخاتە دڵو دەروونی ئادەمیزادەوە. بەشێك لە خراپەکاریو گومڕایی کردنو بانگەوازی کردنی بۆ چەواشە کاری ئەو نەفرین لێ کراوە ئەوە بوو سوێندی خواردو ﴿وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ وتی: پەیمان بێ لە بەندەکانت بەشی خۆم دابڕمو هەڵیان خەڵەتێنم بیان کەمە قوتابیو ئەڵقە لە گوێی خۆم، پابەندی فەرمانو ئامۆژگارییەکانم بن وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان لەسەر زوبانی شەیتان بۆمان دەگێڕێتەوە کە هەڕەشەی کردووە وتویەتی ﴿وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ – الحجر/٣٩ – ٤٠﴾ پەیمان بێ دەبێ هەموویان گومڕا بکەم جگە لە بەندە راستاڵەکانت، ئەوانەی خۆ دەخەنە پەنای تۆوەو بەڕاستی لێ دەبڕێن بۆ خوداپەرستی! دیارە ئەوانە من دەستم بەسەریاندا ناڕواو بۆم هەڵناخەڵەتێن. ﴿وَلأُضِلَّنَّهُمْ﴾ پەیمان بێ دەبێ رێگای راستیان لێ گوم بکەم، نەهێڵم بیروباوەڕی حەق بچێتە دڵو دەروونیانەوە بە هیوای پڕوپووچو بیروباووەڕی ناڕاستەوە خەریکیان بکەم ﴿وَلأُمَنِّيَنَّهُمْ﴾ لەززەت رابواردنی دونیایان لە پێش چاو شیرین دەکەم، رێگای گەڕانەوەو تۆبە کردنیان لێ دەگرمو هەڵیان دەخەڵەتێنم، پێیان دەسەلێنم کە جارێ زووەو وەختی تۆبە کردنیان نەهاتووە، تا لە کیسیان دەدەمو دەیانگەیەنمە حاڵەتی غەرغەرەو ئەو کاتەی کە دەرگای تۆبەیان لێ دەبەسترێ.

﴿وَلآمُرَنَّهُمْ﴾ فەرمانیان پێ دەکەم بە گومڕا بوون ﴿فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الأَنْعَامِ﴾ وایان لێ دەکەم دەبێماڵیاتو ئاژەڵی خۆیان نیشانەدار بکەنو تایبەتیان بکەن بۆ فۆتۆو قوربانی بتەکانیان کە دەهاتن وشتریان دەکردە (بەحیرە) گوێچکەیان دەبڕێ یان دەیانقەڵاشتەوەو دەیان کردە موڵکی بتەکانیانو ئیتر نەدەبوو کەس سواری ئەو

وشترە ببێ، یان باری لێ بار بکا، یان ئەگەر وشترێك (دە) سکی بکردایە هەموویان مێینە بوونایە ئیتر ئەو وشترە دەکرا بە (سائبة) و موڵکی تایبەتی بتەکان دەبوو، نەدەبوو کەس سواری بێ یان شیری بدۆشێو بیخوا، جگە لە بێچووەکەی خۆیو کەسێکی بێ هێز.

وشترێکیش ئەگەر نێرو مێیەکی بە سکێك ببوایە دەیانکردە (وصیلة) لەبەرخاتری بێچووە مێینەکە نێرەکەشیان سەر نەدەبڕی. نەدەبوو ئافرەتیش شیری بخواتەوە، بەڵام بۆ پیاوەکانیان ڕەوا بوو شیری ئەو جۆرە وشترانە بخۆنەوە.

مامۆستا شێخ (محمد عبده) دەفەرموێ: ئەم کردەوانەیان: واتە نیشانە کردنی وشترەکانیانو تایبەت کردنیان بە بتەکانیان لە پڕوپووچ ترین دابو نەریتی بتپەرستان بوو! بۆیە ئاوا بە تایبەتی باسی کرد، ئەگینا ئەمەش لە خانەی بیروباوەڕی پڕوپووچ گومڕایی بوون دایە[1].

﴿وَلآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللّـهِ﴾ فەرمانیان پێ دەکەم کە دروستکراوی خودا بگۆڕن، ئاژەڵیان بخەسێنن جەستەی خۆیان بکوتن بەتایبەتی دەستو پەلو دەمو چاویان کە جۆرەها وێنەو نیشانەی لێ دروست دەکەن بەهۆی کوتانەوە، دیارە ئەمەش گۆڕانکارییە لە دروست کراوانی خوداداو کارێکی حەرامە! چونکە ئەگەر گوێچکە بڕینی ئاژەڵ حەرام بێ ئەدی چۆن چاو هەڵکۆڵین یان لوت بڕینو داخ کردنو خەساندنو ئەم جۆرە کارانەی کە بڕێ فەرمانڕەواو دەرەبەگو پادشا ملهوڕو خوانەناس دەربارەی ئادەمیزاد کردوویانن ڕەوایە؟!

بەکورتی هەر کارێك شێوەی ڕوخساری سروشتی بگۆڕێو شەرع نەهی لێ کرد بێ ئەم ئایەتە دەیگرێتەوەو بە گۆڕانکاری کردن لە دروست کراوی خودادا حسێب دەکرێ، خاوەنانی شەش کتێبە حەدیثەکان حەدیسێك لە ئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕنەوە لای ئیمام ئەحمەدیش هەر بە صەحیح حسێب کراوە دەڵێ: «لَعَنَ اللّـهُ الْوَاشِمَاتِ، وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللّٰهِ عز وجل» ئەمجار دەڵێ: دەی نەفرین لەو کەسانە بێ کە پێغەمبەری خودا نەفرینی لێ

[1] - تفسير المنار ج٥/٤٢٨.

کردوون چونکە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی خودایە ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا – الحشر/٧﴾.

کۆمەڵێك لە راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: لێرەدا مەبەست بە (خلق الله) ئایینی خودایە واتە (خلق الله) دەق مانای (دین الله)یە ئەمە رای ئیبنو عەبباسیشە!! بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ – الروم/٣٠﴾ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم بارەوە دەفەرموێ: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ...» تاج/١ لا – ٢٧.

جا شەیتان ئەمە هەڵسوکەوتو رەفتاریەتی لەگەڵ ئادەمیزاددا چۆن دەبێ ئادەمیزاد بیکەنە گەورەو پشتیوانی خۆیان!!

خۆ ﴿وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا﴾ کەسێك شەیتان بکاتە وەلی و گەورەو خۆشەویستی خۆی، بە پێشەنگو رابەری خۆی بزانێو شوێنی بکەوێ، بێگومان خەسارەتمەندی دونیاو قیامەتە، لە هەموو حاڵێکدا بەدبەختو ماڵ وێرانە، بە هیچ شتێك ئەو خەسارەتەی بۆ پڕنابێتەوە. چی بکا باری لاربووی بۆ راست نابێتەوە! چ زیانێك لەوە گەورەترە ئامۆژگاری قورئان پاشگوێ بخاو شوێن شەیتان بکەوێ؟ واز لە رێبازی راستی قورئان بێنێو بچێتە سەر رێبازی زەلکاوی گومڕایی شەیتان؟!

شەیتانی نەفرین لێ کراو ﴿يَعِدُهُمْ﴾ بەڵێنی پڕوپووچو بێ بناخە دەدا بە پەیڕەوانی خۆی، بە شتی درۆو بێ بناخە هیواداریان دەکا! پێیان دەڵێ: ئەگەر لە ماڵو دارایی خۆتان ببەخشن هەژار دەکەون، ئەگەر بەرۆژو بن نەخۆش دەبن، پێیان دەڵێ: نوێژ کردن، خوداپەرستی دواکەوتوویە!! ﴿وَيُمَنِّيهِمْ﴾ لە هەمان کاتدا هیواداریان دەکا بە شتی پڕوپووچ، پێیان دەڵێ: قومار بکەن دەوڵەمەند دەبن، دزی بکەن، تەرازوبازی بکەن، دەستی ئەمو ئەو ببڕن ماڵو دارایی کۆدەکەنەوە خۆشبەختی دونیاو قیامەت بەدەست دێنن، بەم جۆرە چییان پێ دەڵێ درۆیە، چی وادەیان دەداتێ ئاکامی پێچەوانەیە، چی وادەو پەیمانێکیان پێ دەدا پووچو بەتاڵەو هەڵبەستراوو خەیاڵە، هەر لە چوارچێوەی وادە پڕوپووچەکانی شەیتانە هەموو

ئەو بانگەوازیو بانگەشەیەی کە لە ڕێی ئادەمیزادانی پەیڕەو کارانی شەیتانەوە ئاراستە دەکرێن! کە ئەوانیش هاوڕێی خراپو مامۆستای خائینو دایكو باوکی ناپەسەندە کە ئەمانەش بە دەوری خۆیان ڕێگای گومڕایی لە پێش چاوی خەڵك جوان دەکەن، کاری ناشیرینو بەد ڕەفتاری لە دڵی گوێ بیسانیاندا شیرین دەکەن، یارمەتیان دەدەن لە گومڕاییدا، پەیڕەوی پرۆگرامی گەندەڵی خۆیانو ڕاو بۆچوونی چەواشەکارییان بەناو خەڵکدا بڵاودەکەنەوە، پلەو پایەی خۆیانی پێ بەرز دەکەنەوەو خەڵکی دەکەنە پردو بەسەریدا دەپەڕنەوە! ئەم جۆرە قوتابیانەی شەیتان لە هەموو کاتو شوێنێکدا هەن.

جا کە شەیتان ڕاستەوخۆ یان ناراستەوخۆ وادەو بەڵێن دەدا بە پەیڕەوانی خۆی، لە ڕاستیدا هەڵیان دەخەڵەتێنێو فریویان دەدا، لە خشتەیان دەبا ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُورًا﴾ شەیتان جگە لە هەڵفریواندن چ بەڵێنێك نادا بە شوێنکەوتووانی خۆی، هەرچی پێیان دەڵێ: پێچەوانەیە، قازانجو سوودیان لەبڕێ شتدا بۆ دیاری دەکا کە ئەو شتانە پڕن لە ئێشو ئازارو زیان؛ زیناکەر، قومارکەر، عەرەق خۆر، کە پێی وایە لەززەت دەبینێ لە کارەکەی لە حەقیقەتدا لەزەتێکی کاتییەو بە شوێن ئەو خۆشییە کاتییەدا ئازارو ئێشو زیانی هەمیشەیی بۆ پەیدا دەبێ سەرەنجامی خراپو ماڵوێرانی لە دونیادا وێڕای سزای بە ئێشی قیامەتیان کە خودا نەبێ کەس نازانێ چۆنەو چەندە!!

ڕۆژی قیامەتیش کە ڕێڕەوانی ڕێبازی شەیتان، هەڵخەڵەتاو گومڕیان بە چاوی خۆیان واقیعەکە دەبیننو هەست بە خەسارەتمەندی خۆیان دەکەن دەیانەوێ فشار بۆ شەیتان بێننو دەکەونە سەرزەنشتیو لۆمە کردنی، وڵامی شەیتان بۆ ئەوانە ئەوەیە: کە قورئان تۆماری کردووە بەم بەڵگە بە هێزە بۆریان دەداو ئیتر قسەیان نامێنێ دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ إِنَّ اللّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلاَّ أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي – إبراهيم/٢٢﴾.

ئاکامی ئەو هەڵخەڵەتاوانە، ئەوانەی بە قسەو وادەو بەڵێنی شەیتان فەریویان خواردووە ئاگری دۆزەخە ﴿أُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلاَ يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا﴾ بەڵێ

ئەوانە ئاوا بە وادەو بەڵێنی شەیتان هەڵخەڵەتان، خانەی دوایی‌و شوێنی مانەوەی هەتاهەتاییان ئاگری دۆزەخە، هیچ شتێك نیە ئەوان لەو سزا بە ئێشە رزگار بکا، کەسیان دەست ناکەوێ لەو ئاگرە بیانپارێزێ، هیچ چارێکیان بۆ ناکرێ هەڵ دەرژێندرێنەوە نێوی! دەمو چاو دەست‌و قاچو بەرو پشتیان بەو ئاگرە سوور دەکرێتەوەو هەڵدەپرووزێن‌و دەبنە خەڵوزو جارێکی تر پێستیان بۆ تازە دەکرێتەوەو سەرلەنوێ دەسوتێندرێنەوە..... هتد.

دیارە هەموو کاتێکیش کۆمەڵێك هەن بە وادەو بەڵێنی شەیتان هەڵ ناخەڵەتێن‌و گوێ بۆ فەرمان‌و نەهییەکانی ناگرن؛ ئەوانە کۆمەڵی خوداپەرست‌و خودا پێداون، بۆیە دوابەدوای سەرەنجام‌و ئاکامی هەڵخەڵەتاوان‌و پابەندانی رێبازی شەیتان ئاکامی خوداپەرستانیش دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بە خوداو بە پێغەمبەرو بەرنامەی خوداو بە رۆژی قیامەت هێناوەو پابەندی فەرمان‌و نەهی پەروەردگارن، رازین بە قەزاو قەدەری خودا، وێڕای ئەو بڕوا تۆکمەیەیان کردارو گوفتاریشیان باشە، خێرخوازو خێرۆمەندن‌و چاکەخوازو فەرمانبەردارن، چییان لێ یاساغ کراوە توخنی ناکەون لێی دوورە پەرێزن ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ ئەوانە خودا دەیانخاتە ناو چەند باخ‌و باخاتێکی رازاوەو دڵگیر کە بە ژێر دارەکانیاندا جۆگەو جۆباری روون‌و رەوان دەکشێن، ئەوانە بە ئارەزووی خۆیان بەناو ئەو باخانەدا دەگەڕێن، لە کوێیان بوێ لەوێ هەوار هەڵ دەدەن، مانەوەیان لەو بەهەشتەدا هەتا هەتاییەو بەردەوام تێیدا دەمێننەوە ئەوەش ئەوپەڕی بە مراد گەیشتن‌و پێگەیشتنە، ﴿وَعْدَ اللّهِ حَقًّا﴾ ئەوە بەڵێن‌و وادەی خودایە، بەڵێن‌و وادەی خودا هەرگیز پێچەوانە نایەتە دی‌و چۆنی وادە داوە ئاوا دێتە دی ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ قِيلاً﴾ کێ لە خودا راست بەڵێن ترە؟! کێ وەکوو خودا وادە دروست‌و کارسازە؟! بێگومان کەس هێندەی خودا بەڵێن دروست‌و وادە دروست نیە، چونکە خودا کەرەم‌و رەحمەت‌و فەضل‌و ئیحسانی دەریای بێ بنەو بڕانەوەی نیە، بەسەر هەموو شتێکدا باڵا دەستەو هیچی لێ عاسی نابێ، چی بوێ دەیکا، چی بوێ دەیدا! بە پێچەوانەی وادەو بەڵێنی شەیتان کە هەمووی درۆو دەلەسەو هەڵخەڵەتاندن‌و

فریودانە. بەڵێ کەس لە خودا هەواڵ راستر نیە، هەر خۆی شایەنی خودایەتیو پەروەردگاریەتییە! جگە لە ئەو خودای بە حەق نین!

ئیمامی تیرمیذی حەدیسێك ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە وتارەکەیدا دەیفەرموو «إنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ وَأَحْسَنَ الْهَدْىِ هَدْىُ مُحَمَّدٍ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ». تاج/١ لا — ٥٣ فەرموودەی چوارەم.

١- تێبینی ئەوە دەکرێ کە نەفرین کردن لە شەیتان بەتایبەتی دروستە، هەروەها نەفرین کردن لەو کەسانەی کە بە کافری مردوون وەکوو فیرعەونو ئەبو جەهلو هامانو ........ دروستە!

بەڵام بە شێوەی شەخصیو دیاری کراو دروست نیە نەفرین لە کافری زیندوو بکرێ! وەڵێ بە شێوەی گشتیو تێکڕا دروستە لە پاساوی کوفرو بێ دینییەکەیاندا نەفرینیان لێ بکرێ! هەروەها دروستە نەفرین لە ستەمکاران بە شێوەی گشتی بکرێ، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿أَلاَ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ — هود/١٨﴾ هەروەها دروستە نەفرەت لە یاخی بوانو سەرپێچیکەران بکرێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ»[1] دیارە ئەمانەش هەر بە شێوەی گشتی نەك بەشێوەی تایبەتیو شەخصی!!

٢- دەربارەی خەساندنی ئاژەڵ زانایانی شەرع بە ڕەوایان داناوە، ئەگەر مەبەست لە خەساندنەکە سوودی خاوەن ئاژەڵەکە بێ! وەکوو قەڵەوی یان رام بوونی بێ بۆ ئیش کردنو وەکوو ئەوە جوانەگا دەخەسەێندرێ بۆ ئەوەی جووتی پی بکرێ.

بەڵام خەساندنی ئادەمیزاد حەرامە، چونکە ئازارێکی هەیە زۆرجار سەردەکێشێ بۆ مردنو وەکوو ئەتك کردن وایە. جگە لەوەش کە پێغەمبەر (درووی خوای لەسەر بێ) نەهی لێ کردووە؛ زیاد لەوەش سەردەکێشێ بۆ گەرا

[1] - رواه أحمد والشيخان والنسائى وابن ماجة عن أبي هريرة.

بڕینەوەو کابرا منداڵی لێ نابێ‌و بە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر دەبێ کە فەرموویەتی: «تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ» تاج الأصول ج٢/ ٢٨٣.

٣- دەربارەی داخ کردن‌و نیشانە کردنی ئاژەڵ بە مەبەستی ناسینەوەو جیاکردنەوەی لە ئاژەڵی تر ئەوە نەهییەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نایگرێتەوە لە صەحیحی موسلیمدا حەدیسێك دەگێڕنەوە: ئەنەس ریوایەتی کردووە دەڵێ: «رَأَيْتُ فِي يَدِ رَسُولِ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– الْمِيسَمَ وَهُوَ يَسِمُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ والفيء وغير ذلك حتى يعرف كل مال فيؤدي في حقه، ولا يتجاوز به الى غيره».

بەدەستی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) داخێکم بینی، وشتری زەکات‌و وشتری تالانی جەنگ‌و وشتری تری پێ داخ دەکرد، هەر جۆرەی لە شوێنێکی لەشیا داخی دەکرد، هەتا بەو شێوە وشترەکان بناسرێنەوەو جیا بکرێنەوە، کە هی زەکاتن، یان هی تالا نین، یان هی شتی ترن، هەتا هەر جۆرەی بدرێ بە پێشیاوی خۆی‌و نەدرێ بە کەسێ تر.

## بەهەشت بە هەوانتە دەست ناکەوێ، بە کردەوەو ئیمانی ساغ دەست دەکەوێ

﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ

مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا ﴿١٢٦﴾﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا رۆڵی شەیتانی روون کردەوە، لەوەدا کە بەڵێن‌و وادەی درۆ بە پەیرەوانی دەدا، بێگومان ئەو ختە ختو وەسوەسەیە، یان ئەو بانگەشەو فرتو فێڵەی قوتابییەکانی ئەنجامی دەدەن، بەناو خەڵکدا بڵاوی دەکەنەوە، کاریگەرییەکی کەم تا زۆری دەبێ لە دەروونی خاوەن نامەکان؛ (أهل الکتاب)و بڕێ موسوڵمانی بڕوا لاوازو تێنەگەیشتوودا، کەوابوو: گونجاوە کە لێرەدا کاریگەری ئەو هیواو ئاواتە شەیتانییە روون بکاتەوە، لەتەك ئەوەشدا، گرنگی کردەوەی باش‌و پاداشی دیاری بکا.

ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم لە سوددییەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: چەند موسوڵمانێك‌و چەند جوولەکەیەك‌و چەند مەسیحییەك لە شوێنێکدا بەیەك گەیشتن‌و لێیان بوو بە مقۆ مقۆ، جوولەکەکان بە موسوڵمانەکانیان گوت: ئێمە لە ئێوە باشترین، ئایینمان پێش ئایینی ئێوەیە، کتێبی ئاسمانیمان پێش کتێبی ئێوەیە، پێغەمبەرەکەشمان پێش پێغەمبەری ئێوەیە، ئێمە لەسەر ئایینی (ئیبراهیم)ین کەسێکیش جوولەکە نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە! مەسیحییەکانیش هەمان قسەو باسیان کرد، موسوڵمانەکانیش وتیان:

کتێبی ئاسمانی ئێمە دوای کتێبی ئێوە هاتووە، پێغەمبەری ئێمە دوای پێغەمبەری ئێوە هاتووە، فەرمانتان پێ کراوە کە واز لە ئایینی خۆتان بێنن ئایینی ئێمە قەبووڵ بکەن، ئێمە لە ئێوە باشترین، ئێمە لەسەر ئایینی ئیبراهم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاقین، کەسێك لەسەر ئایینی ئێمە نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە.. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ﴾ پاداش‌و چوونە ناو بەهەشت‌و بەختەوەری دونیاو قیامەت بە گوێری پێ خۆش بوون‌و هیواو ئاواتی ئێوە نیە.

﴿وَلا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ بە گوێری هیواو ئاواتی جوولەکەو مەسیحییەکانیش نیە، بەم جۆرە ئەو قاعیدە توکمە نەگۆڕەی ئیسلام دووپات دەکاتەوە، قاعیدەو یاسایەکی گشتی‌و هەمیشەیی، یاسای کردەوەو پاداش، کەواتە: پاداش‌و خۆشبەختی دوارۆژ بە گوێرەی هیواو ئارەزووی ئێوە نیە، پاداش‌و چوونە ناو بەهەشت بە گوێرەی بنەمایەکی دامەزراوو قانون‌و یاسایەکی نەگۆڕ پەیرەو دەکرێ، قانون‌و یاسایەك هەموو گەل‌و نەتەوەیەك لەبەرامبەریدا یەکسانن لەو یاسایەدا، کەس خزمی خودا نیە، بەڵکوو هەموو کەسێك بەندەی خودایە، کێ زیاتر بەندایەتی بکا، ئەوە رێزی زیاترە، چی بچێنی ئەوە دەدورییەوە ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ﴾، لەبەر خاتری کەس ئەو قانوونە ناگۆڕدرێ! قانوونەکە ئەوەیە: خراپەکار سزا دەدرێ‌و چاکەکەر پاداشی دەدرێتەوەو کەس ستەمی لێ ناکرێ.

گەورەیی ئایین‌و رێزداری‌و رزگار بوون‌و سەرفیرازی پەیرەوانی ئایین بەوە نابێ یەکێ بڵێ: ئایینی من باشترو تەواوترە، بەڵکوو پێویستە بە گوێرەی ئایینەکەی کار بکاو کردەوەی باش ئەنجام بدا، چونکە پاداش لەسەر کردەوە دەبێ، بە هیواو ئاوات هیچ شتێك نایەتە دی، نە رزگار بوونی ئێوەی موسوڵمان‌و نە رزگار بوونی خاوەن نامەکانی تر بە هیواو ئاواتی بێ کردەوە نابێ، ئایین بۆیە نێردراوە کاری پێ بکرێ، نەك بۆ خۆهەڵکێشان‌و خۆ هەڵنان‌و شایی بە خۆبوون.

ئەوەش بزانن باشترین ئایین ئایینی ئیسلامە، کە ئایینی راستەقینەی ئیبراهیمە، باشترین کرداریش ئەوەیە: ئیحسان ئامێز بێ، ئیحسانیش ئەوەیە: کە خوداپەرستی دەکەیت وای بکەی کە خوات لێ دیارە، خۆ ئەگەر تۆ خودات نەبینی بێگومان ئەو چاوی لە تۆیە... ئیحسان لە هەموو شتێکدا پێویستە، تەنانەت لە سەربڕینی ئاژەڵیشدا پێویستە، کە کێردەکەی تیژ بێ بۆ ئەوەی ئەزیەتی سەربڕاوەکە نەدا.

ئەمەیە قانونی پەروەردگار ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ﴾ هەرکەسێك خراپەیەك بکا تۆڵەی لێ دەستێندرێتەوە، چونکە سزا بە گوێرەی داب‌و نەریتی خودایی ئاکامێکی سروشتییە بۆ کردەوە لە سۆنگەی کردارەوە پەیدا دەبێ، جا کەسێك خراپە بکاو شیاوی سزا بێ ﴿وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِن دُونِ اللّهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا﴾ جگە لە خودا

کەسی تر نیە بتوانێ ئەو سزایەی لەسەر لاباو لێی خۆش بێ، کەس نیە یارمەتی بداو لەو سزایە رزگاری بکا، نە ئەو پێغەمبەرانەی ئێوە خۆیان پێوە هەڵدەکێشن دەتوانن سزاکەتان لەسەر لابەرن نە ئەو شتانەی کردووتانن بە خوداو هومێدتان پێیان هەیە، هەموو ئەوانە هیواو ئاواتی سەوزن‌و لە خەون‌و خەیاڵ بەولاوە هیچی تر نین.

دەگێڕنەوە دەڵێن کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ حەزرەتی ئەبوبەکر تینی لێ پەیدا بوو، پرسیاری لە پێغەمبەر کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! جا کێ لەمە رزگاری دەبێ!! کێ هەیە خراپەیەکی نەبێ؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: تۆ لە ژیانی رۆژانەتدا خەفەتبار نابی؟ نەخۆش ناکەوی؟ تووشی بەڵاو دەردی سەری نابی؟ وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانەم تووش دێن، فەرمووی: دە ئەوە تۆڵەو سزاکەیە!

ئیمامی موسلیم‌و کەسانی دیکەش لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە دەڵێن: کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: لەسەرشانی موسوڵمانان زۆر قورس بوو، هی وا هەبوو بە تەواوی تینی بۆ هات، چوونە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)و نارەحەتی خۆیان دەربڕی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: «سَدِّدُوا وَ قَارِبُوا، فَإِنْ كُلَّ مَا أَصَابَ الْمُسْلِمَ كَفَّارَةٌ حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُهَا وَالنَّكْبَةُ يُنْكَبُهَا» واتە: رێگای راست بگرنە بەرو بەردەوام‌و دامەزراو بن لەسەری میانڕەوی‌و مام ناوەندی بن لە ئیش‌و کارو هەڵوێستاندا، دڵنیابن هەرچی دووچاری موسوڵمان دەبێ دەبێتە کەفارەتی گوناهی، تەنانەت چقڵێ دڕکێ بە پێیدا بچێ، یان کە هەڵدەنگوێ، هەڵدەخلیسکێ ئەوە سزای خراپەیەکە کە ئەنجامی داوەو دەبێتە کەفارەتی.

فەرموودەی پێغەمبەر لەم بارەوە زۆرن، بۆیە زۆربەی زانایان پێیان وایە: کە نەخۆشی‌و بەڵای دونیایی دەبنە کەفارەتی گوناه.

بڕێکیش پێیان وایە: کە مەبەست لەوە توشبوونی دەردو بەڵاو کارەسات دەبێتە کەفارەتی گوناه ئەوەیە کە کاریگەرییان لە دڵ‌و دەروونی کابرادا دروست بکەن‌و ببنە هۆی بەهێزبوونی بیرو باوەڕی راست‌و ئارەزووی کردنی کردەوەی چاکی تێدا دروست بکاو هەڵی بنێ بۆ راستاڵی‌و رەفتار چاکی‌و بەندایەتیکردنی

خودا. هەر لە روانگەی ئەم یاساو قانوونەوە بەگوێرەی تەرازووە خوداییەکە؛ دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى﴾ کەسێك کردەوەی چاك بکاو دڵو دەروونی خۆی باش بکا، جا ئەو کەسە نێرینە بێ یان مێینە بێ، بەڵام بەمەرجێك ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ ئەو خاوەن کردەوەیە خاوەن بیرو باوەڕبێ، موسوڵمانی راستاڵ بێ، ﴿فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا﴾[1] ئەوانە دەخرێنە ناو بەهەشتەوەو پاداشی خۆیان دەدرێتەوە بەبێ ئەوەی بە ئەندازەی ئەو خاڵە چاڵە بچکۆلەیەی کەوا لەسەر ناوکی دەنکە خورما هەیە ستەمیان لێ بکرێ لێیان کەمبکرێتەوە!

واتە: کەمترین شت لەپاداشیان کەم ناکرێتەوە کەوابوو رێگای بەهەشتو خۆشبەختیو کامەرانی هەردوو جیهان کردەوەی چاكو هەبوونی بیرو باوەڕی راستو دروست رێگای دۆزەخو بەدبەختی هەردوو دونیا کردەوەی خراپە، هیچ کاتێك خۆهەڵاوەسێن بەگەلو نەتەوەیەك، بە بنەماڵەو خانەوادەیەك، بە پێغەمبەرو پیاو چاکانەوە، نابێتە هۆی رزگاربوون لەدۆزەخ! ئەوەی ئادەمیزاد رزگار دەکا لەدۆزەخ کردەوەی چاكو بیرو باوەڕی راستو پابەندبوون بە شەریعەتی خوداوەیە... ئەمجار پاش روونکردنەوەی ئەم حەقیقەتەو دەستنیشانکردنی ئەو تەرازووە ورد خوێنو وردبینە. پلەو پایەی خاوەن باوەڕان دیاری دەکاو پێناسەی موسوڵمانی راستاڵو بەندەی گوێڕایەڵی خودامان پێ نیشان دەداو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا﴾ کێ ئایینو بیرو باوەڕی جوانترو راسترە؟ ﴿مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله﴾ لەو کەسە کە بەتەواوی رووی لەخودابێ دڵو دەروونی جگە لە خۆشەویستی خوداو ئایینی خودا هیچی تری تێدانەبێ، جگە لەخودا داوای نزا لەکەسی تر نەکا، جگە لەخودا کەسی تر بەشیاوی خودایەتی نەزانێ، بەندایەتی هەر بۆ خودا بکا، وێڕای ئەوەش بە ئیخلاصو بەدڵ بڕوای زاتیو سرووشتی تەواوی هەبێ ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ کردار چاكو گوفتار راستو شیرین رەفتاربێ، لەخراپەو خراپەکاری دووربێ! رەفتارو رەوشتی قورئانی بێ ﴿واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا﴾ پەیڕەوی ئایینی

---

[1]- النقير: النكتة (خاڵ) في ظهر النواة.

پاك‌و پیرۆزی ئیبراهیم (عَلَيهِ السَلام) بکا کە بناغەی ئایینی ئیسلامەو ئایینێکی میانڕەوو دوور لەهاوەڵ دیاریکردن بۆ خودایەو بەرییەو پاکە لەبت پەرستی‌و بت پەرستان! ڕێڕەوی ئایینی ڕاست کە ئایینی ئیسلامە ئەمەیە کە لە ئایەتەکەدا دیاریکراوە وەکوو خودا دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاء مِّمَّا تَعْبُدُونَ، إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ – الزخرف/ ٢٦-٢٧﴾. یان دەفەرموێ: ﴿بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ – البقرة/١٣٥﴾.

ئیبراهیم یەکێکە لە بەندە ڕاستاڵەکانی خودا، ڕێزو پلەو پایەی تایبەتی لای خودا هەیە ﴿وَاتَّخَذَ اللّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾ پەروەردگار ئیبراهیمی هەڵبژاردووە ڕێزو پلەو پایەیەکی داوەتێ دەشوبهێ بە خۆشەویستی دۆست بۆ دۆست!! جا کەسێك ئەوەندە لای خودا ڕێزدار بێ، ئەوەندە نزیك‌و خۆشەویست بێ، خودا کردبێتی بە دۆستی خۆی شیاوی ئەوەیە کە ئایینەکەی پەیڕەو بکرێ‌و شوێن ڕێبازی بکەون، بەکورتی پەروەردگار فەضل‌و بەخششی خۆی ڕژاند بەسەر ئیبراهیمدا؛ سرووشت چاك‌و بڕوا پاك خاوەن ژیری‌و گیانی خاوێن، خوناس‌و تەقواکار بوو، وەرە بەرزو چاو نەترس بوو بۆ دژایەتیکردنی شیرك‌و بت پەرستی! بەجۆرێك کە پلەی (أولوا العزم)ی پێ دراوە، دۆستی یەزدان‌و دوژمنی شەیتانە.

ئەمجار وێدەچێ بڕێ کەس لەمانای ئایەتی پێشوو گومانێکیان بۆ پەیدابێ‌و بڵێن: مادام ئیبراهیم دۆستی خودایە دەبێ لێکچوون‌و نزیکییەکیان لە زات‌و سیفاتدا هەبێ؛ ئیتر پەروەردگار بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانە نابەجێیە، ئەوە ڕوون دەکاتەوە: کە هەرچی لە ئاسمان‌و زەویدا هەیە؛ هەرچی پلەو پایەیەکی هەبێ، چەند جیاوازی هەبێ لەبەندەکانی تر لەڕووی ڕەوشت‌و بیرو باوەڕەوە، لەبەرامبەر خودادا بەندەیەکی گەردن کەچەو فەرمانبەرداری زاتی بێ چوونە!

بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلِلّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَكَانَ اللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطًا﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەیە مولکی خودایە، وەهەموو کەسێ، لەهەرکوێیە بێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: هەر پلەو پایەیەکی هەبێ بەندەو دروستکراوی خودایە، هەر خودا بۆ خۆی کارگێڕو هەڵسوڕێنەری هەموو بوونەوەرە، هەرچی بڕیاربدا جێبەجێ دەکرێ‌و کەس نییە بەرگری بکا، کەس

نییە بتوانێ حوکمی ئەو، بڕیاری ئەو، پووچەڵ بکاتەوە؛ چی بکاو چۆن بکا کەس نییە بتوانێ بڵێ: بۆ وات کرد؟ بۆ وات نەکرد؛ کێ زات دەکا ئەو پرسیارەی لێ بکا؟!!

گەورەییو بەتواناییو باڵا دەستیو دادپەروەریو داناییو لوطفو ڕەحمەتی بەجۆرێکە کە هەرچی دەیکا، هەرچی بڕیاربدا لێی باشتر نییە، جگە لەویستی ئەویش هیچی تر نایەتەجێو ناشبێ بێتەجێ، زانیاری ئەو وێڕای دەسەڵاتو توانای هەموو شتێکیان داگرتووە، لە ئاسمانو زەویدا هیچی لێ هوون نابێ، تەنانەت بە ئەندازەی میثقالە زەڕەو کەمتریش لەئەو یان گەورەتر لە میثقالە زەڕەش لە زانستی خودا گووم نابێ؛ جا خودایەك ئاگاداری هەموو کردەوەی بەندەکانی بێ، سزاو پاداشتیان بداتەوە لەسەر کردەوەکانیان؛ چاکە بەچاکە خراپە بەخراپە، پێویستە ئەو بەندانە ڕێبازێك هەڵبژێرن کە پەسەندی ئەو خودایەبێ، بۆئەوەی بەختەوەری هەردوو جیهانیان بۆ دەستەبەر ببێو بە نەفرەتو فێڵی شەیتانو قوتابیانی هەڵنەخەڵەتێن!

## سەرپەرشتیاری هەتیوان، ڕێکخستنەوەی ژنو مێردی لێك زوویر بوو

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾ وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ

عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًاۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْۖ فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ ﴾.

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ...﴾ وەكوو زانیمان ئەم سوورەتە؛ سورەتی (ألنساء)، دوو باسی گشتیو گرنگی لەخۆ گرتوون، یەکەمیان حوکمەکانی ئیسلام دەربارەی ئافرەتو هەتیوو خزمایەتیو میراتگرتنو زاواو خەزوری، دووەم روونکردنەوەی بنەماکانی ئایینو حاڵو چۆنیەتی (أهلی کیتاب) جوولەکەو مەسیحییەکانو دووڕووەکانو باسی جیهادو شەڕ کردن لەگەڵ خوانەناساندا ئەمجار لێرەدا دێتەوە سەر روون کردنەوەی بڕیارو حوکمەکانی ئیسلامی دەربارەی ئافرەتو هەتیوو زەبوونەکانو پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ژنو مێردو دادپەروەریی کردن لە نێوان ژنەکاندا بۆ کەسێك کە زیاد لە ژنێکی هەبێ!

مامۆستا سەید قوطب دەفەرموێ: ئایەتەکانی سەرەتای ئەم سوورەتە بڕێ پرسیاری دەربارەی ئافرەت هێنایە پێشەوە دیاردەی پرسیار کردنی موسوڵمانانو هەوڵدانیان بۆ زانینی ئەحکامی ئیسلامی دەربارەی لایەنەکانی ژیانیان مانایەکی تایبەتیان دەبەخشێ لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا کە تازە پێك هاتبوو، لێکدانەوەی حەزو ئارەزووی موسوڵمانەکانیش بوو دەربارەی زانینی حوکمو یاسای ژیانیان:

عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ ﴾.

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ...﴾ وەكوو زانیمان ئەم سوورەتە؛ سورەتی (النساء)، دوو باسی گشتیو گرنگی لەخۆ گرتوون، یەکەمیان حوکمەکانی ئیسلام دەربارەی ئافرەتو هەتیوو خزمایەتیو میراتگرتنو زاواو خەزوری، دووەم روونکردنەوەی بنەماکانی ئایینو حاڵو چۆنیەتی (أهلی کیتاب) جوولەکەو مەسیحییەکانو دووڕووەکانو باسی جیهادو شەڕ کردن لەگەڵ خوانەناساندا ئەمجار لێرەدا دێتەوە سەر روون کردنەوەی بڕیارو حوکمەکانی ئیسلامی دەربارەی ئافرەتو هەتیوو زەبوونەکانو پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ژنو مێردو دادپەروەریی کردن لە نێوان ژنەکاندا بۆ کەسێك کە زیاد لە ژنێکی هەبێ!

مامۆستا سەید قوطب دەفەرموێ: ئایەتەکانی سەرەتای ئەم سوورەتە بڕێ پرسیاری دەربارەی ئافرەت هێنایە پێشەوە دیاردەی پرسیار کردنی موسوڵمانانو هەوڵدانیان بۆ زانینی ئەحکامی ئیسلامی دەربارەی لایەنەکانی ژیانیان مانایەکی تایبەتیان دەبەخشێ لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا کە تازە پێك هاتبوو، لێکدانەوەی حەزو ئارەزووی موسوڵمانەکانیش بوو دەربارەی زانینی حوکمو یاسای ژیانیان:

بێگومان ئەو لەرزەو هەژاندنەی کە وەرسوڕان لە دابو نەریتی نەزانییەوە بۆ ژێر سایەی ئیسلام لە دڵو دەروونی ئەو موسوڵمانانەدا هێنایە دی هەژاندنێکی بە هێز بوو لەرزاندنێك بوو لە ناخەوە سەری هەڵدا! بە جۆرێك ئەو موسوڵمانانە لە هەموو دابو نەریتێکی سەردەمی نەزانی کەوتبوونە گومانەوە، لەوە دەترسان کە ئیسلام سڕیبنیەوە یان گۆڕانکاری تێدا کردبن، بۆیە هەوڵیان دەدا بزانن: حوکمی ئیسلام دەربارەی هەموو هەڵس‌وکەوتێکی ڕۆژانەیان چۆنەو چۆن نیە؟؟ نا ئەم دڵ وشیاریو بە پەرۆش بوونەیان بۆ ئەوەی هەموو کاروبارێکیان لە چوارچێوەی حوکمی ئیسلامدا بێو لەگەڵ ناوەڕۆکی ئایین یەك بگرنەوە دیاردەیەکی ڕوونو ئاشکرای ئەو سەردەمە بوو هەرچەندە هەندێ ماکی ئایینی کۆنی سەردەمی نەزانی – لە بڕێ موسوڵماندا بەدی دەکرا! بەڵام گرنگ ئەوە بوو: تێکڕا هەوڵی ئەوەیان دەدا کردارو گوفتارو ڕەفتاریان لە بازنەی حوکمە ئیسلامییەکان دەرنەچێو لەبەر ڕۆشنایی تیشکی ئەو ئایینەدا خۆ ئارایش بدەنو لەو یاساو حوکمانە دەرنەچن.

بێگومان موسوڵمانان لە ناخەوە هەستیان بەوە دەکرد کە پێویستیان بە زانینی حوکمی ئیسلامی هەیە، چونکە ئەو حوکمانە یاسای ئایینی تازەیان بۆ پێك دەهێنانو بە گەرمو گوڕییەوە هەوڵی ئەو زانیاریانەیان دەدا، مەبەستیشیان ئەوە بوو: حوکمی ئایینەکەیانو واقیعی ژیانیان هاوتەرازوو بن، ئەوان تازە لە دابو نەریتی نەزانییەوە هەڵکەندرابوونو وازیان لەو بیروباوەڕە کۆنو مێژووی باوكو باپیری خۆیان هێنا بوو، مەیلو سۆزێکی دابو نەریتی ئەو سەردەمەیان لە مێشکدا بوو، لە هەمان کاتیشدا لە ناخەوە هەستیان بە گرنگی ئەم گۆڕانکارییە سەرتاسەرییە دەکرد کە ئیسلام بەرپای کردبوو.

ئالێرەدا پاداشی ئەو هەوڵدانو حەز لە پرسیار کردنەیان دەردەکەوێ بەروبوومی ڕاستگۆییو سووربوونیان لەسەر هەوڵدان بۆ زانینی حوکمەکانی ئیسلام نومایان دەبن، ئەوەتا پەروەردگار، یەزدانی پاك بۆخۆی وەڵامی پرسیارەکانیان دەداتەوە ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاء ....... قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ﴾.

ئیمامی بوخاری (رَضيَ اللهُ عَنهُ) حەدیسێك دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە (ڕەزای خودای لێ بێت) کە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: ئەوە ئەو پیاوەیە؛ کە

کچەتیوی خزمو منداڵی دەکەوێتە لا، هەم میراتگریەتی هەم سەرپەرشتیاریەتی، کچەتیوەکە ماڵو سامانی هەیەو تێکەڵاو بە ماڵو سامانی پیاوە میراتگرەکەی بووە، پیاوەکە بووەتە هاوبەشی لە ماڵەکەدا، کچەکە وەختی شووی دێ پیاوەکە بۆخۆی لەبەر هەر هۆیەك بێ نایەوێ مارەی بکاو بیکاتە خێزانی خۆی، یان هی کوڕی، لەبەر ماڵو سامانەکەشی نایدا بە کەسێکی بێگانەو ڕێی شوو کردنی لێ دەگرێ، ئەم ئایەتە بەو بۆنەوە هاتۆتە خوارێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە سوودیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: جابیر کچە مامێکی ناشیرینی هەبوو، ئەو کچە ماڵو سامانێکی زۆری لە باوکییەوە بۆ بەجی مابوو، جابیر بۆخۆی نەیدەویست مارەی بکا، نەشی دەدا بەشوو بەکەسانی تر، نەوەکوو مێردەکەی ماڵەکەی بەرێ، جابیر لەم بارەوە پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کردو ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: کە دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ﴾ ئەی پێغەمبەر! داوای فەتوات لێ دەکەن دەربارەی ئافرەتانو مافی گشتیان، مافی ژنو مێردایەتییان، مافی دارایی‌و مافی ڕەفتار کردن لەگەڵیانداو بە یەکسانی‌و بەیەك چاو لە کاروبارەکاندا تەماشا بکرێن لەگەڵ پیاواندا، یەکسانی کردن لەگەڵیاندا لە هەڵس‌و کەوتو پێکەوە ژیانو چارەسەری‌و لێك زویر بوونو کێشەو سەرپێچی ئافرەتو ئەم جۆرە شتانە ﴿قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ﴾ بڵێ: خودا فەتواتان بۆ دەدا، ئەم بابەتانەتان بۆ روون دەکاتەوە، بڕیاری ڕاستو دروستتان لە بارەی ئافرەتەوە بۆ دیاری دەکا! هەروەها ﴿وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لاَ تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ لەم قورئانەی کە بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە حوکمو بڕیاری تریشتان فێر دەکەینو ڕێگای ڕاستتان بۆ روون دەکەینەوە، دەربارەی ئەو ئافرەتە هەتیو چەتیوانەی کە ئێوە میراتی دیاری کراوی خۆیان پی نادەن، ئەو بەشە میراتەی کە بۆیان دیاری کراوە، ئێوە جڵەوگیریان لێ دەکەنو نایان دەنێ، مافی شوو کردنی بە ئارەزووی خۆیان لێ قەدەغە دەکەنو ناهێڵن بە ویستو خواهیشتی خۆیان شوو بکەن!

ماڵی هەتیوان داگیر دەکەن‌و نایان دەنەوە؛ خۆتـان دەپـارێزن لـەو کـچەتیوانەی کە میراتگرو سەرپەرشتیاریانن؛ نە بۆخۆتان مارەیان دەکەن، نە دەیان دەن بە شوو بە کەسانی تر!

﴿وَتَرْغَبُـونَ أَن تَنكِحُـوهُنَّ﴾ دەتانـەوێ ئەگـەر جوان بـن ماڵیـان هـەبێ مارەیـان بکەن، ئەگەر ناشیرین بوون خۆتان مارەیـان نەکـەن‌و لەبـەر خـاتری ماڵەکـەیان بـە شووشیان نەدەن!!

داب‌و نەرتی سەردەمی نەزانیتان وابوو کە ئەو کچە هەتیوانـەی دەکەونـە ژێـر سەرپەرشتیاریتانەوە میراتی دیاری کراوی خۆیانیان نـەدەنێ! ئەگـەر جوان بـوون‌و بەدڵتان بـوون دەتانـەوێ لـە خۆتانیـان مـارە بـبڕن، ئەگـەر ناشـیرین بـن بـۆ خۆتـان مارەیـان ناکـەن‌و لەبـەر خـاتری ماڵەکەشـیان بـە کەسـانی دیکـەیان بـە شـوو نـادەن ئەگەر هاتنە خوازبێنیان!

دەگێڕنەوە دەڵێن: ئیمامی عومەر ئەگەر سەرپەرشتیاری چـەتتیومیەك دەهاتـە لای تێـدەفکری: ئەگـــەر چـــەتیوەکە جـــوان‌و دەوڵەمەنـــد بوایـــە بـــە کـــابرای سەرپەرشتیاری دەگوت: بیدە بە شوو بە پیاوێکی لە خۆت باشترو گونجاو تـر بـۆی، ئەگەر کچەکە ناشیرین بوایـەو مـاڵی نەبوایـە دەیگوت بۆخـۆت مـارەی بکـە، تـۆ لـە هەموو کەسێ بۆی لە پێش تری! ئەمە لە کاتێکدا کە سەرپەرشتیاری وا هـەبوو کـە چەتیوەکەو ماڵەکەی لـە خـۆ دەگـرت ئەگـەر جوان بوایـە کـچەکەی مـارە دەکـردو ماڵەکەشی دەخوارد، ئەگەر چەتیوەکە ناشیرین بوایە نە بۆخـۆی مـارەی دەکـرد نـە دەیهێشت شوو بکا بە کەسانی تر بەو جۆرە دەمایەوە تا دەمرد.

﴿وَالْمُسْتَــضْعَفِينَ مِـــنَ الْوِلْـــدَانِ﴾ هـــەروەها لـــەم قورئانـــەی بەســـەرتاندا دەخوێندرێتـەوە حـوکم‌و بڕیـاری حـەق‌و راسـتتان بـۆ دیـاری دەکـا دەربـارەی ئـەو منداڵە بێ دەسەڵاتانەی کە مافی خۆیان لە میرات نادەنێ کە لـە ئایـەتی ﴿يُوصِـيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ...﴾دا بۆیان دیاری کراوە!

لە سـەردەمی پـێش ئیـسلامدا تـەنها پیـاوان بـوون ئەوانـەی ئـەرکی پارێزگـاری هۆزو بە خێو کردنی ماڵ‌و منـداڵیان لەسـەر بـوو هەرئـەوان میراتیـان دەگـرت ژن‌و منداڵ میراتیان نەدەدرایە.

﴿وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَامَى بِالْقِسْطِ﴾ هەروەها پەروەردگار فەتواتان بۆ دەداو حوکمو بڕیاری حەقو ڕاستتان بۆ دەردەکا، کە هەڵسو کەوتتان لەگەڵ هەتیواندا دادئامێز بێ، گرنگییەکی تەواو بدەن بە سەرپەرشتی کردنیانو بەشێوەیەکی ڕێکو پێکو دادپەروەرانەو دڵسۆزانە بەخێویان بکەنو پێیان بگەیەنن...

جوملەی ﴿وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَامَى﴾ عەطف بێ بۆ سەر ﴿يَتَامَى النِّسَاء﴾ واتە: مەصدەر مونەوەلەکە مەجرور بێ.

زومەخشەری دەفەرموێ: دەگونجێ جوملەی ﴿وَأَن تَقُومُواْ﴾ مەنصوب بێ بە فیعلێکی مەزەندە کراو وەکوو (یأمرکم). خیطابی ئایەتەکەش بۆ فەرمانڕەواو کاربەدەستو دادوەرانە، بۆ ئەوەی دڵسۆز بن بەرامبەر هەتیوانو مافیان بۆ وەربگرنو نەهێڵن کەسو کاریان ستەمیان لێ بکەنو مافیان پێشێل بکرێ.

﴿وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِهِ عَلِيمًا﴾ هەر کردەوەیەکی خێر ئامێز بکەن کەم بێ یان زۆر بێ – بە گوێرەی حوکمو یاسای خودا بێ، ئەوە پەروەردگار ئاگای لێیەتیو پێی دەزانێو باشترین پاداشیان لەسەر ئەوە دەداتەوە، دیارە ئەمە وروژاندنی هەستو نەستی ئادەمیزادانەو هەڵنانیانە بۆ چاکە کردنو پابەند بوونیان بە فەرمانو نەهییەکانی پەروەردگارو پەیڕەو کردنی یاسای قورئانی پیرۆز کە بەرنامەی ژیانە!

وەکوو زانیمان لەوە پێش لەسەرەتای ئەم جزمەدا حاڵەتی یاخی بوونو ناشیزە بوونی ئافرەتی باس کردوو ڕێگا چارەی بۆ دانا، بۆ ئەوەی پارێزگاری لەسەر نیظامی خێزان بکاو نەهێڵێ سەنتەرو سیستەمەکەی تێک بچێ، ئێستاش لێرەدا حاڵەتی یاخی بوونو ناشیزە بوون - ئەگەر لە مێردەوە سەر هەڵبدا - دێنێتە پێشەوە، کە ئەمەش حاڵەتێکە ئارامیو ئاسایشی ژن تێک دەداو ئاسایشی خێزان دەخاتە مەترسییەوە، دیارە دڵو دەروون لە گۆڕاندان، هەستو شعوور دەگۆڕێن، ئەوەی ئەمڕۆ خۆشەویستە، ڕێ دەکەوێ سبەینێ دزێو بێ، خێزانێک ئەمڕۆ لەوپەڕی خۆشیو کامەرانی دایە، سبەینێ کێشەیەکی بۆ دروست دەبێ مەترسی دەخاتە کامەرانیو ژیانی ئاساییەوە، ئیسلامیش کەبەرنامەی ژیانە بۆ هەموو تەنگو چەڵەمەیەک چارەسەری خۆی هەیە، لەبەرامبەر هەموو ئاستەنگو

کێشەیەکدا حەللی خۆی هەیە، جا با بزانین پەروەردگار لەم حاڵەتەدا کە ناشیزە بوونەکە لە پیاوەکەوە بێ چۆن چارەسەر دادەنێ‌و چۆن کێشەی نێوان ژن‌و مێردەکە حەل دەکا، دەفەرموێ: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا﴾ ئەگەر ژنێك لەوە ترسا کە مێردەکەی ئەیەوێ وازی لێ بێنێ‌و لە دڵی مێردەکەیدا شیرین نەبێ، یان ترسا لەوە کە پشتی تێ بکاو رووی لێ وەرگێڕێ‌و خۆی لێ بدزێتەوە! ترسانەکەشی بە خۆڕایی نەبوو، بەڵکوو لە ئاکامی هەڵس‌و کەوت‌و نیشانەو بەڵگەی حاشا هەڵنەگر پەیدا بوو بوو؛ وەکوو ئەوەی قسەی ناخۆشی پێ دەگوتن، یان قسەی لەگەڵ نەدەکرد، سەرجێی لەگەڵدا نەدەکرد، سۆزو خۆشەویستی پیشان نەدەدا، هەوڵی دەدا ژنی تر بێنێ، یان ژنی تری هێنا بوو، بە ئاشکرا ئەوی زیاتر خۆش دەویست‌و لە هەڵس‌و کەوتی رۆژانەیدا گەیشتە ئەو قەناعەتە کە مێردەکەی دەیەوێ دەستی لێ هەڵبگرێ جا هۆی ئەم هەڵوێستەی مێردەکەی ناشیرینی ئافرەتەکە بێ یان پیری بێ یان هەر شتێکی تر بێ!

ئەوە لەم حاڵەتەدا بۆ مەبەستی دڵ هێنانەوەی مێردەکەی بۆئەوەی تەڵاقی نەدا دەتوانێ سوڵحی لەگەڵدا بکا بەم جۆرە لە هەندێ یان لەهەمموو ئەو مافانەی کە لەسەر مێردەکەیەتی وازبێنێ‌و گەردەنی ئازاد بکا، وەکوو ئەوە واز بێنێ لە بڕێ پۆشاك‌و بژێوی کە لەسەر مێردەکەیەتی، یان پێ کێشی لێ نەکا، کە لە گەڵیدا بنوێ‌و سەرجێیی بکا.

وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا﴾ هیچ خراپەیەکیان لەسەر نیە کە لەنێوان خۆیاندا رێك کەون بەم جۆرە ژنەکە دەست لەهەندێ مافی خۆی کە لەسەر مێردەکەیەتی هەڵبگرێ‌و لە لانەی ژن‌و مێردایەتیدا بەرێز لێگیراوی بمێنێتەوە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: ژنێك مێردەکەی ویستی تەڵاقی بدا چونکە پیاوەکە دڵی لێی هەڵکەندرابوو، ژنەکە لەو مێردە منداڵێکی هەبوو وتی تەڵاقم مەدە لێمگەڕێ با لەگەڵ منداڵەکەمدا دانیشم‌و بەدوو مانگ جارێك وەرە لام بنوو، هیچی ترم لێت ناوێ، پیاوەکە وتی: ئەگەر بەوە رازی بی زۆر باشە لەسەرئەوە رێك کەوتن.

سەودەی کچی زەمعە کە خێزانی پێغەمبەر بوو (دروودی خوای لەسەر بێ) کە هەستی کرد پێغەمبەر دەستی لێ هەڵدەگرێ پێی ناخۆش بوو لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جیابێتەوە دەشیزانی کە پێغەمبەر عائیشەی زۆر خۆشدەوێ هات بەشە مێردی خۆی پێشکەش بە عائیشە کرد، لەپێناو ئەوەدا لەژێر نیکاحی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) بمێنێتەوە!!

جا لەم حاڵەتەدا کە ژن و مێردەکە رێکبکەون ئەوە کارێکی باشەو قورئان لەمبارەوە دەفەرموێ: ﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾ واتە: صوڵح کردنیان بەم جۆرە ژن کە لەهەندێ مافی خۆی دەست هەڵبگرێو پیاوەکەش ئەوەی لێ قەبووڵ بکا ئەوە باشترە لەدەست لێبەردانیان، رێککەوتنەوەیان چاکترە، لە لێک جیابوونەوەو تەڵاقدان، یان رێکەوتن و پێکەوە ژیان بە تەبایی باشترە لە ناشیرەبوون و پشت لێکردنیان، یان رێککەوتنەوەیان و پێکەوە ژیانیان باشترە لە کێشەو نیزاع، بۆئەوەی پەیوەندی ژن و مێردایەتی بمێنێتەوە بۆئەوەی بینای خێزان نەروخێو زیان بەمنداڵەکانیان نەگا، هەروەها چونکە تەڵاق دزێوترین کاری حەڵاڵە لای خودا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: «أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى الطَّلاَقُ»[1] ئەمجار رستەیەکی سەرنجراکێش تێهەڵکێش دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأُحْضِرَتِ الأَنفُسُ الشُّحَّ﴾ دەروونی ئادەمیزاد چرووکیو رژدی پیسکەیی تێدا چێنراوە، واتە: سرووشتی ئادەمیزاد وا دروستکراوە حەزی لە ماڵ و داراییو کۆکردنەوەیەتی ماڵ خۆشەویستو رژدو چرووکە؛ کەواتە: ئەگەر ژنەکە دەست هەڵگرێ لەهەندێ لەو ماڵ و داراییەی لەسەر مێردەکەیەتی ئەوە دڵی نەرم دەبێو واز لە تەڵاقدانی دەهێنێ لەبەر خاتری ماڵەکە، چونکە دەروونی ئینسان وا خوڵقێندراوە کە سووربێ لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ و داراییو زۆرکردن و گەشەپێکردنی؛ جا کەئێستا ژنەکەی هەندێکی ماڵ و دارایی بۆ زیاددەکا دیارە ئەویش لەپێناو ئەوەدا واز لەهەندێ داخوازی خۆی دەهێنێ یان کە ژنەکە واز لەهەندێ ماڵ و دارایی خۆی دەهێنێ کە سوورە لەسەر کۆکردنەوەو پەرەپێدانیو

[1]- ئەم حەدیثە ئەبو داودو ئیبنو ماجە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە گێڕاویانەتەوە.

خۆشەویستی ماڵو دارایی‌یەکەی کە ئەو خۆشەویستییە لەدڵدا رسکاوە، دیارە پیاوەکەیش بەو کەمە رازی دەبێو لە هەڵوێستی خۆی ژێوان دەبێتەوە، یان کە ژنەکە واز لەبەشە مێردی خۆی دەهێنێو رێگا دەدا مێردەکەی بەشەکەی ئەمیش بدا بەژنەکەی تری، بەکورتی ئافرەتان سوورن لەسەر بەدەستهێنانی مافی خۆیان لەبەشە مێرد (القسم)و بژێوو ژیان لەگەڵ مێردەکەیدا بەکامەرانی، هەروەها سوورە لەسەر مارەیی‌و هەموو جۆرەکانی ماڵو دارایی، هەروەها پیاوانیش سوورن لەسەر ماڵو دارایی خۆیانو نایانەوێ ماڵیان بەفیڕۆ بڕوا هەروەکوو چۆن نایانەوێ خانەو لانەی خێزانیان لێ تێکبچێ، کەوابوو لێبووردنو دابەزین لە لووتکەی هەڵوێستو وازهێنان لەبڕێ بەرژەوەندی لەهەردوو لاوە خێرئاوەر دەبێ بۆ هەردوولا، پەیوەندی ژنو مێردایەتییان ناپچڕێو خانەی خێزانیان ناشێوێ ﴿وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ ئەگەر بەشێوەیەکی چاكو رێكو پێك لەگەڵ ژنەکانتاندا ژیان بەسەربەرن، وێڕای ئەوەی کە ناخۆشیشتان بوێن لەگەڵیاندا هەڵبکەنو خۆڕاگربن لەبەرامبەر حەزو ئارەزووی خۆتاندا، مافی هاوسەریو پێکەوە ژیانتان لەبەرچاو بێ، چاوپۆشی لەهەندێ کەمو کوڕی یەکتری بکەنو هەوڵبدەن بەکامەرانی ژیان بەسەربەرن، خۆبپارێزن لە ناچیزەبوونو پشت تێکردنو هەرشتێك کە سەربکێشێ بۆ ژیان پێگەیاندنو کێشەو دووبەرەکی!!

ئەوە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ بێگومان خودا بەو چاکەو ئیحسانەی کە لەگەڵ خێزانەکانتاندا دەیکەن ئاگادارو زانایە، هیچی لێ گووم نابێو پاداشی باشتان دەداتەوە!

دەڵێن عیمرانی کوڕی حەططانی خاریجی بۆ خۆی زۆر ناشیرین بوو، خێزانەکەی زۆر جوانو شۆخو شەنگو بوو، رۆژێك خێزانەکەی سەیری عیمرانی کردو وتی: (الحمدلله)، عیمران وتی: ئەوە چیتە؟ وتی: سوپاسی خودام کرد لەسەر ئەوە منو تۆ هەردووکمان بەهەشتین، عیمران وتی: چۆن؟ ئافرەتەکە وتی: چونکە تۆ منت دەسکەوتووەو خودا جوانێکی وەکوو منی بەتۆ بەخشیوە، ئەتۆش سوپاسی خودا دەکەیو شوکرانە بژێری! ئەمنیش ناشرینی وەکوو تۆم بەنسیب بووەو صەبرم گرتووە، پەروەردگاریش بەڵێنی بەهەشتی داوە بەو بەندانەی سوپاس

گوزارو خۆڕاگران کەوابێ تۆ بەهۆی شوکرانە بژێرییەوەو من بەهۆی صەبرو خۆڕاگرییەوە دەچینە بەهەشتەوە!!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕووندەکاتەوە کە هەڵسوکەوت کردنی پیاوان بەشێوەیەکی دادوەرانە لەگەڵ ژنەکانیاندا لەهەموو ڕوویەکەوە مەحاڵە، واتە: پیاوێك زیاد لەژنێکی هەبێ‌و لەهەموو ڕوویەکەوە بەیەکسانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکا بەیەك چاو سەیریان بکا، وەکوو یەك خۆشی بوێن ئەوە کاری نەکردەیەو تەکلیفێکی لە وزە بەدەرو مەحاڵە، بۆیە داوای لەمێردەکان کرد کە بەگوێرەی توانا بەیەکسانی هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکانیاندا بکەن‌و ئەوجا ڕوونی کردەوە کە ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ﴾ ناتوانن کە عەدالەتی تەواو لەهەموو ڕوویەکەوە ئەنجام بدەن لەنێوان ژنەکانتاندا، تەنانەت ئەگەر سووریشبن لەسەر ئەنجامدانی هەر ناتوانن. چونکە عەدالەتکاری لەگەڵ خێزاندا شتی مادی‌و نامادی دەگرێتەوە، لەشتە مادییەکاندا دەتوانێ بە عەدالەت لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت بکاو وەکوو مانەوەی شەو لەلایان‌و بژێوو پۆشاك‌و ئەمجۆرە شتانە! بەڵام لەشتە نامادییەکانی وەکوو خۆشەویستی دڵ‌و مەیل پێدان‌و ئەمجۆرە شتانە کە پەیوەندییان بە هەستی دەروونییەوە هەیە ئەوا عەدالەتکاری تێیاندا مەحاڵەو ناتوانێ ئەنجامی بدا!!

بۆیە پەروەردگار عەدالەتکاری لەشتە مادییەکاندا لەسەر پیاوان پێویست کردووە لەشتە نامادییەکاندا کە لەچوارچێوەی دەسەڵاتی ئەواندا نییە ئەو ئەرکەی لەسەر سووك کردن بەڵام لەهەمان کاتدا ئامۆژگاری پیاوانی کرد کە بەگوێرەی توانا لەو شتە دەروونیانەشدا بە عەدالەت لەگەڵیاندا بجوڵێنەوەو فەرمووی: ﴿فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ﴾ مەیل‌و سۆزی خۆتان بەتەواوی مەدەن بە ژنە خۆشەویستەکەو ژنەکەی تر پاشگوێ بخەی بەهیچ شێوەیەك مافی ژن‌و خێزانێتی نەدرێتێ‌و ﴿فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ﴾ لای خۆتان بیهێڵنەوە وەکوو (معلق)، نە بەڕەڵلاکراو نە تەلاقدراوبێ بۆخۆی بچێ شوو بکاتەوە، نە لەلای مێردەکەشی مافی خێزانێتی بدرێتێ، واتە: لەڕووی دەروونییەوە کە نەتان توانی بەیەکسانی لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە لەڕووی شتەکانی ترەوە بەگوێرەی توانا ستەمیان لێ مەکەن، بەڵکوو

لەبارەی لەلا نوستن‌و لەگەڵ رابواردن‌و هەڵس‌و کەوتی جوان لەگەڵدا کردن دەبێ رازییان بکەن‌و مافیان بپارێزن.

﴿وَإِن تُصْلِحُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ ئەگەر ئێوە کاروباری خۆتان رێك بخەن‌و بە عەدالەت هەڵس‌وکەوت لەگەڵ ژنەکانتان بکەن‌و واز لە ستەم‌و ستەمکاری بێنن، تەقواکارو خۆپارێز بن لەهەموو ئیش‌و کارێکتاندا ﴿فَإِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ ئەوە بێگومان خودا لەهەموو مەیل کردن‌و ستەمێك کە لەوەپێش لە ژنەکانتان کردووە خۆش دەبێ، داب‌و نەریتی خودا هەمیشە ئەوەیە: کە لێخۆشبوونی هەیە بۆ هەڵەکاران‌و رەحمەت‌و بەزەیی هەیە بۆ تۆبەکاران ئەوانەی لەدوای تاوان کردن پەشیمان دەبنەوە.

﴿وَإِن يَتَفَرَّقَا﴾ ئەگەر لێك جیابوونەوە، نە ئافرەتەکە وازی لەبڕێ ماڵ‌و دارایی خۆی هێنا نە پیاوەکەش لە هەڵوێستی خۆی ژێوان بووەوەو کار گەیشتە ئەوەی دەست لێك بەردەن ئەوە دڵنیا بن هیچ لایان پەکی ناکەوێ بەڵکوو ﴿يُغْنِ اللّهُ كُلاًّ مِّن سَعَتِهِ﴾ پەروەردگار هەر یەکەیان لەوی تریان بێ ئاتاج دەکا، بە لوطف‌و کەرەمی خۆی بۆ پیاوەکە ئافرەتێکی باشتر دەرەخسێنێ، بۆ ژنەکەش مێردێکی چاکتر پەیدا دەبێ، لەبارەی بژێوو ماڵ‌و دارایشەوە خودا هەردوو لایان بێ ئیحتاج دەکا!

دەگێڕنەوە دەڵێن جەعفەری کوڕی (محمد) پیاوێك چووە لای‌و سکاڵای خۆی بۆ کرد لەدەست هەژاری ئەویش وتی: برۆ ژن بێنە، کابرا ژنی خواست‌و گواستیەوە پاش ماوەیەك هاتە لای هەر سکاڵای هەژاری کرد ئەویش فەرمانی پێکرد وتی ژنەکەت تەڵاق بدە!

کە پرسیاریان لێکرد وتیان: ئەمە یانی چی؟ لە وەڵامدا وتی: فەرمانم پێکرد بەژن هێنان وتم: بەڵکوو بەر ئەم ئایەتە بکەوێ کە دەفەرموێ: ﴿إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ - النور/٣٢﴾ کە ژنی هێناو ئایەتەکە نەیگرتەوە، فەرمانم پێکرد بە تەڵاقدانی ژنەکەی وتم بەڵکوو لە ئەهلی ئەم ئایەتە بێ ﴿وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ اللّهُ كُلاًّ مِّن سَعَتِهِ﴾ لەم بارەوە چیرۆك‌و سەرگوزەشتە زۆرن.

﴿وَكَانَ اللّهُ وَاسِعًا حَكِيمًا﴾ پەروەردگار رزق‌و رۆزی دەری هەموو گیانلەبەرێکە گەنجینەی فراوانەو هەرگیز کۆتایی نایە. دانایە لە ئیش‌و کارەکانیدا، لەهەموو

رووپەکەوە لەبارەی دروست کردن‌و دەست رەنگێنی‌و شەریعەت دانان‌و هەڵسوڕاندنی بوونەوەرو پاداش دانەوەو تۆڵە سەندنەوە.

## خاوەنێتی بوونەوەر هەر بۆ خودایە، سەربەرزی دونیاو قیامەت بۆ تێکۆشەرانە

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدٗا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿١٣٤﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا فەرمانی بە ئادەمیزاد کرد کە عادیلانە لەگەڵ هەتیوان‌و زەبووناندا بجوڵێنەوەو چاکەیان لەگەڵدا بکەن، ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە؛ کە ئەم فەرمان‌و داوایە لەبەرئەوە نیە کە خودا پێویستی پێ بێ، خودا هیچ ئاتاجی کردارو گوفتاری بەندەکانی نیە، چونکە هەموو ئاسمان‌و زەوی، هەموو بوونەوەر موڵکی خۆیەتی، ئەو خوایەکی بێ باک‌و بێ ئیحتیاجە، بەندەکان پێویستیان بە رەحمەت‌و بەخششی ئەو هەیە، بەڵکوو کە فەرمانیان

پێدەکا بۆ بەرژەوەندی خۆیانە، بۆ رام کردنو هەڵنانیانە لەسەر کردنی کاری چاکە، بۆ رێکخستنو خولقاندنی کۆمەڵگای بەختەوەرو کامەرانە!

فەرمووی: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ هەر بۆ خودایە موڵكو دارایی‌و سەڵتەنەتی ئاسمانەکان‌و زەوی هەر خودا خۆی حاکم‌و هەڵسوڕێنەری کاروبارە تێیاندا، هەرچی تێیاندا هەیە لە رووی موڵکایەتی‌و خولقاندن‌و هێنانەدی‌و هەڵسوڕان‌و بەندایەتی کردنی بەندەکان هەر بۆ خودایە! فەرمانڕەوایەکی رەهاو باڵادەستی هەیە!

﴿وَلَقَدْ وَصَّيْنَا الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ بێگومان فەرمانمان بە خاوەن نامەکان (جوولەکەو مەسیحی‌و گەلانی تریش) کردووە، هەروەها فەرمانمان بە ئێوەش کردووە؛ کە ﴿أَنِ اتَّقُواْ اللَّهَ﴾ بەندایەتی خودا بکەن‌و کار بە بەرنامەی خودا بکەن! هەمیشە هەوڵی چەسپاندنی بدەن‌و بیکەنە یاساو پرۆگرامی خۆتان، بۆ ئەوەی بەختەوەری دونیاو قیامەت بن، خۆ ﴿وَإِن تَكْفُرُواْ﴾ ئەگەر سەرپێچی فەرمانی یەزدان بکەن و کافر ببن ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ ئەوە بێگومان بۆ خودایە هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەیە، چی لە بوونەوەردایە موڵك‌و سامانی خودایە، بۆخۆی خاوەنیانە، کافر بوون‌و یاخی بوونتان چ زیانێك بە خودایەتی‌و باڵا دەستی ئەو ناگەیەنێ، هەروەکوو چۆن سوپاسگوزاری‌و خوداپەرستیتان چ لە خودایەتی ئەو زیاد ناکا! کە فەرمانیشی پێ کردوون سوپاس گوزاری بن‌و بەندایەتی بکەن، ئەوە لەبەر سۆزو رەحمەتی بێ پایانیەتی!.

رستەی ﴿وَإِن تَكْفُرُواْ﴾ عەطف کراوە بۆسەر رستەی ﴿اتَّقُواْ﴾ واتە فەرمانمان بەوانیش‌و بە ئێوەش کردووە کە تەقوای خودا بکەن! بەوانیش‌و بە ئێوەشمان گوتووە کە ئەگەر کافر ببن‌و سەرپێچی بکەن‌و لە خودا یاخی بن، ئەوە هەموو سەڵتەنەت هی خودا خۆیەتی! بە کورتی وەکوو زومەخشەری دەفەرموێ: بوونەوەر هەمووی هی خودایە! خودا دروستی کردون، خودا خاوەنیانە، هەر خودا رزق‌و رۆزی دەدا بە زیندەوەران‌و ئەو دەیانژێنێ!

جا کە ئادەمیزاد بەشێکی بوونەوەرەو خودا ئەو هەموو فەضل‌و نیعمەتانەی پی بەخشیون، ئەرکی سەرشانیانە کە بیپەرستن، مافی خودا خۆیەتی کە پەرستراو

بێو کەس سەرپێچی نەکا، ئادەمیزادان خۆیان لە سزاو تۆڵەی بپارێزن، لە سزادانەوەی بترسێن‌و بە هیوای پاداش‌و بەخششی باش بن! واتە: ئەم فەرمانی ئێمە فەرمان‌و ئامۆژگارییەکی کۆن‌و لە مێژینەیەو شتێکی تازە قەڵا نیە، هەر لە کۆنەوە پەروەردگار ئەم فەرمانەی بە بەندەکانی کردووەو بەرو دوا ئەم فەرمانەی ئاراستەی هەموو گەل‌و نەتەوەیەك کردووەو تایبەت نیە بە ئێوەوە، چونکە تەقوا وەسیلەو هۆکاری رزگار بوون‌و سەرفیرازی ئادەمیزادە بەهۆی تەقوا کردنەوە بەختەوەری دونیاوو قیامەت دەبن.

ئەمجار بە ئەوانیش‌و ئێوەشمان گوتووە ئەگەر کافر بن‌و لە خودا یاخی بن ئەوە ج زیانێك بە خودا ناگاو تۆزقاڵێك لە خودایەتی کەم نابێتەوە، سەرباری ئەوەش لە ئاسمانەکان‌و زەویدا فریشتەو دروست کراوی تر زۆرن کە یەکتاپەرستی دەکەن‌و فەرمانبەردارو گەردنکەچی بۆ دەکەن‌و خۆیان لە سزاو تۆڵەی دەپارێزن ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَنِيًّا﴾ خودا لە زاتی خۆیدا بێ ئاتاجە لە دروست کراوانی خۆی‌و پێویستی بە هیچ کەس نیەو بێ ئیحتیاجە لە عیبادەت کردنیان ﴿حَمِيدًا﴾ شیاو لایەق‌و موستەحەقی سوپاس‌و رێزلێنانە چونکە زاتێکی پاك‌و بێ خەوشە، صیفاتی تەواو بێ نەقصن بەخشش‌و نیعمەتی زۆرن، تەنانەت ئەگەر کەسیش بەندایەتی بۆ نەکا ئەوە لە خوایەتی کەم نابێتەوە، واتە: خودا پێویستی بە تاعەت‌و شوکرو سوپاسی ئێوە نیە بۆ ئەوەی خودایەتی خۆی پێ تەواو بکا! ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ – الإسراء/٤٤﴾.

لە حەدیثی قودسیدا هاتووە دەفەرموێ: «يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ

وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ» رواه مسلم. (رياض/١، لاپەڕە: ١٤٣).

له ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ – الذاريات/ ٥٧–٥٨﴾ ئەمجار پەروەردگار بێ ئاتاجی خۆی له بەندەکانی دووباره کردەوه فەرمووی: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ هەر بۆ خودایه چی له ئاسمانەکانو زەویدا هەیه له بارەی دروست کردنو خولّقاندنو خاوەنیەتییەوە، به ئارەزووی خۆی چۆنی بوێ، ئاوا هەڵیان دەسوڕێنێ، به دییان دێنێو دەیانفەوتێنێ، دەیانژێنێو دەیانمرێنێ ﴿وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾ بەسه که خودا بۆخۆی سەرپەرشتیارو پارێزگار بێ بۆ کاروباری بەندەکانیو رزقو رۆژی هەموو کاروبارێکی تریان له ئەستۆ گرتبێ!!

زومەخشەر دەفەرموێ: دووباره کردنەوەی رستەی ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ بۆ چەسپاندنو تەقریری خودایەتی خودایه بۆ سەلماندنی شیاویەتیو پەروەردگارییەتی بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لێی بترسێن خۆ لەسزاو تۆڵەی بپارێزن، بەندایەتی بکەنو لێی یاخی نەبن، چونکه ترسانو خۆپارێزی لەسزای خوودا بنەمای هەموو خێرو خۆشییەکه؛ ئەمجار هەڕەشەی توند ئاراستەی کردنو فەرمووی:

﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ وَيَأْتِ بِآخَرِينَ﴾ ئەی ئادەمیزاد! ئەگەر خودا بیەوێ بتانفەوتێنێو له بێختان دەربێنێ تاقمو کۆمەڵێکی تر له ئادەمیزاد بێنێته کایەوه دەیکاو کەس نیه ببێته لەمپەرو نەهێڵێ ئەو کاره ئەنجام بدا، چونکه هەموو شتێك له ئاسمانو زەویدا له ژێر دەسەڵاتی ئەودایەو له چوارچێوەی دەسەڵاتی دەرناچێ ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى ذَلِكَ قَدِيرًا﴾ پەروەردگار لەسەر ئەو له ناو بردنو بەدیهێنانه ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەیەو هیچ هێزێك نیه بتوانی بەرەنگاری بکا!! بەڵام که نایکا ئەوه لەبەر ئەوەیه: که ئیرادەی نەکردووه.

ئەمــە هەڕەشــە کردنــە لــە بتپەرســتەکان کــە ئــازاری پێغەمبــەریان دەداو بەرەنگاری بانگەوازییەکەیان دەکرد، دەربڕینی ئاستی ڕقو بیمی پەروەردگارە لەو خوانەناسانەو دەستنیشان کردنی دەسەڵاتی بێ سنووریەتی لەسەر لەناو بردنو فەوتاندنیان، ئەگەر لەسەر یاخی بوون بەردەوام بن بەڵکوو هەڕەشە کردنو ئاگادار کردنەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کار بەدەستنو لێپرسراوییان هەیە؛ کە ئەگەر دادپەروەر نەبن خودا لە ناویان دەبا! هەروەها بۆ زاناو زانستخوازان کە ئەگەر بە گوێرەی زانیاری خۆیان مامەڵە نەکەن خودا ڕیسوایان دەکا، شکستییان بەسەر دێنێ.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ – محمد/٣٨﴾ هەندێ لە زانایانی پێشین (سەلەف) فەرموویانە! ئای ئادەمیزاد چەند بی نرخە لای خودا کاتێ کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکا!؟

لە ئایەتێکی ترد دەفەرموێ: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ، وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ – إبراهيم/ ١٩–٢٠﴾.

ئەمانە هەموو هەڕەشەو ئامۆژگاری پەروەردگارن بۆ ئادەمیزاد لەچەند شوێنێکی قورئاندا بە بۆنەی جیاجیاوە دوبارەو سێ بارە بوونەتەوە. بۆ ئەوەی بەندەکان بە هۆش خۆ بێنەوەو واز لە ڕێگای چەوت بهێننو بێنە سەر ڕێگای راستو ڕەوان کە ئەویش پابەند بوونە بە فەرمانەکانی خوداو جڵەو گیرییەکانی.

ئەمجار دەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ الدُّنْيَا﴾ هەرکەسێك لە ئێوە لە ڕێگەی هەوڵدانو کۆششو جیهادەوە بیەوێ دەستکەوتی جیهانی دەست کەوێ، ماڵو نیعمەتو پلەو پایەی دونیای بەدەست دێنێ! ئەوە ﴿فَعِندَ اللَّهِ ثَوَابُ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ پاداشی باشی دونیاو قیامەت لای خودایە، پەروەردگار هێزو هەستو عەقڵو شارەزایی ئەوەی داوە پێتان کە ئەگەر بەکاریان بێنن دەتوانن هەموو پاداشەکان دەستەبەر بکەن، هەر بە پاداشی دونیای بێ بەقا رازای نەبن، چونکە کۆکردنەوەیان بۆ ئێوە ئاسانە، وەکوو ئەوە جەنگاوەری ئیسلام لە ڕێگای خودا بجەنگێ ئەگەر کارەکەی بۆ خودا بێ هەم غەنیمەتو سەرکەوتن بەدەست دێنێ هەم ڕەزامەندی خوداو بە مراد گەیشتنی لە ڕۆژی دواییدا.

واتە: ئەگەر بەندە بیەوێ راستاڵانە بۆ خودا کار بکا بەختەوەری هەردوو جیهان دەستەبەر دەکا، ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئایین ئادەمیزاد شارەزا دەکا بۆ کامەرانیو بەختەوەری هەردوو دونیا، ئەو شارەزایی کردنە فەضلو نیعمەتی خودایە، ئەگەر موسوڵمانان پابەندی فەرمانو جڵەو گیرییەکانی خودا بنو بە گوێری قورئان کە بەرنامەی هەڵبژێردراوی خودایە کار بکەن دەبنە گەورە هێزی جیهانو دونیا دەکەوێتە ژێر دەستیان (ئەمەش راستییەکی مێژووییەو چەند جار لە مێژووی کەونا رای ئیسلامدا بەگەشی بینراوە!! هەرکاتێکیش پابەندی بەرنامەی خودا نەبووبن ئازادیو سەربەستیان لەدەست داوەو کەوتوونەتە ژێر چنگی داگیرکەرانو چەوسێندراونەتەوە).

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ، وِمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، أُولَئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْ – البقرة/ ٢٠٠-٢٠٢﴾.

لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ – الشورى/٢٠﴾.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاء لِمَن نُّرِيدُ... تا دەطاتە – انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ – الإسراء/ ١٨-٢١﴾.

هەموو ئەم ئایەتانە ئەوە دەچەسپێنن کە ئادەمیزاد چی دێتە رێ ئاکامی کردەوەی خۆیەتیو پێویستە هەموو کاتێ هەوڵ بدا خودا لە خۆی رازی بکاو بەختەوەری ژیانی قیامەتی دەستەبەر بکا، هەوڵو تێکۆشانی بەتەنیا بۆ ژیانی کەم خایەنی دونیا نەبێ!!

کۆتایی ئایەتەکەشی بەوە هێناوە کە دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ پەروەردگار هەمیشە قسەو گفتوگۆی بەندەکانی بیستووەو دەبیسێ، بیناو زاناو ئاگادارە بە هەموو مەبەستو کردەوەیەکیان، کەوابوو پێویستە هەمیشە لە کاتی هەموو گفتوگۆو کردارێکیاندا خودایان لە یاد بێو بزانن کە هەمیشە خودا ئاگای لە هەڵسو کەوتی ئەوانە، هیچ شتێکی لێ هون نابێ.

**دادوەری لەبڕیارداندا، شایەتی دان بەحەق، بڕوا بەخوداو بە پێغەمبەر**

﴿ ۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ ﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا فەرمانی بە ئادەمیزادان کرد کە دادپەروەر بن لەگەڵ هەتیوانـدا، لەگەڵ ئافرەتانـدا، بـەم جـۆرە زەمینـەی خـۆش کـرد بـۆ فـەرمان بـە عەدالەت بـە شـێوەیەکی گشتیو سەرتاسـەری،، چونکە کۆمـەڵگا بەختـەوەر نابـێو کاروباری سـەرناگرێ ئەگـەر عـەدالـەت بـاڵی پـیرۆزی بەسـەردا نەکێشێ! پارێزگاری یاساو بەردەوام بوونی دەسـەڵات بـەبێ عـەدالـەت مەیسەر نابێ، عەدالەت بناخـەی دەسـەڵاتی هەمیـشەییە، بـەبێ دادپـەروەری کۆمـەڵگا بـەڕێوە ناچـێ! بۆیـە ئـەم بانگەوازییە گشتییە سەرتاسەرییەی ئاڕاستەی، موسـوڵمانان کـردو فـەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی بڕواتـان هێنـاوە! زیـادە ڕەوی‌و موبالەغە بکەن لە چەسپاندنی عەدالەتدا، ڕەوشـتی دادپـەروەری لەخۆتانـدا ڕەوشتێکی سرووشتی‌و بنچینەیی بێ بە لێبڕاوی پابەندی بن!!

عەدالـەت وشـەیەکی گـشتییە؛ دادگـایی دادوەر دەگرێتـەوە هـەروەها هـەموو هەڵس‌و کەوتێکی حـەقانی ئـادەمیزادیش دەگرێتـەوە، پیـاو لـەناو خێزانـدا، ژن لـە ماڵدا، سەرۆك دائیرە لە فەرمانگەکەی خۆیدا، کوێخا لە گونددا، سـەرۆك هـۆز لـەناو خێڵەکەیدا، ئەفسەر لە سوپادا... هتد.

هەموو ئەمانە پێویستە دادپەروەری لە بزاڤی ژیانیاندا رەنـگ بداتـەوە بەیـەك چاو سەیری ژێر دەستەی خۆیان بکەن، جیاوازی لەنێوانیاندا نەکەن! ﴿شُـهَدَاء لِلّـهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ﴾ شایەتی حـەق‌و راسـتی بـن بـۆ خـودا واتـە: هـەوڵی چەسـپاندنی حەق بدەن‌و مەبەستی خودا لە خۆڕازی کردنتـان هـەبێ، شایەتی بەڕاسـتی بـدەن، خۆتان لە شایەتیدانی بـەدرۆ بپـارێزن، لـە شـایەتیداندا لایـەنگیری رەچـاو مەکـەن، شایەتی راست‌و بێ پێچ‌و پەنا بدەن، با لەدژی خۆشتان بێ.

﴿أَوِ الْوَالِدَيْنِ﴾ یان زیانی بۆ دایك‌و باوکتان هەبێ ﴿وَالأَقْـرَبِينَ﴾ یـان زیـانی بـۆ خزم‌و کەس‌و کارو دۆست‌و ئاشنا هەبێ! حەق چۆنەو رووداوەکە چۆنتان ئاگا لێیـە ئاوا بیگێڕنـەوە، لـە شـایەتیداندا جگـە لەلایـەنی خـوداو حـەق – هـیچ شتێکی تـر لەبەرچاو مەگرن! ﴿إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقَيرًا فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا﴾ لە شایەتیداندا لایەنگیری دەوڵەمەند لەبەر دەوڵەمەندییەکەی مەکەن بەزەییتان بـە هـەژاردا لەبـەر هـەژاری نەیەتـەوە، ئـەوە حەواڵـەی خـودا بکـەن خـودا بـۆ خـۆی بـاش بـاش دەزانـێ بەرژەوەندییان لەچیدایە!!

﴿فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ﴾ شوێن هەواو هەوەس مەکـەون؛ نـەوەکوو لەحـەق لابدەن بۆ بەتاڵ، چونکە هەرکەسێ شوێن هەواو هەوەسـی بکـەوێ هەڵدەخلیـسکێ‌و تووشی هەڵە دەبێ، یان با هەواو هـەوەس‌و دەمـارگیری‌و خۆشەویـستی بـۆ هەنـدێ کەس‌و رق‌و کینەتان لە هەندێکی تر واتان لێ نەکا عەدالەت‌و دادپـەروەری پاشـگوێ بخەن! بـەڵکوو هـەموو کاتـێ لەهـەموو حاڵێکدا پابەنـدی عەداڵـەت بـن‌و دەسـتی لێ بەرمەدەن! وەکوو لەم ئایەتەی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَـنَآنُ قَـوْمٍ عَلَـى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى – المائدة/٨﴾.

دەسـەڵاتی عەداڵـەت ئـامێز بـەردەوام پایـەدارە، جێگـای رەزامەنـدی خـوداو ئـادەمیزادە.. ﴿وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُـواْ﴾ ئەگـەر بـە ئەنقەسـت خـوار بـڕۆن‌و شـایەتی

بگۆڕن‌و درۆی تێدابکەن‌و لەڕاستی لابدەن، یان شایەدییەکە بشێرنەوەو ئەدای نەکەن‌و وەکوو پێویست ئەرکی سەر شانی خۆتان ئەنجام نەدەن ئەوە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ دڵنیابن خودا ئاگای لە هەڵوێست‌و کردارو ڕەفتارتانەو سزاتان دەداتەوە، ئاگادارو زانایە بەهەمووو وردەکارییەکان‌و هیچی لێ هوون نابێ بەهەمووو نهێنی‌و پەنامەکییەکی شایەتییەکە دەزانێ، با سەرپێچیکاران بترسێن‌و بزانن کەخودا ئاگاداری هەمووو فێڵ‌و فسەگۆڕین‌و ژێر لێو خستنی شایەتیدانەکانیانە.

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی پیرۆزی ئاراستەی خاوەن بڕوایان دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ آمِنُواْ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! بەردەوامبن لەسەر بڕوای راستتان بەخوداو بە پێغەمبەری خوداو بەو نامەیەی ناردویەتییە خوارێ بۆسەر پێغەمبەرەکەی‌و ﴿وَالْكِتَابِ الَّذِيَ أَنزَلَ مِن قَبْلُ﴾ هەروەها بڕواتان هەبێ بەو نامانەی کە لەپێش قورئاندا نێردراون بۆ پێغەمبەرەکانی پێشوو، پێتان وابێ کە ئەو نامانە لەخوداوە نێردراون بۆسەر پێغەمبەران.. ئەمە ئەگەر خیطابەکە ئاراستەی موسوڵمانان کرابێ، وەکوو زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئان پێیان وایە! ئیبنو کەثیرو قورطوبی پەسەندیان کردووە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ – الحديد/٢٨﴾.

بەڵام ئەگەر خیطابەکە رووبکاتە بڕوادارانی ئەهلی کیتاب، ئەوە مەبەست بە فەرمانەکە ئیمان هێنانیانە بە پێغەمبەری ئیسلام‌و بە قورئان وەکوو چۆن بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی پێشوو هێناوە بڕوایان بە نامە ئاسمانییەکانی پێش قورئان هێناوە!!

جا وەکوو ریوایەت کراوە: ئەمە خیطابە بۆ ئەوانەی جوولەکە بوون‌و بڕوایان هێناوە بە پێغەمبەر، ئیبنو عەبباس‌و کەلەبی دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام‌و ئەسەدو ئوسەید کە دوو کوڕی کەعب بوون‌و هەروەها

ئەعلەبەی کوڕی قەیس و سەلام کە کوڕی خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بوون یامینی کوڕی یامین، کەهاتنە خزمەتی پێغەمبەرو عەرزیان کرد ئێمە بڕوا بەتۆو بە کتێبەکەت دەکەین، هەروەها ئیمانمان بە مووساو بە تەوراتو بە عوزەیر هەیە ئیتر بڕوا بە کەسی ترو بەهیچ کتێبێکی تر ناکەین! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: نابێ بەڵکوو دەبێ ئیمان بەخوداو بە پێغەمبەرەکەی کە منم ئیمان بە قورئان بهێنن، هەروەها دەبێ بڕواتان هەبێ بەهەموو نامە ئاسمانییەکانی پێش قورئان. ئەوانیش وتیان نەخێر شتی وا ناکەین ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێو هەموویان ئیمانیان هێنا..

ئەمجار هەڕەشەی سەخت ئاڕاستەی سەرپێچیکاران دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ هەرکەسێك بڕوای بە خوا یان فریشتەکانی یان نامە نێردراوەکانی یان پێغەمبەرانی یان ڕۆژیی قیامەت نەبێ یان بڕوای بە هەندێکیان نەبێ ئەوە گومڕایەو ڕێگای لێ هوون بووەو لەڕێگای حەق لایداوە، زۆر لە ڕێگای مەبەستو حەقیقەت دوور کەوتۆتەوە، کەسێك جیاوازی بخاتە نێوان نامە ئاسمانییەکانو پێغەمبەران بڕوا بەهەندێکیان بکاو بڕوا بەبڕێکیان نەکا وەکوو جوولەکەو مەسیحییەکان ئەوە بڕواکەیان بایەخی نییە! چونکە کافربوون بە نامەیەکی ئاسمانی یان بە پێغەمبەرێك بڕوا نەبوونە بەهەموو نامە ئاسمانییەکانو بەهەموو پێغەمبەران! ئەگەر ئیمانی ڕاستو دروستیان بە پێغەمبەرەکەیان، بەنامە ئاسمانییەکەی هەبووایە، بێ بڕوا نەدەبوون بە (محمد) کە لە ئاینو کتێبەکەیاندا مزگێنی پێدراوە!!

## ڕەوشتی دووڕووەکانو هەڵوێستیان دژی موسوڵمانانو سزایان لەلای خودا

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا ﴿١٣٧﴾

بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾

**لە ئایەتی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کرد کە بڕوادار بن‌و بەردەوامبن لەسەر بڕواداری‌و ئیمانیان بەخوداو بە پێغەمبەران‌و بەنامە ئاسمانییەکان هەبێ، ئیتر گونجاو بوو کە باسی دوو کۆمەڵ بکا کەلەو بڕوادارانە نین.**

**کۆمەڵی یەکەم: ئەو تاقمەن کەبە ڕواڵەت ئیمانیان هێناوەو دوایی گەڕانەوە بۆسەر کوفرو بە کافری مردن، ئەوانە تۆبەیان بۆ نیە لەسەر کوفر مردوون، خوداش لێیان خۆش نابێ!**

کۆمەڵی دووەم: ئەو تاقمە دووڕووەن کە بە ڕواڵەت بە موسوڵمانی مانەوەو لە دڵیاندا لەگەڵ کافرەکان دانو لایەنگیری ئەوان دەکەن، ئەوانەش سزای سەختیان دەدرێو بە ئاگری دۆزەخ دەسوتێنرێن.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ ئەو کەسانەی موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندا، دوایی پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە بۆ کوفرو گومڕایی ﴿ثُمَّ آمَنُواْ﴾ ئەمجار هەڵوێستیان گۆڕیو بە ڕواڵەت موسوڵمان بوونەوە ﴿ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ ئەمجار هەڵگەڕانەوەو دووبارە کافر بوونەوە ﴿ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْرًا﴾ ئەمجار زێدەڕەویان کرد لە گومڕاییو کافر بوونداو درێژەیان بەکافربوونی خۆیان داو لەسەر گومڕایی مانەوە تا مردن، ئەوانە ﴿لَّمْ يَكُنِ اللّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ﴾ لێخۆشبوونی خودا نایانگرێتەوەو ﴿وَلاَ لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلاً﴾ شارەزایی ناکرێن بۆ چاکەو خێر، واتە: ئەوانە کە ئەوەندە ڕاڕابوون بە ڕواڵەت موسوڵمان بوونو بە ئاشکرا لە ئایین هەڵگەڕانەوەو زێدەڕەوی لەسەر کافر بوونو گومڕاییان لێ بیندراو سوور بوون لەسەر کافر بوونو ئامادە نەبوون بە باشی لە ئیسلام حاڵی بنو هەوڵیان نەدا بەردەوام بن لەسەر دینداریو مانەوە لەسەر ڕێگای ڕاست! ئەوە هەرگیز لێخۆشبوونی خودایان دەست ناکەوێ، ڕەحمەتو چاکەو ڕەزامەندی پەروەردگار نایانگرێتەوە، دوای ئەو دڵەڕاوکەو ڕاڕاییە ئیتر شیاوی ئەوە نین شارەزای ڕێگای بەهەشت بکرێنو ناکرێن، ژیانی سەربەرزیو کامەرانی نابینن، لەو دونیاش لە ئاگری دۆزەخ. ڕزگاریان نابێ، چونکە لە ژیاندا تۆبەی ڕاستیان نەکردووەو لەسەر کوفرو گومڕایی خۆیان تا مردن بەردەوام بوون!

﴿بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ﴾ ئەی محمد! مزگێنی بدە بە دووڕووەکان لەهەر تاقمو کۆمەڵێك بن، هەروەها ئەوانەی کە لایەنگیری کافرەکان دەکەن ﴿بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ بەوە کە ئاگری دۆزەخ ئامادەیە بۆیانو لە ناو دۆزەخدا سزای سەخت دەچێژن!

ئەمجار پێناسەی دووڕووەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ﴾.

ئەوانە کافرەکان دەکەنە دۆستو برادەرو راوێژ پێکراوو یارمەتیدەرو پشتو پەنا، دۆستایەتی موسوڵمانان بەڕاستی ناکەنو لەژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان دەردەچنو خۆیان لێ جیا دەکەنەوە، بەو هیوایەو پێیان وایە کە لە ئاکاما سەرکەوتن بۆ کافرەکان دەبێ! نازانن: کە سەرەنجام سەرکەوتن بۆ موسوڵمانانە، چونکە خودایان لەگەڵە!.

ئەمجار بەشێوەی پرسیارێکی سەرزەنشت ئامێز دەفەرموێ: ﴿أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ﴾ ئایا ئەوانە کە دۆستایەتی کافرەکان دەکەن دەیانەوێ لای ئەوان هێزو پشتیوانی بۆ خۆیان پەیدا بکەن؟ ئەگەر بە تەما بن بەوە بەهێز بنو پشتو قووەتیان زیاد بکا، ئەوە بە هەڵە چوون ﴿فَإِنَّ العِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ هێزو تواناو پشتو قووەت لە دونیاو لە قیامەتدا هەر بۆ خودایە، هەر ئەویش هێزو تواناو پشتو پەنا دەبەخشێ، سەرکەوتن سەرەنجام بۆ خۆشەویستانی خودایەو ئەوان باڵا دەستو زاڵ دەبن بەسەر جوولەکەو خوانەناسانی تر.. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ – المنافقون/٨﴾ عیزەتو شانو شەوکەت هی خودایە دەیدا بەوانەی خۆی ئارەزووی بکا! کەوابوو پێویستە عیزەتو هێزو توانا لە خودا داوا بکەن، بە هۆی بڕوای راستو پتەوو پەیڕەو کردنی رێبازی پەروەردگارو شوێنکەوتنی بەرنامەی پێغەمبەرەکەیەوە بەدەستی بێنن! بێگومان پەروەردگار عیزەتو شانو شکۆی دا بە پێغەمبەرو بە موسوڵمانان چونکە پەیڕەوی قورئان بوون، رێبازی پێغەمبەریان گرتە بەر!! کاتێکیش موسوڵمانان وازیان لە بەرنامەی خودا هێناو ئەو شەریعەتو یاسایەی پێشینانی ئەوان پێی بەرز بوونەوە ئەمان پاشگوێیان خستو لێی دەست بەردار بوون، شانو شەوکەتیان نەما، زەلیلو ژێر دەستە بوون، تەختی بەختیان وەرگەڕا، دووڕووو خوێڕیو جاشیان تێدا پەیدا بوون، دۆستایەتی کافرو خوانەناسانیان کردو پێیان وابوو: بەوە پلەو پایەیان بەدەست دەهێنن! بەڵام با دڵنیا بن هەرگیز لەو روانگەوە پلەو پایە دەست ناکەوێ! ئومێدەوارین موسوڵمانان بە هۆش خۆ بێنەوە، بگەڕێنەوە بۆسەر ئەو رێبازە پیرۆزە یەزدان کردەو ئەو شەریعەتە ئاسمانییە بکەنەوە بەرنامەو پرۆگرامی خۆیاو جارێکی تر سەروەریو باڵا دەستیو فەرمانڕەوایی

جیهـان بەدەسـت بێـنن! جـارێکی تـر دەری بخـەن کـە ﴿وَلِلَّـهِ الْعِـزَّةُ وَلِرَسُـولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾.

ئەمجار پەروەردگار جڵەوگیری لە موسوڵمانان کرد بە گشتی: کە نابێ لـە کۆڕو کۆمـەڵی ئـەو کافرانـەدا ئامـادە بـن کـە گاڵتـە بـە قورئـان‌و ئـاینی خـودا دەکـەن، دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ﴾ بێگومان نێردراوە بۆ ئێوە ئـەی کۆمـەڵی موسوڵمانان! ئەوانەتان بەڕاستی موسوڵمان بوون‌و ئەوانەشـتان مونـافیق‌و دووڕوون – لە قورئاندا پێتان راگەیەندراوەو فەرمانتان پێکراوە ﴿أَنْ إِذَا سَـمِعْتُمْ آيَـاتِ اللَّـهِ يُكَفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا﴾ هـەرکاتێ بیـستتان‌و زانیتـان‌و بینیتـان کـە قورئـان‌و ئـایینی خـودا رەت دەکرێتـەوەو گاڵتـەی پـێ دەکـرێ‌و دەکرێتـە هـۆی رابـواردنی کۆمـەڵی خوانەناسـان ﴿فَلاَ تَقْعُـدُواْ مَعَهُـمْ حَتَّـى يَخُوضُـواْ فِـي حَـدِيثٍ غَيْـرِهِ﴾ ئامـادەی کـۆڕو کۆبوونەوەیان مەبن‌و لەگەڵیاندا دامەنیشن تا دەکەونە سەر قسەو باسێکی ترو واز لە گاڵتە کردنەکە دەهێنن! ئەمە ئاماژەیە بۆ ئایەتی ﴿وَإِذَا رَأَيْـتَ الَّـذِينَ يَخُوضُـونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ – الأنعام/٦٨﴾ ئـەم ئایەتـە لـە مەککە هاتۆتە خوارێ، ئەوە بوو کافرەکانی مەککە کۆڕو کۆبوونەوەیان دەبەست‌و گاڵتـەیان بـە قورئـان دەکـردو هەنـدێ موسـوڵمانی سـافیلکەش لایـان دادەنیـشتن‌و نەشـیان دەتـووانی بەرپەرچـیان بدەنـەوە، چـونکە لاوازو بـی توانـا بـوون، ئـیتر پەروەردگار فـەرمانی پـی کـردن بـە روو وەرگێـڕان لێیـان‌و گوێ رانـەگرتان بۆیـان، ئـەمجار کـە موسـوڵمان چـوونە مەدینـە جوولەکـەکانی مەدینـە هـەمان هەڵوێـستی کافرەکانی مەککەیان هەبوو، گاڵتەیان بە قورئان دەکرد موسوڵمانە دووڕووەکانیش (دەچوونە لایـان دادەنیـشتن‌و گوێیـان بـۆ دەگـرتن). ئـیتر پـەروەردگار بـە گـشتی جڵـەوگیری لـە موسـوڵمانان کـردو ئـەوەی لێ قەدەغـە کـردن.. تیکـڕای هـەردوو ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنن کەبڕێ لەو شتانەی ئاڕاستەی پێغەمبەر (درووودی خـوای لەسەر بێ) کـراوە مەبەسـت لێـی ئومەتەکەیـەتی! ﴿إِنَّكُـمْ إِذًا مِّـثْلُهُمْ﴾ ئێوە ئەگـەر هاوبەشی دانیشتن‌و قسەو باسی ئەو کۆڕانەیان بکەن، ئـەوا وەکـوو ئـەوان تاوانبـارو هاوبەشـی کوفرەکـەیانن!! چـونکە دانیـشتن لەگـەڵیان‌و گـوێ راگـرتن بـۆ گاڵتـە کردنەکـەیان نیـشانەی رەزامەندییـە بـە هەڵوێـستیان، رازی بـوون بـە کـوفر بـە

ئیختیار کوفره، ئەمجار پەروەردگار ئەمە روون دەکاتەوە کە خودا لە دووا رۆژدا کۆیان دەکاتەوە، گاڵتەکەرو گوێ گر هەردوو لا چۆن لە دونیادا بۆ گاڵتەکردن بە قورئان کۆبوونەوە بەو شێوەیە لەناو ئاگری دۆزەخدا کۆیان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ دڵنیابن کەخودا دووڕووەکانو کافرەکان لەناو ئاگری دۆزەخدا کۆدەکاتەوە، بەیەکەوە سزایان دەدا چونکە کەسێك رازی بێ بە کارێك حوکمی ئەو کەسەی هەیە کە کارەکەی کردووە.

ئەمجار پەروەردگار بڕێ رەوشتو نیشانەی مونافیقەکان دەستنیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ﴾ ئەو دووڕووانە ئەوانەن کە خۆیان بەلایەکدا ساغ ناکەنەوە چاوەڕوانن ئاخۆ چییان دێتە رێ ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ﴾ ئەگەر ئێوەی موسوڵمان لە خوداوە یارمەتی دراونو بەسەر دووژمندا زاڵ بوونو سەرکەوتنتان بەدەست هێناو، غەنیمەتتان دەست کەوت زمان درێژ دەکەنو گەزاف دەکێشنو دەڵێن: ئێمەش لەگەڵتان بووینو بەشە تالانیمان بدەنێ، مافمان پێشێل مەکەن! بە شێوەیەکی پرسیار ئامێز ﴿قَالُواْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ دەڵێن: ئایا ئێمە لە جەنگەکەدا لەگەڵتان نەبووین؟! وەکوو ئێوە بەشداری جەنگمان نەکرد؟؟ ﴿وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ﴾ ئەگەر کافرەکان سەرکەوتنێك بەدەست بێننو بەسەر موسوڵماناندا زاڵ ببن وەکوو رۆژی جەنگی ئوحوود ﴿قَالُواْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ؟﴾ بە کافرەکانی مەککە دەڵێن: ئایا ئێمە یارمەتیمان نەدان بۆ سەرکەوتنتان؟نەمان دەتوانی بتان کوژین دیلتان بکەین؟ نەهێڵن سەربکەون؟؟ ئایا ئێمە نەبووینە یارمەتیدەر بۆتان؟؟ لەم رووەوە کە دڵی موسوڵمانەکانمان سارد دەکردەوە؟! ترسمان دەخستە دڵیانەوەبۆ ئەوەی پشتیان سارد بێتەوەو پەلامارتان نەدەن!! ﴿وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ کاری سەرەکیمان ئەوە بوو: نەمانهێشت موسوڵمانان هەڵمەتتان بۆ بێنن، دڵمان سارد دەکردنەوە، بەو شێوەیە ئێوەمان پاراست لە پەلاماردانی ئەوان، کەواتە بەشێکمان لە دەستکەوتەکانتان بدەنێ! چونکە ئێمەش هاوخەباتتان بووین.

ئیتر پەروەردگار حەسمی مەقیفەکە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ خودا دادگایی نێوانتان دەکا ئەی خاوەن بڕوایانو موسوڵمانانی بەڕاستیو ئەی کۆمەڵی دووڕوو! لە رۆژی قیامەتدا پەروەردگار حیسابتان بۆ دەەکاو هەر

یەکەتان بە گوێرەی کردەوەی خۆی سزاو پاداشتان دەداتەوە؛ موسوڵمانانی راستاڵ دەخاتە بەهەشتەوەو دووڕووەکانیش فڕێ دەداتە ناو دۆزەخەوە! ئەمجار پەروەردگار دووڕووەکان هیوا بڕاو دەکاو پەیامی نائومێدیان بە گوێچکەدا دەداو دەفەرموێ: ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ ئەی کۆمەڵی دووڕوو دڵنیا بن، دەستی نائومێدی بخەنە ژێر سەرتان! هەرگیز خودا ماوە نادا کافرەکان بەسەر موسوڵماناندا بەتەواوی زاڵ ببن و لە بێخیان دەربێنن بەمەرجێ موسوڵمان دەست بە شەریعەتی خوداوە بگرن و پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی پەروەردگاریان بن، ئەگەر لە شەڕێکدا، لە چاخ و سەردەمێکدا کافرەکان سەرکەوتنێ بەدەست بێنن، ئەوە شتێکی کاتییەو پایەدار نابێ، سەرەنجام سەرکەوتن بۆ خواپەرستانە، بە مراد گەیشتن لە دونیاو قیامەتدا هەر بۆ موسوڵمانانی راستاڵ و لە خۆ بووردووە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ – الروم/٤٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ – محمد/٧﴾.

**تێبینی**:

یارمەتیدانی خودا کاتێك دەبێ کە موسوڵمانان شەڕ لەپێناو حەق و عەدالەتدا بکەن، مەبەستیان بەرزز کردنەوەی ئاڵای (لا إلە إلا الله.........) بێ و رەزامەندی خودایان بوێ و پاداشیان لەو داوا بکەن! نیشانەکانیشی ئەوەیە: ئامۆژگارییەکانی خودا پەیڕەو بکەن، وەکوو قورئان فەرمانیان پێ دەکا ئامادەباشی خۆیان نیشان بدەن، پێویستیاتی بۆ دابین بکەن! بە گوێرەی ئایەتی ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ﴾ و ئایەتی ﴿إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ وَاذْكُرُواْ اللّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلَحُونَ﴾ رەفتار بکەن.

چەند جار گوتراوە: بیروباوەڕ هۆی سەرەکییە بۆ سەرکەوتن، هەر جەنگاوەرێك بیروبڕوای بۆ مەسەلەکە نەبوو لەشەڕەکەدا سەرناکەوێ، هەبوونی بیروباوەڕیش ئەوە دەخوازێ کە هەمیشە ئامادەباش بێ، پێویستیاتی جەنگی بە گوێرەی رۆژگار دابین بکا، هەرکاتێك موسوڵمانان پابەندی فەرمانی خودا بوون و پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی بوون، خوداش سەریان دەخاو زاڵیان دەکا. ئەمە

راستیەکەو بەڵێنێکی خوداییە، هیچ شكو گومانی تێدا نیە، چەندجارێك لە مێژوودا بە ئاشكراو بە زەقی خۆی نواندووە!! بەڵام ئێستا، کە دەبینرێ وڵاتی موسوڵمانان داگیر کراوە لەلایەن کافرو خوانەناسانەوە، ئەو زێدو نیشتمانەی کە کاتی خۆی موسوڵمانان بە زەبری شمشێرو ئاکامی تێکۆشانو خوێن رشتنو عەرەق رشتنو خۆبەخت کردن رزگاریان کردو لە چنگی کوفر دەریان هێنا، ئێستا لەلایەن کوفرەوە داگیر کراوەتەوە! هۆیەکەی ئەوەیە: موسوڵمانان لەبەر خاتری خودا شەڕ ناکەن، لە پێناو ئایینو بڵاوکردنەوەی حەقو بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامدا ناجەنگێن، پەیڕەوی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی خوداو پێغەمبەر ناکەن وەکوو قورئان فەرمانی پێ کردوون ئامادەباشی جەنگو فیداکاری نین، کۆڵەکەی دین کە جیهادو غەزایە پاشگوێیان خستووە، بە گوێرەی رۆژگار پێداویستی جەنگیو بەرەنگاری دابین ناکەن، ناتوانن و هەوڵیان نەداوە گەمێی جەنگیو فڕۆکەی پێشکەوتوو تۆپی دوور هاوێژو گەورەو موشەکی جۆراو جۆری پێشکەوتوو بۆ خۆیان دابین بکەن ناتوانن و نەیان کردووە لەگەڵ دوژمندا پێشبڕکێی چاکسازی بکەنو ئامێری بەرەبەرکانی بێننە کایەوە! کە ئەمانە بە گوێرەی یاسای ئایینەکەمان لەسەرمان پێویستەو پشتگوێ خستنیان بێ شەرعییەکی زەقو کەم تەرخەمییە لەبەرامبەر فەرمانی خودا!

### هەڵوێستی تری دووڕووەکان، سزادانیان لەلایەن خوداوە

﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا

تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾.

هەروا لەسەر روونكردنەوەی رەوشتی ناجوامێرانەی دووڕووەكان دەڕواو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ﴾ بێگومان ئەو دووڕووانە لەبەر نەزانیو بێ عەقڵیو دەروون نەخۆشییان بەهۆی تێنەگەیشتنو بیرتەسكیان پەنا بۆ فرتو فێڵ دەبەن كارێك دەكەن بە ڕواڵەت وەكوو ئەوە وایە فێڵ لەخودا بكەن، دەچن خۆیان بە موسوڵمان دەخەنە بەرچاوی موسوڵمانانو لە دڵیشدا بی بڕوان، وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا – البقرة/٩﴾ ئاشكراشە خودا فێڵی لێ ناكرێ، چونكە ئەو زاناو ئاگادارە بە نهێنی ناو دڵانو هەموو پەنامەكییەك دەزانێ!

پێیان وایە: وەكوو لە دونیادا بۆیان چووەتە سەر بە ڕواڵەت حوكمی شەریعەتیان بەسەردا جێبەجێ دەكرێ لەلای خوداش ئەوەیان بۆ دەچێتەسەر لە قیامەتیشدا وەكوو دونیا رزگاریان دەبێ!

وەكوو لەئایەتێكی تردا پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموێ: كە رۆژی قیامەت زیندوو دەكرێنەوەو راپێچی دەشتی مەحشەر دەكرێن، سوێند بۆ خودا دەخۆن

دەڵێن: ئێمە خاوەن بڕوا بووین لەسەر رێگای راستو حەق بووین: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ – المجادلة/١٨﴾.

بەڵام یەزدان بە درۆیان دەخاتەوەو سوود لەو سوێند خواردنەیان نابینن! ﴿وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾ خوداش تۆڵەی ئەو فرتو فێڵەیان لێ دەستێنێ، سزادانەومیان ناو نراوە (مخادعة) لەبەر (مشاكلة)یە بۆ ووشەی پێشوو وەکوو ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللَّـهُ﴾ وایە.

یان مانای وایە: ئەوەی خودا لەگەڵیان دەکا لە فێڵ دەچێ، لەم رووەوە کە لە دونیادا وازی لێ هێناون، ئەحکامی شەریعەتیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، خوێنو ماڵیان پارێزراو دەبێ، بەڵام لە قیامەتدا ژێرخانی دۆزەخی بۆ ئامادە کردوونو دەیان کاتە بنکڵی دۆزەخ، چونکە دابو نەریتی خودا وایە: هەرکەسێك هەڵوێستی خیانەتکاری وەکوو ئەو دووڕووانە بنوێنێ کە لە دونیادا تووشی ریسوایان بکاو لە قیامەتیشدا سزای سەختیان بدا، ئەمەش دیاردەیەکی دووڕووانە لە هەموو گەلو هۆزێکدا فێڵو تەلەکە پەیدا دەکەنو درۆ هەڵدەبەستن پیلان دەگێڕن غەش دەکەن دوژمنانی گەلو نیشتمانی موسوڵمانان دەکەنە گەورەو لێپرسراوی خۆیانو جاشایەتییان بۆ دەکەن، کتێبە مێژوویییەکان پڕن لە باسو خواسی ئەو جۆرە جاشانە هەرکاتێ گەلو نەتەوە لاواز ببنو دوژمنیان بە هێز بن ئەم چڵکاو خۆرانە زۆر دەبنو سەر هەڵدەدەن، چونکە ئەو خۆفرۆشانە هەمیشە هەڵپەی سوودو قازانجی تایبەتی خۆیان دەدەنو سودی گشتی ژێر پێ دەخەن، بۆ بەدەست هێنانی ئامانجی تایبەتی چڵکاو خۆری خۆیان هەموو رێگایەکی خوار دەگرنەبەرو کۆ لە هیچ خیانەتکارییەك ناکەنەوە.

ئەحمەدو موسلیم لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێن: هەڵخەڵەتاندنی خودا بۆیان ئەوەیە: کە خودا رۆژی قیامەت رووناکییەکیان دەداتێ کە پێی بڕۆنو وەکوو موسوڵمانان رێگا دەرکەن! کە دەگەنە سەر پردی صیراط روناکییەکەیان دەکوژێتەوە، لەناو تاریکیدا دەمێننەوە.

نیشانەیەکی تری ئەم دووڕووانە ئەوەیە: ﴿وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى﴾ کە هەڵدەستن بۆ نوێژ بە تەمبەڵیو لەش گرانی ئەنجامی دەدەن، چونکە ئیمانی

پتەویان پێی نیە بەرەغبەتەوە نایکەن، هاندەرێکی دروونی پاڵیان پێوە نانێ بۆ ئەنجام دانی، نیازی پاکیان نیە، لەمانای نوێژ ناگەن، بە هیوای پاداشی پاشەڕۆژ نین، ترسی دۆزەخیان نیە، بەڵکوو لە ترسی خەڵکەکە نوێژ دەکەن، ئەگەر هەر بۆخۆیان بوون ئەوا هەر نوێژ ناکەن، ئەگەر لەگەڵ موسوڵمانانیش بوون ئەوا بە ڕواڵەت نوێژەکانیان دەکەن، کەسێك ئەوە حاڵی بێ، دیارە بە تەمبەڵیو بە ناڕێكو پێکی نوێژەکانی دەکا، ئەوانە بە نوێژ کردنەکەیان مەبەستیان خودا نیەو هیچ ئیخلاصو دڵسۆزییەك لە نوێژەکەیاندا بەدی ناکرێ ﴿يُرَآؤُونَ النَّاسَ﴾ بەڵکوو بۆ ئەوە دەیکەن کە موسوڵمانان بیان بینن‌و ریابازی دەکەن‌و نوێژەکەیان بۆ ناو شۆرەتە نەك بۆ خودا! بۆیە زۆرجار لە نوێژ دوا دەکەون‌و ئامادەی کردنی نوێژی خەوتنان‌و بەیانی نابن، وەکوو لە صەحیحەیندا هاتووە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «إِنَّ أَثْقَلَ الصَّلاَةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلاَةُ الْعِشَاءِ وَصَلاَةُ الصبح، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا» گرانترین نوێژ لەسەر شانی دووڕووەکان نوێژی عیشاو نوێژی بەیانیە ئەگەر بیانزانیایە چەند خێرو بێریان تێدایە ئەنجامیان دەدان تەنانەت ئەگەر بە قنگە خشکێش بوایە. هەروەها ﴿وَلاَ يَذْكُرُونَ اللّهَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئەوانە کەم وادەبێ نوێژ بکەن یان لە نوێژەکەیاندا کەم یادی خودا دەکەن نازانن چی دەڵێن، بەڵکوو لە نوێژەکەیاندا بێ ئاگاو بی نیازن، تەنانەت ئەوان لە واقیعدا زۆرکات هەر نوێژ ناکەن، ئەگەر خەڵك نەیانبینن‌و بۆ رووپامایی نەبێ هەر نوێژ ناکەن. هەروەها ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لاَ إِلَى هَؤُلاء وَلاَ إِلَى هَؤُلاء﴾ ئەوانە سەریان لێ تێکچوومبە هیچ لایەکدا خۆیان بۆ ساغ ناکرێتەوە، نە لەگەل موسوڵمانەکانن بەڕاستی، نە لەگەڵ کافرەکانن بە ڕاستی، بەڵکوو بە ڕواڵەت لەگەڵ موسوڵمانەکانن لە دڵیشدا لەگەڵ کافرەکانن، هی واشیان هەیە شك‌و گومانی دەهێنێ‌و دەیبا، جارێك مەیلی لای موسوڵمانەکان دەکاو جاری واش هەیە مەیلی لای کافرەکانیانن هەیە وەکوو جوولەکەکان، وەکوو سەرەتای سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا أَضَاء لَهُم مَّشَوْاْ فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُواْ﴾ ئایەتی (٢٠) ئەوانە کوری رۆژن‌و کێ سەرکەوت لەگەڵ ئەوەدان.. ئەوانە گومڕان ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللّهُ﴾ کەسێك خودای بەهۆی کردەوەو هەڵوێستی نالەبارییەوە لە ڕێگەی ڕاست لای بداو سەرلێشێواو

گومڕا ببێ ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! ئەی بیسەر! ناتوانی ڕێگای حەق و ڕاستی بۆ بدۆزیتەوە، چی هەوڵ بدەی و تێبکۆشی بۆ خستنە سەر ڕێگای باش، هەوڵدانەکەت بێ هودەیە! چونکە سوننەت و داب و نەریتی خودا ناگۆڕێ و هەڵناوەشێتەوە! کەوابێ مانای (إضلال) ڕێ لێ هون کردنی خودایی ئەوە نیە کە خودا سروشتی هەندێ ئادەمیزاد لەسەر کوفر دابڕێژێ! کابرا هیچ دەسەڵاتێکی تێدا نەبێ!

ئەمجار پەروەردگار موسوڵمانان لەوە دەترسێنێ کە هوڵوێستی دووڕووەکان وەربگرن و چاو لەوان بکەن یان دۆستایەتی کافرەکان بکەن و یارمەتیدەریان بن بۆ سەرکەوتنیان بەسەر موسوڵماناندا و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا، بە هیچ شێوەیەك کافرەکان مەکەن بە دۆست و گەورەی خۆتان و موسوڵمانان پاشگوێ بخەن!

خوانەناسان مەکەن بە دۆست و یارمەتیدەر و هاوەڵ، دۆستایەتییان لەگەڵدا مەبەستن، نەصیحەت و ئامۆژگارییان لێ وەرمەگرن، دژی موسوڵمانان دەستی خۆشەویستییان بۆ درێژ مەکەن و نهێنی و حاڵ و وەزع و حاڵی موسوڵمانانیان پێ مەڵێن، سیخوڕی و چاوساغی بۆ خوانەناسان مەکەن! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ – آل عمران/٢٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ – المائدة/٥١﴾ بەڵام پێدانی بڕێ وەزیفەی گشتی بە کافرە ذیمییەکان لە فەرمانگەکانی حکومەتی ئیسلامیدا، ئەوە کارێکی ئاساییە و هیچ ڕەخنەی لێ ناگیرێ بەمەرجێ چاودێری بکرێ و فەرمانگەیەکی وا نەبێ نهێنییە گرنگەکانی دەوڵەتی تێدا پارێزرابێ، ئەوەتا لەسەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر بڕێ ذیمی لە دیوانەکانی حکومەتدا کاریان دەکرد و کاروباری گشتی ئەو دیوانانەیان بەڕێوە دەبرد، عەبباسییەکانیش ئەبو ئیسحاقی (الصابی) کە ناموسوڵمان بوو کردوویانە

بە وەزیرو بە فەرمانی خەلیفە کاروباری دەوڵەتی بەڕێوە بردووە[١]! ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا مُّبِينًا﴾ واتە: ئایا دەتانەوێ بەو یارمەتیدانەی کافران‌و کردنیان بە گەورەو لێپرسراوی خۆتان بەڵگەی تەواو بدەن بەدەست خودا بۆ ئەوەی سزاتان بداو تۆڵەتان لێ بستێنێ؟؟ مەبەست ئەوەیە: کە یارمەتیدان‌و هاریکاری کافران دژی موسوڵمانان ڕەوشتی دووڕووانەو بەڵگەیە لەسەر مونافیقی!

ئەمجار پەروەردگار سزای دووڕووەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ بێگومان ڕۆژی قیامەت دووڕووەکان دەخرێنە چینی ژێرەوەی دۆزەخەوە لە بنکڵێدا دەسوتێنرێن! ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە دۆزەخ: چین چین‌و قات قاتە، حەوت تەبەقەو ناخۆشترین شوێنی قاتی هەرە خوارویەتی، کە جێگای دووڕووانە.

ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: دۆزەخ حەوت تەبەقە، یەکەمیان جەهەننەم ئەمجار (لظى) ئەمجار (الحطمة) ئەمجار (سعير) دوایی (جحيم) ئەمجار (الهاوية) جاری وا دەبێ هەندێکیان بەناوی هەندێکیانەوە ناو دەبرێن. بەهەشتیش هەشت پلەیە هەر پلەی جێگەی جۆرە کەسێکە بەپێی پلەو پایەیان لەخودا پەرستیدا.

هۆی ئەوەی کەسزای دووڕووەکان سەخت ترە لە کافرەکان ئەوەیە: کە دووڕوو وەکوو کافرەکە کافر گاڵتەکردنی بە ئیسلام‌و موسوڵمانانیشی سەربارە! ﴿وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾ کەس نیە ئەو سزایە لەسەر دووڕووەکان لابەرێ، یان بۆیان سووك بککا کەس نیە یارمەتیان بداو بە هانایانەوە بچێ!! ئەمجار پەروەردگار ڕێگای سەرفیرازی‌و ئیصلاح بۆ ئەم دووڕووانە دەستنیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ﴾ مەگەر ئەوانەیان کە لە هەڵوێستی دووڕوویی خۆیان پەشیمان دەبنەوە ﴿وَأَصْلَحُواْ﴾ هەوڵ تێکۆشانی تەواو دەخەنە کار بۆ کردنی کرداری چاك‌و سڕینەوەی تاوانی ڕۆژگاری دووڕوویيان‌و شتنەوەی چڵکی نیفاق ﴿وَاعْتَصَمُواْ بِاللَّهِ﴾ دەست دەگرن بەبەرنامەی خودا کە قورئان‌و شوێن ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر دەکەون ﴿وَأَخْلَصُواْ دِينَهُمْ لِلَّهِ﴾ تەنها خودا دەپەرستن‌و بەندایەتی هەر بۆ ئەو

---

[١] بۆ زێدە درێژە پێدان سەیری تەفسیری (المنار) ج٥/ لا: ٤٧٢ – ٤٧٣ بکە.

دەکەن‌و سەری بەندایەتی هەر بۆ ئەو نەوی دەکەن پەنا بۆ کەسی تر نابەن نەبۆ لابردنی زیان‌و ناخۆشی‌و نەبۆ دەستکەوتنی سوودو قازانج وەکوو لە سورەتی فاتیحەدا دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾.

ئەم چوار مەرجانە مەرجی وەرگیرانی تۆبەی دووڕووە، بەڵام کافر مەرجی تۆبەکەی ئەوەیە کۆتایی بە کوفرەکەی بێنێ‌و وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ – الأنفال/٣٨﴾.

مونافیق ئەوەیە: بەدەم موسوڵمان بێ بەدڵ بێ بڕوا بێ، بەقسە لەگەڵ خودا بەکردەوە لەگەڵ شەیتان ﴿فَأُوْلَئِكَ مَعَ الْمُـؤْمِنِينَ﴾ ئەو دووڕووانە کە بەو شێوەیە باس کرا ئەگەر تەوبە بکەن‌و بگەڕێنەوەو واز لە دووڕوویی بێنن، ئەوە دەبنە هاوەڵی موسوڵمانان‌و لەهەردوو دونیادا لە کۆمەڵ‌و گرۆهی خاوەن باوەڕان حسێب دەکرێن.

﴿وَسَوْفَ يُؤْتِ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ لەوە بەولاوە پەروەردگار پاداشی زۆر زەبەندە دەداتەوە بە خاوەن باوەڕان کە خودا نەبێ کەس ئەندازەی نازانێ، ئەو تۆبەکارانەش دەبنە هاوبەشی ئەو موسوڵمانانە.

ئەمجار پەروەردگار هۆی سزادانەکەیان ئاشکرا دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَّا يَفْعَلُ اللّـهُ بِعَـذَابِكُمْ إِن شَـكَرْتُمْ وَآمَـنتُمْ﴾ خودا چ مەبەستێکی هەیە بە سزادانی ئێوە ئەی ئادەمیزاد؟؟ ئەگەر ئێوە بڕواتان هەبێ‌و بەندایەتی بکەن‌و سوپاس گوزار بن بۆچی سزاتان دەدا؟؟ واتە: پەروەردگار کە سزاتان دەداو لە دۆزەخدا بە ئاگر دەتانسووتێنێ لەبەر ئەوە نیە زیانتان لێ بداو ئەویش تۆڵەی زیانەکەتان لێ بستێنێتەوە، یان لەبەر ئەوە نیە: کە زیان لە خۆی دوور بخاتەوە یان سوودێکی دەستکەوێ!! هیچ ئاکامێ لەم مەبەستانەی نیە، چونکە خودا بێ ئاتاجە لە هەموو بوونەوەر هیچ پێویستییەکی بە ئادەمیزاد نیە، خودایەتی خودا زۆر لەوە بەرزترە کە ئەو مەبەستانەی هەبن، بەڵام خودا عادل‌و دانایە، ئاگادارو زانایە، هەرگیز چاك‌و خراپ وەکیەك سەیر ناکا، کافرو موسوڵمان لە تەرازووی ئەودا بەرامبەرو یەکسان نین! کافرو مونافیق‌و یاخی بووکە سوپاسی خودا ناکەن لەبەرامبەر نیعمەتەکانیدا، ئەرکی سەرشانی خۆیان - کە ئیمان بە خوداو بەندایەتی کردنیەتی

- بەجێ ناهێنن! ماڵو دارایی‌و هێزو دەسەڵاتیان کە خودا پێی داون لە خێرو چاکەدا بەکاری ناهێنن، چۆن دەبێ وەکوو خوداپەرستێکی راستاڵ حلێب بکرێن؟! خۆ ئەگەر ئەو خوانەناسانە وازیان لە هەڵوێستی خۆیان بهێنایەو سوپاسگوزاری پەروەردگار بوونایە کردارو گوفتاریان باش بوایە بڕوایەکی پتەو راستیان بە خودا بهێنایە، ئەوانیش شیاوی پاداش دەبوون‌و بەختەوەری هەردوو جیهانیان بەدەست دەهێنا! ﴿وَكَانَ اللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا﴾ هەمیشە خودا پاداشی سوپاسگوزاران بە چاکەو سوپاس دەداتەوە، پاداشی باشی داناوە بۆ ئەوانەی بەندایەتی دەکەن‌و فەرمانبەردارن! زانایە بە حاڵی بەندەکانی‌و ئاگاداری دروست کراوانی خۆیەتی، هیچی لێ گوم نابێ کەسێك بڕوای بە خودای خۆی هەبێ، بەندەی سوپاسگوزارو راستاڵ بێ، خودا پێی دەزانێ‌و ئاگای لێیەتی‌و بە باشترین پاداش پاداشی دەداتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ – إبراهيم/٧﴾.

ئاشکرایە قورئان کە نامەی نووسراوی پەروەردگارەو پرۆگرام‌و بەرنامەی نەتەوەی موسوڵمانە هەوڵی ئەوە دەدا وەکوو هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی نەتەوەیەکی بێ خەوش‌و موسوڵمان بێنێتە کایەوە، نەتەوەیەك لە کۆمەڵانی موسوڵمان پێك بهێنێ کە ئیسلام لە کۆمەڵگاکانی کوفرو نەزانییەوە بۆ لای خۆی کێشی کردبوون، بە شیری خوداپەرستی گۆشی کردبوون! بۆ ئەوەی دوای دروست بوونی ئەو نەتەوە ئیسلام کردە رێبەری‌و رابەرایەتی ئادەمیزاد بگرێتە دەست‌و بەرەو ئاسۆی کامەرانی‌و خۆشبەختی‌و سەرفیرازی وەگەڕی بخا؟! هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدا هۆکارەکانی درووست بوونی ئەو نەتەوەیە دەستەبەر بکا، بناخە گشتییەکانی دابمەزرێنێ.

یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانە پاك کردنەوەی دڵو دەروونی ئەو کۆمەڵە موسوڵمانەیە کە کۆمەڵگای ئیسلام یان نەتەوەی موسوڵمانی لێ پێك دێ‌و بەرز کردنەوەی ئاستی رەوشتی‌و دەروونی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایەیە!!

جا کە کۆمەڵی موسوڵمانان گەیشتنە ئەو ئاستە بەرزە، لە رەوشتی تاکە کەسی‌و کۆیدا گەیشتنە ئەو ئەندازە پێویستەو هاوشان لەگەڵ ئەوەشدا لە بارەی

بیروباوەڕی عەقیدەییەوە هەمان سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەو کاتە پەروەردگار ئەو نەخشەیەی یان ئەو تابلۆیەی کە کێشاویەتی بۆ ئادەمیزاد دەهێنێتە کایەوە، نەتەوەیەك دەخولقێنێ کە پارێزگاری ئاینو بەرنامەکەی بکەنو ببنە پێشەواو رابەرو رزگارکەری ئادەمیزاد لە گێژەڵوکەی گومڕاییەوە بۆ دونیای نورو رووناکیو بەختەوەریو سەرفیرازی.

پەروەردگار خاوەنی ئاسمانو زەوییە، گەنجینەی بوونەوەر هی خۆیەتی، بەخشندەو میهرەبانە لەبەرامبەر کردەوەی کەم پاداشی زۆرو زەبەندەی دەداتەوە پاداشی کردەوەی چاکە بە دوو چەندانەو دە چەندانەو چەندەها چەندانە دەداتەوە.

پەروەردگارا! ئەی بەدیهێنەری ئاخو ئاو هەوا! رزقو رۆژیدەری گیانلەبەران! بە مارو مێروشەوە، هەڵسوڕێنەری بوونەوەر بە ئاسمانو ئەستێرەو حەشامەتییەوە، راگری کەونو کائینات بەدەستی قودرەتو دەسەڵات، کەریمی کارساز، کەسی بێ کەسان، حەکیمو دانا، خاوەن رەحمو توانا بۆ خاتری زاتو صیفاتت بە عەطفو میهرەبانیو بەرزی زانایت لە گرۆهی موسوڵمانی سوپاسگوزارمان حلێب بفەرموو، خۆراگرو راستاڵو چاکەکارو باش گوفتارمان بسازێنە لەو کۆمەڵەمان بژمێرە کە خۆت لە دونیاو قیامەتدا لێیان رازیت ئەوانیش لە پاداشو نیعمەتەکانت رازین. ئامین.

**بەیارمەتی خودای مەزن تەفسیری جزمی پێنجەم لە تەفسیری رەوان بۆ تێگەیشتنی قورئان تەواو بوو، جزمی شەشەم بە شوێنیدا دێ**

## باسکردنی خەڵك بەخراپە، خراپە مەگەر ستەمی لێ کرابێ

﴿ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ ﴾.

جا کە موسوڵمانان لە گۆڕەپانی ژیاندا ئەم سەرکەتنانەیان بەدەست هێنا کە لەوەپێش ئاماژەی پێ کرا، شیاوی ئەوە دەبن: کە جێنشینی خودا (خليفة الله) بن لەسەر زەوی بەڵکوو رابەرایەتیو پێشەوایەتی بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد بەگشتی ئەو کاتە بۆ ئەوان کارێکی سروشتیو ئاسایی دەبێ، لەسەر بنەمای راستو پتەو دادەمەزرێ، هاوشان لەگەڵ ئەو سەرکەوتنو پێشکەوتنانەدا لەبارەی زانستو زانیاریو ژیارو ئابووریو رامیاریش هەنگاوی پیرۆز دەهاوێژنو بەرەو ئاسۆی رۆشن رەورەومیان وەگەڕ دەکەوێ.

لایەنێکی پاك کردنەوەی دڵو دەروونی کۆمەڵو تاکەکانی لەم دوو ئایەتەدا رەنگ دەداتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿لاَّ يُحِبُّ اللّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوَءِ مِنَ الْقَوْلِ﴾ ئایەتەکە پەیوەندی بە ئایەتەکانی پێشەوەوە هەیەو حوکمی قسەگوتنی ناشیرین بە خەڵك دیاری دەکا بۆ ئەوەی موسوڵمانان وا حاڵی نەبن کە بە ئاشکرا گوتنی قسەی خراپ بە شێوەیەکی گشتی رەوایەو هیچ سنوورێکی بۆ دانەنراوە.. بۆیە دەفەرموێ: خودا نایەوی تانەو تەشەر بە ئاشکراو دەنگی بەرز ئاراستەی یەکتر بکەن، واتە کەسێك بە ئاشکرا قسەی ناشیرین ئاراستەی یەکێکی تر بکا خودا سزای دەدا، کەسێك شوورەییو نەنگی کەسانی تر دیاری بکاو بڵاویان بکاتەوە خودا تۆڵەی لێ دەستێنێ، چونکە ئەو عادەتو رەوشتە سەر دەکێشێ بۆ بڵاوبوونەوەی دوژمنایەتیو رقو کینە لە ناو خەڵکدا، تۆوی دەغەزو کینەو دژایەتی لە دەرووندا دەچێنێ، زیانی بۆ بیسەرانیش هەیە، پاڵیان پێوە دەنێ بۆ خراپەکاریو چاولێکردنیانو دەیانخاتە گوناهەوە، چونکە بیستنی قسەی خراپ وەکوو خراپە کردن وایە! هەروەها

باسکردنی خەڵك بە خراپە بە نهێنیو سرتەسرتیش هەر حەرامەو سزای توندی لەسەر، کە ئایەتەکە باسی جەهرو دەنگ بەرزبوونەوەی کردووە لەو رووەوەیە: کە زیانی زۆرترە، کاریگەری گشتی ترو خەتەر ترە، ئەگینا باس کردنی عەیبو عاری ئادەمیزادان بە هێدی یان بە دەنگی بەرز بێ، هەر حەرامە: لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ – النور/١٩﴾.

هەر هەڵسوکەوتێك ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی کاری نالەباری شەرم ئاوەرو دابو رەوشتی خراپ خودا پێی نارازییەو سزای توندی ئەوانە دەدا کە پێی هەڵدەستنو ئەنجامی دەدەن.

ئەمجار پەروەردگار حاڵەتێك هەڵدەهاوێرێ دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ واتە باسی خراپەی موسوڵمانان هەموو کاتێك بە هەموو شێوەیەك حەرامەو خودا پێی نارازییە، مەگەر کەسێك ستەمی لێ کرابێو سکاڵای حاڵی خۆی بکا، وەکوو ئەوەی لای قازیو دادوەر، یان هەر کەسێك کەهیوای یارمەتیدانو کۆمەکی پێ کردنی لێ بکا، دەردی دڵی خۆی لە دەستی ستەمکار هەڵڕێژێو خراپەکانی روون بکاتەوەو داوای لێ بکا دەستی ستەمکار بگرێو زوڵمو زۆری لەسەر لابەرێو مافی خۆی بۆ وەربگرێتەوە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو شکات کردن لە زوڵم بە فەرمانی شەرع کارێکی پێویستە، چونکە خودا نایەوێ بەندەکانی لە ئاست زوڵمی زاڵمدا بێ دەنگ بنو دەستەو ئەژنۆ دابنیشنو ملی خۆیان بۆ ستەمکار شۆڕ بکەنو سوکایەتی پێ کردنو ژێر دەستەیی قبووڵ بکەن، ﴿وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾ لە هەردوو حاڵەتەکەدا حاڵەتی رەوای باسکردنی خراپەی زۆردارو حاڵەتی نارەوایی[1]، ئەوە خودا بیسەرەو چی بگوترێ دەیبیسێو زاناو ئاگادارە بە هەموو ئەو مەبەستو نیازانەی کە دەبنە هۆی بڵاو کردنەوەی سکاڵانامە، زانایە بە هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزادو نیازو هەڵسو کەوتی!! ئەوەی کە ستەمی لێ کرابێو بەدەنگ هاتبێ پاداشی دەداتەوە، ئەوەی کە لە خۆڕایی ناوی موسوڵمانان بزڕێنێ، بەبێ هۆ خەڵکی

---

[1] - بە هیچ جۆرێ باسی عەیبو عاری کەس دروست نیە، سکاڵا جیایە لەباسی عەیبو عار کردنی کەسێ.

عەيبدار دەكا تۆڵەی لێ دەستێنێ، يارمەتيدەرە بۆ لابرنی ستەمو سزای ستەمكاران دەدا!!

﴿إِن تُبْدُواْ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُواْ عَن سُوَءٍ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ ئەگەر كردارو گوفتارتان بە ئاشكرا ئەنجامی بدەن يان بە پەنامەكی، هەروەها ئەگەر لێبوردنتان هەبێ بەرامبەر ئەو كەسەی خراپەتان لەگەڵ دەكا، ئەوە كارێكی باشەو خودا پاداشی خێرتان دەداتەوە، نەك هەر ئەوەندە بەڵكوو خودا ئافەرين لەو كارانە دەكاو ئادەميزاديان بۆ هەڵدەنێ! خودا بۆخۆی كاری خێری پێ خۆشە، لە تاوان خۆش دەبێو ئەو پەڕی دەسەڵاتيشی هەيە بۆ سزادانی خراپەكار، كەوابێ چاولێكەری خودا لەم جۆرە كارانەدا شتێكی پەسەندەو جێگای ڕەزامەندی خودايە.

## كوفرو ئيمانو سزاو پاداشيان

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٥٢﴾ ﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار موسوڵمانانی ترساند لە هاوەڵی کردنی کافران‌و دۆستایەتی کردن‌و کۆمەکی کردنیان دژی موسوڵمانان، نارەزامەندی خۆی دەربڕێ دژی رەوشتی دووڕووەکان‌و موسوڵمانانی ئاگادار کردەوە بۆ ئەو حاڵەتەی کە رەوایە خراپەی ئادەمیزاد باس بکرێ، ئەمجار دێتە سەرباسکردنی هۆی کافر بوونی خاوەن نامەکان‌و لە روانگەی روون کردنەوەی دوو پایەی گرنگی ئیسلام کە بڕوا بە خواو بڕوا بە هەموو پێغەمبەرانە بەبێ جوداوازی لە نێوان ئەم پێغەمبەرەو ئەو پێغەمبەرەدا، جا کەسێك بڕوا بێنێ بە هەندێ پێغەمبەرو بڕوای بە هەندێکیان نەبێ؛ ئەوا لە کۆمەڵی ئەو کافرانەیە: کە شیاوی سزای بە ئێشن‌و لە ناو دۆزەخدا، واتە: پەروەردگار کە باسی موشریك‌و دووڕووەکانی کرد گونجاو بوو کە باسی کافرەکانی ئەهلی کیتابیش بکا کە جوولەکەو مەسیحییەکانن‌و فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ بێگومان ئەوانەی کافرن بە خوداو بڕوایان بە پێغەمبەرانی خودا نیە وەکوو بیروباوەڕی جوولەکەو مەسیحی کە بڕوایان بە هەندێ پێغەمبەر هەیەو بڕوایان بە هەنددێکیان نیە ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ جوداوازی دەخەنە نێوان خوداو پێغەمبەرانییەوە لەم رووەوە کە ﴿وَيقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ﴾ دەڵێن بڕوامان بە هەندێ پێغەمبەر هەیەو هەندێکیشیان بە پێغەمبەر نازانین، هیچ بەڵگەشیان بەدەستەوە نیە، جگە لە دەمارگیری‌و شوێن کەوتنی پێشینان‌و پابەند بوونیان بە هەواو هەوەسی خۆیانەوە!! جوولەکەکان بڕوایان بە هەموو پێغەمبەران هەیە جگە لە عیسا (عليه السلام)و حەزرەتی محمد (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ).. مەسیحییەکان بڕوایان بە هەموو پێغەمبەران هەیە جگە لە محمد کە دوا پێغەمبەرەو بەرێزترین پێغەمبەرە![1] کەسێك بڕوای بە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان نەبێ مانای وایە:

---

[1]- ئەمە قسەیەکی مەشهوری غەڵەتە، چونکە جوولەکەو گاور باوەڕیان بە زۆر لە پێغەمبەرەکان نیە، وەك: سولەیمان‌و صالح‌و هود، جوولەکە بڕوایان بە زەکەریاو یەحیای کوڕیشی نیە، مەسیحیش زەکەریا بە پێغەمبەر نازانن سفری زەکەریا هی ئەو زەکەریایە نیە کە باوکی یەحیایە، کە مەسیحی پێی دەڵێن یوحنا المعمدان. نوری فارس

بـڕوای بـە هیـچیان نیـە، چـونکە پێویـستە بڕوایـان بـە هـەموانیان هـەبێ، کەسـێك لەبـەر هـەر هۆیـەك پێغەمبەرایـەتی پێغەمبـەرێك ڕەت بکاتـەوە مانـای وایـە: بڕوایەکەی بە پێغەمبەرەکانی تریش بڕوایەکی شەرعیو پەسەند نیە، بەڵکوو ئەو ئیمانە بە هەواو هەوەسی دەمارگیرییە.

﴿وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾ ئەوانـە دەیانـەوێ کە ئـاییننێکی مـام ناوەندی لە نێوان کوفرو ئیمانـدا دابێنـێن، ئایینێـك لـەنێوان ئیـسلامو جوولەکـەدا پەیدا بکەن ﴿أُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا﴾ ئەوانە کوفرەکەیان ئاشـکرایەو هـیچ شـكو گومـانی تێـدا نیـە، چـونکە ئیمانەکـەیان ئیمـانێکی شـەرعی نیـە، چـونکە ئەگـەر ئیمانیـان بـە پێغەمبـەرێك بوایـە دەبوایـە ئیمانیـان بـە پێغەمبـەرەکانی تـریش هەبوایە ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ ئامادەمان کردووە بۆ بێ بڕوایان بە گشتی – یان بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە هەندێ پێغەمبەر هەیەو بڕوایـان بـە هەنـدێکیان نیە – سزایەکی ڕیسواکەرو شەرم ئاوەرە.

لە ڕوانگەی ئەم ئایەتەوە ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە کـە بڕوانـەبوون بـە پێغەمبەران دوو جۆرە؛ جۆرێکیان بڕوا نەبوون بـە هـەموویان، جۆرێکیـشیان بـڕوا نەبوون بە هەندێکیان. هەردوو تاقمەکە یەکسانن لەوەدا کە شیاوی سزای دۆزەخن، چونکە ئیمان بەخوداو بە پێغەمبەران بـەش بـەش نـاکرێ! کەسـێ ئیمـانی ڕاستو دروسـتی بـەخودا هـەبێ دەبـێ بـڕوای بەڕاسـتی پـەیامو پێغەمبەرایـەتی هـەموو پێغەمبەرەکانیش هەبێ، کەخودا نـاردوونی بـۆ شـارەزایی کردنـی ئـادەمیزاد، دەبـێ بـڕوای وابـێ کـە هـەر خـودا خـۆی کـانو سەرچـاوەی نـاردنی پێغەمبەرانـە، پێغەمبەرەکان هەڵبـژاردەو ڕەوانـەکراوی خـودان، کردوونـی بـە فروسـتادەو سـەفیر لەنێوان خۆیو بەندەکانیدا، کەوابێ ناگونجێ کابرا بڕوای بەخودا هەبێو بڕوای بە برێ پێغەمبەر نەبێ، مووسا بە پێغەمبەر بزانێو عیسای بـەلاوە پێغەمبـەر نـەبێ، چۆن ڕەوایە ئیمـانی بەهەموو پێغەمبـەران هـەبێو بـڕوای بـە (محمد) نـەبێ؟ کـە لەکتێبـەکانی پێـشوودا مزگێنـی بـەهاتنی دراوەو نـاوی لـەناو تـەوراتو ئینجیلـدا نووسراوە، پێغەمبەری ئیسلام پاڵپشتی ڕاسـتی ئایینـە ئاسمانییـەکانی پێـشوو دەکا، قورئان باڵا دەستە بەسەر کتێبە ئاسمانییەکانی پێشوودا خودا بۆ خۆی دەزانـێ کـێ

شیاوی پێغەمبەرایەتییە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا – المائدة/٤٨﴾.

ئەمجار پەروەردگار دوابەدوای باسی ئەو دوو جۆرە کافرانە، باسی کۆمەڵی سێیەم کە کۆمەڵی موسوڵمانانە دێنێتە پێشەوە، بۆ بەرامبەری کردنو پەند وەرگرتن لێیانو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ يُفَرِّقُواْ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ ئەوانەی ئیمانیان بەخوداو پێغەمبەرەکانی هەیە، کار بە شەریعەتی دوا پێغەمبەر دەکەنو پێشیان وایە: کە هەموویان لەخوداوە نێردراونو هەریەکەیان لەسەردەمی خۆی ئایینەکەیان راستو دروست بووەو پێویست بووە خەڵکی پابەندی بنو جوداوازییان نەخستۆتە نێوانیانو نەیانگوتووە ئەومیان پێغەمبەرەو ئەومیان پێغەمبەر نیە، بەڵکوو پێیان وابوو: هەموویان نێردراوی خودانو نیگای خودایان بۆ هاتووە ﴿أُوْلَئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾ ئەوانە لە قیامەتدا خودا پاداشی خۆیان دەداتەوە، لە پاداشتی ئەو بڕوا راستەیاندا بەهەشتیان دەداتێ ﴿وَكَانَ اللّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ خودا زۆر لێبووردووەو لە گوناهیان خۆش دەبێ، بەرەحمو بەسۆزە بەرامبەریان بە چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکاو چاکەکانیان بۆ زیاد دەکا، هەر وەکوو چۆن خودا بەرامبەر هەموو بەندەکانی بەرەحمە لەم بارەوە کە پێغەمبەری بۆ رەوانە کردوونو پرۆگرامی ژیانی پێدا ناردوونو رێگای راستی بۆ دیاری کردوون، هەروەها ئەگەر تاوانێکیان کرد پەلە لە سزادانیان ناکا، بەڵکوو مۆڵەتیان دەدا بۆ پەشیمان بوونەوەو تۆبە کردن، بەهۆی پێغەمبەران بەهۆی قورئان بەهۆی عەقڵو هۆشو هەستو ئەزموونو رووداوەکانی ژیان شارەزای رێگای راستییان دەکا!!

## هەڵوێستو بەدرەفتاری جوولەکەکان

﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً

فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُواْ فِي ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفُۢۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾

له ئایەتەکانی پێشوودا حاڵو چۆنیەتی هەڵوێستی کافرەکانی روون کردەوە ئەوانەی بڕوایان بە خودا نیە، بڕوایان بە پێغەمبەرانی خودا نیە، جیاوازی

دەخەنە نێوان خوداو پێغەمبەرەکانییەوە بڕوایان بە خودا هەیەو بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی نیە، یان بڕوایان بە هەندێکیان هەیەو بە هەندێکیان نا، کە ئەوانیش ئەهلی کیتابن‌و ئایینیان کردووە بە هۆکاری خۆسەپاندن‌و دەمارگیری لەو روانگەوە سەیری ئایین ناکەن کە بە خشایش‌و هیدایەتی خودایە، ئایینیان کردووە بە هەواو ئارەزوو بازی!!.

ئەمجار لەم ئایەتەی دواییدا بڕێ هەڵوێستی تری بەنو ئیسرائیلییەکان دەخاتە روو کە بریتییە لە سەر رەقی‌و داوا کردنی موعجیزەی جۆراو جۆر لە پێغەمبەر بە شێوەیەکی ناشیرین‌و گاڵتە پێ کردن وێڕای نەزانی‌و تێنەگەیشتنیان لە حەقیقەتی ئایین‌و مەبەستەکانی!! ئاشکرایە لای رافەکەرانی قورئان: کە جوولەکەکان داوایان لە محمد کرد (صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلمَ) کە بە بەرچاوی ئەوانەوە بۆ ئاسمان سەرکەوێ! نامەیەکی بە خەتی یەزدانی نووسراویان بۆ بێنێ، راستی پێغەمبەرایەتییەکەی تێدا نووسرابێ وەکوو چۆن مووسا تەوراتی بە نووسراوی بۆ هێنان بە یەك جار! ئەم بڕو بیانوو گرتنەشیان بۆ رەقەبەری پێغەمبەر بوو، نیشانەی سەر رەقی‌و دڵ رەقییان بوو؛ پەروەردگار دڵخۆشی پێغەمبەری دایەوەو پێی راگەیاند: کە باوك‌و باپیری ئەو جوولەکانە، پێشینانی ئەو گەلە فێڵ بازو چەقەبازە زۆر لەوە گەورەتریان داوا لە مووسا کردووە کە ئەو لە نەتەوەی خۆیان بوو، لە دەستی فیرعەون رزگاری کردن، کەچی واش پەڵپیان پێ دەگرت‌و بروبیانوویان لێ دەدۆزییەوە، تەنانەت داوایان لێ کرد وتیان: دەبێ خودا بە چاوی خۆمان ببینین، ئەمجار بڕوات پێ دەکەین! وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُكَ أَهْلُ الْكِتَابِ﴾ خاوەن نامەکان (جوولەکەکان) داوات لێ دەکەن ﴿أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَابًا مِّنَ السَّمَاءِ﴾ کە نامەیەکی نووسراو بە خەتی ئاسمانی بێتە سەریان شایەدی ئەوە بدا: کە تۆ پێغەمبەری خوداو نێردراوی بۆ سەر ئەوان‌و خەڵکی تریش، کتێبەکە ناوزەد بکرێ بۆ لای ئەوان بۆ بەنو ئیسرائیل بنێردرێ، یان بۆ لای چەند کەسێکی تایبەتی ئەوان کە ماڵەو سەرۆك خوێندەوارەکانیانن — بنێردرێ! یان مەبەستیان ئەوە بوو کە شەریعەتی پێغەمبەر بەش بەش نەیەتە خوارێ بەڵکوو بەیەکجار وەکوو تەختە نووسراوەکانی مووسا بنێردرێنە خوارێ.

ماموٚستا شێخ (محمد عبده) دەفەرموێ: ئێمە لە زوٚربەی کتێبەکانی خوٚماندا دەبینین: کە دەڵێن تەورات بە یەك وەجبەو لەیەك کاتدا بوٚ مووسا نێردراوە، هەروەها ئینجیل بەیەکجار بوٚ عیسا نێردراوە ئەمجار لەم روانگەوە ئەمەیان داهێناوە کە جوولەکەکان داوایان لە پێغەمبەر کردووە کە بەیەکجار وەکوو تەورات قورئانی بوٚ بێتە خوارێ! بەڵام ئەمە فێڵێك بوو جوولەکە لە موسوڵمانەکانیان دەکرد، چونکە ئەوەی کە لای جوولەکەکان خوٚیان باوەو سەلمێندراوە ئەوەیە: کە مووسا تەنها ئاموٚژگارییەکەی بەیەکجار بوٚ هات لەسەر دووو تەختەی نەخشێن دانرابوون‌و هێنانی بوٚ لای گەلەکەی کە بینینی هەڵگەڕانەوەو بوونە گوێرەکەپەرست ورقی هەڵساو تەختەکانی فڕێ دان‌و شکاندنی!!

پاشان پەروەردگار فەرمانی پی کرد کە دوو خشتی تر لەبەرد بتاشێ‌و ئاموٚژگارییەکانی لەسەر بنووسێتەوە، باقی حوکمەکانی تری تەورات لە کاتی جیاجیاداو پارچە پارچە بوٚی نێردراون‌و بەیەکجار نەهاتوونە خوارێ.[1]

جا ئەی پێغەمبەر! کە جوولەکەکان داوای نامەیەکی ئاوات لێ دەکەن مەبەستیشیان ئینکاری کردن‌و بوٚڕدانتە نەك دەستکەوتنی بەڵگەو دەلیل، ئەوە بەلاتەوە سەیر نەبێ‌و شتێکی سەرسوڕهێنەر نیە لەوانەوە، چونکە ﴿فَقَدْ سَأَلُواْ مُوسَى أَكْبَرَ مِن ذَلِكَ﴾ پێشینانی ئەوان زوٚر لەوە گەورەتریان لە مووسا داوا کرد ﴿فَقَالُواْ أَرِنَا اللّهِ جَهْرَةً﴾ وتیان ئەی مووسا!: بە ئاشکرا خودامان نیشان بدە با بە چاوی خوٚمان ببینین! ئەمانیش ئەوەو وەچەی ئەوانەن‌و هەمان رەوشت‌و ئەخلاق‌و هەڵوێستی ئەوانیان هەیە پەندی پێشینان دەڵێ: گیا لەسەر بنجی خوٚی دەڕوێتەوە – ئەوە داب‌و نەریتی باوك‌و باپیریانە بوٚیان ماوەتەوە، بە تایبەتی کە ئەوان لە بێگانە ژن ناهێنن تا بگوترێ لەوانەیە هەندێ گوٚڕانکاری کە لە رەوشتیاندا روو دەدا بەهوٚی ژن‌و ژنخوازی لە بێگانەوەیە.

ئەوەشمان لە بیر نەچێ سوننەتی قورئان وا هاتووە دەربارەی گەل‌و نەتەوەکان‌و ئاراستە کردنی خیطاب بوٚیان بەیەك کەس حلێب دەکرێن؛ چونکە

---

[1]- تەفسیری مەنار ج/٦/ ١٢.

گەل‌و نەتەوە لەبەر هەبوونی هاریکاری لە نێوانیانداو میرات لەیەك گرتن‌و رەنگدانەوەی رەوشت‌و سیمای رابوردوو لە داهاتوو شوێنکەوتنی پاشینە بۆ پێشین وەکوو یەك کەس سەیر دەکرێن‌و ئەوەی پێشینان کردوویانە پاڵ داهاتووان دەدرێ. (واتە: ئاراستە کردنەکە حەقیقەت نیەو مەجازە) دەشتوانین بڵێین: ئاراستە کردنەکە لە ڕوانگەی حەقیقەتەوەیەو مەجازی تێدا نیە لەم رووەوە کە هەردوو پرسیارەکە، هەردوو داواکان ئاراستەی جنسی ئەهلی کیتاب کراون، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ: کە ئەو کۆمەڵ‌و تاکانەی پرسیاری یەکەمیان وەپاڵ دراوە هەمان کۆمەڵ‌و تاك بن کە پرسیاری دووەمیان ئاراستە کراوە!!

بەهەرحاڵ داواکردنی ئەم تاقم‌و کۆمەڵانەی کە داوای بینینی خودایان کردووە بە ئاشکرا زۆر گەورەترو سەرسوڕهێنەر ترە لە داوای ئەوانەی کە داوایان لە پێغەمبەر کرد کە بە تایبەتی نامەیەکی ئاسمانییان ئاراستە بکرێ، هەردوو پرسیارەکەش نیشانەی گێلی‌و تێنەگەیشتوویی‌و سەررەقی جوولەکەکانە، نیشانەی ئەوەیە: کە نازانن ئەرکی پێغەمبەرو کاری پێغەمبەرایەتی چیەو چۆنە، جیاوازی نێوان ئایەتی راست‌و موعجیزەی خودا لەگەڵ سیحربازی‌و چاوبەستەکی ناکەن، ئەمە بە نیسبەت داواکردنی ناردنی نامەی ئاسمانی بۆیان، بە نیسبەت داواکردنیان بۆ دیتنی خودا ئەمەیان زیاتر بەڵگەی نەزانی‌و گێلییان دیاری دەکا، چونکە وا گومان دەبەن کە خودا جیسمەو مادەیەو پانی‌و درێژی‌و کورتی هەیە.

جا هەرچەندە پرسیارەکە لە پێشینەکانی جوولەکەوە سەری هەڵداوە کەچی قورئان پرسیار کردن‌و داواکردنەکەی وەپاڵ جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر داوە، چونکە ئەمان میراتگرو لاسایی کەرەوەی ئەوانن، بە کردەوەکانیان رازین‌و ریسوایان ناکەن نارەزامەندی خۆیان بەرامبەر هەڵوێستەکانیان دەرنابڕن!

لەئاکامی ئەو داوا نارەوایەیاندا کە گاڵتە ئامێزو فرت‌و فێڵاوی بوو پەروەردگار سزای دەست بەجێی بۆ ناردوون ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ﴾ هەورە تریشقەیەك لێی دان‌و هەموویان خپ کەوتن ﴿بِظُلْمِهِمْ﴾ بەهۆی سەر رەقی‌و ستەمکاری خۆیان‌و مل نەدانیان بۆ حەق‌و راستی، خودایان بە خۆیان شوبهاند، پلەو پایەی خۆیان بەرز کردەوە بۆ زوور پلەو پایەی خودا، ڕێزی خودایان وەکوو پێویست بە گوێرەی

توانایان نەگرت. بۆیە ئاوا خودا کردنی بە پەندی زەمانە! ﴿ثُمَّ اتَّخَذُواْ الْعِجْلَ مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ﴾ کەچی پاش زیندوبوونەوەو بە ئاگا هاتنەوە دەستیان کرد بە گوێرەکەپەرستن‌و ئامۆژگاری مووسایان لە بیر چووەوە؛ وێڕای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانەی کە لەسەر دەستی مووسا بینییان وەکوو لەناو چوونی فیرعەون‌و هەموو دارو دەستەکەی لە ناو نیلی میسردا، وەکوو یەدی بەیضا، کە بریتی بوو لەوە کە دەستی لە باخەڵی دەرهێنا دەستی وەك چرا دەدرەوشایەوەو عەصاکەی کە دەبوو بە ئەژدیهایەکی راستی‌و مارە درۆزنەکانی سیحربازەکانی دەخوارد... هتد پاشگەز بوونەوە....

﴿فَعَفَوْنَا عَن ذَلِكَ﴾ کە تۆبەیان کردو پەشیمان بوونەوە، لە تاوانی گوێرەکە پەرستیان خۆش بووین، تۆبە کردنەکەیان بریتی بوو لە یەکتر کوشتن (وەکوو لە سورەتی بەقەرە ئایەتی ٥١ — ٥٤ بە درێژی باس کراوە). ﴿وَآتَيْنَا مُوسَى سُلْطَانًا مُّبِينًا﴾ دەسەڵاتی ئاشکراو بەڵگەی بە هێزمان بە مووسا بەخشی، جوولەکەکان بۆی رام بوون، لەگەڵ ئەو هەموو سەرکەشی‌و سەر رەقی‌و یاخی بوونەیان ملیان شۆڕ کردو بە فەرمانی خوا کەوتنە وێزەی یەکتری‌و مەرجی قبووڵ کردنی تۆبە لێیان ئەوە بوو کە هەندێکیان هەندێکیان بکوژن، تا پێیان دەگوترێ بەسە، کە پێیان گوترا بەس ئەوانەی کوژراون بە شەهید حلێب بوون‌و ئەوانیش کە مابوونەوە تۆبەیان لێ وەرگیرا بوو!

پەروەردگار جۆرەها شێوازی لەگەڵ ئەو جوولەکانەدا بەکار هێنا یەکێك لەو ئوسلوبە سەرسوڕهێنەرانەی کە لەگەڵیاندا ئەنجام درا؛ ئەوە بوو: کە فەرمانیان پێکرا شەریعەتی خودا وەربگرن‌و پابەندی بن ئەوانیش ملیان نەدا کێویان لەس راگیرا وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ الطُّورَ بِمِيثَاقِهِمْ﴾ بەرزمان کردەوە بەسەریاندا کێوی طوری سەینا وەکوو هەور هێنامان لە ئاستی سەر سەریان رامانگرت، ئەویش بە هۆی ئەو عەهدو پەیمانەی لێمان وەرگرتبوون کە پابەندی شەریعەتی تەورات بن‌و کاری پێ بکەن کەچی سەرپێچیان دەکرد، دوایی ملیان کەج کردو هاتنە خەتەوە ﴿وَقُلْنَا لَهُمُ ادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّدًا﴾ پێمان گوتن بڕۆنە ناو شارەوە بچنە ناو بەیتولمەقدیسەوە بە ملکەچی‌و سەر کزی، فەرمانبەرداری

فەرمانەکانمان بن‌و بکەونە سوژدە ئەوانیش بە ناچاری‌و لە ترسان چوونە سوژدە لە سوژدەکەیاندا بە تیلەی چاو سەیری کێوەکەیان دەکرد دەترسان بەسەریاندا بکەوێ وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّواْ أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ – الأعراف/١٧١﴾.

فەرمانمان پێ کردن: بە ملکەچی‌و زەلیلی بەرەو بەیتولمەقدیس بچن‌و بڵێن (حطة) واتە: خودایە گوناهمان بشۆرەوە، لێمان خۆش بە کە وازمان لە جیهاد هێنا، سەرپێچی فەرمانەکانتمان کرد چل ساڵ لە بیابان مانەوە، کەچی بە پێچەوانەوە نە بە کردار نە بە گوفتار ئەوەی پێیان گوترا بوو: ئەنجامیان نەدا کە چوونە ژوورەوە بە قونەخشکێ لەسەر کلۆتیان دەکشان، لە باتی وتنی وشەی (حطة) دەیانگوت (حنطة).

ئامۆژگاریمان کردن‌و فەرمانمان پێ کردن: کە رێزی رۆژی شەممە بگرن‌و خۆ بپارێزن لەو شتانەی خودا لێی حەرام کردوون تێیدا ﴿وَقُلْنَا لَهُمْ لاَ تَعْدُواْ فِي السَّبْتِ﴾ لەسەر زمانی داود پێمان گوتن: لە رۆژی شەممەدا سنووری خودا مەبەزێنن‌و راوەماسی تێدا مەکەن، بەڵام ئەوان سەرپێچییان کردو فێڵیان بەکار هێنا، برێکیان ئەم فێڵ کردنەیان پێ ناخۆش بوو نارەزاییان دەربڕی. هەندێکیشیان بێ دەنگ بوون. جا کە ئەوان دەربارەی رۆژی شەممە نافەرمانی خودایان کرد، ئەمجار بۆ چونە ژوورەوەی بەیتولمەقدیس دوبارە سەرپێچییان کرد....! ئەی محمد! بەلاتەوە سەیر نەبێ کە ئاژاوە دەنێنەوەو دژایەتیت دەکەن!!

﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا﴾ پەیمان‌و بەڵێنێکی پتەوو جەخت لەسەر کراومان لێ وەرگرتن: کە بە گوێرەی تەورات کار بکەن‌و پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بن، مزگێنی بدەن بە هاتنی حەزرەتی عیسا (عَلَيهِ السلام)و هاتنی حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عليهِ وَسلمَ) ناو نیشانەیان مەشارنەوەو بە خەڵکی رابگەیەنن... کەچی پابەندی ئەو فەرمان‌و جڵەوگیریانە نەبوون‌و سەرپێچیان کردو یاخی بوون‌و فێڵ‌و تەڵەکەیان بەکار هێنا! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْت

إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعاً وَيَوْمَ لاَ يَسْبِتُونَ لاَ تَأْتِيهِمْ كَذَلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ – الأعراف/١٦٣﴾.

ئەمجار پەروەردگار دوای ئەم بەڵێن وەرگرتنە لێیان، هۆی ئەو بەڵاو سزایانەی تووشیان بوون شی دەکاتەوە، کە بریتی بوون لە سەرپێچی کردنی زەق و هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمان و بەڵێنانەی کە بە خودایان دابوو، حەرامیان بە حەڵاڵ لە قەڵەم داو حەڵاڵیشیان بە حەرام دانا ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ﴾ بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی جوولەکەکان بۆ بەڵێن و پەیمانەکانیان و بڕوا نەکردنیان بەو ئایەت و بەڵگانەی کە راستی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرەکان دەچەسپێنن، ﴿وَكُفْرِهِم بَآيَاتِ اللّهِ﴾ کافر بوونیان بە نیشانەکانی خوداو بە نامە ئاسمانییەکانی ﴿وَقَتْلِهِمُ الأَنْبِيَاء بِغَيْرِ حَقًّ﴾ هەروەها بە هۆی کوشتنی پێغەمبەران وەکوو زەکەریاو یەحیا بەبێ ئەوەی تاوانێکیان کردبێ و مافێکیان بەسەرەوە بن شیاوی ئەوە بن! ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ ئەو وتەیان کە دەیانگوت: دڵمان پەردەیەکی قایم و پتەوی تێوە پێچراوە ئەو بانگەوازی و ئامۆژگارییەی ئێوەی تێ ناچێ، هیچ قسەو بەڵگەیەکتان، هیچ پەندو ئامۆژگاریتان کارمان تێ ناکاو ناچێتە دڵمانەوە[1]!. جا بەهۆی ئەو هەموو کردەوە ناشیرینانەیانەوە، لە پاساوی ئەو هەموو هەڵوێستە نالەبارو فرت و فێڵ و تەڵەکە بازییەیانەوە ئەوەمان پێکردن کە پێمان کردن کەبریتی بوو لە... کە نەفرین و رق لێبوونەوەو ریسوا کردن و لێ ستاندنەوەی موڵك و سەڵتەنەت و باڵا دەستی و ئازادی و سەربەستی و لەش ساغی و تەندروستی....هتد.

---

[1] – غلف دوو مانای هەیە یەکەمیان کە کۆی (اغلف) بێ مانای ئەوەیە: پەردەی لەسەرەو رێگای نادا شتێ پاڵ بکەوێ؛ دووەمیان: کە کۆی (غلاف) بێ وەکوو (کتیاب - کتب) لامەکەی زەنەدار کراوە وەکوو (كُتب رُسل) ئەو کاتە ماناکەی وایە کە دڵ و دەروونیان هەمبانەو سندوقی زانست و زانیارین پڕبووە لە عیلم و پێویستیان بە ئامۆژگاری پێغەمبەرو کەسی تر نیە.

ئەمجار پەروەردگار ئەم بۆچوونەیان ڕەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلْ طَبَعَ اللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ﴾ وەکوو بۆخۆیان باسی دڵیان دەکەن وا نیەو بۆچوونەکەیان هەڵەیەو چاوبەستەکی لە خەڵك دەکەن، بەڵکوو ئەوان بە هۆی کوفرو گومڕاییانەوە پەروەردگار دڵی مۆر کردوون‌و کەوتونە زەلکاوی گومڕاییەوەو ڕەنگ دانەوەی ناشیرینی ئەو گومڕاییەیان لەسەر کردارو گوفتارو ڕەوشتیاندا دیارە، یان دڵیان وەکوو پارەی نیکڵ‌و ئاسنێکی مۆر لێ دراو وایە لە ڕەقی‌و نەگۆڕیدا هیچ نەقش‌و نیگاری تری لێ نادرێ دڵی ئەوانیش بەو جۆرە هیچ شتێکی تر کاری تێ ناکاو هیچ بەڵگەو تێڕوانین‌و ئامۆژگارییەك کاریان تێ ناکاو لە زەلکاوی گومڕاییدا سەریان لێ شێواوەو لەخوو ڕەوشتی پیس‌و بەد ڕەفتاری خۆیان لا نادەن ﴿فَلاَ يُؤْمِنُونَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ بڕوای تەواویان نیە تەنها بڕوایان بە مووساو تەورات هەیە، ئەوەیش بە بڕوا حلێب ناکرێ، یان کەمێکیان نەبێ وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی سەلام‌و هاوەڵانی ئەوانی تریان بڕوایان نیە! ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَى مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا﴾ هەروەها بە هۆی بڕوا نەکردنیان بە عیساو بە ئینجیل‌و بوختان کردنیان بە مەریەم کە گوایە دەستی تێکەڵ کردووە، لە ژێرەوە لەگەڵ یوسفی (النجار)دا داوێن پیسی ئەنجام داوە!! کە ئەوە بوختانێکە مووچڕکە بە جەستەی خاوەن ویژداندا دەهێنێ‌و هەست‌و شعور دەتاسێنێ! بوختانێکی گەڵێ گەورەو ناڕەوایە، جگە لە جوولەکەکان کەسی تر زات ناکا بوختانی وا بکا. ﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ﴾ هەروا گومانی ئەوەیان کە گوایە عیسای کوڕی مەریەمیان کوشتووە، بە گاڵتەوە – نەك بە ڕاستی پێی دەڵێن: - (رسول الله) ڕەوانە کراوی خودا قورئانیش کە بە (إبن مريم) تۆماری کردووە بۆ ڕەتدانەوەی ئەو مەسیحییانەیە کە دەڵێن: کوڕی خودایە!!

ئەمجار پەروەردگار گوتن‌و بۆچوونەکانیان پووچەڵ دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ﴾ ئەوان درۆ دەکەن عیسایان نەکوشتووە، ﴿وَمَا صَلَبُوهُ﴾ هەڵیان نەواسیوەو لە خاچیان نەداوە وەکوو خۆیان ئەو ئیدیعایە دەکەن. ﴿وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ بەڵکوو خودا شێوەی عیسای خستە سەر پیاوێکی ترو ئەوویان گرت‌و کوشتیان‌و هەڵیانواسی! کەوابوو: ئەوان بە یەقین عیسایان نەکوشتووە، چونکە ئەو

تیرۆرستانەی کە چوون بۆ کوشتنی عیسا، عیسایان نەدەناسی، کە کابرایان کوشت لە ناو خۆیانەوە کەتنە گومانەوە ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ﴾ ئەوانەی کەوتوونە گومانەوە لە بارەی هەڵواسینی عیسا، ئایا هەڵواسراوەکە عیسا بووە یان یەکێکی تر بووە؟؟

﴿لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ﴾ لە گومانو ڕاڕاییدان دەربارەی ڕاستی ڕووداوەکە، ﴿مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ﴾ زانیارییەکی تەواویان لەو بارەوە نیە، بەڵکوو ئەوان شوێن گومانو نیشانەی وا کەوتوون کە زانیاری ڕاستیان بۆ دەستەبەر ناکا. ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا﴾ ئەوان بە یەقینی عیسایان نەکوشتووە! وشەی ﴿يَقِينًا﴾ یان حاڵە لە (واوی) (قتلوه) واتە: ئەوان دڵنیا نەبوون لە کوشتنەکەی بەڵکوو گومانیان بۆ پەیدا بوو.

یان حاڵە لە (هێی) (قتلوه) واتە کوشتنەکەیان بە یەقین نیە بەڵکوو گومانی تێدایە، یان صیفەتی مەصدەرێکی حەزف کراوە، واتە: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ قتلاً يَقِينًا﴾ نەیانکوشتووە بە کوشتنێکی یەقین! ﴿بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ﴾ بەڵکوو خودا لە دەستی ئەو کۆمەڵە جوولەکە تیرۆرستانە ڕزگاری کردو بەرزی کردەوە بۆ لای خۆیو وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ - آل عمران/٥٥﴾ ئیبنو عەبباس دەڵێ: مانای (مُتَوَفِّيكَ) دەتمرێنم. وەهەب دەڵێ: خودا سێ ڕۆژ عیسای مراندو دوای زیندووی کردەوەو ئەمجار بەرزی کردەوە!

زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: مەبەست بە (مُتَوَفِّيكَ) لێرەدا مردن نیە، بەڵکوو مەبەست نووستنە وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم - الأنعام/٦٠﴾ یان دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا...الزمر/٤٢﴾.

حەسەنی بەصری دەڵێ: پێغەمبەر بە جوولەکەکانی گوت: عیسا نەمردووە بەڵکوو پێش ڕۆژی قیامەت دێتەوە بۆ ناوتان. واتە: ئەوەی لە ناو ڕاڤەکەرانی قورئاندا باوە ئەوەیە: کە یەزدان عیسای بە جەستەو گیانییەوە بەرز کردۆتەوە بۆ ئاسمان. ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: بەرز کردنەوەکە بە پلەو پایەو ڕێزو تەقدیرە،

واتە بەرزت دەکەمەوە بۆ پلەو پایەی ڕێزدارانی خۆم. مانای ﴿رَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ یەعنی (رافعك إلى محل كرامتي). وەکوو چۆن دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَى رَبِّي سَيَهْدِينِ – الصافات/٩٩﴾ ئاشکراشە ڕۆیشتنەکەی ئیبراهیم لە عێراقەوە بۆ شام بوو کەوابوو رستەی (إِلَى رَبِّي) بۆ شانو شەوکەتو ڕێزو تەقدیرە. ئەمجار پەروەردگار بەڵگەی لەسەر باڵا دەستی خۆی هێنایەوە ئەوەی سەلماند کە توانای تەواوی هەیە بۆ پاراستنی عیسا لە هەڵواسینو رزگار کردنی لە چنگی جوولەکەو رۆمە ستەمکارەکانو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ واتە: خودا باڵا دەستەو کەس بەسەریدا زاڵ نابێ، داناو زانایە لە هەموو کارو نەخشەو پیلانێکیا، هەموو کەسێك بە گوێرەی کردەوەکانی پاداشی دەداتەوە، بۆ وێنە ئەوەتا سزای جوولەکەکانی بەوە دەداتەوە کە لەسەر زەوی ژێردەستەو شاربەدەر کراوو قیز لێ کراوون!.

ئەمەی نووسرا بیروبڕوای موسوڵمانانە دەربارەی هەڵواسینی عیساو بەرز کردنەوەی بۆ ئاسمان، کە دەقی قورئانەو ئێمە گومانمان لە راستیدا نیە، هەر دێرۆكو قسەو قسەڵۆكو باسێکی تر لەم بارەوە بگوترێ پێچەوانەی ئەمە بێ! بە ڕاستی نازانینو هەموویان بێ سەرو بەرەن! لە لایەکی ترەوە بڕوا کردن بەو رایەی کە دەڵێ: عیسا نەکوژراوە هەڵنەواسراوە، زۆرتر جێگای ڕێزە بۆ عیسا، بۆچوونی ئەوە کە عیسا کوژراوە هەڵواسراوەو خۆی بەخت کردووە لە پێناو ئادەمیزاددا بە گشتی بۆئەوەی تاوانی ئادەمو نەوەکانی بشواتەوە بیروبۆچوونێکی مەسیحییەو بەشێکە لەو رۆمانو سەرگوزشتانەی کە لە ئینجیلدا هەن، بیروزادەی مێشکی ئادەمیزادن فری بەسەر کەلامی خوداوە نیە، چونکە پەروەردگار پاك بوونەوەی لە گوناه پابەند کردووە بە تۆبەو گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوە. ئادەم تۆبەی کرد تۆبەکەی لێ وەرگیرا خودا لێی خۆش بوو، وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ – البقرة/٣٧﴾ کەسێك کەمێك تێفکرینی هەبێ ئەوەی بە دڵدا ناچێ کە بۆ مەسیحییەکان تاوان کردن رەوایە، چونکە مەسیح خۆی کردۆتە قوربانی بۆ گوناهەکانیان، عیسا گوناهەکانیان بۆ رەش دەکاتەوە کاتی خۆی بوومتە قۆچی قوربانیو کەبشی فیدا بۆیان.

ئـەمجار پـەروەردگار دەربـارەی مەسـیح بڕیـارێکی یەکلاکـەرەوە دەردەکـاو دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِـهِ﴾ دڵنیـابن هـەر یـەکێك لـە خاوەن نامەکان جوولەکەو مەسیحی لە کاتی سەرەمەرگا کە مردن یەخەی دەگرێو ڕاستی بۆ دەردەکەوێو پێغەمبەرایەتیو بەندایەتی عیسای بۆ ئاشکرا دەبێو بڕوای پـێ دەکـەنو بەڕاسـتی دەیناسـن، جوولەکـە دەزانـێ کـە پێغەمبـەرێکی ڕاسـتگۆیەو درۆزن نیە، مەسیحی دەزانێ کە ئادەمیزادەو بەس، نە خودایەو نە کوڕی خودایـە، بـەڵکوو ڕەوانــە کــراوی خودایــە، بەندەیــەکی فەرمانبــەرداری یەزدانــە، بــەڵام بڕواهێنانەکـەیان لـە کاتێکدایـە کـە سـوودی نیـە، چـونکە لـە سـەرەمەرگو پـێش غەرغەرەی ڕۆح دەرچوونە، ئەو کاتـەش ئیمـان هێنـان لەکـەس وەرنـاگیرێ! چـونکە ئەوکاتە کاتی ئەرکو لە ئەستۆیی نامێنێو خاڵی وەرچەرخانە لە ژیانی دونیاوە بۆ ژیانی دوایی، جگە لەوەش دوای هاتنی پێغەمبـەری ئیسلام ئیمـان هێنـان بـە هـیچ پێغەمبەرێك سوودی نیە ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی تیشکی قورئاندا نەبێ!

﴿وَيَـوْمَ الْقِيَامَـةِ يَكُـونُ عَلَـيْهِمْ شَـهِيدًا﴾ ڕۆژی قیامـەتیش حـەزرەتی عیـسا شــایەتی لەســـەر جوولەکـــەکان دەدا بـــەوەی کـــە بڕوایـــان پـــێ نـــەکردووەو پێغەمبەرایەتیەکـەیان بـەدرۆ خـستۆتەوە، شـایەتی لەسـەر مەسـیحیەکانیش دەدا بەوەی کە بە کوڕی خودایـان دانـاوە، ڕاسـتی چۆنیـەتی خـۆی ئاشـکرا دەکـا، وەکـوو خودا لەسەر زوبانی عیسا خۆیەوە بۆمان باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا قُلْـتُ لَهُـمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُـدُواْ اللّـهَ رَبِّـي وَرَبَّكُـمْ وَكُنـتُ عَلَـيْهِمْ شَـهِيدًا مَّـا دُمْـتُ فِـيهِمْ – المائدة/١١٧﴾.

واتە: شایەتی بۆ موسوڵمانان دەدا بەوەی کـە بڕوایـان پـێ کـردووە، شایەتی لەسەر کافرەکانیش دەدا بەوەی کە بە درۆیان خستۆتەوەو بڕوایان پێ نـەکردووە، چونکە هەموو پێغەمبەرێك شایەدو چاودێرە بەسـەر ئوممەتەکەیـەوە! وەکـوو لـە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَـى هَـؤُلاء شَهِيدًا – النساء/٤١﴾.

قەتادە دەربارەی ئایەتی ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ وتوویەتی: مانای ئەوەیە: کە عیسا دەبێتە شایەد بەسەریانەوە لەوەدا کە نیگای خودای پێ گەیاندوون و خۆی بەوە پێ ناساندوون کە بەندەی خودایە!

بەڵێ لە حاڵەتێکی غافڵ گیری و ناگەهان ئامێزدا، عیسا بەرەو روویان دەبێتەوەو شایەتییان لێ دەدا، ئەوانەی بە درۆیان خستۆتەوەو ئەوانەی بڕوایان پێ کردووە دەست نیشان دەکا! خۆ بە دوور دەگرێ لەوانەی بوختانیان بۆ دایکی کردووەو خۆیشیان بە کوڕی خودا لەقەڵەم داوە! لەبەردەم هەموانیاندا ئەوە دوپات دەکاتەوە: کە بەندەو رەوانەکراوی خودایەو بانگەوازی ئوممەتەکەی کردووە بۆ خوداپەرستی و بەندایەتی کردنی و تا لە ناویاندا بووە چاودێری کردوون و ئامۆژگاری کردوون و ئەم راستییەی بۆ روون کردوونەوە، لە دوای مردنیشی ئەوە لێیان بەرپرسیار نیەو عوزری هەیە!!

## سەرەنجامی ستەمکاری جوولەکەکان و سوود خواردنیان و پاداشی خودا پەرستان

﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ الرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ مِنْهُمْ وَالْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَالْمُقِيمِينَ الصَّلَاةَ

﴿وَٱلۡمُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾﴾.

خوێنەری هێزا ئەم چەند ئایەتەی دوایش پەیوەندیدارن بەباسی جوولەکەکانەوە، ئەوەتا: دوای ئەوەی پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەو کردەوەو خراپەکارییانەی جوولەکەی باس کرد کە بوونە هۆی رق هەڵسانی خوداو نارازی بوون لێیان! ئەمجار شێوەی سزادانیان لە دونیادا دیاری دەکا کە بریتییە لە یاساغ کردنی برێ خواردەمەنی خۆش لێیانو لە قیامەتیشدا سزای بە ئێشیان بۆ ئامادە کراوە بۆ موسوڵمانانیش پاداشی باش کە بەهەشتی بەرینە. دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ﴾ بەهۆی ستەمو ستەمکاری جوولەکەکان خۆیانەوە لە ئاکامی ئەو هەموو تاوانە گەورانەیان ﴿حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾ چەند خواردەمەنییەکی خۆشو بەلەزەتمان لێ قەدەغە کردن کە لەوە پێش بۆیان حەلاڵ بوو وەکوو دەفەرموێ: ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ – آل عمران/٩٣﴾.

واتە: پێش هاتنی تەورات هەموو خواردەمەنییەکیان بۆ حەلاڵ بووە جگە لەو خواردنانەی کە یەعقووب لەسەر خۆی یاساغی کردبوون کە بریتی بوو لە گۆشتی حوشترو شیرەکەی.

ئەمجار پەروەردگار لە تەوراتدا زۆر خواردنی لێ یاساغ کردن وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلاَّ مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِبَغْيِهِمْ وِإِنَّا لَصَادِقُونَ – الأنعام/١٤٦﴾.

واتە: بۆیە ئەو شتانەمان لێ قەدەغە کردن چونکە سەرپێچیان کرد، یاخی بوون، دژی پێغەمبەرەکانیان وەستان، گوێیان بە ئامۆژگارییەکانیان نەدا، سەرە رۆو دڵ رەقو مێشك بۆشو ئاژاوە گێرو ستەمکار بوون بۆیە فەرمووی: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ﴾ واتە خەتاکە لە خۆیانەوە بوو، بەهۆی ستەمکاری سەرپێچییەوە ئەو

یاسایەیان بەسەردا سەپێنرا، ﴿وَبِـصَدِّهِمْ عَـن سَـبِيلِ اللَّـهِ كَـثِيرًا﴾ بـەهۆی ئـەوە کـە خۆیان شوێن حەق‌و راستی نەکەوتن‌و نەشیان دەهێشت خـەڵکانی تـریش شـوێنی بکەون! فەرمانیان بە خراپە دەکردو جڵەوگیریان لە چاکە دەکـرد، مـوژدەی هـاتنی پێغەمبەرو رەوشت‌و نیشانەکانی لە کتێبەکانیاندا تۆمار کرابوون دەیـان شـاردەوەو نەیاندەهێشت خەڵك پێی بزانێ!

ئەم رەوشتانەیان رەوشتی سروشـتیان بـوو لـە هـەموو کـات‌و شـوێنێکدا، لـە کۆن‌و نوێدا، هەموو کاتێ دوژمنی بابە کوشتەی پێغەمبەران بوون دژیان وەستاون‌و بـە درۆیـان خـستوونەتەوە، لێیـان کوشـتوون‌و بـە ئەوپـەڕی دڕنـدەیی لـە ناویـان بـردوون، هـەر لـەم روانگەشـەوە حـەزرەتی عیـسا (عَلَيْـهِ الـسَّلام)و حـەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یـان بـە درۆ خـستوونەتەوە! ﴿وَأَخْـذِهِمُ الرِّبَـا﴾ هەروەها بە هۆی ریبا وەرگرتن‌و مامەڵە کردنیان بە شێوەی ریبا نامێز ﴿وَقَدْ نُهُـواْ عَنْـهُ﴾ لـە کاتێکـدا کـە لەسـەر زبـانی پێغەمبـەران جڵـەوگیرییان لێ کرابـوو، راگەیەنرابوو کە ریبا وەرنەگرن [1]، ﴿وَأَكْلِهِمْ أَمْـوَالَ النَّـاسِ بِالْبَاطِـلِ﴾ هـەروەها بـە هۆی وەدەست هێنانی ماڵ‌و سامان‌و خـواردنی مـاڵی خـەڵك بـە شـێوەی نـاڕەواو لـە رێی بەرتیل‌و دزی‌و داگیر کردن‌و هەڵخەڵەتاندن‌و فرت‌و فێڵ‌و کاسبی نادروسـتەوە وەکـوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿سَـمَّاعُونَ لِلْكَـذِبِ أَكَّـالُونَ لِلـسُّحْتِ – المائـدة/٤٢﴾. (سحت) واتـە: کاسبی حـەرام جـا لەهـەر روویەکـەوە بـێ، ﴿وَأَعْتَـدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ئامادەمان کردووە بۆ بێ بڕواکانیان سـزای کوشـندەو بـە ئێش لە ناو دۆزەخدا هەروەها بۆ هەموو بی بڕوایەکی وەکوو ئەوان سزای بە ئێشی دۆزەخمان ئامادەیە!

تێبینـی ئـەوە دەکـرێ کـە یاسـاغ کردنـی خواردەمـەنی لـە هـەموو ئـەوەی ئیـسرائیل بـووەو شـێوەیەکی گشتی لـە خـۆ گرتـووە، بـەڵام سـزای دۆزەخ هـەر بـۆ کافرەکانیانـــە، ئەوانـــەیان کـــە بـــە کـــافری مـــردوون.. بۆیـــە پـــەروەردگار بـــۆ

[1] هەرچەندە لە تەوراتی ئێستا ریبا وەرگرتن لە خزم‌و خوێش حەرامە ئەگینا ریبـا وەرگـرتن لە بێگانە رەوایە بەلایانەوە.

راستکردنەوەی زەمینی بیسەران و بۆ ئەوەی وا نەزانن کە چونکە سزا دونیاییەکەیان گشتیە سزا قیامەتیەکەشیان هەر وایە، یان چونکە لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی جوولەکە بە رەهایی و گشتی کراوە سەرپێچی و خراپەکارییان بە شێوەیەکی عام وەپاڵ دراوە واگومان ببرێ کە ئەوە هەموانیان دەگرێتەوەو کەسیان تێدا نیە شیاوی چوونە بەهەشت بێ جا بۆ رەواندنەوەی ئەم گومانە پەروەردگار فەرمووی: ﴿لَّٰكِنِ الرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ مِنْهُمْ﴾ بەڵام ئەو جوولەکانەی خاوەنی زانیاری راست و دروستن و لە زانیاریدا قوول بوونەوە، ئاییناین بە بەڵگەوە وەرگرتووە بیروباوەڕیان وەکوو کێوی ئەلبورزە، ئاییناین بە ماڵ و سامانی دونیا ناگۆڕنەوە ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ موسوڵمانان بەگشتی یان موسوڵمانی ئوممەتی (محمد) (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوانەی بیروباوەڕیان دامەزراوەو ئیمانەکەیان هەڵیان دەنێ بۆ چاکەکاری و خواپەرستی، ئیمانەکەیان رەگەز پەرستی و دەمارگیری تێدا نیە، رواڵەتبازی و چاولێکەری نیە ﴿يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ برِوایان هەیە بەو قورئانەی کە بۆتۆ نێردراوە ئەی پێغەمبەری ئیسلام! ﴿وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ هەروەها ئیمانیان بەو نامە ئاسمانی و نیگا یەزدانیانە هەیە کە بۆ مووساو عیساو پێغەمبەرەکانی تر نێردراوە، ئیمانیان بە خوداو هەموو پێغەمبەران هەیە، جوداوازی ناخەنە نێوانیانەوە، ئیمانی پتەویان بە خوداو بە رۆژی قیامەت و بە زیندوبوونەوەو پاداشی کردەوەکانیان هەیە.

﴿وَالْمُقِيمِينَ الصَّلاَةَ﴾ وشەی (الْمُقِيمِينَ) دروستە بە مەنصوبی بخوێندرێتەوە مانای ستایش بگەیەنێ و ببێتە مەفعوول و بیهی بۆ فێعلێکی مەزندە کراو کە (أعنى) یا (أمدح) بێ واتە: بە تایبەتی ئەوانەی کە بە رێک و پێکی نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن، رووکن و مەرجەکانیان بە تەواوی بەجێ دێنن. دروستە بە مەجروری بخوێندرێتەوە ئەوکاتە دەتوانین بڵێین: مەعطوفە بۆ سەر (ما) لە (ما أنزل)دا واتە: (يؤمنون بما أنزل إليك وبالمقيمين الصلاة من الأنبياء) دەشتوانین بڵێین: عەطفە بۆ سەر (ك) لە (اليك)دا واتە: (بما أنزل إليك وإلى المقيمين الصلاة) یان عەطفە بۆ سەر (ك) لە (قبلك)دا واتە: (من قبلك وقبل المقيمين الصلاة من

أمتك) عەطف کردنە بۆ سەر (ك) لە (الیك)و (قبلك)مدا لەسەر رای کوفییەکانە ئەگینا بەلای بەصرییەکانەوە ئەو جۆرە عەطفە نابێ.

بۆیە لەناو پایەکانی ئیسلامدا تەنها باسی نوێژی کردووە، چونکە بەجی هێنانی نوێژ بە ڕێك و پێکی سەردەکێشێ بۆ بەجێ هێنانی ئەرکەکانی دیکەش، نوێژ ئادەمیزاد لە کردەوەی ناشیرین و گوفتاری فاحیشە دەگێڕێتەوە، دڵ و دەروون پاك دەکاتەوە، نەفس رام دەکا بۆ ئەوەی لە ماڵ و دارایی خۆی ببەخشێ بە هەژاران و نەبوان! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا، إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا، وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا، إِلَّا الْمُصَلِّينَ – المعارج/١٩ – ٢٢﴾.

﴿وَالْمُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ ئەوانەی زەکاتی ماڵ و سامانی خۆیان دەردەکەن و دەیدەنە ئاتاجان ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بە خودا هەیە و بەندایەتی بۆ دەکەن ﴿وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بە رۆژی قیامەت هەیە ﴿أُوْلَئِكَ﴾ ئەوانەی خاوەنی ئەو رەوشتانەن کە باس کران ﴿سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ لەمەو دوا لە رۆژی قیامەتدا پاداشی گەورەو باشیان دەدەینێ پاداشێك کە هەر خودا چۆنیەتی و چەندییەتی دەزانێ.

ئیبنو ئیسحاق و بەیهەقی لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئایەتی ﴿لَّكِنِ الرَّاسِخُونَ﴾ دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و ئوسەیدی کوڕی سەعیە و ثەعلەبەی کوڕی سەعیە و ئەسەدی کوڕی عوبەید هاتۆتە خوارێ، کە وازیان لە ئایینی جوولەکە هێناو بە راستی موسوڵمان بوون و هاتنە ریزی یارانی پێغەمبەرەوە!

هەروەها ئایەتەکان درێژە بە موناقەشە کردنی خاوەن نامەکان دەدەن و سەرپێچییە جۆراو جۆرەکانیان دەخەنە روو، چونکە وەکوو لە پێشەوە شی کرایەوە ئەو خاوەن نامانە بڕوایان بە هەموو پێغەمبەرەکان نیە، داخوازی سەیرو سەمەرەیان لە پێغەمبەرەکان داوا کردووە، هەر ویستوویانە لەمپەڕ لەبەردەم بانگەوازیکەران دابنێن و فرت و فێڵیان لێ بکەن، کەمێکیان نەبێ بە دڵسۆزی ئیمانیان نەهێناوە، وا لێرە بەو لاوە لەم چەند ئایەتەدا ئەوە دووپات دەکاتەوە کە نیگای خودا بۆ هەموو پێغەمبەران یەك جۆرەو جوداوازی تێدا نیە، ئەگەر ئەو

جوولەکانە راست دەکەن بڕوایان بە مووسا هێنابێ دەبێ ئیمان بە (محمد)یش بێنن و جیاوازی ئەم پێغەمبەرو ئەو پێغەمبەر نەکەن!

## نیگا بۆ پێغەمبەران هەمووی لەیەك سەرچاوەوەیە

﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ ﴾.

ئیبنو ئیسحاق لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عودەی کوڕی زەید وتی: بە گوێرەی زانینی ئێمە پەروەردگار دوای مووسا هیچ جۆرە نیگایەکی بۆ سەر هیچ کەسێك نەناردووە، واتە: کۆمەڵێك جوولەکە کە سوکەین و عوودەی کوڕی

زەیدیان تێدا بوو، بە پێغەمبەریان گوت: لەپاش مووسا خودا نیگای بۆ کەس نەکردووە! ئەوە بوو: پەروەردگار بە درۆی خستنەوەو فەرمووی: ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ﴾ ئەی محمد! ئێمە نیگامان بۆ تۆ ناردووە وەکوو چۆن نیگامان بۆ نوحو ئەو پێغەمبەرانەی دوا ئەو کردووە، جوداوازی لە نێوان نیگا کردن بۆ تۆو بۆ ئەوان نیە، تۆ ئەی محمد! پێغەمبەرێکی نەشاز نیت، ئەگەر ئەوان بە راستی ئیمانیان بە پێغەمبەرەکانی تر هەبوایە ئیمانیان بە تۆش دەهێنا نیگای یەزدانی یەك توخمەو گۆڕانی بەسەردا نایەو بۆ هەموو پێغەمبەرەکان چوون یەکە.

نیگا: پێ زاناندنو پێ راگەیاندنێکە لەخوداوە بۆ پیغەمبەرێك جا بەقسە لەگەڵ کردن بێ، یان مانا خستنە دڵ بێ بەشێوەیەك کە سەر بکێشێ بۆ زانیاری راستو دروستو لێشی عەیان بێ کە لەخوداوەیە.

دەتوانین بڵێین: نیگا زانیارییەکە ئادەمیزاد لە خۆیدا هەستی پێ دەکاو لێی یەقینو عەیانە لە خوداوە هاتووە، جا بەهۆی ناوەندەوە بێ یان بەبێ ناوەند بێ.

نیگایەك جۆرەو بۆ هەموو پیغەمبەران چوون یەکە، یەکەم پیغەمبەر کە نیگای بۆ کراوە حەزرەتی نووح بووە، یەکەم پیغەمبەر بووە کە لەسەر زوبانی شەریعەتو یاسا بلاوبۆتەوە، ئەمجار هەر بەو جۆرە نیگا بۆ پیغەمبەرەکانی دوای ئەویش کراوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ نیگامان بۆ ئیبراهیم کردووە کە بە باوکی پیغەمبەران ناسراوە، پێشی دەڵێن (خلیل الله) هەروەها بۆ ئیسماعیل کە کوڕە گەورەی ئیبراهیمەو باوکی هۆزی عەرەبەو باپیرە گەورەی پیغەمبەری ئیسلامەو لەمەککە لەدونیا دەرچووە، هەروەها نیگامان بۆ (ئیسحاق) کردووە کە کوڕی ئیبراهیمەو باوکی یەعقوبە کە بە ئیسرائیل بەناوبانگەو نەژادی جوولەکە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، لەشام لەدونیا دەرچووە، ئەمجار بۆ لوط کە برازای ئیبراهیمە، ئەمجار بۆ یەعقوب ئەمجار بۆ (أسباط) کە بریتین لە

(١٠) کوڕەکانی یەعقوبو دوو کوڕەزاکانی کە کوڕی یوسف بوونو کۆی (سبط)ە دوانزە کوڕ بوون، ئەسباط لە نەوەی ئیسحاقە.

ئەمجار نیگامان نارد بۆ عیساو هارونو ئەیوبو داودو سولەیمانو یونس، لە ئایەتەکەدا عیسا پێش ئەو پێغەمبەرانە خراوە چونکە جوولەکەکان تانەی لێ دەدەنو پڕوپاگەندەی دەربارە بڵاودەکەنەوە، ئەو کۆمەڵە پێغەمبەرەی ناوزەد کردن بۆ ڕێزلێنان.

پەروەردگار بە تایبەتی زەبووری بۆ داود نارد. زەبوور نامەیەکی ئاسمانی بووە، پەروەردگار بە نیگا ناردوویەتی بۆ داودو لە سەدو پەنجا سوورەت پێك هاتبوو حوکمو حەلاڵ کردنو حەرام کردنی هیچ شتێکی تێدا نەبوو بەڵکوو ناوەڕۆکی بریتی بوو لە پەندو ئامۆژگاری! داود (عَلَيهِ السَّلام) دەنگی زۆر خۆش بوو، کە دەستی دەکرد بە خوێندنەوەی زەبوور ئادەمیزادو جنۆکەو پەلەوەرو ئاژەڵ لێی کۆ دەبوونەوەو گوێیان لێ دەگرت، حەزرەتی داود زۆر نێك نەفس بوو هەرگیز فیزو لوت بەرزی نەبوو، لە بەروبوومی ئیشی دەستی خۆی بژێوی خۆی دابین دەکردو زرێ چنی دەکرد!!

ئەی محمد! ئێمە تۆمان نارد بە پێغەمبەرو نیگامان بۆ ناردووی‌و ڕەوانەمان کردووی بۆ سەر ئادەمیزادو وەکوو چۆن پێغەمبەری تریشمان جگە لەوانەی لێرەدا باسمان کردوون ناردووە، ﴿وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ﴾ ژیان نامەو بەسەرهاتی هەندێك لەو پێغەمبەرانەمان بۆ گێڕاویتەوە لە پێش نازڵ کردنی ئەم سورەتەدا وەکوو ئەو پێغەمبەرانەی کە لە سورەتە مەکییەکاندا ناویان هاتووە بۆ نموونە بە بۆنەی سەرگوزشتەی ئیبراهیم لە سورەتی ئەنعامدا دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ، وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ، وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ – الأنعام/ ٨٤-٨٦﴾.

ئەم سورەتانە کە بە زۆری سەرگوزشتەی پێغەمبەرانیان لە خۆ گرتووە سورەتی (الأنبياء، هود، الشعراء)ن سەرجەمی ئەو پێغەمبەرانەی لە قورئاندا ناویان

هاتووە بیستو پێنج پێغەمبەرن، کە ئەو زاتانەن: ئادەم، ئیدریس، نوح، هود، صالح، ئیبراهیم، لوط، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقووب، یوسف، ئەیوب، شوعەیب، مووسا، هارون، یونس، داود، سولەیمان، ئیلیاس، ئەلیەسەع، زەکەریا، یەحیا، عیسا، ذولکیفل بەلای زۆربەی راڤەکەرانی قورئانەوە – ئاخروسەرخەتمەی پێغەمبەرانیش حەزرەتی (محمد)ە سەلامی خودا لە هەموویان بێ بە تایبەتی لە سەردارو گەورەی هەموانیان کە حەزرەتی (محمد)ە!!

﴿وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ﴾ ژیان نامەو بەسەرهاتی هەندێ پێغەمبەرمان بۆ نەگێڕاویتەوە، لە قورئاندا باسمان نەکردووە وەکوو ئەو پێغەمبەرانەی کە نێردراون بۆ سەر ئەو گەلو نەتەوانەی کە مێژوو بەسەرهاتیان لە لایەن گەلەکەتەوە نەزانراوەو خاوەن نامەکانیش (جوولەکەو مەسیحی) ئاگاداریان نین؛ وەکوو ئەو پێغەمبەرانەی کە نێردراون بۆ سەر گەلو نەتەوەکانی صینو یابانو هیندو خۆرئاوای ئەفریقا.

بۆیەیش سەرگوزشتەکانیانی بۆ نەگێڕاوینەوە چونکە مەبەست لە سەرگوزشتە گەڕاندنەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرتنەو بەلگە هێنانەوەیە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی وەکوو لەشوێنێکا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى – یوسف/١١١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاء الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ – هود/١٢٠﴾.

پێویستە ئەوە بزانین: پەروەردگار بۆ سەر هەموو گەلو نەتەوەیەک چەند پێغەمبەرێکی رەوانە کردووە، رەحمەتو بەزەیی خودا بۆ سەرجەم ئادەمیزاد گشتی بووە، پێغەمبەرایەتی تایبەت نەبووە بە گەلو نەتەوەیەکی تایبەتو دیاری کراو؛ وەکوو جوولەکەکان پێیان وایەو دەڵێن: پێغەمبەر هەر دەبێ بەنو ئیسرائیلی بێ، بەلکووو قورئان بە روونی ئەوە ئاشکرا دەکا کە هەموو گەلو نەتەوەیەک پێغەمبەری بۆ نێردراوە، هەموو گەلو نەتەوەیەک پێغەمبەری تێدا نێردراوە ئەوەتا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خلَا فِيهَا نَذِيرٌ – فاطر/٢٤﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ –

النحل/٣٦﴾ ئەمە راستییەکە قورئان دەیچەسپێنێ، خاوەن نامەکان (أهل الكتاب) کە پێیان وایە قورئان لە کتێبەکانی ئەوان وەرگیراوە، ئەمەیان نەزانیوە کە قورئان ئەم راستییەی چەسپاندو زانیاریە تایبەتییەکانیش زیاتر رۆشنیان کردەوە.

ئەوەی کە مەشهورو باوە دەربارەی ژمارەی پیغەمبەران ئەو حەدیثەیە ئیبنو مەردەوەیهی لە ئەبو زەڕەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پرسیارم لە پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کرد وتم ئەی رەوانە کراوی خودا! ژمارەی پێغەمبەران چەندە؟ پێغەمبەر فەرمووی: «مِائَةُ أَلْفٍ وَأَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ أَلْفاً» وتم ئەی رەوانە کراوی خودا! چوندیان رەسولن؟ واتە ئومەتیان هەبووە؟ فەرمووی: «ثَلاَثُمِائَةٍ وَثَلاَثَةَ عَشَرَ، جَمٌّ غَفِيراً» وتم ئەی رەوانە کراوی خودا! یەکەمیان کێ بوو؟ فەرمووی: (آدەم) وتم ئەی رەوانە کراوی خودا! ئادەم پێغەمبەرو رەوانە کراو بووە؟ فەرمووی: «نعم خلقه الله بيده ثم نفخ فيه من روحه ثم سواه قبلاً» ئەمجار فەرمووی: «يا أبا ذر أربعة سريانيون: آدم، وشيث، ونوح وأخنوع وهو إدريس، وهو أول من خط بالقلم، وأربعة من العرب هود وصالح وشعيب ونبيك يا أبا ذر! وأول نبي من بني إسرائيل: موسى وآخرهم عيسى وأول النبيين آدم وآخرهم نبيك». ئەم فەرموودەیە ئەبو حاتەمی کوڕی حەببانی بەڕاستی ریوایەتی کردووەو بە صەحیحی حلێب کردووە.

ئەمجار پەروەردگار دەربارەی مووسا زێدە رێزێکی باس کردووە فەرمووی: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ پەروەردگار بە تایبەتی لەگەڵ مووسادا ئاخاوتنی کرد ئاخاوتنێك بی ناوەند، ئاخاوتنێکی راستو حەقیقەت، بۆیەش لێرەدا ئەم زێدە رێزیەی مووسای باس کرد، چونکە جوولەکەکان نەتەوەی مووساو مەبەستی سەرەکی باسەکەن!

وشەی (تكليم) کە چاوگەو بووتە مەفعوولی موطلەق بۆ فێعلی (كلم) جەختو چەسپاندن دەگەیەنێ.

تەکلیم بە نیسبەت پیغەمبەران بە مانا نیگا هاتووە وەکوو خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ – الشورى/٥١﴾. بەلام چۆنیەتی نیگاو

پێگەیشتنو تێگەیشتنی ئەوە باش وایە دەمی تێوە نەدەین، چونکە ناگەینە بنجو بنەوان تێیداو سوارچاکی ئەو مەیدانە نین، تەنانەت ئێمە چۆنیەتی پەیدا بوونو گەیشتنی قسەی ناوخۆمان کە بە هۆی شەپۆلی هەواوە لە یەکترەوە پێمان دەگا نازانین، چ جای چۆنیەتی قسەی خودا!

ئەمجار پەروەردگار مەبەستو حیکمەتی یەزدانی لەناردنی پیغەمبەران روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ ئەو پیغەمبەرانەی ناردوومانن هەموویان مـوژدەدەر بوون بۆ چاکەکارانو ترسێنەر بوون بۆ خراپەکاران بۆیەش ئەو پیغەمبەرانەمان رەوانە کردوون ﴿لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ بۆئەوەی ئادەمیزادان بەلگەیان بەدەستەوە نەبێ لەسەر خودا، دوای هاتنی پیغەمبەرەکان بۆ ناویانو پێ راگەیاندنی فەرمانی خودا ئیتر رۆژی قیامەت بە هانەیان بەدەستەوە نابێو ناتوانن داکۆکی لە خۆیان بکەنو بلێن: نەمان زانیوە چیمان لەسەر بووە چیمان لێ قەدەغە بووەو کەس ئاگاداری نەکردووینەوەو ئێمە بێ ئاگا بووینو هیچمان نەزانیوە، وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا أَهْلَكْنَاهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِ لَقَالُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَى – طه/١٣٤﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً – الإسراء/١٥﴾ کەوابوو ناردنی پیغەمبەرانو ناردنە خوارەوەی نامە ئاسمانییەکان بۆ ئەوەیە: کە کەس عوزری نەمێنێ!

ئایین بەرنامەیەکی یەزدانییە، عەقڵ بە تەنیا پەی پێ نابا، بە نیگا نەبێ نازاندرێ، ئایین لەگەڵ یاساکانی سروشتدا دەگوونجێ نەفس پاك دەکاتەوەو ئامادەی دەکا بۆ ژیانی هەتا هەتایی لە جیهانی قودسیدا، پەیرەو کردنی ئایین سەردەکێشێ بۆ پاداشو، گوێ پێ نەدانی دەبێتە هۆی سزا، ئەم پاداشو سزایەش بەبێ پێگەیشتنی بانگەوازی پیغەمبەران نابێ! ﴿وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ پەروەردگار بالا دەستەو هەر شتێکی بوێ هیچ کەس نیە بتوانێ بەرەنگاری بکا، داناو حەکیمە لە کارەکانیداو کەریمی کارسازە!

بەهانەو بەلگە بەدەست کەسەوە ناهێلێتەوەو وەکوو لە صەحیحی موسلیمو بوخاریدا هاتووە ئیبنو مەسعوود دەفەرموێ: پیغەمبەر فەرموویەتی:

(کەس بە ئەندازەی خودا عیزەت دار نیـە، بۆیـە بـە ئاشکراو بـە نهێنـی فاحیـشەو کاری ناشیرینی یاساغ کردن، کەس بە ئەندازەی خودا مەدح کردنی پێ خۆش نیـە، بۆیە مەدح‌و سوپاسی خۆی کردووە، کەس بە ئەندازەی خودا عوزر هێنانـەوەی پـێ خۆش نیە بۆیە پیغەمبەرانی رەوانـە کـردوون بـە مـوژدە بـەخش‌و ترسـێنەر.. جـا لەکاتێکدا ئایەتی پێشوو ﴿إِنَّـا أَوْحَيْنَـا إِلَيْـكَ﴾ پیغەمبەرایـەتی (محمد) دەسـەلمێنێ بـەرەنگاری موشـریك‌و ئـەهلی کیتـاب دەکـاو بۆچـوونەکانیان رەت دەکاتـەوەو لـە سـیاقی ئایەتـەکان ئـەوە وەردەگـیرێ کـە جوولەکـەو موشـریکەکان ئینکـاری پیغەمبەرایەتی (محمد)یان دەکـردو شـایەدی بـە پیغەمبەرایـەتی ئـەو زاتـە نـادەن! پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ﴾ واتە: بـەڵام خـودا شـایەدی بۆ تۆ دەدا کە رەوانە کراوی یەزدانی‌و ئەو پیغەمبەرەی قورئانت بۆ نێردراوە: ئـەو قورئانـەی کەتـەلۆکی بوونـەوەرو بەرنامـەی ژیانـەو یاسـای پەسـەندو شـاکاری پەروەردگارە، ئەو قورئانەی کە ﴿لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيـلٌ مِّـنْ حَكِيمٍ حَمِيـدٍ – فـصلت/٤٢﴾ جـا کـێ پێـی بـاوەڕ ناکـا بـا بـاوەڕ نـەکاو بـە درۆی بخاتەوە!!؟! بە پیغەمبەر دەفەرموێ ئەوانە وێـڕای ئاشـکرایی پیغەمبەرایەتیەکەت شایەدی بە پیغەمبەریت نادەن بەڵام خودا شایەدی پێ دەدا! ئەمجار ئـەم شـایەدییە دووبـارە دەکاتـەوەو جـەختی لەسـەر دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿أَنزَلَـهُ بِعِلْمِـهِ﴾ پـەروەردگار قورئـانی ناردۆتـە خـوارێ پـڕە لـە زانـستی یـەزدانی، نـە ئـەتۆو نـە نەتەوەکەت ئاگاتان لە ناوەڕۆك‌و شێوەی شـاکاری نـەبوو، نەتانـدەزانی کـە پـڕە لـەو هەموو زانستیە یەزدانییەو ئەو هەموو زانیاریە ئـەدەبی‌و رامیـاری‌و کۆمەڵایـەتی‌و سەرگوزشـتەو بەسـەرهاتی پیغەمبـەرە پێـشینەکان‌و نەتـەوەکانیانی تێدایـە! پەروەردگار ویستی وا بوو کە بەنـدەکانی ئاگـادار بکـا بەسـەر ئـەو هەمـوو بەڵگـەو رێنومایـە یەزدانییـەدا کـە قورئـان لـە خـۆی گرتـوون، ویـستی بەبەنـدەکانی رابگەیـەنێ خـودا چـی خـۆش دەوێ‌و لـە چـی رازییـە، چـی پـێ ناخۆشـەو نایـەوێ، ویستی زانیاری غەیبی رابوردوو داهاتوو بە ئادەمیزاد رابگەیەنێ، نـاوە پیرۆزەکـانی خودا رەوشتە بەرزەکانی بناسێنێ: ئەو زانیاری‌و نـاوو رەوشـتانەی کـە پیغەمبـەرو فریـشتەش ئەگـەر خـودا پێـی نەگوتنایـە نەیانـدەزانی! وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿وَلَا

يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء – البقرة/٢٥٥﴾ وێڕای ئەوەی کە تۆ ئەی محمد! بڕوای تەواوت هەیە کە پیغەمبەری و پەروەردگاریش شایەدی تەواوت بۆ دەدا کە رەوانە کراوی و قورئانی بۆ ناردوی کە گەورەترین موعجیزەو بەڵگەی بەهێزە بۆ راستی پیغەمبەریەتیت ﴿وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ﴾ فریشتەکانیش شایەدیت بۆ دەدەن و بە پیغەمبەرو رەهبەری ئادەمیزادو ئەجندەکانت دەزانن، شایەدیت بۆ دەدەن کە سەرداری پیغەمبەرانی! جوبرائیل کە یەکێکە لەفریشتەکان خۆی قورئانی بۆ هێناوی و بۆی خوێندوییەوەو فێری کردوی، هەروەها پەروەردگار کۆمەڵێك فریشتەی کردنە یارمەتیدەری موسوڵمانان و گیانی مەردایەتی و ئازایەتی و خوراگرییان تێیدا بە هێز دەکردن وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرَّعْبَ – الأنفال/١٢﴾. دەی لەگەڵ شایەدی دانی ئەوانە هەموو: ئینکاری کردنی ئەو جوولەکەو موشریکانە چ رۆڵێکی هەیە؟! ﴿وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيدًا﴾ بەسە کە خودا شایەدیت بۆ دەداو شایەدی ئەو کیفایەتەو راسترین و کاریگەرترین شایەدییەو هیچ شایەتیدانێکی ناگاتێ!

وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً قُلِ اللّهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ – الأنعام/١٩﴾.

## گومرایی کافرەکانو سزادانیان، بانگکردنی ئادەمیزادان بۆ بڕوا کردن بە پیغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ)

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّواْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُواْ خَيْرًا لَّكُمْۚ وَإِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧٠﴾ ﴾.

پەروەردگار لە ئایەتەکانی پێشوودا بە شایەدی خۆی پیغەمبەرایەتی محمد (صلی اللهُ علیهِ وسلم)ی چەسپاندو شایەتی لەسەر راستی پیغەمبەرایەتییەکەی دا! ئەمجار لەم ئایەتانەی دواییدا هەرەشە لەوانە دەکا کە بڕوای پێ ناکەنو بە درۆی دەخەنەوە، وێڕای ئەوەش هەڵوێستو رەوشتی ئەو جوولەکانە روون دەکاتەوە کە لەوەپێش باس کراوە کە بڕوایان بە محمدو قورئان نیەو خەڵکی لە رێگەی خودا لا دەدەنو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ﴾ بێگومان ئەوانەی باوەڕیان بە خوداو قورئان نیە، ناهێڵن خەڵکی تریش موسوڵمان ببنو شوێن پیغەمبەر بکەون، شكو گومان فڕێ دەدەنە ناو دڵیانەوەو بۆ ئەوەی ئادەمیزادان لە ئایینی ئیسلام دووركەونەوەو، درۆو بوختان هەڵدەبەستن؛ وەکوو ئەوە دەڵێن

ئەگەر (محمد) پیغەمبەر بوایە بەیەکجار قورئانی بۆ دەهاتە خواریّ وەکوو چۆن تەورات بەیەك کەڕەت بۆ مووسا هاتە خواریّ یان دەڵێن: پیغەمبەران هەموویان دەبیّ لەنەوەی هارون‌و داود بن، ئا ئەو جوولەکانە ﴿قَدْ ضَلُّواْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ ڕێگایان لیّ گوم بووە، لەجادەی حەق‌و ڕاستی دوور کەوتوونەتەوە، بە تەواوی لە ڕێبازو بەرنامەی خودا لایان داوە، سەریان لیّ شێواوەو خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بوون!!

ئەمجار پەروەردگار بڕیاری عادیلانەی خۆی بەرامبەر ئەوانە دەردەکاو دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێگومان ئەوانەی بۆخۆیان کافر بوون‌و کردارو گوفتاریان کافرانەیە ﴿وَظَلَمُواْ﴾ ستەمیان لە کەسانی دیکە کردووە کەبە قسەی لووس هەڵیان خەڵەتاندوون‌و بە هەموو شێوەیەك کاریان تیّ کردوون ﴿لَمْ يَكُنِ اللّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ﴾ ئەوە داب‌و نەریتی خودا وانیە لێیان خۆش ببیّ، قانون‌و یاسای خۆی وا ڕەسا نەکردووە لەو شێوە کوفرو ستەمکارییە چاوپۆشی بکا لە ڕۆژی قیامەتدا تۆڵەو سزایان لیّ دەستێنیّ، چونکە کوفرو ستەمکاری لە هەر کەسێکدا هەبن کاریگەری خۆیان لە دڵ‌و دەروونیدا دەچەسپێنن‌و چۆنیەتیەکی تیدا دەخولقێنن!! بە گوێرەی سوننەتی خودا بە بیروباوەڕی پتەو کردەوەی چاك نەبیّ ناسڕدرێتەوە، دیارە پاش مردن‌و هاتنی ڕۆژی حیساب تازە ئەو هەڵە لە کیس چووە، تازە ئیمان هێنان دەوری نیەو کردەوەی چاکیش نە دەکریّ، نە نرخی هەیە، چونکە ئیمان‌و کردەوە مەرجە دەبیّ لە ژیانی دونیاداو پێش سەرەمەرگ بن!

﴿وَلاَ لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقاً إِلاَّ طَرِيقَ جَهَنَّمَ﴾ شارەزاییان ناکا بۆ ڕێگەی خێرو چاکە، دوای ئەوەی بۆخۆیان بە ویست‌و ئیرادەی خۆیان ڕێگەی کوفرو ستەمکارییان هەڵبژارد ئیتر خودا توفیقیان نادا بۆ گەیشتن بە ڕێگەی ڕاست؛ داب‌و نەریتی خودا وایە کە ئەوانە تۆڵەی کردەوەکانیان لیّ وەربگیرێتەوە، جگە لەڕێگەی دۆزەخ ڕێگەی تر نەدۆزنەوە، تەنها بۆ ڕێگەی دۆزەخ شارەزا بکرێن ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، لە وێدا مردن‌و لە ناوچوونیان بەسەردا نایە، ژیانیان لە ناو ئەو سزا سەخت‌و سامناکەدا بەردەوامەو بڕانەوەی نیە ﴿وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللّهِ يَسِيرًا﴾ ئەو سزادان‌و عەزابە بۆ خودا ماندوو بوونی تێدا نیە، چونکە ئەو

دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هیچ شتێکی لێ عاسی نابێ، تاك‌و تەنیاو باڵا دەست‌و سەرکوتکەرو بە تاوانایە، کاری هەموو عەدالەت‌و دانایی‌و حیکمەت ئامێزە. ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار شوبهەو رەخنەی جوولەکەکانی رەت کردەوە بەڵگەکانی پوچەڵ کردنەوە، گەندەڵی بیروباوەریانی روون کردەوە، رووی خیطاب دەکاتە کۆمەڵی ئادەمیزاد بە گشتی فەرمانیان پێ دەکا: کە هەموو گوێڕایەڵی بانگەوازی محمد (صَلّی اللّهُ علیهِ وَسَلّمَ) بن‌و بڕوا بە پیغەمبەرایەتییەکەی بکەن‌و شوێنی بکەون‌و دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءكُمُ الرَّسُولُ بِالْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ﴾ ئەی ئادەمیزادینە! پیغەمبەرو رەوانەکراوی ئێمە هاتووە بۆ سەرتان ئایینێکی راست‌و دروست‌و بێ غەل‌و غەشی لە خوداوە بۆ هێناون ﴿فَآمِنُواْ خَيْرًا لَّكُمْ﴾ بڕوا بکەن بەو بەرنامەی بۆی هێناون‌و شوێنی بکەون ئەو بڕوا هێنانە بۆ ئێوە باشە، چونکە لە چڵك‌و پۆخەڵی کوفرو بێدینی پاکتان دەکاتەوە، رێگەی خۆشبەختی‌و کامەرانی دونیاو قیامەتتان نیشان دەدا، ئەو حەق‌و عەدالەتەی ئەو هێناویەتی لە خوداوە قورئانی پیروزو نیگای یەزدانە بەرنامەی بانگەوازییە بۆ خوداپەرستی‌و واز هێنان لە هەموو پەرستراوێکی تر جگە لە خودا!

ئەمجار هەڕەشە لە سەرپێچیکەران دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَكْفُرُواْ﴾ ئەگەر بڕوای پێ نەکەن، ئەوە خودا پێویستی بە ئیمانی ئێوە نیەو ئیمان بێنن یان نەی هێنن لە خودایەتی خودا زیادو کەم ناکا چونکە ﴿فَإِنَّ لِلّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەرچی لەبوونەوەردا هەیە مولکی خودایە، هەموویان دروستکراوو بەندەی خودان‌و ملکەچی خودایەتی خودان وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى إِن تَكْفُرُواْ أَنتُمْ وَمَن فِي الأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ – إبراهیم/٨﴾ زۆر ئایەتی تر هەن کە مەفهومی ئەو ئایەتە دەچەسپێنن ﴿وَكَانَ اللّهُ عَلِيمًا﴾ هەمیشە خودا زانایە بەو کەسانەی شیاوی شارەزایی کردنن‌و شارەزایان دەکا بۆ رێگەی راست‌و دەزانێ کێ شیاوی گومڕا بوونە گومڕای دەکاو هیچ کردارو گوفتارێکی بەندەکانی لێ گوم نابێ ﴿حَكِيمًا﴾ دانایە لە کردارو گوفتاردا لە تەشریع‌و بەرنامەدا پاداشی کەس نافەوتێنێ‌و هەرکەسە بە گوێرەی خۆی سزاو پاداشی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە، هەرگیز چاکەکارو خراپەکار بەیەك چاو

تەماشا ناکا! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ – ص/٢٨﴾.

## حەزرەتی عیسا لەڕوانگەی قورئانەوە

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا

ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧٣﴾

ئەمجار پەروەردگار دوای ئەوەی شوبهەو گومانی جوولەکەکان رەت دەکاتەوەو رێگای راستی پیشان دان، رووی خیطاب دەکاتە مەسیحییەکان‌و رای حەق‌و راستیان دەربارەی عیسا بەگوێدا دەداو دەفەرموێ: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ﴾ ئەی کۆمەڵی نەصاراو ئەو کەسانەی شوێن عیسا کەوتوون[1] زێدە ڕەوی دەربارەی عیسا مەکەن ئەوەندە بەرزی مەکەنەوە بیگەیەننە پلەی خودایەتی؛ ئەو ئادەمیزادێکە کراوە بە پیغەمبەر، بە گوێرەی بەرنامەی خوداو نیگای ئاسمانی هەڵس‌و کەوت بکەن‌و بیروباوەڕتان دابمەزرێنن! پەروەردگار ئەم خیطابەی ئاراستەی نەصاراکان کرد، چونکە دەربارەی عیسا زێدە رەویان دەکردو گەیاندبوویانە پلەی خودایەتی‌و لە پلەی پیغەمبەرایەتییەوە بردبوویانە پلەی خودایەتی‌و کردبوویانە هاوبەشی پەروەردگار، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو زیادە رەویان دەربارەی شوێنکەوتوانیشی کردبوو پێیان وابوو: کەبی گوناهن‌و هەرگیز تاوانیان لێ روونادا‌و هەرچی گوتوویانە دەبێ پەیڕەو بکرێ، ئەو راهیب‌و دێرنشینانە چی بڵێن راست یان درۆ، حەق یان بەتاڵ – ئەوە کەلامی خودایە دەبێ پەیڕەو بکرێ.

بە پێچەوانەشەوە جوولەکەکان زێدە ڕەوییان کردبوو عیسایان بە هیچ نەدەزانی‌و بڕوایان پێ نەبوو، ئەوەی کە پێویست بوو دەبوو میانەڕەو بوونایەو

---

[1] - ئەهلی کیتاب لێرەدا مەبەست تەنها مەسیحییەکانە وشەکە لێرەدا گشتییەو مەبەست تەنها مەسیحییەکانە واتە: وشەکە لێرەدا گشتییەو مەبەست لێی تایبەت‌و بەشێکی دیاری کراوە لەو مانا گشتیە.

بەو جۆرە بەرزو نزمییان تێدا نەکردایە! نەوەکوو نەصرانیەکان بە خودای بزانن، نەوەکوو جوولەکەکانیش بە درۆی بخەنەوەو بە هیچی نەزانن! بۆیە دەفەرموێ ئەی کۆمەڵی نەصارا! سنوور بەزێنی مەکەنو بەبێ بەڵگە زیادو کەم لە ئاییندا مەکەن ﴿وَلاَ تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقِّ﴾ جگە لە حەقو راستی چەسپاو بڕوا بە هیچی تر مەکەن، دەقێکی ئایینی متواتر یان بەڵگەیەکی عەقڵی چەسپاو نەبێ بڕوای پێ مەکەن! شتێك راست نەبێ دەربارەی خودا مەیڵێن! وریا بن خۆ لەو بیروبۆچوونەتان دوور بخەنەوە کە گوایە مەریەم خێزانی خودایەو عیسا کوڕی خودایە، هەروەها وەکوو جوولەکەکانیش نەچن مەریەم بە داوێن پیسو عیسا بە درۆو بێ بناغە حلێب بکەن! ﴿إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ﴾ لەڕاستیدا عیسا نە کوڕی خودایەو نە خودایە، بەڵکوو ئادەمیزادەو کوڕی خاتوو مەریەمی داوێن پاكو خواپەرستو رێزدارە پیغەمبەرێکی رەوانە کراوە بۆ سەر بەنو ئیسرائیل، فەرمانی پێ کردوون خوداپەرستی بکەن، گەردن کەچو فەرمانبەرداری بن، جڵەوگیری لێ کردوون لە هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوداو بڕیاردانی هەبوونی (تثلیث) سێ خودایی!!! زۆر بە دڵسۆزی هەڵیدەنان بۆ خوداپەرستیو دوورکەوتنەوە لە دونیا، موژدەی هاتنی پیغەمبەری ئاخر زەمانو نیشانەکانی پێداون، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ – الصف/٦﴾. عیسا بە فەرمانی خودا بە وشەی (کن) ببە، هاتۆتە وجود، دروست کردنی عیسا رەنگدانەوەی فەرمانی خودا بوو، ئاکامی موژدەی نێردراوی خودا کە جوبرائیل بوو موژدەی بە مەریەم داو وتی: من نێردراوم کە منداڵێکی زیرەكو وریات پێ ببەخشم ئەویش سەرسام بوو وتی: من چۆن منداڵم دەبی بەبێ ئەوەی کە مێردم کردبێو لێم نزیك بووبێتەوە!! ئەویش پێی گوت: ﴿كَذَلِكِ اللّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاء إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ – آل عمران/٤٧﴾ کەوابوو وشەی (کن) وشەیەکی تەکوینە، هەرکاتێ خودا ویستی شتێك بێنێتەدی بەو وشەیە ئامازەی بۆ دەکاو دەست لە عاست ئەو شتە دێتە وجود، عیساش لەئاکامی ئاڕاستە کردنی ئەو وشەیە هاتۆتە دی. کەوابوو پەروەردگار وەکوو چۆن دەتوانێ ئادەمیزاد بەبێ باوكو دایك دروست بکا وەکوو کە ئادەمی

دروست کرد یان بەبێ هەبوونی دایك وەکوو حەوای دروست کرد دەتوانێت ئادەمیزاد دروست بکات بەبێ ئەوەی باوکی هەبێ وەکوو عیسای کوڕی مەریەم، وەکوو لەشوێنێکی تر دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ – آل عمران/٥٩﴾. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ – الزخرف/٥٩﴾. ماددەو سرووشت بۆ خۆی دروست کراوبێ ناتوانێ شت بێنێتە دی ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ ئەم رستەیە دوو مانای هەیە:

١- یارمەتدراوە بە روحی خودا، فریشتەی خودا هاریکارییان کردووە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ – البقرة/٢٥٣﴾.

٢- دروست کراوە بەفوو تێکردنێك لەلایەن گیانی خوداوە کە جوبرائیلە، بەو بەلگەیە کە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا – الأنبياء/٩١﴾.

عیسا ئادەمیزادەو پیغەمبەرێکی رەوانە کراوە، پاڵپشت کراوە بە گیانێك لەخوداوە، بەشێك نیە لەخودا، وەکوو مەسیحییەکان تێگەیشتوون و بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەگینا دەبوایە هەموو ئادەمیزادێك کە لەخوداوەو بەهۆی فریشتەوە گیانی بەبەردا دەکرێ بەشێك بێ لە یەزدان!! پەروەردگار موسوڵمانانیشی وەصف دار کردووە بەوە کە بەگیانی خودا پاڵپشت دەکرێن و دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ – المجادلة/٢٢﴾.

موجاهید دەفەرموێ: ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ واتە: پیغەمبەر رەوانە کراوە لەخوداوە دروستکراوە لە گیانێکی دروست کراو، وەپاڵ دانی بۆ لای خودا بۆ رێزو تەقدیرە، وەکوو چۆن دەفەرموێ: ﴿هَذِهِ نَاقَةُ اللّهِ – الأعراف/٧٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ – الحج/٢٦﴾.

جا کەبنەمای دروستکردنی عیساو ئادەمیزادان و شتی تریش ئەوەبوو کە شیکرایەوە، بیرو بۆچوونی گومرایان پووچەڵ کرایەوە.

﴿فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ﴾ ئێوە بڕوای راست و دروست و پتەوتان هەبێ بە خوداو بە پیغەمبەرانی، زێدە رەوی مەکەن و بەرزو نرمی لە پلەی خودایەتی و

پیغەمبەرایەتی پیغەمبەراندا مەکەن ﴿وَلاَ تَقُولُواْ ثَلاَثَةٌ﴾ بەهیچ جۆرێك بڕیاری ئەوە مەدەن کە سێ خودا هەن (باوكو كوڕو روح القدس) یان بڵێین خودا سێ بەشە هەر بەشێکی عەینی بەشەکەی ترە، هەریەکەیان بەخودا حلێب دەکرێو کۆی هەرسێ بەشەکەش یەك خودایە، مەڵێن عیساو دایکی هاوبەشی یەزدانن، چونکە ئەو بڕوایە پێچەوانەی یەکتا پەرستییە، لادانە لە ئایینو بیروباوەڕی ئیبراهیمو پیغەمبەرەکانی تر، شوێن کەوتنی باوەڕی بتپەرستییە، کۆکردنەوەی یەکتا پەرستیو سێ خودایی عەقڵ وەری ناگرێو هۆشمەندان پەسەندی ناکەن ﴿انتَهُواْ خَيْرًا لَّكُمْ﴾ ئەی کۆمەڵی مەسیحی واز لە بڕوای سێ خودایی بێنن؛ بڕوایەکی ترتان هەبێ ئەوە باشترە بۆ ئێوە ئەویش بیروباوەڕی سەرجەم پیغەمبەرانە کە بریتییە لە یەکتاپەرستی.

﴿إِنَّمَا اللّهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ یەزدان بۆ خۆی خودایەکی تاكو تەنیایە، پارچەو بەشی ئەم لاو ئەو لای نیە، لەهیچ شتێکی دروستکراوان ناچێ ﴿سُبْحَانَهُ أَن يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ﴾ زۆر پاكو بێ خەوشو دوورە لەوەی کە منداڵی هەبێ منداڵ بەو مانایەی کە پێك بێ لە موتربە بوونی تۆوی پیاو لەگەڵ هی ژندا — جا ئەگەر منداڵی (مجازی)بێ ئەوە تایبەت نییە بە عیساوە، کەوابوو خودا منداڵی حەقیقی نیە بەڵام ﴿لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَات وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە چ بە موڵکایەتی چ بە دروست کردن (عیسا)ش لەگەڵ دابێ، هەموو هی خودایە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا – مريم/۹۳﴾ یان دەفەرموێ: ﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ – الأنعام/۱۰۱﴾ لەم حوکمەشدا جیاوازی لەنێوان پیغەمبەرانو فریشتەکانو دروستکراوەکانی تردا نیە ئەوانەی لە سەرەتادا بەبێ دایكو باوك دروست کراون وەکوو ئادەمو فریشتەکان، یان ئەوانەی کە لەیەك کەس دروست کراون وەکوو حەواو عیسا یان ئەوانەی کە لەدایكو باوك دروست کراون... هتد.

﴿وَكَفَى بِاللّهِ وَكِيلاً﴾ کیفایەتە کە خودا پارێزەرو پشت پێ بەستراو بێ. ئیمامی رازی دەفەرموێ: واتە: خودا بەسە بۆ هەڵسوڕانی ئیشو کاری دروستکراوانیو پارێزگاری کردنی بوونەوەر.

﴿لَّن يَسْتَنكِفَ الْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْداً لِّلّهِ وَلاَ الْمَلآئِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ﴾ مەسیح بۆ خۆی لاری لەوەنیە کە بەندەی خودا بێ، هیچ نەنگی لە بەندایەتی کردنی بۆ خودا نابینێ، هەروەها فریشتە نزیکەکانی بارەگای (ئەقدەس)یش بەلایانەوە نەنگی نیە کە بەندایەتی خودا بکەن، هەموو ڕێزو حورمەتو نرخێك لە بەندایەتی کردن بۆ خودادا دەبیننەوە هەموویان خۆیان بە بەندەی خودا دەزانن.

ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە فریشتە لەڕووی دروست کردنو کردەوەوە – لە عیسا ڕێزدارترن، یەکێك لە فریشتەکان (روح القدس)، کە بە فوتێکردنێکی ئەو عیسا هاتە دی، لەسەر بنەمای ئەم ئایەتە زوربەی زانایان بەڵگە دێننەوە کە فریشتە نزیکەکانی بارەگای ئەقدەس لە پیغەمبەران ڕێزدار ترن، چونکە سیباقی ئایەتەکە ڕەتکردنەوەی توندڕەوی مەسیحییەکانە دەربارەی عیسا کە بە خودای حلێب دەکەنو لە پلەی ئادەمیزادیو بەندایەتییەوە بردوویانەتە پلەی خودایەتی، چونکە ڕەتدانەوەی مەسیحییەکان، دەبێ لە بەرزەوە بۆ بەرزتر بڕوا نەك لە بەرزترەوە بۆ بەرز، بۆ نموونە دەڵێی: فلان کەس پیاوێکی ئاساییو ساکارە، لاری نییە دەستی وەزیرو ئەمیر ماچ دەکا، ئەگەر لەم جۆرە رستانەدا ئەمیر پێش بخەی هێنانی وشەی وەزیر بەدوایدا بێ هودەیە!

چونکە بەهێنانی وشەی ئەمیر وەزیر بەولاترەوە بەردەکەوێ، بڕێ زانای تر ئەم بۆچوونەیان ڕەت کردۆتەوەو دەڵێن: ئایەتەکە دەربارەی زێدە ڕێزی فریشتەکان دەدوێ لەوەدا کە زۆر قەبەو گەورەو بە دەسەڵاتنو دەتوانن کاری گەورە ئەنجام بدەن، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە نابێ پیغەمبەران لەوان گەورەتر بن!

﴿وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيَسْتَكْبِرْ﴾ کەسێ لاری هەبێ لە بەندایەتی کردن بۆ خوداو لوتبەرزی بکا ﴿فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيهِ جَمِيعاً﴾ ئەوە خودا لەڕۆژی قیامەتدا هەموو ئادەمیزادان لەدەشتی مەحشەردا کۆدەکاتەوە حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکا، هەرکەسە بە پێی خۆیو بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشو سزای دەدرێتەوە، ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ جا ئەوانەی بڕوایان بەخودا هەیەو کردەوەی باشیان ئەنجام داون ﴿فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزيدُهُم مِّن فَضْلِهِ﴾ ئەوا

پاداشی تەواویشیان دەداتەوە، ئەمجار بە فەضل‌و گەورەیی خۆی زێدە پاداشی تریشیان دەداتێ ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ اسْتَنكَفُواْ وَاسْتَكْبَرُواْ﴾ بەڵام ئەوانەی کە لارییان لە بەندایەتی کردن بۆ خودا هەیە تەکەبوورو لوتبەرزی دەکەن‌و ئەرکی سەرشانی خۆیان بەرامبەر یەزدان بەجێ ناهێنن ﴿فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلُيمًا﴾ ئەوە پەروەردگار سزای بە ئێشیان دەدا، بەگوێرەی بیروباوەڕو کردەوەی خۆیان سزایان دەداو هیچی لێ زیاد ناکا، چونکە خودا رەحمەت‌و بەزەیی لە رق‌و غەزەبی زیاترە.

﴿وَلاَ يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ اللّهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا﴾ ئادەمیزادان جگە لەخودا کەسێکی تریان دەست ناکەوێ کاروبارو بەرژەوەندییان بەڕێوە بەرێ، کەس نیە بتوانێ بەندەیەك لە سزای خودا رزگار بکاو یارمەتی بدا، سزای لەسەر هەڵبگرێ وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ – غافر/٦٠﴾.

## بانگەوازی کردنی خەڵك بۆ ئیمان هێنان بەقورئان

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَـٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾ ﴾.

لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار چەند بەڵگەو دەلیلێکی لەسەر دووڕوو موشریك‌و جوولەکەو مەسیحییەکان راست کردەوە، پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (محمد)ی چەسپاندو کردنی بە رێخۆشکەرو بەرکوڵ بۆ بانگەوازی کردنی هەموو ئادەمیزاد بۆ بڕوا هێنان بە قورئانی پیرۆزو کردنی بە بەرنامەی ژیان‌و فەرمووی:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئەی کۆمەڵانی ئادەمیزاد! ئەی خەڵکینە! بێگومـان لەلایـەن یەزدانـەوە بەڵگـەو نیـشانەیەکی زۆر ئاشـکراتان بـۆ هـاتووە، حەقیقەتی بڕوا بەخوداو نظامو یاسای ژیـانی کۆمـەڵتان بـۆ ئاشکرا دەکا، ئـەویش ئـەو پیغەمبـەرە نەخوێندەوارەیـە کـە بـە هـەڵسو کـەوتی ڕێكو پێکـی بـە ژیـانی عەمەلیو بانگەوازی کردنی شەرع ئامێز بەڵگەیەکی بەهێزو ڕۆشنە لەسـەر ڕاسـتی بانگـەوازی کردنەکـەی، چـونکە نەخوێنـدەوارێك کـە لەژیانیـدا نەچـووبێتە فێرگەیەکی زانستییەوە ئەو عیلمو زانستە باوانەی سەردەمی خۆی نەخوێندبێ، لە لـەناو خێـزانو لـە دەرەوە فێـری هـیچ خوێنـدنێك نـەکرابێ، بـە منـداڵی ئامـادە نەکرابێ بۆ ئەو ئەرکە قورسـەی: کە بەگـەورەیی شـانی بـەردا، کـە بریتـی بـوو لـە پەروەردەکردنی کۆمەڵانی ئادەمیزاد لەڕووی کۆمەڵایەتیو ڕامیاریو سـەربازییەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەوپـەڕی لێهـاتوویی ئـەو ئەرکـە قورسـە ئەنجامـدا، ئەمـە خـۆی لەخۆیـدا بەڵگـەو نیـشانەیە لەسـەر ئـەوە کـە لـەخوداوە یارمــەتی دراوە، پیغەمبەرێك کە بە منـداڵی لـەناو کۆمەڵگەیـەکی نەزانیـدا پـەروەردە بووبـێ بـەڵام هیچ دیاردەیەکی ناشـیرینی ئـەو کۆمەڵگایـەی پێـوە دیارنـەبێ، بـەڵکوو پـەروەردگار بەچاودێری خۆی پەروەردەی کردبێ بۆ هەڵگرتنی ئـەرکی پیغەمبەرایـەتی؛ تـا وای لێهات بووە بەنموونەی هەرە بەرزی مرۆڤایـەتی لـە ڕەوشـتو ژیـانو پێـشەوایەتیو هـەڵسو کەوتیـدا هـەر بۆخـۆی بەڵگەیـەکی عەمـەلی گـەورە بـوو لەسـەر ڕاسـتی پیغەمبەرایەتییەکـەی! وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿اللَّـهُ أَعْلَـمُ حَيْــثُ يَجْعَـلُ رِسَــالَتَهُ – الأنعام/١٢٤﴾ جا وێڕای ئـەوەی کـە بـۆ خـۆی بەڵگەیـە لەسـەر ڕاسـتی پەیامەکـەی ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا﴾ ناردوومانە بۆ ناو ئێوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! نامەیەك کە وەك ڕۆژ ڕوناکیی دەبەخشێ، ڕێگەی حـەقو ڕاسـت نیـشان خـەڵکی دەدا، چاكو خراپ لێك جیادەکاتەوە کە ئەویش قورئانی پیرۆزەو هاتووە بیروباوەڕی ئـادەمیزاد ڕاست بکاتـەوە، بەرنامـەی ڕاسـتو حـەق نیـشان مەردومگەل بـدا، یـەکتا پەرسـتی بچەسپێنێ، دژایەتیو بەرەنگاری بتپەرسـتیو شـیریك بکـا، بیروبـاوەڕی پڕوپووچـی جوولەکەو مەسیحی شێواو هەڵگەڕاوەو گۆڕدراو بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، دیـاردەی هیدایەتو خودا پەرستی ڕاست بچەسپێنێ، بناغەی ئەخلاقو یاسای ژیـان لـەبارەی

رامیاری‌و شەڕو ئاشتی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتی زانستییە بوونەوەرییەکان دابڕێژێ، ئەوانە وێڕای ژیاننامەی تایبەتی خودی پێغەمبەر بەڵگەی بەهێزن لەسەرئەوە کە ئەم ئایینە ئایینێکی حەق‌و راستە وێنەی نییەو ناشێ لێی لابدەن‌و فەرامۆشی بکەن!

﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ بِاللّهِ﴾ جا ئەوانەی بڕوایان بەخودا هێناوەو پەیڕەوی فەرمانی ئەویان کردووە ﴿وَاعْتَصَمُواْ بِهِ﴾ دەست بە قورئانەوە دەگرن‌و ئیسلام دەکەنە بەرنامەی خۆیان ﴿فَسَيُدْخِلُهُمْ فِي رَحْمَةٍ مِّنْهُ﴾ لەرۆژی دواییدا پەروەردگار دەیانخاتە بەهەشتی رازاوەی خۆیەوە دەیانخاتە بەر رەحمەتی تایبەتی خۆی‌و کەسی تر ناخاتە نێو ئەو رەحمەتەوە ﴿وَفَضْلٍ﴾ فەضل‌و بەخششێکی تایبەتی خۆی دەرێژێ بەسەریاندا، ئەوانە لەدونیاو قیامەتدا بەختەوەرو کامەرانن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (رَحْمَةٍ) لێرەدا مانای بەهەشتە (فَضْل) ئەو بەخشش‌و نازو نیعمەتەیە کە خودا دەیدا بە خۆشەویستانی کە نەچاو بینیوویەتی‌و نە گوێچکە بیستوویەتی نە بەسەر دڵی کەسدا رابردووە.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: (رَحْمَةٍ) و (فَضْل) بریتین لەو خۆشی‌و لەزەتەی کە لە بەهەشتا هەیە بەهەموو جۆرەکانیەوە!

﴿وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ شارەزای رێگایەکی راستیان دەکا بۆئەوەی بگەن بە پاداشتی باشی نەبڕاوەی خۆی، شارەزای رێگەیەکیان دەکا کە کامەرانی دونیاو قیامەتیان دەست دەکەوێ، ژیانی دونیا بەسەر بەرزی‌و رێزداری بەسەر بەرن‌و لە قیامەتیشدا بە بەهەشتی رازاوە شادببن، ئەم رێگە راستەش بەهۆی دەست بە قورئان گرتن‌و شوێنکەوتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر دەستەبەر دەبێ، لێرەدا مەبەست لە هیدایەت شارەزایی کردن‌و بەرقەرار کردنە لەسەر رێگای راست‌و خوا پەسەند!

**هیدایەت لە قورئاندا دوو جۆری هەیە هیدایەتی گشتی‌و هیدایەتی تایبەتی:**

هیدایەتی گشتی وەکوو ئەوەی کە لە ئایەتی ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ – البلد/١٠﴾دا هاتووە واتە: شارەزایی کردن‌و رێگە نیشاندان، جا ئەم شارەزایی کردنە بەهۆی هەستەوە بێ، یان بەهۆی عەقڵەوە یان بەهۆی ئایینەوە بێ!

هیدایەتی تایبەتی وەکوو ئەوەی لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللّـهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ – الأنعام/٩٠﴾. یان کە دەفەرموێ: ﴿اهدِنَا الصِّرَاطَ الُمستَقِيمَ﴾ ئەم هیدایەتەی لەم جۆرە ئایەتانەدا هاتووە شارەزایی کردنی گشتی نییە بەڵکوو بریتییە لە یارمەتیو پشتگیریی کردن لەسەر بەردەوامبوون لەسەر ڕێگای خێرو سەرفرازی.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: پەروەردگار لە سەرەتای سوورەتەکەوە باسی یاسای ماڵو سامانی کرد، کۆتایی سوورەتەکەشی بە باسێك دەربارەی ماڵو سامان هێنا، ناوەڕاستی سوورەتەکەشی بەرەتکردنەوەی بیرو بۆچوونی ناحەزانی ئیسلام پڕکردەوەو موناقەشەی گرۆ موخالیفەکان دەکا.

## میراتگرتنی کەلالە، یان میراتگرتنی براو خوشکی باوکی یان دایکی

﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾﴾.

نەسائی لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: نەخۆش کەوتم، پیغەمبەر (صَلى اللـهُ عَليـهِ وَسَـلمَ) دیدەنی کردم وتم: ئەی پیغەمبەری خودا! وەسیەت بۆ

خوشکەکانم بکەم بە سێیەکی ماڵەکەم!! فەرمووی: باشە، وتم ئەگەر نیوەی ماڵەکەم بکەم چۆنە؟؟ فەرمووی: باشە، پاشان تەشریفی رۆیی، ئەوەندە پێ نەچوو هاتەوە لام و فەرمووی: پێم وانییە بەم نەخۆشییە بمری، پەروەردگار ئایەتێکی ناردووە ئەندازەی بەشە میراتی خوشکەکانتی روون کردۆتەوە، ئەویش دووبەش لەسێ بەشە، لەوە بەولاوە جابیر دەیگوت ئەم ئایەتە دەربارەی من هاتۆتە خوارێ[1] دەفەرموێ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ﴾ زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوە: کە ئەم ئایەتە دەربارەی میراتی خوشك و برای باوك و دایکی یان باوکی هاتۆتە خوارێ، بەڵام خوشك و برای دایکی لەوەپێش لەسەرەتای سوورەتەکەدا بەشە میراتیان لە ئایەتی (١٢)دا دیاری کراوە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ﴾.

دەگێڕنەوە: ئەبوبەکر (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) لە وتارێکیدا فەرمووی: ئاگاداربن ئەو ئایەتەی پەروەردگار لە سوورەتی (النساء)دا دەربارەی میرات ناردوویەتیە خوارێ ئایەتی یەکەمیان دەربارەی منداڵ و باوك هاتۆتە خوارێ، دووەمیان دەربارەی ژن و مێرد و خوشك و برای دایکی هاتۆتە خوارێ، ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء)ی کۆتایی پێ هێناوە دەربارەی خوشك و برای باوك و دایکی یان خوشك و برای دایکی هاتۆتە خوارێ..

﴿يَسْتَفْتُونَكَ﴾ واتە: ئەی پیغەمبەر! داوات لێ دەکەن فتوایان بۆ بدەی دەربارەی کەسێك – دەربارەی (کەلالە) کە بریتییە لە میراتگر جگە لە باوك و دایك – میراتی لێ بگرێ وەکوو جابیری کوڕی عەبدوڵڵا کە لەکاتی مردنیدا نە باوکی هەبوو نەمنداڵی هەبوون چەند خوشکێکی باوك و دایکی هەبوو لەوەپێش بەشە میراتیان دیاری نەکرابوو، ئەوەی تا ئەوکاتە بەشە میراتی دیاری کرابوو خوشکی دایکی بوو کە بەتەنها شەشە یەکی بۆ دیاری کرابوو بۆ زیاتر لە یەکیش سێیەك دیاری کرابوو.

[1] ئیبنو حەجەری ئەسقەلانی دەڵێ: ئەمە سەرگوزەشتەیەکی ترە دەربارەی جابیر جیاوازە لەو سەرگوزەشتەی کە دەربارەی ئایەتی (١١)ی ئەم سوورەتە رابورد.

﴿قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ﴾ بەڵێ پەروەردگار فتواتان بۆ دەداو باسی کەلالەتان بۆ روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ﴾ ئەگەر کابرایەك مردو منداڵی لەپاش بەجێ نەمابوو باوکیشی نەمابوو ﴿وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾ خوشکێکی باوكو دایکی هەبوو، یان خوشکێکی باوکی هەبوو، ئەوە نیوەی میراتەکەی دەگرێ ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ﴾ ئەگەر خوشکەکە بمرێ میراتی لێ دەگرێ ئەگەر کوڕو کچی لەپاش بەجێ نەمابنو باوکیشی نەمابێ ڕێگای میراتگرتنی لێ بگرێ!

واتە: ئەگەر برای باوكو دایکی یان باوکی هەبوو ماڵو سامانی خوشکە مردووەکەی بەمیرات وەردەگرێ بەمەرجێك مردووەکە منداڵی لەپاش بەجێ نەمابن، باوکیشی نەمابێ چونکە ئەگەر باوك هەبوو برای ڕێگەی میراتگرتنی نابێ. مەبەست بە (برا) لێرەدا برای باوكو دایکییە یان باوکییە چونکە برای دایکی شەش یەکی بەردەکەوێ.

﴿فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ ئەگەر برا مردووەکە دوو خوشکی باوكو دایکی یان باوکی یان زیاتری لەپاش بەجێ مابوون ئەوا سێ یەکی ماڵە بەجێماوەکە دەبەن.

﴿وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء﴾ ئەگەر میراتگرەکان ژمارەیەك خوشكو برا بوون ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ بۆ هەر نێرینەیەك بەشی دوو مێینە هەیە.

﴿يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ﴾ پەروەردگار کاروباری ئایینو هەموو حوکمێکی حەڵاڵو حەرامتان بۆ روون دەکاتەوە بۆئەوەی ڕێگاتان لێ تێك نەچێو بزانن چۆن میرات بەش بەش دەکەنو هەرکەسە بەشە میراتی شیاوی خۆی بدرێتێ! ﴿وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار ئاگاداری هەموو شتێکە هەر حوکمو یاسایەك بۆتان دەردەکا بەرژەوەندی ئێوەی تێدایە لەژێر زانستو ئاگاداری پەروەردگاردا هاتۆتە دیو ئاکامی زانست فراوانی خودایە، کەوابێ روونکردنەوەکەی حەقو ڕاستەو پێناسەکەی لەجێی خۆیدایە!!

**دەربارەی میراتگرتنی (کەلالە) چوار حـاڵ تێبینـی دەکـرێو لـە ئایەتەکـە وەردەگیرێ:**

**حاڵەتی یەکەم:** پیاو بمرێو یەك خوشکی لەپاش بەجێ بمێنێ ئادەمیزاد لەم حاڵەدا خوشـکەکە نیـوەی ماڵەکە دەبـاو ئـەوی تـری دەدرێ بـە خزمـەکانی ئەگـەر هەبوون، ئەگینا ئەوەش دەگەڕێندرێتەوە بۆ خوشکەکە. خوشکیش لە خوشـك هـەر نیوە دەگرێ!

**حاڵەتی دووەم:** بە پێچەوانەوە ژنێك بمرێ تەنها برایەك میراتگری بـێ ئـەوە هەموو ماڵەکە دەگرێ، بڕاش لەبرا هەموو ماڵە بەجێماوەکە دەگرێ!

**حاڵەتی سێیەم:** ئەوەیە میراتگری پیاوە مردووەکە دوو خوشك یان زیاتر بـن ئـەوە دوو بـەش لەسـێ بـەش دەبـەن، زانایـان کـۆکن لەسـەر ئـەوە کـە زیـاد لـەدوو خوشکیش هەر دووبەش لەسێ بەش دەبەن چونکە زیاد لەدوو کچیش لـەدوو بـەش لەسـێ بـەش زیـاتر نابـەن، کـەوابێ بـەولاترەوە دوو خوشـك لـەو ئەندازەیـە زیـاتر وەرناگرن!

**حاڵـەتی چـوارەم:** ئەوەیـە میراتگرەکـان کۆمـەڵێك خوشـكو بـرابن ئەوکاتـە مـردووەکە نێربێ یان مێ بێ ماڵەکە بەسـەر میراتگرەکـان دابـەش دەکـرێ بـۆ هـەر نێرینەیەك ئەندازەی دوو مێینەی دەدرێتێ، بەڵام ئەگـەر خوشـكو براکان بـاوكو دایکیو باوکی بوون خوشكو بـرا بـاوكو دایکییـەکان پـێش دەخـرێن چـونکە بـراو خوشکی باوکی بە براو خوشکی دایكو باوکی بەش بڕاو دەبن.

بـەڵام ئەگـەر میراتگرەکـان کۆمـەڵێك بـرای مردووەکـە بـوون ئـەوە هـەموو ماڵەکە دەگرنو وەك یەك لەنێوانیاندا دابەش دەکرێ!

**بەیارمەتی خودا سوورەتی (النساء) تەواو بوو!!**

بسم الله الرحمن الرحيم

# سورەتی (المائدة)

ئەم سوورەتە: پێنجەم سوورەتی قورئانی پیرۆزە، ئەم سوورەتە ناونراوە سوورەتی (المائدة) چونکە چیرۆکی هاتنە خوارەوەی سفرەو خوانی ئاسمانی تێدایە، ئەو سفرەو خوانەی کە حەوارییەکانی داوایان کردن حەزرەتی عیسا بۆیان دەستە بەربکا، بۆئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر راستی پیغەمبەرایەتییەکەی‌و بیکەنە جەژن بۆ خۆیان.

هەروەها پێشی دەگوترێ: (سورەتی العقود) (سورەتی المنقذة) پیغەمبەر دەفەرموێ: (سورة المائدة تدعی في ملكوت الله: المنقذة، تنقذ صاحبها من أيدي ملائكة العذاب).

ئەم سورەتە مەدەنییە، واتە: دوای کۆچ کردنی پیغەمبەر بۆ مەدینە هاتۆتە خوارێ جا با لە مەککەش نازڵ بووبێ لە صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هاتووە کە ئیمامی عومەر فەرموویەتی: ئایەتی ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئێوارەی عەرەفە رۆژی جومعە لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا هاتۆتە خوارێ!

دەگێڕنەوە: کە پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) لە حەجی ماڵئاواییدا سورەتی (المائدة)ی خوێندو دوایی فەرمووی: (يا أيها الناس: إنَ سُورَةِ المائِدَة آخرُ مَا نَزَلَ فاحلُوا حلالها وَحرموا حرَامها) ئیمامی ئەحمەدو تیرمذی‌و بەیهەقی‌و حاکم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕنەوە فەرموویەتی: دوا سورەتی قورئان کە نازل بووبێ سورەتی (المائدة)و سورەتی (الفتح)ە دووبارە ئەحمەدو نەسائی‌و حاکم پەسەندیشی کردووە – لەگەڵ بەیهەقی لە عائیشەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: سورەتی (المائدة) دوا سورەتە هاتبێتە خوارێ، هەرشتێکی تێدا بوو بە حەڵاڵ دانرابوو بە حەڵاڵی بزانن، هەرچیشی تێدا بوو بە حەرام دانرابوو بە حەرامی بزانن!

ئەم سورەتە (١٢٠) ئایەتە بەگوێرەی سەرژمێر کردنی کوفییەکان، (١٢٢) ئایەتە بەگوێرەی سەرژمێر کردنی حیجازییەکان، (١٢٣) ئایەتە بەگوێرەی سەرژمێر کردنی بەصرییەکان.

پەیوەندی ئەم سوورەتە بە سوورەتی (النساء)ەوە لەچەند روویەکەوەیە! هەردوو سورەتەکە چەند پەیمانو بەڵێنو سەوداو حوکمو موناقەشە کردنی جوولەکەو مەسیحیو موشریكو دووڕووەکانیان لەخۆ گرتووە.

لە سورەتی (النساء)دا باس باسی عەقدی مارەبڕینو ئەماننامەو سوێند خۆریو پەیمانو بەڵێنو وەسیەتو سپاردەو وکالەتو بەکرێدانن.

سورەتی (المائدة)ش بە فەرمان بەوەفا کردن بە سەوداو بەڵێنو پەیماندان دەست پێدەکا، سورەتی (النساء) بەرکولو ڕێخۆشکردنێکی هێنا بۆ حەرام کردنی عەرەق سورەتی (المائدة)ش بە تەواوی حەرامی کرد، هەردوو سوورەتەکەش موناقەشەو ڕەتدانەوەی ئەهلی کیتابو موشریكو دووڕووەکانی دەربارەی بیروباوەڕو هەڵوێستیان لەبەرامبەر پیغەمبەرایەتی حەزرەتی (محمد) لەخۆ گرتووە!

سورەتی (المائدة) چەند حوکمێکی شەرعیو سێ چیرۆکی لەخۆ گرتوون: حوکمەکان حوکمی سەوداو مامەڵەو مارەکردنی ئافرەتی جوولەکەو مەسیحیو وەسیەت کردنی کاتی مردنو باسی خواردەمەنی وەکوو کوشتیو نێچیرو نێچیری حەرەمو سزاکەی، پاكو خاوێنی دەست نوێژو خۆشتنو تەیەمموم و حەرام کردنی عەرەقو قومارو سزای هەڵگەڕانەوە لە ئایین، سزای دزیو ڕێگریو کەفارەتی سوێند، باسی سەردەمی نەزانی دەربارەی (بوحەیرەو سائیبەو وەصیلەو حام) کە چەند جۆرە وشترێك بوون لەو چاخەدا گۆشتەکەیان حەرام کردبوون، هەروەها حوکمی ئەوانەی کە کار بە قورئان ناکەنو ئەو جۆرە شتانە کە ناواخنی ڕەتدانەوەو موناقەشەکردنی نەصرانییەکانو جوولەکەو موشریكو دووڕووەکان دەخاتەڕوو.

زانایانی ئیسلام دەفەرموون: ئەم سورەتە هەژدە فەریضەی تێدان لە سورەتەکانی تردا نین ئەو باسە شەرعییانەش باسی (المنخنقة)و (الموقوذة)و (المتردية)و (النطيحة)و (وما علمتم من الجوارح مكلبين)و (طعام الذين أوتوا الكتاب)و (المحصنات من الذين أتوا الكتاب من قبلكم)و پاكو خاوێنی تەواو (إذا قمتم الى الصلاة)و (السارق والسارقة)و (لا تقتلوا الصيد و أنتم حرم) تا دەگاتە

(عزيز ذو انتقام). هەروەها ﴿مَا جَعَلَ اللّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ﴾ هەروەها ﴿شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ...﴾الآية.

قورطوبی فەریضەیەکی لەم ئایەتە دیاری کردووە ئەویش ئایەتی ﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى...﴾ کە باسی بانگ، لەم سورەتەدا نەبێ لە سورەتی تردا نەهاتووە، ئەوەی لە سورەتی (الجمعة)دا هاتووە ئەوە تایبەتە بە نوێژی جومعە بەڵام ئەمەی ئێرە بانگی هەموو نوێژەکانە!

**بە کورتیو پوختی ئەم سورەتە بە تایبەتی چەند بنەمایەکی گرنگی ئیسلامی لەخۆ گرتووە:**

١- تەواو کردنی ئایینو راگەیاندنی ئەوە: کە ئایینی خودا یەك ئایینە هەر چەندە یاساو رێبازی پێغەمبەرەکان جوداوازی هەبوو!

٢- دیاری کردنی ئەوە: کە حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەرێکی گشتی هەموو کەسە، بانگەوازی کردنەکەی بۆ هەموو کەسە.

٣- پەروەردگار بە واجبی داناوە لەسەر موسوڵمانان کە دەروونی خۆیان پاك بکەنەوە، ئەگەر بۆخۆیان باش بن خراپیو گومڕایی خەڵکی تر زیانیان پێ ناگەیەنێ؛ پێویستی کردووە کە رێگای راست بگرنو وەفا بە عەهدو پەیمانی خۆیان بکەن، دەست درێژی کردنی بۆسەر خەڵك حەرام کردووە، یارمەتی یەکتری بدەن لەسەر چاکەو خوداپەرستی، هاریکاری یەکتری مەکەن لەسەر خراپەو دەست درێژی.

دۆستایەتیو بە گەورە دانانی کافرانی حەرام کردووە، لەسەر موسوڵمانانی پێویست کردووە کە شایەتی حەقو رەوا بدەن، حوکم بە عەدڵو یەکسانی لە نێوان موسوڵمانانو ناموسوڵمانانیدا بکەن.

٤- دەست نیشان کردنی حوکمی خواردەمەنییەکان، حەرام کردنی عەرەقو قومارو تیر خستنو کاری خۆمو بەختم!!

٥- کاروباری سزادانەوەی قیامەت تایبەتە بە خوداوە، کەسی تر دەسەڵاتی تێدا نیە، ئەوەی کە سوودو قازانجی بۆ رۆژی قیامەت هەیە راستگۆییو راستاڵییە.

سورەتەکە سێ چیرۆکیشی لەخۆ گرتووە بۆ پەندو ئامۆژگاری یەکەمیان چیرۆکی بەنی ئیسرائیلییەکان لەگەڵ حەزرەتی مووسادا (عَلَيْهِ السَّلام) کە گوتیان: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ دووەمیان چیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەمە کە قابیل هابیلی کوشت، ئەم تاوانە یەکەم تاوانی ئادەمیزادە لەسەر زەوی.

سێیەم چیرۆکی ئەو سفرەو خوانە بوو کە وەکوو موعجیزەیەك بۆ عیسا لەسەر داوای حەوارییەکان نازڵ بوو.

ئیمام ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە سورەتی مائیدە بۆ سەر پێغەمبەر نازڵ بوو لەو کاتەدا تەشریفی سواری وڵاغێك بوو وڵاغەکە نەیتوانی خۆی بۆ رابگرێ پێغەمبەر لە وڵاغەکە دابەزی! تا سورەتەکە تەواو بوو.

## وەفا بەوادەو بەڵێن: هاریکاری لەسەر خێرو چاکە

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ

ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە خودا هێناوەو ڕەوشتی موسوڵمانیتان تێدایە! ﴿أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ﴾ پابەندی وادەو بەڵێنی خۆتان بن، بەسەر ڕاستیو لە باری پەیمانی نێوان خۆتانو ئادەمیزادی تر ئەو پەیمانەی بۆ خۆتان بەخۆتان داوە بە جێی بهێنن، ئەو ئەرکانەی خراوەتە سەر شانتان بە ڕێكو پێكی ئەنجامیان بدەن، ئەو ئەرکانەی پەروەردگار خستویەتییە سەرشانتانو ئێوەش بەڵێنی جێبەجێ کردنیتان داوە، ئەو شتانەی خودا حەڵاڵی کردووە یان حەرامی کردووە، ئەو عەهدو پەیمانەی لە بڕواداران وەرگیراوە کە بڕواتان بە پێغەمبەرو قورئان هەبێ پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانیان بن.

### وشەی (عقود) شەش جۆر دەگرێتەوە:

پەیمانو بەڵێن لەگەڵ خودادا پەیمانی سوێند خۆری، پەیمانی هاوبەشی کردن لە ئیشدا بەڵێنی مامەڵەو سەودا، پەیمانی مارە کردنو ژنو مێردایەتی، شت لەسەر خۆ قەرار دان، هەر مەرجێك جێبەجێ کردنەکەی پێچەوانەی شەرع نەبێ پابەند بوونی پێویستە، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسلمَ) دەفەرموێ: «الْمُسْلِمُونَ عِنْدَ شُرُوطِهِمْ»[1] یان دەفەرموێ: «كُلُّ شَرْطٍ لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْط»[2] یان دەفەرموێ: «وَمَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»[3] ئەمجار

[1]- رواه الحاكم عن أنس و عائشة.

[2]- رواه البزار والطبراني عن إبن عباس.

[3]- رواه أحمد ومسلم عن عائيشة.

پەروەردگار دەست دەكا بە شی كردنـەوەی ئـەو حوكمـە شـەرعییانەی كـە فـەرمانی كـردوە بەپابەنـد بـوون پێوەیـان، سـەرەتا دەسـت دەكـا بـەو شـتانەی كـە زەروری ژیـانن‌و دەفـەرموێ: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ﴾ حـەڵاڵ كـراوە بـۆ ئێـوە سـوود وەرگرتن لە ئاژەڵ كـە وشـترو ڕەشـەوڵاغ‌و بـزن‌و مـەڕو گاكێوی‌و حەیوانـە كێـوی‌و ئاسـك‌و ئـەو جـۆرە شـتانەیە كـە دەتـوانن بـە هـۆی سـەربڕینی شـەرعییەوە گۆشتەكەیان بخۆن، شیریان بدۆشن‌و جۆرەها خواردەمەنی لێ دروست دەكرێ، سوود لە خوری‌و موویان وەربگیرێ، ﴿إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ جگە لەو گیانلەبـەرو ئاژەڵانـەی لێرە بەو لاوە لە ئایەتی داهاتوودا بەسـەرتاندا دەخوێندرێتـەوە بـەڵام بەمـەرجێك سوود وەرگرتن لەو جۆرە ئاژەڵانەتان بۆ ڕەوایـە ﴿غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ كـە لە بەستی مەككەدا لەكاتی ئیحرام بەستن بـە حـەج‌و عـەمرەدا ڕاوی نێچیر نەكـەن چـونكە ڕاو كـردن لـە حەرەمـدا حەرامـە تەنانـەت بـا ئیحرامیـشی نەبەسـتبێ، كەسـێكیش ئیحراكـی بەسـتبێ لـە دەرەوەی حـەرەمیش بـێ هـەر ڕاو كردنـی لێ حەرامــە، حــەرەمیش دوو شــوێنە حــەرەمی مەككــەو حــەرەمی مەدینــە لــە هەردووكیاندا ڕاوكردن یاساغە، ﴿حُرُمٌ﴾ كۆی حەرامە مەبەست ئیحرام بەسـتن بـە حەج یان بە عەمرە یان هەردووكیانـە ﴿إِنَّ اللّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ دڵنیـابن كـە خـودا چی بوێت بڕیاری لەسەر دەدا، چی بوێ حەڵاڵی دەكاو چـی بـوێ حـەرامی دەكـا بـە گـوێرەی حیكمـەت‌و دانـایی خـۆی‌و بەرژەوەنـدی ئـادەمیزاد بڕیـار دەداو حـوكم دەردەكا ئێوەش ئەی ئادەمیزاد پابەنـدی فـەرمان‌و بڕیارەكانی بن‌و وادەو بـەڵێنی خۆتان ببەنە سەر، هیچ پەیمانێكتان هەڵمەوەشێننەوە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحِلُّواْ شَعَآئِرَ اللّهِ﴾ ئەی ئـەو كەسـانەی بڕواتـان هەیـە دیاردە (مەعالیمە) ئایینیەكانی خودا بـەبێ ڕێـز سـەیر مەكـەن، تەگـەرە مەخەنـە بەردەم ئەوانەی دەیانەوێ جێبەجێی بكەن، سنوور بەزێنی‌و یاسا شكێنی مەكـەن. مەچـن لـە خۆتانـەوە ئـاڵ‌و گۆڕیـان تێـدا بكـەن‌و دەسـتكارییان بكـەن! بـەڵكوو بـە گوێرەی ئایین‌و چۆنتان پێ گوتراوە ئـاوا ئـەنجامیان بـدەن‌و ڕێزیـان لێ بگـرن ﴿وَلاَ الشَّهْرَ الْحَرَامَ﴾ ڕێزی مانگە حەرامەكان بگرن ئەو مانگانەی شەڕیان تێـدا حەرامـە. كە مـانگی (ذولقەعیـدەو ذولحیجـەو موحـەرەم‌و ڕەجـەب)ن لـەو مانگانـەدا جـەنگ

لەگەڵ کافرەکاندا مەکەن، ئەو مانگانە مەگۆڕن بە مانگی تر وەکوو لەوە پێش عەرەبەکان دەیان کردو بە ئارەزووی خۆیان (مانگە حرامە) کانیان دەگۆڕین.

لەو مانگانەدا حەجیان تێدا دەکرێ شتێك مەکەن کە ببێتە بەربەستو لەمپەر رێگەی حەج کردن لە موسوڵمانان بگرێ ﴿وَلاَ الْهَدْيَ﴾ رێگە مەگرن لە کۆشتیو قەربانی کە بۆ کەعبە دەبرێ بەو جۆرە لێی داگیر بکەنو لێی بستێنن، یان نەهێڵن بیگەیەنێتە شوێنی خۆیو بە کەعبە نەگا ﴿وَلاَ الْقَلاَئِدَ﴾ هەروەها دەست درێژی مەکەنە سەر ئەو ئاژەڵانەی کە دیاری کراون بۆ دیاری کەعبە، ملوانکەی قوربانیان لە ملی کراوە، نیشانەی دیاریو هەدیەیان پێوەیە، رێزیان مەشکێننو رێگەیان مەگرن با لە شوێنی خۆیان وەکوو پێویست سەر ببڕدرێن جا هەرچەندە وشەی (الهدي) (القلائد)یش دەگرێتەوە بەڵا بۆیە ناوی هێنا بۆ زێدە گرنگی پێدانو زێدە رێز لێ گرتن واتە: رێزی کۆشتیو قوربانی بگرنو مەبنە لەمپەرو بەربەست لە گەیشتن بە شوێنی خۆیان جا ملوانکە داربن یان نا!! ﴿وَلاَ آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ﴾ رێگە لەوانە مەگرن کە دەیانەوێ بچن بۆ دیدەنی کەعبە، شەڕیان لەگەڵدا مەکەن،ماڵو سامانیان داگیر مەکەن، ئەوانە بەو دیدەنییەیان بۆ کەعبە ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَانًا﴾ مەبەستیان بەدەست هێنانی سوودو قازانجی بازرگانییەو لە خودایان داوایە خێریان بە توشەوە بێو رەزامەندی خودا بەدەست بێنن. مەبەست لە پارێزگاری کردنی ئەم شتانەی باس کرانو رێز لێ گرتنیان ئەوەیە خەڵك لە کاتو شوێنی حەجو عومرەدا بە دڵنیاییەوە کارەکانیان ئەنجام بدەن، حاجیو عەمرەکاران تووشی لەرزو ترسو دڵەڕاوکێ نەبن، لە خوێنو ماڵو ناموسی خۆیان دڵنیابن.

﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُواْ﴾ کە لە ئیحرام بەستن بوونەوەو ئیحرامتان شکاندو لە ئاخی[1] بەست دەرچوون ئەوە ئەوەی لەوێدا لێتان یاساغ بوو بۆتان رەوایە، لە دەرەوەی حەرەم بە ئارەزووی خۆتان راو بکەنو نێچیر بگرن، هیچ تاوانتان لەسەر نیە راو بکەنو گۆشتەکەی بخۆن، سوود لە نێچیر وەربگرن. بەڵام ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ

[1] ئاخ: خاك، زەوی.

شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ﴾ با رقو کینەتان لە گرۆهو کەسانێك کە لەوەپێش ڕێگەی کەعبەیان لێ گرتبوون هەڵتان نەنێ دەست درێژی بکەنە سەریانو سنوور بەزێنی بکەنو تۆڵەیان لێ بکەنەوە.

ئەوە بوو موشریکەکان ساڵی حودەیبیە نەیانهێشت موسوڵمانان عەمرە بکەن، ئیتر ساڵی حەجیماڵئاوایی (حجە الوداع) کە ساڵی هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتەیە، بەم ئایەتە جڵەوگیری لە موسوڵمانان کرد کە دەست درێژی نەکەنە سەر ئەوانە، یاسا شکێنی نەکەن! بەڵکوو خودا فەرمانی چی پێ کردوون وا پەیڕەو بکەن، لەگەڵ هەموو کەسێکدا بە عەداڵەت کار بکەن!

جا چونکە دەست درێژی کردنی هۆزێك بۆسەر هۆزێك بەبێ هاریکاری یەکتری دەست درێژکەران نایەتە دی، بۆیە فەرمان بە هاریکاری کردنی چاکە دەکاو جڵەوگیری لە هاریکاری کردن لەسەر خراپە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ هاریکاری یەکتری بکەن لەسەر خێرو چاکە. (بر) لە لوغەتدا زۆرکردنی کاری خێرە؛ ئەو کارەیە شەرع پەسەندی دەکاو فەرمانی پێ دەکا (تقوی) بریتیە لە هەر کارێك خاوەن کارەکە لە زیانی دینو دونیا بپارێزێ، کە وابوو تا بۆتان دەکرێ هاریکاری یەکتری بکەن لەسەر کاری چاکە، بەڵام بە هیچ جۆرێك هاریکاری یەکتری مەکەن لەسەر تاوانو دەست درێژیو کاری ناپەسەند! لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ»[1] فەرمان بە هاریکاری کردن لەسەر چاکەو خۆپاراستن لەو شتانەی دەبنە هۆی زیانی دینو دونیا بەشێکە لە بنەمای ڕەهنومایی کردنی کۆمەڵایەتی لە قورئاندا، چونکە بە پێویستی دانراوە لەسەر

[1]- رواه مسلم وأصحاب السنن... و روى أحمد والدارمي عن وابصة بن معبد الجهيني إنه قال: (أتيت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فقال جئت تسأل عن البر والإثم قلت نعم و كان قد جاء لأجل ذلك فأخبره النبي (صلى الله عليه وسلم) ((إستفت قلبك، البر ما اطمأنت اليه النفس واطمأن إليه القلب والإثم ما جاك في الصدر و تردد في الصدر وإن أفتاك الناس وأفتوك)).

ئادەمیزادان کە لەناو خۆیاندا هاریکاری یەکتری بکەن لەسەر چاکەو هەر شتێك سوودی کۆمەڵایەتی تێدا بێ بۆ تاك و کۆمەڵ لە کاروباری دینیو دونیایی دا هەڵیان دەنێ بۆ کردنی هەرکارێکی تەقوا ئامێزو هەرشتێك کە ئادەمیزاد لە زیان بپارێزێ. بێگومان موسوڵمانان لە رۆژگاری زێڕینی یەکەمیاندا کە ویستبێتیان هاریکاری یەکتری بکەن! پێویستیان بە پەیمان بەستنو سوێند بۆ یەکتری خواردن نەبوو، موسوڵمان وێڕای جیاوازی رەنگو زمانو زێد، خۆی بە برای موسوڵمان دەزانێ، بە تەواوی پابەندی فەرمانی ئاسمانی ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾ بوون، بەلام کە موسوڵمانان گرو تینی ئایینیان تێدا کز بوو، موسوڵمانان پێویستیان بە پێك هێنانی کۆڕو کۆمەڵ هەبوو بۆ ئەوەی بتوانن لەژێر سێبەری ئەم رێکخراوانەدا هاریکاری لەگەڵ یەکتری جێبەجێ بکەن..

﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ خۆتان لە سزای خودا بپارێزن بەهۆی پەیڕەو کردنی فەرمانەکانی پەروەردگار کە لە قورئاندا بۆی روون کردوونەوە بۆ ئەوەی بە هۆی پشت هەڵکردنتان لە فەرمانی خودا تووشی سزا نەبن ﴿إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ بێگومان پەروەردگار سزای بە ئێشو بە سزایە، تۆڵە لە تاوانباران دەستێنێ!

## خواردەمەنی حەرام، تەقواکردنی ئایین، حەرام خواردن لەکاتی پێویست

﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِٱلْأَزْلَٰمِ ۚ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ۗ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ

مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ۚ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ ۙ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾.

ئەمجار دەست دەكا بە دەست نیشانكردنی ئەو شتانەی خواردنیان حەرامەو دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ﴾ یاساغە لێتان خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، مردارەوە بوو: بریتیە لەو ئاژەڵەی بەبێ سەربڕینی شەرعی، یان نێچیر كردنی گیانی دەردەچێ، خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو حەرامە، چونكە پیسە، هەروەها چونكە هەندێ ماددەی زیانبەخش لە لاشەی مرداربووەكەدا دەمێنێتەوە، كە بەهۆی نەخۆشی ئاژەڵەكە، یان مانەوەی خوێن تێیدا پەیدا بووە، ئەگەر سەر ببڕێ بەهۆی ڕەوان بوونی خودێنەكە ئەو ماددە زیانبەخشە، نامێنێ، زیادلەوەش تەبیعەتی بەرزو خاوێن قێز لە خواردنی ئەو جۆرە گۆشتە مردارەوە بوود دەكاتەوە، تەبیاتی تێ ناچێ! كەوابوو گۆشتی مردارەوە بوو زیانی بۆ دین‌و گیان‌و لەش هەیە، بۆیە خودا حەرامی كردووە! بە تێكڕا زانایانی ئیسلام خواردنی گۆشتی مردارەوەبوویان بەلاوە یاساغە، بەلام كوڵك‌و مووو ئێسقانەكانی بەلای ئەبو حەنیفەوە پاكن‌و درووستە بەكار بهێندرێن..

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ پیسن‌و بەكارهێنانیان نابێ! دوو جۆر لە گیانلەبەران بە مردارەوەبوویی دەخورێن ئەوانش ماسی‌و كوللەن.

ئیمام ئەحمەدو دارە قوطنی‌وبەیهەقی‌و ئیبنو ماجە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر فەرموویەتی: «أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ وَأَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ» هەروەها لە حەدیسێكی تردا

پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسیاری دەربارەی ئاوی دەریا لێ کرا لە وەڵامدا فەرمووی «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ» ﴿وَالدَّمُ﴾ هەروەها یاساغە لێتان خوێنی رەوان ئەو خوێنەی روونو دەرژێ نەك خوێنی تۆپەڵ بوو (متجمد) وەکوو جەرگو سپڵ، یان ئەو خوێنەی کە لەگەڵ گۆشتەکەدا دەمێنێتەوە؛ چونکە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا – الأنعام/١٤٥﴾ پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس دەربارەی (سپڵ) لە وەڵامدا فەرمووی: بیخۆن وتیان ئاخر هەر خوێنە؛ وتی ئاخر تەنها خوێنی رەوان حەرامە، ئەو خوێنەی لە کاتی سەربڕینی گیانلەبەردا دەڕوا! هۆی حەرام بوونی خوێنی حەرام ئەوەیە: کە مەڵبەندی بەکتریاو جەراثیمەو ژاراوی دەبێ! هەروەها قیزی لێ دەکرێو بە ناخۆش هەزم دەبێ، خوێن چەند جۆرێکی هەیە ئەگەر جۆرەکەیان جیا بوو زیان بە جەستە دەگەیەنێ!

﴿وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ﴾ هەروەها حەرامە لێتان خواردنی پێستو گۆشتو پیوی بەراز، بۆیەش هەر ناوی گۆشتەکەی هێناوە چونکە ئەو مەبەستی گرنگە! شەرعیش قیزی لە سوود وەرگرتن لە هەموو ئەندامانی بەراز کردووە، هەروەها وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ – الأنعام/١٤٥﴾ پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: « إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهَا يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟؟ فَقَالَ: لاَ، هُوَ حَرَامٌ» هەندێ لە زانایان بە رەوایان زانیوە کە پێستو مووی بەراز بەکار بێ هەرکاتێ زەروری بوو بە گوێرەی پێویستییەکە سوودی لێ وەردەگیرێ!

هۆی حەرام بوونی خوێنی بەراز هەبوونی زیانو قیز لێ کردنیەتی بە ناخۆشی هەزم دەکرێ، چونکە زۆر پیوو چەوری تێدایە، بۆ مەعیدە زیانی زۆرەو بە تایبەتی لە وڵاتی گەرمەسێردا، هەروەها چونکە بەراز بۆخۆی رەوشتی بێ غیرەتی تێدایەو، زۆربەی ئەو رەوشتانەی بەهۆی خواردنی گۆشتەکەیەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئادەمیزادەکان. هەر وەکوو چۆن زیانی مەعنەویشی تێدایە!

جا كە ئێستا لە هەندێ ولاتی پێشكەوتوودا ئاغەڵی تایبەتی بۆ گەلەبەراز دروست دەكرێ‌و پزیشك چاودێرییان دەكاو گۆشتەكەیان فەحص دەكرێ بۆ ئەوەی بەرگری لەو زیانە بكرێ، ئەمە نابێتە هۆی حەلاڵ بوونی خواردنی گۆشتی بەراز! چونكە ئەمە بۆ هەموو كەس‌و لەسەر هەموو بەرازێك ئەنجام نادرێ، هەر وەكوو چۆن زیانی مەعنەوەی‌و نادیار خۆ لێ پاراستنی ناكرێ! بەهەر حاڵ پێویستە موسوڵمانان لە هەموو حاڵ‌و شوێنێكدا خۆیان لە خواردنی گۆشتی بەراز بپارێزن‌و پابەندی فەرمانی خودا بن‌و گوێ نەدەنە بیروبۆچوونی ئەم‌و ئەو.

﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ هەروەها حەرامە لێتان هەر سەربڕاوێك كە ناوی غەیری خوای لەسەر برابێ، لە كاتی سەربڕیندا ناوی شتی تری لەسەر بەرز كرابێتەوە وەكوو ئەوەی ناوی پیغەمبەر، مەسیح، شێخی گەیلانی، مەولانا خالیدو كاك ئەحمەدی شێخ‌و........ هتد لەسەر ببرێ.

یان وێڕای ناوی خودا ناوی كەسێكی تری لەسەر ببرێ وەكوو ئەوە بڵێ (بەناوی خوداو پیغەمبەر ئەو ئاژەڵە سەردەبڕم!) بەلام ئەگەر بڵێ بە ناوی خودا ئەم ئاژەڵە سەردەبڕم، (محمد پیغەمبەری خودایە) قەیناكا، واتە: ئەگەر ناوی غەیری خودا بە عەطف بۆسەر ناوی خودا یان پێش ناوی خودا خرا ئەوە حەرامی دەكا، ئەگەر بە شێوەی عەطف نەبوو حەرام نابێ بەلام مەكروە دەبێ.

هۆی حەرام بوونی ئەم جۆرە سەربڕاوە هاوبەش پەیداكردنە بۆ خودا لاسایی كردنەوەی كافرەكانە لە عیبادەتداو وەكوو ئەوەی كە كافرەكان لە سەردەمی پێش ئیسلامدا لە كاتی سەربڕینی كوشتیدا دەنگیان بەرز دەكردەوەو دەیانگوت (بأسم اللات والعزى) یان دەیانگوت (بأسم هبل).

بۆیە ئیسلام ئەو جۆرە سەربڕاوانەی حەرام كردووە بە پێویستی داناوە كە لە كاتی سەربڕینی گیانلەبەراندا تەنها ناوی پاك‌و خاوێنی زاتی بێچوون بهێنرێ، هەركاتێ جگە لە ناوی خودا ناوی شتی تری لەسەر هات بەڕای تێكڕایی زانایان گۆشتەكەی حەرام دەبێ!.

﴿وَالْمُنْخَنِقَةُ﴾ هەر ئاژەڵێك بخنكێندرێ، جا خنكانەكەی بە ئەنقەست بێ یان بە سودفە بێ، بە هەر شێوەیەك‌و بەهۆی هەر شتێكەوە بخنكێ گۆشتەكەی

حەرام دەبێ، جا هەرچەندە ئەمە دەچێتە خانەی (مردارەوبووەوە) بەڵام چونکە بە کرداری بکەر ئەنجام دەدرێ قورئان بە تایبەتی ناوی هێنا نەوەکوو وا گومان ببرێ کە خنکاندن دەچێتە خانەی سەربڕینەوە! بۆ ئەوەی رایبگەیەنێ کە مەرج و گرنگ سەربڕینی شەرعیەو بەس.

﴿وَالْمَوْقُوذَةُ﴾ ئەو حەیوانەی بە شتێکی کوشندە لێی دەدرێ تا گیانی دەردەچێ بەبێ سەربڕینی شەرعی، جا ئەو شتە پێی لێ دەدرێ قۆچەقانی بێ یان هەر داروبەردێك و شتێك بێ چوون یەکەو ئەو گیان دەرچووە مردارەوە بووەو خواردنی گۆشتەکەی حەرامە، لە سەردەمی پێش ئیسلامدا ئەم جۆرە گۆشتەیان دەخوارد!!

(وقذ) لێدان لە گیانلەبەر حەرامە، چونکە، تەعذیب و ئازار پێ گەیاندنەو گیان لەبەر بردنە بەبێ سەربڕین پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»[1] بەڵام ئەو حەیوانەی بە شتی تیژو گەرم وەکوو (گولله)ی تفەنگ دەکوژرێ ئەوە گۆشتەکەی حەڵاڵە! هەرشتێك تیژو بڕندە بێ نێچیری پێ بکرێ کە بۆی هاوێژرا جەستەی ببڕێ و خوێنی لێ بێنێ گیانی دەرچوێنێ گۆشتەکەی حەڵاڵە!

﴿وَالْمُتَرَدِّيَةُ﴾ هەر ئاژەڵێك هەڵدێرێ و بەربببێتەوەو گیانی دەرچێ گۆشتەکەی حەرام دەبێ! ئەگەر پێش گیان دەرچوونی فریا بکەوێ سەر ببڕدرێ ئەوە حەڵاڵە!

﴿وَالنَّطِيحَةُ﴾ هەرحەیوانێك لە ئاکامی شەڕ کردن لەگەڵ حەیوانێکی تردا گیانی دەربچێ مردارەوەبووەو خواردنی حەرامە، تەنانەت با شاخی بشکێ لوتی بپژێ و خوێنیشی لێ بێ!

﴿وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ﴾ هەر حەیوانێك دڕندە بریندار بکا یان هەندێکی لێ بخوا و گیانی دەربچێ خواردنی گۆشتەکەی حەرامە هەرچەندە خوێنیشی لێ بڕوا.

---

[1] - رواه أحمد ومسلم وأصحاب السنن عن أبي يعلى شداد بن أوس.

﴿إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ مەگەر ئەو جۆرە حەیوانانەی کە گوتران بە زیندوویی فریایان بکەونو سەریان ببڕن بە شێوەیەکی شەرعی. بەڵام مردارەوە بوو، خوێنو گۆشتی بەراز بە هیچ شتێك حەڵاڵ نابن. مەگەر ناعیلاجی!؟ بە کورتیو پوختی ئەو حەیوانەی یەکێ لەو کارەساتانەی بەسەر دێ ئەگەر بە زیندوویی فریای کەوتی گومانی ئەوە دەبرا کە ئەو حەیوانە لەگەڵ ئەو حاڵەی بەسەری هاتووە دەژیو ئەوە سەبڕینەکە حەڵاڵی دەکا! ئەگەر گومانی ئەوە دەبرا کە ناژی دوو را هەیە:

١- حەنەفیو شافیعییەکان دەڵێن: سەردەبڕێو گۆشتەکەی حەڵاڵە بە مەرجێ لە کاتی سەربڕیندا نیشانەی زیندووی پێوە بێ، وەکوو جوڵاندنی قاچو کلكو پێڵوی چاوو گوێچکە.

٢- ئیمام مالیكو کۆمەڵێکی تر دەڵێن: سەربڕین حەڵاڵی ناکاو بێ سوودە!

﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ﴾ (نصب) چەند بەردێك بوون بە دەوری کەعبەوە ژمارەیان سێ سەدو شەست بەرد بوون عەرەبەکان لەسەردەمی نەزانیدا ئاژەڵیان لەسەر سەردەبڕین بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە بتەکان کە دەیانپەرستن. خوێنەکەیان لە دیواری کەعبە هەڵدەسوو، گۆشتەکەیان بەسەر بەردەکان (نصب) هەڵدەخست ئەم بەردانە جوودا بوون لە بتەکانیان، بتەکانیان نەقشو نیگاریان لەسەر بوو ئەم (نصب)و بەردانە لووسو پووس بوون.

پەروەردگار جڵەوگیری لە موسوڵمانان کرد لەوەی کە لەسەر ئەو بەردانە کوشتی سەر نەبڕن، تەنانەت ئەگەر لەو شوێنە حەیوان سەربڕدرێ ناوی خوداشی لەسەر بهێندرێ هەر گۆشتەکەی حەرام دەبێ! چونکە لاسایی کردنەوەی موشریکەکانی تێدایە!

ئەمجار پەروەردگار هەندێ حەرامی تر دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ﴾ حەرامە لێتان بەخت گرتنەوەو رەمڵ هاویشتن بە هۆی تیرەدارینەوە.

أَزْلاَمِ: بریتی بوو لەچەند دارێك لە شێوەی تیر، بەڵام بێ ئەوەی سەرەتیری پێوە بێ، ئەم پارچە دارانە سێ پارچە بوون لەسەر یەکیان نووسرا بوو (أمرنی

ربي) لەسەر دووەمیان نووسرا بوو (نهاني ربي) سێیەمیش هیچی لەسەر نەنووسرا بوو.

جا کە کەسێك دەیویست ئیشێك بکا؛ بچێ بۆ سەفەرێك ئەم تیرە دارانەی دەجوولاندن و دوایی یەکێکیانی رادەکێشا ئەگەر ئەوە بهاتایە دەستی، کە لەسەری نووسرا بوو (أمرني ربي) ئەوە ئیشەکەی دەکردو پێی وا بوو بەخت هاورێیەتی ئەگەر ئەوە بهاتایە پێشەوە کە لێی نووسرا بوو (نهاني ربي) وازی لێ دەهێناو دەستی لێ هەڵدەگرت! ئەگەر ئەوە بهاتایە دەستی کە هیچی لەسەر نەنووسرا بووئەوە تاقی کردنەوەکەی دووبارە دەکردەوە.

هەروەها هەر شتێك لەو جۆرە تاقی کردنەوانە کە (یا نصیب) ناسا بێ، حەرامەو پشت پی بەستنی ناشەرعییە! حیکمەتی حەرامی ئەمە ئەوەیە: کە جۆرێکە لە خەرافاتو خۆ هەڵخەڵەتاندن و بێ عەقڵییە، هەر کەسێ پشت بەو جۆرە کردارانە ببەستێ خۆی دەکاتە گاڵتە چیو بۆ کۆڵکە شێخو زڕە خوێندەوار! بۆیە ئایینی پیرۆز ئایینی زانستو عەقڵ ئەم جۆرە شتانەی حەرام کردوون و بە دابو نەریتی نەشیاوی سەردەمی نەزانی حلێب کردوون. زیاد لەوەش ئەم کاری (أَزْلاَمِ)ە درۆ هەڵبەستنی تێدایە بەدەم خوداوە چونکە ئەگەر مەبەستی بە (أمرني ربي) بت بێ ئەوە وێڕای ئەوەی کە ئیدیعای زانینی عیلمی نهێنی تێدایە کە زانستی نهێنی تایبەتە بە خوداوەو بەس. درۆ هەڵبەستێکی ئاشکراشە! بە داخەوە ئێستاش هەندێ زڕە موسوڵمانی نەزان و دەست بڕ لاسایی ئادەمیزادانی ئەم رۆژگارە دەکەنەوە بەو شێوە، یان بە شێوەیەکی تر ئەو بەخت گرتنەوە ئەنجام دەدەن! هی وا هەیە تەسبیحێکی درێژ دێنێتە پێشەوە لەسەر دەنکێکی نووسراوە (بکە) لەسەر یەکێکی تر نوویسراوە (مەکە) ئەمجار کابرا دێنێ ئەم تەسبیحە هەندێك دەنك بڕ دەداو ئەمجار دەنکەکان یەك بەدوای یەکدا وەلا دەنێ تا کۆتایی دەنکەکانی کە بڕی داون، ئیتر دەنکە کۆتاییەکە چی لەسەر نووسرا بوو ئەوە دەکاتە ئاوێنەی بەختی خۆی. هی وا هەیە فاڵ بە قورئان دەگرێتەوە بەرگی ئایینی لەبەر فاڵ گرتنەوەکەیان دەکەن و ناوی لێ دەنێن (الفأل الحسن) کە لە

راستیدا ئەمە فەئلول حەسەن نیە، بەڵكوو ئەو فاڵەیە كە پێچەوانەی رەشبینییەو جڵەوگیریی لێ كراوەو ئیسلام پێی نارازییە.

سەیر ئەوەیە موسوڵمانان وازیان لە كاركردن بە قورئان هێناوەو وازیان لەوە هێناوە كە بیكەنە بەرنامەی ژیانی خۆیان كەچی بۆ فاڵ گرتنەوە بڕوایان پێیەتی، یان دەبێت چەند ئایەتێك لە ناو جامێكدا، فنجانێك وادەنووسن یان لەسەر كاغەز دەینووسن نووشتەو جادوبازی پی دەكەن!! بەڕاستی ئەم جۆرە كارو بیروباوەڕانە لە گومڕایی‌و پڕوپووچی بەو لاوە چی تر نیەو هیچ شتێك لەم بارەوە لە پیغەمبەرەوە نەبیستراوە لەوە سەیرتر ئەوەیە: بڕێ دەست بڕو دەجال ئەمە دەخەنە خانەی قورعەی رەواوە. كە لە راستیدا لە گومڕایی زیاتر نیە، یان دەڵێن ئەمە شتێكە وەكوو ئیستیخارە وایە.

لە راستیدا ئەو شێوە ئیستیخارەیەی لە فەرموودەی پیغەمبەردا هاتووە بریتیە لە رووكردنە خوداو پەنا بۆ بردن‌و نوێژ كردن‌و پاڕانەوە لە دەرگای رەحمەتی، كە دڵی بەرێتە سەركارێك‌و شارەزایی بكا بۆ ئەنجام دانی، دڵی بەرێتە سەر ئەو شتەی كە سوود ئامێزەو خێری دونیاو قیامەتی تێدایە، ئەمە لە ئیشێكدا كە نەزانی خێر لە كام لای دایە، نەزانی خێر لە كردنیدا هەیە یان لە نەكردنیدا!!

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلم) چۆن فێری سورەتێكی قورئانی دەكردین ئاواش فێری نوێژی ئیستیخارەی دەكردین‌و دەیفەرموو: «إِذا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ العظيم، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هَذَا الأَمْرَ خَيْرًا لِي فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ قَالَ أَوْ فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي فَاقْدُرْهُ لِي، وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ ، اللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّهُ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ، ثُمَّ رَضِّنِي بِهِ»[1] ئەمجار ناوی مەبەستەكەی دێنێ.

---

[1]- رواه الجماعة (أحمد وأصحاب الكتب السنة).

﴿ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ﴾ هەموو ئەو شتە حەرامانەی باسکران پێویستە خۆیان لێ دوور بخەینەوە، چونکە دەرچوون لە سنووری خودا، سەرپێچی کردنی فەرمانەکانیەتی، هەڵس‌وکەوت کردنە بە شێوەی نامەعقول‌و ناسروشتی.

لەپاش ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی لە موسوڵمانان کرد کە نزیکی شتە حەرامەکان نەکەون، لە هەمان کاتدا هەڵی نان بۆ پابەند بوون بەو شەریعەتەی بۆی داناون، مزگێنی پێدان بە سەرکەوتن‌و زاڵ بوون بەسەر دوژمندا لە ڕۆژی حەجی ماڵئاوایی دا ئەم ئایەتە نازڵ بو: کە دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمْ﴾ ئەمڕۆ کە ڕۆژی عەرەفەیەو ساڵی دەیەمی کۆچییە ڕێکەوتی ڕۆژی جومعەیە، ئەو ڕۆژەی کە ئەم ئایەتەی تێدا هاتۆتە خوارێ، ئەمڕۆ کافرەکان ناهومێد بوون لە پووچەڵ کردنەوەی ئایینەکەتان‌و ناتوانن ئیتر بەسەرتاندا زاڵ ببن‌و بتانگێڕنەوە بۆ سەر بتپەرستی‌و ئایینی خۆیان، هەروەها شەیتان ناهومێد بوو کە لە ئاخی ئێوەدا بە قسەی بکرێ!

ئیبنو عەبباس دەڵێ: واتە: دانیشتوانی مەککە ناهومێد بوون لەوەی کە ئێوە بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی ئەوان‌و بتپەرستی دەست پێ بکەنەوە.

لە حەدیثی صەحیحدا هاتووە: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: «إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ يَئِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ» جا کەوابێ ﴿فَلاَ تَخْشَوْهُمْ﴾ لێیان مەترسێن، ترسی ئەوەتان نەبێ کە سەرپێچییان بکەن، زیانتان پێ بگەیەنن ﴿وَاخْشَوْنِ﴾ لەمن بترسێن، خۆتان بپارێزن لەو شتانەی دەبنە هۆی نارەزامەندی من، ئەمن یارمەتیتان دەدەم‌و سەرتان دەخەم، لە دونیاو لە قیامەتدا دەتانخەینە ژوور ئەوانەوە. ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئەمڕۆ ئەحکامی ئایینمان بۆ چەسپاندن، حەڵاڵ‌و حەرامان بۆ لێك جیا کردنەوە، هەموو حوکمێکی پێویستمان بۆ دیاری کردوون، هەموو شتێك دەربارەی ئایین ڕوون‌و ئاشکرایەو پەردە پۆش نین. هەموو یاساو نیظامێکمان بۆ داناون‌و کەم‌و کوڕی تێدا نیە. ﴿وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي﴾ منەت‌و بەخششی خۆمانمان بەسەرتاندا تەواو کرد وڵات بۆ ئێوە قۆرخ کراوە، هیچ لە موشریکەکان بۆی نیە هاوبەشیتان بکا لە حەج کردندا، مەککە ڕزگار کرا، ئەو وادەیەی پێتان درابوو بەجێ هێنرا، خەڵکی کۆمەڵ

کۆمەڵو دەستە دەستە دێنە ژێر بەیداخی ئیسلامەوەو سەرکەوتنتان بەدەست هێنا ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾ رازیم کە ئیسلام ئایینتان بێو بیکەنە بەرنامەی ژیانتانو ڕۆژی قیامەتیش بە گوێرەی ئەم ئایینە دادگایی دەکرێن، جگە لە ئیسلام نابێ هیچ ئایینێکی تر پەیڕەو بکەن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ – آل عمران/٨٥﴾. ئەم مزگێنیانە هەموو هاتنە دیو پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە هەشتا شەو ژیاو دونیای بەجێ هێشت! دەڵێن: ئیبنو عەبباس ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ......﴾ جوولەکەیەك گوێی لێ بوو وتی: ئەگەر ئەم ئایەتە بۆسەر ئێمە بهاتایە خوارێ ڕۆژی هاتنەخوارەوەیمان دەکردە جەژن، ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەو ئایەتە لە ڕۆژێکدا هاتە خوارێ بە دوو جۆر جەژن بوو هەم ڕۆژی جومعە بوو هەم جەژنی قوربان بوو.

ئیمام موسلیمو ئیمامەکانی تر لە طاریقی کوڕی شیهاب دەگێڕنەوە دەڵێن: پیاوێکی جوولەکە هاتە خزمەت حەزرەتی عومەر وتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئایەتێك لە کتێبی ئێوەدا هەیەو دەیخوێننەوە، ئەگەر بۆسەر ئێمەی جوولەکە بهاتایە خوارێ ئەو ڕۆژمان دەکردە جەژن بۆ خۆمان، ئیمام عومەر فەرمووی: ئەوە کام ئایەتە؟؟ وتی: ئایەتی ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ.......﴾ عومەر فەرمووی: من دەزانم لە چ ڕۆژێکدا هاتۆتە خوارێ، لە چ شوێنێك بوو هاتە خوارێ ئەو ئایەتە لە ڕۆژی جومعەو لە کێوی عەرەفە بۆ سەر پێغەمبەر هاتە خوارێ! مەبەست بە تەواوکردنی ئایین ئەوە نیە پێش ئەو ڕۆژە ناتەواو بووبێ ئەو ڕۆژە تەواو کرابێ! بەڵکوو مەبەست ئەوەیە: حوکمەکانی ئایین چەسپێندراونو قبووڵی نەسخ کردنەوە ناکەن، ئەو حوکمانە بۆ هەتا هەتایە بەردەوامو گونجاو لە بارن بۆ هەموو کاتو شوێنێك دەبن، مەبەست بە تەواو بوون دەرکەوتنو بڵاوبوونەوەیەتی ئەحکام لەخۆگرتنیەتی، دیاری کردنی حەڵاڵو دیاری کردنی حەرامە دیاری کردنی بنەمای بیروباوەڕو بناخەی شەریعەتو یاسایە!

وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ – الإخلاص/١﴾و ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ – الشورى/١١﴾و ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ – الأنعام/٧٣﴾.و ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ

وَالإِحْسَانِ – النحل/٩٠﴾و ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ – النحل/٩١﴾و ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ – آل عمران/١٥٩﴾و ﴿وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا – الشورى/٤٠﴾و ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى – الأنعام/١٦٤﴾و ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ – الأنعام/٢﴾.

جا ئایینێك ئەمە نموونەی دەقەكانی بێ، دیارە هەڵبژاردەی هەموو ئایینەكانە، لەگەڵ هەموو بەرژەوەندیە گشتیەكاندا گونجاوە، لەگەڵ هەموو تەطەورو پێشكەوتنێكدا هەڵدەكا، بە تەرازووی بەرژەوەندی گشتیو تایبەتی مامەڵە لەگەڵ بوونەوەر دەكاو میانڕەو رەفتار دەنوێنێ!

## خواردەمەنی حەڵاڵو مارەكردنی ئافرەتی یەهودیو مەسیحی

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤﴾ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍۗ وَمَن

يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار برێ لەشتە حەرامەکانی راگەیاندو بڕیاری حەرام بوونی ئەو شتانەی لەسەر هەموو موسوڵمانان دەرکرد! دێ هەندێ حاڵەت وەلا دەخاو لەو حوکمانە دەریان دەهاوێو دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ﴾ کەسێك ناچار بوو لە حاڵەتی برسییەتیو پێویستیدا بەبێ ئەوە مەبەستی حەرام خواردن بێ، حەزی لە تاوان نەبێ، بە ئەندازەی پێویست دەتوانێ لەو حەرامە برسایەتی خۆی لابەرێ؛ بەڵام هەر ئەوەندە پێویستییەکەی خۆی بەجێ بێنێو زێدە ڕەوی نەکا، ئەوە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ دڵنیا بن خودا لێخۆشبوو بە بەزەییە، لەسەر ئەو حەرام خواردنە سزاتان نادا، چونکە ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکا!

جا چونکە ئەصڵ لە هەموو شتێکدا رەوابوونە (إباحە)یە، لەم ڕووەوە پەروەردگار هەرچی لە زەویدا هەیە بۆ سوودی ئێمەی داناوە، ئەوەی کە لێی قەدەغە کردووین بۆیە لێی قەدەغە کردووین چونکە زیانی ئێمەی تێدایە! بەڵام ئادەمیزادان جاری واهەیە ئەوەی سوودی تێدایە بۆیان وازی لێ دێننو ئەوەی زیانی بۆیان هەیە دەستی بۆ دەبەن، وەکوو لە سەردەمی نەزانیدا عەرەبەکان مردارەوەبوو خوێنو، ئەو جۆرە شتانەیان دەخوارد. لە خەتوخۆڕایش، بە بیروباوەڕی پڕوپووچ، خواردەمەنی پاكو خاوێنیان لە خۆیان حەرام دەکرد وەکوو (بحيرة)و (سائبة) هتد.

بۆیە پێویست بوو پەروەردگار حەڵاڵو حەرام بۆ ئادەمیزاد روون بکاتەوە. ئیبنو جەریری طەبەری لەرێگەی شیعبییەوە لە عەدی کوڕی حاتەمی طائییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم) پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەو نێچیرانەی کە سەگ دەیگرێ، پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم) نەیزانی چۆن وەڵامی بداتەوە تا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ﴿تُعَلِّمُونَهُنَّ

مِمَّـا عَلَّمَكُـمُ اللّـهُ........﴾ ئیبنـو ئـەبی حاتـەم لـە سـەعیدی کـوڕی جوبـەیرەوە دەگێڕێتـەوە دەڵێ: عـەدی کـوڕی حاتـەمی طائیو زەیـدی کـوڕی موهەلهـەلی طائی پرسیاریان لە پیغەمبەر کرد وتیان: ئەی ڕەوانە کراوی خودا! ئێمە کەسانێکین، بـە هۆی سـەگو تاژییـەوە نێـچیر دەگـرین، خێڵـی زورمیـح سـەگی وایـان هەیـە، کـەرە کێویو گا کێویو ئاسك ڕاو دەکەن، پەروەردگاریش مردارەوەبـووی حـەرام کـردووە، لەم نێچیرانە چیمان بۆ ڕەوایە؟

ئـیتر ئـەم ئایەتـە هاتـە خـواریو فـەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَـاذَا أُحِـلَّ لَهُـمْ﴾ موسوڵمانان پرسیارت لێ دەکەن ئەی (محمد)! چ گۆشتو خواردنێکیان بۆ ڕەوایە؟؟

﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَـاتُ﴾ پێیـان بڵـێ: ڕەواو حەڵاڵـە بـۆ ئێـوە خواردەمـەنی پاكو خاوێن، هەر گۆشتو خواردنێك کە ئادەمیزاد بەلایەوە پاكو خاوێن بێ، هەر خواردنێك طەبیعەتو سروشتی پاكو بـە پـاکی بزانـێ حەڵاڵـە! ﴿وَمَـا عَلَّمْـتُم مِّـنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ﴾ هەروەها حەڵاڵـە بۆتـان نێـچیری سـەگو تاژی تەربییە دادراو، واتە: هـەر نێـچیرێك ئـەو جـۆرە سـەگو تاژییـە فێـر کراوانـە بیگرن خواردنی حەڵاڵە، بەمـەرجێك ئـەو سـەگو تاژیانـە لـە لایـەن ئـادەمیزادەوە فێری ڕاو کرابنو مەشق دادرابن.

خواردەمەنیە خاوێنەکان ئەوانـەن کـە قورئـان بـە حـەرام نـاوی نـەهێناون، لەناچنە بازنـەی ئـەو دە شـتەی کـە قورئـان تۆمـاری کـردوون، بـە حـەرامی دانـاون هـەروەها ئـەو شـتانەی لـە فـەرموودەی پیغەمبـەردا وەگـەلیان خـراونو بـە حـەرام حلێب کراون ئیتر جگە لەوانە هەموو گۆشتو خواردەمەنییەك حەڵاڵە!!

ئیمـامی ئەحمـەدو ئەصـحابی (السنن) لـە ئیبنـو عەبباسـەوە دەگێڕنـەوە فەرموویـەتی: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ): نَهَـى عَـنْ كُـلِّ ذِى نَـابٍ مِـنَ السِّبَاعِ وَعَنْ كُلِّ ذِى مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ».

هەروەها لە ئـەبو ثـەعلەبـەی خوشـەنیەوە فەرموودەیـەك ڕیوایـەت کـراوە: دەفەرموێ: «كُلُّ ذِى نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ فَأَكْلُـهُ حَـرَامٌ» رواهمـا أحمـد ومـسلم وأصحاب الـسنن. کـەوابوو ئـەو شـتانەی دەقـی شـەرعی دەربارەیـان نـەهاتبێ دوو جـۆرن جۆرێکیان پاكو خاوێنو حەڵاڵە، جۆرێکیان حەرامو پیسن، قاعیدەو قیاسیش بـۆ

پاكو خاوێنی، حەرامو پیسی وەرگرتنو وەرنەگرتنی زەوقی سەلیمە!! ﴿فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾ بخۆن لە گۆشتی ئەو نێچیرانەی كە ئەو بازو سەگو تاژییە راوكەرانە بۆ ئێوەی دەگرن، پاسی دەكا تا خاوەنەكەی دەگاتە سەریو هیچی لێ ناخوا! خۆ ئەگەر لێی بخوا بەلای زۆربەی زانایانەوە نێچیرەكە حەرام دەبێ چونكە دەشوبهێتە بەرماوەی درندە.

﴿وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهِ﴾ لەكاتی تێبەردانی سەگە راوكەرەكەدا ناوی خودا بێننو بیسمیللای لەسەر بكەن.

ئیمامی ئەحمەدو موسلیمو بوخاری لە عەدی كوڕی حاتەمەوە دەگێڕنەوە: دەڵێ: پیغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وَسلمَ) فەرموویەتی: «إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ الْمُعَلَّمَةَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَكُلْ مَا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَلاَ تَأْكُلْ فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ مِمَّا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ».

لە گێڕانەوەیەكی تردا هاتووە: كە فەرموویەتی: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيًّا فَاذْبَحْهُ وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قَتَلَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ فَكُلْهُ فَإِنَّ أَخْذَ الْكَلْبِ ذَكَاةٌ». ناو هێنانی ناوی خودا لەكاتی ناردنی راوكەرە فێركراوەكە بەلای جەماوەری زانایانەوە واجبە بەلای شافیعییەوە سوننەتە.

## بۆ رام كردنو فێركردنی سەگو تاژی سێ مەرج گەرەكە:

١- دەبێ سەگو تاژییەكە رام كراو بن.

٢- دەبێ ئەو كەسەی فێریان دەكا دەست رەنگینو كارامە بن لە فێركردندا.

٣- دەبێ ئەوەی خودا فێری كردوون ئێوەش فێری ئەو سەگو تاژییانەی بكەن، واتە: دەبێ بزانێ كە خاوەنەكەی دەینێرێ بۆ نێچیری، ئەگەر نێچیرەكەی گرت هیچی لێ نەخوا، هەركاتێ خاوەنەكەی ناردی بڕوا، هەركاتێ بانگی كردەوە بگەڕێتەوە! نیشانەی رام بوونەكەیان بەم جۆرەیە: ئەگەر حەیوانە راوكەرەكە بازو هەڵۆ بوون دەبێ لەگەڵ خاوەنەكەی بانگی كردەوە بگەڕێتەوە بۆ لای! ئەگەر سەگو تاژی بوون سێ جار نێچیر بگرنو لێی نەخۆن.

﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ تەقوای خودا بکەن، خۆتـان بپـارێزن لـەو شتانەی کـە دەبنـە هۆی سزای خودا، پارێزگاری سنوورەکانی یەزدان بکەن، بەهیـچ شێوەیەك سەرپێچی فەرمانەکانی خودا مەکەن.

﴿إِنَّ اللّـهَ سَـرِيعُ الْحِسَابِ﴾ دڵنیـابن خـودا خێـرا حیسابو لێکۆڵینـەوەتان لەگەڵ دەکا، هیچی لێ گوم نابێ، ماندوو بوون وەرِزبوونی بەسەردا نایە، بەڵکوو زۆر بە خێرایی‌و لێهاتوویی لێکۆڵینـەوە لەگـەڵ ئـادەمیزاد دەکـاو هەرکەسـە بـەگوێرەی خۆی سزاو پاداشی دەداتەوە!

﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ﴾ ئەمرۆ ئەو خواردەمەنییانەی کە لـەوەوپێش بـە ئیجمـالی بۆتـان حـەڵاڵ کرابـوو، بەشـێوەیەکی بـەرفراوان‌و تەفـصیل ئـامێز حەڵاڵییەکەیان جێگیر کـراو خواردنیـان بۆتـان رەوایـەو حـوکمی حەڵاڵییەتەکـەیان چەسپاوو بەردەوامە.

﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ﴾ هەروەها گۆشت‌و سەربڕاوی ئەوانـەی خاوەن نامەی ئاسمانین حەڵاڵە بۆتان، هەر ئاژەڵێك جوولەکە یـان مەسـیحی سـەری بـبڕێ لـەو گیانلەبەرانـە بـێ کـە گۆشـتیان دەخـورێ بـۆ ئێـوەی موسـوڵمان حـەڵاڵ‌و رەوایە! بەڵام سەربڕاوی ئاگر پەرست‌و شـەیتان پەرسـت... هتـد حـەڵاڵ نیـە، نابـێ ئافرەتیشیان لێ بخوازن‌و سەربڕاوو ئافرەتیان بۆ ئێوە حەڵاڵ نیە.

مەبەست بە (طَعَام) لە ئایەتەکـەدا گۆشـتی گیانلەبـەری سـەربڕاو بەدەسـتی ئەوانە، نەك هەموو خواردەمەنییەك چونکە تەنها گۆشتەکە بـە سـەربڕینی ئـەوان دەبێتە طەعـام خواردەمەنییـەکانی تـر بـۆ هـەموو کـەس حـەڵاڵ‌و زوڵاڵـەو لێـرەدا ناچنە ژێر وشەی (طَعَام)ەوە.

﴿وَطَعَامُكُمْ حِـلُّ لَّهُـمْ﴾ گۆشـتی سـەربڕاوی ئێـوەش بـۆ ئـەوان حەڵاڵـە هـیچ گوناهتـان ناگاتـێ ئەگـەر لەگۆشـتی سـەربڕاوی خۆتـان بەشـیان بـدەن، یـان پێیـان بفرۆشن. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە سەربڕاوی ئەهلی کیتاب بـۆ ئێمـەو هـی ئێمـە بۆ ئـەوان حەڵاڵـە، بـەڵام ژن‌و ژنخوازی وانیـە، بۆیـە فـەرمووی ﴿وَالْمُحْـصَنَاتُ مِـنَ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ حەڵاڵ‌و رەوایە ئـافرەتی موسـوڵمان مارەبکـەن هـەروەها ﴿وَالْمُحْـصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ حەڵاڵ‌و رەوایە بۆ ئێوەی موسوڵمان کـە ئـافرەتی

ئازادی سەربەستی داوێن پاکی جوولەکەو مەسیحی مارەبکەن، ئەوانەی کە نامەی ئاسمانییان پێش ئێوە بۆ نێردراوە، بەڵام بەمەرجێ:

﴿إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ کە مارەییان بدەنێ واتە: مارەیی واجبەو دەبێ بدرێ، ئەم مەرجە بۆ جەخت کردنە لەسەر واجبی نەك مەرجی حەڵاڵ بوون! هەروەها دروستە ئافرەتی کۆیلەی ئەهلی کیتاب مارەبکرێ بەڵام کە باسی ئافرەتە ئازادەکانی کردووە ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە مارەکردنی ئافرەتی ئازاد لەهی کۆیلە باشترە.

حەڵاڵە بۆ ئێوە کە ئافرەتی ئازادو داوێن پاك مارەبکەن، لە کاتێکدا کە ئێوە ﴿مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ﴾ داوێن پاك بن زیناکارو داوێن پیس نەبن ﴿وَلَا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ﴾ هەروەها بە نهێنی پەیوەندی ناڕەوا لەگەڵ ئافرەتدا نەبەستن، واتە: نە بە ئاشکراو نە بەنهێنی داوێن پیسی نەکەنو ئاوی خۆتان نەڕێژنە شوێنی حەرامەوە!

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزاد دەترسێنێ لەسەرپێچی کردنو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِالإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ﴾ هەرکەسێك ئینکاری شەریعەتی ئیسلام بکاو ئەرکەکانی جێبەجێ نەکا، ئینکاری بنەما ئیسلامییەکانو فروعەکانی بکا هەموو کردەوەکانی پووچەڵ دەبنەوەو خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبێ، لەدونیادا کردەوەکانی بێ سوودو بێ بایەخەو ﴿وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ لە قیامەتیشدا سوود لە کردەوەکانی جیهانی نابینێو مایە پووچ دەمێنێتەوە.

## حوکمی دەستنوێژو غوسڵو تەیەممووم، یادکردنی خودا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا

فَاطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾

ئەمجار دێتە سەرباسی دەستنوێژو خۆشتن‌و تەیەممووم، پەیوەندی نێوان ئایەتەکانی پێشوو ئەم ئایەتانەی دوایی ئەوەیە:

لێرەدا دەڵێن: دوو عەهدو پەیمان‌و وادەو بەڵێن هەیە لەنێوان بەندەو پەروەردگارداو، پەیمانی خودایەتی پەیمانی بەندایەتی، دوای ئەوەی پەروەردگار وادەی خودایەتی خۆی بۆ بەندەکانی بەجێ هێنا حەڵاڵ‌و حەرامی بۆ لێك جیا کردنەوە، جۆری خواردەمەنی ڕەوای بۆ دیاری کردن، شێوەی ژن‌و ژنخوازی‌و ئەحکامی مارەکردن‌و مارەیی بۆ شی کردنەوە! داوا لە بەندەکانی دەکا کە ئەوانیش وەفا بە عەهدی خۆیان بکەن وادەو بەڵێنی بەندایەتی‌و گەردنکەچیەتی خۆیان بەجێ بێنن، گەورەترین طاعەت‌و بەندایەتی کردن بۆ پەروەردگار پاش بڕوا

بەخوا – نوێژە، نوێژیش بەبێ پاكو خاوێنی دروست نابێ، بۆیە هات باسی دەستنوێژی كرد، ئەمجار ئەوەی بیر خستینەوە كە پێویستە وەفا بە وادەو بەڵێنی بەندایەتی كردنو گوێڕایەڵی بۆ خوداو پیغەمبەر بكەین!

ئەبوو داوودی طەیالیسیو ئەحمەدو بەیهەقی لە جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پیغەمبەر (صَلى اللهُ علَيهِ وَسَلمَ) فەرموویەتی: «مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ الصَّلَاةُ وَمِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ». واتە: كلیلی بەهەشت نوێژە، كلیلی نوێژیش پاكیو دەستنوێژە.

یان دەتوانین بڵێین: موناسەبەی ئەم ئایەتانە بە ئایەتەكانی پێشووەوە ئەوەیە: ئادەمیزاد شەهوەتو ئارەزووی سروشتی هەن كە لە خواردەمەنیو ژنو مێردایەتیو پەیوەندی دروست بوون لەنێوانیاندا ڕەنگ دەدەنەوە هەموو ئادەمییەك مافی خۆیەتی كە بەپێی یاساو شەریعەت پێداویستی خۆی لێیان دابین بكا، لەپاڵ ئەمەشدا ئەركی لەسەر شانە، پێویستە ئەنجامی بدا، جا پاش ئەوەی پەروەردگار ئەركەكانی سەرشانی ئادەمیزادی ڕوون كردەوە، حەلاڵو حەرامی بۆ دیاری كردن دەستی كرد بە دیاری كردنی ئەركی سەر شانیان، كە پێویستە ئەنجامی بدەن، كەوابێ پوختەی مانای ئەم ئایەتە دەچێتە خانەی فەرمانی یەزدانی خۆی كە فەرمانی پێ كردن، وەفا بە وادەو بەڵێن بكەنو پابەندی ئەحكامی شەریعەت بن، هەروەها دەچێتە چوارچێوەی تەواوكردنی نیعمەتی ئایینو ئاسانكارییەكانی كە یاسای تەیەممووم ڕوخسەتێكی خودایەو لەو ئاسانكارییانەیە!

مامۆستا (محمد عبده) دەفەرموێ: موناسەبەی ئەم ئایەتی دەستنوێژە لەگەڵ ئایەتەكانی پێشوودا ئەوەیە:

بێ دەستنوێژیو لەشگرانی هەردووكیان بەهۆی خواردەمەنیو چوونە لای ئافرەت پەیدادەبن! ئەگەر خواردن نەبێ میزو پیسایی كە دەستنوێژ پێویست دەكەن نابن، ئەگەر مارەكردنو چوونە لای ژن نەبێ لەشگرانی پەیدا نابێ! بۆیە دوا بەدوای ئایەتەكانی پێشوو كە باسی خواردەمەنیو ژنو ژنخوازی دەكەن فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان بەخودا هێناوەو

پەیڕەوی فەرمانی خوداو پیغەمبەر دەکەن ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ﴾ ئەگەر ویستتان نوێژ بکەنو بێ دەستنوێژ بوون پێش ئەوەی دەست بکەن بە نوێژ دەستنوێژ بگرن بەم شێوەیە: ﴿فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ﴾.

یەکەم: پێویستە دەمو چاوتان بشۆن. سنووری دەمو چاو لە باری درێژییەوە لە تووکی سەرەوە بۆ دامێنی چەناگەیە، لەباری پانیشەوە نێوان دوو گوێچکەیە، کەسێك ریشی تەنکی هەبوو پێویستە پێستی ژێرەوە بشۆرێ، ئەگەر ریشی پڕبوو دەبێ پەنجەکانی تێ بخا، پێویست ناکا ئاو بگەیەنێتە ناو چاوەکانی، ئاو لەدەم وەردانو ئاو لە لووت وەردان لەگەڵ چەند شتێکی تردا، لەناو دەستنوێژدا سوننەتن، بەڵام لە فەرموودەی پیغەمبەر وەرگیراوە، قورئان باسی نەکردووە.

دووەم: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ﴾ شتنی هەردوو دەستە لەسەرە پەنجەکانەوە تا ژوور ئانیشك.

سێیەم: ﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ﴾ دەستی تەڕ بەبڕێ لەسەرتاندا بهێنن. بەلای شافیعییەوە پێویست مەسح کردنی بڕێ لە مووی سەرە لەجێگای خۆی، تەنانەت با مویەکیش بێ.

مالیكو ئەحمەد دەفەرموون: پێویستە مەسحی هەموو سەربکا، لەبەر ئیحتیاط، ئەبوو حەنیفە دەفەرموێ: پێویستە مەسحی چواریەکی سەربکا، زۆربەی زانایان پێیان وایە: یەکجار دەستی تەڕ بەسەردا بهێنێ بەسە، شافیعی دەفەرموێ: سوننەتە سێ جار دەستی تەڕ بەسەردا بهێنێ.

چوارەم: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ﴾ پێویستە هەردوو قاچی لەگەڵ قولە قاپی بشوا، بەڵگە لەسەر شتنی قاچو قولە پێ وێڕای ئەم ئایەتە، کردەوەی پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)و کردەوەی هاوەڵانیو چینی دوا هاوەڵانە، کە هەموویان بۆ دەستنوێژ قاچیان شتووە، ئیجماعی زانایانیشی لەسەر دامەزراوە.

ئیمامی موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پیاوێکی بینی لە دەستنوێژدا پاژنە پێی باش نەشتبوو، پێی فەرموو: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ».

بوخاری‌و موسلیم لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: لە سەفەرێکدا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) لەئێمە دواکەوت‌و، کە پێمان گەیشتەوە نوێژی عەصرمان دوا خستبوو، ئێمە دەستنوێژمان دەشت‌و قاچی خۆمان مەسح دەکرد، دەڵێ: ئیتر پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) بەدەنگی بەرز هاواری کرد فەرمووی: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ». دوو جار یان سێ جار ئاوا هاواری کرد.

ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) لەکاتی دەستنوێژ گرتندا، جاری وا دەبوو یەکجار یەکجار ئەندامەکانی دەشۆرد، جاری وا دەبوو دووجار دووجار یان سێ جار سێ جار، موسوڵمانان لەسەر سێ جار سێ جارەکەیان کاریان کردووە، (تەفسیرەکان بەتایبەتی مونیرو قورطوبی زۆریان لەبارەی ئەحکامی دەستنوێژ نووسیوە لێرەدا بە پێویستم نەزانی ئەو ئەحکام‌و راو بۆچوونانە راگوێزی ئێرە بکەم).

﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ﴾ ئەگەر لەشتان گران بوو بوو خۆتان پاك بکەنەوە، هەموو ئەندامەکانی جەستەتان بشۆن! پێویستە ئاو بەسەر بەدەندا بڕوا، (جونوب = لەشگرانی) مانایەکی شەرعییە، کەسێك لەشی پیس بوو نابێ نوێژ بکا، نابێ قورئان بخوێنێ، نابێ دەستی لێدا، نابێ بچێتە مزگەوتەوە، هۆی لەش پیسی چەند شتێکە لەوانە:

١- ئاو هاتنەوە، چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: «إنما الماء من الماء». واتە: ئاو لە ئاوەوەیە. مەبەست ئەوەیە: خۆشۆردن بە ئاو هاتنەوە پێویست دەبێ. ئاو هاتنەوەش بەهۆی شەیتانی بوون‌و جووت بوون لەگەڵ هاوسەرو شتی وا روودەدا.

٢- بەیەك گەیشتنی ئامێری زاوزێی ژن‌و پیاو. هەروەها خۆشتن (غسل) واجب دەبێ بە کۆتایی هاتنی خوێنی حەیزو خوێنی پاش منداڵ بوون‌و بە مردن.

دوای ئەوەی پەروەردگار بەیانی ئەوەی کرد: کە هەرکاتێ ویستتان نوێژ بکەن بەکارهێنانی ئاو پێویستە بۆ دەستنوێژو خۆشتن، ئەوە روون دەکاتەوە: کە بەکارهێنانی ئاو پابەندە بەدوو شتەوە:

یەکەم هەبوونی ئاو، دووەم بتوانێ بەکاری بهێنێ بەبێ ئەوەی زیانی پێ بگا! ئەگەر ئەو کەسە ویستی نوێژ بکا نەخۆش بوو، یان لەسەفەردا بوو، ئاوی دەست نەکەوت، ئەوە شەرع ڕێگای داوە لەجیاتی ئاو بە خۆڵی پاك تەیەمموم بکا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَى﴾ ئەگەر ئێوە نەخۆشییەکی واتان لەگەڵ دابوو: کە نەتان دەتوانی ئاو بەکاربێنن، ﴿أَوْ عَلَى سَفَرٍ﴾ یان لەسەفەردا بوونو ئاو نەبوو، ﴿أَوْ جَاء أَحَدٌ مَّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ﴾ یان دەستتان بەئاو گەیاندو پێویستتان بە دەستنوێژ هەلگرتن بوو ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء﴾ یان لەسەر پێشاوو تەوالێت دەهاتنەوە پێستان لە پێستی ئافرەت کەوتن یان چوونە لای ئافرەتو کاری شەرعیتان لەگەڵدا کردن ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء﴾ ئاوتان دەست نەکەوت بۆ دەستنوێژ یان غوسل، ئەوە لەم حاڵانەدا.

﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ ئەوە قەصدی خۆڵێکی پاكو خاوێن بکەنو تەیەمموم بکەن بە خۆڵێکی خاوێن، ﴿فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ﴾ مەسحی دەمو چاوو دەستتان بکەن بە ئەم خۆڵە.

بە کورتیو پوختی: ئەگەر یەکێ لەم حاڵانە (نەخۆشی، سەفەر، بێ دەستنوێژی، لەش پیسی)تان بەسەردا هاتو ئاوتان دەست نەکەوتو پێویستتان پێ بوو، پەنا بەرنە بەر خۆڵێکی خاوێنو تەیەممومی پێ بکەن، لەپی دەستانی پیا بکێشنو روخسارو دەستو قۆڵتانی پێ تەیەمموم بکەن مەسح کردنی قۆڵ لەگەڵ ئەنیشك دایە وەکوو حەنەفییەکانو شافیعییەکانیش دەڵێن.

تەیەمموم لەجیاتی دەستنوێژە، دەبێ دووجار لەپی دەست بکێشی بە خۆڵەکەدا، جارێك بۆ دەمو چاوو جارێك بۆ هەردوو باسك هەتا ئەنیشك.

دارە قوطنی لە ئیبنو عومەرەوە حەدیسێکی ریوایەت کردووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: «التَّيَمُّمُ ضَرْبَتَانِ ضَرْبَةٌ لِلْوَجْهِ وَضَرْبَةٌ لِلْيَدَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ».

ئەمجار پەروەردگار حیکمەتی دانانی تەیەمموم دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾ خودا نایەوێ لەو یاساو شەریعەتەی بۆتان دادەنێ قورسایی بخاتە سەر شانتان، چونکە بێ ئاتاجە لە ئەزیەتدانتان، هەر یاساو شەریعەتێکتان بۆ دابنێ سوودی ئێوەی تێدایە، شتێك قازانجی ئێوەی تێدا نەبێ

فەرمانتان پێ ناکا، ﴿وَلَكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ﴾ بەڵکوو دەیەوێ ئێوە پاك بکاتەوە لەهەموو پیسییەکی ناوەوەو دەرەوە، لەهەموو پیسو پۆخەڵیو خاویو سستی لەش، دوایی لەش پیس بوونتان، لەسەر لابەرێ!

﴿وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ﴾ بۆئەوەی نیعمەتی خۆی بۆ ئێوە تەواوبکا، پاکی جەستەو پاکی گیان بەیەکەوە بۆتان دابین بکا چونکە ئادەمیزاد لە مادەو گیان پێك هاتووە، نوێژ دڵو دەروون پاك دەکاتەوە، نوێژ ئادەمیزاد لە خراپەو خراپەکاری دەگێرێتەوە، وا لە نوێژکەر دەکا رۆژانە چەند جار خۆ لەبەردەم خودادا رانوێنێو بە نهێنیو بە ئاشکرا موراقەبەی خۆی بکا، ترسو رەجای لەخودا هەبێ، دەستنوێژیش کە مەرجی نوێژە هۆکارێکی گرنگە بۆ پاكو خاوێنی جەستەو لەشو لار کەوابێ پێویستە ئێوە لە پاساوی ئەوەدا سوپاسی خودا بکەن وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆئەوەی ئێوە سوپاسی خودا بکەنو بەردەوام بن لەسەر سوپاسو بەندایەتی کردن بۆ پەروەردگار.

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەو برە حوکمانەی بەیان کردن، ئەو ئاسان کارییانەی بەیان کرد کە تەواوکەری نیعمەتی خودایە بۆ ئادەمیزاد، ئەمجار هەندێ نیعمەتی خۆی وەبیر بەندەکانی هێنایەوەو دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ﴾ یادی ئەو نیعمەتانەی خودا بکەنەوە، کە لە عالەمی ئەرواحدا وادەی لێ وەرگرتوون ﴿وَمِيثَاقَهُ الَّذِي وَاثَقَكُم بِهِ﴾ پابەندی ئەو عەهدو پەیمانەی خودا بن کە بەڵێنی پێ لێ وەرگرتوون. یان یادی ئەو نیعمەتانەی خودا بکەنەوە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! کە ئێوە لەوەپێش خودا نەناسو ناکۆك بوون بەهۆی نووری ئیسلامەوە بوون بەبرای یەکتریو خۆشەویستی لە ناوتاندا بڵاوبۆتەوە! هەروەها بیری ئەو عەهدو پەیمانە بکەنەوە کە بە پیغەمبەرتان داوە!

﴿إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ کە وتتان: بەڵێ پابەندی فەرمانەکانی خوداو پیغەمبەر دەبین، گوێڕایەڵیان دەبین لە خۆشیو لە ناخۆشیدا، لە تەنگانەو فەرەحیدا، چیمان پێ بفەرموێ فەرمانبەرداریین، جڵەوگیریی چیمان لێ بکەی نایکەین ﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ خۆتان لە سزای خودا بپارێزن، چی جڵەوگیریی لێ کردوون توخنی مەکەون! ﴿إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ دڵنیابن پەروەردگار زاناو

خەبەرداره بەوەی کە لە دەروونتان دایه، دەزانێ کێ بەڕاستی دڵسۆزی ئایینەو کێ دووڕوو ریابازه هیچ شتێك؛ نهێنیو ئاشکرا لەخودا گوم نابێ.

## شایەتی دان بە عەداڵەت، حوکمی دادوەرانەو موژده بۆ موسوڵمانانو هەڕەشە لەکافران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۙ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ﴾

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بە ئادەمیزاد کرد کە پابەندی بەڵێن‌و پەیمانی خۆیان بن، منەتی بەسەر بەندەکانیدا کرد بەوە کە خواردەمەنی پاك‌و بەسوودی بۆ حەڵاڵ کردوون، خواردنی پیس‌و بێ سوودی لێ قەدەغە کردوون، مەگەر لەبەر ناچاری! ئەمجار ئەوەی ئاشکرا کرد، کە گۆشت‌و سەربڕاوی ئەهلی کیتاب‌و مارەکردنی ئافرەتیان حەڵاڵە بۆ موسوڵمانان. فەرمانی پێ کردن بە پاك‌و خاوێنی‌و دەستنوێژ شتن‌و غوسڵ کردن، ئەمجار فەرمانی پێ کردن کە مامەڵەیان لەگەڵ خۆیان‌و غەیری خۆیاندا دادپەروەرانە بێ لەگەڵ دۆست‌و دووژمندا عەدالەت بەکاربێنن!

دەگێڕنەوە: جوولەکەی بەنو نەضیر پیلانێکیان دارشت بۆ لەناو بردنی پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پەروەردگار نیگای بۆ کردو پیلانەکەی لێ ئاشکرا کردن، ئەمجار پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ناردی بۆ لایان کە دەبێ لە دەوروبەری مەدینە بار بکەن‌و لێی نەمێنن، ئەوانیش قەڵایان قایم کردن‌و گوێیان بە فەرمانەکەی پیغەمبەر نەدا، پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە کۆمەڵێك لە هاوەڵانییەوە چووە سەریان‌و شەش شەو ئابلۆقەی دان تینیان بۆ هات، ئەمجار داوایان لە پیغەمبەر کرد کە رێگەیان بدا باربکەن بەڵام بەمەرجێ گیانیان پارێزراو بێ، هەریەکەیان باری وشترێك کەل‌وپەل لەگەڵ خۆیدا بەرێ! برێ لە موسوڵمانان دەیانویست پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کوشت‌و کوشتاریان تێدا پەیدا بکا، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ جڵەوگیری لەوەدەکا کە بەوشێوە توندە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، ئیتر پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) داخوازی جوولەکەکانی پەسەند کردو گواسترانەوە.

هەندێکی تر دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی موشریکەکانی مەککە هاتۆتە خوارێ، کە ساڵی (حودەیبییە) موسوڵمانانیان نەهێشت دیدەنی کەعبە بکەن، بەهەرحاڵ ئایەتەکە هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەکەی تایبەتی بێ، حوکمەکەی هەمیشەیی‌و گشتییەو دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! هەموو هەڵس‌و کەوتێکتان، هەموو کارو کردەوەیەکتان حەق ئامێز بێ، عەدالەت کاری بێ،

داب‌و نـەریتتان مرۆڤانـەو حـەقخوازی بـێ، بەرامبـەر بـە پـەروەردگار دڵسۆزو موخلیص کاربن، هەموو کارێك لەبەر رەزامەنـدی خـوداو بـە گوێرەی بەرنامـەی ئیسلام ئـەنجام بـدەن، دەسـت درێـژی مەکەنـە سـەر کـەس، فـەرمان بـە چـاکەو جڵەوگیری لە خراپە بکەن، ﴿شُهَدَاء بِالْقِسْطِ﴾ حەق‌و راستی بـۆ دادوەر دەستنیـشان بکەن، چۆن حەق‌و راستە ئاوا شایەتی لە یەکتری بدەن، لەبەر خاتری بەرژەوەندی هیچ کەس شایەتی لە یەکتری مەدەن! لە هەموو شتێکدا عەداڵەت خواز بن، چونکە عەدالـەت تـەرازوی مافـە بـۆ هـەموو کـەس، زوڵم‌و سـتەمکاریی لـە نـاو هـەر هـۆزو گەلێکدا بڵاوبووەوە بنەمای کۆمەڵگا دادەوەشێنێ.

﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ﴾ با رق لێبوونتـان بەگـەل‌و هۆزێـك هـەڵتان نـەنێ بـۆ بەرقـەرار نـەکردنی عەداڵـەتکاری دەربارەیـان، بـەڵکوو پێویـستە عەداڵەت بەکار بێنن لەگەڵ هەموو کەسێ، دۆست بێ یان دوژمـن ﴿اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ عەداڵـەتکاریتان لـە مامەڵـە کردنـدا نزیـك‌و هۆکـارە بـۆ خواپەرسـتان لـە گونـاه، پارێزگارتـان دەکـا، لـە نـاڕەزایی خـودا، وازهێنـان لـە عەداڵـەتکاری تـاوانی گەورەیە، چونکە بە نەبوونی چەتری عەداڵـەت کۆمـەڵگا دادەوەشـێ‌و یاسـاو نیـزام تێکدەچـێ‌و پەیوەنـدی نێـوان تاکـەکانی کۆمـەڵ مۆرانـە لێـی دەداو ئـەفرادەکان پەرتەوازە دەبن‌و جۆرەها نەخۆشی ئەخلاقی‌و ئایینی بڵاودەبنـەوە! ﴿وَاتَّقُواْ اللّـهَ﴾ خۆتان لە سزای خـودا بپـارێزن لـە ئـاگری دۆزەخ بترسـن، سەرپێـچی فەرمانـەکانی مەکەن.

﴿إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ دڵنیابن خودا هیچی لێ گوم نابێ ئاگادارو زانایـە بە کردەوەکانتان، بترسن لەوەی سزاتان بـدا لەسـەر گوێ پێنـەدانتان بـە عەداڵـەت: مێـژووش شـایەتە: کـە خـودا چـی بـە سـتەمکاران کـردووە، هەرکەسـێك وازی لـە عەداڵەتکاری هێنا بێ، لە دونیادا سووك‌و ریسوای کردووە، لە قیامەتیشدا سزای بـە ئێشی بۆ داناوەو، وێڕای ئەوەش ریسوای هەتا هەتایی دەکا.

﴿وَعَدَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُـواْ﴾ پـەروەردگار وادەی بەختـەوەری هـەردوو جیهـانی داوە بە وانەی بڕوایان بە خوداو پیغەمبەر هێناوە ﴿وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ کـردەوەی باشـیان ئـەنجام داوە، هەمیـشە خـەریکی ئەنجامـدانی کـاری مەسـڵەت ئـامێزن،

حـەقخوازو عەدالـەتکارن، لـە هـەموو حـاڵو بارێکـدا تـەقوای خـودا دەکـەن خـۆ دەپارێزن لە نافەرمانی خودا!

ئەمجار پـەروەردگار وادەو بەڵێنـەکانی کە داونـی بـە خوداپەرستان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەوانـە لـە خـوداوە لێخۆشـبوونیان بـۆ هەیەو پاداشی گەورەیان دەدرێتێ، کە بەهەشتی ڕازاوەیـەو زێـدەکردنی پاداشـە لـە بەرامبەر بڕوای ڕاستو کردەوەی باشیان!

﴿وَالَّـذِينَ كَفَـرُواْ﴾ ئەوانـەی بڕوایـان بـە خـوداو هـەموو پیغەمبـەران نیـە، نیشانەکانی خودایەتی خودا لـە بوونـەوەر خـودی ئادەمیزادەکانیـدا رەت دەکەنـەوە ﴿وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا﴾ بەڵگەی تاكو تەنیایی خـوداو بـەرفراوانی دەسـەڵاتو بـە توانـایی خودا بە درۆ دەخەنەوە، بڕوا بە نامە ئاسمانییەکانو پیغەمبەرەکان ناکەن ﴿أُوْلَئِكَ أَصْـحَابُ الْجَحِـيمِ﴾ ئەوانـە تـاقمو گـرۆی دۆزەخـین، سـزای سەپێـچیو بێـدینیو خراپەکارییان ئاگری دۆزەخەو تێی فڕێ دەدرێن.

ئـەمجار پـەروەردگار نیعمـەتی خـۆی بەسـەر موسـوڵمانانـدا بـاس دەکـاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـواْ﴾ ئـەی خـاوەن بـاوەڕان ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان بـە خوداو بە پیغەمبەر هێناوە؛ ﴿اذْكُـرُواْ نِعْمَـتَ اللّـهِ عَلَـيْكُمْ﴾ یـادی نیعمـەتی خـودا بکەن بەسەرتانەوە، شەڕو بەڵای لەسەر لابردن پیغەمبەرەکـەتانی لـە تـیرۆر ڕزگـار کـرد ﴿إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُواْ إِلَـيْكُمْ أَيْـدِيَهُمْ﴾ کە کۆمـەڵێك ویـستیان دەست درێـژی بکەنە سەرتانو پیغەمبەر لە ناو بەرن ﴿فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ﴾ بـەڵام خـودا لـە بـاڵی دانو ئێـوەی پاراسـتو پیلانەکـەیان بـۆ جێبـەجێ نـەکراو نـەیانتوانی پیغەمبـەر تیرۆر بکەنو ڕزگاری بوو!! ئایینی خۆی سەرخستو نووری ئیسلام بڵاوبووەوە..

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ریوایەت زۆرن پوختەکەیان ئەوەیـە! گوایە کابرایەك لە هۆزی (محارب) ویستی پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تـیرۆر بکـا، هۆزەکـەی ناردیـان بـۆ ئـەو مەبەسـتەو شمـشێرێکی پـێ بـوو، گەیـشتە لای پیغەمبەر کە هیچی پێ نـەبوو، لەسـەر سـەری پیغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەستاو وتی: ئەی محمد! کێ لەدەستی من ڕزگـارت دەکـا؟ ئـەویش فـەرمووی: خـودا ڕزگارم دەکا!! ئیتر کابرا شمشێرەکەی لەدەست کەوتە خوارێو پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ

علَيْـهِ وَسَلم) هـەڵی گرتـەوەو فـەرمووی: کێ لەدەستی مـن رزگـارت دەکا؟؟ کـابرا ترساو وتی پیاوی باشبە مەمکوژە، پێغەمبـەر فـەرمووی: «تَـشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّـهُ وَأَني رَسُولُ اللّهِ؟» کابرا وتی: پەیمانت دەدەمێ کە شەڕ لەگەڵ تۆ نەکەم، لەگەڵ هۆزێکدا نەبم کە شەڕ لەگەڵ تۆدا دەکەن، ئیتر پێغەمبـەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلم) ئـازادی کـرد، کـابرا گەڕایـەوە بـۆ نـاو هۆزەکـەی وتـی: وەڵڵاهـی لـەلای چـاکترین ئادەمیزادەوە گەڕامەوە! ئەم ریوایەتە بە جۆری تریش گێڕدراوەتەوە!!

بەهەرحاڵ نیعمەتی خودا زۆرو زەبەندن لە ژمارە نایەن بۆیـە پـەروەردگار فەرمانی بە بەندەکانی کردووە تەقواکار بن‌و پـشت ببەسـتن بـە خـوداو فـەرمووی: ﴿وَاتَّقُواْ اللّـهَ﴾ بترسـن لـەو پـەروەردگارەی کـە بـە توانـایی‌و دەسـەڵاتی بـەرفراوانی خۆی نیـشان دان، لـە کـاتی بـێ هێزیـدا بەسـەر دوژمنـدا زاڵـی کـردن، ﴿وَعَلَـى اللّـهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ پشت هەر بە خـودا ببەسـتن تـەوەکولتان هـەر لەسـەر ئـەو بـێ، هەر لە ئەو داوای یارمەتی‌و سەرکەوتن بەسەر دوژمنـدا بکـەن، چونکە دەسـەڵات‌و بە توانایی خودا رەهاو موطلەقەو بێ ئەندازەو سنوورەو هەرگیز لە بن نایە، بەڵام وێڕای تەوەکول بە خودا ئەسبابی پێویست بۆ سـەرکەوتن دەستەبەر بکـەن (مـەبن بە حەمەی پەنا بـە خـوا)و پـاڵی لێ بدەنـەوەو هـیچ نەکـەن‌و بڵێن، تـەوەکولمان بـە خودایە!!

## پەیمان شکێنی جوولەکەو نەصاری

﴿ ۞ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَىْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِى وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ

عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَـٰقَهُمْ لَعَنَّـٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَـٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَـٰرَىٰٓ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَهُمْ فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١٤﴾

لێرەش بەولاوە ئایەتەکان بەردەوامن لەسەر یادخستنەوەی عەهدو پەیمان، دوای ئەوەی کە پەروەردگار ئەو وادەو بەڵێنەی بیرخستنەوە کە لە موسوڵمانانی وەرگرتووە دەربارەی پێغەمبەری ئیسلامو فەرمانی پێ کردین کە وەفا بەوادەو بەڵێن بکەین، پابەندی حەڵاڵو حەرامی خودا بین! لەم ئایەتانەی دوایی دا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە؛ کە پەروەردگار هەمان وادەو بەڵێنی لە (جوولەکە)و

(نەصـاری) وەرگرتـووە، بـەڵام ئـەوان پابەنـدی بەڵێنەکـەیان نـەبوونو هـەڵیان وەشاندەوە، خوداش سزای دانو تۆڵەی لێ ستاندن، بـۆ ئـەوەی موسـوڵمانان پەنـدیان لێ وەربگـرنو نەکەونـە هـەمان هەڵـەوە دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَـدْ أَخَـذَ اللَّـهُ مِيثَـاقَ بَنِـي إِسْرَآئِيلَ﴾ بێگومان: پەروەردگار بەهۆی مووسا پێغەمبەرەوە پەیمانو وادەو بەڵێنی لەبەنو ئیسرائیل وەرگرت، بۆ ئـەوەی پابەنـدی فـەرمانو جڵەوگیرییـەکانی تـەورات بن، ئەو تەوراتەی کە یاساو شەریعەتی بۆ ئەوان تێدا ناردبووە! ئـەو تەوراتـەی کـە خودا بۆی هەڵبژاردنو بە نیگا بۆ مووسای ناردووە! تا ئێـستا ئـەو عەهـدو پەیمانـە لە کۆتایی سفری پێنجەم کە پاڵ مووسا دراوەن — لە تەوراتدا ماونەوە.

﴿ وَبَعَثْنَا مِنهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا﴾ فەرمانمان بە (موسا) کرد: کە دوازدە نەقیب هەڵبژێرێ بۆ ئەوەی بیان نێرێ بـۆ شـەڕ کـردن لەگـەڵ جـەبابیرەکان... دەگێڕنـەوە دەڵێن: کە جوولەکە لە دەست فیرعـەون رزگاریـان بـوو، لـە دەریـای نیـل پەڕینـەوە فیرعەون تێیدا خنکا، پەروەردگار فەرمانی پێ کردن کە بـەرەو قـودس بـڕۆن، ئـەو کاتـەی قـودس کەنعانیـە زلحۆرتـەکانی تێـدا بیـشتەجێ بـوون، پـەروەردگار بـەهۆی پێغەمبەرەکەیانەوە پێی راگەیاندن: کە من قودسم بۆ ئێـوە کـردووە بـە نیـشتمانو بچنە ناوی جیهاد بکەن، ئەو جەبابیرە کەنعانیانەی لێ وەدەرنێن من یارمەتیدەرتان دەبمو زاڵتـان دەکـەم! فـەرمانی بـە مووسـاش کـرد کـە لەهـەموو بـەرەبابێك پیاوماقوڵێك هەڵبـژێرێو بـە بـەرعودە ببـێ بـۆ جێبـەجێ کردنـی ئـەو فەرمانـەی پێیـان کـراوە، وادەو پـەیمانی لـە جوولەکـەکان وەرگـرتو (نەقیبـەکان) بـەرعۆدە بـوونو لەگـەڵ جوولەکـەکان بـەرەو قـودس کەوتنـە رێ، کاتێـك لـە بەیتولمەقـدیس نزیك بوونەوە، نەقیبەکانیان نارد چاوێك بە وەزعەکـەدا بگێـڕنو بـزانن مـەوقیف چۆنەو چۆن نیە، کە چۆن سەیریان کـرد ئـادەمیزادی کەتـەو زلیـان بینـیین لێیـان ترسانو گەڕانەوە، چییان بینـی بـوو بـۆ جوولەکـەکانیان گێڕایـەوە، لـەوە پێـشیش (موسا) بە نەقیبەکانی گوتبوو: کـە نابـێ بـەو شـێوە ئـەوەی دیتومانـە بیگێڕنـەوە، جگە لە دوو نەقیب نەبێ ئەوانی تر پابەندی فەرمانەکەی (موسا) نـەبوون! وەکـوو لە مەودوا قورئان ئاماژەی بۆ دەکاو: دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَجُلاَنِ مِنَ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ اللَّهُ﴾ جا کە خودا فەرمانی پێ کردن بەرەو قودس بـەرێ بکـەون ﴿وَقَـالَ اللَّـهُ إِنِّـي

مَعَكُمْ﴾ پەروەردگار نیگای بۆ (موسا) کرد: کە مـن یارمەتیـدەرتانم پـشتان دەگـرم، بەمەرجێ پابەندی وادەو بەڵێنەکانتان بن، ئاگاداری کردەوەکانتانم، گوێم لە قسەو گفتو گۆتانە، دەزانم دڵتان چی تێدایە.

﴿لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلاَةَ﴾ ئەگـەر ئێـوە نوێـژەکانتان بـە ڕێـكو پێکـی ئـەنجام دا، ﴿وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ﴾ زەکـاتی مـاڵو سـامانی خۆتـان دا بـە ئاتاجـان ﴿ وَآمَنـتُم بِرُسُـلِي﴾ بڕواتـان بـە پیغەمبـەرەکانم کـردو پابەنـدی فەرمانـەکانیان بـوون ﴿وَعَزَّرْتُمُـوهُمْ﴾ یارمەتیتان دانو دژی خوانەناسان لەگەڵیاندا جەنگان، ﴿وَأَقْرَضْتُمُ اللّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ لە ڕێگای خودا زیاد لە واجب ماڵو سامانتان بەخشی، جگە لـەزەکاتی واجب مـاڵو سامانی تریشتان بەخشی، کە ئەم ئەرکانە بەجێ بێنن ﴿لَّأُكَفِّرَنَّ عَـنكُمْ سَـيِّئَاتِكُمْ﴾ تاوانەکانتان دادەپۆشینو لێتان خۆش دەبینو تۆڵەتان لێ ناسێنین!

﴿وَلأُدْخِلَـنَّكُمْ جَنَّـاتٍ تَجْـرِي مِـن تَحْتِهَـا الأَنْهَـارُ﴾ دەتانخەینـە بەهەشـتێکی ڕازاوەو پانو بەرین کە بە ژێر دارو درەختەکانیـدا جۆگـاوی ئـاوی جوانو سـەرنج ڕاکێش دەکشێنو ئەوەندەی تر بەهەشت دەڕازێنینەوەو جوانی پێ دەبەخشین!!!

جا ﴿فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِـكَ مِـنكُمْ﴾ هەرکەسـێك دوای وەرگرتنـی وادەو بـەڵێن لێی سەرپێچی ئەو فەرمانانە بکا کە ئاراستەی کراونو پابەندی فەرمانەکانی خـودا نەبێ، ئەوەی پێی گوترابوو نـەیکردوو ئـەوەی جڵەوگیریی لێ کرابـوو کـردی، ئـەوە ﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَاء السَّبِيلِ﴾ بێگومان ڕێگای ڕاستی لێ هەڵەبووەو گومڕابووە، ئیتر دڵو دەروونی پاك نابێتەوە، شایانی ئەوە نیە بچێتە بەهەشتەوەو بە دیتنی پەروەردگار بەهرەمەند بێ.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە بەیان دەکا کە ئـەو جوولەکانـە پابەنـدی عەهـدو پەیمانەکەیان نەبوونو سزای توندی دان، دەفەرموێ: ﴿فَبِمَـا نَقْـضِهِم مِّيثَـاقَهُمْ﴾ جا بەهۆی هەڵوەشاندنەوەیان بۆ وادەو بەڵێنەکانی خۆیان، بـەهۆی پاشـگەزبوونەوەیان لەو عەهدو پەیمانەی لێیان وەرگیرا بوو – کـە بەشـێك لـەو عەهـدو پەیمانـە ئـەوە بـوو ئیمـان بـەو پیغەمبەرانـە بێـنن کـە دەنێردرێنـە سـەریانو یارمـەتیان بـدەنو ڕێزیان لێ بگرن ﴿لَعَنَّاهُمْ﴾ نەفرەتمان لێ کردن، شیاوی ڕقو غەزەبی ئێمە بوون، لـە ڕێگەی حەق لادرانو، گومڕا بوون ﴿وَجَعَلْنَا قُلُـوبَهُمْ قَاسِـيَةً﴾ دڵیانمـان ڕەق کـردووە،

بەزەیی‌و مرۆڤایەتییان تێدا نەماوە، بە هیچ جۆرێك حەق وەرناگرن پەندوو ئامۆژگاری ناچێتە گوێچکەیانەوە، هەڵوەشاندنەوەی وادەو بەڵێن دڵی رەش کردوون، سروشتی تێك داون دەروونی پیس کردوون، بەزەیی‌و سۆز لە دڵیاندا نەماوە بە جۆرێك تەنانەت بە ناحەق پێغەمبەرانیان کوشتن، بوختانیان بۆ خاتوو مەریەم کرد، عیسای کوڕی کرا بە پێغەمبەر بۆ سەریان رەوانە کرا کەچی سوکایەتیان پێ کرد، تەنانەت هەوڵی کوشتنیان دا، هەموو ئەم کارانەیان، لە رەحمەتی خودا دووری خستنەوەو شیاوی غەزەبی خودا بوون..! کەوابێ با گلەیی لە خۆیان بکەن، سەرزەنشتی خودی خۆیان بکەن، بۆخۆیان بەدەستی خۆیان دۆزەخیان بۆخۆیان خۆش کرد!! ئەوان وێرای هەڵوەشاندنەوەیان بۆ عەهدو پەیمانەکانیان ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾ دەستکاری رستەکانی تەورات دەکەن، ماناکەی وا ئاراستە دەکەن کە پێچەوانەی مەبەست بێ، پاش‌و پێش لە وشەکانیدا دەکەن، مانایەك بۆ رستەکان دێنن کە ئەو مانایە هەر لە گۆڕێ نیە! گۆڕانکاری لە دەقەکانی دا دەکەن:

**دیارە گۆڕانکاری دوو جۆری هەیە:**

١- گۆڕینی وشەکان بە پاش‌و پێش کردن‌و لێ زیاد کردن‌و لێ کرتاندن.

٢- گۆڕینی ماناکەی وەکوو ئەوە وشەکە بۆ مانایەك بەرێ کە هەڵی نەگرێ!

٣- مێژووش چەسپاندوویەتی جوولەکەو نەصاری بۆخۆشیان دانی پیا دەنێن کە ئەو تەوراتە نێردراوەتە خوارێ بۆ سەر مووساو نووسیویەتەوەو فەرمانی بە پارێزگاری کردنی کردووە، تەنها نوسخەیەك بووەو هیچی تری لەبەر نەنووسراوەتەوە ئەوەش لای مێژوو نوسانی جوولەکەو نەصارا چەسپاوە: کە لە کاتی کوشتن‌و کوشتاری بابلیەکان لە جوولەکەکان‌و تالان‌و برۆ کردنیان‌و تەفرو تونا کردنیان، ئەو نوسخە تاقانەی تەورات فەوتاوە، نوسخەی تریان لەلا نەبووەو لەبەریان نەبووە، تا لە سینگەوە بیگوێزنەوە بۆسەر کاغەز، بابلیەکانیش هەیکەلەکەیان رووخاندو پایتەختەکەیانیان وێران کردن‌و ئەوەی بە زیندوویی بە دیل گیرا کرا بە کۆیلەو گوێزرایەوە بۆ شوێنێکی دیکە. ئەو پێنج سپاردە

(أسفار)ەی کە وەپاڵ موسا دەدرێن‌و باسی مردنی موساو ژیاننامەی ئەوی تێدایە، ئەوەشی تێدایە: کە دوای موسا کەس شوێنی نەگرتۆتەوە.

ئەم سپاردنانە بە ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ دوای (موسا) نووسرانەوە، دوای چەند سەدەیەك عیزڕای کاهین لە زمانی هەندی پیرەمێرد کە لە دوای کارەساتی بابل مابوونەوەو ڕێگادرا جوولەکەکان لە هەندەرانەوە بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان! نووسیونیەوە.

هەروەها (ئینجیل)یش بە ئیعترافی نەصارا خۆیان، دوای نەمانی عیسا بە سەدەیەك ئەمجار دەست کراوە بە نووسینەوەی! ﴿وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ﴾ پەیمانی خودا کە پیغەمبەرەکانیان لێیان وەرگرتوون کە دەبێ ئیمان بە (محمد) بێنن لە بیریان چووەوە!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مانای وایە تەوراتیان لە بیر چۆتەوە، واتە: بەشێکی تەوراتیان واز لێ هێناو کاریان پێ نەکرد، فەرمانیان پێ کرابوو، کە ئیمان بە پیغەمبەری ئاخر زەمان (پیغەمبەری ئیسلام) بێنن، بەڵام ئەوان ئەم جۆرە فەرمان‌و جڵەوگیریانەیان شاردەوەو پەردە پۆشیان کرد..

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: واتە:وازیان لە پوختەی ئایینەکەیان هێناو ئەو ئەرکانەی خرابووە سەریان ئەنجامیان نەدا!! بەمەش بەدبەخت‌و چارەڕەشی دونیاو قیامەت بوون. ڕاڤەکەرانی تر دەڵێن: مانای ﴿وَنَسُواْ حَظًّا﴾ واتە: کاریان بە تەورات نەکرد، ئیتر تووشی بەدبەختی بوون، نە دڵ‌و دەروونیان بە ساخی مایەوە نە سروشت‌و هەڵس‌و کەوتیان مرۆڤانە بوون، نە کردەوەکانیان ڕێك‌و پێك بوون، هەموو شتێکیان دڕندە ئاسا بوو.

ئەم موعجیزە قورئانیە کە ڕاستیەتی پیغەمبەرایەتی (محمد) دەچەسپێنێ بەردەوام‌و هەمیشەییە هەڵوەشانەوەی بەسەردا نایە، قورئان بەچەند سەدەیەك دوای لە دونیا دەرچوونی موسا ئەم ڕاستیانەی ڕاگەیاندووە، زانستی مێژووی تازەش ئەمەی وەکوو حەقیقەتێکی مێژوویی چەسپاندووە!

جا وەنەبێ ئەم ڕەوشتە ناشیرینانەیان تایبەت بێ بەو ڕۆژگارەو دوایی گۆڕابن، بەڵکوو ﴿وَلاَ تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىَ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ﴾ ئەی (محمد) تا ئێستاش لەو

جوولەکانە خیانەت دوای خیانەت دەبینندریّ! هەرگیز ئەی (محمد) وا مەزانە کە تۆو ئایینەکەشت لە خیانەتی ئەوان دوورە پەرێز دەبن، قەت لە پیلانو گێرەشێوێنیان دڵنیا مەبە، ئەوانە گەلو نەتەوەیەکن خاوەنی وەفاو وادەو بەڵێنیان نین لێیان ئەمین مەبن، کەسێك عەهدو پەیمان لەگەڵ خودا نەباتە سەرو بەڵێنی خۆی هەڵوەشێنێتەوە! کەی هی ئەوەیە پشتی پێ ببەسترێ؟ بەتەمای خێرو بێر بی لێی!

طەبەری دەفەرموێ: رای پەسەند ئەوەیە: کە پەروەردگار مەبەستی لێرەدا جوولەکەکانی بەنو نەضیرە کە پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) هاتە لایان بۆ ئەوەی باربووی موسوڵمانان بکەن بۆ خوێنی عامرییەکان، بەڵام ئەوان پیلانی تیرۆر کردنی پیغەمبەریان دارشتو ویستیان لە ناوی بەرن، ئیتر خودا پیغەمبەری لەو پیلانە ئاگادار کردەوە خیانەتکاریو پیلانگێریو بێ وادەو بەڵێنی رەوشتی سەرەکیو بنەرەتی نەتەوەی جوولەکەیە.. ئیمان بە پیغەمبەری ئیسلام ناهێنن ﴿إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمُ﴾ مەگەر کەمێکیان نەبێ، وەکوو عەبدوڵلای کوری سەلامو هاوەڵەکانی؛ ئەوانەی کە ئیمانیان بە پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) هێناوە خودا بە تاكو تەنیا دەپەرستن، ئەوانە گومانی خراپەیان لێ مەکە، لە پیلانو خیانەتکارییان مەترسێ، چونکە ئەوانە دڵسۆزی ئایینو خوداپەرستن! فرتو فێڵیان نیە. ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ﴾ چاوپۆشی بکە لەو هەڵەو تاوانەی لەوەپێش لێیان روی داوە، لە خراپەیان خۆش بە، مامەڵەیان لەگەڵدا بکە بە شێوەیەکی باشو چاکەکاری. ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ بێگومان خودا چاکەکارانی خۆش دەوێن، ئەو چاکەکارانەی لە کاتی دەسەڵاتو تواناداا عەفو دەکەنە رەفتاری خۆیانو لە خراپەی خراپەکاران خۆش دەبن، پاداشی چاکەکاران دەداتەوە، ئەمەش ترۆپکی سەرکەوتنو سەرفیزاویو زاڵبوونە.

لە مێژوودا چەسپاوە کە پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) لەگەڵ هەرسێ هۆزی جوولەکە (بنو قيناعو بنو النضيرو بنو قريظة) کە لە دەرەوەی مەدینە بوون – ئەوپەڕی مامەڵەی باشی کردووە هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی... هەر لەسەرەتای گەیشتنی پیغەمبەر بۆ مەدینە عەهدی لەگەڵدا مۆر کردن: کە شەری

لەگەڵدا نەکەن، دوژمنی نەهێننە سەری‌و یارمەتی دوژمنەکانی نەدەن! ئەوانیش لە گیان‌و ماڵی خۆیان ئەمین بن‌و بەسەربەستی‌و ئازادی کارو باری خۆیان ئەنجام بدەن، کەچی جوولەکەکان لە کاتی ئاشتی‌و ئارامیدا پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندەوە، پیلانیان لە خودی پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گێڕا، پاڵیان بە سوپای قورەیشییەکانەوە داو لەگەڵ عەرەبە کافرەکان شەڕیان دژی موسوڵمانان هەڵگیرساند، پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر ئەوەندەی لەگەڵ کردن کە لە دەوروبەری خۆی دووری خستنەوە، لە کۆتاییشدا کە موسوڵمانان بەهێز بوون پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سزای جوولەکەکانی نەدا لەسەر ئەو هەموو پیلان‌و خیانەتکارییەی کە لەگەڵ موسوڵماناندا کردیان تەنها ئامۆژگاری موسوڵمانانی کرد لە نیوەی دورگەی عەرەب وەدەریان نێن، نەهێڵن ئەو خائینانە لە نزیك پایتەختی موسوڵماناندا نیشتەجێ بن! بە مەبەستی جێبەجێ کردنی فەرمانی پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جوولەکەکانی بەرەو شام رەو پێکردن.

﴿وَمِنَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّا نَصَارَى أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ﴾ هەروەها عەهدو پەیمانمان لە مەسیحییەکانیش وەرگرت؛ کە هەرکاتێ پیغەمبەری ئاخر زەمان رەوانە کرا شوێنی بکەون‌و یارمەتی بدەن‌و پشتی بگرن، هەروەها بەڵێنمان لێ وەرگرتن کە بڕوا بە هەموو پیغەمبەرانی خودا بکەن، کەچی ئەوانیش هەمان هەڵوێستی جوولەکەکانیان نواند، ئایینی خۆیان تێکدا، گۆڕانکارییان تێدا کرد، سەرپێچی... هەموو عەهدو پەیمانێکیان کرد، بەڵێنی خۆیان هەڵوەشاندەوە بۆیە خودا دەفەرموێ: ﴿فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ﴾ کاریان بە بنەمای ئایینەکەی خۆیان نەکرد، پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیری ئینجیل نەبوون، هەموو وادەو بەڵێنی خۆیان هەڵوەشاندەوە ﴿فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ ئێمەش لە تۆڵەی ئەوەدا تۆوی دوژمنایەتی‌و ڕق‌و کینەمان خستە ناویانەوە، هەریەکەیان ڕقی لەوی ترە، هەر بەو شێوەیەش دەمێننەوە هەتا رۆژی قیامەت! کۆمەڵەی مەسیحی وێڕای جوداوازی رەگ‌و رەگەزیان لە نێوان خۆیاندا دوژمنایەتی دژایەتییان هەیە، هەریەکە ئەوەی تر بە کافر حسێب دەکا، هەریەکەیان نەفرین لەوی تر دەکا!

﴿وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللّهُ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ﴾ لەوە بەولاوە رۆژی قیامەت خودا لە کاتی حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ کردندا پێیان دەڵێ: لە دونیادا چییان کردووە، یەکە یەکە تاوانەکانیان بیر دەخاتەوەو سزایان دەدا لەسەری، تاوانی پەیمان شکێنیو پابەند نەبوون بە وادەو بەڵێنی جەخت لەسەر کراوو گۆڕینی ئینجیلو گۆڕانکاری لەو فەرمانو جڵەوگیرییانەی کە لە خۆی گرتوون، ئەمە هەڕەشەیەکی توندو سامناکە بۆ مەسیحییەکان لەسەر ئەو هەموو تاوانو تاوانکارییەی کە ئەنجامیان داوە، لەسەر ئەوەی کە درۆیان بەدەم خوداوە هەڵبەستووەو پیغەمبەریان بە درۆ خستۆتەوە لەسەر ئەوەی کە دەڵێن: خودا خێزانی هەیە، منداڵی هەن شەریکی هەن خودا سێ ئەقنومی هەیە، کوڕو باوكو گیانی پاك، بێگومان خودا رۆژی قیامەت لەسەر ئەم هەڵوێستەو بیروباوەڕانەیان سزایان دەدا!!

ئەوەی لە ڕووی مێژوییەوە تەنانەت لای خودی مەسیحییەکانیش چەسپاوە؛ ئەوەیە: کە مەسیح بۆخۆی پەندو ئامۆژگاریو تەعلیماتەکانی خۆی نەنوسیوەتەوە، کە دونیای بەجێ هێشتووە ئینجیلێکی نووسراو نەبووە، جوولەکەکانیش بەوپەڕی دڕندەییو دڵڕەقییەوە چەوساندوونیانەوە بە تایبەتی زۆر ستەمکاریان لەگەڵ حەوارییەکانیدا کردووە! کاتێك (قوسطه نطين مەليك) بوو بە مەسیحیو ئیمانی بەو پەیامە هێناو ئایینی مەسیحی بەرەسمی ناساند، هەڵمەتی قەڵاچۆکردنی مەسیحییەکان لە لایەن دوژمنەکانیانەوە کەمێك هێواش بووەوە، ئەمجار مەسیحییەکان دەستیان کرد بە نووسینەوەی ئینجیلەکانیان کە چەند ئینجیلێك بوون هەریەکەیان لەوی تریان جیابوو، ئەو چوار ئینجیلەی کە ئەمرۆ لە ئارادان، سێ سەدە پاش لە دونیا دەرچوونی مەسیح نووسراونەتەوە واتە: لەسەردەمی قوستەنتین مەلیکی رۆمانیدا کە ئایینی مەسیحی بەرەسمی ناساندو بۆخۆی ئەو ئایینەی پەسەند کرد! ئیتر لەو کاتەشەوە چەند بیروباوەڕێکی فەلسەفیو ئیغریقی بتپەرستی چووە ناو ئایینی مەسیحیەوە! ئەم ئینجیلانە کە پێیان دەگوترێ (العهد الجديد) وێڕای ئەوەی کە بێ بنەماو بێ مێژوونو کۆمەڵێك دەقی جۆێ جۆێو دژ بەیەکیان تێدایە، لەبەر رۆشنایی کتێبەکانی جوولەکەدا

دانراون: کە پێیان دەگوترێ (العهد القدیم) کە ئەمانەش بۆخۆیان بناغەیەکی رەسەنو چەسپاو راستیان نیە وەکوو لەوە پێش ئاماژەمان بۆ کرد!!

## مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٦﴾ ﴾.

ئەمجار دوای ئەوەی یەزدان ئەوەی بۆ روون کردینەوە کە وادەو بەڵێنی لە ئەهلی کیتاب وەرگرتووە، کە پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودا بن، هەروەکوو چۆن بەڵێنی لە نەتەوەی ئیسلامیش وەرگرتووە، بەڵام ئەهلی کیتاب پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندەوەو پابەندی نەبوون دوای ئەو روون کردنەوە جارێکی تر بانگی ئەهلی کیتابی کردەوە: بۆ ئەوەی ئیمان بە پێغەمبەری ئیسلام بێنن.

ئیبنو جەریری طەبەری لە عەکرەمەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کۆمەڵێك جوولەکە هاتنە خزمەت پێغەمبەر (صَلی اللهُ عليهِ وَسلَم) پرسیاری (رجم)

بەردبارانی داوێن پیسییان لێ کرد، پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) سوێندی دان بەو کەسەی کە تەوراتی بۆ سەر موسا ناردۆتە خوارێو کێوی تووری بەرزکردۆتەوەو لەسەر سەری جوولەکەکان ڕای گرتو وادەو بەڵێنی لە ئەهلی کیتاب وەرگرتووە: کە لە شایەتیدا ڕاست بڕۆن: ئەمیش وتی: کاتێك ڕەوشتی داوێن پیسی لە ناوماندا بلاوبووەوە سەد داری جەڵدمان لێ دەدانو سەرمان دەتاشین، واتە: لە بنەڕەتدا بەردباران بووە! ئیتر پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) حوکمی دانێ بە ڕەجم کردنی زیناکەرەکە، ئەمجار ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ﴾ ئەی کۆمەڵی جوولەکەو نەصارا! ﴿قَدْ جَاءكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ﴾ بێگومان پیغەمبەری ئێمە (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) هاتووە بۆ سەرتان، ئێمە ناردوومانە بۆ ناوتان، بۆ ئەوەی زۆر لەو حوکمانەی کە شاردووتانەوەو لە تەوراتدا چەسپاون بۆتانی ڕوون بکەینەوە (وەکوو حوکمی زیناکەر کە بەردباران کردنیەتی، ئەم حوکمە لەو حوکمانەیە کە لە سیفری (التثنية)دا تۆمار کراوە، بەلام ئێوە پابەندی نەبوونو کاری پی ناکەن، عالەکەشتان (ئیبنو صوريا) لای پیغەمبەر ئینکاری هەبوونی ئەو حوکمەی کرد، دوایی کە پیغەمبەر سوێندی دا، دانی پیانا، ئەی کۆمەڵی جوولەکەو نەصارا! ئێمە پیغەمبەری ئیسلام؛ (محمد)مان ناردووە بۆ سەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی، ناردووومانە بە بەڵگەی بەهێزەوە بۆ جیاکردنەوەی حەق لە بەتاڵ.

## قورئانی پیرۆز دوو ڕەوشتی پیغەمبەری لێرەدا دیاری کردووە:

ڕەوشتی یەکەم ئەوەیە: پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) بڕێ گۆڕانکاریو هەڵگێڕانەوەو تەئویل کردنیان بۆ دەقەکانی تەورات ڕوون دەکاتەوە.

زۆر لەو شتانەی کە لە تەوراتدا هەیەو شاردوویانەتەوەو بۆیان ڕوون دەکاتەوە، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: نیشانەو ڕەوشتی پیغەمبەریان شاردۆتەوە، حوکمی زیناکەر کە بەردباران کردنە شاردوویانەتەوە بەلام خودا چاوپۆشی لێ نەکردنو پەردەی لەسەر هەڵنەماڵین، جا کە پیغەمبەر لەگەڵ ئەوەشدا کە خوێندەواری نەبووە – ئەم نهێنییانەی ئاشکرا کردنو حوکمە شاردراوەکانی

تەوراتی خستنە ڕوو، ئەوە نیشانەی ڕاستی پیغەمبەرایەتییەکەیەتی، ئەگینا پیغەمبەرێکی نەخوێندەوار چۆن ئەو حوکمانەی زانین!!؟

ڕەوشتی دووەم: بێدەنگی لە زۆر حوکمی شاردراوەی تر کردووە کە دەرخستنیان بۆ بانگەوازییەکەی پێویست نیەو سوودی ئیسلام لە ڕوون کردنەوەیاندا نیە وەکوو دەفەرموێ:

﴿وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾ واتە: ڕەوشتی دووەمی پیغەمبەر ئەوەیە: کە زۆر شت لەو حوکمانەی شاردویانەتەوە لە تەوراتدا هەن ئەو چاوپۆشی لێ دەکاو پەردە لەسەرتان هەڵنامالێ چونکە بۆ نەخشەی بانگەوازییەکەی پێویست نیە، بەڵام پێویستە ئەوان بۆخۆیان واز لەو گۆڕانکاریو حوکم شاردنەوە بێنن بۆ ئەوەی حەیایان نەچێ!! بێگومان ڕوون کردنەوەی قورئان دەربارەی حوکمە شاردراوەکانی تەوراتو ئینجیل بوو بە هۆی موسوڵمان بوونی زۆر لە مالمو زاناکانیان..

ئەمجار پەروەردگار وەصفی قورئان دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَدْ جَاءَكُم مِّنَ اللَّهِ نُورٌ﴾ لە خوداوە (نوور) بۆ ئێوە هاتووە پیغەمبەرێك کە مەشخەڵی نوورو ڕووناکییە، ئەگەر ئەو پیغەمبەرە نەبوایە هیچ کەسێك شارەزایی ئایینی حەقو ڕاست نەدەبوو، خەڵکی لە گومڕاییو سەرلێشێواویدا دەمانەوە، بڕێ لە ڕاڤەکەران دەڵێن: مەبەست بە (نوور) ئایینی ئیسلامە.

﴿وَكِتَابٌ مُّبِينٌ﴾ بۆتان هاتووە کتێبێکی ڕێگا نیشاندەرو حەق ئاشکراکەرو ڕاستو دروست، هەرچی ئادەمیزاد پێویستیان پێ بێ ئەو ڕوونی کردۆتەوە، بەرنامەی ژیانەو، کەتەلۆکی بوونەوەرە، قانونو یاسای خودایە بۆ بەندەکانی: ﴿يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ﴾ پەروەردگار بە هۆی ئەو قورئانەوە کەسانێك شارەزا دەکا کە بیانەوێ لەسەر ئایینی حەقو ڕاست بنو شوێن پەندو ئامۆژگاری یەزدان بکەون! شارەزایان دەکا بۆ ڕێگای ڕزگاریو سەرفرازیو پرۆگرامی ڕاستو دروست! ﴿وَيُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ﴾ لە گومڕاییو چارەڕەشی ڕزگاریان دەکا، لە باوەشی کوفرو بێدینی دەریان دێنێ، دەیانخاتە ناو دونیای نوورو ئیمانو کامەرانییەوە، ﴿وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ شارەزایان دەکا بۆ ڕاسترین ڕێگە کە ئەویش ئایینی حەقو ڕاستی ئیسلامە، چونکە حەق بۆخۆی

ته‌نیا ڕێگه‌ی ڕاست‌و دروسته به‌ڵام به‌تاڵ بریتییه له چه‌ند شیوو دۆڵ‌و کوێره ڕێ‌و که‌نده‌ڵان‌و به‌سته‌ڵه‌ك‌و هه‌ڵدێر.

**په‌روه‌ردگار سێ به‌هره‌ی قورئانی دیاری کردوون:**

١- قورئان نامه‌یه‌کی ئاشکراو حه‌ق‌و ڕاست‌و دروسته.

٢- هه‌رکه‌سێك شوێن ئایینی خودا بکه‌وێ قورئان شاره‌زای ده‌کا بۆ ڕێبازێك که له هه‌ردوو جیهاندا لێی ده‌حه‌سێته‌وه، له هه‌موو به‌دبه‌ختی‌و چاره‌ڕه‌شییه‌ك ڕزگاری ده‌بێ.

٣- شاره‌زاییکه‌ره بۆ ڕێگایه‌ك که ده‌یگه‌یه‌نێ به مه‌به‌ستی به‌رزو پیرۆز، ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی پابه‌ندی فه‌رمان‌و جڵه‌وگیرییه‌کانی بن‌و به ڕێك‌و پێکی ببنه ڕێبواری ئه‌و کاروانه پیرۆزه.

## ره‌تکردنه‌وه‌ی بیروباوه‌ڕی جووله‌که‌و مه‌سیحییه‌کان

﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَنْ يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَنْ يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَىٰ نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُمْ

بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٩﴾﴾.

دوای ئەوەی پەروەردگار بەشێوەیەکی گشتی بەڵگەی لەسەر ئەهلی کیتاب هێنایەوە سەرزەنشتی کردن‌و ئەوەی روون کردەوە: کە ئەوانە کەمتەرخەم‌و تاوانبارن، روویان لە حەق وەرگێڕاوە، چونکە بڕوایان بە پەیامی ئیسلام نەکردووە، ئەمجار دێ بە شێوەیەکی تایبەتی باسی کوفرو سەر لێ شێواوی مەسیحییەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ﴾ بێگومان کافرو بێ باوەڕن ئەوانەی کە دەڵێن: خودا بریتییە لە مەسیحی کوڕی مەریەم.

وەکوو زاندراوە: تەنها کۆمەڵی یاقوبییەکان لە نەتەوەی مەسیحی پێیان وایە: کە مەسیح خوایە، پاشان ئەم رێبازو بیروباوەڕە لە ناو هەرسێك کۆمەڵەی مەسیحی (کاثولیك، ئەرثودکس، پرۆتستانت)دا بلاوبووەوە پرۆتستانت پێش چوارده سەدە لەسەر دەستی راهیبێکی موصلیح کە ناوی (مارتن لۆثەر) بوو دامەزراوە، ئەم راهیبە ئایینی مەسیحی لە زۆر بیروباوەڕی پڕوپووچ پاك کردەوە، بانگەوازییەکەی پەرەی سەندو بوو بە رێبازی ژمارەیەکی زۆری مەسیحی؛ ئەم رێبازە بەتایبەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو ئەڵمانیا بلاوبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (مارتن لۆثەر) بانگەوازی بیروباوەڕی بۆ سێ خودایی دەکردو هەرکەسێك بانگەوازی یەکتاپەرستی‌و یەك خودای بکردایە ئەوە

بە مەسیحی حلێب نەدەکرد.. بەڵام لە ئاکاما رایەکەی سەر بەوە دەکێشێ کەوا وەصفی مەسیح دەکا کە خودایە، ئەوەتا لەلاپەڕەی یەکەمی ئینجیلدا نووسراوە (كتاب العهد الجديد لربنا ومخلصنا يسوع المسيح) هەموو کۆمەڵەی مەسیحی ئەمڕۆ لەسەر ئەوەن: کە خودا مەسیحی کوڕی مەریەمە، عیسا خودایە، بەڵگەشیان ئەو دەقەیە: کە لە ئینجیلی یوحەننادا هەیە، کە دەڵێ (في البدء كانت الكلمة والكلمة كانت عند الله، والله هو الكلمة) کەلیمە لای مەسیحییەکان بریتییە لە عیسا، کەوابێ بەپێی رستەی سێیەم لەم دەقە وای لێ دێتەوە (خودا عیسای کوڕی مەریەمە).

بەهەرحاڵ ئێستا لەناو مەسیحییەکانی خۆرئاوادا کەسانێك هەن بڕوایان وایە: کە مەسیح رەوانەکراوو پێغەمبەرە، نەك خودا! قورئانی پیرۆز وەصفی مەسیحییەکانی بەوە کردووە کە دەڵێن: خودا عیسای کوڕی مەریەمە! بۆیە ئەم باوەڕە بێ بناخەیان رەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو مەسیحییانە بڵێ: کە جەسارەت لەسەر پلەو پایەی خودایەتی دەکەن: پێیان بڵێ کێ دەسەڵاتی هەیە لە ناوچوونو مردن لە عیساو دایکی دووربخاتەوە؟! بەڵکوو کێ لە توانایدا هەیە کە مردن لە هەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی دووربخاتەوە؟ ئەگەر خودا ویسی لە ناویان بەرێ کێ هەیە نەهێڵێ ئەم ویستەی یەزدان بێتە جێ؟ بە کورتی مەسیحو دایکی دروستکراوو بە دیهێنراون وەکوو بە دیهێنراوانی تر کە مردنو نەمان روویان تێ دەکا، ئەگەر خودا ویستی بیانفەوتێنێ یان هەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی لە ناو بەرێ کەس نیە بتوانێ بەرگری بکاو نەهێڵێ ویستەکەی خودا بێتە دی، جا کە مەسیح نەتوانێ مردن لە خۆیو دایکی دووربخاتەوە وەکوو چۆن ناتوانێ لە خەڵکی تریشی دووربخاتەوە، ئەدی چۆن بۆخۆی خودایەو دەسەڵاتی هەموو بوونەوەری هەیەو هەموو شتێکی بەدەستە؟؟

بەس پەروەردگار دەسەڵاتی رەهاو بێ سنووری هەیە، دەتوانێ هەموو بوونەوەر لەناوبەرێ، هەموو ئادەمیزادان بمرێنێ، هیچ شتێك نیە ببێتە لەمپەر لەبەردەم ئیرادەیدا، دەسەڵاتێك نیە لە ژوور دەسەڵاتی خوداوە بێ، چونکە ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ هەر بۆ خودایە پادشایەتیو خاوەنیەتی

ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لە ناویاندا هەیە، چی لە بوونەوەردا هەیە ملکی خودایە! چی ئادەمیزادو جنۆکەو فریشتە هەن دروستکراوی خودان! ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ هەر ساتێك بیەوێ شتێك بێنێتە دی دەیهێنێتە دی، چۆنی بوێ لە نەبوونەوە دروستی دەکا، جاری وادەبێ لە گڵ ئادەمیزاد دروست دەکا بەبێ ئەوەی دایكو باوكی هەبێ، وەکوو ئادەم "درودی خودای لێ بێ" هەروەها بنەمای هەموو زیندەوەرێکی تر کە لەگڵ دروستی کردوون! جاری وا دەبێ ئادەمیزاد دروست دەکا تەنها باوکی هەیە دایکی نیە، وەکوو دایە (حەوا) جاری وا هەیە ئادەمیزاد دروست دەکا باوکی نیەو بەس دایکی هەیە، وەکوو (عیسا) ئەمە رەتدانەوەی مەسیحییەکانە، کە پێیان وایە: مەسیح هەم خودایەو هەم ئادەمیزادە، دەڵێن: (عیسا) سروشتی ئادەمیزادی تێدایەو سروشتی خوداشی تێدایە، سروشتە خودابیەکەی زاڵترە، چونکە بە شێوەیەکی نائاسایی بەبێ باوك دروست کراوە، کردەوەی سەرسوڕهێنەر لەسەر دەستی روویان داوە... بەڵام لە راستیدا ئەم رووداوە نائاساییانەی کە لەسەر دەستی عیسا رویانداوە، موعجیزەو نیشانەی پیغەمبەرایەتی (عیسا)نو بەویستی خودا هاتوونە دی، ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خودا بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە جاری وا دەبێ بەبێ دایكو باوك ئادەمیزاد دروست دەکا، جاری وا دەبێ بەبێ باوك ئادەمیزاد دروست دەکا! وەکوو (عیسا) کە ئێوە بە خودای دەزانن! بە کورتی هەرشتێك ویستو ئیرادەی خودا پەیوەندی پێوە ببەستێ بە دەسەڵاتو توانای بێ سنووری دێتە دی، جا کە برە شتێك بەسەر سوڕهێنەر دێتە بەرچاو ئەوە هەر بە نیسبەت ئادەمیزادەوەیە نەك بە نیسبەت خوداوەیە، هەموو کارێك بۆ خودا وەکوو یەك وایە.

کۆمەڵێك جوولەکە هاتنە خزمەت پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەگەڵیدا کەوتنە گفتوگۆ، بانگی کردن بۆ بڕوا هێنانو لە سزای خودا ترساندنی، وتیان: ئەی محمد! مەمان ترسێنە ئێمە کوڕی خوداینو خۆشەویستی خۆینی ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ﴾ جوولەکەکانو مەسیحییەکان دەڵێن: ئێمە خۆشەویستی خوداین سەر بە پیغەمبەرەکانینیو رێزو قەدرمان لای خودا هەیە، چاودێریمان دەکا، قسەمان لای خودا پەسەندەو شانسو بەختمان

هەیە، کە دەڵێن: ﴿نَحْنُ أَبْنَاء اللّهِ﴾ مەبەستیان ئەوە نیە کە کوڕی بەراستی خودا بن، بەڵکوو مەبەستیان ئەوەیە: کە لای خودا خۆشەویستو قسە ڕۆیشتوون!

ئیتر خودا بیروبۆچوونەکەی ڕەت کردنەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: دەی ئەگەر وایە بۆچی خودا لە دونیادا لەسەر تاوانەکانتان سزاتان دەدا، وەکوو ئەوە بتپەرستەکان مزگەوتی گەورەی ئێوەیان رووخاند، شاری پیرۆزی قودسیان وێران کرد، فەرمانڕەواییان لێ ستاندنەوە لە قیامەتیشدا ئاگری دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون لە تۆڵەی کوفرو درۆو بوختان هەڵبەستنتان، خۆ وا باوە باوك ڕۆڵەی خۆی خۆش دەوێ زەرەرو زیانی پێ ناگەیەنێ! جا کە ئێوە خودا سزاتان دەدا مانای وایە: ئێوە خۆشەویستی خودا نین‌و لای خودا ئەو ڕێزو قەدرەتان نیە کە بۆخۆتان ئیدیعای بۆ دەکەن!!

﴿بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ﴾ بەڵکوو ئێوە ئادەمیزادن‌و وەکوو هەموو ئادەمیزادێکی ترو بەندەی پەروەردگارن، خودا مەرایی لەبەر کەس ناکاو منەتی لەکەس نیە ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء﴾ کەسێك شیاوی لێخۆشبوون بێ لێی خۆش دەبێ‌و کامەرانی دونیاو قیامەتی دەداتێ ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء﴾ کەسێك شیاوی سزادان بێ سزای دەداو تۆڵەی لێ دەستێنێ، خودا چی بوێ‌و چۆنی بوێ ئاوا ئەنجامی دەداو کەس ناتوانێ بەرگری بکا، کەوابێ لە لوتبەرزی خۆتان دابەزن‌و بە خۆتاندا بچنەوە، ئەو بانگەشەو فڕوفیشاڵە سوودتان پێ ناگەیەنێ، ئەوەی کە سوود بەخشە بۆتان بیروباوەڕی راستەقینەو بڕواهێنانە بە پەیامی ئیسلام‌و کردنی کردەوەی چاکە! ﴿وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ هەر بۆ خودایە خاوەنیەتی‌و دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیاندایە، لە ناویاندایە، هەموو بوونەوەر دروست کراوو بەندی ئەڵقە لە گوێی خودان‌و لە ژێر دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی ئەودان، گەڕانەوە هەر بۆلای خودایە، هەموو بەندەکان زیندوو دەکرێنەوەو دەچنەوە بەر قاپی یەزدان، بە شێوەیەکی دادپەروەرانە دادگایی هەموو ئادەمیزادان دەکاو، هەر کەسە بە پێی کردارو گوفتاری پاداش‌و سزای دەداتەوە پەروەردگار بۆیە ڕستەی ﴿وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ دووبارە کردەوە بۆ ڕەتکردنەوەو چەسپاندنی ئەو پەیامەیە: کە دەڵێ: خودا خاوەنی

مەسیحەو دەتوانێ لەناوی بەرێ، هەروەها بۆ رەتدانەوەو بەرپەرچدانەوەی هەموو جوولەکەو مەسیحییەکانە، بۆیان روون دەکاتەوە کە خودا توانای لێخۆشبوونو سزادانی هەیە، هەرچی بوێ دەیکا، هەروەها رەتکردنەوەی ئەو ئیدیعا کردنەیانە کە دەڵێن: ئێمە لە خودا نزیکینو شانسو بەختمان لای خودا هەیە، بۆیان روون دەکاتەوە کە لە خودا نزیکی ئەوە نیە: کە ئەوان لێی حاڵی بوون، بەڵکوو تەرازووی نزیك بوونەوە لە خودا بڕوای راستو کرداری چاکە، نەك رەگەزو چینایەتی کەوابێ ئەو ئیدیعایانە درۆیە کە دەڵێن: جوولەکە گەلو هۆزی هەڵبـژێردراوی خودانو خۆشەویستی یەزدانن!! بەڵکوو لای خودا کێ زیاتر خودا پەرست بێو بڕوا دروستو قایمو پتەو بێ ئەوە لای خودا رێزدارترە.

ئەوجار خودا جارێکی تر خیتاب ئاڕاستەی ئەهلی کیتاب دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَى فَتْرَةٍ مِّنَ الرُّسُلِ﴾ ئەی ئەهلی کیتاب! باش بزانن کە ئەو پیغەمبەرەی کە لەسەر زمانی پیغەمبەرەکانتاندا مزگێنیتان پێ دراوەو لە نامە ئاسمانییەکاندا باسی کراوە هاتووە بۆناوتان، ئەویش رەوانەکراوی خودای مەزن (محمد)ە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوا پیغەمبەرەو هیچ پیغەمبەر نایەن لە دوای ئەو، بەڵکوو ئەو پشتگیری پەیامی ئەوان دەکاو بڕوای بە هەموویان هەیەو هەموویان بە حەق دەزانێ! (محمد) ئەو پیغەمبەرەیە: کە لە نامە ئاسمانییەکانتاندا مزگێنیتان دەربارەی دراوەتێ، پیغەمبەرەکانتان نیشانەکانی ئەویان بە ئێوە راگەیاندووە، ئەو پیغەمبەرە پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر پچڕانو لێبڕانی پیغەمبەراندا ئەو هاتۆتە سەرتان، ماوەیەکی دوورو درێژ تێپەڕیوە بەسەر لە دونیا دەرچوونی عیسادا ئەمجار ئەم نێردراوە، بۆ ئەوەی پێویستیاتی ئایینیتان بۆ روون بکاتەوە، رەوڕەوەی ژیانتان بۆ دیاری بکا، بیروباوەڕی بتپەرستیو مادە پەرستیتان لێ دووربخاتەوە، خوداپەرستیو تەقواکاری راستو دروستتان فێر دەکا، ئەوەی تێیدا کەوتوونە گومانەوە بۆتان راست بکاتەوە!

وەکوو دەڵێن: نێوان ئادەمو نوح هەزار ساڵ بووە، نێوان نوحو ئیبراهیم هەزار ساڵ بووە، نێوان موساو عیسا هەزارو حەوت صەد ساڵ بووە، لە نێوان لە دایك بوونی مەسیحو لە دایك بوونی پیغەمبەری ئیسلام پێنج صەدو شەستو نۆ ساڵ بووە.. بەڵێ پەروەردگار (محمد)ی رەوانە کرد بۆ سەر ئێوە نەوەکوو بڵێن: ئێمە ترسێنەرمان نەهاتۆتە ناو، کەس نەبووە ئامۆژگاریمان بکاو مزگێنی بەهەشتمان بداتێ لە ئاگری دۆزەخ بمانترسێنێ! ئیتر پەروەردگار ئەم عوزەریان بۆ ناهێڵێتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَن تَقُولُواْ مَا جَاءنَا مِن بَشِيرٍ وَلاَ نَذِيرٍ﴾ ئەوەتا پیغەمبەرمان بۆ ناردن بۆ ئەوەی نەڵێن هیچ موژدەدەرو ترسێنەرێکمان نەهاتۆتە ناو، بێ ئاگا بووین ئەوەتا ئێستا ﴿فَقَدْ جَاءكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ﴾ هاتۆتە ناوتان پیغەمبەرێك ناوی (محمد)ەو دوا پیغەمبەرە، مزگێنی دەدا بەوانەی خوداپەرستی دەکەن، بەهەشت رەزامەندی خودا بەتەمایان دەکا سەرپێچی کەران لە دۆزەخ دەترسێنێو رێگای راستو دروست نیشان ئادەمیزاد دەدا، رێگای سەرفرازی رزگاری هەتا هەتایی بۆ ئادەمیزادان دەست نیشان دەکا!

﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا بە تواناو دەسەڵاتە، هەرکەسێك یەکتاپەرستی بکا، پاداشی دەداتەوە، هەرکەسێك سەرپێچی بکا سزای دەدا هەندێکیش لەو بەڵگانەی دەسەڵاتی خودا دیاری دەکەن یارمەتیدانو سەرخستنی پیغەمبەرەکەیەتی کە (محمد) (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلم) بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیەتی لە دونیادا پێ بەخشینی پایەی بڵندە لە رۆژی قیامەتدا!

## داواکردنی حەزرەتی موسا لە نەتەوەکەی کە نیعمەتەکانی خودا لەبیرنەکەنو بچنە ناو خاکی پیرۆزەوە

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا

لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِى وَأَخِى ۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ

يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾.

ئەمجار پاش ئەوەی بەلگەی هێنایەوە لەسەر حەق‌و راستی پیغەمبەرایەتی (محمد)و موناقەشەی ئەهلی کیتابی کردوو بیرو بۆچوونەکانیانی رەت کردەوە! ئەمجار دوو هەلوێستی جوولەکە دیاری دەکا؛ کە نیشانەی سەر رەقی‌و بێ باوەڕییانە.. یەکەمیان ئینکاری کردنی نیعمەتە زۆرەکانی خودایە بۆیان. دووەمیان یاخی بوونیانە لە فەرمانی موسا، کە فەرمانی پێ کردن بچنە خاکی فەلەستینەوەو لەگەڵ عەمالیقەو کەتەکاندا بجەنگێن بە قسەیان نەکردوو فەرمانەکەیان رەت کردەوە.

پەروەردگار کە ئەم هەلوێستەی جوولەکەکان دیاری دەکا، بۆ دلدانەوەی پیغەمبەرو پێناسەکردنیان بەوە کە سەرپێچی کردن لەلای ئەوان شتێکی سروشتیەو لەگەڵ خوێنیان تێکەلە، دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ اذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ﴾ ئەی پیغەمبەر! ئەوە بۆ نەتەوەی ئیسرائیل‌و هەموو ئەوانەی کە بانگەوازی تۆیان دەگاتێ بگێڕەوە کە موسا بە نەتەوەکەی خۆی گوت: ئەی خەلکینە! یادی نیعمەت‌و بەخششی خودا بکەنەوە بەسەرتانەوە: کە خێرو خۆشی دونیاو قیامەتی پێ بەخشیون، لەدەست فیرعەون رزگاری کردن‌و لە ولاتی زولم‌و ستەمکاری رەوی پێ کردن، سەربەستی‌و ئازادی پێ بەخشین‌و لە چەوساندنەوەو کۆیلایەتی دەربازی کردن! ئەمجار موسا سێ نیعمەتی هەرە گەورە بۆ گەلەکەی دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ:

١- یادی نیعمەتی خودا بکەنەوە بەسەرتانەوە ﴿إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنبِيَاء﴾ کە زنجیرەی پیغەمبەرانی یەك لە دوای یەکی تێدا رەوانە کردون، هەر لە ئیبراهیمەوە زنجیرەی پیغەمبەران لە ناو ئەواندا نەپچڕاوە، وەکوو موساو هارون‌و ئەوانەی لە پێش ئەوان‌و دوای ئەوان هاتوون هەموو پیغەمبەرەکانی بەنو ئیسرائیلی دوای موسا بە گوێرەی تەورات رەفتاریان کردووەو کتێبی ئاسمانی هەموانیان بووە!

﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾ لە دوای کۆیلەیەتی‌و ژێردەستەیی کردوونی بە خاوەنی خۆتان، لە بەندو کۆتی چەوساندنەوە رزگاری کردوون، هەر کەسە بۆخۆی خاوەنی موڵك‌و ماڵ‌و خێزانی خۆیەتی..!

ئەبو سەعیدی خودری فەرموودەیەکی (مرفوع) دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (کان بنو اسرائیل اذا کان لاحدهم خادم ودابة وامرأة کتب ملکا).

ئەبو داوود لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە: کە دەفەرموێ: (من کان له بیت وخادم فهو ملك).

ئاشکراشە لەناو کۆمەڵدا کەسێك ئەو شتانەی هەبێ (سەربەرستی‌و خاوەنیەتی ماڵ‌و دارایی خۆی‌و ئازادی لە هەڵسوڕانیدا) بە ڕواڵەت پێی دەگوترێ: مەلیك = پاشا! تەنانەت تا ئێستا کەسێك خزمەتکاری هەبێ‌و ماڵ‌و داراییەکی مامناوەندی هەبێ‌و لەگەڵ هۆزو عەشیرەتی خۆیدا بە دڵنیایی دانیشێ‌و، لە ماڵ‌و حاڵی خۆیدا سەربەست‌و ئازاد بێ خەڵکی پێی دەڵێن: ئەوە پادشایە مەلیکی ماڵی خۆیەتی! هەرچەندە لە راستیدا پادشاش نەبێ!

٢- ﴿وَآتَاكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ﴾ نازو نیعمەتێکی وای پێ بەخشیوون کە نەیداوە بە کەسی تر لەو رۆژگارەدا، بە تایبەتی رێزو نرخی پێ داون، دەریای بۆ شەق کردن‌و چەن رێگایەکی بۆ تێداکردنەوە پێیدا رۆیشتن‌و لە دەستی فیرعەون رزگاریان بوو دوژمنی هەرە گەورەیان کە فیرعەون بوو، بۆی لە ناو بردن.

٣- گەزۆو گۆشتی پەلەوەری شێلاقەی بۆ دابارانددن هەوری لەسەر سەر راگرتن؛ بۆ ئەوەی سێبەریان لێ بکا، ئەمجار کە حەزرەتی موسا (سەلامی خودای لێ بێ) ئەو نازو نیعمەتانەی خودای وەبیر هێنانەوە، فەرمانی پێ کردن کە جیهاد بکەن‌و دژی دوژمن بجەنگێن، بەڵێنی ئەوەشی پێ دان کە خودا یارمەتییان دەداو پشتگیریان لێ دەکاو پێی گوتن:

﴿يَا قَوْمِ ادْخُلُوا الأَرْضَ الْمُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەی نەتەوەی ئیسرائیل ئەی گەل‌و هۆزەکەم خودا لە کۆیلایەتی‌و ژێر دەستەیی رزگاری کردن! سەربەستی‌و ئازادیتان بەدەست هێنا! پێویستە پارێزگاری ئەو دەستکەوتە بە

نرخەی خۆتان بکەن! بچنە ناو ئەو خاکە پیرۆزەوە کە لە بتپەرستی پاک کراوەتەوەو بووەتە زێدو مەڵبەندی پیغەمبەران، خودا بۆ ئێوەی داناوەو کردوویەتی بە خاکی نیشتیمانی ئێوە؛ کە خاکی فەلەستینو شامە، بچنە ناویەوەو دامو دەزگای خۆتانی تێدا دابمەزرێننو کافرو خودا نەناسانی لێ وەدەرنێنو خۆتان تێیدا نیشتەجێ بن!!

ئیبنو عەساکیر لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ: خاکی پیرۆز نێوان عەریشو فوراتە، بڕێکیش لە: بەشی شیمالی سوریای ئێستاو فەلەستینە، سوریەو فەلەستین لێرەدا بریتین لە خاکی پیرۆز (الأرض المقدسة) کە خاکی میعادیشی پێ دەڵێن: چونکە وەکوو دەڵێن: پەروەردگار بەڵێنی بە ئیبراهیم دا: کە ئەو خاکە بکاتە زێدی نەتەوەکانی.

دکتۆر بۆست لە قاموسی (كتاب المقدس)دا دەڵێ: ناوی فەلەستین لە سەرەتاوە تایبەت بوو بە خاکی فەلەستینییەکان، دوایی کراوە بە ناوی هەموو خاکی ئیسرائیلییەکان کە دەکەوێتە خۆرئاوای ئەردەنەوە، لە بنەڕەتدا پێیان دەگوت: وڵاتی کەنعان فەلەستین: ئەرزی موقەدەسو یان خاکی ئیسرائیل، یان خاکی وادە پێدراو، یان خاکی جوولەکەیان پێ دەگوت، ئەمەش ئەو وڵاتو هەرێمەیە: کە کەوتۆتە رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستەوە نیوان زێو نیلو فوراتو دەریای ناوبراوەوە کە هەموو قارەی ئاسیاو ئەفریقا پێکەوە دەبەستێتەوە.

مانای ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ خودا کردویەتی بە بەشی ئێوە؛ بۆ تێدا دانیشتن، واتە: مافی ئەوەیان هەبێ تێیدا نیشتەجێ بن، نەك بە موڵکایەتی ببێ بە موڵکی ئەوانو کەسی تر لە گەڵیان تێیدا دانەنیشێ، چونکە ئەوە پێچەوانەی واقیعە، پەروەردگار وادەی بە ئیبراهیم داوە: کە مافی ئەوەی هەبێ لەو وڵاتە نیشتەجێ ببێ، دیارە دوای خۆیشی بۆ نەوەکانی هەیە: کە تێیدا نیشتەجێ ببن، نەك موڵکی تایبەتی ئەوان بێ، کەوابوو بیروبۆچوونی جوولەکە لەو وادەیەوە کە دەڵێن: ئەوە موڵکی ئێمەیە راست دەرناچێ، چونکە ئەوەتا: پەروەردگار دوای چەند ئایەتێك لێرە بەو لاوە دەفەرموێ: ﴿قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ﴾ ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەرزی فەلەستین بەخشرابوو بە جوولەکە، بەڵام دوایی لێیان قەدەغە کرا؛ چونکە

لە خودا یاخی بوونو سەرپێچیان کرد. هەروەها چونکە فەرموودەی خودا: کە دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ اللَّـهُ لَكُمْ﴾ پەیوەستە بەمەرجی خودا پەرستییەوە، مەرج نەیەتە جێ، مەرج پێ کراو نایەتە دی.

﴿وَلَا تَرْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ﴾ نەکەن هەلگەڕێنەوەو واز لە یەکتاپەرستیو دادپەروەریو ڕێگای بەختەوەری بهێننو ڕوبکەنە بتپەرستیو گێرە شێوێنیو ستەمکاریو ئاشوب گێڕان، شوێن هەواو هەوەس بکەون، چونکە لەم هەلگەڕانەوەتاندا خەسارەتمەندی دونیاو قیامەتتانی تێدایە، ئەو نیعمەتو بەخششانەی پێتان دراوە لە کیستان دەچێ ئەو خاکە پیرۆزەی پێتان دراوە: کە بیکەنە زێدو نیشتمانی خۆتان لە پاساوی شوکرو خوداپەرستیتاندا، لێتان دەسێندرێتەوە لە خێرو بەرەکەتی بێ بەری دەبن.

کەچی ئەوان بە ئامۆژگارییەکانی موسا پەند ئامێز نەبوون هیچ ئامادەباشییان نیشان نەدا بەڵکوو ﴿قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ﴾ وتیان: ئەی موسا ئەو وڵاتو هەرێمەی کە هەڵمان دەنێی بچینە ناویەوە، گەلو هۆزێکی جەربەزەو کەتەی تێدان، ئادەمیزادەکانیان باڵا بەرزو بە هێزو بە تاوانو سامناکن، هەموو پاڵەوانو گورز بەدەست بەهەڵمەتو نەبەردن، ئێمە دەرەقەتیان نایەین ﴿وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا مِنْهَا﴾ ئێمە ناچینە ناو شارەوە هەتا ئەوان چۆڵی نەکەن، ئەگەر ئەوان لێی چوونە دەرەوە ئەوکاتە ئێمە دەچینە ناوی!

بە پوختیو بە کوردی موسا کە بەخۆیو گەلەکەی لەهەرێمی خاکی پیرۆز نزیك بوونەوە وڵاتێکی ئاوەدانو هەوا سازگار بوو، فەرمانی بە گەلەکەی کرد بچنە ناویو داگیری بکەن، ئەگەر دانیشتوانی ئەو شارە بەرگرییان کرد شەڕیان لەگەڵدا بکەن، بەڵام جوولەکەکان سەرپێچییان کردو عوزریان هێنایەوە وتیان: ئێمە زەبوونو بێ دارو بارو لاوازین، ئەوانە زەبەلاحو پڕ چەكو بەهەڵمەتو شەڕکەرو کەتەو پۆشناخو خاوەن دەستو بازو گورز وەشێنن، هەتا ئەوان لە وێدا بن، ئێمە ناچینە ناو ئەو شارەوە، بە هیچ جۆرێك خۆمان لە قەرەی ئەوان نادین!

بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی ترسنۆکیو بێ باوەڕیو هیچوپووچی دەگەیەنێ! دەیانویست بەبێ ماندوبوون، بەبێ ئەوەی زیانێکیان پێ بگا، بەبێ ئەوەی هێزی

عــەقڵی‌و جەســتەیی بــەکار بێــنن، دەســتکەوتیان هــەبێ، ئامــادە نــەبوون بــۆ دورخستنەوەی شەڕو ناخۆشی لـە خۆیـان کـەمترین فیـداکاری بنـوێنن، دەیانویـست هەموو شتێکیان بە موعجیزەو شێوەی نائاسایی‌و ناسروشتی دەست بکەوێ! دیـارە گەل‌و نەتەوەیـەك ئـەوە ڕەفتـاری بـێ، هـەرگیز شـیاوی ئـەوە نیـە بـە سەربەسـتی‌و ئــازادی بــژی، شــیاوی ژیــانی پیاوانــەو ســەرفیرازی نیــە، مــافی ســەربەخۆیی‌و فەرماندەیی‌و خود موختاری نیە!!!

﴿فَإِن يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ﴾ ئەگـەر ئـەوان لێـی دەربـچن ئێمـە دەچینـە نـاوی. ﴿قَالَ رَجُلاَنِ مِنَ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِمَا﴾ دوو پیـاو لـە نەقیبـەکان کـە ترسی خودایان لە دڵدا بوو، پـەروەردگار نیعمـەتی هیدایـەت‌و ئیمـانی تـەواوی پـێ بەخشی بوون‌و تـەوفیقی دابـوون، بـۆ ڕێبازێـك کـە لێـی ڕازی بـوون، بتمانـەیان بـە یارمەتی خودا هەبوو، پشت ئەستوور بوون بە یارمەتیـدانی خـودا، دوو پیـاو بـوون لە پیاوە صاڵحەکانی گەلی موسا کە یوشـوعی کـوڕی نـوون‌و کـالبی کـوڕی یوحـەننا بوون، ئەو دوو پیاوە وتیـان: ﴿ادْخُلُواْ عَلَيْهِمُ الْبَـابَ﴾ تـا دەرگـای شـار لێیـان بـچینە پێشەوە ورەبەرنە خۆتان‌و هەڵمەت بـەرن ﴿فَـإِذَا دَخَلْتُمُـوهُ فَـإِنَّكُمْ غَـالِبُونَ﴾ ئەگـەر ئێوە تا دەرگای شار بۆیان چوون‌و خۆتان نیشان دان‌و ئامـادەبوون شـەڕیان لەگەڵدا بکـەن، ئـەوە خـودا یارمـەتیتان دەداو بەسـەر دوژمنەکانتانـدا زاڵتـان دەکـا، ئەگـەر توانـای خۆتـان بـەکاربێنن‌و فەرمانبـەرداری خـودا بـن‌و بتمانـەتان بـە خۆتـان بـوو پشتیوانیتان بە خودا بـە هێـز بووبـوو، بڕواتـان وابـوو: کە وادەی خـودا جێبـەجێ دەبێ، خودا بەو تواناو دەسەڵاتە بۆ بـەدیهێنانی بەڵێنـەکانی، هـەروەها پێیـان وتـن ئێوە لە زەلامی‌و زەبەللاحی ئەوان مەترسن! دڵیان پڕ بووە لە ترس‌و بیم لە ئێـوە، هەرچەند جەستەیان گەورەو زەبەللاحە دڵیان زەبوون‌و لاوازە!

کەچی جوولەکەکان بەمـەش پەنـدیان وەرنـەگرت‌و هـەر لەسـەر ترسـنۆکی خۆیان بەردەوام بوون‌و ﴿وَعَلَى اللّهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّـؤْمِنِينَ﴾ تـەوەکولتان هـەر بـە خودا بێ‌و پشت بە ئەو ببەستن ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هەیـەو موسـوڵمانن!. ﴿قَالُواْ يَا مُوسَى إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَـا﴾ وتیـان: ئـەی موسـا! ئێمـە هـەرگیز نزیك لەو شارە ناکەوینەوە، هەتا ئەوانە لەوێـدابن ئێمـە زات ناکـەین بـچینە نـاوی

﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ ئه‌ی موسا! ئه‌گه‌ر راست ده‌كه‌ی‌و خودا فه‌رمانی پێ كردووی كه‌ جیهادی بۆ بكه‌ی ئه‌وه‌ تۆو خوداكه‌ت بچن بۆ شه‌ڕ كردن له‌گه‌ڵ ئه‌و عیملاقانه‌دا، له‌گه‌ڵ ئه‌و زه‌لام‌و زه‌به‌لاح‌و شانپان‌و كه‌ته‌و پاڵه‌وانانه‌دا، ئێمه‌ لێره‌ داده‌نیشین‌و چاوه‌ڕێی ئاكامی شه‌ڕه‌كه‌تانین! به‌ڕاستی ئه‌م هه‌ڵوێسته‌یان ئه‌وپه‌ڕی بێ ئه‌ده‌بی‌و بێ عه‌قڵی‌و ترسنۆكی‌و بێ باوه‌ڕی تێدایه‌، به‌ڵام ئه‌مه‌ له‌وان چاوه‌ڕان كراو بوو، چونكه‌ گه‌لێك دوای خوداپه‌رستی ده‌ست بكه‌ن به‌ گوێره‌كه‌ په‌رستن، ئه‌و هه‌موو بوختان‌و پڕوپاگه‌ندانه‌ بۆ پێغه‌مبه‌ره‌كانیان بكه‌ن، ئه‌زیه‌تیان بده‌ن راوه‌دوویان بنێنن، بیانكوژن، دڵ ڕه‌قی‌و بێ واده‌و به‌ڵێن بن، هه‌ڵبه‌ته‌ ئه‌و جۆره‌ هه‌ڵوێستانه‌شیان لێ چاوه‌ڕوان كراوه‌. قورئانی پیرۆز زۆر به‌دره‌وشتی‌و دڵ ڕه‌قی‌و په‌یمان شكێنی جووله‌كه‌كانی تۆمار كردووه‌و بۆ په‌ندو عیبره‌ت بۆمان ده‌گێڕێته‌وه‌. حه‌زره‌تی موسا زۆر به‌و هه‌ڵوێسته‌یان ناره‌حه‌ت بوو، رقی لێ هه‌ڵسان؛ خۆی به‌ شه‌رمه‌زاری قاپی په‌روه‌ردگار زانی، رووی كرده‌ باره‌گای یه‌زدان‌و عوزری هێنایه‌وه‌و خه‌م‌و خه‌فه‌تی خۆی ده‌ربڕی‌و ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي لا أَمْلِكُ إِلاَّ نَفْسِي وَأَخِي﴾ وتی: په‌روه‌ردگارم! من ته‌نها ده‌سه‌ڵاتی خۆم‌و براكه‌م هه‌یه‌، ناتوانم به‌ زۆر جگه‌ له‌ خۆم‌و براكه‌م كه‌سی تر هه‌ڵنێم بۆ فه‌رمانبه‌رداریت له‌ خۆشی‌و ناخۆشیدا.

ئه‌م وته‌یه‌ی حه‌زره‌تی موسا، ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێ: كه‌ موسا له‌ هه‌ڵوێستی (یوشوع‌و كالب)یش دڵنیا نه‌بووه‌و پێی وانه‌بووه‌ كه‌ ئه‌وانیش هاوبه‌شی خۆی‌و هارونی برای بكه‌ن، چونكه‌ وێ ده‌چێ كه‌سێك ئاماده‌باشی تێدا بێ بۆ هه‌ڵمه‌ت بردن بۆ سه‌ر دوژمن له‌گه‌ڵ سوپایه‌كی زۆردا، به‌ڵام هه‌مان ئاماده‌باشی تێدا نه‌بێ كه‌ له‌گه‌ڵ ژماره‌یه‌كی كه‌م دا بێ..

جا كه‌ حه‌زره‌تی موسا ئه‌م هه‌ڵوێسته‌ ترسنۆكانه‌ی له‌ گه‌له‌كه‌ی بینی، ئاوا بووده‌ڵه‌و هیچ له‌ بارا نه‌بوو هاتنه‌ پێشه‌وه‌، به‌ هیچ جۆرێك فه‌رمانبه‌ردار نه‌بوون، ده‌ستی نزای به‌رزكردنه‌وه‌و داوای له‌ بارگای یه‌زدان كرد، وتی: ﴿فَافْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ خودایه‌! من‌و براكه‌م له‌م قه‌ومه‌ فاسق‌و سه‌رپێچیكه‌ره‌ جیا بكه‌ره‌وه‌، ئه‌وانه‌ به‌م سه‌رپێچی كردنانه‌یان بوون به‌ دوژمنی ئێمه‌، ده‌ی

پەروەردگار حوکم بکە لە نێوانمانداو هەر کەسە شیاوی چیە لە پاداش‌و سزا با وەری بگرێ!

یان مەبەستی ئەوەیە بڵێ: خودایە! ئەگەر سزای ئەمانەت داو لەسەر ئەم سەرپێچی کردنانەیان تۆڵەت لێ ستاندن ئێمەیان لێ جیا بکەرەوە سزاکەت لە ئێمە بە دوور بێ! ئیتر پەروەردگار نیگای بۆ موسا نارد ﴿قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الأَرْضِ﴾ فەرمووی: بەهۆی ئەو سەرپێچی کردنە لێیان، ئەو خاکە پیرۆزەیان لێ یاساغ‌و قەدەغەیە؛ بۆ ماوەی چڵ ساڵ دەبێ لە بیابان‌و چۆڵەوانیدا سەرگەردان‌و سەر لێ شێواو بن، نەزانن لە کوێوە هاتوون‌و بۆ کوێ دەچن.

﴿فَلاَ تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ ئەی موسا! تۆ خەفەت بۆ گەل‌و نەتەوەی ستەمکارو سەرپێچیکەر مەخۆ، دڵ نارەحەت مەبە بۆیان؛ ئیتر ماوەی ئەو چڵ ساڵە ئەوانەی ئەو سەرپێچییەیان کرد، لە ماوەی ئەم چڵ ساڵەدا، یان لە ژیاندا نامێنن، یان پیرو کەنەفت دەبن بە کاری جیهاد نایەن.

لە ماوەی ئەو چڵ ساڵەدا کە بەسەرگەردانی‌و سەر لێ شێواوی بە خاکی دەشتی سینادا دەسووڕانەوە، سەروبەری خۆیان دەرنەکرد قیمەت‌و نرخێکی جیهانیان نەبوو، تۆڵەو سزای پەروەردگار بوو بۆیان، کە ئەوندە بێ عەقڵ‌و نەفام بوون لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزانەی پیشانیان درا، باوەڕیان بە پەیامی خودا نەکرد، وێڕای ئەو هەموو ژمارە زۆرەیان هەرچەندە کردیان‌و کرواندیان لە خۆیان رانەدی بچن لەگەڵ ئەو دانیشتوانەی ناو شارەکە شەڕ بکەن‌و لە وڵاتی خۆیان دەریان بکەن، بۆیە خودا تووشی ئەو هەموو نەهامەتییەی کردن! بێگومان لەم سزا خوداییەدا پەندو ئامۆژگاری زۆر بۆ خاوەن عەقڵان هەیە، گەلانی ژێردەستەو چەوساوە پێویستە سوودی لێ وەربگرن، چونکە ئەو گەل‌و هۆزانەلە ژێر باری داگیرکەراندا دەچەوسێندرێنەوە ئەخلاقییان نامێنێ، هێزو توانایان بە فیڕۆ دەڕوا، مۆرکی ژێر دەستەیی‌و چەوساوەییان پێوە دەنرێ، لەگەڵ چڵکاو خۆری‌و ژێردەستەییدا رادێن،ئەگەر ماوەیەکی دوورودرێژیان بەم شێوەیە بەسەردا تێپەڕی خزمەتچیەتی‌و چڵکاو خۆرییان لا دەبێتە شتێکی ئاسایی‌و خوی پێوە دەگرن، جا کە لەو حاڵە ژێردەستەیی‌و چەوساندنەوە رزگاریان بوو، دڵیان بۆی لێ دەداو ملیان

بۆ دەخوریۆ و حەزی لێ دەکەنەوە، چونکە تازە باریان پێوە گرتووەو پێوەی راهاتوون عەرەب گوتەنی: (ترك العادة مرض) کوردیش دەڵێن خویەك گرتت بە شیری تەرکی ناکەی بە پیری!!

دەڵێن ژمارەی بەنو ئیسرائیلییەکان شەش صەد هەزار کەس بوون حەزرەتی هاروون لەو بیابانە کاکی بە کاکییەدا مردووە، دوای ئەوو بە ساڵێك حەزرەتی موساش لە دونیا دەرچووە، موسا پاڕایەوە کە لەخاکی پیرۆز نزیك ببێتەوە ئەمجار بمرێ، پەروەردگار نزیکی کردەوە تا بەردهاویژێك لە دوور خاکی پیرۆز گیانی دەرچوو، ئەوکاتە حەزرەتی یوشوع تەمەنی لە چل ساڵ تێپەڕی بوو کرا بە پیغەمبەریان و فەرمانی پێ کرا بە شەڕ کردن لەگەل جەبابیرەکاندا، ئەویش ئەو جوولەکانەی کە مابوون کۆی کردنەوەو بردنی بۆ شەڕ کردن، ئەو رۆژەی دەست کرا بە شەڕ رۆژی هەینی بوو، رۆژ وەستا، روناکی بەردەوام بوو، تا یوشوع و تاقمەکەی لەشەڕەکە بوونەوە.

ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا (حەدیث)ێکی ریوایەت کردووە، دەفەرموێ: «إِنَّ الشَّمْسَ لَمْ تُحْبَسْ عَلَى بَشَرٍ إِلاَّ لِيُوشَعَ لَيَالِيَ سَارَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ» زومەخشەری و هی تریش پرسیارێکیان هەڵساندووە دەڵێن: چۆن مانای فەرموودەی خودا ﴿فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ﴾ لەگەڵ فەرموودەی خودا ﴿الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ رێك دەکەون؟؟ بە دوو شێوە وەڵامی ئەم پرسیارە دراوەتەوە.

١- مەبەست ئەوەیە: چل ساڵ ئەو خاکە لە ئێوە یاساغە، کە چل ساڵەکە تێپەڕی دەبێتە بە خاکی خۆتان.

٢- ئەو خاکە بۆ ئێوە نووسراوەو کراوە: بە زێدی ئێوە، بەمەرجێ جیهاد لەگەڵ دانیشتووە زەبەللاحەکانیدا بکەن، کاتێ سەرپێچییان کرد خودا ئەو خاکەی لێ حەرام کردن.

**چیرۆکی قابیل‌و هابیل یەکەم تاوانی کوشتنە:**

﴿ ۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾ مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا

وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَافٍ أَوْ يُنفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾

ئەمجار پەروەردگار چیرۆکێکی سەرنج راکێشمان بۆ دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی کاردانەوەی حەسوودیمان بۆ دیاری بکا، بزانین حەسوودیو خۆویستیو حیقدو کینە چەند پەتایەکی سامناكو کوشندەن بۆ لێك هەڵوەشانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، چەند زیانبەخشو زەرەر ئاوەرن، چەند زوو سەردەکێشن بۆ خوێن ڕشتنو تەفرو تونا بوون!

نموونەی ئەمە زۆرو زەبەندن، بۆیە پاش ئەوەی پەروەردگار باسی حەسوودی جوولەکەکانی کرد بەرامبەر پێغەمبەر تا گەیشتە ئەوەی ویستیان

تیرۆری بکەن، ئەمجار چیرۆکی دوو کوڕەکانی باوە ئادەممان بۆ دەگێڕێتەوە، کە برا حەسوودی بە برا بردووە، پەیوەندی ئەم چیرۆکەش بە ئایەتەکانی پێشووەوە ئەوەیە، کە ستەمکاری جوولەکەکان‌و هەلوەشاندنەوەی وادەو بەلێنیان دەشوبهێتەوە ستەمکاری کوڕی ئادەم لە هەلوێستەکەیدا، دەفەرموێ: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ﴾ زۆربەی زانایانی ئیسلام دەلێن: ئەم دوو کوڕە کوڕی ئادەم بوون، لە پشتی ئەو پەیدا بوون.. لە سفری تەکویندا دەلێ: ئەو دوو کوڕە یەکەم کوڕی ئادەم بوون یەکیان ناوی قاین یان قابین بووە.

بەلام ڕافەکەرانی قورئان مێژوو نووسە موسولمانانەکان بە قابیل‌و هابیل ناویان بردوون، قابیل بکوژەو هابیل کوژراوەکە بووە واتە: ئەی محمد! بەسەر ئەهلی کیتاب‌و هی کەشدا ئەو هەواڵە گرنگە بخوێنەوە، هەوالی دوو کوڕەکەی ئادەم بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست بگێڕەوەو حەقیقەت‌و ڕاستی ئەو ڕوداوەیان بۆ شی بکەرەوە، بۆیان شی بکەرەوە کە ئادەمیزاد سروشت‌و تەبیعەتی چۆنە، چەند بەیەکتری حەسوودی دەبەن‌و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەپەرستن!! چەند ئامادەباشییان تێدایە بۆ دەست درێژی کردنە سەر یەکتر و یەکدی کوشتن بۆ ئەوەی حیکمەتی شەریعەت‌و دانانی کوشتنەوەو داری حەدو دەست بڕین تێبگەن، بۆ ئەوەی بزانن: هەولدانی جوولەکە بۆ لە ناو بردنی پیغەمبەرو موسولمانان شتێکی ئاساییە، نموونەی ئەم جوولەکانە وەکوو دوو کوڕەکەی ئادەم وایە: کە کوڕە خراپەکەیان حەسوودی بە باشەکەیان بردوو دەست درێژی کردە سەری‌و کوشتی؛ هۆی ئەم چیرۆکە ئەوە بووە لە شەریعەتی ئادەمدا ڕێگا هەبووە بۆ ئەوە برا خوشکی خۆی مارە بکا، بەم جۆرە کچی ئەم سکە بدرێ بە کوڕی ئەو سکەو بە پێچەوانەشەوە خێزانی ئادەم بەهەر سکێك کوڕو کچێکی دەبوون، کچی ئەم سك دەدرا بە کوڕی سکەکەی تر.. ئەو کچەی لەگەڵ هابیل بوو ناشیرین بوو ئەوەی لەگەڵ قابیل لەدایك بووبوو جوان بوو، قابیل ڕازی نەبوو هاوسکەکەی خۆی بدا ب عابیل‌و هاوسکی هابیل لە خۆی مارە بکا، ویستی بۆخۆی هاوسکی خۆی کە زۆر جوان بوو مارە بکا، لەسەر ئەوە کێشەیان تێکەوت، حەزرەتی ئادەم پێیانی فەرموو: کە کوشتییەك سەربڕن دای بنێن قوربانی هەرکامیان لەلایەن یەزدانەوە قبووڵ

کرا!؛ ئەو کچە جوانەکە مارەبکا، ئاگرێك لە ئاسمانەوە هاتوو قوربانییەکەی (هابیل)ی برد کە نیشانەی قبووڵ بوون بوو، قوربانی قابیل لە شوێنی خۆی مایەوە، قبووڵ نەکرا، ئیتر لەسەر ئەو ئەم رووداوە سامناکە کە لێرە بەم لاوە قورئان تۆماری کردووە روویدا وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا﴾ کە هەریەکەیان قووربانیەکیان ئامادە کرد، بۆ قبووڵ بوون ﴿فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا﴾ قوربانی یەکێکیان کە (هابیل) بوو وەرگیرا، بەم جۆرە ئاگرێك لە ئاسمانەوە هات قوربانیەکەی هابیلی لەگەڵ خۆیدا برد بە ئاسمانا کە بەرانێکی قەڵەو بوو، قبووڵ کرا ﴿وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ﴾ لەوی تریان کە قابیل بوو وەرنەگیرا، کە قوربانیەکەی بریتی بوو: لە هەندێ گوڵە گەنمو پوشو پەڵاش. ئیبنو عەبباسو ئیبنو عومەرو کەسانی تریش دەڵێن: یەکیان خاوەنی کشتو کاڵو دانەوێڵە بوو، بە نابەدڵی خراپترین جۆری دانەوێڵەی هێنابوو بیکا بە خێر، ئەوی تریشیان خاوەنی مەڕو ماڵات بوو باشترین ئاژەڵی هێنا بوو بۆ قوربانی.. دەڵێن: نیشانەی قەربانی قبووڵ کراو ئەوە بوو: کە ئاگرێك لە ئاسمانەوە دەهات دەیخوارد، ئەگەر نەیخواردایە ئەوە بە قبووڵ کراو حلێب نەدەکرا.

جا کە هەریەکەیان قوربانی خۆی ئامادە کرد لەگەڵ باوکیاندا چوونە سەر کێوێك دانیشتنو چاوەڕوانی قبووڵ بوونی قوربانیەکەیان بوون، پەروەردگار ئاگرێکی نارد قوربانیەکەی (هابیل)ی لول داو بردی، قوربانی (قابیل) لە شوێنی خۆی مایەوە ئەمجار قابیل رووی کردە هابیل وتی: قوربانی تۆ وەرگیراو هی من رەت کرایەوە دەبێ بتکوژم نەهێڵم بە مراد بگەی، هابیل وتی: من لە ناخی دڵمەوە بەوپەڕی پێ خۆش بوونەوە چاکترینو پاکترین ماڵی خۆم هێنا بۆ قوربانیو خودا لێی قبووڵ کردم، تۆ خراپترین ماڵی خۆت هێنا بۆ قوربانیو خوودا لێی وەرنەگرتی، خودا بۆخۆی پاكو خاوێنە، شتێ خاوێن نەبێ وەری ناگرێ، قوربانی لە خوداپەرستو تەقواکار وەردەگیرێ لەوانە قوربانی وەردەگرێ کە لە سزای خودا بترسن، هاوبەشی بۆ قەرار نادەن، خۆ لە تاوانو سەرپێچی کردن دەپارێزن! وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ – آل عمران/٩٢﴾.

کە هابیل ئەم ئامۆژگاریانەی بە قابیل گوت: ﴿قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ﴾ قابیل ڕەقی هەڵسا وتی، مەرج بێ دەتکوژم؛ ئیتر ئاسنێکی بەرز کردەوەو پێی کێشاو کوشتی! جا کە قابیل هەڕەشەی لە هابیل کرد، هابیل زۆر بە هێواشی وتی ﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ پەروەردگار خێرو خێرات لە تەقواکەر وەردەگرێ، لە کەسێك قوربانی قبووڵ دەکا کەخۆ لە تاوان بپارێزێ، واتە: من تاوانێکم نەکردووە شیاوی ئەوە بم بمکوژی، ئەگەر خودا قوربانیەکەی وەرنەگرتووی ئەوە بە خۆتدا بچۆرەوە، بزانە هۆیەکەی چیەو خۆت باش بکەو واز لە سەرپێچی کردنی خودا بێنەو هەوڵ بدە تەقوای خودا بکەو فەرمانبەرداری فەرمانو جڵەوگیریەکانی بە ﴿لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي﴾ خۆ ئەگەر دەستدرێژی بکەیە سەرمو بتەوێ بمکوژی ﴿مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لَأَقْتُلَكَ﴾ من دەستمت بۆ درێژ ناکەم بۆ ئەوەی بتکوژم! هەرگیز وەڵامی ئەو کردەوە خراپەت نادەمەوە، چونکە ئەو کارە ناشیرینە لەگەڵ ڕەوشتی من ناگونجێ، ڕێگا بە خۆم نادەم تاوانی ئاوا گەورەم لەدەست بقەومێ، بۆیە هەرگیز کاری ئاوا ناکەم چونکە ﴿إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ من دەترسم لە خودای بوونەوەر، نامەوێ بە خوێن ڕێژو تاوانبار بم بینێ! بەڵکوو خۆ ڕادەگرمو پاداشی صەبرو خۆڕاگریم لە خودا داوا دەکەم! چونکە دەست درێژی بۆ سەر گیانی ئادەمیزاد لە تاوانە هەرە گەورەکانەو من خۆمی لێ دەپارێزم!

بێگومان ئەم وەڵامە ئامۆژگارییەکی زۆر بەلیغو دڵسۆزانەیە، هەوڵ دانە بۆ هێور کردنەوەی براکەی کە سوورە لەسەر ئەنجامدانی تاوانی کوشتن، ئەوەش ناگەیەنێ کە من بەرگری لە خۆم ناکەم، بەڵام ئەوەی تێدایە: کە من تاوانی کوشتن ئەنجام نادەم. ئەمجار هابیل بەردەوام پەندو ئامۆژگاری خۆی ئاراستەی براکەی دەکاو لە سزای دۆزەخ دەی ترسێنێ، هەوڵی ئەوە دەدا لە هەڵوێستەکەی ژێوانی بکاتەوەو دەڵێ ﴿إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ﴾ من دەمەوێ بەم خۆپارێزییەم لە دەست درێژی کردنەوە بۆ سەرت کە تۆ ئەگەر ئەو تاوانەت ئەنجام دا — بگەڕێیتەوە بە گوناهی کوشتنی منو گوناهی تایبەتی خۆت، کە قوربانییەکەت لێ وەرنەگیرا، ئەو کاتە، لە ئاکامی ئەو دوو تاوانانەدا ﴿فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ﴾ تۆ دەخرێیە ناو دۆزەخەوە، دۆزەخیش سزای هەموو ستەمکارێکە،

بـرێکیش دەڵـێن: مەبەسـت ئەوەیـە: بکـوژ ڕۆژی قیامـەت گونـاهی کوژراوەکـەی دەکەوێتە سـەر شان، چونکە ئـەو تاوانانـەی کە مـافی ئادەمیزادیـان تێدایـە خـودا لێیـان خۆش نابـێ تـا مافەکە نەدرێتـەوە بـە خاوەنـەکانیان، جا ئەگـەر سـتەمکار چاکەی هەبوو ئەوە لێی دەدرێ بە ستەم لێکراو، ئەگەر چاکەی نەبوو تاوانی سـتەم لێکـراو دەخرێتـە سەرشانی سـتەمکار بـە ئەنـدازەی خـۆی، ئەگـەر زیـادو کەمیـشی هەبوو بە بەهەشتو دۆزەخ پڕ دەکرێتەوە.

## هابیل بە سێ ئامۆژگاری قابیلی ترساند

**یەکەم**: ترسان لە خودا.

**دووەم**: تاوان هەڵگرتن.

**سێیەم**: دوو گوناهی تاوانی کوشتنو تاوانی تایبـەتی خـۆی، خـستنە ڕیـزو حیساب کردنی لە پێڕی دۆزەخیانو سـتەمکاراندا! ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەو ئامۆژگاریو هەوڵدانەی هابیل تۆزقاڵێك کاری لـە قابیـل نـەکردو لە هەڵوێستەکەی ژێوان نەبووەوە.

﴿فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ﴾ ئینجا پاش ئەو هـەموو پەنـدو ئامۆژگارییـەی هابیل بۆ قابیلی برایو بەهیوای ئەوە لە ئەنجامـدانی ئـەو تاوانـە پاشـگەز بێتـەوە، بـەڵام نەفـسی سەرکەشـی قابیـل ڕۆڵـی خـۆی گێـڕاو هانیـدا بـۆ کوشـتنی براکـەیو ئەنجام دانی ئەو تاوانە سامناکەی لەپێش چاو جوانو لە دڵیدا شیرین کرد، دەسـتی تاوانی بۆ درێژ کردو هەڵمـەتی بـێ ویژدانانـەی بـۆ بـرد ﴿فَقَتَلَـهُ﴾ هـابیلی کوشـتو تـاوانی سـامناکی ئـەنجام دا ﴿فَأَصْـبَحَ مِـنَ الْخَاسِـرِينَ﴾ چـووە ڕیـزی ئەوانـەی خەسـارەتمەندی دونیـاو قیامـەت بـوون! لـە دونیـادا بـە سـەرکۆنە کـراویو خەفەتباریو بێ هیوایی ژیا، لە قیامەتیشا لە تۆڵەی ئەو تاوانە گەورەدا دەخرێتـە دۆزەخەوەو بە توندترین سزا تۆڵەی لێ دەستێندرێ، چونکە لەگەڵ هەموو بکوژێك هاوبەشە.

ئیتر کە ئەم کارەساتەی لەدەست قـەوما، ئـەو دیمەنـە سامناکەی بـە چـاوی خۆی بینی، بەتایبەتی کە دیمەنی ئادەمیزادی کوژراو زۆر قیز لێ کـراو سامناکە —

سەری لێ تێك چوو، نەیزانی چی لە جەستەی برای کوژراوی بکاو ئەو دیمەنە لەبەرچاوی خۆی لابەرێ!

﴿فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الأَرْضِ﴾ خودا قەلەڕەشەیەکی نارد، لە پێش چاوی قابیل دەستی کرد بە هەڵکەندنی زەویو چاڵێکی هەڵکۆڵی، جا وەکوو دەڵێن: ئەو قەلەڕەشە قەلەڕەشەیەکی تری کوشتو خستیە ناو چاڵەکەوە، یان لاشەی قەلەڕەشێکی بێ گیانی پێ بوو، یان لەو شوێنە لاشەیەکی باڵندەی بێ گیانی بینی خستییە ناو چاڵەکەوەو خۆڵەکەی بەسەردا کرد ، تا بە تەواوی ژێر خاکی کرد ﴿لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءَةَ أَخِيهِ﴾ بۆ ئەوەی پیشان قابیلی بدا: کە چۆن جەستەی بێ گیانی براکەی بشارێتەوە، کە ئەمەی بینی هاواری کردو؛ ﴿قَالَ يَا وَيْلَتَا﴾ وتی: ئای هاوار بۆ خۆم قوڕ بەسەر خۆم! داماو هیچ نەدیوو لێقەوماو خۆم!!

﴿أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَذَا الْغُرَابِ﴾؟؟ ئایا من نەمتوانی وەکوو ئەم قەلەڕەشەیە بکەم؟ زانستو هێزو توانای عەقڵیم نەگەیشتە ئاستی عەقڵو هۆشی ئەو قەلەڕەشەیە؟؟ هێندە بێ مێشکم نەمزانی وەکوو ئەو هەڵسو کەوت بکەم؟؟ ﴿فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي﴾ جەستەی شێوێندراوو قێزەونو سامناکی براکەم داپۆشم؟ ئیتر ئەمیش هات چاڵێکی هەڵکەندو جەستەی براکەی تێ خستو گڵەکەی بەسەردا دایەوەو ژێر خاکی کردوو ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ﴾ ئیتر بەتەواوی لە کوشتنی براکەی پەشیمان بووەوە؛ بەڵام تازە چ سوود؟؟ ئەم پەشیمان بوونەوە هەڵوێستی هەموو تاوانبارێکە: کە تاوانێك ئەنجام دەداو پاشان پەشیمان دەبێتەوە! بەڵام دیارە قابیل تۆبەی لێ وەرنەگیراوە، چونکە هەرچەندە لە فەرموودەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) هاتووە کە دەفەرموێ: « النَّدَمُ التَّوْبَةَ»[1] وەلێ ئەم لە تاوانەکە پەشیمان نەبۆتەوە بەڵکوو پەشیمان بوونەوەکەی لە کوشتنی براکەی بووە! چونکە هیچ سوودی لە کوشتنەکەی ئەو نەبینیو لەلایەن باوكو براکانیشیەوە سەرزەنشت کراو بێ ڕێزو نرخ بوو. ڕێگای ئەم تاوانەی بۆ ئادەمیزادانی تر کێشاو سەرەتای

[1]- رواه البخاري وأحمد والحاكم والبيهقي.

کوشتنی داهێناو بوو بە پێشەنگی بکوژان، تا دونیا دونیایە هەرکەسێك بکوژرێ بەشێك لە تاوانی کوشتنەکە لە ئەستۆی قابیلە!

بوخاری‌و موسلیم لە ئیبنو مەسعوودەوە فەرموودەیەکیان گێڕاوەتەوە: کە دەفەرموێ: «لاَ تُقْتَلُ نَفسٌ ظُلْمًا إلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّل كِفْلٌ نصيب مِنْ دَمِهَا، لأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ».

ئەمجار پەروەردگار سزاو ئاکامی ئەم کوشتن‌و تاوانە سامناکە لەسەر ئادەمیزاد بە گشتی‌و لەسەر نەتەوەی ئیسرائیل بە تایبەتی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ﴾ بەهۆی ئەنجامدانی ئەم تاوانە سامناکە: کە قابیل بەرامبەر برای خۆی کردی، بە ناڕەواو ستەمکارانە هابیلی برای کوشت ﴿كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا﴾ یاسای تۆڵەستاندنەوەی کوشتنمان داناوە، لەسەر نەتەوەی ئیسرائیلمان فەرز کرد، کە هەرکەسێ ئادەمیزادێك بەبێ حەق بکوژێ بەبێ ئەوەی تاوانێکی کردبێ کە شیاوی کوشتن بێ، بەبێ ئەوەی ئاژاوەو ئاشوبی لەسەر زەوی بەرپا کردبێ بیکوژێ ئەوە تاوانی زۆر گەورەیە، وەکوو ئەوە وایە: هەموو ئادەمیزادی سەر زەوی کوشتبن، چونکە لای خودا جیاوازی نیە لە نێوان ئەم مرۆڤ تا ئەو مرۆڤ دەست درێژی کردن بۆ سەر ئادەمیزادێك دەست درێژی کردنە بۆ سەر هەموو کۆمەڵگای ئادەمیزاد، چونکە کەسێك پرکێشێ ئەوە بکا ئادەمیزادێك بکوژێ‌و بەڕەوای بزانێ، وەکوو ئەوە وایە: کوشتنی هەموو ئادەمیزاد بە ڕەوا بزانێ!

واتە: چۆن کوشتنی هەموو ئادەمیزاد کارێکی دزێو‌و سامناك‌و روخێنەرو بە هیلاك بەرە، کوشتنی یەك ئادەمیزادیش، هەمان کاردانەوەی هەیەو قورسایی تاوانەکەی لەو ئاستەدایە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا – النساء/٩٣﴾. بە پێچەوانەشەوە ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾ واتە: کەسێك ببێتە هۆی دەرباز بوونی گیانی ئادەمیزادێك لە مردن، وەکوو ئەوە وایە: هەموو ئادەمیزادی لە مردن رزگار کردبێ، چونکە ئەو شتەی پاڵی پێوە ناوە ئادەمیزادێك لە مردن رزگار بکا، دڵسۆزی‌و رەحم‌و رێزگرتنی گیانی ئادەمیزادەو

پابەندبوونە بە فەرمانو جڵەوگیرییەکانی شەریعەت، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە: کە ئەگەر بتوانێ هەموو ئادەمیزاد ئاوا رزگار دەکاو چی لە توانادا بێ بۆ ئەو مەبەستە بەکاری دێنێ! ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە ئادەمیزاد هەموویان ئەندامی یەك خێزانن‌و هەریەکەیان پێویستە پارێزگاری ئەوی تریان بکاو زەرەرو زیان لە یەکتری دوور بخەنەوە، رێز شکاندنی مرۆڤێك رێز شکاندنی هەمووانە یارمەتی‌و بە پیرەوە چوونی لێقەوماوێك بە پیرەوە چوونی هەمووانە، لە زۆر شوێنی تردا قورئان ئاماژە بۆ یەکیەتی گەل‌و گرنگی یەکگرتن دەکا، تەنانەت کارو هەڵوێستی رابوردوانی گەل‌و نەتەوە ومیاڵ داهاتوانی دەدا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە دەست درێژی کردن بۆ سەر ئادەمیزادێك دەست درێژی کردنە بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد لە هەموو کاتو شوێنێکدا.. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە گیانی ئادەمیزاد بە تەنها موڵکی خۆی نیە، بەڵکوو موڵکی هەموو ئەو کۆمەڵەیە کە تێیدا دەژی، بۆیە ئەگەر کەسێك دەست درێژی بکاتە سەر گیانی خۆی، خۆی بکوژێ لە رۆژی قیامەتدا شیاوی سزای بە ئێشە. ئەمجار پەروەردگار لۆمەو سەرزەنشتییەکی توندی خۆی ئاراستەی نەتەوەی ئیسرائیل کرد، چونکە دوای پێزانین‌و تێگەیشتن تاوانیان ئەنجام داوە، لە کوشتندا توندڕەوو بێ ویژدان بوون، پیغەمبەرانیان بە مشار داهێناوە، لە سەردەمی رابوردوو لە سەردەمی ئیسلامیشدا کاری ناپەسەندیان ئەنجام داوە، دڵڕەق‌و بێ ویژدانییان کردووە، وەکوو ئەو هەڵوێستەی بەنو قورەیظەو بەنو نەضیرو بەنو قەینوقاع کە سێ هۆزی جوولەکە بوون بەرامبەر پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نواندیان. ئەوانە لە سەردەمی نەزانیدا شان بەشانی هۆزی ئەوس‌و خەزرەج لە شەڕەکانی پێش ئیسلامدا هاوبەشییان دەکرد، پاش هاتنی ئیسلامیش شان بەشانی موشریکەکان شەڕیان دژی موسوڵمانەکان دەکرد، بۆیە سەرزەنشتیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءتْهُمْ رُسُلُنَا بِالبَيِّنَاتِ﴾ بێگومان پیغەمبەرانی ئێمە بە بەڵگەی ئاشکراوە هاتوونە ناویان‌و بانگەوازیان کردوون‌و رێگەی راست‌و چەوتیان بۆ دیاری کردوون، ﴿ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَلِكَ فِي الأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾ کەچی زۆربەی زۆریان ویڕای ئەو هەموو بانگەوازی‌و پێ راگەیاندنانە، پاش ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانە، سەرباری ئەو هەموو پەندو

ئامۆژگـاری کردنــە، لــە بــاتی ئــەوەی ڕەوشــتیان بــەرز بــێو دڵ نــەرمو هێــدیو لەســەرخۆو میانــڕەو بــن، کەچــی پیــاوکوژو توندڕەویــشن لــە کوشــتندا، ســنوور شکێنن‌و دڵرەقن، لە ئەنجامی تاواندا، دەست درێژیکەرو بێ ویـژدانن‌و لـە کـردارو گوفتـاردا! جا هەرچـەندە ئـەم کـردارە ناپەسـەندانە لەسـەر دەسـتی رابوردووانیـان روویــان داوە، وەلێ وەپــاڵ نەتەوەکــە هــەموویان دەدرێ چــونکە ئــەمانیش بــەو کردەوانــە رازیــن‌و دەســت خۆشــیان لێ دەکــەن، ئەمــەش نیـشانەی یەکیــەتی گــەل‌و نەتەوەیە.

لەم چیرۆکەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئەمـە یەکـەم چیرۆکە پێمـان رادەگەیەنێ: کە حەسوودی هۆی ئەنجامدانی یەکەم تاوانی ئادەمیزادە لەسەر زەوی، هەتا ئێستاش هۆکارێکی سەرەکییە بۆ لێك هەڵوەشاندنی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی‌و خزمایەتی‌و هۆزایەتی‌و نیشتمانی، حەسوود بەلایـەوە گرانـە ببینـێ کە براکـەی خودا نازو نیعمەتێکی پێ بەخشیوە، ئاواتە خوازە ئەو نیعمەتە بدرێ بـە ئـەوو بـۆ یەکێکی تر نەبێ، ئێستا گەورەترین لەمپەڕ لەبەردەم پێشکەوتنی موسوڵمانانـدا بـە خیلی‌و حەسوودییە، هەرکە ئاشتیخوازو پێشکەوتنخوازو رابەرێك لـە نـاو کۆمەڵدا پەیدا بوو، ویستی گەشە بە وڵات بدا، سـەرفیرازی‌و ئـازادی‌و سـەربەخۆیی بـۆ گـەل دەستەبەر بکا، دەیان جلخوارو حەسوود لێی راست دەبنەوەو دەبنە لەمپـەڕو رێگـر لەبەردەم پەیامەکەیدا!! ئەمە دیاردەیەکە هەموو رۆژگارێك دووبارە دەبێتەوە!

لـە دوای ئـەوەی پـەروەردگار خەتـەرو زیـانی تـاوانی کوشـتنی نـاڕەوای بـۆ دیاری کردین، ئـەوەی راگەیانـد کـە کوشـتنی ئادەمیزادێك وەکـوو کوشـتنی هـەموو ئــادەمیزاد وایــە، لەبــەر ئــەوەش یاسـای تۆڵــەو قیـصاصی داهێنـا، ئـیتر گونجـاوو موناسیب دێتـە پێش چاو کە سزای ئاژاوەگێڕو شەڕخوازان‌و ئەوانـەی فیتنـە بـەرپا دەکـەن، کـە زۆربـەی کـات تاوانـەکانیان سەردەکێـشێ بـۆ کوشـتنی نـاڕەوا، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّـهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا﴾ دەربـارەی هاتنــە خـوارەوەی ئــەم ئایەتـە ئیمـامی موسـلیم‌و بوخـاری لـە ئەنەسـەوە دەگێڕنــەوە دەڵــێ: چــەند کەســێك لــە خێڵــی عوکــل‌و عورینــە، هاتنــە خزمــەت پیغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) دەربـارەی ئیـسلام قـسەو ئاخاوتنیـان ئـەنجام داو

ویستیان فێری تەعالیمی ئایین ببن، بەڵام پاش ماوەیەك ئاوو هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت پیغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بڕێك وشترو شوانێکی وەگەڵ خستن‌و ناردنی بۆ دەشت بۆ ئەوەی لەوێ شیری وشترەکان بخۆنەوەو تەندروستیان باش ببێ! کە چوونە دەری مەدینەو گەیشتینە ئەو خرە بەرداوییەی کە پێی دەگوتری: ئەلحەرە لە ئیسلام پەشمان بوونەوەو شوانەکەیان کوشت‌و هەتکیشیان کردو وشترەکانیشیان بردن، ئەم هەواڵە بە پیغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گەیشتەوە، مەفرەزەیەکی بۆ دەرکردن‌و دەستگیر کران‌و هێنانیاننەوە خزمەت پیغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانیدا چاویان هەڵکۆڵین، دەست‌و قاچیان راست‌و چەپ بڕین‌و فڕێیان دانە ناو خرە بەرداوییەکەوە لە دەرەوەی شار کە پێی دەگوترێ ئەلحەرە ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

بڕێکیش دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی کەس‌و کاری هیلالی کوڕی عووەیمیری ئەلئەسلەمی هاتۆتە خوارێ کە لە نێوان هیلال‌و پیغەمبەردا پەیمان‌و بەڵێن هەبوو: کە هەرکەسێك بە هەرێمی ئەواندا هات بۆ خزمەت پیغەمبەر رێگەی لێ نەگرن، کەچی رۆژێك گرۆهێك لە هۆزی (کەنانە) بە مەبەستی موسوڵمان بوون دەهاتن بۆ خزمەت پیغەمبەرو بەو ناوچەیەدا تێپەڕ دەبوون‌و (هیلال)یش لە ماڵ نەبوو خزمەکانی هیلال رێگایان لێ گرتن‌و کوشتنیانن‌و ماڵ‌و سامانەکەشیان بردن. بڕێکیش دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی هۆزێکی ئەهلی کیتاب هاتۆتە خوارێ کە لە نێوان ئەوان‌و پیغەمبەردا عەهدو پەیمان هەبووە، بەڵام ئەو هۆزە نامەردیان کردوو پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوەو رێگەیان لە موسوڵمانان گرت... بەهەر حاڵ دەگونجێ هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە چەند هۆکارێك بن، هەر کەسێك رەوشتی دژایەتی کردنی خوداو پیغەمبەری تێدا بێ بیگرێتەوە جا ئەو کەسانە کافر بن یا موسوڵمان بن، ئەگەر ئایەتەکە دەربارەی کافرەکان هاتبێتە خوارێ ئەوە عیبرەت بە گشتی وشەکەیە نەك بە تایبەتی هۆکارەکە. ئەم ئایەتە ئایەتی (محاربة)ی پێ دەڵێن: واتە: دژایەتی کردن‌و سەرپێچیکردن بە جۆرێك کە تاوانی کوفر رێگە گرتن‌و رێبوار ترساندن‌و ئاژاوەگێڕان‌و ئاشوب بەرپا کردن بگرێتەوە، چونکە ئەم تاوانە (تاوانی دژایەتی کردنی خوداو پیغەمبەر) تاوانێکە ئاشتی

کۆمەڵگا دەشێوێنێ‌و لەرزە بە پایەکانی کۆمەڵگا دەخاو ترس‌و لەرزو دڵەراوکێ لە ناو خەڵکیدا بڵاو دەکاتەوە! بۆیە پەروەردگار سزای توندی بۆ ئەنجامدەرانی داناوە، ئەوەتا: سزای ئەو دژە یاسایانە (المحاربین)ی بە تەرتیب‌و تەوزیع داناوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ﴾ واتە: سزاو تۆڵەی کە بە پێی تاوانی ئەو کەسانە بێ کە لەگەڵ خودادا شەڕ دەکەن‌و بە گژ پێغەمبەری خودادا دەچن‌و شەڕی لەگەڵ دەکەن‌و هێزو توانای بەرگرییان لە خۆیان بۆ دەکرێ چەك‌و تەقەمەنی پێویستیان هەیە، رێگە لە رێبواران دەگرن، دەست درێژی دەکەنە سەر ماڵ‌و گیانی موسوڵمانان ﴿وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا﴾ هەوڵ دەدەن ئاشوب‌و ئاژاوە بگێڕن، لە ناو وڵاتدا ئاشوب‌و خراپە بەرپا بکەن، لەسەر رووی زەوی چەتەیی ئەنجام دەدەن، خەڵك دەکوژن، رێبواران رووت دەکەنەوە ئەوانە سزاو تۆڵەیان ئەوەیە ﴿أَن يُقَتَّلُواْ﴾ واتە: سزایەکی وا کە شایستەی ئەمانە بێ، ئەوەیە: کە بکوژرێن. واتە: ئەگەر خەڵکیان کوشت دەکوژرێنەوە، تەنانەت ئەگەر کەس‌و کاری کوژراوەکەش لێی خۆش ببن یان بە خوێن رازی بن هەردەبێ بکوژرێتەوە ﴿أَوْ يُصَلَّبُواْ﴾ ئەگەر وێڕای کوشتن سامانیان لە خەڵکی ستاندبوو، وێڕای کوشتنەوەیان دەبێ بۆ عیبرەت بکرێن بە داراو هەڵ بواسرێن ﴿أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ﴾ ئەگەر هەر ماڵ‌و سامانیان لە خەڵکی ستاندبوو دەست‌و قاچیان راست‌و چەپ دەبڕدرێن ﴿أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ﴾ ئەگەر هەر خەڵکیان ترساندبوو، هیچ کام لە تاوانی کوشتن‌و ماڵ ستاندنیان ئەنجام نەدابوو، ئەوە لەم شارەوە بۆ ئەو شار دەربەدەر بکرێن.

بەهەر حاڵ کتێبە شەرعییەکان لەم بارەوە زۆر بە دوورو درێژی راو بۆچوونی زانا ئایینیەکانی ئیسلامیان تۆمار کردووە، هەر یەکەیان لە ئایەتەکە حوکمێکی دەرهێناوەو بەڵگەی لەسەر هێناوەتەوە، هەرکەسێك مەبەستیەتی با بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانە.

جا بۆ ئەوەی (محارب) رێگرو ئاژاوەچی ئەو حوکمانەیان بەسەردا بدرێ دەبێ سێ مەرجییان تێدا کۆببێتەوە:

١- دەبێ هێزو توانایان هەبێ بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن، چونکی ئەگەر نەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن حوکمی دزیان بەسەردا دەدرێ، دەبێ دەست درێژی بکەنە سەر رێبواران بە چەك یان بە کوتەك و عەصاو خەنجەر، جا کۆمەڵ و گرۆ بن، یان تاکە کەس بێ، موسوڵمانان روت بکەنەوە، یان زیمی و پەنادراوان روت بکەنەوە.

٢- دەبێ لە دەشت و دەری وڵاتی ئیسلامدا رێگە بە خەڵك بگرن نەك لەناو ئاوەدانیدا، چونکە لە ئاوەدانیدا کابرای رێگە پێگیراو دەتوانێ هانا بۆ دانیشتوان بەرێ و ئەوانیش بە هانایەوە بێن؛ بەڵام جەماوەری زانایان جیاوازی لە نێوان ئاوەدانی و کەژو کێو ناکەن، چونکە رێ دەکەوێ لە ئاوەدانیشدا ئەم جۆرە تاوانانە ئەنجام دەدرێن، واقیعی حاڵیش دەری خست کە ئەم رایە راستە، چونکە ئەوەتا لەسەردەمی ئێمەدا، بووە بە دیاردەیەکی دزێوی هاوچەرخ: کە کۆمەڵێ مافیاو تاوانبار بە شەوو تەنانەت بە رۆژیش جاری وا هەیە لەسەر جادەی گشتی و کوچەو گەڕەکەکانی شاردا هەڵدەکوتنە سەر خەڵکی و روتیان دەکەنەوە.

٣- دەبێ ئەو ماڵ و سامانانەی لە هاوڵاتیانی دەستێنن بە ئاشکرا بیستێنن، چونکە ئەگەر بە نهێنی بیستێنن ئەوە دەبێتە دزی و حوکمی دزیان بەسەردا دەدرێ.

**سزای جەردەو پیاوکوژان (محاربین) سزای دونیایی و سزای قیامەتی هەیە، سزای دونیا چوار جۆرە:**

ا- کوشتن بەبێ هەڵواسین، ئەگەر تەنها تاوانی کوشتنیان ئەنجام دابێ. ئایەتەکە بە وشەی (تقتیل) کە زێدە موبالەغەی تێدایە حوکمەکەی هێناوە، تا ئاماژە بێ بۆ ئەوە کە کوشتنەوەکە حەتمییەو بە هیچ شێوەیەك عەفو ناکرێ، تەنانەت ئەگەر کەس و کاری کوژراو لە بکوژ خۆش بن لێخۆشبوونەکەیان هیچ دەورێکی نابێ، بەڵکوو پێویستە لەسەر دادوەری موسوڵمانان تۆڵەی کوشتنەوەی بەسەردا بداو پێویستە کۆمەڵی موسوڵمانانیش هاریکاری حاکم بکەن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو حوکمە شەرعیە.

ب- کوشتنەوەو هەڵواسین ئەگەر وێڕای تاوانی کوشتن ماڵ و سامانیشیان ستاندبوو.

ج- ئەگەر هەر خەڵکیان رووت کردبووەوە ئەوە دەستو قاچیان راستو چەپ دەبڕدرێن.

د- ئەگەر هەر ترسو خۆفیان خستبووە سەر رێگا تەنها لە وڵات دەردەکرێنو بەس.

هەڵواسین، بەلای حەنەفییەکانو رای پەسەند لای مالیکییەکان لە پێشدا دەبێ، دەڵێن چونکە هەڵواسین سزاو تۆڵە ستاندنە سزاش بە زیندووی نەبێ نابێ، بەلای شافیعییەکانو حەنبەلییەکانەوە هەڵواسین دوای کوشتنەکە دەبێ، چونکە پەروەردگار لە ئایەتەکەدا کوشتنی پێش هەڵواسینەکە خستووە، هەروەها هەڵواسینی بە زیندوویی جۆرە سزایەکە جڵەوگیری لێ کراوە. مەبەستیش لە هەڵواسین ترساندنو تەمێ کردنی کەسانی ترە، بۆ ئەوەی کەسی تر زات نەکا ئەو جۆرە تاوانانە ئەنجام بدا.

﴿ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا﴾ ئەو سزاو تۆڵەو هەڵواسینو دەرکردنە ریسواکردنو تۆڵەو سزادانیان لە دونیادا بۆ ئەوەی کەسی تر بیر لەو جۆرە تاوانە نەکاتەوەو بترسێنو زمندەقیان بچێ، وێڕای ئەو سزا توندو سامناکەی دونیا ﴿وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لە قیامەتیشدا سزای بە ئێشو ترسناکی دۆزەخیان بۆ ئامادە کراوە لە تۆڵەی ئەو تاوانە خەتەرناکەی ئەنجامیان داوەو بناغەی کۆمەڵیان پێ وە لەرزە خستووەو ئەمنو ئاسایشی هاوڵاتیانیان شڵەقاندووە کارو کاسبیان لە خەڵکی تێك داوەو بازرگانییان راگرتووە.

ئەمجار پەروەردگار چەند کەسێك وەلا دەنێو لەم حوکمە دەریان دەهاوێو چەرتیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ﴾ مەگەر ئەوانە نەبێ کە لەپێش ئەوەدا دەستگیر بکرێن تۆبە دەکەنو لە کارەکەیان پەشیمان دەبنەوەو وازدێنن؛ ئەوانە تۆڵەستاندنیان لەسەر لا دەچێ، بەمەرجێ تۆبەکردنەکەیان بەراست بێو فرتو فێڵی تێدا نەبێو بۆ خۆ دەرباز کردن نەبێ، چونکە مەبەست لە تۆڵەستاندنەکە بەرپابوونی ئەمنو ئاسایشە دەی ئەوە بە تۆبە کردنو پەشیمان بوونەوەو وازهێنانیان دەستەبەر دەبێ! ﴿فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ

رَّحِيمٌ﴾ باش بزانن کە خودا لێخۆشبووە، ئەگەر تۆبە بکەن خودا لێتان خۆش دەبێ‌و تاوانەکانیان دەسڕێتەوە، خودا بە رەحم‌و میهرەبانە.

تۆ بەتەنها (حق الله) لا دەبا، ئەگەر مافی ئادەمیزادانی لەسەر بێ دەبێ فەرمبوویان بکاتەوە، کەس‌و کاری کوژراو خاوەن ماڵی رفێندراو زەوت کراو بۆیان هەیە: داوای مافی خۆیان بکەن، تەنانەت تۆبەکەیان بە راست حلێب ناکرێ هەتا ئەو ماڵەی لایانە نەیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی! ئەگە (حاکم)یش لە ماڵەکە عەفویان بکا دەبێ لە گەنجینەی دەوڵەت بیبژێرێ!

## لەخودا ترسان‌و تێکۆشان لەپێناو ئاییندا هۆی رزگاربوونی قیامەتە، هەروەها دونیا بەکەڵکی فیدیەی کافر نایە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٣٦﴾ يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٣٧﴾ ﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار حەسوودی‌و دڵ پیسی جوولەکەکانی روون کردەوە، فرت‌و فێڵ‌و هەوڵدانیان بۆ تیرۆرکردنی پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و کوشتنی پیغەمبەرانی خۆیان بە ناڕەوا لەسەری تۆمار کردن، فەرمانی بە موسوڵمانان کرد بە تەقوا کردن‌و خۆپاراستن لە سزاو غەزەبی، هەڵینان بۆ خۆ

نزیك كردنەوە لەخوا، لەڕێگەی كرداری چاكو فەرمانبەرداری بۆ پەروەردگار، جڵەوگیری لێ كردن كە پشت بە بیروڕای جوولەكەو مەسیحی نەبەستنو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ﴾ ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە بە خودایەتی خوداو پیغەمبەرایەتی (محمد) خۆتان بپارێزن لەسزای خودا، شتێك مەكەن خودا لە خۆتان برەنجێنن، پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەكانی بن ﴿وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوَسِيلَةَ﴾ هەوڵ بدەن لە یەزدان نزیك ببنەوە بە تاعەتو خودا پەرستی، شتێك بكەن جێگای ڕەزامەندی پەروەردگار بێو بە مرادتان بگەیەنێو بە بەهەشت شادمانتان بكا!

(وسیلە) پلەوپایەیەكی بەهەشتە، ئیمامی ئەحمەدو موسلیم لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە دەڵێ: من لە پیغەمبەرم بیست دەیفەرموو «إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ: ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ» كەوابوو: وەسیلە بەرزترینو خۆشترین شوێنو پلەو پایەو مەقامە لە بەهەشتدا ئەویش پلەو پایەی پیغەمبەرو شوێنو جێگایەتی لە بەهەشتداو نزیكترین شوێنە لە عەرشی كردگار!

هەركەسێك لە خودا بپاڕێتەوە كە ئەو شوێنە بدرێ بە پیغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وَسلمَ) شەفاعەتی بۆ دەكا.

ئیمامی ئەحمەدو بوخاریو خاوەنی سوننەكان لە جابیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پیغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وَسلمَ) فەرمووی: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

شایانی باسە كە لە هاوەڵانی پیغەمبەرەوە نەبیستراوە هەروەها لە چینی دوای ئەوانیش نەبیستراوە. كە وەسیلە بۆلای خودا شتێك بێ كە یەزدان بۆ ئادەمیزادانی بەرەوا دانەنابێ، هەروەكوو چۆن لە زانایانی سەلەفیش ئەم ڕاو بۆچوونە نەبیستراوە.

بەڵام بە داخەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستو بەم لاوە دیاردەیەك پەیدا بوو ئەویش واسیتە کردن بۆ لای خودا، دەستنیشان کردنی پیغەمبەرانو پیاوچاکان بۆ واسیتە پێ کردن لای خودا سوێند خواردن پێیان، داوای جێبەجێ کردنی مرادو ئیشو کار ئەنجامدان لێیان، داوای هێنانی خێرو بەرەکەت لێیان، لابردنی بەڵاو بەرگری کردن لە زەرەرو زیان، هاوارکردن لێیان ئەم دیاردانە وا بڵاوبوونەوە بە جۆرێك کە هاوار دەکەنە گۆڕەپانیانو داوای جێبەجێ کردنی ئیشو کاریان لێ دەکەن جاری وا هەیە لەتەك خودا هاواریان دەکەنێو جاری واش هەیە هاوارەکە هەر ئاراستەی ئەوان دەکەنو بەس! هاوار لێ کردنو پاڕانەوە جۆرێکە لە عیبادەت قورئانیش دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ – الشعراء/٢١٣﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا – الجن/١٨﴾ تەوەسولو واسیتە کردن بە پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەتوانین دوو مانا، دوو مەبەستی لێ دەربێنین، هەردووکیان لای زانایانی ئیسلام پەسەندن، مەبەستێکی تریشی لێ دەردێنرێ بەڵام سونەتی پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پشتگیری ناکا.

یەکێك لەو دوو مانایە ئەوەیە: کە مەبەست بە وەسیلە بناغەی ئیمانو ئیسلام بێ! واتە: تەوەسول بە پیغەمبەر بریتی بێ لە خۆ نزیك کردنەوە لە خودا بەهۆی بڕوا بە پیغەمبەرو پابەندبوون بە فەرمانەکانی.

مانای دووەم: ئەوەیە وەسیلە بریتی بێ لە نزاو پاڕانەوەی پیغەمبەرو شەفاعەتکردنی بۆ ئومەتی: ئەم دوو مانایە هەردووکیان دروستنو زانایانی ئیسلام پەسەندیان دەکەن، هەر لەم رووەوە ئیمامی عومەر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لە ساڵێکی بێ بارانیدا وتی (اللهم انا كنا إذا جدبنا توسلنا إليك بنبينا فسقينا وأنا نتوسل إليك بعم نبينا فاسقنا!) واتە: خودایە! ئێمە لەوە پێش کە پێویستیمان بە باران دەبوو بە پاڕانەوەو دۆعاو نزای پیغەمبەر پەنامان بۆ دەهێنایو ئەتۆیش بارانت بۆ دەباراندین! ئێستا کە پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ژیاندا نەماوە هانات بۆ دێنین بە پاڕانەوەو دۆعاو نزای عەبباس: کە مامی پیغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بارانمان بۆ بباریێنە!! دەی ئەگەر تەوەسول بە خودی پیغەمبەر بکرایە، دەبوایە دوای لە دونیا دەرچوونیشی هەر تەوەسولیان بۆ ئەو بکردایە! لەمەوە

ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئەو شتەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ژیاندا پێی کراوە دوای لە دونیا دەرچوونی بۆی دەستەبەر نابێ! کەوابوو: وشەی تەوەسول سێ مانای هەیە!

ا- تەوەسول بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەوە بڕوای پێ بکەی، بە پێغەمبەری بزانی، ئەمە پێویستەو بەبێ ئەم جۆرە باوەڕە ئیمان تەواو نابێ.

ب- تەوەسول بە دۆعاو پاڕانەوەو شەفاعەتکردنی بۆ ئوممەتی، ئەمەشیان کاتێ دەستەبەر دەبێ کە تەشریفی لە ژیاندا بێ جا چ لە ژیانی دونیا، یان لە کاتی شەفاعەتکردنی رۆژی قیامەتدا.

ج- تەوەسول بەو مانایە سوێندی پێ بخورێ، واتە: بگوترێ خودایە! بۆ خاتری پێغەمبەر ئەوەم بۆ بکە: ئەم جۆرە تەوەسولە هاوەڵانی پێغەمبەر نەیان کردووەو بەلایانەوە پەسەن نەبووە، نە لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەرداو، نە لە دوای لە دونیا دەرچوونی، هەرگیز لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نزایەك بەم مانایە نەبیستراوە، کەوابوو: بە هیچ جۆرێك نابێ بگوترێ: خودایە بۆ خاتری گەیلانی یان مەولانا خالیدی نەقشبەندی یان کاك ئەحمەدی شێخ ئەو کارەم بۆ جێبەجێ بکە! ئەم جۆرە پاڕانەوە شەرعی نیەو ئیسلام پەسەندی ناکا هەروەکوو چۆن سوێند خواردن بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یان بە گۆڕو ئارامگای، یان گۆڕو ئارامگای پێغەمبەرانی ترو پیاوچاکان، لە ئیسلامدا نیەو حەرامە، ئەم جۆرە تەوەسولەش حەرامە!

سوێند خواردن تەنیا بە زاتو صیفاتی خودا دەخورێ، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: «مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللّٰهِ فَقَدْ أَشْرَكَ» تیرمیذیو هی تریش ئەم فەرموودەیان بە پەسەند داناوە! لە ریوایەتێکی تردا هاتووە (فقد کفر) لە صەحیحەیندا هاتووە دەفەرموێ: «مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللّٰهِ» هەروەها دەفەرموێ: «لاَتَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ فِإنَّ اللّٰهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ».

زانایانی ئیسلام هەموویان کۆکن لەسەر ئەوە کەسێك سوێن بخوا بە دروستکراوێکی رێزدار، یان بە شتێك کە پێی وایە: رێزدارە وەکوو عەرشو کورسیو قەڵەمو کەعبەو مسجیدلحرامو مسجیدلئەقصاو مزگەوتی مەدینەو

فریشتەو پیاو چاكو شمشێری موجاهیدانو خوێنی شەهیدان، گۆڕی پیاوچاكان ئارامگای پیغەمبەران... هتد. سوێندەكەی دانابەسترێو كەفارەتی لەسەر نیە، سوێند خواردن بە مەخلوقات بەلای جەماوەری زانایانەوە حەرامە، لە مەزهەبی حەنەفیو لە رایەكی شافعیشو ئەحمەدیشدا هەروایە، كۆرایی (اجماع)ی هاوەڵانی پیغەمبەریش لەسەر ئەوە باس كراوە! تەنانەت عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) فەرموویەتی: ئەگەر بە درۆ سوێند بە خودا بخۆم بەلامەوە باشترە لەوەی كە بە راستی سوێن بە جگە لە خودا بخۆم! چونكە سوێن خواردن بە غەیری خودا شیركە، ئاشكراشە شەریك دانان بۆ خودا تاوانی گەورەترە لەدرۆ!!

حەدیثی كابرای كوێرە كە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فێری كرد، بلێ «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِي اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ» كە هەندێ لە زانایان دەیكەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە دروستە بگوترێ: خودایە! بۆخاتری پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فلان كارم بۆ جێبەجێ بكە – نابێتە بەلگە بۆیان، بەڵكوو ئاشكرایە لەوەدا كە (تەوەسول) بە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) تەوەسول كردنە بە نزاو پاڕانەوەی!

واتە: داوای لە پیغەمبەر كرد نزاكەی بۆ بكا، تەنانەت پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ كرد كە بلێ (اللهم شفعه فيّ) هەر لەبەر ئەوەش كە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) بۆی پاڕایەوە خودا چاوەكانی پێ بەخشییەوە، واتە: ئەوە وەكوو موعجیزەیەك وابوو بۆ پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) ئەگەر كوێری تر پاش لە دونیا دەرچوونی تەوەسول بە پیغەمبەر بكەن، ئەوانەی كە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) پێی نەگوتوون بمكەنە تكاكار، ئەوە تكاكەیان هیچی لێ شین نابێ!!

﴿وَجَاهِدُواْ فِي سَبِيلِهِ﴾ لە رێگای خودادا جیهاد بكەن، تێبكۆشن بەرگری لە ئایین بكەن، خەڵك هەڵبنێن بۆ خوداپەرستی، جیهاد لەگەڵ نەفسی خۆتاندا بكەن، مەهێڵن سەركەشانە پەل بهاوێ، رای بێنن لەسەر ویژدانو دادپەروەریو لە هەموو شوێنو كاتێكدا چاودێری بكەن، جیهاد بكەن لەگەڵ دوژمنی منو خۆتاندا، خۆتان

ماندوو بکەن لە جەنگان لەگەڵیانداو مەهێڵن ببنە کۆسپ لەبەردەم بانگەوازی ئیسلامیدا ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکوو رزگارتان بێو بە مراد بگەن، کامەرانی دونیاو قیامەت بەدەست بێنن، لە دونیادا ژیانی بەختەوەریی بەسەر بەرن، لە قیامەتیشا بە بەهەشتی بەرین شاد ببن!

موسوڵمان هەمیشە پێویستە لە جیهادو کۆششدا بێ، بە هەموو جۆرێك هەوڵ بدا کرداری چاك بکاو واز لە خراپەکاری بێنێ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا جیهاد کردنە لەگەڵ نەفس.

ئەمجار پەروەردگار جەختی لەسەر مانای پێشوو کردەوەو ئەوەی دووپات کردەوە؛ بە مراد گەیشتنو سەرفرازیو سەرکەوتن بە هۆی تەقوای خوداوە دەبێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُواْ بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بێگومان ئەوانەی ئینکاری خودایەتی خودا دەکەن، جگە لەخودا شتی تر دەپەرستن؛ وەکوو گوێرەکەو بتو لەسەر ئەو حاڵەتە گومڕاییە دەمرن ئەگەر هەرچی لەسەر زەوی هەیە ملکی ئەوان بێو ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێو بیانەوێ بیکەن بە سوپەرو خۆیانی پێ لە سزای رۆژی قیامەت رزگار بکەنو خۆیانی پێ بکڕنەوە، ئەوە لێیان وەرناگیرێو لێیان قبووڵ ناکرێ، بەڵکوو خودا سزای بە ئێشیان دەداو تۆڵەی دادپەروەرانەیان لێ دەستێنێ، چونکە سوننەتی خودا وا رەها بووە: کە هۆکاری رزگاریو سەرفرازیو بە مراد گەیشتن لە خودی ئادەمیزادەکە خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ، وەکوو دەڵێن: (کەس بە مەڵەی باوکی ناپەڕێتەوە!) سەرفرازیو خۆشبەختی بەهۆی فەرمانبەرداریو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوداوە دەستەبەر دەبن، دەبێ خودی ئادەمیزادەکە بۆ خۆی باش بێو لە ناخەوە خوداپەرست بێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا – الشمس/٩ – ١٠﴾ ئەمە سنووری نێوان ئیسلامو ئایینەکانی ترە، مەسیحی پێیان وایە رزگاریو سەرفرازیو خۆشبەختیان بە هۆی قوربانی بوونی حەزرەتی عیساوە دەبێ، پێیان وایە: چی تاوان بکەن، عیسا خۆیان بۆ دەکا بە قوربانی رزگاریان دەکا، جوولەکە پێیان وایە: ئەوان خۆشەویستی خوداو منداڵی خودان، دەڵێن: ئێمە گەلو نەتەوەی

هەڵبژاردەی خوداین! چی بکەین خودا سزامان نادا، ئەگەر سزاشمان بدا چەن رۆژێك دەبێ‌و بەس!

بەڵام موسوڵمانان بڕوایان وایە: کە سەرچاوەی رزگار بوونیان بەهۆی پاك کردنەوەی نەفس دەبێ، هەموو کەس بە گوێرەی کردەوەی خۆی پاداش‌و سزا وەردەگرێتەوەو کەس کۆڵی کەس هەڵناگرێ ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى – المائدة/١٦٤﴾ ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى – النجم/٣٩﴾.

ئەمجار باسی ئەو سزاو ناخۆشیانە دەکا: کە لە رۆژی قیامەتا تووشی کافرەکان دەبێ دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ النَّارِ﴾ ئاواتەخوازی ئەوەن کە لە دۆزەخ دەربچن‌و رزگاریان ببێ بەڵام ﴿وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنْهَا﴾ ئەوانە دەرناچن، بۆیان ناکرێ لە ناو دۆزەخ دەربچن، ئاواتەخوازی‌و هاوارو هەوڵدانیان بۆ دەرچوون لە ناو ئاگر بێ سوودەو هەر تێیدا دەمێننەوە ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ ئەوانە لە وێدا سزای بەردەوام‌و نەبڕاوەیان هەیە، نە لەسەریان لادەچێ نە ئەوانیش لێی دەردەچن، بۆ هەتا هەتایە دۆزەخ ماڵ‌و شوێنی حەوانەوەی ئەوانە.

بوخاری‌و موسلیم‌و نەسائی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسلم) فەرمووی: «وَيُؤْتَى بِالرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَيَقُولُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ! كَيْفَ وَجَدْتَ مَنْزِلَكَ؟ فَيَقُولُ شَرُّ مَنْزِلٍ. فَيَقُولُ: هَلْ تَفْتَدِي الأَرْضِ ذَهَباً؟ فَيَقُولُ نَعَمْ يا رب. فَيَقُولُ الله تعالى: كَذَبْتَ قَدْ سَأَلْتُكَ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ وَأَيْسَرَ فَلَمْ تَفْعَلْ فَيُرَدُّ إِلَى النَّارِ».

## سزای دزیکردن

﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ

﴿٣٩ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٤٠﴾.

ئـەمجار دوابـەدوای بـەیان کردنـی حـوکمی ئـاژاوەگێڕو پیـاوکوژو ڕێگـرو جەردە، دێتـە سـەر بـەیانکردنی حوکمی دز.. موناسـەبەو گونجاوی باسـی دزی بـە باسـەکەی پێـشەوە ئەوەیـە: (محاربـة) چـەتەیی‌و ڕێگـری‌و ئاشـوب گێـڕی – وەکـوو حەنەفییەکان دەڵێن: دزی کردنی گـەورە (السرقه الکبری)یـە، دزی ڕواڵـەتیش دزی بـچوکە، جـا کـە حـوکمی (محـاربین) ئـاژاوەگێڕو چـەتەو ڕێگرانـی بـەیان کـردوو فـەرمانی بـە ئـادەمیزادان کـرد: کـە تـەقوای خـودا بکـەن، لـە تـاوان کـردن‌و حـەرام خۆری دووره پەرێزبن؛ ئەمجار دێتە سەر باسی سزای (دز) ئەوانەی بە نهێنـی مـاڵ دەدزن! ئاشکراشـە بەشـێك لـە سـزای (محـاربین) بڕینـی دەسـت‌و قاچـە بـە راسـت‌و چەپ، جا وەکوو لە راڤەکردنی ئایەتەکانی (١٠٥ – ١٠٦ – ١٠٧) ی سورەتی (النساء)دا باسمان کرد، طوعمەی کوڕی ئوبەیریق زرێی قەتادەی دزی بوو، بردبـووی لـە مـاڵی زەیدی کوڕی سەمینی جوولەکە حەشاری دابوو، دوایی پێی زاندرا، پیغەمبەر (صلَّی اللّهُ عَلیهِ وَسلَمَ) ویستی بـەرگری لـە طوعمـە بکـا، چونکە زرێکـە لـە مـاڵی زەیـددا دۆزرابووەوە؛ ئیتر ئایەتی ﴿وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ – النسـاء/١٠٧﴾ هاتە خوار، بۆ دیاری کردنی حوکمی دزیش ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ﴾ پیـاوی دزو ئـافرەتی دز حوکمەکـەیان ئەوەیـە کـە بۆتـان دەخوێندرێتەوە، سزای تاوانەکانیانتان بۆ دیاری دەکـەین، وەکـوو چـۆن لـەوە پـێش حوکمی ئاژاوەگێڕو جـەردەو ڕێگرمـان بـەیان کـرد. ئەمـەش حوکمەکەیانـە، پیـاوو ئافرەت ئەگەر دزیان کردوو دزییەکەیان لەسەر چەسپا ﴿فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا﴾ دەستیان ببڕن، وەکوو چۆن دەسـتی ئـاژاوەگێڕو چـەتەو ڕێگـر دەبـڕن! بـەپێی حـوکمی ئـەم

ئایەتە هەرکەسێ - پیاو بێ یان ئافرەت — دزی بکاو لەسەری بچەسپێ مەرجی دزیەتی تێدا بێتە جێ، دەستی راستی لە جوموزگەوە دەبڕدرێ، ئەگەر دزییەکەی دووبارە کردەوە قاچی چەپی دەبڕدرێ، لە قاپەڕەقەیەوە! ئەمجار دەستی چەپی، ئەمجار قاچی راستی، ئەگەر هەر وازی لە دزی نەهێناو تەمێ نەبوو بەند دەکرێ! دارەقوطنی فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە دەڵێ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: «إِذَا سَرَقَ السَّارِقُ فَاقْطَعُوا يَدَهُ، ثم إِذَا عَادَ فَاقْطَعُوا رِجْلَهُ اليسرى» بۆ بڕینی دەستی دز چەند مەرجێك هەیە دەبێ بێنەجێ، ئەمجار حوکمەکە جێبەجێ دەکرێ:

١- دەبێ دزەکە باڵغو هۆشمەند بێ.

٢- نابێ دزییەکە شكو شوبهەی تێدا بێ، وەکوو ئەوە ماڵ لە کەسێك بدزێ گومانی لێ بکرێ کە بەشی پێومیە، وەکوو دزی کردن لە باوكو دایكو برا...هتد.

٣- دەبێ ماڵە دزراوەکە بگاتە حەدی ئەوەی پێی بگوترێ: ماڵو نیصابی شەرعی بێ.

زانایانی شەرع سێ رایان هەیە دەربارەی نیصابی ماڵی دزراو: حەسەنی بەصریو داوودی ظاهیری دەڵێن: ماڵەکە کەم بێ یان زۆر بێ دەستی دەبڕدرێ لەبەر ظاهیری ئایەتەکەو ئەو حەدیثەی کە موسلیمو بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە؛ کە دەفەرموێ: «لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ».

جەماوەری زانایانی شەرع دەفەرمون: دەبێ ماڵە دزراوەکە نرخی بگاتە چارەکە دیناری زێڕ = چارەکە دیناری ئاڵتوون، یان سێ دیرهەمی زیوو زیاتر چونکە فەرموودەیەك هەیە: ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو خاوەنی سوننەکان (أصحاب السنن) لە خاتو عائیشەوە گێڕاویانەتەوە، دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– يَقْطَعُ الْيَدَ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا» هەروەها چونکە لە صەحیحەیندا فەرموودەیەك لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە، دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستی کابرایەکی بڕی چونکە مەتاڵێکی دزی بوو نرخەکەی سێ دیرهەمی زیو بوو.

ئەبو حەنیفە دەڵێ ئەندازەی ماڵی دزراو دینارێکی زێڕ یان (دە) دیرهەمی زیوە، لەوە کەمتر دەستی تێدا نابڕدرێ، ئەمەیش بە پێی فەرموودەیەك کە ئیمامی ئەحمەد لە ئیبنو عومەرەوە گێڕاویەتەوە: کە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: «لاَ قَطْعَ فِيمَا دُونَ عَشْرَةِ دَرَاهِمَ» بەڵام پسپۆڕانو زانایانی فەرموودە دەڵێن: ئەم حەدیثە لاوازە. نازانین ئەبو حەنیفە چۆن لای چەسپاوە؟؟

دزی بە دان پیانان دەچەسپێ، یان بە دوو شایەد، تۆڵەی دەست بڕین بەیەکێ لە مانە لە کۆڵ دەکەوێ: بە لێخۆشبوون، یان تۆبە کردنو پەشیمان بوونەوە پێش ئەوەی کارەکەی بگاتە لای فەرمانڕەوا ئەگەر ماڵە دزراوەکە کرا بە ماڵی کابرای دز پێی بەخشی، یان بە هۆی تر بوو بە ماڵی، بەلای ئەبو حەنیفەو موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانیەوە کارەکەی بەرزیش کرابێتەوە بۆلای حاکم، هەر حەددی تۆڵەی لەسەر لادەچێ، بەلای جەماوەری شەرع زانیشەوە ئەگەر پێش بەرزکردنەوەی کارەکەی بۆلای حاکم، دزراوەکە بوو بە ماڵی، ئەوە تۆڵەکەی لەسەر لادەچێ ئەگینا، نا.. ئەمجار پەروەردگار پاساوی حوکمی تۆڵەی دز دەداتەوەو بایبسی بۆ دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿جَزَاء بِمَا كَسَبَا﴾ بڕینی دەستی پیاوو ئافرەتی دز، تۆڵەو سزای کردەوەکەیانە، چونکە دەستدرێژیان کردۆتە سەر ماڵی خەڵك، ﴿نَكَالاً مِّنَ اللّهِ﴾ ریسوا کردنو پەند پێدانو تەمبێ کردنە لە خوداوە بۆیان، بۆ ئەوەی جارێکی تر هەوڵ نەدەن ئەو تاوانە دووبارە بکەنەوە؛ هەروەها پەندو ئامۆژگارییە بۆ خەڵکی تریش کە خۆ لەو تاوانە بپارێزن، تۆڵەی دەستبڕین هەرچەندە دیاردەیەکی سامناکەو بێزراوە بەڵام لە راستیدا تۆڵەیەکی گونجاوو بن بڕکەرە، هەر ئەو تۆڵەیەیە دەتوانێ دیاردەی دزی قەڵاچۆ بکا، هەر ئەو تۆڵەیەیە ئارامی دەخاتە دڵی دانیشتوانەوە، دڵنیایان دەکا: لە ماڵو سامانیان، کەسیش نیە تەواو هەست بەخەتەرو کاریگەری دزی بکا، مەگەر کەسێك دز چوبێتە سەری تووشی ئەو دەست درێژی کردنە بووبێ، کەسێك کارەساتی دزی لێ کردنی تووش هاتبێ جگە لەوەی زەرەمەندو ماڵ تالآن کراو بووە، تووشی نەخۆشی دەروونیو نائومێدیو دوژمنایەتیو دڵە راوکێ دەبێ، ئاواتەخوازە دزەکە بدۆزێتەوەو پەلاماری بدا، تۆڵەی لێ بکاتەوە، ئەو گەڕەکەی دزی تێدا روو دەدا دانیشتوانی

تووشی ترس و بیم و دڵەڕاوکێ و خەو لێ زڕین دەبن، زەلامێکی تێدا نامێنێ شەوانە تێر بخەوێ، کە دز هەڵدەکوتێتە سەر ماڵێك بە شەو بێ یان بە ڕۆژ بێ دانیشتوان دەخاتە ترس و لەرزەوە، جاری وا دەبێ تووشی تەقەو پەلاماردان و بریندار بوون و کوشتار دەبن، ئەوەش ئەوپەڕی زیان و زەرەری تێدایە بۆ کۆمەڵگاو ئاکامەکەی خەتەرناکەو چەند جار وا ڕێ کەوتووە ئافرەت و منداڵ لە کاتی دز چوونە سەردا شێت و هار بوون ئەعصابیان تێك چووە ، تەنانەت هەندێ کەس پێیان وایە: کە کوشتن بە ئەندازەی دیاردەی دزی سامناك نیە، چونکە ڕووداوی کوشتن گەرچی ڕووداوێکی تاکە کەسییە بەڵام کاردانەوەی بە زۆری لە بنەماڵەی بکوژو کوژراودا هەر دەمێنێ، بەڵام دیاردەی دزی کاریگەری لەسەر کۆمەڵ هەیە، هەر کەسێك شتێك لە ماڵ و دوکانی خۆی شك بەرێ ترسی دز دەیگرێتەوەو تینی سوتمانی ئەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتیەی پێ دەگا!!

ئەمجار یەزدان جەخت لەسەر جێبەجێ کردنی حوکمی دز دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ پەروەردگار بە تواناو باڵا دەستە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی، چۆنی بوێ ئاوا یاسا دەردەکا، بە هێزو توانایە بۆ تۆڵە سەندنەوە لەوانەی تاوانی دزی ئەنجام دەدەن، دانایە لەیاسا داناندا، شەرع و یاسایەك دانانێ کە بەرژەوەندی گەل و وڵاتی تێدا نەبێ، تۆڵەو سزا وادادەنێ کە گونجاو بنبڕکەر بێ بۆ تاوان، ڕەگ و ڕیشەی تاوانکاران لە بێخ دەربێنێ و لە تاوان کردن بینانگێڕێتەوە، واتە: بەم جەخت کردنە ئەوە بە موسوڵمانان دەفەرموێ: کە بەرامبەر دز نەرم و نیانی نەنوێنن، سوور بن لەسەر جێبەجێ کردنی حەددی شەرعی بەسەریانداو هیچ بەزەییان پێیاندا نەیەتەوە، خێرو بەرژەوەندی کۆمەڵگای ئادەمیزاد لەوەدایە، جا دڵ ڕەش و کورت بین و خوانەناسان ڕەخنەی خۆیان بگرن ئێوە گوێ بە فیتنەی ئەوان مەدەن!

ئەمجار حوکمی ئەوانە دیاری دەکا: کە لە تاوانەکەیان تۆبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوەو ڕەوشت و حاڵی خۆیان باش دەکەن و هەڵوێستیان دەگۆڕن، دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَابَ مِن بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ﴾ جا کەسێك دوای ئەنجامدانی تاوانی دزی پەشیمان بووەوەو تۆبەی کردو ماڵە دزراوەکە، یان نرخەکەی گێڕایەوە بۆ

خاوەنەکەی، هەڵوێستی خۆی گۆڕیو ڕەوشتی خۆی پاك کردەوەو بە خۆیدا چووەوە، بڕیاریدا جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو تاوانە ئەوە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خودا تۆبەکەی لێ وەردەگریو لێی خۆش دەبێ، چونکە پەروەردگار لێخۆش بوونی زۆرەو بەرەحمو بەزەییە.

ئەمجار ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە حەددو تۆڵەی دزی پڕاوپڕ حیکمەتو دادپەروەریو ڕەحمەتەو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ بۆتۆ نازانی ئەی پێغەمبەر؟ یان ئەی ئەو کەسەی بانگەوازی ئیسلام بڵاو دەکەیتەوە! بۆ تۆ نازانی: کە خودا خاوەنی هەرچی لە ئاسمانو زەویدایە؟ هەمووی موڵکی ئەوەو بە ویستو حیکمەتی خۆی هەڵیان دەسوڕێنێ، بەو پەڕی عەدالەتکاریو ڕەحمو بەزەیی کاروباریان تێدا ئەنجام دەدا، کەس نیە بتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێو ببێتە لەمپەڕ لەبەردەم ویستو ئیرادەیدا، شتێك ناکا حیکمەتو عەدالەتی تێدا نەبێ، پەروەردگار ئەم یاساو شەریعەتەی داناوە بۆ ئەوەی ئەمنو ئاسایش بۆ تاكو کۆمەڵ دەستەبەر بێ، دڵنیا بن لە گیانو ماڵو سامانیان، ڕۆژانە ڕوو بکەنە شوێنی کاری بازرگانییان، دڵنیا بن لە ماڵو منداڵو کەرەستەو سەرمایەیان!

ئەمە حیکمەتو دانایی خودایە کە تۆڵەی داناوە: بۆ (محاربین) ئاژاوەگێڕو چەتەو ڕێگرو دزو جەردە، ئەوانەی بەرژەوەندی هاوڵاتییان دەخەنە خەتەرەوە، سەرفرازیو سەربەستی ئادەمیزاد پێشێل دەکەن، هەر بەپێی ئەو حیکمەتو داناییە لێ بووردنی خۆی تەرخان کردووە بۆ ئەوانەی تۆبە دەکەنو پەشیمان دەبنەوەو دەست لە تاوانەکانیان هەڵدەگرنو هەڵوێستی خۆیان دەگۆڕن، چونکە مەبەست لە حەددی شەرعی خودی سزادانەکە نیە: بەڵکوو مەبەست دەستەبەرکردنی ئەمنو ئاسایشو بڵاوکردنەوەی ئارامییە! هەموو کاروبارێك، هەموو دەسەڵاتو هێزو توانایەك بەدەست خودایە ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ﴾ هەرکەسێك شیاوی سزا بێ ئەگەر ویستی سزای دەداو کەس نیە بڵێ نابێ سزای بدەی، ئارەزوشی لێ بێ لێی خۆش دەبێ، کەس نیە بتوانێ بڵێ نابێ لێی خۆش بی!!

ئەوە بزانن خودا بە ئادەمیزاد لە خۆیان بۆ خۆیان بەبەزەیی ترە رەحمی بۆیان لە رەحمی دایك بۆ بێچووەکەی زیاترە، تۆڵەو سزای بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵە، لەڕاستیدا ناپەسەندە کەسێك هەبێ بەرگری لەو دەست رەشە تاوانبارانە بکا، چونکە ئەوانە ئەندامی فاسیدی کۆمەڵن، ئاژاوەگێڕو وێراکەرن، پێویستە هیچ بار سوکییان لەگەڵدا نەکرێ ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا بە تواناو خاوەن دەسەڵاتە، دەتوانێ سزای تاوانبارن بدا دەتوانێ لێیان خۆش بێ.

## پەلەو هەڵپەکردنی دووڕوو جوولەکان بۆ کوفرو هەڵوێستی جوولەکە دەربارەی حوکمی تەورات

﴿۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّـٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّـٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَـٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ

أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْۚ لَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْأَخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔاۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٣﴾.

لەوەو پێش پەروەردگار برێ حوکمو ئەرکی شەرعی شیکردەوە، پیغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وَسلَمَ) بە ڕێكو پێكی ئەم حوکمو یاسایانەی گەیاند، برێ کەس لە دووڕووەکانو جوولەکەکان پشتیان لێ هەڵ کردنو بەو یاسایانە رازی نەبوون، یاسای کوفر ئامێزیان بەلاوە پەسەند بوو، ئیتر خودای مەزن دڵنەوایی پیغەمبەر دەکاو هەڵی دەنێ: کە خۆڕاگر بێو بەردەوام بێ لەسەر بانگەوازی کردنەکەی، بە پڕوپاگەندەی جوولەکەو دووڕووەکان دلگیر نەبێ، ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ﴾ بۆ ناردە خوارێ، دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە زۆر ریوایەت هەن: قورطوبی دەڵێ: راسترین ریوایەت ئەوەیە: کە دەربارەی رەجمی زیناکەری جوولەکە هاتبێتە خوارێ.. ئیمامی مالیكو ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو

تیرمیـذیو ئـەبو داوود لەبـەرِرای کـوڕی عازیبـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پیغەمبـەر (صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَمَ) بەلای کابرایەکی جوولەکەدا تێپەڕ بوو کە لەسەر زیناکردن جەڵدەیان لێدابوو، بە خـەڵووز روویـان رەش کردبـوو! پیغەمبـەر (صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَمَ) بانگی کردنو پێی فەرموون: (بۆچی ئێوە ئاوا لە تەوراتـدا حـەددی زیناکـەر دەبینـنو وادەزانـن حـوکمی زیناکـەر وایـە؟؟ وتیـان: بـەڵێ، ئـەمجا بـانگی یـەکێ لـە مالەکانیانی کردو پێی فەرموو بەو خودایەت سوێند دەدەم کە تـەوراتی بـۆ مووسـا ناردووە، ئایـا حـەددو سـزای زیناکـەر لـەکتێبی ئێوەدا کـە تەوراتـە بـەو شـێوەیە؟؟ مالەکە وتی: خودایە! تۆ ئاگاداری وانییـە! ئـەی محمـد! تـۆش ئەگـەر ئـاوا سـوێندت نەدامایە پێم نەدەگووتی: ئەمجار گوتی: حـەددی زیناکـەر لـەکتێبی ئێمـەدا رەجـم کردنـە، بـەلام چـونکە دیـاردەی زینـاکردن لـەناو بنەماڵـەو پیـاو ماقوڵەکانمانـدا بلاوبۆوە، ئەگەر رێزدارێکمان ئەو کارەی بکردایە وازمان لێ دەهێنـا، ئەگـەر ناکـەس بەچەیەك بیکردایە رەجممان دەکرد، دوایی وتمان: وەرن بـا لەسـەر یاسایەك پێـك بێین بەبێ جیاوازی بەسەر هەموو کەسدا بیسەپێنین، ئـیتر هـاتین جەلـدە لێـدانو روو رەش کردنمان لەباتی رەجم پەسەند کـرد، پیغەمبـەر (صَلّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَمَ) فەرمووی: خودایە! ئـەوە مـن یەکـەم کەسـم کـە فـەرمانی تـۆ لەمبارەیـەوە زینـدوو دەکەمەوە، کە ئەمانە مراندبوویانە! ئـیتر فـەرمانی داو کابرایـان رەجـم کـردو ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارێ کـە راسـتەوخۆ خیتـاب لەگـەڵ پیغەمبەردایـەو بـە (رسـول - رەوانەکراو) ناوی دەبا بۆ رێزلێنان لە پیغەمبـەرو فێرکردنـی موسـوڵمانان کـە بـەو ناوەوە بانگی بکەنو دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَـا الرَّسُـولُ) ئـەی رەوانـەکراو بـۆ سـەر گـشت ئـادەمیزاد! ﴿لاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْـرِ﴾ تـۆ خەفـەتبار ناکـا، واتـە: خـەم مەخۆ گوێ مەدە بەوانەی کە بێ بڕوان، بۆ کوفر شانیان دەخـورێو ئەڵقـە لـەگوێی کوفرنو ئامادەن هەنگاو بەهەنگاو پـەیڕەوی بەرنامەکـەی بکـەن، بـە دڵخۆشـییەوە بـەپیر بانگەوازەکەیـەوە دەچـن، هـەر هـەلیان بـۆ هەڵبکـەوێ کـوفری خۆیـان دەردەخەنو پـاڵ دەدەن بـە دوژمنـانی ئیسلامەوە، تـۆ خـودات لەپـشتەو لـە شـەڕو نیازی خراپی ئەوان دەتپارێزێو زاڵت دەکا بەسەر ئـەوانو یارمەتیدەرانیانـدا، ئـەو ناپاکانە ﴿مِنَ الَّذِينَ قَالُواْ آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ﴾ لەوانـەن کـە دووڕوون، بـەدەم دەڵێن: ئێمـە

بڕوامـان بـە پـەیامی ئیـسلام هەیـە، بـەڵام ﴿وَلَـمْ تُـؤْمِن قُلُـوبُهُمْ﴾ دڵیـان بـڕوای نەکردووە؛ ئەو ئیمانەی بە زوبان ئیدیعای دەکەن لەدڵیاندا نییـە، هـەروەها ﴿وَمِـنَ الَّـذِينَ هَـادُواْ﴾ ئەوانـەش کـە جوولەکـەن، هـەردوو تاقمەکـە دوژمنـی راسـتەقینەی ئیسلام‌و موسوڵمانا ئەوانـە ﴿سَمَّاعُونَ لِلْكَـذِبِ﴾ زۆر گوێ گـرن بـۆ درۆو دەلەسـەو بڕوایان بەو درۆیانە هەیـە: کـە مـاڵ‌و سـەرۆکەکانیان هـەڵیان دەبەسـتن دەربـارەی پیغەمبـەرو لـەبارەی ئـەحکامی ئـاییینی خۆیانـەوە، کـە بـەئارەزووی خۆیـان گۆڕانکارییان تێدا دەکەن.

راڤەکەران دەڵێن: (لام)ی (للكذب) (لام)ی تەقوییەیە واتە: زۆر بیـسەرن بـۆ درۆو پێـی بـڕوا دەکـەن، مەبەسـت بـە درۆکـە درۆی سـەرۆك‌و ماڵەکانیانـە: کـە دەربارەی ئایینەکەیان‌و دەربارەی پیغەمبەر بە ئارەزووی خۆیان درۆ هەڵدەبەستن. یان (لام)ی (تعلیل) بایستە واتە: زۆر گوێ دەگرن بـۆ قـسەی پیغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆئەوەی درۆی بەدەمەوە هەڵبەسـتن‌و گۆڕانکـاری لەقسەکانیدا بکـەن، ئەوانـە سیخوڕو جاسووسـی هـەواڵگرن لـەناو موسـوڵمانانـدا بۆئـەوەی سـات بەسـات قسەکان بگەیەننەوە بە ماڵ‌و سەرۆکەکانیان‌و دوژمنانی ئیسلام لە هەست‌و نەستی موسوڵمانان ئاگاداربن! بۆیە گوێ بـۆ قـسەکانی پیغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) دەگرن بۆئـەوەی بتـوانن درۆ بـەدەم پیغەمبـەرەوە هەڵبەسـتن‌و لێشیان وەربگـیرێ، چونکە کەسێك هیچ لە حاڵ‌و وەزعـی یـەکێکی تـر نـەزانێ ئەگـەر درۆی بەدەمـەوە هەڵبەستێ، بۆی سەرناچێ‌و ناتوانێ درۆکە وا ئاراسـتە بکا لێـی وەربگـیرێ، بـەڵکوو هەر لەگەڵ دەمی کـردەوە یەکـسەر پێـی دەزانـدرێ! بۆیـە ئێـستاش ئـەو رۆژهـەڵات ناسـانەو دوژمنـانی ئـاییینی ئیـسلام کـە دەیانـەوێ دژی ئیـسلام بـدوێن، درۆو بوختانیـان بەدەمـەوە هەڵبەسـتن، جـارێ لەپێـشدا کتێـب‌و نامیلکـەی ئیـسلامی دەخوێننـەوە، بۆئـەوەی درۆکانیـان لەسـەر هەنـدێ بناغـە هەڵبەسـتن‌و ئـەمجار بـە ئـارەزووی خۆیـان گۆڕانکاری تێـدا بکـەن‌و زیـادو کـەم لـە باسـەکەدا ئـەنجام بـدەن چونکە ئەگـەر شارەزاییەکیان لـە باسـەکەدا نـەبێ، نـاتوانن تـیری ژەهـراوی خۆیـان ئاراستە بکـەن ﴿سَمَّاعُونَ لِقَـوْمٍ آخَـرِينَ لَـمْ يَـأْتُوكَ﴾ قسە زۆر دەبیـستن لـەتۆ ئـەی پیغەمبەر! لەبەر خاتری کۆمەڵێکی ترو بۆئەوەی قسەکانت بۆ ئەوان بگێڕنەوە: کە

بەفرتو فێڵو پیلانن بۆ خۆیان، واتە: ئەو سەرۆكو پیلان گێرانە نایەنە كۆڕو مەجلیسی تۆوە جیا یان ناوێرن یان بێزیان نایە، بەڵام هەواڵگرو جاسووس لەخەڵكی تر دەنێرن، كە ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِن بَعْدِ مَوَاضِعِهِ﴾ گۆڕانكاری لە وشەو رستەكانی تەوراتدا دەكەن، دوای ئەوەی پەروەردگار هەموو ئەو وشەو رستانەی لەشوێنی خۆی داناوەو حەرامی بە حەرام دەستنیشان كردووەو حەڵاڵی لێ بە حەڵاڵ داناوە، كەچی ئەوان بە ئەنقەست دەستكارییان كردووەو گۆڕانكاری تێدا دەكەن، جا گۆڕانكارییەكەیان؛ یان گۆڕینی وشەكانە بەم جۆرە وشەیەك لە شوێنی وشەیەكی تر دابنێن، یان زیادو كەمی تێدا بكەن، یان وشەكە بۆ مانایەك كە مەبەست نییە دایبنێن، مانایەك بۆ دەقەكە دابنێن: كە نایگرێتەوە، ئەو فێڵبازانە ﴿يَقُولُونَ﴾ دەڵێن: بەوانەی كە دەیانێرن بۆلای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كە پرسیاری حوكمی زیناكەری موحصەنی لێ بكەن، پێیان دەڵێن: ﴿إِنْ أُوتِيتُمْ هَـٰذَا﴾ ئەگەر لەلایەن (محمد)ەوە فتواتان پێدرا بە جەلدە لێدانو روو رەشكردن لەباتی رەجم، ئەوە ﴿فَخُذُوهُ﴾ ئەوە وەری بگرنو پێی رازی بن، ﴿وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا﴾ ئەگەر ئەو فتوایەی بۆ نەدانو رەجم كردنی بۆ بڕیاردان، ئەوە بترسن لە قبووڵ كردنیو پێی رازی مەبنو رەتی بكەنەوە!

﴿وَمَن يُرِدِ اللَّـهُ فِتْنَتَهُ﴾ كەسێك ویستی خودا وابوو: كە تاقی بكاتەوە؛ تاقیكردنەوەكەش كوفرو گومڕاییەكەی دەرخست، وەكوو چۆن ئاگرو بۆتە غەلو غەشی ئاڵتوون دیاری دەكەن، ئەویش ئاوا كوفرو گومڕاییەكەی دەركەوت ﴿فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! هیچ دەسەڵاتێكت نییە بتوانی ئەو حاڵەی بگۆڕی لە گومڕاییەوە بیخەیە سەر حاڵی هیدایەت، وەكوو چۆن ناتوانیٚ مس بگۆڕیٚ بە ئاڵتوون، چونكە سوننەتی خودا دەربارەی كونهی ئینسانەكە نەگۆڕە، وەكوو چۆن كانەكانی زەویی نەگۆڕن.

ئەو دووڕوو جوولەكانە تاقیكردنەوەكانیان ئەندازەی كوفرو گومڕاییانی دەرخست، چونكە ئەوانە درۆو دەلەسە وەردەگرنو زوو پێی بڕوا دەكەن، ئەحكامی ئایینی خۆیان بەگوێرەی ویستو ئارەزووی خۆیان تاوتوێ دەكەن، كەوابێ ئەی پێغەمبەر! (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تۆ خەفەت لە ئیمان نەهێنانی ئەوان مەخۆ، لە

ئێستەش بەولاوە هومێدی ئەوەت نەبێ ئەوان موسوڵمان بن، تۆ بەس راگەیاندن و بانگەوازی کردنت لەسەرە، هیدایەت و خستنە سەر رێگەی راستیان بەدەستی خودایە ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ﴾ بێگومان ئەوانە ئەو کەسانەن کە فیتنەیی و ئاژاوەگێریان گەیشتۆتە ئەندازەیەك گومڕایی بووەتە سروشت و تێکەڵاوی خوێن و گۆشتیان بووە، بە جۆرێك کە ئیرادەی خودا پەیوەندی بەوەوە نەبەستووە کە پاکیان بکاتەوەو بیانخاتە سەر رێگای هیدایەت، چونکە کەسێك لەسەر بەتاڵ پەروەردە بوو، ئەوەندە رۆچوو لە گومڕاییدا، ئومێدی چاکەی لێ ناکرێ، رێگای ئەوەی نامێنێ کە نووری ئیمان بچێتە دڵیەوەو نەسیحەت و ئامۆژگاری کاری لێ بکا، دەی لێیان بگەڕێ با ئاکامی چارە رەشی خۆیان بنۆشن، ئەوانە ﴿لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ لە دونیادا بەشیان ریسواییە، بەوە کە نامەردی و درۆزنییان دەردەکەوێ، هەمیشە سەر شۆڕو چاو بەرەو ژێرن، ریسوایی دووڕووەکان لەم رووەوە کە درۆزنیەکەیان لای پیغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاشکرا بووەو ترسی کوشتن و تۆڵە لێ سەندنەوەیان هەیە، ریسوایی جوولەکەکانیش لەوەدایە: کە شاردنەوەی دەقەکەی تەوراتیان لێ ئاشکرا بووە دەربارەی حەددی زیناکەری موحصەن کە لەوێدا رەجم کردنە بەڵام ئەوان کردبوویانە جەلدەو رووڕەش کردن ﴿وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لە قیامەتیشا سزای گەورەو ترسناك و بە ئێشیان هەیە، کە ئاگری دۆزەخەو سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادو بت و صەنەمەکانیان ﴿سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ﴾ دەڵێن: ئەم ئایەتەش هەر دەربارەی جوولەکەکان هاتۆتە خوارێ، جا یان بۆ چەسپاندن و دووبارە بوونەوەی مانای ئایەتی پێشووە، یان وەکوو: دەگێڕنەوە دەڵێن: ماڵم و دادوەرەکانیان کە یەکێك بهاتایە لایان و داوایەکی بێ بناغەی بەرتیل بەڕەوانداینە داواکەی دەبیسراو هیچ گوێیان لە سکاڵای کابرای داوا لەسەر تۆمارکراو نەدەگرت، هەژارەکانیشیان پارەیان لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگرت: بۆئەوەی لەسەر بیرو باوەڕی جوولەکەیی بمێننەوەو لە دەوڵەمەندەکان درۆو دەلەسە ببیسن و پڕو پاگەندە بۆ جوولەکایەتی بکەن، ئیتر هەژارەکان ئەو پارە چڵکاو خۆریەیان لە دەوڵەمەندەکان وەردەگرت و گوێیان بۆ درۆو دەلەسەی دەوڵەمەندەکان رادەگرت و بڵاویان دەکردەوە بەهەرحاڵ

ئایەتەکە ئەوە جەخت دەکاتەوە کە ﴿سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ﴾ زۆر گوێیان بۆ درۆ رادەگرت‌و بڕوایان پێ دەکردو بلاویان دەکردەوە ﴿أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ﴾ زۆریان ماڵی حەرام دەخوارد کۆیان لە خواردنی هیچ حەرامێك نەدەکردەوە، بەرتیلیان وەردەگرت، پارەی گەوادی‌و ناموس فرۆشییان وەردەگرت، حەقی ئەسپ پەڕێنی‌و جوانەگا پەڕێنی‌و نێری پەڕێنیان وەردەگرت، بەهای عەرەق‌و گۆشتی مردارەوەبوویان دەخوارد لەهیچ کارێکی حەرام سڵیان نەدەکردەوە!

ئەمجار پەروەردگار پێغەمبەری خۆی سەرپشك دەکا لەوەدا کە حوکم‌و بڕیار بۆ جوولەکەکان دەربکا، یان رویان لێ وەرگێڕێ‌و دەفەرموێ: ﴿فَإِن جَآؤُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُم أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ ئەگەر جوولەکەکان هاتنە لات بۆ حوکم کردن لەناویاندا، تۆ بۆخۆت سەرپشك بە بڕیاریان بۆ بدەو حوکمیان بۆ دەرکە، یان پشتیان لێ هەڵ بکەو وەلامیان مەدەرەوە، بابچن لای ماڵم‌و سەرۆکەکانی خۆیان حوکم وەربگرن، شایانی باسە، کە ئەم سەرپشکییە بۆ ئەوانەیە: کە ئەهلی نیممەنین، ئەهلی نیممە ئەگەر حوکمیان هێنا بۆ لای موسوڵمانان پێویستە بڕیاری شەرعییان بۆ بدرێ، چونکە لەگەڵ عەقدی نیممەکەیان لەگەڵدا دەبەسترێ مەرجی عەقدەکە ئەوەیە؛ دەبێ لە تاوان‌و سەوداو مامەڵەدا پابەندی حوکمی ئیسلامی بن، جگە لە فرۆشتنی عەرەق‌و بەراز ئەوەیان لێ مەنع ناکرێ، هەرچەندە لە ئیسلامدا مامەڵەیان یاساغە، هەروەها زیناکەری موحصەن رەجم ناکرێ، بەلای ئەبوو حەنیفەو مالیکەوە، چونکە ئەو کەسەی حوکمی رەجمی بەسەردا دەدرێ دەبێ سێ مەرجی تێدابن موسوڵمان بێ، شافیعی‌و ئەحمەد دەڵێن: رەجم دەکرێن: بەلگەیان فەرمانکردنی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) بەرەجم کردنیی دوو جوولەکە زیناکەرەکەیە وەکوو لەمەوپێش باسکرا.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە پرسیارەکەش ئەوەیە: لەم ئایەتەدا پەروەردگار پێغەمبەری سەرپشك کرد لەوەدا حوکم‌و بڕیاریان بۆ دەربکا یان نەیکا! کەچی ئایەتی (٤٩)ی ئەم سورەتەدا کە لەوەدووا دێ، دەفەرموێ: ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللّهُ﴾ ئەوەتا: لەسەر پێغەمبەری پێویست کردووە کە حوکم‌و بڕیاریان بۆ بدا بەگوێرەی قورئان؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم ئایەتەی ئێرە کە پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وَسلَّمَ) تێیدا سەرپشکە، تایبەتە بە ئەوانە کە عەقدو پەیمانی ذیممەیان لەگەڵ بەسترابێ.

زۆربەی زۆری زانایانی موسوڵمان دەڵێن: ئەم ئایەتەی ئێرە بە ئایەتی داهاتوو سڕدراوەتەوەو، حوکمەکەی لابراوە، ئیبنو عەبباس‌و حەسەنی بەصری‌و موجاهیدو عەکرمەش هەروایان فەرمووە!

هەندێکی تر دەڵێن: حوکمی ئەم ئایەتە گشتییەو هی ئایەتی داهاتوو تایبەتە بە ئەوانە کە سەرانەیان لێ دەسێندرێ!

بەهەرحاڵ دژایەتی لەنێوان ئەم ئایەتەی ئێرەو ئایەتی (٤٩)دا نیە، لەهەموو کاتێکیشدا کە حوکمی ئیسلامییان بەسەردا بدرێ بۆ شتێکە کە حوکم‌و بڕیارەکە لە شەریعەتی خۆیاندا هەبێ وەکوو تۆڵەو حەددی زیناکەرو تۆڵەی دزی، هەروەها بۆ شتێکی کە پەیوەندی بە یاسای گشتییەوە هەبێ وەکوو سزای ئاژاوە گێڕو ئاشووب گێڕ لە وڵاتداو ئەو جۆرە شتانە، نەك بۆ شتێکە کە تایبەتە بە خۆیانەوەو لەناو خۆیاندا بەکاری دێنن! خواردنی گۆشتی بەرازو عەرەق خواردنەوەیان لێ مەنع ناکرێ، بۆ ئەم شتانە رێگەیان پێ دەدرێ ﴿وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئًا﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر ئەو لایەنەت هەڵبژارد کە حوکمیان بۆ نەدەی‌و بڕیاریان بۆ دەرنەکەی، ئەوە دڵنیابە کە ناتوانن هیچ زیانێکت پێ بگەیەنن‌و خودا لە پیلان‌و دەست درێژی ئەوان دەتپارێزێ!

﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ﴾ ئەگەر ئەوەت هەڵبژارد کە حوکم‌و بڕیاریان بۆ دەرکەی بڕیاری عادڵانەیان بۆ دەرکە، بەپێی قورئان حوکمیان بکە ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ بێگومان خودا دادپەروەرو رێڕەوانی شەریعەتی ئیسلامیی خۆش دەوێن ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ﴾ ئەوە چۆنە تۆ دەکەن بە دادپەروەرو بڕیار بەدەست لە روداوێکدا وەکوو رووداوی دوو زیناکەرە جوولەکەکە ﴿وَعِندَهُمُ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ﴾ خۆ لای خۆیان تەوراتیان لەبەر دەستدایەو شەریعەت‌و حوکمی خودا دەربارەی ئەو روداوە ئاشکراو نمایانە، ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ پاشان پشت هەڵ دەکەن‌و روو لە حوکمی تۆ وەردەگێڕن، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانن حوکمەکەی تۆش وەکوو بڕیارەکەی تەورات وایە، ﴿وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوانە

هەرگیز موسوڵمان نابن، یان ئەوانە بڕوایان بە تەورات نیە، کە کتێبی خۆیانەو لافی ئەوە لێ دەدەن کە گوایە پابەندینی.

ئایەتەکە شێواز (ئسلوب)ی تەعجوبی تێدایە، لەوەدا: کەتۆ دەکەن بە دادپەروەرو داوات لێ دەکەن: حوکمیان بکەی، وازیان لە حوکمی کتێبی خۆیان هێناوە هاتوونە لای تۆ کە بڕوایان پێت نیەو ئایینەکەت بە بەتاڵ دەزانن، کەچی پاش بڕیار دەرکردنەکەت ئەمجار لێت پاشگەز دەبنەوە چونکە حوکمەکەت بەگوێرەی هەواو ئارەزووی ئەوان نییە!!

## تەورات نامەی هیدایەتو نوورە، یاسای تۆڵەو سزای تێدایە، پێویست بوو مەسیحیەکانیش پابەندی بن

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ

وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

ئیمامی موسلیم لە بەڕڕای کوڕی عازیبەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) پیاوێکی جوولەکەو ژنێکی جوولەکەی لەسەر زیناکردن ڕەجم کردن، ئەمجار فەرمووی: «وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللّٰهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللّٰهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللّٰهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ». جا دەفەرموێ: ئەم ئایەتانە هەموویان دەربارەی کافرەکان هاتۆنە خوارێ! پەیوەندی ئەم ئایەتانە لەگەڵ ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەیە: پەروەردگار هەڕەشەی لەو جوولەکانە کرد کە روویان لەحوکمی تەورات: کە ڕەجم کردنی موحصەنە وەرگێڕاوەو داوایان لە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) کرد کە حوکمی سوکتریان بۆ دیاری بکا، باسی رێنمویەکانی تەورات دەکا بۆ بەنو ئیسرائیل کە چۆن ئەحکامی ئایینی بۆ روون کردوونەوە، لەم ئایەتەشدا ئەو جوولەکانە هۆشیار دەکاتەوە: کە ئینکاریان دەکردو دەیانگوت: حوکمی ڕەجم کردنی زیناکەر تۆڵە

سەندنەوە لە بکوژ لە تەوراتدا نیە، سەرزەنشتیان دەکا لەوەدا کە تەوراتیان گۆڕیوەو سەرپێچی فەرمانی زانا ئایینەکانی پێشوویانو پیغەمبەرانی خۆیان کردووەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ﴾ ئێمە تەوراتمان ناردە خوارێ بۆ سەر موسا رێنموییو شارەزایی کردنی تێدا بوو بۆ نەتەوەی ئیسرائیل، هەموو حوکمو ئەرکو پێویستییەکانی سەر شانیان تێدا روون کراوەتەوە یەکتاپەرستیو ئەرکی پیغەمبەرایەتیو چۆنیەتی رۆژی قیامەتی تێدا شی کراوەتەوە، تەوراتمان بۆ ناردنە خوارێ بۆ ئەوەی وەکوو شەریعەتو قانون ﴿يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُواْ﴾ بۆ ئەوەی ئەو پیغەمبەرانەی کە گەردنکەچی فەرمانی خودانو موسوڵمانن حوکمی پێ بکەن، ئەو پیغەمبەرانەی کە بە پاکو خاوێنی ئایینی خودایان بە گەلەکانیان گەیاند، بە دڵسۆزیو لێبڕانەوە تێکۆشان، راستاڵانە خودا پەرستیان کردووە، مەبەست ئەو پیغەمبەرانەیە: کە لە رۆژگاری حەزرەتی موساو دوای ئەو تا حەزرەتی عیسا رەوانە کراون/سەلامی خودا لە پیغەمبەری خۆمانو لەوانیش بێ.

ئیبنولئەنباری دەڵێ: ﴿الَّذِينَ أَسْلَمُواْ﴾ سیفەتی کاشیفەیە، بۆ بەیانی حاڵە، واتە: بە سروشت هەموو پیغەمبەرێ! موسوڵمانە، نەك صیفەتی ئاسایی، کە بۆ جیاکردنەوەی کەسێکە لە کەسێکی تر، کە لەم شوێنەدا مەفهومە مەخالیفەکەی ئاوای لێ دێ کە هەندێ پیغەمبەر موسوڵمان نین، چونکە ناگونجێ پیغەمبەر هەبن موسوڵمان نەبن؛

ئەمە رەتدانەوەی جوولەکەو مەسیحییەکانەو چەسپاندنی ئەوەیە: کە پیغەمبەران صیفەت دار نەکراون بۆ جوولەکەییو نەصرانیەت بەڵکوو صیفەتی موسوڵمانییان پێوە لکێنراوە.

کەوابوو: ئەوە ئامارەیە بۆ ئەوە کە سیفەتی موسوڵمانیەتی ئەوەندە گەورەو بەرێزە، کراوە بە سیفەتی تایبەتی پیغەمبەران کە رێزدارترین دروستکراوی پەروەردگارن، هەر وەکوو چۆن لە سورەتی (غافر)دا کە باسی هەڵگرانی عەرش دەکا سیفەتی بڕوا بە خودایان پاڵ دەدا بۆ ئەوەی دەری بخا کە

سیفەتی بڕوا بە خوا ئەوەندە بەرزو گەورەیە وەسفو سەنای ئەو فریشتانەشی پێ کراوە کە هەڵگری عەرشی کردگارن!

﴿لِلَّـذِينَ هَـادُواْ﴾ پیغەمبـەران حـوکم بـە تـەورات بکـەن بـۆ بەرژەوەنـدی جوولەکەکان، تەورات یاساو شەریعەتێکی تایبەتـە بـە نەتـەوەی ئیسرائیلو گشتی نیە بۆ هەموو کەسو گشت کاتو شوێنێك، داوودو سولەیمانو عیسا حوکمیان بە تـەورات کـردووە، ﴿وَالرَّبَّـانِيُّونَ وَالأَحْبَـارُ﴾ هـەروەها بـۆ ئـەوەی رەبـەنو پیـاو چاکەکانیان کە ئـەوەی هاروونن حوکمی پێ بکەن.. مەبەست بـە ﴿وَالرَّبَّـانِيُّونَ﴾ زاناو داناکانیانن کە زیرەكو لێزانن لە سیاسەتو بەڕێوەبردنی کاروباری خـەڵکیو پاراستنی بەرژەوەندییـەکانیان! مەبەسـتیش بـە ﴿الأَحْبَـارُ﴾ زانـاو خواپەرسـتو راستاڵەکانیانن! ئەوانەی حوکمیان بە تەورات کردووەو بە رێكو پێکی پـەیڕەویان کردووە، لەو کاتانەی پیغەمبەریان نەبووە بۆخۆیان حوکمیان بـە تـەورات کـردووە، ئەگەر پیغەمبەریشیان لە ناودا بووبێ بە ئیـزنو رەزای ئـەو حوکمیـان بـە تـەورات کردووە ﴿بِمَـا اسْـتُحْفِظُواْ مِـن كِتَـابِ اللّـهِ﴾ حوکمیـان بـە تـەورات کـردووە بـەهۆی ئەوەوە: کە زانیاری تەوراتیان پێ سپێردراوەو بە ئەمین دانراون لەسەریو داوایـان لێ کراوە: پارێزگاری بکەن.. پەروەردگار لەسەر زمانی موسا پـەیمانی لـە زاناکانیـان وەرگـرت کـە پارێزگـاری کتێبەکـەی کـە تەوراتـە بکـەن بـە دوو شـێوە؛ لـە سـنگی خۆیاندا هەڵی بگرنو بە زوبان توێژینەوەی تێدا بکەن، حوکمـەکانی پـەنا نـەدەنو نەیانفەوتێنن، کەمتەرخەمی لە لە شەریعەتەکانیدا نەکەن! ﴿وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء﴾ پێشینە صاڵحەکانیان پارێزگـاری تـەوراتیان دەکـردوو چاودێری ئەوانـە بـوون کـە دەستکاری تەوراتیان دەکردو رەخنەیان لێ دەگـرتن شـایەتیان دەدا کـە حوکمـەکانی حەقو راستن، وەکوو ئەوەی عەبـدوڵلای کـوڕی سـەلام کـە شـایەدی دا: کـە حـوکمی رەجـم لـە تەوراتـدا حـەقو راسـتە یـان شـایەدییان دەدا کـە ئـەوە شـەریعەتی پـەروەردگارە، نـەك وەکـوو ئـەوەی نـەوەکانیان دەیکـەن کـە بـڕێ لـە حوکمـەکانی دەشـارنەوە بـۆ مەبەسـتی هـەواو ئـارەزووی خۆیـان، یـان لـە ترسـی پیـاو مـاقوڵو رێزدارەکانیـان بـۆ ئـەوەی حـەددی رەجمیـان بەسـەردا نـەدەن! لـەوەش تـاوانتر شاردنەوەی باسو نیشانەی پیغەمبەرە لە گەلەکەیان.

ئـەمجار دوای ئـەوە کـە باسـی هـەڵس‌و کـەوتی زانـا پێشینە راستاڵەکانیانی کـردوو ئافـەرینی لێ کـردن، هـەروەها هەڵوێـستی نامەردانـەی زانـا دواییـنـەکانیانی ئاشـکرا کـرد، رووی خیتـاب دەکاتــە سـەرانی جوولەکـەو ماڵــەکانیان: ئەوانــەی هاوچەرخی هاتنەخوارەوەی قورئان بوون‌و کۆیان لە شاردنەوەو گـۆڕینی ئـەحکامی تەورات نەدەکرد، دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ﴾ واتە: کـە حـاڵ‌و رووداو ئەوە بێ کە باس کراو ئێوەش ددانی پێدا دەنـێن‌و ئینکاری ناکـەن، دەی لـە گـرۆی جوولەکەکان مەترسێن، لەبەرخاتری بنەماڵەو پیاو ماقوڵەکانیان حوکمی تـەورات مەشـارنەوە، بـۆ مەبەسـتی تایبـەتی خۆتـان‌و دەسـتکەوتی مـاددی لـەو خەڵکـە، گۆڕانکـاری لـە دەقەکانیـدا مەکـەن؛ تـەنیا لـە مـن بترسـێن: کـە پـەروەردگارو بەدیهێنـەرتانم، وەفا بـە عەهـدو بـەڵێنی خۆتـان بکـەن کـە بـە منتـان داوە، شـوێن هـەڵس‌و کـەوتی زانـا پێـشینەکانتان بکـەون پارێزگـاری تـەورات بکـەن‌و پابەنـدی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی بن؛ کە پێتان دەڵێ: شـوێن پیغەمبـەری ئیسلام بکـەون‌و ئیمانی پێ بێنن باش بزانن هەموو سوودو زیانێـك بەدەست منـە، جڵەوی هـەموو شتێك بەدەستی قودرەتی منـە ﴿وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ واز لـە شـیکردنەوەو گەیاندن‌و کارپێکردنی تەورات مەهێنن، حوکمـەکانی مەشـارنەوەو گۆڕانکـاری تێـدا مەکەن، بۆ بەدەست هێنانی دەستکەوتێکی دونیایی بێ بایەخ وەکوو بەرتیل‌و پلـەو پایـەو ئافـەرین کـردن لێتـان، لـە پاساوی گـۆڕین‌و ژێـر لێـو خـستنی حوکمـەکانی تەوراتـدا! ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ هەرکەسێك حـوکم‌و بڕیار لە شەریعەتی خودا وەرنەگرێ‌و بە پێی کتێبی نێـردراو لـە خـوداوە بـۆ سـەر پیغەمبـەر کـار نـەکا؛ وەکـوو ئـەوەی جوولەکـەکان دەیـان کـرد لـە جیـاتی رەجـم جەڵدەو روورەش کردنیـان دانـابوو، نیـشانەو رەوشـتی پیغەمبـەر، کـە لـە تـەورات دیاری کرا بوون، دەیان شاردەوە، لە برێ کوژراویاندا نیوە خوێنیان وەردەگـرت‌و لـە برێکیـشیاندا خـوێنی تـەواو، بـۆ هەنـدێکیش هـەر تۆڵـەیان نەدەسـتاند، ئەوانـە هەموویان کافرن، حەق‌و راستی دەشارنەوە، ستەمکارو مل هوڕو لە سـنووری خـودا دەرچوون، سووکایەتی بە کتێبی خودا دەکەن.

ئیبنو عەبباس (رَضِیَ اللهُ عنهُ) دەڵێ مەبەست بە (الکافرون، الظالمون، الفاسقون) خاوەن نامەکانن، ئەمە هەڕەشەیەکی توندو تیژە بۆ ئەو جوولەکانەی گۆڕانکارییان لە تەوراتدا کردووە دەربارەی زیناکەری موحصەنو تۆڵەستاندن لە بکوژی بەئەنقەست... ئەوانە کافرن نە بڕوایان بە موسا هەیەو نە بە (محمد)و قورئان!

ئیبنو جەریری طەبەری لە ئەبو صالحەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: ئەو سێ ئایەتەی کە لە سورەتی مائیدە دان بە ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ...﴾ دەست پێ دەکەن دەربارەی موسوڵمانان نین، تایبەتین بە کافرەکانەوە[1] ئیمام فەخری رازی قسەکەی رەت دەداتەوەو دەفەرموێ: ئەم قسەیە لاوازە چونکە (ئیعتیبار بە گشتییەتی وشەکەیە نەك بە تایبەتمەندی هۆی نازڵ بوونەکە).

ئەمجار رازی لە عەکرەمەوە رایەك دێنێ دەڵێ: ئایەتی ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ...﴾ کەسێك دەگرێتەوە بە دڵ ئینکاری حوکمی خودا بکا، بە زوبانیش دەری بڕێ، بەڵام کەسێك بە دڵ پێی وا بێ کە ئەوە حوکمی خودایەو شەریعەتی ئاسمانیە بە زوبانیش دانی پیابنێ وەڵێ بە کردەوە شتێك بکا دژی ئەو بڕوایەی بێ ئەوە ناچێتە چواچێوەی مانای ئەم ئایەتەوە؛؛ ئەمجار رازی دەڵێ ئەمە وڵامێکی راستە[1].

بە کورتی کەسێك بەرحوکمی ئەم ئایەتە دەکەوێو بە کافر حسێب دەکرێ: کە بەلایەوە رەوا بێ حوکم بە غەیری شەریعەتی خودا بکرێ، بە دڵ ئینکاری حوکمی خودا بکا، بە زووبانیش دژی بدوێ! بەڵام کەسێك بیروباوەڕی وا نەبێ وەڵێ حوکمیش بە شەریعەتی خودا نەکا، بە هەڵەکارو تاوانبار حسێب دەکرێ، سزا دەدرێ لەسەر ئەوەی کە حوکمی بە شەریعەتی خودا نەکردووە..

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داوود لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە کە دوو هۆزی جوولەکە (بەنو نەضیرو بەنو قورەیظە) لە پێش هاتنی ئیسلامدا شەڕیان

---

[1]- تفسیر الطبری ٦، ١٦٣

[1]- تفسیر الرازی ج١٢، ٦.

بووبـوو، بـەنو نـەضـیر زاڵ بـوو بـوون‌و بـەنو قـورەیظـەیـان شـکاند بـوو، دوایـی ڕێککەوتن لەسەر ئەوە خوێنی کوژراوانی بەنو نەضیر دوو چەندانەی خوێنی بـەنو قورەیظە بێ، کوشتنەوەی بکوژیان لابردوو حوکمی تـەورات کـە کوشـتنەوەی بکـوژ بـوو لـە غویـان کردبـوو، بـەم شـێوەیە ئـەم ڕێککەوتننامـەیان پـەیڕەو کـرد تـا پیغەمبـەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) کۆچی کـرد بـۆ مەدینـە، پـاش ماوەیـەك بـەنو قـورەیظـە پیاوێکیـان لـە بـەنو نـەضـیر کوشـت، ئـەوانیش داوای خـوێنی دوو چەندانەیان کرد، بەنو قـورەیظـە نەچوونە ژێـری، دوایـی ڕێککـەوتن کەبـچنە لای پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) ئەو حوکمەیان بۆ بدا، چەند کەسێکی دووڕوویان نارده لای پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) بۆ ئەوەی بزانن چۆن حوکم دەدا، ئـیتر ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارێ: بـۆ روون کردنـەوەی تۆڵەی بکـوژ دەفـەرموێ: ﴿وَكَتَبْنَـا عَلَـيْهِمْ فِيهَـا﴾ ئێمـە بـە پێویـستمان دانـاوەو لەسـەر جوولەکـەکانمان چەسـپاند لـە تەوراتدا: کـە تۆڵـە یەکسانییەو لـە تۆڵـەدا کـەس لـە کـەس زیـاتر نیـە ﴿أَنَّ الـنَّفْسَ بِـالنَّفْسِ﴾ ئـادەمیزادی بکـوژ لـە تۆڵـەی کـوژراودا دەکوژرێتـەوە ﴿وَالْعَـيْنَ بِـالْعَيْنِ﴾ کەسێك چاوی کەسێك کوێر بکا چاوی کوێر دەکرێتـەوە ﴿وَالأَنفَ بِالأَنفِ﴾ کەسێك لووتی کەسێك ببڕێ لووتی دەبڕدرێتەوە، ﴿وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ﴾ گوێچکە لەباتی گوێـچکە دەبڕدرێتـەوە ﴿وَالـسِّنَّ بِالـسِّنِّ﴾ ددان لـە جیـاتی ددان دەردەهێنـدرێ ﴿وَالْجُـرُوحَ قِصَاصٌ﴾ لە برینیشدا تۆڵـە دەسـتێندرێ، هـەوڵ دەدرێ بـە ئەنـدازەی ئـەو برینـدار بکرێتـەوە!! ئایەتەکـە بـە روونـی ئـەوە دەگەیـەنێ کـە تۆڵـە دەسـتێندرێتەوە لـەو شتانەی باسی کرد.

﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُ﴾ کەسـێك برینـدار کـرا یـان شـوێنی شـکا یـان زیـان بـەلوت‌و چـاوی گەیـەنراو تۆڵەسـتاندنەوەی کـابرای عـەفو کـرد، ئـەو عـەفو کردنەی دەبێتە کەفارەتی گوناهـەکانی ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنـزَلَ اللّـهُ فَأُوْلَـئِكَ هُـمُ الظَّالِمُونَ﴾.

ئیمامی ئەبو حەنیفە لەم ئایەتە ئەوەی وەرگرتـووە: کـە لـە جیـاتی ذیممـی موسـوڵمان دەکوژرێتـەوە، وەلێ جـەماوەری زانایـان دەڵـێن: ناکوژرێتـەوە، چـونکە

ئایەتەکـە شـەریعەتی ئومەتـەکانی پێـشووە، بـەلای شافیعیـشەوە شـەریعەتی پیغەمبـەرانی پێـشوو نابێتـە شـەریعەت بـۆ ئێمـە، هـەروەها چـونکە ئەحمـەدو تـیرمیـذیو ئیبنـو ماجـە لـە عەبـدوڵلای کـوڕی عـەمر فەرموودەیـەکیان ڕیوایـەت کردووە کە پیغەمبەر فەرموویەتی: «لایقتل مسلم بکافر».

مەبەست لە ڕستەی ﴿وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ﴾ وەرگرتنـەوەی حـەق بـە ئەنـدازەی کردەوەی دەستدرێژیکەر بەبێ زیادو کەم، چاوی ڕاست لـە جیاتی چاوی ڕاست کوێر دەکرێ: ئەگەر هەبوو بەڵام ئەگەر نـەبوو چاوی چەپ لـە جیاتی هـی ڕاست کوێر ناکرێتەوە هەروا بـە پێچەوانەشەوە.. ئـەم تۆڵـە سەندنەوە لـە کاتێکدا وایـە تاوانەکە بەئەنقەست بێ، ئەگەر بە هەڵە بوو دەبێ خوێن بدرێ لە جیاتی چاوێك نیوە خوێن هەیە، لە جیاتی دوو چاو خوێنی تەواو وەردەگیرێ.

ئەگـەر کابرایـەکی کـوێر چـاوێکی سـاغی دەرهێنـا بـەلای ئـەبو حەنیفـەو شافیعییەوە تۆڵەی لێ دەستێندرێ؛ ئاماژە بە دەقی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ﴾ ئیبنو عەرەبی دەڵێ: کـارکردن بـە عـومومی قورئـان باشـترە! ئیمـامی مالیـك دەفەرموێ: کابرا سەرپشك دەبێ، ئارەزووی لێ بـوو تۆڵـە (قیـصاص)ی لێ دەسـتێنێ، ئارەزووی لێ بوو خوێنی لێ وەردەگیرێ.

ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: قیصاصی لێ ناسـتێندرێ، بـەڵکوو خـوێنی تـەواوی لێ وەردەگیرێ، چونکە یەکسانی نیـە لـە نێـوان چاوی دەسـتدرێژیکەرو چاوی دەست بۆسەر دورێژکراو، هەروەها تۆڵەی لـووتو گوێـچکەو ددان دەسـتێندرێ، ئەگـەر بـە ئەنقەست بێ، وەکوو تۆڵەی باقی ئەندامەکانی تر، بەڵام هی زوبان زۆربەی زانایـان دەڵێن: خوێن دەستێندرێ بە گوێرەی ئەو زیانەی پێی گەیشتووە، خوێنەکە دابەش دەکـرێ بەسـەر ئـەو پیتانـەی بـە زمـان دەگـوترێن، چـەند پیتـی بـۆ نـەگوتران خوێنەکـەیان دەسـتێندرێ، ئەگـەر بـە تـەواوی لـە قـسە کـەوت خـوێنی تـەواوی وەردەگیرێ. وەلێ برینـی تـر چـەندێك بکـرێ بـە ئەنـدازەی برینەکـە بـستێنیتەوە پەیڕەو دەکرێ، ئەگەر نـەتوانرا وەکوو کوتران‌و پـوانی گۆشـت‌و شـکانی ئێـسقانی سینگ، ئـەوا ئەندازەیـەك پـارە دادەنـرێ دادوەرو لـە ڕێگای لیژنەیـەکی پـسپۆڕەوە پارەکە مەزندە دەکا.

هەموو ئەم شتتانە لە کاتێکدا دەبێ: کە بەئەنقەست بێ، وەڵێ ئەگەر بە هەڵە بێ خوێنی وەردەگیرێ، جا یان خوێنی تەواو یان خوێنی ئەندامێك وەردەگیرێ.

ئەمجار پەروەردگار ئاماژە بۆ لایەنی مرۆڤایەتی دەکات؛ کە ئەویش لێخۆش بوون‌و لێبوردنە لە تاوانکارو دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُ﴾ کەسێك خۆش بێ لەو مافەی بۆی دەچەسپێ لە تاوانکار، ئەوە ئەو لێخۆش بوونە دەبێتە کەفارەتی تاوانەکانی‌و گوناهەکانی پێ دەسڕدرێتەوە، طەبەرانی لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: «مَنْ تَصَدَّقَ عَنْ جَسَدِهِ بِشَيْءٍ أَعْطَى بِقَدْرِ ما صَّدَقَ» ئەم حەدیثە هەر لە عوبادەوە بە لەفظی تریش ریوایەت کراوە، ئەوەی گوترا: حوکمی پەروەردگارە، شەریعەتی یەزدانە، ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ هەرکەسێك پشت هەڵکا لە شەریعەتی خودادەرباری تۆڵەو خوێن وەرگرتن‌و لێخۆشبوون یاسای خودا پەیڕەو نەکا، ئەوە ستەمکارو مل هوڕو بێ ویژدانن ستەم لە خۆیان‌و غەیری خۆیان دەکەن، دەست درێژی دەکەنە سەر سنووری خوداو هیچ شتێك لە شوێنی خۆیدا ناهێڵنەوە.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە: کە تەورات شەریعەت‌و یاسای هەموو پیغەمبەرانی نەتەوەی ئیسرائیل بووەو دەفەرموێ: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعَيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾ لە دوای ئەو پیغەمبەرانەی نەتەوەی ئیسرائیل هەموویان بە پێی تەورات کاریان کردووە، عیساش لەسەر رێبازی بووە کەوابێ شەریعەتی عیسا بریتی بوو لە تەورات، تەنانەت لە ئینجیلەکانیاندا هاتووە کە عیسا وتوویەتی: بۆیە نەهاتووم شەریعەتی تەورات بکوژێنمەوە، بەڵکوو بۆیە هاتووم تەواوی بکەم ئەوەی خودا رێگام بداو بۆم بنێرێ لە حوکم‌و ئامۆژگاری لێی زیاد بکەم، بەڵام لە دوایی دا نەصرانییەکان وازیان لە کارکردن بە تەورات هێناو شوێن رایەکەی (پۆلس) کەوتن.

﴿وَآتَيْنَاهُ الإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى﴾ بەخشیمان بە عیسا ئینجیل: کە هیدایەت‌و شارەزایی کردنی ئادەمیزادی تێدایە، لە گومڕایی‌و بیروباوەڕی پڕوپووچ رزگاریان

دەکا، فێـری یەکتاپەرسـتیو راسـتاڵیتان دەکـا ﴿وَنُـورٌ﴾ رووناکییـە بـۆ ڕێڕەوانـی خوداپەرستیو ڕێگای حـەقیان نیـشان دەدا ﴿وَمُـصَدِّقًا لِّمَـا بَـيْنَ يَدَيْـهِ مِـنَ التَّـوْرَاةِ﴾ تەصدیق کەرو پشتگیری کارە بۆ ئەو نامـە ئاسمانیانـەی کـە لـە پێشدا هـاتوون کـە تەوراتە.

تێبینی ئەوە دەکرێ: کە دووبارە کردنەوەی رستەی ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْـهِ﴾ بـۆ گەیانـدنی دوو مانـای لێـك جیـاوازە، واتـە: مەسـیح تەصـدیقی تـەورات دەکـاو ئینجیلیش تەصدیقی تـەورات دەکـا، ﴿وَهُـدًى﴾ لەیەکـەم جـاردا روون کردنـەوەی ئەحکامو شەریعەتو ئەرکی سەرشانی ئادەمیزادانە مەبەست بـە (نـوور)یـش روون کردنەوەی یەکتاپەرستیو چۆنیەتی پیغەمبەرایـەتیو زیندوبوونەوەیـە، مەبەسـت بە ﴿وَهُدًى﴾ لە جاری دووەمدا ئەوەیـە: کـە ئینجیـل شـارەزایکەرو رەهنومایـیـەکی ئاشکرایە بۆ ناساندنی پیغەمبەرایەتی (محمد) (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هۆکـارێکی سەرەکییە بۆ شارەزایی کردنـی خـەڵك، بـۆ تێگەیـشتنو ناسـاندنی پـەیامی ئیـسلام، چونکە موژدەی هاتنی پیغەمبەری ئیسلامی تێدایە.

﴿وَمَوْعِظَـةً لِّلْمُـتَّقِينَ﴾ پەنـدو ئامۆژگـاریی تێدایـە بـۆ خۆپـارێزانو لـە خـوا ترسان، چونکە هەر ئەوان سوودی لێ دەبینن، کەسێك خۆپارێزو لە خوا ترس نەبێ سوود لە نیگای ئاسمانی نابینێ.

﴿وَلْـيَحْكُمْ أَهْـلُ الإِنجِيـلِ بِمَـا أَنـزَلَ اللّـهُ فِيـهِ﴾ گوتمـان بـا ئەوانـەی گرۆهـی ئینجیلنو خۆیان بە پەیڕەوکارانی ئینجیل دەزانن با حوکم بەو یاسایانە بکەن کە خودا لە ئینجیلدا ناردونیە خوارێ! مەبەست بە حوکم کردن بە ناوەڕۆکی ئینجیـل دوای هاتنـە خـوارەوەی قورئـان ئەوەیـە: جڵـەوگیریان لێ دەکـا، کـە گۆڕانکـاری لـە ئینجیلدا نەکەن، وەکوو جوولەکە لە تەوراتدا کردیـان! ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ کەسێك حوکم بـەو شـەریعەتە نـەکا کـە خـودا ناردویـە بـۆ سەر پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوانە فاسقنو لەڕێ لادەرن، لە چواچێوەی ئیسلام دەچنە دەرێ پێشێلی ئەحکامی دەکەن.

**دوای باسکردنی تەورات کە بۆ موسا نێردراوە باسکردنی ئینجیل کە بۆ عیسا رەوانە کراوە**

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَـٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَـٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾.

دوای وەسف کردنی تەورات و ئینجیل بەوە کە پەندو ئامۆژگاری و رەهنومایی کردنیان تێدا بوو، یاساو شەریعەتی پەسەند کراوی خودا بوون بۆ ئادەمیزاد، ئەمجار فەرمانی بە نەتەوەی ئیسرائیل کرد کە پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانیان بن، ئەمجار دێتە سەر باسی قورئانی پیرۆز کە بە نیگا ناردوویەتی بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام و پلەو پایەی لە بەرامبەر نامە ئاسمانیەکانی پێشوو دیاری کردووە، ئەوەش روون دەکاتەوە: کە حیکمەتی یەزدان وابووە کە شەریعەت و یاسای ژیان بە گوێرەی رۆژگار بنێرێ، لەگەڵ بارو زروفی خەڵکەکەدا گونجاو بێ، دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ﴾ ناردوومانەتە خوارێ بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر! ﴿الْكِتَابَ﴾ قورئانی پیرۆز: کە تەواوکەری هەموو کتێبە ئاسمانیەکانە ﴿بِالْحَقِّ﴾ بە حەق و راستی، هەرچی تێدایە هەق و راستە و شك و گومانی تێدا نیە کە لە خوداوە بۆت نێردراوە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ﴾ تەصدیق و پشتگیری کتێبە ئاسمانیەکانی پێشوو دەکا، وەکوو تەورات و ئینجیل کە باسی وەصفی قورئانیان لە خۆ گرتووە، موژدەی هاتنی پێغەمبەری ئاخر زەمان و ناونیشانی تێیاندا روون کراوەتەوە، ئەو کتێبانەش لە خوداوە نێردراون!! موساو عیساش دوو پێغەمبەری خودا بوون بۆ سەر گەلەکانیان و چییان گوتووە حەق و راستە و ئەوانە بەدەم خوداوە درۆیان هەڵنەبەستووە بەڵام دوای ئەوان ئێوە باوك و باپیرانتان گۆڕانکاریتان تێدا کردوون ئەحکامەکانتان تێك داوە! ﴿وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ چاودێرو شایەتە بەسەر باقی کتێبەکانی تردا، شایەتی راستی و چەسپاوی بناغەکەیانە، روون کەرەوەی حەقیقەت و ناوەڕۆکیانە، شایەدی ئەوەیە چەند گۆڕانکاریی و کەم و زیادییان بەسەردا هاتووە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ﴿مُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ واتە: ئەمیندارو رازگری کتێبە ئاسمانیەکانی پێشووە، واتە: ئەگەر ئەهلی کیتاب لە کتێبەکانی خۆیانەوە هەواڵێکیان پێ دابن، سەیر بکەن ئەگەر لە قورئاندا هەبوو بڕوای پێ بکەن ئەگینا بە درۆی بزانن. جا ئەگەر ئەمە پلەو پایەی قورئان بێ! کەواتە ﴿فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ ئەی (محمد)! حوکم بکەن ئەتۆو غەیری تۆش، لە نێوان ئەهلی کیتاب و هەموو خەڵکی تریشدا بەو حوکم و یاساو شەریعەتەی لەم قورئانە پیرۆزەدا هەیە

هەروەها بەو شەریعەتو یاسای پیغەمبەرانەی پێشوو: کە هەڵتەوەشینراوەتەوە، بەڵام ﴿وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ﴾ شوێن بیروڕای دەست کردی ئەهلی کیتاب مەکەوە، کە وازیان لە بڕیارە ئاسمانیەکە هێناوە، بە ئارەزۆی خۆیان شەریعەتی تریان هەڵبەستووە، لامەدە لەو شەریعەتە حەقەی خودا بۆی ناردووی، فەرمانی پێ کردووی کە پابەندی بێ، لامەدە بۆ هەواو هەوەسی ئەو سەرسەری بازانەی لە نەزانیدا گومڕابوون، حوکمی رەجمو تۆڵە ستاندنەوەی بکوژیان لە تەوراتدا گۆڕیوە، موژدەی هاتنی پیغەمبەری ئاخر زەمانو ناونیشانەکانیان شاردۆتەوە!

ئەمجار پەروەردگار ئاخاوتنێکی تر دادەمەزرێنێو دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك لە ئێوە یاساو شەریعەتێکمان بۆ داناوە، لەسەرمان پێویست کردوون پەیڕەوی بکەن، حوکمەکانی جێبەجێ بکەن، بۆ هەر گەلو نەتەوەیەك پرۆگرامو بەرنامەیەکمان بۆ دیاری کردوون، فەرضمان کردووە لەسەریان کە پابەندی بنو لێی لانەدەن، ئەو شەریعەتو یاسایانەش کە بۆیان دانراوە بە گوێرەی رۆژگارو سروشتی کۆمەڵگای ئادەمیزادی ئەو سەردەمانە بووە، لەگەڵ کۆمەڵگاکاندا شەریعەتەکانیشیان بۆ گۆڕدراوە، هەرچەندە ئەو شەریعەتانە هەموویان لە بنەمای ئایین دان، کە یەکتاپەرستیو خوداپەرستییە هەموویان یەکنو یەك مەبەستن هەروەها لە بنەمای ئەخلاقو رەوشتیشدا یەك سەرچاوەن، کەوابێ جیاوازی شەریعەتەکان لە (فروع) لقو پۆپ دابووە نەك لە بنەماو (اصول)دا.

بە کورتی بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك هی رابووردو هی داهاتوو پەیڕەوو پرۆگرامی خۆی بۆ نێردراوە، رێگە نەدراوە هیچ نەتەوەیەك لە شەریعەتی پەسەند کراوی خۆی لابدا، ئەو گەلو نەتەوانەی لە سەردەمی حەزرەتی موساوە بەم لاوە تا رۆژگاری حەزرەتی عیسا سەلامی خودایان لێ بێ، شەریعەتەکەیان ئەوە بووە: کە لە تەوراتدا بۆیان نێردراوە، لە رۆژگاری حەزرەتی عیساوە بەم لاوە تا هاتنی پیغەمبەری ئیسلام شەریعەتەکەیان ئەوە بووە: کە لە ئینجیلدا بۆیان روون کراوەتەوە، لە ناردنی پیغەمبەری ئیسلام بەم لاوە هەتا رۆژی قیامەت تاکە

شەریعەتی پەسەندو حەق‌و ڕاست ئەوەیە: کە لە قورئـان دایـەو بـەس! پێویـستە هەموو ئادەمیزاد بڕوایان پێ بێ‌و کاری پێ بکەن! چونکە (محمد) (صَلّی اللّهُ عَلَیهِ وَسَلّمَ) دوا پیغەمبەرو فروستادەی خودایە بۆ سـەر هـەموو ئـادەمیزاد، پیغەمبـەری ئـادەمی‌و جندۆکەیـە، شـەریعەتەکەی تـەواوترین شـەریعەت‌و یاسایە، قورئـانی بـە خەڵات بۆ هاتووی تاکە کتێب‌و پـەڕاوە، کـە بـەبێ دەست لێدان‌و گۆڕانکاری تێیـدا ماوەتەوەو بە ئێمە گەیشتووە، دەقەکانی هـەموویان جێگای متمانـەو بـڕوان، هـیچ شك‌و گومان لە لەفظو مەعنایدا نیە.

شـەریعەت: بریتییـە لـەو حوکمـە عەمەلیانـەی کـە بـە گـوێرەی گـۆڕانی پیغەمبەران ئەوانیش دەگۆڕێن، شەریعەتی تـازە شـەریعەتی رابووردو دەسڕێتەوە، بـەڵام ئـایین بریتییـە لـەو بنـەما سـەرەکی‌و چەسپاوانەی کـە لـە هـەموو شوێن‌و زەمانێکدا یەك بابەتە.. گۆڕانی بەسـەردا نایـە لـە ئـایینی هەموو پیغەمبەرەکانـدا چوون یەك‌و یەك تەرزن.

ئـەمجار پـەروەردگار خیتـاب ئاراسـتەی هـەموو گـەل‌و نەتـەوەکان دەکـاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللّـهُ لَجَعَلَكُـمْ أُمَّـةً وَاحِـدَةً﴾ ئەگـەر خـودا بیویـستایە هـەموو ئێوەی ئادەمیزادی دەخستە سەر یەك بیروباوەڕ لە ژێر خێمـەی یـەك ئاییـندا کـۆی دەکردنەوەو یەك شەریعەتتان پەیڕەو دەکردو ئەو شەریعەتە بـەردەوام دەبـوو، وە هیچی لێ نەدەسڕایەوەو گۆڕانی بەسەردا نەدەهێنا.

﴿وَلَكِـن لِّيَبْلُـوَكُمْ فِـي مَـآ آتَـاكُم﴾ بـەڵام بۆیـە ئـاوا شـەریعەتی جیـاوازی بـۆ پیغەمبـەران دانـاوەو هـەر پیغەمبـەرێکی رەوانـە کردبـێ بـە گـوێرەی رۆژگـار شـەریعەتێکی تایبـەتی بـۆ نـاردووە، چـونکە هەمیـشە کۆمـەڵگای ئـادەمیزاد لـە گۆڕاندایە، شەریعەت‌و یاسای ئەم سەردەم بۆ سەردەمێکی تر نـەگونجاوە، ئـادەمیزاد هەمیـشە لـە پێـشکەوتن‌و گەشـە کردنـی عـەقڵ‌و هۆشـیدایە، رۆژ بـە رۆژ ئاسـۆی بیروبۆچوونی فراوان تر دەبێ، بۆیـە کـە ئـادەمیزاد بـە گشتی لێـك نزیـك بـووەوە، کـاتی ئـەوە هـات شـەریعەتێکی سەرتاسـەری‌و هـەتا هـەتاییان ببـێ، پـەروەردگار شەریعەتێکی ئیسلامی بۆ ناردن: کە بـۆ هـەموو گەل‌و نەتەوەیـەك‌و هـەموو کـات‌و شوێنێك گونجاو لەبارە.

مەبەست لە ناردنی ئەو شەریعەتە جیاجیایانە تاقیکردنەوەی ئادەمیزادە، لە هەموو سەردەمێکدا جۆرە شەریعەتێکی بۆ ناردووە، لە سەردەمی ساوایدا شەریعەتێکی بۆ ناردن کە لایەنی ماددی تێدا باڵا دەست بوو، لە سەردەمی پێگەیشتن‌و سەردەمی کامڵ بوون‌و خۆناسین‌و ئاستی عەقڵ‌و هۆشی بەرز بووەوە، بەم جۆرە لە بیری گەل‌و نەتەوەدا بە تەواوی ئەم پێگەیشتن‌و خۆناسینە بە تەواوی بە دیار کەوت، لە هەندێ گەل‌و نەتەوەشدا لێی چاوەڕوان دەکرا پێ بگا، شەریعەتی ئیسلامی بۆ ناردن: کە هەردوو لایەنی ماددی‌و گیانی کۆکردنەوە بناغەکانی لەسەر تێفکرین‌و ورد بوونەوەو لێکۆڵینەوە دامەزراوە، کاروباری دادوەری‌و رامیاری‌و کۆمەڵایەتی‌و سەربازی لە روانگەی مەشوەرەت‌و راوێژەوە چارەسەر دەکا، سەربەستی‌و ئازادی داوە بە ئادەمیزاد، فەرمانی کردووە جگە لە خودا گەردنکەچی کەسی تر نەبن، لایەنی ماددی‌و لایەنی گیانی لە ژیانی مرۆڤدا وێکڕا بە خێو بکەن، جوولەکایەتی شەریعەتەکەیان لەسەر توندوتیژیی بنیات نراوە، چونکە ئەو شەریعەتە بۆ نەتەوەیەك هاتووە: کە کۆیلەو چەوساوە بوون، سەربەستی‌و ئازادیان لەدەست دابوو، کەس مافی لێکۆڵینەوەو ڕادەربڕینی نەبوو، شەریعەتێکی ماددی‌و تەن پەروەری بوو! ئەو کەسەی پەیڕەوی بکردایە وەکوو بەخێوکەری‌و منداڵێکی چڵێس‌و سەرکەش بوو.

شەریعەتی مەسیحیش لەلایەکەوە جوولەکانە بوو، لەلایەکی ترەوە زۆر گرنگی بە لایەنی گیانی دەدا، فەرمانی دەکرد بە پەیڕەوانی کە کاروباری جەستەیی‌و کۆمەڵایەتییان بەکاربەدەستانی زاڵ بوو بەسەریاندا بسپێرن، فەرمانیان پێ دەکا کە گەردنکەچی فەرمانڕەوایانیان بن، تەنانەت ئەگەر ئەوپەڕی ستەمکاری‌و ملهوڕیشیان لەگەڵدا بەکار بێنن، هەر رازی بن‌و سەرپێچی نەکەن‌و لە روویان هەڵنەگەڕێنەوە، هەر خەریکی پەروەردە کردنی گیان بن، عاتیفەو سۆزی خۆیان بەخێو بکەن، کە شەپازلەیان لە رومەتی راستی دا لە جیاتی تۆڵە سەندنەوە لای چەپی بۆ ئامادە بکا!!.

بەڵام شەریعەتی ئیسلام لەسەر بناغەی عەقڵ‌و لێکۆڵینەوەو تێفکرین‌و توێژینەوە دامەزراوە، بەرژەوەندی جەستەو گیانی بەیەکەوە رەچاو کردووە،

شەریعەتێکی میانەڕەو گونجاوە بۆ هەموو کاتو شوێنێك، ئاوێنەیەکی باڵا نومایە بۆ ئەو فەرمووده‌یەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ – البقرة/١٤٣﴾، شەریعەتی ئیسلام دانراوە لەسەر بنەمای سەربەخۆییەکی وا کە شیاوی ئادەمیزادی ژیرو تێگەیشتوو بێ! هەر بۆیەشە ئەحکامی دونیایی لە قورئاندا زۆر کەمن بەڵام لە هەمان کاتدا، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دونیایی، داوای لە ئادەمیزاد کردووەو لەسەری پێویستی کردووە: کە توێژینەوەو تێفکرینو ئیجتیهاد بکا، یاسای ژیانیان لە دەقەکانی قورئانو سوننەتی پیغەمبەر دەربێنن، لە ژێر رۆشنایی بناغە سەرەکییەکانی شەریعەتدا یاسای ژیان دابڕێژن ﴿فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ﴾ کەوابێ ئەی گرۆهی موسوڵمانان! هەمووتان پێشبڕکێو دەست پێشخەری بکەن، بۆ خوداپەرستیو پابەندبوون بە فەرمانەکانی، بۆ شوێنکەوتنی ئەو شەریعەتەی کە هەموو شەریعەتەکانی پێش خۆی سڕیوەتەوە، شەریعەتێکی بەردەوامو دامەزراو تەواو، گونجاو شیاو بۆ هەموو کاتو شوێنێك! بڕوای تەواوو پتەو بە کتێبەکەی کە قورئانی پیرۆزە بکەنو بیکەنە چرای ژیانتان، بۆ ئەوەی چی خێرو بێری دوونیاو قیامەت هەیە دەستتان بکەوێ، بەخششو رەزامەندی خوا بەدەست بێنن ﴿إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ سەرەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای خودایە، هەمووتان رۆژی قیامەت لەبەر قاپی دیوانی ئەودا کۆ دەبنەوە؛ ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ هەواڵتان دەداتێ بەو شتە حەقانەی کە تێیدا کەوتوونە کێشەوە، پێتان دەفەرموێ: کێ راستی کردووەو کێ خوار رۆیشتووە، هەرکەسە بە گوێرەی کردارو گوفتاری خۆی پاداشو سزای دەدرێتەوە؛ راستگۆیان پاداشی راست گۆییان وەردەگرنەوە، درۆزنو سەرپێچیکارانو لادەران لە رێگای حەقو راستی، سزا دەداو تۆڵەیان لێ دەستێنێ.

پەروەردگار جەخت لەسەر فەرمانی پێشوو دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللَّهُ﴾ لەسەر تۆمان بە پێویست داناوە: کە حوکم بە قورئان بکەی کە بۆت نێردراوە، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بە، ﴿وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ﴾ شوێن بیروباوەڕی ئارەزوبازیی ئەو جوولەکانە مەکەوە، ﴿وَاحْذَرْهُمْ﴾ لە فرتو فێڵیان بترسێو ئاگات لە خۆت بێ ﴿أَن يَفْتِنُوكَ﴾ نەبادا تووشی فیتنەت بکەن، لە

ڕێگای حەق لات بدەن ﴿عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾ لەو حوکمانەی خودا بۆی نازڵ کردووی، هەندێ کەس دەڵێن (بعض) بە مانا (کل)ە لە زمانی عەرەبیدا، جاری وا هەیە: (بعض) بەو مانایە دێ واتە: لە هەموو ئەو حوکمانەی کە خودا بۆی ناردووی!! هەندێکیش دەڵێن: وشەی (بعض) لەسەر مانای خۆیەتی! مەبەست شاردنەوەی حوکمی زیناکەری موحصەنە کە جوولەکەکان دەیانویست لە جیاتی ڕەجم پیغەمبەر بڕیاری جەڵدەو ڕوورەش کردنیان بۆ بدا! جا ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ ئەگەر پشتیان هەڵکرد لەو قورئانەی تۆ حوکمی پێ دەکەی لە ناویاندا بەراستو دروستی، سەرپێچی شەریعەتی خودایان کرد، ئەوە لەسەر شانت گران نەبێو گوێ مەدەرێو ﴿فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ﴾ بزانە کە ئەوە لە دەسەڵاتی خودادایەو حیکمەتی وایە: کە لە ڕێگای هیدایەت لایان بدا، بەهۆی ئەو هەموو تاوانانەیان کە لەوە پێش ئەنجامیان داوە، بەرادەیەك کە شیاوی ئەوە بوون؛ خودا ڕێگایان لێ گوم بکاو تووشی دەردی سەریو سزاو تۆڵە ببن، پەروەردگار دەیەوێ کە لە دونیادا پێش قیامەت سزایان بدا بەهۆی بڕی تاوانیانەوە کە پشت هەڵکردنو ڕو وەرگێڕانیانە لە حوکمو شەریعەتی خوداو لەو کتێبەی تۆ حوکمی پێ دەکەی، ئەمەش هاتە دیو ئەو سزایەیان چەشت، ئەوە بوو: لە ئاکامی غەدرو پیلانی جوولەکەکان، پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خێڵی بەنو نەضیری لە مەدینە وەدەرناو بەنو قورەیظەشی قەڵاچۆ کردنو ئاسەواری بڕینەوە! لەلایەکی تریشەوە لەسەر ئەو حەمکە تاوانە زۆرو زەبەندانەیان ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا سزای بە ئێشی بۆ داناونو بە ئاگری دۆزەخ دەیانسوتێنێ!

﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ﴾ بێگومان زۆربەی ئادەمیزادان لادەرو یاخی بوون، سەرپێچی حەقو ڕاستی دەکەن، لە ڕێگەی ڕاست لایان داوە، لە سنوورەکانی شەرعو ئایینو عەقڵ دەرچوون! ئەمەش دڵدانەوەی پیغەمبەرە بۆ ئەوەی خەفەتبار نەبێ بەوەی کە ئەو جوولەکەو کافرانە بڕوای پێ ناکەنو بە درۆی دەخەنەوە!

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لەو جوولەکانە دەکا کە دەیانەوێ جیاوازیی بخەنە نێوان کوژراوی ئەم هۆزو ئەو هۆزەوەو دەیانەوێ بە گوێرەی یاساو پەیمانی

سەردەمی پێش ئیسلام خوێنی کوژراو وەربگرن، وێڕای ئەوەی کە خۆیان ئەهلی کیتابن کەچی دەیانەوێ حوکمی جاهیلی پەیڕەو بکەن، بۆیە پەروەردگار بەم شێوە پرسیارە نارەزاییە روو دەکاتە ئەهلی کیتابو ئەوانەی وەکوو ئەوانن دەفەرموێ ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ ئایا ئەوانە (ئەی محمد)! پشت لە حوکمی تۆ هەڵدەکەن کە حوکمی قورئانە، حەقو راستو دروستە، حوکمو بڕیاری سەردەمی نەزانییان دەوێ کە لەسەر بناغەی نەزانیو ستەمو ئارەزووبازی دامەزراوە، ئەمە سەرزەنشتو سەرسوڕمانە لە حاڵو بۆچوونو هەڵوێستیانو نارەزایی دەربڕینەلە هەڵوێستی هەر کەسێك لە حوکمی خودا دەربچێ، واز لە حوکمی قورئان بێنێو پەنا بباتە بەر حوکمو بۆچوونو بیروڕای هەوەسبازان، وەکوو چۆن کۆمەڵگای سەردەمی نەزانی حوکمیان بەو جۆرە بڕیارە گومڕاییانە دەکرد، کە بۆخۆیان بەو نەزانیو بێ عەقڵییەوە دایان نابوون! ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ کێ حوکمی لە حوکمی خودا چاکترو باشترە؟؟ واتە: کەس حوکمی لە حوکمی خودا جوانتر نیە بۆ کەسانێك هۆشمەندو خاوەن بڕوا بن، گەردنکەچی شەریعەتەکەی بن، چونکە حوکمی خودا کامەرانی دونیاو قیامەتی لە خۆ گرتووە، ئەوپەڕی دادوەریو پابەند بوون بە حەقو راستی تێدا بەدی دەکرێ! لە حوکمو بڕیاری خودادا دەبێ حاکم حەق بێژو راستی خواز بێ، دەبێ حوکم بەسەردا دراو رازیو گەردنکەچی حوکمەکە بێ، بڕێك دەڵێن: (لام) لە (لقوم)دا بەمانا (عند)یە یان (لام)ی بەیانو روونکردنەوەیە، ئەو کاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: حوکمی پەروەردگار جوانترین حوکمو باشترین بڕیارە لەلای ئەوانەی بیروباوەڕیان بە ئایینی خودا هەیە. پوختەی مانای ئایەتەکە ئەوەیە: دەفەرموێ: ئەوەی جێگای سەرسوڕمانو پرسیارە، ئەوەیە: کە ئەو بەد مەزهەبو خوانەناسانە حەزیان لە حوکمو بڕیاری سەردەمی نەزانیو ستەمکارییە، بەسەر حوکمی خودادا هەڵی دەبژێرن کە دادپەروەریو حەقخوازییە، ئاشکراشە حوکمی خودا باشترین حوکمە بۆ کەسانێك خاوەن باوەڕو موسوڵمان بن، چونکە حوکمی خودا بریتییە لە دادپەروەریی، کە کاروباری خەڵك بە دادپەروەرییەوە رادەوەستێ، حوکمی سەردەمی نەزانیو هەڵقوڵاو لە بیروبڕوای هەوەسبازان بریتییە لە پاساودانی بە هێز بەسەر بێ

هێزدا، کە یارمەتی ستەمکاران دەدا بۆ چەوساندنەوەو ریشەکێش کردنی هەژارو لاوازو زەبوونەکان، ئەم جۆرە حوکمەش خراپترین حوکمەو بڕیارە روخێنەری ئاوەدانیو ژیاری گەلو چەواشە کردنی یاساو نیزامە.

## جوولەکەو نەصارا مەکەن بەریش سپیو گەورەی خۆتان

﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْۚ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

ئینجا وەکوو لە ژیاننامەی پێغەمبەردا نووسراوەو لە کتێبە تەفسیرو مێژووەکاندا باس کراوە، کاتێ پێغەمبەر (صلی اللهُ علیهِ وسلم) تەشریفی چووە مەدینە بێ بڕواکان سێ جۆر بوون، جۆرێکیان پەیماننامەیان لەگەڵدا مۆر کرد کە نە شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر بکەن نە یارمەتی کەسێك بدەن کە شەڕی لەگەڵ دەکا، لە

بەرامبەر ئەوەشدا ئەوانە لەسەر بێ بڕوایی خۆیان بمێننەوە لە گیانو ماڵی خۆیان دڵنیا بن!!

بەشێکی تریان بێ لایەن مانەوە نە پەیمانی ئاشتیان لەگەڵدا بەستو نە شەڕیشیان لەگەڵدا کرد بەڵکوو چاوەڕوان بوون ئاکامی مل ملانێو شەڕو جەنگەکانی پیغەمبەر لەگەڵ کافرەکان بەچی دەگا، لە واقیعو لە دڵیشدا دوژمنو دژی پیغەمبەر بوونو بە خوێنی سەری تینو بوون، ئەمانە دووڕوو (منافق)ەکان بوون. کۆمەڵی سێیەمیان بە ئاشکرا دژی وەستانو شەڕیان لەگەڵدا کرد.

پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەگەڵ هەر سێ تاقمەکەدا بە گوێرەی فەرمانی خودا لەگەڵیاندا جوڵایەوە، نامەی ئاشتی لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینە مۆر کردو ئاشتینامەیان لەگەڵ یەکتری گۆڕییەوە، جوولەکەکان سێ هۆز بوون، لە دەوروبەری شاری مەدینە نیشتەجێ بوون، (بەنو قەینوقاع، بەنو نەضیر، بەنو قوریظە) لە دوای جەنگی بەدر بەنو قەینوقاع شەڕیان لەگەڵ پیغەمبەر کرد، بەنو نەضیریش شەش مانگ دوای ئەوە پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندەوە، کاتێکیش پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەرچوو بۆ غەزای خەندەق بەنو قوریظە ئاشتی نامەی خۆیان هەڵوەشاندەوە، ئەم هۆزە لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی پیغەمبەر بوون، ئەم سێ هۆزە جوولەکانە هەر یەکە لەلای خۆیەوە شەڕیان لەگەڵ پیغەمبەرو هاوەڵانیدا کردو پەروەردگار پیغەمبەری زاڵ کرد بەسەریاندا، عەرەبە گاورەکانو ڕۆمەکانیش وەکوو جوولەکە شەڕیان دژی پیغەمبەر بەرپا کرد.

ئەمانە بە تێکڕا هۆی گشتیو سەرەکی ئەوە بوون: کە پەروەردگار جڵەوگیری لە موسوڵمانان بکا کە دۆستایەتی ئەهلی کیتاب نەکەنو نەیان کەنە گەورەو کار بەدەستی خۆیان جڵەوی کاروباری خۆیان نەدەنە دەست ئەوانو رازو نهێنی خۆیان لا نەدرکێننو فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء﴾ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە ئایینی ئیسلام کردووە جوولەکەو مەسیحییەکان مەکەن بە هاوپەیمانو دۆستو پشت پێ بەستووی خۆتان، مەیانکەن بە یارمەتیدەرو سوێندخۆری خۆتان بەسەر موسوڵماناندا پاساویان مەدەنێ نهێنی خۆتانیان لامەدرکێنن لە دۆستایەتیو خۆشەویستیان دڵنیا مەبن!

چـونکە ئـەوان دڵـسۆزی ئێـوە نـین، نەچـن دەسـتیان لەگـەڵ تێکـەڵ بکـەن گەلەکۆمـەکییان لەگـەڵ بکـەن دژی کۆمـەڵی موسـوڵمانان، ئەوانـە دوژمنـی ئێـوەن ﴿بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ﴾ جوولەکەکان هەندێکیان یارمەتیدەرو پشتو پەنای یـەکترن، مەسـیحییەکانیش برێکیـان پـشتو پـەنای یـەکترن، هیـچیان بـۆ موسوڵمانان نابنـە یارمەتیـدەرو پـشتو پـەنای راسـتەقینە،، ئـەوە بـوو: جوولەکـەکان بـەبێ ئـەوەی پیغەمبـەر (صَلى اللـهُ عَليـهِ وَسَـلمَ) شـەڕیان لەگـەڵ بکـا پەیمانەکـەی خۆیـان هەڵوەشاندەوە هەموویان دژی پیغەمبەرو هاوەڵانی یـەکیان گرتـوو بوونـە دوژمنـی بابە کوشتەیان.

ئەمجار هەڕەشەی توند ئاراستەی ئەوانـە دەکا: کـە دۆسـتایەتیو هاریکـاری ئەو کافرو یاخی بووانە دەکەنو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ کەسـێك یارمـەتیان بـداو هاریکاریـان بکـا، یـان داوای یارمـەتیان لێ بکـا، ئـەوە لـە راسـتیدا لەوانەو لە کۆمەڵی ئەوان حسێب دەکرێ وەکوو ئەوان وایەو لە تـاقمی موسـوڵمانان نیـە ئەمـە دەربڕینـی نارەزامەندییـە لـە پـەروەردگارەوە دژی دووڕووەکـان دەری دەبـڕێ، ئـەو دووڕووانـەی کـە دۆسـتایەتی جوولەکـەو مەسـیحییەکان دەکـەن دژی موسـوڵمانان. چـونکە دۆسـتایەتیو هاوپـەیمانی کردنیـان ئـەوە دەگەیـەنێ کـە بـە ئایینەکەیان رازین! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دۆستایەتیو هاوپـەیمانی لـە نێـوان موسـوڵمانانو تـاقمو گـرۆی ناموسـوڵمانان بـۆ بەرژەوەنـدی کاروبـاری دونیـایی لـە ئایەتەکەدا جڵەوگیر لێ نـاکرێ! هۆی ئـەم هەڕەشـەیە ئەوەیـە: کەسـێك دۆسـتایەتی ئەوانە بکا لەسەر حیسابی ئایینەکەیو یارمـەتی بـدا، یـان داوای یارمـەتیان لێ بکـا، ئـەوە سـتەمکارە سـتەمی لـە خـۆی کـردووە، چـونکە دۆسـتایەتی لەگـەڵ کەسـێك بەستووە کە ناشێ دۆسـتایەتی لەگەڵدا بکـرێ ﴿إِنَّ اللّـهَ لاَ يَهْـدِي الْقَـوْمَ الظَّـالِمِينَ﴾ بێگومان خودا هیدایـەتی قـەومی سـتەمکار نـادا بـۆ رێگـەی خێـرو حـەقو راسـتی، ئەوەتا ﴿فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَـارِعُونَ فِيهِمْ﴾ واقیعی حاڵو رووداو ئەوەیە: کـە دەبینـی ئەوانـەی لـە دڵیانـدا شـكو گومـان هەیـە دووڕوو مونـافیقن وەکـوو عەبـدوڵلای کـوڕی ئوبـەی پەیوەنـدی بـە جوولەکەکانـەوە دەکـەن، پەلەپەلیانـە بـۆ دۆستایەتی لەگـەڵ بەسـتنو پەیوەنـدی پێوەکردنیـان بـە ئاشـکراو بـە نهێنـی، هـەر

هەڵێکیان بۆ هەڵبکەوێ دەی قۆزنەوەو بۆ پتەو کردنی خۆشەویستیو پەیوەندی نێوانیانو چەسپاندنی دۆستایەتی بەردەوامیان دژی موسوڵمانان.

هۆی دۆستایەتی ئەو دووڕووانە بۆ دوژمنانی ئیسلام ئەوەیە: کە بەزوبانی خۆیان دەڵێن: ﴿يَقُولُونَ نَخْشَىٰ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ﴾ دەترسێین، کە موشریکەکان یان جوولەکەکان، لە ئاکامدا سەرکەوتوو بن بەسەر موسوڵماناندا، ئەوکاتە گورزێکیش لە ئێمە بدەنو سزامان بدەن، دەترسێین کە بەڵایەکی رۆژگار تووشمان ببێ پێویستیمان بە یارمەتی جوولەکەو مەسیحییەکان ببێ.. بۆیە دەمانەوێ دەستێکمان هەبێ لایان، لە کاتی فەرەحیدا دۆستایەتییان بکەین بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانەدا فریامان بکەون؟!

ئەمە دیاردەیەکی هەمیشەییە ئەوەتا: هەموو کاتێكو لە هەموو سەردەمو رۆژگارێکدا دووڕوو بێ وەرەو لاوازو زەبوون، دۆستایەتی لەگەڵ سەرانی کوفرو ئیلحاددا دەگرن بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانەدا فریایان بکەون، هەر لەم روانگەوەیە: کە تابووری پێنج لە ناو وڵاتدا دروست دەبێ، تەنانەت وا دەبێ کابرا کاربەدەستێکی خاوەن پلەو پایەیە لە دەوڵەتدا، کەچی لە ژێرەوە پەیوەندی نامەشروع لەگەڵ دوژمناندا دەبەستێ بۆ ئەوەی کە لێی قەوما پەنایان بۆ بەرێ.

ئەمجار رەدی مونافیقەکان دەداتەوەو کلکی تەماعو چاوچنۆکیان دەقرتێنێو موژدە دەدا بە موسوڵمانانو دەفەرموێ: ﴿فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ﴾ ئومێد وایە خودا سەرکەوتنو زاڵ بوون بێنێ بۆ پەیڕەوکارانی ئایینەکەی، کێشەی نێوان موسوڵمانانو کافران یەك لا بکاتەوە، وەکوو ئەوەی لە رزگار کردنی مەککەو شوێنەکانی تردا روویدا، ﴿أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ﴾ یان کارێك بسازێنێ لەلایەن خۆیەوە دەربارەی کافرەکان، دەستی ئادەمیزادانی تێدا نەبێ؛ وەکوو ئەوەی ترسی خستە دڵی جوولەکەکانی بەنو نەضیرەوە، یان ئەو هۆکارانەی کە سازاندنی بۆ سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر کافرەکاندا، ﴿فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا أَسَرُّواْ فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ﴾ ئەو دووڕووانەی کە دۆستایەتی جوولەکەو گاورەکانیان کردووەپەشیمان ببنەوە بۆیان دەربکەوێ، کە دۆستایەتیو فسکەفسکیان لەگەڵ جوولەکەو مەسیحییەکان بێ سوودە، بەڵکوو زیانی پێ گەیاندنو پەردەی سرپۆشیان لەسەر

لادرا، کلکایەتیو خیانەتیان بۆ موسوڵمانان دەرکەوت، کە لەوەپێش پەردەپۆش کرابوونو لە ریزی خوداپەرستان حسێب دەکران!

راڤەکەرانی قورئان دەفەرموون وشەی (عسی) لەسەر مانای خۆی نیە کە واتای بە تەماو ئومێد بوونە، بەڵکوو بۆ وجوبو حەتمییە، چونکە خودا کە ئومێدی شتێکی خستە دڵانەوە دەیکا، کەواتە وەکوو وادا پێدان وایە.

بۆیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مەبەست بە فەتح رزگار کردنی مەککەو شوێنەکانی ترە کە موسوڵمانان رزگاریان کردن، هەروەها دەرکردنی جوولەکەیە لە وڵاتی حیجازو خەیبەرو شوێنەکانی تر.

ئیتر ناکامی فرتو فێڵو چاوەڕاوی دووڕووەکان دەردەکەوێ، خیانەتو درۆکانیان ئاشکرا دەبن ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ برێ لە موسوڵمانان بە برێکی تریان یان بە جوولەکەکان، لە شێوازی سەرسوڕمانو گاڵتە پێ کردنو پێ خۆش بوون پێیان – دەڵێن: ﴿أَهَـؤُلاء الَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ﴾ ئائەم خوێڕیو هیچو پووچانە بوون، کە سوێندیان بۆ دەخواردنو جەختیان لەسەر سوێندەکانیان دەکردەوەو دەیان گوت: ئێمە لەگەڵتان داینو یارمەتیتان دەدەینو بۆ زاڵبوون بەسەر جوولەکەکاندا هاوکاریتان دەکەین، بەڵام دوایی حەقیقەتو ناوەڕۆکیان دەرکەوت، دژایەتیان بۆ موسوڵمانان ئاشکرا بوو: وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ – التوبة/٥٦﴾. ئەوانە کۆمەڵێکی ترسنۆکن بە رواڵەت موسوڵمانن و لە دڵدا کافرن، بۆ خۆپارێزیو سیاسەت لافی موسوڵمانیەتی لێ دەدەن، ئەگینا لە راستیدا کافرو بێ بڕوان ﴿حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَاسِرِينَ﴾ ئەو دووڕووانە مایە پووچن، ئەو کردەوانەی کردوویانن، وەکوو نوێژو رۆژو حەجو جیهاد کە بە مونافیقی کردوویانن لێیان وەرناگیرێ زەرەرمەندی دونیاو قیامەت بوون.

راڤەکەرانی قورئان دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە چەند رایەکیان هەیە! ئیمامی سوودی دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی دوو پیاو هاتۆتە خوارێ، کە لە دوای جەنگی ئوحوود یەکیان بە ئەوەی تریانی گوت: ئەمن دەچم بۆلای فلانە جوولەکەو خۆ دەخەمە پەنایەوەو دەبمە جوولەکە بۆ ئەوەی ئەگەر

بارو دۆخ سورا بەڵكوو فریام بكەوێ! ئەوەی تریشیان وتی: منیش دەچم بۆلای فلانە كەسی گاورو پەنای بۆ دەبەم‌و دەبمە نەصرانی! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

عیكرمە دەفەرموێ: ئەو ئایەتە دەربارەی ئەبو لوبابەی كوڕی عەبدوول مونزیر هاتۆتە خوارێ، ئەوە بوو پیغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) ناردی بۆلای بەنو قوریظە كە چوو بۆلایان لێیان پرسی: پیغەمبەر چیمان لەگەڵ دەكا؟ ئەویش ددەستی بۆ قورتومەی خۆی برد واتە: سەرتان دەبڕێ.

برێكیش دەڵێن: دەربارەی عەبدوڵڵای كوڕی نوبەی، ناودار بە ئیبنو ئەبی سەلوول هاتۆتە خوارێ.

## باسی هەڵگەڕاوەو پاشگەزبووەكان‌و دوژمنایەتیان بۆ موسوڵمانان

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾.

دوای ئـەوەی پـەروەردگار جڵـەوگیری لـە موسـوڵمانان کـرد، کـە دۆسـتایەتی کافرەکـان بکـەن‌و پێـی ڕاگەیانـدن کـە ئـەوەی پـەنایان بـۆ ببـاو دۆستایەتییان بکا هەڵگەڕاوەیە لە ئایین‌و بە کافر حسێب دەکرێ! ئەوەشی ڕاگەیانـد کـە پـەروەردگار بێ ئاتاجەو لە هەڵگەڕاوەکان‌و ئەوانەی خۆش دەوێـن: کـە ئیمانیـان سـاغ‌و پتـەوەو خۆشەویـستی خـودا بەسـەر هـەموو شـتێکدا هەڵدەبـژێرن‌و حـەق‌و عەداڵـەتکاری بەڕێوە دەبەن، چیی خودا پێـی خـۆش بـێ خۆشیان دەوێ‌و بەلایانـەوە پەسـەندە.. حەقیقەتێکی ڕاگەیاندو هـەواڵێکی نهێنـی پـشتگیری لێ دەکا، کـە ڕۆژگـاری داهـاتوو دەری دەخـا؛ حەقیقەتەکـەش ئەوەیـە کـە ئـایینی خـودا بـە موسـوڵمانانی ڕاسـتاڵ‌و خۆبەختکـەر سـەردەکەوێ‌و ئەوانـەی خودایـان خـۆش دەوێ هەرشـتێك لای خـوا پەسەند بێ، ئەوان خۆشیان دەوێ ئەوەتا بەم خیتابە دەست پێ دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَـن دِينِـهِ﴾ ئـەم ئایەتـەو دوو ئایەتـەکانی دوایـی دەربارەی پەشیمان بوونەوەی هۆزە عەرەبەکان لە ئیسلام لەسـەردەمی پیغەمبـەردا هاتۆتە خوارێ.

## ئەو هۆزانەی لەسەردەمی پیغەمبەردا لە ئیسلام هەڵگەڕانـەوە سـێ هۆزن:

ا- بەنو مودلەج: کە سەرۆکەکەیان ئەسوەدی عەنەسی بـوو، کـاهین بـوو لـە وڵاتـی یەمـەن، پیغەمبەرایـەتی خـۆی ڕاگەیانـدو کارمەنـدانی پیغەمبـەری لێ وەدەرنان، دوایی بە دەستی فەیروزی دەیلەمی کوژرا.

ب- بـەنو حەنیفـە: هـۆزی موسـەیلەمەی درۆزن کـە لـە وڵاتـی یەمامـەدا پیغەمبەرایەتی خۆی ڕاگەیاندو نامەی بۆ پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) نـارد، لـە نامەکـەدا ئـەوەی نووسـیبوو: کـە هابەشـی پیغەمبـەرو شـەریکیەتی! نووسیبوی زەوی دوو بەشـە، بەشـێکی هـی پیغەمبـەرەو بەشـەکەی تـری هـی موسـەیلەمەیە، پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) ئەم نامەیەی بۆ نووسـی «من محمـد رسـول الله إلى مسيلمة الكذاب والسلام على من اتبع الهدى اما بعد فان الأرض يورثهـا مـن يـشاء مـن عباده ووالعاقبة للمتقين».

لەدوای لە دونیا دەرچوونی پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَم) حەزرەتی ئەبوبەکر لەشکری نارده سەریو وحشی – کەکاتی خۆی ئیمامی هەمزەی شەهید کردبوو، دوایی موسوڵمان بوو بوو – لەو شەڕەدا موسەیلەمەی کوشت، دوایی وەحشی لە ناو خەڵکدا دەیگوت: لەسەردەمی نەزانیو کافریم دا باشترین کەسم کوشت، لە سەردەمی موسوڵمانیشم دا خراپترین کەسم کوشت.

ج- بەنو ئەسەد بە سەرکردایەتی طولەیحەی کوڕی خومیلید: کە لەسەردەمی پیغەمبەردا هەڵگەڕایەوە دوایی ئەبو بەکر لەسەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا شەڕی لەگەڵ کردو هەڵات بۆ وڵاتی شامو موسوڵمان بووەوەو تۆبەیەکی راستاڵانەی کرد..

## لەسەردەمی ئەبو بەکردا حەوت هۆز لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە

١- هۆزی غەتەفان بەسەرۆکایەتی قورڕەی کوڕی سەلەمەی قوشەیری.

٢- هۆزی فەزارە کەسو کاری عویەینەی کوڕی حیصن.

٣- هۆزی بەنو سەلیم کەسو کاری فوجائەی کوڕی عەبدیالیل.

٤- هۆزی بەنو یەربووع، کەسو کاری مالیکی کوڕی نویرە.

٥- برێك لە هۆزی تەمیم بەسەرۆکایەتی سەجاعی کچی مونذیر کە ژنی موسەیلەمەی درۆزن بوو (کوڵەوەنانی دەکرد).

٦- هۆزی کیندە کەسو کاری ئەشعەسی کوڕی قەیس.

٧- هۆزی بەنوبەکری کوڕی وائیل (ئەلحوطەم)ی کوڕی قەیس.

لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا خێڵی غەسان کەسو کاری جبیلەی کوڕی ئەلئەیهەم لە ئیسلام هەڵگەڕایەوەو بوو بە مەسیحی، چونکە لە کاتێکدا کە طەوافی کەعبەی دەکرد کابرایەکی فەزارەیی پێی لەلکە ئیزارەکەی نا، جبیلەش مستەکۆڵەیەکی لەدەمی دا، لووتی شکاند کابرای فەزارەیی لای ئیمامی عومەر شکاتی لێ کرد، حەزرەتی عومەر فەرمووی: یا دەبێ کابرا فەزارەیی عەفوت بکا، یان دەبێ تۆڵەت لێ بکرێتەوە، جبیلە بەم حوکمە فسقەڵ بوو، وتی: چۆن تۆڵە لە من دەستێنی من پاشایەکم ئەو کابرایە بازاڕییە؟ ئیمامی عومەر فەرمووی: ئیسلام

یەکسانی خستۆتە نێوانتانەوە دوایی داوای مۆڵەتی کرد تا رۆژی دوایی و ئیتر هەڵات بۆ شام! سەرجەمی ئەوانەی لە ئایین هەڵگەڕانەوە، یازدە خێڵ بوون ئەمجار پەروەردگار ئاکامو چارەنووسی هەردوو بەرە؛ بەرەی هەڵگەڕاوان و بەرەی خواپەرستان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوەو خواپەرستن! ﴿مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ﴾ هەر کەسێ لە ئێوە لە ئایینی خۆی پەشیمان ببێتەوە لە ئایینی حەق و راست هەڵگەڕێتەوە بۆ ئایینی بەتاڵ و بێ بناغە، ئەوە باش بزانن خودا زیانی پێ ناگاو دەستەوئەژنۆ دانانیشێ ﴿فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ﴾ پەروەردگار کۆمەڵێك دێنێتە شوێنیان و جێگیریان دەکا، کە ئەم رەوشتانەیان تێدا بەدی دەکرێن ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾.

١- خودا خۆشی دەوێن، پاداشی باشیان دەداتێ مەدح و ثەنایان دەکا، لێیان رازییە.

٢- ئەوانیش خودایان خۆش دەوێ، پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی و تاعەتی دەکەن هەوڵ دەدەن رەزامەندی ئەو بەدەست بێنن، لە هەر شتێك خودا پێی ناخۆش بێ دوورە پەرێز دەوەستن.

٣- سۆزو رەحمیان بۆ موسوڵمانان هەیە، یارمەتیان دەدەن بە هانایانەوە دێن.

٤- توندوتیژی بەتەوەژمن بەرامبەر کافرەکان، لە ئاستیاندا، خۆ سەر بەرزو بالادەست دەزانن، وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ – الفتح/٢٩﴾.

٥- رەوشتی پێنجەمیان ﴿يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ لە رێگەی خودادا جیهاد دەکەن و تێ دەکۆشن لە پێناو بەرز کردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله) هەوڵ و تەقەلا دەدەن! هەوڵ دەدەن حەق و عەدالەت بەرقەرار بێ، یەکتاپەرستی بچەسپێنێ، خودا لە خۆیان رازی دەکەن، بەرگری لە گەل و نیشتمان و خوێن و نامووس دەکەن!

٦- رەوشتی شەشەمیان ﴿وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ﴾ لە پێناوی رەزای خوادا لە سەرزەنشت و لۆمەی کەس ناترسن، چونکە دڵ قایم و ورە بەرزو چاو نەترس و

خاوەنی بیروباوەڕی پۆڵایین، هەمیشە هەوڵی چەسپاندنی حەق و هەڵکەندنی بەتاڵن بە پێچەوانەی دووڕووەکان: کە لەسەرزەنشتی جوولەکە هاوسوێندخۆرەکانیان دەترسن ﴿ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء﴾ ئەو ڕەوشتە بەرزو نایابانەی باس کران؛ بەخشش و فەضلی خودایە دەیبەخشێ بەو کەسانەی بیەوێ ئەو بەهرەو ڕێزو فەضلەیان بداتێ ﴿وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا خێرو بەرەکەتی زۆرو فراوانە، دەزانێ کێ شیاوی ئەو ڕێزو بەهرەمەندییەیە.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار جڵەوگیری کرد لە دۆستایەتی و پشت بەستن بە کافرەکان، فەرمانی پێ کردن بە دۆستایەتی و پشت بەستن بە خوداو فەرمووی: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ﴾ جوولەکەو گاور دۆستی ئێوە نین، بەڵکوو دۆستی ڕاستەقینەی ئێوە تەنیا خوداو پیغەمبەرو ئەو گرۆهانەن کە بە ڕاستی بڕوایان هێناوە بە ئیسلام ﴿الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ﴾ ئەوانە نوێژەکانیان بەباشی بەجێ دێنن ﴿وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ زەکاتی ماڵ و سامانی خۆیان بە تەواوی و ڕێك و پێکی دەردەکەن، بە دڵێکی فراوان و ڕوخۆشییەوە دەیدەن بەوانەی کە شیاوی زەکات پێدانن.

﴿وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ هەموو کاتێ گەردنکەچی فەرمانی خودان و ئامادەی جێبەجێ کردنی هەموو تەکلیفێکی شەرعین.

ئاشکراشە ﴿وَمَن يَتَوَلَّ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ﴾ کەسێك خوداو پیغەمبەر بکا بە دۆست و پەنای خۆی و پشتیان پێ ببەستێ و یارمەتی ئایینی خودا بداو موسوڵمانان بکا بە دۆست و ئاشنای خۆی، ئەوە سەرکەوتوو بە مراد گەیشتووە، چونکە ئەو کاتە دەبێتە حیزبی خودا دڵنیاش بن: کە ﴿فَإِنَّ حِزْبَ اللّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾ بەڕاستی هەر لایەنگرو گرۆی پابەند بە ئایینی خودا سەرکەوتوو ڕزگار بوو باڵا دەستن.

**دۆستایەتی کافرەکان مەکەن (باسی جڵەوگیری کردن لە دۆستایەتی کافران)**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ ﴿٦١﴾ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ

﴿ٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ۝٦٣﴾.

لە ئایەتەكانی پێشوودا پەروەردگار نەهی كرد لەوەی: كە موسوڵمانان جوولەكەو مەسیحییەكان بكەن بە پشتو پەنا بۆ خۆیان چونكە ئەوان هەندێكیان پشتو پەنای یەكترنو هەموویان تێكڕا دژی موسوڵمانانن.. لێرەشدا نەهییەكە جارێكی تر دووبارە دەكاتەوەو جڵەوگیری لەوە دەكا: كە نابێ بە هیچ شێوەیەك بێ بڕوایان بكەن بە دۆستو پەناگای خۆیان؛ چونكە بێ بڕوایان بە گشتی ئەزیەتی موسوڵمانان دەدەنو بەرەنگاری ئایینەكەیان دەكەنو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ﴾ ئەی گرۆهی خواناسان! ئەچن خوانەناسان لە جوولەكەو مەسیحیو هابەش پەیداكەرانو دووڕووەكان بكەن بە دۆستی خۆتان! هانا مەبەنە بەر ئەوانەی گاڵتەو قەشمەری بە ئایینەكەتان دەكەنو شەریعەتو یاسای ئایینەكەتانیان پێ گاڵتەو گەمەیە، بە هیچ جۆرێك ئەوانە مەكەنە سوێندخۆرو یارمەتیدەری خۆتان! چونكە كەسێك گاڵتەو گەمە بە شتێك بكا دیارە دژایەتیو بڕوای پێی نیەو دوژمنی پەیڕەوكارانیەتی، تەنانەت ئەگەر بە ڕواڵەت خۆشەویستیشیان نیشاندا ئێوە پێیان باوەڕ مەكەنو مەیانكەن بە دۆستو سوێندخواری خۆتان!

بێگومان ئیسلام لەگەڵ ئەهلی كیتابدا شێوە هەڵسو كەوتێكی بەكار هێناوە جیاوازە لە هەڵسو كەوت كردنی لەگەڵ كافرەكانی عەرەبدا، ئەوەتا: خواردنی خۆراكی ئەهلی كیتابی بە حەڵاڵ داناوە بۆ موسوڵمانانو مارە كردنی ئافرەتیانی بۆ حەڵاڵ كردوونو ناوی ئەهلی كیتابی لێناون، عەرەبە بێ بڕواكان بە (كوففار) یان (موشریك) ناو دەبا، چونكە ئەمان لەبەر بتپەرستییان لە شیركو كوفردا ڕۆچوونو كافریەتی تێیاندا ڕەگی داكوتاوە، بەڵام ئەهلی كیتاب كافریەتەكەیان ئەصڵ نیەو بەسەریاندا هاتووە!

﴿وَاتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! خۆتان بپارێزن لە سزای خودا، دۆستایەتی ئەوانە مەکەن کە بیروباوەڕتانیان بەلاوە گاڵتەو گەمەیە، مەیانکەن بە پەناگاو پشتیوانی خۆتان، ئەگەر ئێوە بەڕاستی بیروباوەڕ دامەزراووو رێزی بڕیارەکانی ئیسلام دەگرن‌و پابەندی سنوورەکانی یەزدانن‌و ئیمانتان پتەوە بەو ئایینەی کە ئەوان گاڵتەی پێ دەکەن! پشت بەو کۆمەڵە لە خودا یاخی بووە مەبەستن!!

هەروەها ﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا﴾ هەرکاتێ بانگبێژ بانگی موسوڵمانانی کرد بۆ نوێژ ئەو کەسانەی دۆستایەتیتانیان لێ قەدەغە کراوە کە ئەهلی کیتاب‌و کافرەکانی عەرەبن گاڵتە بە بانگدەرەکەو بانگەکە دەکەن ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَعْقِلُونَ﴾ ئەو گاڵتە کردنەیان بە ئایین‌و بانگەوازی بۆ کردنی بەهۆی ئەوەوەیە: کە مانای ئایین‌و خوداپەرستی نازانن، بێ عەقڵ‌و هۆشن، لەشەریعەت‌و یاسای خودا تێ ناگەن، ئەمە رەوشت‌و پیشەی شوێنکەوتووانی شەیتانە، کە گوێیان لە بانگ دەبێ روو وەردەگێڕن هەتا گوێیان لێ نەبێ!

ئەمجارە ئەی محمد! بکەوە گفت‌و گۆو موناقەشەیان لەگەڵدا بکە ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّا إِلاَّ أَنْ آمَنَّا بِاللّهِ﴾ بە ئەوانەی گاڵتە بە ئایینەکەتان دەکەن بڵێ: ئایا ئێوە ئەوە لە ئێمە دەکەن بە عەیب‌و لەکە؟ کە بڕوای راست‌و پتەومان بە خودا هێناوە؟! رەخنەی ئەوەمان لێ دەگرن کە بڕوامان بە خوداو پیغەمبەرانی هەیە؟! ﴿وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ هەروەها ئەوەمان لێ دەکەن بە لەکە کە ئیمانمان بەو قورئانە هەیە، کە نێردراوە بۆ سەرمان ﴿وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلُ﴾ هەروەها ئەو نامە ئاسمانیانەش کە لەوە پێش نێردراون بۆ سەر گەلەکانی تر، دەی ئەم بیروباوەڕەمان نابێتە عەیبە لێمان‌و شایانی رەخنە گرتن نیە ﴿وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ﴾ واتە: رەخنە گرتنتان لێمان لەبەر بڕوا راستی ئێمەو ئیمان هێنانمانەو لەبەر ئەوەشە کە ئێوە زۆربەتان لە ئایین دوورن‌و حەقیقەتی ئایین ئاگادار نین، ئەو ئایینەی هەشتانە بریتییە لە رواڵەتکاری‌و دەمارگیری‌و داب‌و نەریتی بۆش‌و بێ بایەخ!! ئەمجار پەروەردگار وەڵامی گاڵتە پێ کردنەکەیانی دایەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَلِكَ﴾ پێیان بڵێ: ئایا پێتان بڵێم: ئەی گاڵتەکەران‌و فیتنە

جۆیان: کە دەڵێن: پێمان وانیە ئایین لە ئایینی ئێوە خراپتر هەبێ! پێتان بڵێم چ کارێك لەوە خراپترە؟ هەواڵتان بدەمێ کێ خراپترە لە خاوەنی ئەو ئایینەی کە ئێوە رقتان لێیەو گاڵتەی پێ دەکەن؟ ﴿مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ﴾ لەبارەی تۆڵەو سزای خراپەوە لای خودا ﴿مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ﴾ ئەوە خراپەی ئەو کەسەیە کە خودا نەفرینی لێ کردووەو لە رەحمەتی خۆی دووری خستوونەوەو رق و خەشمی لێیانە، ﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ﴾ گێڕانەوەی لەو نامەردانە چەند مەیموون و بەرازێك چەندێکیانی لێ گۆڕین، لە روخساری ئادەمیزادییەوە کردنی بە مەیموون و بەراز ﴿وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ﴾ هەندێکیانی لێ کردن بە گوێرەکە پەرست و شەیتان پەرست و بت پەرست و ملهوڕ پەرست... هتد ﴿أُوْلَئِكَ شَرٌّ مَّكَاناً وَأَضَلُّ عَن سَوَاء السَّبِيلِ﴾ ئەوانەی کە ئەو رەوشتە ناشیرینانەیان هەیەو ئەوە هەڵوێست و بیرو باوەڕیانە، ئەوانە جێگایان خراپەو ئاکامیان شەڕەو رێگایان لێ گوم بووەو گومڕاو سەرگەردانن[1].

ئەمجار پەروەردگار حاڵ و چۆنیەتی دووڕووەکان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا جَآؤُوكُمْ قَالُوَاْ آمَنَّا﴾ ئەو دووڕووە جوولەکانە کەدێن بۆ لای ئێوە بە رواڵەت و بۆ سیاسەت دەڵێن: بڕوامان بە پێغەمبەرو بەو قورئانەش هەیە کە بۆی نێردراوە پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی ئەو شەریعەتەین! لەکاتێکا ئەوان ﴿وَقَد دَّخَلُواْ بِالْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُواْ بِهِ﴾ بە کافری هاتوون بۆ لای ئێوەو هەر بە بیروباوەڕی کافریەتییەوە چوونە دەرەوە، نەصیحەت و ئامۆژگاری ئێوە بۆیان تێفکرین و سەیرکردنیان لە هەڵس و کەوتی ئێوە هیچ کاری تێ نەکردوون، بیروباوەڕی کوفرو خیانەتیان نەگۆڕاوە، وا ئاوێتەی کوفرو گومڕایی بوون ئەو کاتەی هاتوونە لای تۆو ئەو کاتەی چوونە دەرەوە بیروباوەڕیان تۆزقاڵێك نەگۆڕاوە، لە کوفرو گومڕایی

---

[1] شایانی باسە وشەی (شر، اضل) کە ماناکەیان زێدەو پاساودانی تێدایە لێرەدا، لەسەر مانای خۆیان کە بابی (افعل التفضیل)ە نەهاتوون بەڵکوو وەکوو دەڵێن: بۆ موشاکە لەو مۆجارات لە بڕوای ئەواندا بەشێوەی (افعل التفضیل) هێندراون وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: {أَصْحَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا – الفرقان/٢٤}.

خۆیان نەهاتوونە خواریّ، ئەمە رەوشتێکی سەرەکی دووڕووەکانە: بە رواڵەت خۆ بە موسوڵمان‌و خواناس دەخەنە پێش چاوی موسوڵمانان‌و دڵیشیان بە کوفر داپۆشراوە، پیشەیان فرت‌و فێڵ‌و تەلەکەبازییە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویّ: ﴿وَإِذَا لَقُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ قَالُواْ آمَنَّا وَإِذَا خَلاَ بَعْضُهُمْ إِلَىَ بَعْضٍ قَالُواْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللّهُ عَلَيْكُمْ - البقرة/٧٦﴾ ئەوانە سەرسەری ئەبلەو نەزان‌و کەودەنن، چونکە ناتوانن نهێنی دڵیان لەخودا بشارنەوە ﴿وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكْتُمُونَ﴾ خودا لەخۆیان زاناترە بەنهێنی ناو دڵیان، زاناو خەبەردارە بەوەی لەدڵیاندا حەشاریان داوە، جا با ئەوان بە رواڵەت بە پێچەوانەی راستییەوە خۆ دەرخەن‌و چاوبەست لە خەڵك بکەن، دڵنیابن خودا زانایە بەهەموو نهێنییەك‌و (ئاگای لەمارو مێرو هەیە) لە خۆیان باشتر ئادەمیزادەکان دەناسیّ، لەسەر کردەوەکانیان بە تەواوی پاداش‌و سزایان دەداتەوە.

ئەمجار باسی ئیشی خراپتریان دەکاو دەفەرمویّ: ﴿وَتَرَى كَثِيرًا مِّنْهُمْ﴾ ئەتۆ دەبینی (ئەی محمد!) یان ئەی بیسەر! زۆربەی ئەو جوولەکەو دووڕووانەی: کە گاڵتە بە ئایینەکەی تۆ دەکەن‌و قەشمەرییان بە بانگ‌و بانگەوازیی ئیسلام دیّ ﴿يُسَارِعُونَ فِي الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ پەلە دەکەن لە ئەنجامدانی ئەو تاوانەی کە تێیاندا نوغرۆ بوون، هەمیشە بە کردەوەو بە گوتە خەریکی ئەنجامدانی ستەم کردن‌و سنوور بەزاندن‌و زیانگەیاندنن بە مەردووم‌و رێبازی ئیسلامی، دەست درێژی دەکەن بۆ سەر خەڵك، ئازاری هەزاران دەدەن، دژی ئایینی خوداو پەیڕەوکارانی دەدوێن ﴿وَأَكْلِهِمُ السُّحْتَ﴾ هەروەها پەلە دەکەن بۆ خواردنی شتی حەرام‌و نامەردانە، کۆ لە هیچ شتێکی حەرام - کردەوە بیّ یان گوتە - ناکەنەوە، هەرشتێك زیانی دین‌و دونیای تێدابیّ ئەوان ئەنجامی دەدەن، تا بینە قاقایان لە تاواندا نوغرۆبوون، هەر کارێکی حەرامیان بۆ هەڵ بکەویّ خێرا دەیقۆزنەوەو بە بست بەسەریەوە ناچن‌و بە قوتاری نادەن ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ بەڕاستی خراپ کردەوەیەکە، ئەو ئیشەی: کە ئەوان دەیکەن! هەرشتێك رەوشت تێك بداو ژیان تاڵ بکاو کۆمەڵگا بشێوێنیّ ئەوان تێیدا دەست رەنگینن، هاوار بۆ کۆمەڵگایەك کە نموونەی ئەوانەی تێدا باڵا دەست‌و کاربەدەستە، بەدبەخت ئەو گەل‌و نەتەوەیە:

کە ئەو جۆرە کەسانەی تێدا هەن‌و کەس نیە بەرگرییان بکاو جڵەوگیرییان لێ بکا، ئامۆژگارییان بکا، بۆچی زاناو رۆشنبیرو پیاو ماقوڵ‌و مەلاکانیان لێیان ناکەونە خۆو بەر پەرچییان نادەنەوە؟ بۆچی فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لە خراپە وەکوو پێویست ئەنجام نادەن؟؟ بۆنەوەی گرۆو تاقمی شەڕ خوازو روخێنەری ئاوا پەیدا نەبن ﴿لَوْلاَ يَنْهَاهُمُ الرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ﴾ بۆچی رەبەن‌و پیاو چاک‌و مەلاکانیان نەهییان لێ ناکەن‌و ئەو خراپەکارییەیان قبوول دەکەن؟ بۆچی زاناو رۆشنبیرەکانیان جڵەوگیرییان لێ ناکەن ﴿عَن قَوْلِهِمُ الإِثْمَ﴾ لەوتەی درۆو بوختان‌و گاڵتەکردن بە ئایینی ئیسلام ئاوا جڵەوی خراپەکارییان بۆ شل دەکەن؟ ﴿وَأَكْلِهِمُ السُّحْتَ﴾ بۆ رێگەیان دەدەن ئاوا حەرام خۆری‌و بەرتیل کاری لەناویاندا بڵاوببێتەوە؟ بۆچی نارەزایی خۆیان بەرامبەر ئەو کردەوە ناشیرینانەیان دەرنابڕن؟ بۆچی فەرمان بە چاکەو جڵەوگیری لەخراپەیان پاشگوێ خستووە؟ ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ﴾ بەڕاستی کارێکی خراپە ئەوەی کە ئەو بەناو زاناو پیاو چاک‌و رۆشنبیرانەیان دەیکەن! هەڵوێستێکی نا مەسئولانەیان هەیە کە ئەوەندە بە کارامەیی‌و لێزانی‌و ساختەچییەتی خۆیان لەکاری پیرۆزی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە دزیوەتەوە! ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لە قورئاندا لەم ئایەتەی هەڕەشە ئامێزتر تێدانیە، کە ئاوا سەرزەنشتی زانایان بکا؛ ئەمە لۆمەیەکی توندو تیژە بۆ عولەماو ئامۆژگاری کەران کاتێك کەمتەرخەمی بکەن لە بانگەوازی‌و ئامۆژگاری کردنەکەیاندا، واز لە جڵەوگیری کردن بێنن لەو خراپەو خراپە کاریانەی کە کۆمەڵگا دەشێوێنن، تاك‌و کۆمەڵ تێك دەدەن!! ئەرکی سەرشانی زاناو رۆشنبیران‌و کاربەدەست‌و لێپرسراوانە کە لەم سەر کۆنە کردنەی: کە ئاراستەی زاناو مالمەکانی جوولەکە کراوە کەڵك وەربگرن‌و بزانن: ئەمە ئامۆژگاری‌و هەڕەشەیە بۆ هەمووانە، نەك هەر بەتەنیا بۆ ئەوان‌و بەس.

**ناشیرینترین قسەو بوختانی جوولەکەو، دوژمنایەتی ناوخۆیان، پاداشی ئیمانو باوەڕیان**

﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۚ وَأَلۡقَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ٱللَّهُۚ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ (٦٤) وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَكَفَّرۡنَا عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ (٦٥) وَلَوۡ أَنَّهُمۡ أَقَامُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ لَأَكَلُواْ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ مِّنۡهُمۡ أُمَّةٞ مُّقۡتَصِدَةٞۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ سَآءَ مَا يَعۡمَلُونَ (٦٦) ﴾.

پاش ئەوەی یەزدان بڕێ هەڵویستو کرداری جوولەکەکانی باس کرد، وەکوو پەلەکردن لە ئەنجامدانی کاری خراپو خواردنی ماڵی حەرام، ئەمجار باسی ناشیرین ترین ڕەوشتو هەڵوێستیان دەکا ئەویش ئەوەیە کە جورئەت دەکەن سیفەتی بەخیلی وەپاڵ خودا بدەن! کە هیچ هۆشمەندێك قسەی وا نابەجێ ناکاو زاتی ناهێنێ بوختانی ئاوابکا.

طەبەرانیو ئیبنو ئیسحاق لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێ: پیاوێك لە جوولەكە ناوی نەبباشی كوڕی قەیس بوو وتی خودا بەخیلەو بەخشندە نیە![1] ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، كە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللّهِ مَغْلُولَةٌ﴾ جوولەكەكان دەڵێن: خودا دەستی وا لە كۆتو كەلەپچەدایە، بەهۆی ئەوە تووشی دەست قوچاویو چروكی بووە! كاتێك بە هۆی بڕوا نەكردنیان بە پەیامی پیغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) تووشی دەست كورتیو كێشەی سامانی بوون هەندێكیان (ئەم شەكرمیان شكاند) نەك هەموویان بەڵام وتەكە وەپاڵ هەموو گەلەكە دراوە، چونكە نەتەوە هاریكاریو تەكافولی ئیجتیماعی هەیە لە ناویانداو ئەم جۆرە قسانە سەرچاوە لە بیروباوەڕی گشتی ناویان هەڵ دەگرێ، بۆیە ئەگەر یەكێكیان كردەوەیەكی كرد پاڵ هەموو نەتەوەكە دەدرێ! ﴿غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾ دەستی خۆیان كەلەپچە كرێو خێر لە دەستیان نەبێتەوە، خۆیان رژدو چروكن بەهۆی ئەو قسە نابەجێیەیان: مێژووش دەری خست كە تا ئێستا هیچ نەتەوەیەك نەبووە بە ئەندازەی جوولەكە بەخیلو چروك بن. یان دەگونجێ وشەی (غل) لەسەر مانای خۆی بێ، ماناكە ئەوە بێ كە دووعایان لێ بكا بڵێ: هەمیشە دەست بە كۆتو زنجیر بن، لە دونیادا ژێردەستەو دیلو چەوساوە بن، لە قیامەتیشا لە دۆزەخدا كۆتو زنجیری ئاگرو ئاسنیان لەدەست بكرێ. ئەمجار پەروەردگار بیروبۆچوونەكەیان رەت دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ بەڵكوو یەزدان دەستی بەخششی هەمیشە كراوەو پەخشایندەیە، دەرگای خەزێنەی رەحمەتی فراوانو كراوەیە ﴿يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاء﴾ دەبەخشێ چۆنی بوێ، گەنجینەی هەموو شتێك لای خۆیەتی، هەموو نیعمەتێك دروستكراوی ئەوەو لە ئەوەوەیەو بەس، تاكو تەنیاو بێ هاوتایە، رزقو رۆزی گیانلەبەران هەمووی بە دەستی ئەوە، وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ

---

[1] ـ ئەبو شەیخ ئیبنو حەییان لە رێگەیەكی ترەوە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی (فەنحاص)ی سەرەك خێڵی بەنو قەینوقاع هاتۆتە خوارێ عەكرەمەش هەروا دەڵێ.

اللَهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ – إبراهيم/٣٤﴾. ئەمجار کاریگەری قورئان لەسەریان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾ دڵنیابەو بزانە: ئەو قورئانەی بۆتۆ نێردراوە، ئەو نیعمەتو فەضلەی بە تۆ بەخشراوە، گومڕایی‌و کوفر بۆ ئەوان زیاد دەکا؛ لە کاتێکدا موسوڵمانان بڕوایان پێی پتەو دەبێ‌و کرداری باشی پی زیاد دەکەن، زانستی بە سوودی لێ وەردەگرن، کافرو جوولەکەکان حەسوودانی خۆت‌و گەلەکەت، گومڕایی‌و کوفری پێ زیاد دەکەن‌و پتر سەرلێ شێواوو یاخی دەبن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ – فصلت/٤٤﴾ یان دەفەرموآ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَارًا – الإسراء/٨٢﴾ لەکاتێکا قورئان رەحمەت‌و شیفای دڵی موسوڵمانانە دەبێتە مایەی گومڕایی‌و نەگبەتی بۆ کافرەکان.. سزاو تۆڵەی خودا لە پاساوی ئەو هەموو تاوان‌و قسە ناشیرینانەیان زۆرو هەمە جۆرن بە گوێرەی کردەوەکانیان سزایان دەداو تۆڵەیان لێ دەستێنێ لە دونیاو قیامەتدا ﴿وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ خستوومانەتە نێوان کۆمەڵانی جوولەکەو گاورانەوە دوژمنایەتی‌و دژایەتی کردنی یەکتری، هەر کۆمەڵێکیان دژی کۆمەڵێکی تریانە، هەرگیز دانویان پێکەوە ناکوڵێ‌و پەیوەندی دۆستایەتیان لە نێواندا نیە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى – الحشر/١٤﴾. مێژووی کۆن‌و نوێیش ئەو راستییەی چەسپاندووەو گەلێ بەڵگەو رووداوی شەڕی چینایەتی‌و شەڕی ئایینی‌و شەڕ داگیرکەرەکانیانی لە دوو توێی خۆی گرتووەو گەواهی ناکۆکی‌و پچڕپچڕی ناو کۆمەڵانی مەسیحی‌و جوولەکە دەدەن، بەوەش هەڵمەخەڵەتێ: کە ئێستا لەسەر داگیر کردنی خاکی فەلەستین یەکیان گرتووە، ئەوە شتێکی کاتییەو بەرقەرار نابێ! ﴿كُلَّمَا أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللّهُ﴾هەرکاتێ بیانەوێ فرت‌و فێڵ لە پیغەمبەرو موسوڵمانان بکەن، فیتنە بەرپا بکەن‌و شەڕ هەڵگیرسێنن، دوژمنایەتی بخەنە نێوان گەل‌و نەتەوەکانی ترەوە، ئاگری شەڕ خۆش بکەن، لە دەرەوەو ناوەوە خودا ریسوایان دەکاو فرت‌و فێڵەکانیان بۆخۆیان دەگەڕێتەوە، جا یان هەوڵ‌و تەقەلاکانیان بێ سوود دەبن، یاخود

موسوڵمانانیان بەسەردا زاڵ دەکا! لە پەڕاوەکانی مێژووی ئیسلامو لە کتێبەکانی سیرەدا زۆر لەو باسانە هەیە کە جوولەکەکان موشریکەکانیان هەڵ دەنان بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر پیغەمبەرو هاوەڵانی؛ هەیان بوو رۆمەکانی هەڵ دەنان بۆ ئەوەی پەلاماری موسوڵمانەکان بدەن، هەیان بوو پەنای دەدا بە دوژمنی موسوڵمانەکانو دەیحەواندەوەو یارمەتی دەدان وەکوو کەعبی کوڕی ئەشرەف!! هۆی سەرەکی ئەم دژایەتییە حەسوودیو دەمارگیری بوو هەروەها زاناو رەبەنەکانیان ترسی ئەوەیان هەبوو: کە بە هۆی بڵاوبوونەوەو سەقامگیر بوونی ئایینی ئیسلامو سەرکەوتنی؛ ئەو ئیمتیازاتە ئایینیو عیلمییانەی پێوەی ناسرابوون لە وڵاتی حیجازدا لە کیسیان بچێ! کەوابوو: دوژمنایەتیان بۆ موسوڵمانان دوژمنایەتییەکی سیاسیو رەگەزایەتی بوو، دژایەتییەکی هەڵقوڵاو لە ئایینەوە نەبوو، بۆیە لە دواییدا لە وڵاتی شامو ئەندەلوسدا جوولەکەکان پەیوەندیەکی باشیان لەگەڵ موسوڵمانەکاندا پەیدا کرد، دوای ئەوەی کە دادپەروەرییان لێ بینینو ئەو ستەمو ئازارەی لە رۆمەکانەوە پێیان دەگەیی موسوڵمانەکان لایان بردوو مرۆڤانە لەگەڵیاندا جووڵانەوە، هەروەها دوژمنایەتی نەصرانیەکان بۆ موسوڵمانەکان لە چەرخی یەکەمی ئیسلامیدا رامیاری بوو نەك ئایینی، ئەم دژایەتییە لە نێوان موسوڵمانەکانو رۆمە داگیرکەرەکانی وڵاتی شامو میصردا توندتر بوو، مەسیحییە دانیشتووەکانی ئەم ناوچانە مەیلیان زیاتر بەلای موسوڵمانەکانەوە هەبوو، بە تایبەتی کە زۆر زەبرو زەنگیان لە رۆمەکانەوە پێ گەیشتبوو، گەلێك ستەمیان لێ کرد بوونو بتمانەشیان بە دادپەروەری موسوڵمانەکان پەیدا کردبوو، ئەمەش دیاردەیەکی روونی ناو ئادەمیزادە، هەمیشەو چاویان لە بەرژەوەندی خۆیانەو لە روانگەی ئەو بەرژەوەندییانەوە پەیوەندیەکانیان جۆش دەدەن! کەوابێ پێویستە ئەو دژایەتیە نەکەین بە صیفەتێکی زاتی بۆ خۆیان، یان بۆ ئایینەکەیان، جا باخوێنەر چاوەڕوانی بکا کە پاش چەند ئایەتێکی تر پەروەردگار بۆخۆی شایەدی ئەوە دەدا کە مەسیحییەکان نزیکترین گەلو نەتەوەن لە بارەی خۆشەویستیو دوستایەتی کردنی موسوڵمانانەوە، ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێ کە دژایەتییەکە دژایەتییەکی رامیاریو

سیاسییەو هەڵقوڵاوی ئایین نیە. ﴿وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا﴾ واتە: ئەو جوولەکانە کە دژایەتی پیغەمبەرو هاوەڵانی دەکەن، ئاگری شەڕو فیتنەیی هەڵ دەگیرسێنن، ومنەبێ مەبەستیان راست کردنەوەی ئەخلاق‌و رەوشت بێ، یان بۆ بەرژەوەندی وڵات‌و ئاوەدان کردنەوەی بێ، بەڵکوو مەبەستیان دژایەتی کردن‌و بڵاوکردنەوەی فەسادو بەدڕەوشتییە، دەیانەوێ موسوڵمانان یەك نەگرن‌و لە نەزانییەوە نەگوێزنەوە بۆ ژێر رۆشنایی عیلم‌و زانست لە بت پەرستییەوە نەبنە یەکتاپەرست هەوڵ دەدەن فێڵ‌و تەڵەکە لە موسوڵمانان بکەن، گومان بخەنە بیروباوەڕیانەوە، حەسوودیان پێ دەبردن، حەزیان لێ بوو ئیمتیازات‌و بەرژەوەندیەکانیان بەردەوام بێ ﴿وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾ پەروەردگار هەرگیز فەسادکارانی خۆش ناوێن، کردەوەکانیان باش ناکاو هەوڵ‌و کۆششەکانیان سەرکەوتوو ناکا، چونکە ئەوان دژایەتی حیکمەتی خودا دەکەن کە دەمیەوێ ئادەمیزادان رێك‌و پێك بن، وڵات ئاوەدان بکەنەوە، بۆیە پەروەردگار هەموو پیلان‌و فرت‌و فێڵێکی ئەو ناحەز بە ئیسلامانەی پووچ کردەوە، موسوڵمانەکان کە یەکیان گرت‌و بەهۆی ئیسلامەوە حاڵیان باش بوو، حاڵی کەسانی دیکەشیان باش کرد، لە هەر وڵات‌و هەرێمێك کە ئەوان تێیدا باڵا دەست بوون، زەوییان ئاوەدان کردەوە، بەڵام فەرمانڕەواکانی گەلانی تر وێرانکەرو ستەمکار بوون؛ بەڵێ ئیسلام فەرمان بە پەیڕەوکارانی دەکا راستاڵ‌و رێکخەر بن بە باشترین شێوە، ئەمەش رەوشتێکە خودا خۆشی دەوێ جا کە موسوڵمانان بەم ئەرکە پیرۆزەیان هەستان‌و پەیڕەوی ئایینی ئیسلامیان کرد، خوداش یارمەتی دان‌و بەسەر هەموو دوژمنانیاندا سەری خستن!

هەروەها تەورات‌و ئینجیلیش بۆ هیدایەتی ئادەمیزاد هاتوون، بۆ راستاڵ کردن‌و ریکخستنی ئادەمیزاد نێردراون، پەیڕەوکارانیان بۆیە لەو رۆژگارانەدا بوون بە موفسید، چونکە وازیان لە شوێنکەوتنیان هێنا، وەکوو چۆن لەم رۆژگارانەدا موسوڵمانان وازیان لە شوێنکەوتنی قورئان هێناوەو روویان وەرگێڕا لەو ئامۆژگارییانەی ئاراستەی ئادەمیزادانی دەکا؛ ئیتر تەختی بەختیان وەرگەڕاو دوژمن بەسەریاندا زاڵ بوو، بوونە ژێردەستەی بێگانەو وڵاتیان داگیر کرا! بەڵام

وێــرای ئــەو خراپەکاریانـــەیان پــەروەردگار دەرگـــای تۆبـــەو گەڕانـــەوەی لێ دانەخـستبوون، بـەڵکوو بـە خۆیانـدا بـچنەوە، واز لـە تاوانکـاریی بهێـنن، وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُواْ وَاتَّقَوْاْ﴾ ئەگـەر ئـەهلی کیتـاب بـڕوای ڕێـك‌و پێکیـان بـە خـوداو بـە پیغەمبـەر بکردایـەو پابەنـدی فـەرمان‌و جڵەوگیرییـەکانی قورئان بوونایە، خۆیان بپارستایە لەو تاوانانـەی کە ئاوێتـەی بـوو بـوون وازیـان لێ بهێنانایە ﴿لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ﴾ تاوانـەکانیانمان ڕەش دەکـردەوە لـە تۆڵەی ئـەو گوناهانــەی ئــەنجامیان داون  خــۆش دەبــووین ﴿وَلأدْخَلْنَـــاهُمْ جَنَّـــاتِ النَّعِـــيمِ﴾ دەمانخستنە ناو بەهەشتی ڕازاوەو خۆشـەوە! بۆخۆیـان تێیـدا خۆشـیان بچێشتایە! ناخۆشیمان لەسەر لادەبردن‌و خۆشی‌و کامەرانیمان دەدانێ! خۆ ﴿وَلَـوْ أَنَّهُـمْ أَقَـامُواْ التَّـــوْرَاةَ وَالإِنجِيـــلَ﴾ ئەگـەر ئــەهلی کیتـاب گۆڕانکارییــان لـە تــەورات‌و ئینجیلـدا نەکردایـەو چـۆن لـە خـوداوە بۆیـان هـاتوون ئـاوا بیـان پاراسـتنایەو کاریـان پــێ بکردنایەو پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانیان بوونایە کـە هەنـدێ لـە دەقـەکانیان جەخت کردنە لەسەر یەکتاپەرستی‌و موژدەدانە بە هاتنی پیغەمبەری ئاخر زەمان ﴿وَمَـا أُنـزِلَ إِلَـيهِم مِّـن رَّبِّهِـمْ﴾ هـەروەها بڕوایـان بـە قورئـان بێنایـەو کاریـان پـێ بکردبایـەو شـوێن ڕێبـازی پیغەمبـەر بکەوتنایـە ﴿لأَكَلُـواْ مِـن فَـوْقِهِمْ وَمِـن تَحْـتِ أَرْجُلِهِـم﴾ پــەروەردگار ڕزق‌و ڕۆزیــی بــۆ گوشـاد دەکــردن‌و لــە ئاسمانــەوە بـاران‌و بەرەکەتی بۆ دەباراندن‌و زەویـش خێـرو خێراتـی بـۆ فەراهـەم دەهێنـان، بـە تێـرو تەسەلی لە بەروبوومی جۆراو جۆریان دەخوارد، لە هەموو لایەکەوە ڕزق‌و ڕۆژییـان بەسەردا دەباری! وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَلَـوْ أَنَّ أَهْـلَ الْقُـرَى آمَنُـواْ وَاتَّقَواْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـاتٍ مِّـنَ الـسَّمَاء وَالأَرْضِ - الأعـراف/٩٦﴾ ئیبنـو عـەباس دەفـەرموێ: ﴿لأَكَلُواْ مِن فَـوْقِهِمْ﴾ یـانی ئاسمـان بـارانی تـەواوو لـە کـاتی خۆیـدا بـۆ دەباراندن ﴿وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم﴾ یانی زەوی بەرەکەتی خۆی بۆ دەردەخستن.

جا وەنـەبێ ئـەهلی کیتـاب هـەموویان یـەك هەڵوێـست‌و یـەك بیروباوەڕیـان هـەبێ، بـەڵکوو لـە کـردەوەو بـاوەڕدا جیاوازییـان لـە نێوانـدا هەیـە؛ ﴿مِّـنْهُمْ أُمَّـةٌ مُّقْتَصِدَةٌ﴾ تاقمێکیـان هەیـە میانـەڕەوو ڕاسـتاڵ‌و خوداپەرستن، وەکوو عەبـدوڵڵای

کوڕی سەلامو هاوەڵانی لە جوولەکە، یان وەکوو نەجاشیو هاوەڵانی لە مەسیحییەکان ﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾ زۆربەی زۆریشیان لە سنووری ئایین دەرچوونو هەڵوێستو کردەوەو گوفتاریان نامەردانەو فیتنە ئامێزو گومڕاییە.

زۆر ئایەتی تر هەن ئەوە دەچەسپێنن کە بڕێ لە ئەهلی کیتاب میانەڕەوو ڕاستاڵنو وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ – الأعراف/١٥٩﴾ یان دەربارەی شوێنکەوتوانی عیسا دەفەرموێ: ﴿فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ – الحديد/٢٧﴾.

بەڕاستی ئەو جوولەکانە گەلێکی سەیرو سەمەرە بوون، کردەوەی خراپ نیە نەیانکردبێ، زیانیان بە هەموو کەس گەیاندووە بەڵکوو پیغەمبەرانیش لە دەستیان رزگاریان نەبووە، چەند پیغەمبەریان بە شێوەی درندەیی شەهید کردووە، تەنانەت لە خوداش رازی نەبوون! چەند صیفەتی ناشیرینو نەگونجاویان وەپاڵ داوە!

## فەرمانی پەروەردگار بە پیغەمبەر بە گەیاندنی پەیامەکەیو بانگەوازی کردنی خاوەن نامەکان بۆ ئیمان هێنان بە پیغەمبەر

﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا

وَكُفْرًا فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَىٰ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾

لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی روون کردەوە: کە زۆربەی زۆری ئەو خەڵکە فاسقو گومڕاو یاخینو کەمێکیان خودا پەرستو راستاڵن، لەم ئایەتانەی دواییدا فەرمان دەکا بە پیغەمبەر کە گوێ بە زۆریی گومڕاو لەخودا یاخی بووەکان نەدا، لە فرتو فێڵو پیلانەکانیان نەترسێ، بانگەوازی خۆی رابگەیەنێو نهێنیو کارە ناشرینەکانی ئەهلی کیتابو کافران بخاتە روو، چونکە خودا دەیپارێزێ لە فرتو فێڵەکانیانو ناتوانن زیانی پێ بگەیەنن.

ئەبوو شەیخ "ئەبو حەییان" لە حەسەنی بەصرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیغەمبەر (صَلّی اللهُ عَلیهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: پەروەردگار منی بە پەیامێکەوە ناردو ئەرکێکی خستە سەر شانم کە بە تەواوی تینم بۆ هاتو ترسامو زانیم کە خەڵك بەرۆم دەخەنەوە، ئیتر خودای مەزن ئەوەی پێ راگەیاندم کە پەیامەکەم دەگەیەنم بە تەواوی یان سزام دەدا، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەی پیغەمبەری رەوانەکراو! ئەو پەیامەی بۆت نێردراوە بە تەواویو دەست بەجێ بیگەیەنە بەو خەڵکەو دوای مەخە؛ لە کەسیش مەترسێ، هیچ کەس ناتوانێ زیانت پێ بگەیەنێ! پیغەمبەر (صَلّی اللهُ عَلیهِ وَسَلّمَ) ئەرکی سەرشانی خۆی بە ئەوپەڕی لێبوردوویییەوە رەدام هێنا، بە باشترین شێوە پەیامی خۆی راگەیاند.. ئیمامی بوخاری لە کاتی تەفسیر کردنی ئەم ئایەتەدا لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عائیشە فەرموویەتی: هەر کەسێك بۆی

گێڕایەوە کە پیغەمبەر شتێکی لە پەیامەکەی شاردۆتەوەو نەیگەیاندووە درۆ دەکا! ئیمامی موسلیم‌و تیرمذی‌و نەسائیش هەمان ریوایەتیان کردووە!

لە صەحیحەیندا دووبارە لەخاتو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: ئەگەر پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیویستایە لە پەیامەکەی شتێك بشارێتەوە ئایەتی ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ – الأحزاب/٣٧﴾ی دەشاردەوە کە دەربارەی مارەکردنی زەینەب هاتۆتە خوارێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە موجاهیدەوە نەقڵ دەکا دەڵێ: کاتێك ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ هاتە خوارێ پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رووی کردە بارەگای یەزدان‌و فەرمووی: خودایە! من چی بکەم ئەمن بە تاقە کەسی‌و ئەوان زۆرن، گەلە کۆمەکیم لێ دەکەن! ئیتر ئەمە هاتە خوارێ: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ﴾ ئەگەر دەست بەجێ ئەو قورئانەی بۆت نێردراوە بەبێ ترس بە خەڵکی نەگەیەنی، ئەوە ئەو ئەرکەی خراوەتە سەرشانت بە رێك‌و پێکی ئەنجامی نەدەی، بەم جۆرە شتێکی لێ بشاریتەوە با بۆ ماوەیەکیش بێ ئەوە ئەرکی پیغەمبەرایەتی خۆت ئەنجام نەداوەو پەیامی خۆت نەگەیاندووە!!

حیکمەت لە فەرمان کردن بە پیغەمبەر کە پەیامەکەی بگەیەنێ‌و جەخت کردنەوە لەسەر فەرمانەکە کە دەفەرموێ: ئەگەر هەندێکی لێ بشاریتەوە وەکوو ئەوە وایە: هەموویت شاردبێتەوەو ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام نەدابێ، لە کاتێکدا پیغەمبەران دوورن لە تاوان‌و سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا! پارێزراون لەوەی بەشێك لە پەیامی بۆ لا نێردراویان پاشگوێ بخەن، مەبەستەکە ئەوەیە: کە لە پیغەمبەر بگەیەنێ کە راگەیاندنی پەیامی خودا ئەرکێکی پێویست‌و جەخت لەسەر کراوە، بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ پیغەمبەر بە ئیجتیهادی خۆی هەندێکی لێ دوا بخات بۆ ماوەیەك، بەڵکوو پێویستە دەست بەجێ‌و بێ سێ‌و دوو پەیامەکە بگەیەنێ! پێویستە موسوڵمانانیش ئەم حەقیقەتە بزانن‌و تێیدا نەکەونە راجیاییەوە جا بۆیە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر نیگایەکی بۆ بهاتایە دەست بەجێ رای دەگەیاند‌و بۆ خەڵکەکەی شی دەکردەوە.

بوخـاری دەفـەرموێ: ئیمـامی زوهـری فەرموویـەتی: (نـاردنی پـەیام لـە خوداوەیە، لەسەر پیغەمبەر گەیاندنە، لەسەر ئێمە پابەند بوونە پێوەی) نەتـەوەی موسوڵمان تێکڕا شایەدی ئەوە دەدەن، کە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پـەیامی پێ سپێردراوی بە ئەوپەڕی لێهاتووییەوە گەیاندووە، ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام داوە، لە گەورەترین کۆبوونەوەیدا لەگەڵ موسوڵمانان لـە حـەجی ماڵئـاواییدا کـە نزیکەی چل هەزار لە هاوەڵانی ئامادە بوون، لە وتارە گرنگەکەیـدا، ئـەو راسـتییەی دووپات کردەوەو فەرمووی: «أيها الناس انكم مسؤلون عني، فما أنـتم قـائلون» وتیـان شایەدی دەدەین: کە تۆ پەیامی خۆت گەیاندووەو ئـەرکی سەرشـانی خۆتـت ئـەنجام داوەو ئامۆژگاری ئێمەت کردووە، ئیتر پیغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پەنجـەی موبارەکی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان‌و بۆ لای ئـەوانی رادەداشـتەوە دەیفـەرموو «اللّٰهُـمَّ هَلْ بَلَّغْتُ».

ئیمـامی ئەحمـەد لـە ئیبنـو عەبباسـەوە دەڵـێ: پیغەمبـەر لـە حـەجی ماڵئـاواییدا فـەرمووی: «يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ، أَيُّ يَـوْمٍ هَـذَا؟» وتیـان رۆژێکـی پـیرۆزو ئاشتیخوازو شەڕ تێیدا یاساغ کراوە، ئەمجار فەرمووی: «أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟» وتیان: شاری حەرامە، واتە: شـەڕ تێیـدا یاسـاغە.. فـەرمووی: «فَـأَيُّ شَـهْرٍ هَـذَا؟» وتیـان: مـانگی حەرامـە.. شـەڕی تێـدا قەدەغەیـە. ئـەمجار پیغەمبـەر فـەرمووی: «فَـإِنَّ دِمَـاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِـي بَلَـدِكُمْ هَـذَا فِـي شَـهْرِكُمْ هَذَا» چەند جارێك ئەم رستانەی دووبارە کردنەوە ئەمجار پەنجەی هـەڵبڕی بـۆ لای ئاسمـان‌و فـەرمووی: «اللّٰهُـمَّ هَـلْ بَلَّغْـتُ» چـەند جارێـك ئەمـەی وتـەوە ئـەمجار فەرمووی: «أَلاَ فَلْيُبْلِغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّـارًا يَـضْرِبُ بَعْـضُكُمْ رِقَـابَ بَعْضٍ».

ئـەمجار پـەروەردگار پـشتگیریی‌و کەفالـەت‌و زامنـی خـۆی بـۆ پیغەمبـەر رادەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ خودا لە پیلان‌و هەوڵدانی ئەو خەڵکە خوانەناسە دەتپارێزێ‌و ناهێڵێ دوژمنانت لێت بە مەرام بگـەن‌و زەفـەرت لێ بێـنن، بێگومـان موشـریکەکان چـەند جارێـك هـەوڵی تـیرۆر کردنیـان داوەو لـە

(دارالندوة)دا بە تایبەتی پاش مردنی ئەبو طالیب، بەلام خودا پاریزگاری کردو پیغەمبەر (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمْ) کۆچی کرد بۆ مەدینەو لە دەستیان رزگاری بوو، هەروەها جوولەکەکان چەند جارێك پاش کۆچ کردنی بۆ مەدینە هەولی تیرۆر کردنیان داوەو بەلام هەولەکانیان بێ سوود بووەو پیلانەکانیان پووچەل بوونەوە!! مەبەست بە پاراستنەکەی پاراستن لە تیرۆر کردنە، کەوابێ رەخنە ناگیرێ بەوەی کە پیغەمبەر لە کافرەکانی مەککەوە تووشی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجە بووە لە مەککە، لە طائیف، پاش کۆچ کردنیشی بۆ مەدینە لە جەنگی ئوحوودا دانی شکاو روخساری بریندار بوو!!

تیرمذیو ئەبوو شەیخ "ئیبنو حەییان" و حاکمو ئەبوو نەعیم بەیهەقی لە کۆمەلێك لە هاوەلانەوە دەگێڕنەوە، دەلێن: پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیغەمبەر لە مەککە پاسەوانی هەبوون، عەبباسی مامی یەکێك بوو لەوانەی کە پارێزگاری لێ دەکرد، کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، ئیتر پاسەوانەکانی جواب کردن، دەگێڕنەوە دەلێن: ئەبوو طالیب عادەتی وا بوو: پیغەمبەر (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمْ) بۆ هەرشوێنێك بچووبایە پاسەوانی لەگەلدا دەناردن، کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ فەرمووی: مامە خودا پارێزگاریم دەکا، ئیتر پێویستم بە پاسەوان نیە.

ئەنەس (رَضِیَ اللهُ عَنْهُ) دەلێ سەعدو حوزەیفە تا هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پاسەوانی پیغەمبەریان (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسلمْ) دەکرد کە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ پیغەمبەر (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمْ) سەری موبارەکی لە پەنجەرەکەوە دەرهێناو فەرمووی: ئەی خەلکینە! ئێوە بڕۆنەوە، پێویستم بە پاسەوان نیە، خودا خۆی دەمپارێزێ، هەندێك دەلێن: ئەم ئایەتە دوو جار هاتۆتە خوارێ؛ جارێك لە مەککە جارێکیش لە مەدینە هەندێکیش دەلێن: ئایەتەکە مەککەییەو یەك جار نازل بووە، بەلام لە سیاقی تەبلیغ کردنی ئەهلی کیتابدا هێندراوە کە پێ راگەیاندنی ئەهلی کیتاب لە مەدینە بوو، تا ئەوە بگەیەنێ کە پیغەمبەر (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَمْ) هەر وەکوو تووشی ئەزیەتو ئازاری کافرەکانی مەککە بووە، تووشی ئەزیەتو ئازاری ئەهلی کیتابیش بووە، پەروەردگار لە هەردوو تاقمو گرۆکان پاراستیو لە ماوەی (٢٣) سالدا نەیان توانی فرسەتی لێ بێنن.

دیـاره کـه ئایەتەکـه مانایـەکی گـشتی تـری هەیـە؛ ئـەویش ئەوەیـە کـە دەفـەرموێ: ئـەی فرسـتادەو رەوانـەکراو! ئـەتۆ پـەیامی خـۆت بگەیەنـە، تـۆ هـەر راگەیاندنت لەسەرە، هیدایەتو گەیاندن بە مەبەست بەدەست خودایـە، وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿لَّـيْسَ عَلَيْـكَ هُـدَاهُمْ وَلَكِـنَّ اللّـهَ يَهْـدِي مَـن يَـشَاء – البقرة/٢٧٢﴾، یان دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ – الرعـد/٤٠﴾، ئـەمجار پـەروەردگار هۆکـاری پاراسـتنەکەی دیـاری دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللّـهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ بێگومان خودا هیدایەتی گرۆی کافرو بێ دین نادا، پـشتگیری ئەوانە ناکا کە هەوڵی تیرۆر کردنی تۆ دەدەن...

ئـەمجار خـودای گـەورە راسـتییەکی تـر بـۆ ئـادەمیزادان روون دەکاتـەوەو، راستییەکی گرنگ بۆ ئەهلی کیتابو موسوڵمانان رادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿قُـلْ يَـا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَى شَيْءٍ حَتَّىَ تُقِيمُـواْ التَّـوْرَاةَ وَالإِنجِيـلَ﴾ ئـەی محمـد! بـە ئـەهلی کیتاب – جوولەکەو مەسیحی – بڵێ: ئێوە لەسـەر ئایینێك نـین کە پەسـەند بـێ هەتا پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییـەکانی تـەورات نـەبنو بـە کـردەوە جێبـەجێیان نەکەن کە بریتییە لە یەکتاپەرستیو کردەوەی چاك: کـە برێـك لـە فەرمانـەکانیان بڕوا کردنە بە پەیامی ئیسلامو شوێنکەوتنی شەریعەتی (محمد)و بـڕوا هێنـان بـە پیغەمبەرایەتیەکەیو، ﴿وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾ هەروەها پەیڕەوی ئـەو قورئانـە بکەن. کە لە خوداوە نێردراوە بـۆ ئێـوەو هـەموو ئـادەمیزاد بـە گـشتیو تـا کۆتـایی دونیا، ئەو قورئانەی کە بەرنامەو پرۆگرامی خودایە بۆ ئادەمیزاد، پاڵفتەی هەموو کتێبە ئاسمانیەکانی پێشووە، تەواوکەری ئایینەو نێردراوە بـۆ پیغەمبـەری ئیـسلام (صَلَى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) کە ناوی (محمد)ە دوا پیغەمبـەرەو پـەیامی پیغەمبەرایـەتی بەو تەواو کراوە.

ئـەمجار مانـای ئایـەتی پێـشوو ژمـارە (٦٤)ی جارێکی تـر دووبـارە کـردەوەو فەرمووی: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّـكَ طُغْيَانًـا وَكُفْـرًا﴾ پـەروەردگار سوێند دەخواو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتـەوە: کـە ئـەم قورئانـە بـۆ زۆربـەی زۆری ئەهلی کیتاب دەبێتە گومڕابوونی زیاترو سەرلێشێواوی پـتر ئـەم قورئانـەی کـە لـە خوداوە بۆ تۆ نێردراوە زۆربەی زۆری ئەهلی کیتاب پێی شێت گیر تر دەبنو زیـاتر

پەیامەکەت رەت دەکەنەوەو کوفرو گومڕاییان زیاتر پێی پتەو دەبێ! چونکە ڕقو کینەی ئەوان بەرامبەر حەقو ڕاستی بە میرات بۆیان ماوەتەوەو لەگەڵ خوێنو ئێسقانیان ئاوێتە بووە، هەرگیز بە چاوێکی ورد بینییەوەو بە عەقڵێکی کراوەوە بیر ناکەنەوەو ویژدان بە کار ناهێنن، ئەوانە کوفر تا بینە قاقایانی داگیر کردوە نایەنە سەر رێگای ڕاست، کەوابێ ﴿فَلاَ تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! خەمو خەفەت مەخۆ لەسەر زێدە گومڕایی بوونو پتەوبوونی بیروباوەڕی کوفر ئامێزیان، چونکە زیانی ئەوە بۆخۆیان دەگەڕێتەوەو تۆ زەرەر ناکەی، موسوڵمانانیش پێویستیان بەوان نیە! ئەو کەمینەشیان کە بڕوایان بە یەکتایی خودا هەیەو ئیمانیان بە نامە ئاسمانیەکانو بە پێغەمبەران هەیە، قورئانی پیرۆز بیروباوەڕیان پتەوتر دەکاو چاوکراوەو شارەزایی تریان دەکاو کامەرانیو خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر دەکا.

دوای ڕوون کردنەوەی ئەم ڕاستییە گرنگە قورئانی پیرۆز قانونو یاسایەکی گشتی دیاری دەکا بۆ هەموو ئادەمیزادانو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەو ئادەمیزادانەی بڕوایان بە ئایینی ئیسلام کردووەو شوێن پەیامی پێغەمبەری ئاخر زەمان کەوتوون ﴿وَالَّذِينَ هَادُواْ﴾ ئەوانەی جوولەکە بوونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی تەورات بوون، شوێن پەیامی موسا کەوتن ﴿وَالصَّابِؤُونَ﴾ ئەوانەی صابیئەنو هیچ ئایینو شەریعەتێکیان نیە یان ئەوانەی فریشتە دەپەرستنو لە نوێژدا روو ناکەنە قیبلە ﴿وَالنَّصَارَى﴾ ئەوانەی مەسیحینو شوێن پەیامی عیسا کەوتوونو بڕوایان بە ئینجیل هێناوە ﴿مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ هەر کەسێ لەو گرۆهانە ئیمانی ڕاستو دروستی بە خوداو پێغەمبەرانی خوداو رۆژیی دوایی هەبێ، وێڕای هەبوونی ئەو ئیمانە ﴿وعَمِلَ صَالِحًا﴾ کردارو گوفتاری ڕاستاڵانەی کردبێ، هەموو کارێکی بۆ ڕەزامەندی خودا بێو لە چوارچێوەی شەریعەتی خوادا هەڵسو کەوت بکا، ئەوە ﴿فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ترسی تۆڵەو سزای رۆژی قیامەتیان نیە دڵنیان لە ئاکامی تێکۆشانو هەوڵو تەقەلای دونیایان ﴿وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەفەت بۆ ژیانی دونیاشیان ناخۆن تامەزرۆی لەزەتو خۆشییەکانی بە جێماو لە

دونیایاندا نین چونکە ئەوەی پێیان دراوەو پێی گەیشتوون زۆر لە هی دوونیایان خۆش ترە!

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە ئەهلی کیتاب ئایینی خودایان جێبەجێ نەکردووە، نەهۆکاریان بەکارهێناوەو نەگەیشتوونەتە مەبەست، نە پارێزگاری دەقەکانی تەوراتو ئینجیلیان کردووە، بەم رەنگە نەهێڵن گۆڕانکاریان تێدا بکرێ، نەهێشتوویانە دەقەکانیان لەسەر شێوەی نێردراوی خۆیان بمێننەوە، نە بڕوایان بە خوداو رۆژی دوایی کردووە، وەکوو ئەو شێوەیەی کە پێشینانی خۆیان لەسەری رۆیشتوون نەوەکوو پێشینانی صالحو خوداپەرستان، هەڵسو کەوتیان کردووە! جگە لە کەمێکیان: کە خوداپەرستو راستاڵ بوونو پابەندی فەرمانی خودا بوونو کە ئایینی ئیسلامیش هات شوێن پیغەمبەری ئیسلام کەوتنو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی قورئان بوونو لە ژێر ئاڵای ئیسلامدا، خەباتو تێکۆشانیان ئەنجام دا.

## بەدرۆ خستنەوەو شەهیدکردنی پیغەمبەران لەلایەن جوولەکەکانەوە

﴿ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًاۖ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُواْ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾ وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٧١﴾ ﴾.

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند: کەوادەو بەڵێنی لە نەتەوەی ئیسرائیل وەرگرتووە کە پابەندی فەرمانەکانی خودا بن، بڕوا بە پیغەمبەرانی

بکەن، بەڵام ئەوان پابەندی وادەو پەیمانەکانی خۆیان نەبوون، عەهدو بەڵێنەکانی خۆیانیان هەڵوەشاندۆتەوە، لێرەدا هەمان راگەیاندن دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلاً﴾ بێگومان وادەو بەڵێنمان لە نەتەوەی ئیسرائیل وەرگرت: کە گەردن کەچو پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بن، پێغەمبەرانمان بۆ لا رەوانە کردن، بانگەوازییان کردن بۆ خودا پەرستیو ئامۆژگارییان کردن، بەڵام ئەوان بەپیر بانگەوازییەکانەوە نەدەهاتن، سەرپێچییان دەکرد ﴿كُلَّمَا جَاءهُمْ رَسُولٌ بِمَا لاَ تَهْوَى أَنْفُسُهُمْ﴾ هەرکاتێ پێغەمبەرێك بهاتایە بۆ ناویان، ئایینو شەریعەتێکی بهێنایە کە بە هەوەسی ئەوان نەبوایە، بەرژەوەندی تەسکی تایبەتی ئەوانی تێدا نەبوایە، وادەو بەڵێنی خۆیان هەڵدەوەشاندەوەو لە خودا یاخی دەبوونو هەڵسو کەوتیان لەگەڵ پێغەمبەرەکان بە یەکێك لەم شێوانە بوو ﴿فَرِيقًا كَذَّبُواْ﴾ کۆمەڵێکیان بە درۆ دەخستەوەو پشتیان لێ هەڵدەکردن، ﴿وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ﴾ یان کۆمەڵێکیان لێ تیرۆر دەکردنو بە درندەترین شێوە شەهیدیان دەکردن.

بەکورتی بەنو ئیسرائیل لە خراپەکاریو شوێنکەوتنی هەواو هەوەسدا گەیشتبوونە ئەوپەڕی گومڕاییو سەرلێ شێواوی، تەنانەت ئامۆژگاری پێغەمبەرەکانیشیان کاریگەر نەبوو لە دڵیانداو لە خراپەکاری نەیان گێڕانەوە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە شارەزایی کردنو بانگەوازی کردنی ئەو پێغەمبەرانە بۆیان زیاتر گومڕای کردنو پتر سوور بوون لەسەر بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیانو بگرە کوشتنو لە ناو بردنیان!! ئەوەندەش لە تاوانکاریو خراپەکاریدا نوقوم بوو بوون ﴿وَحَسِبُواْ أَلاَّ تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ پێیان وابوو: کە لەسەر ئەو کردەوە خراپانەیان هیچ فیتنەییو ئاشوبێك هەڵناستێ! بەلایانەوە کارێکی ئاسایی بوو پێیان وابوو، تۆڵەیان لێ ناسێندرێ، چونکە ئەوان خۆیان بە خۆشەویستی خوداو کوڕی خودا حسێب دەکردو بڕوایان وابوو: پێغەمبەرایەتی پێشینانیانو پیاو چاکی باوكو باپیرانیان لە تۆڵەو سزای ئەو کوشتنو بە درۆخستنەوەیە دەیانپارێزێ، بەڵام ئاکامی ئەم خراپەکارییەیان نەگبەتی بوو بۆیان ﴿فَعَمُواْ﴾ لە ئاستی حەق کوێر بوونو حەقو راستییان نەبینی ﴿وَصَمُّواْ﴾ گوێچکەی خۆیان لە ئاست حەقو

بیستنی ئایەتی خوادا ئاخنی بوونو حەقو راستییان نەدەبیستو پەندو ئامۆژگاری پیغەمبەرەکانیان بە گوێدا نەچوو ترساندنو هەڕەشەکردنی پیغەمبەرەکانیان کاری تێ نەدەکردن، بەڵکوو زیاتر سوور بوون لەسەر سەرپێچی کردنو وادەو بەڵێنی خۆیان هەڵوەشاندەوەو لە رێی ئایین دەرچوونو ستەمیان لە خودی خۆیان کردو شوێن هەواو هەوەس کەوتن، نوگرۆی گومڕایی بوون، ئەمجار خوودای بالاّ دەست، زەواڵی خۆیانی بۆ ناردنو بابلیەکانی بەسەردا زاڵ کردن، بە قوڕدا بردنیە خوارو کوشتنو بڕینو چەوساندنەوەیان تێدا بەرپا کردن، وڵاتو هەرێمیان وێران کردن، مزگەوتی قودسیان سوتاندن، ماڵو سامانیان تاڵان کردن، ژنو منداڵیان لێ داگیر کردنو کردنیانن بە کۆیلەو تەختو بەختیان ژێرو زەبەرکردنو دەسەلاّتو فەرمانڕەواییان لێ زەوت کردن، ﴿ثُمَّ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ ئەمجار خودا بەزەیی پێدا هاتنەوەو تۆبەو پەشیمان بوونەوەی لێ قبووڵ کردن، کاتێك وازیان لە فەساد هێناو بە خۆیاندا چوونەوە، سەڵتەنەتی لەسەر دەستی پاشایەکی فارس زوبان، پێیدانەوە، ئەم پاشایە هات بەیتولمەقدیسی بۆ ئاوەدان کردنەوە، ئەو جوولەکانەی بە دیلی لای بەختو نەصەر مابوونەوە بەرەڵای کردنو گێڕانیەوە بۆ خاكو نیشتیمانی خۆیانو ئاهێکیان بەبەردا هاتەوەو ژمارەیان زۆر بووەوە، وەزعی ماددیو تەندروستی کۆمەڵایەتییان لە پێشوو چاکتر بۆ سازایەوە، بەڵام دووبارە سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بە سەرپێچی کردن ﴿ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ﴾ پاشان زۆربەی زۆریان لە ئاستی حەقدا کوێر بوونو راستی حەقیقەتیان نەبینی، گوێچکەی خۆیان لە ئاست پەندو ئامۆژگاری پیغەمبەرانیان ئاخنیو جارێکی تر دەستیان کردەوە بە سەرپێچی کردنو ئەزیەتدانی پیغەمبەرانیانو پتر پێیان لێ هەڵبڕیو زیاتر زێدە رەوییان کرد، تەنانەت بە ناڕەواو بێ هۆ چەند پیغەمبەریان تیرۆر کرد؛ وەکوو زەکەریا، ئیشعییا، هەروەها ویستیان عیسا شەهید بکەنو بۆیان نەکرا، دووبارە پەروەردگار زەواڵێکی دیکەی بۆ ناردن، فارسەکانی بەسەردا زاڵ کردن، ئەمجار رۆمەکانی بەسەردا بالاّ دەست کردن، سەرلەنوێ بەختو سەڵتەنەتیان لێ سەندرایەوەو بوونەوە بە ژێر دەستەو چەوساوە. کە دەفەرموێ: ﴿كَثِيرٌ مِّنْهُمْ﴾ ئاماژەیە: بۆ ئەوە کە زۆربەی زۆریان لە

خـودا یـاخیو سەرپێـچیکەر بـوونو کـەمێکیان موسـوڵمانو راسـتاڵ بـوون، کـەڕیو کوێریان لە ئاسـتی حـەقو راسـتیدا هـەموویانی نـەگرتبووەوەو هەنـدێکیان لەسـەر خوداپەرستیو حەق شوناسی بـەردەوام بـوون؛ چـونکە عیـبرەت بـە زۆربـەی زۆرە، نەك بە کەمینەیەك کە نەتوانێ بەرگری لە خراپەکارییەکە بکا، بۆیە هەرکاتێ لـە ناو گەلو نەتەوەیەکدا خراپەکاری زۆر بوو، پەروەردگار چاكو خراپ، تـەڕو وشـك لە دونیادا پێکەوە دەسوتێنێ! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَاتَّقُـواْ فِتْنَـةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً – الأنفـال/٢٥﴾ بـەڵام بـەپێی فـەرموودەی سـاغ لـە قیامەتدا هەرکەسە لەسـەر نیـازی خـۆی زینـدوو دەکرێتـەوە وشـك بـە تـاوانی تـەڕ ناسـوتێنرێ ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى – الـنجم/٣٩﴾ ئەمـە قـانونو یاسـایەکی خوداییە پێویستە موسوڵمانان زۆر ورياو ئاگادار بن، هەمیشە لە تێکۆشانو هـەوڵو تەقەلادا بنو نەهێڵن خراپەو خراپەکاران سەرهەڵدەن.

﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ خودا بینایە بەو هـەموو پـیلانو فـرتو فێڵانـەی کە ئەنجامیان دەدەن دژی پیغەمبەری ئاخر زەمان، ئاگای لەوە هەیـە: کـە هەمیـشە هـەوڵ دەدەن هـۆزە عەرەبـەکان دژی راسـت بکەنـەوەو لـە هـەموو لایەکـەوە فـشار بخەنە سەر پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)و هـاوەڵانی نـەهێڵن پـەیامی پـیرۆزی ئیـسلام بـە ئاکام بگـا، ئەمـەش بـە هـۆی ئەوەویـە: کـە ئـەو جوولەکانـە لـە ئاسـت حـەقو راسـتیدا کـوێرو کـەڕن، نـوورو هێدایـەتی ئیـسلام نـابینن، ئایـاتی قورئـان نابینو پەندی لێ وەرنـاگرن؛ بێگومـان خـودا لـە پاشـان تۆڵـەیان لێ دەسـتێنێو بـە کوشندە ترین شێوە سزایان دەدا.

## مەسیحیەکانی عیسا بەخودا دەزانن هەرچەندە بەندەیەکی فروستادەیە

﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ۗ

﴿ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾﴾.

پاش ئەوەی پەروەردگار پلە بەپلە ئاخاوتنی لەبارەی جوولەکەکانەوە ئەنجام داو بەڵگەکانیانی پووچەڵ کردنەوەو خراپەکارییەکانی لەبارەی مەسیحییەکانو چەواشەکاری بیروباوەڕی پووچەڵی ئەوانیشی خستەڕوو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ﴾ پەروەردگار لە روانگەی بە کافر حسێب کردنی هەموو گرۆهە مەسیحییەکان مەلکییە - یەعقەبییە، نەسطورییە پێشینیەکان، کاثولیك، ئەرثودکس، پرۆتستانتی ئێستا کە ئەو گرۆهانە هەتا ئێستا باوەڕیان بەوە هەیە؛ کە خوا سێ توخمی هەیە، دەفەرموێ: سوێند بە یەزدان کافرو گومڕان هەموو ئەوانەی کە دەڵێنو بڕوایان وایە: کە خودا عیسای کوڕی مەریەمە، بەڕاستی ئەوانە گومڕا بوونو ڕێگایان لێ تێکچووە: کە پێیان وایە خودا لە سێ ئوقنوم پێکهاتووە، واتە: لەسێ ئەصڵ (باوك، کوڕ، روحول قودس) دەڵێن (الله) باوکە (مەسیح) کوڕەکەیەو ئەڵلا لە مەسیحدا تواوەتەوەو بوون بەیەكو (روحول قودسی)یان پێك هێناوە، هەر یەکێك لە خوداو لە مەسیح بریتییە لەوی تریان، پوختەی قسەیان ئەوەیە: کە دەڵێن: خودا مەسیحەو مەسیح خودایە، واتە: دوو ناون بۆ یەك شت!! ئەمە لە کاتێکدا حەزرەتی مەسیح بە منداڵی یەکەم وشەیەك کە لەدەمی هاتەدەر ئەوەبوو (من بەندەی خودام) ئەمجار بانگەوازی خەڵکەکەی کرد بۆ شوێنکەوتنی پەیامەکەی ﴿وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ﴾ مەسیح بانگی گەلەکەی کردو گوتی: ئەی نەتەوەی ئیسرائیل! خودا بپەرستن، بە تاكو تەنیای بناسن، بۆ تاعەتکردن روو بکەنە ئەو، هەر ئەو بە خودا بزانن، ئەو خودای منو خودای ئێوەشە، ئەم قسەیەی عیسا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر پووچەڵی بیروباوەڕی نەصرانیەکانو بێ بناغەیی بۆچوونەکانیان! چونکە عیسا هیچ جوداوازییەکی لە نێوان خۆیو خەڵکانی دیکەدا دانەنا، ئەمجار بە شوێن

بانگەوازەکـەدا هەڕەشـەیەکی تونـدی ئاراسـتەی هاوبـەش پەیداکـەران کـردوو فەرمووی: ﴿إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّـهِ﴾ هەرکەسێك هاوبـەش بـۆ خـودا دابنـێ، جا ئـەو هاوبەشە فریشتە، یان ئادەمی، ئان ئەستێرە یان بتو صەنەم بێ یـان هـەر شـتێکی تـر بـێ، ئـەوە ﴿فَقَدْ حَرَّمَ اللَّـهُ عَلَيهِ الْجَنَّـةَ﴾ بێگومـان خـودا بەهەشـتی لێ حـەرام کـردووەو بـۆنی بەهەشـت ناکـا، پـەروەردگار ئـەم بڕیـارەی لـە زانـستی خۆیـدا لـە ئەزەلدا چەسپاندووەو لە شـەریعەتی پیغەمبەرەکانیـدا تۆمـاری کـردووە، ئـەوانیش بە ئادەمیزادانیان ڕاگەیاندووە، ﴿وَمَأْوَاهُ النَّارُ﴾ دوا خانوو مەنزلگای قیامەتی ئاگری دۆزەخە کە پڕاوپڕ سزای خراپەکاری‌و بیروباوەڕی چەواشـەو بـێ بناغەیانـە ﴿وَمَا لِلظَّـالِمِينَ مِـنْ أَنـصَارٍ﴾ بـۆ ئـەو سـتەمکارانەی کـە سـتەمیان لـە خۆیـان کـردووە، شەریکیان بۆ خودا قەرار داوە، یارمەتیدەرو پەنا نیەو کەس بـە هانایانـەوە نایـێ‌و کەس ناتوانێ لە سزای خودا ڕزگاریان بکا هـەروەها ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّـذِينَ قَـالُواْ إِنَّ اللَّـهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ﴾ بێگومان کـافر بـوون‌و نـەفرین لێ کـراون ئەوانـەی پێیـان وایـە، کـە بـە دیهێنەری ئاسمان‌و زەوی‌و هەموو بوونەوەر سێیەمی سێ خودایەکانە، کـە ئەمـەش قسەی مەسیحیەکانەو دەڵێن: مـەسیح کوڕی خودایە، یان دەڵێن: خودا پێـك هـاتووە لە سێ ئوقنوم؛ باوك کە خودایە، کوڕ کە عیسایە، دایك کە مەریەمە، واتە: هـەموو تـاقم‌و گرۆهـەکانی مەسـیحی کـافرن؛ چ ئەوانـەی دەڵـێن: مـەسـیح یەکێکـە لـە سـێ خواکان، یان ئەوانەی کە دەڵێن: مـەسـیح کـوڕی خودایـە، یـان ئەوانـەی کـە دەڵێن: خـودا بریتییـە لـە مەسـیحی کـوڕی مەریـەم، نەصـرانیە تازەکـان بڕوایـان بـە سـێ خودایی هەیـە، دەڵێن: (الله، عیسا، مەریـەم) هەرسـێکیان خـودان، لەلایـەکی تـرەوە پێیـان وایـە: کـە هەریـەکێ لـەم سـیانە عـەینی یـەکترن، واتـە: هەرسـێکیان یـەك خودان!! پەروەردگار بۆچوونەکەیانی ڕەت کردەوەو فەرمووی: ﴿وَمَا مِنْ إِلَـهٍ إِلاَّ إِلَـهٌ وَاحِدٌ﴾ هیچ خودایەك نیە لە بوونەوەردا شیاوی خودایەتی‌و پەرستن بێـت بێجگـە لـە (الله) کـە خودایـەکی تـاك‌و تـەنیاو بـی شـەریك‌و بـێ هاوەڵـە، خـودای کـەون‌و کائیناتـە، بەدیهێنـەری بوونـەوەرە، خودایەکـە سـیفەتی تـاك‌و تـەنهایی تایبـەتی خۆیەتی‌و هـیچ ڕەوشـتێکی ئـادەمیزادی تێـدا نیـە، زاتـی پـیرۆزی پێکهاتـەی بـەش‌و کەرت نیە، نە زات‌و نەسـیفاتی مورەکەب نیـە، زاتێـك نیـە پێکهاتبـێ لـە ئـەعیان‌و

ئەجزاءو ئەنواع! لە هیچ شتێك ناكاو هیچ شتێكیش لەو ناكا، وەكوو دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ – الشوري/١١﴾، ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لە مەسیحیەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ﴾ ئەگەر واز لەو هەڵوێستو باوەڕەیان نەهێنن، لە بڕوا بە سێ خودایی دەست هەڵنەگرنو بڕوا بە یەكتاییو بێ شەریكی خودا نەكەن ﴿لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وەڵڵاهی سزایەكی توندو بە ئێش لە قیامەتدا تووشی كافرەكانی ئەو نەتەوە نەصرانییانە دەبێ، خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبنو دەكەونە بەر نەفرینو غەزەبی خودا! ئایەتەكە ئاماژە بۆ ئەوە دەكا كە سزاكە تەنها تووشی ئەوانەیان دەبێ كە كافرو شەریك بۆ خودا بەڕەوا دەزانن! نەك ئەوانەیان كە تۆبە دەكەنو بۆلای خودا دەگەڕێنەوەو واز لە بیروباوەڕی فرە خودایی دەهێننو تاوانی تر ئەنجام نادەن!! ئەمجار بە سەرسوڕمانەوە باسی سوور بوونی نەصرانییەكان لەسەر بیروباوەڕی سێ خودایی دەكا، بەلایەوە جێگای سەرسوڕمانە كە پاش وەدەركەوتنی ئەو هەموو بەڵگە بەهێزو پووچەڵكەرەوانە لەسەر ناراستی بیروباوەڕەكەیان، وێڕای ئەو هەموو هەڕەشەو ترساندنەیان بە سزای سەخت كەچی ئەوان هەر سوورن لەسەر بیروباوەڕی سێ خودایییانو واز لە بڕوای چەوتیان ناهێنن، فەرمووی: ﴿أَفَلاَ يَتُوبُونَ إِلَى اللّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ؟﴾ ئەرێ ئەوانە لە بڕوای نابەجێیان پەشیمان نابنەوەو تۆبە ناكەنو بۆلای خوداناگەڕێنەوەو داوای لێ خۆش بوونی لێ ناكەن؟ سەیرە ئەوانە ئەو هەموو پەندو ئامۆژگارییانە دەبیستن، ئەو هەموو بەڵگە بەهێزەیان پێ ڕاگەیاندران لەسەر پووچیو بێ بناغەیی بیروباوەڕی هەڵەیان، ئەو هەموو هەڕەشەیان ئاراستە كران، كەچی ملیان نەداو ڕوویان نەكردە خوداو تۆبەیان نەكردو نەبوونە خوداپەرستی یەكتا پەرستو نەهاتن داوای لێ بووردن لە خودا بكەن، كە لە تاوانی ڕابردوویان خۆش ببێ!! لە كاتێكا ﴿وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ پەروەردگاریان ڕەحمەتو بەزەیی فراوانەو لێخۆشبوونی زۆرو زەبەندەیە، تۆبە لە بەندەكانی قبوول دەكا، لە تاوانی ڕابردوویان خۆش دەبێ، ئەگەر ئیمان بێننو بیروباوەڕی خۆیان وا لێ بكەن جێگای ڕەزامەندی خودا بێو خۆیان لەو شتانە بپارێزن كە دەبنە هۆی سزای خوداو كردەوەی چاكیش ئەنجام بدەن!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە عیسا پێغەمبەرێکە وەکوو هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە لەلایەن خوداوە نێردراون بۆ هیدایەتدانی ئادەمیزادو دەفەرموێ: ﴿مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ﴾ عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەرێکە لەو پێغەمبەرانەی کە خودا ناردوونی بۆ شارەزایی کردنی ئادەمیزاد، بۆ خۆشی ئادەمییەکەو بەندەی خودایە، نەك بۆخۆی خودا بێ، یەکێکە وەکوو ئەو پێغەمبەرانەی کە خودا پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیونو بە نیشانەو بەلگەو مەعجیزەی جۆراوجۆر پشتگیری کردوون ﴿وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ﴾ دایکیشی کە مەریەمە ئافرەتێکی خوداپەرستی راستگۆو راستاڵ بوو، پلەو پایەی لە خوار پلەو پایەی پێغەمبەرانەوەیە، نە پێغەمبەرەو نە پلەو پایەی خودایەتی هەیە؛ وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ – التحريم/١٢﴾.

﴿كَانَا يَأْكُلاَنِ الطَّعَامَ﴾ هەریەکەیان لە مەسیحو لە دایکی لە رەگەزی ئادەمیزاد بوونو خۆراکیان دەخوارد بۆ ئەوەی درێژە بە ژیانیان بدەن، وەکوو ئادەمیزادی تری ئاسایی پیسایییان دەکرد، پێویستیان بە ئیستراحەتو خەو هەبوو، کەسێك ئەمە حاڵی بێ پێویستی بە خەو خواردنو رینەوە هەبێ، جەستەی مورەککەب بێ ناگونجێ خودا بێ، نابێ هیچ رەوشتێکی خودایەتی تێدا بێ، ئەو پەڕی بێ هۆشیو گەوجیشە ئادەمیزاد ئەوەندە خۆی سووك بکاو ئەوەندە لە پلەو پایەی خۆی دابەزێنێ یەکێکی وەك خۆی کە لە رەگەزو چۆنیەتیدا وەك یەك وان، بەرزی بکاتەوەو بیکاتە خوداو خۆی بکاتە بەندەی ئەو!!

﴿انظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الآيَاتِ ثُمَّ انظُرْ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ بەراستی جێگای سەرسوڕمانە ئەی بیسەر! سەیر بکە بە بیری وردو فکری تیژەوە بڕوانە، ئێمە چۆن بەلگەی بەهێزو حاشا هەڵنەگر بۆ ئەو گرۆهانەی خۆیان بەنەصرانی ناوزەد کردووە دەهێنینەوە بەلگەی روونو ئاشکرا لەسەر بەتاڵیو پووچی ئیدیعای ئەو گرۆهانەو بیروبۆچوونیان دەربارەی حەقیقەتی عیساو دایکی دەخەینە روو، کەچی ئەوان پشت هەڵدەکەنو یاخی دەبن، هیچ تێ نافکرنو ورد نابنەوە ئەم هەموو بەلگەو دەلیلانە کاریان تێ ناکەن!

ئەوە بۆکوێ دەچن‌و بەتەمای چین‌و بەچ بەڵگەیەك پشت ئەستورن؟ بە راستی ئەوانە دەڵێی عەقڵیان لە دەست داوەو بێ هۆش‌و گۆشن، ئەگینا ئەوەندە کەودەن‌و کورت بین‌و نەزان نەدەبوون!!

تۆزێك بیریان دەکردەوەو بە خۆیاندا دەچوونەوە بەلاَم ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾* کەسێك خودا گومرای بکا کەس نیە شارەزای بکا.

## رەتدانەوەی مەسیحیەکان دەربارەی بە خودا زانینی عیسا، داوا کردن لەخاوەن نامەکان کە لەئاییندا زێدەڕەوی نەکەن

﴿ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٦﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ ٱلَّذِينَ

---

* جارێ ئەسقوفێ بە ئیمامی سیوطی دەڵێ: ئێوە خێزانی پیغەمبەرەکەتان خیانەتی زەوجی کردووە، کەچی ئێوە بۆی پینەو پەڕۆ دەکەن‌و داستانی گومبوونی گەردانەیەکتان لەم بارەیەوە دروست کردووە!

ئیمامی سیوطیش دەفەرموێ: (ئەوەی کە ئێوە قبووڵی دەکەن بۆ رەددی بوختانێ بۆ دایکی خواکەتان کراوە، ئێمەش قەبووڵی دەکەین بۆ رەددی ئەو بوختانەی کە بۆ هاسەری پیغەمبەرەکەمان کراوە، لەگەڵ ئەم فاریقەدا: دایکە خواکەی ئێوە بێ مێرد منداڵی هێناوە، هاسەری پیغەمبەری ئێمە مێردیشی بووە منداڵی نەبووە، دەی کامیان پتر جێگەی گومانە.

كَفَرُواْ مِنۢ بَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾

ئەمجار پاش ئەوەی کە پەروەردگار بیروڕاو بۆچوونەکانی جوولەکەی ڕەت کردەوە، پاشان بیروباوەڕی گەندەڵو بێ بناغەی مەسیحیەکانیشی پووچەڵ کردەوە، بەلگەی بە هێزو بۆڕدەری هێنانەوە لەسەر پووچەڵیو گەندەڵی ئەو بیروباوەڕانەی کە جوولەکەو مەسیحیەکان پەیڕەوی دەکەن.. ئەمجار نارەزامەندی خۆی دەردەبڕێ لە هەر بەندەیەك کە جگە لە خودا شتی تر بپەرستێ، شەریكو هاوەڵ بۆ خودا دابنێ، ئەوەش روون دەکاتەوە: کە جگە لە خودا هیچ شتێك شایانی خودایەتی نیە، ئەمجار خیتاب ئاراستەی جوولەکەو مەسیحییەکان دەکا کە لە

ئایینەکەیاندا زێدەڕەوی نەکەن میانەڕەو بن، دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! بەو جوولەکەو گاورانە بڵێ! ﴿أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا﴾ ئایا ئێوە جگە لە خودا کەسێك دەپەرستن کە نەدەتوانێ زیانتان لێ دووربخاتەوەو لە زیان بتانپارێزێ نە دەتوانێ سوودتان وەدەست بخا!! ﴿وَاللّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ پەروەردگار قسەو گفتو گۆی بەندەکانی دەبیسێو ئاگادارە بە هەموو شتێك، هەموو بوونەوەر بەدەست ئەوە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، دەی ئیتر بۆچی روو لە پەرستنو بەندایەتی کردن بۆ ئەو زاتە وەردەگێڕن؟ کە هەر ئەو قازانج بە دەستی حەقیقییە روو دەکەنە پەرستنی بەندەیەك یان ئەستێرەو بەردو دار: کە بێ گیانو بێ هەستن، نابینن، نابیسن؛ هیچ نازانن، پەرستراوەکانتان چ ئادەمی چ شتەکانی دی دەسەڵاتی هیچ قازانجو زیانێکیان نە بۆ خۆیان نە بۆ ئێوە نیە. ئەوەتا: ئەو جوولەکانەی دوژمنی عیسا بوون، ویستیان بیکوژن، نەیانتوانی زیانی پێ بگەیەنن، بەڵکوو هەوڵیاندا بیگرنو بیکوژن هەڵیواسن، ئەو بۆخۆی نەیتوانی بەرگری لە خۆی بکا، هەروەها نەیتوانی قازانج بۆ شوێنکەوتوانی دەستەبەر بکا، ئەوەبوو: تووشی ئەو هەموو کوشتنو بڕینو دەرکردنو ڕاوەدوونانە بوون؛ دەی کەسێك ئەوە تواناو دەسەڵاتی بێ، چۆن بە کاری خودایەتی دێ؟ کەی شیاوی ئەوەیە بە خودای بزانن؟ ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکا، کە بە ئەهلی کیتاب رابگەیەنێو ئامۆژگارییان بکا لە سنووری ئایین دەرنەچن ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ﴾ ئەی محمد! بە ئەهلی کیتاب بڵێ: لە شوێنکەوتنی ئایيندا سنوور بەزێنی مەکەن، زێدەڕەوی لە بەگەورە زانینی عوزەیردا مەکەن، هەروەها لە بەگەورە زانینی عیساشدا زێدەڕەوی مەکەن، بەجۆرێك کە زیاد لە پلەو پایەی خۆیان بدەنێ! بەم جۆرە عیسا لە پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی دەربکەن بەرزی بکەنەوە بۆ پلەو پایەی خودایەتی! ئێوەش ئەی جوولەکە! زێدەڕەوی مەکەن لە سووکایەتی کردن بە عیساو دایکی، وازبێنن لەوەی کە تۆمەتی داوێن پیسی دەخەنە پاڵ مەریەم.

﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ أَهْوَاء قَوْمٍ قَدْ ضَلُّواْ مِن قَبْلُ﴾ شوێن هەواو ئارمزوو بازی کەسانێك مەکەون کە بیرو بۆچوونەکەیان هەڵقوڵاوی هەواو هەوەسە، ئەوانە پیری کۆنە ساڵو گومڕاو سەر لێ شێواون! لەمێژە نوغرۆی گومڕایی بوون.

﴿وَأَضَلُّواْ كَثِيرًا وَضَلُّواْ عَن سَوَاء السَّبِيلِ﴾ ئەوانە زۆر تاقمو گرۆی ئادەمیزادیان گومڕا کردووە بۆ خۆشیان لە ڕێگەی ڕاستو دروست لایان داوەو چوونە سەر ڕێگای گومڕاییو سەر لێ شێوان!

﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾ لە کۆنەوە پەروەردگار لەسەر زوبانی داوود لە زەبووردا‌و عیسا لە ئینجیلدا نەفرینی کردووە لەوانەی کافرو گومڕابوون لە نەتەوەی ئیسرائیل بەهۆی سەرپێچی کردنو لادانیان لەڕێگەی خوداو سنوور بەزێنیان، بەهۆی دەست درێژی کردنیان بۆ سەر خەڵك، داوود نەفرینی کرد لەوانەی کە لەڕۆژی شەممەدا سنووریان بەزاندوو بەفێڵ ڕاوە ماسییان ئەنجامدا، هەروەها نەفرینی لەوانە کرد: کە لەخودا یاخی بوونو پابەندی فەرمانو جڵەو گیرییەکانی نەبوون، حەزرەتی عیساش نەفرینی لە جوولەکە یاخی بووەکان کرد بەهۆی سەرپێچی کردنو پشت هەڵ کردنیان لە فەرمانەکانی یەزدان.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: نەتەوەی ئیسرائیل لە تەوراتو ئینجیلدا نەفرینیان لێ کراوە، هەروەها لە زەبورو لە قورئاندا نەفرینیان لێ کراوە ﴿ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ﴾ هۆی ئەم نەفرین لێ کردنەیان بە بەردەوامیو بێ پسانەوە درێژە پێدانیان بوو بە سەرپێچی کردنو یاخی بوونیان لەخودا، بەبێ پسانەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ﴾ کە ڕستەکە خۆی مانای بەردەوامیو درێژە پێدان دەگەیەنێ!

ئەمجار پەروەردگار هۆکاری ئەم بەردەوامییەیان لەسەر یاخی بوونو سەرپێچی کردنو سنوور بەزێنیەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ﴾ دابو نەریتیان وابوو: کەس جڵەوگیری لەکەس نەدەکرد، لەو خراپەکاریانەی ئەنجامیان دەدا، چەندێك ئەو خراپەکاریانەیان گەورەو سامناكو زیان ئامێز بوونایە کەس نەبوو جڵەوگیری لێ بکا، ئاشکراشە پارێزگاری ئایین

پاراستنی سنوورەکانی بە نەهی لە خراپەو فەرمان بە چاکە دەبێ، جا ئەگەر سەرسەری‌و شەقاوەکان یاخی بوون سەرپێچی کاران جورئەتی ئەوەیان کرد ئاوا بە ئاشکرا تاوان ئەنجام بدەن‌و خەڵکی تریش لەجیاتی ئەوەی بەرگرییان بکەن، شوێنیان بکەون، ئیتر بە تەواوی پێی لێ هەڵدەبڕن‌و پێوەی رادێن‌و لێیان دەبێتە شتێکی ئاسایی‌و دەسەڵات‌و پیرۆزیی ئایین لە دڵیاندا نامێنێ‌و حوکمەکانی ئایین پاشگوێ دەخرێن.

﴿لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾ خراپ کردەوەیە کە ئەو کردارەی ئەوان دەیان کرد، هەڵوێستێکی ناشیرین بوو: کە هەندێکیان تاوانیان ئەنجام دەداو بەردەوام دەبوون لەسەر ئەنجامدانی، ئەوانی تریش پێی رازی بوون‌و لێیان بێ دەنگ بوون!! ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە پێویستە موسوڵمانان پەند وەربگرن‌و وەکوو بەنو ئیسرائیلی نەکەن، نەوەکوو وەکوو ئەوان خودا لێیان نارازی بێ! ئەوەی تووشی ئەوان بوو تووشی ئەمانیش بێ، فەرمان بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە کۆمەڵگا لە رەوشت نزمی دەپارێزێ، تاکەکانی کۆمەڵ راستاڵ‌و رێك‌و پێك دەکا، رەوشتی جوان‌و فەضیلە لەناو کۆمەڵدا بڵاو دەکاتەوەو بەرەو خێرو چاکەیان دەباو خۆشبەختییان بۆ دەستەبەر دەکا. ئەبوو داوودو تیرمیذی‌و ئیبنو ماجە لە ئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا دَخَلَ النَّقْصُ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ: إِنَّه كَانَ الرَّجُلُ يَلْقَى الرَّجُلَ، فَيَقُولُ: يَا هَذَا اتَّقِ اللّٰهِ وَدَعْ مَا تَصْنَعُ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ لَكَ، ثُمَّ يَلْقَاهُ مِنَ الْغَدِ وَهُوَ عَلَى الحالَهُ، فَلاَ يَمْنَعُهُ ذَلِكَ أَنْ يَكُونَ أَكِيلَهُ وَشَرِيبَهُ وَقَعِيدَهُ، فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ ضَرَبَ اللّٰهُ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ، ثُمَّ قَالَ: (لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا) تا وشەی (فَاسِقُونَ) ئەمجار فەرمووی: «كَلاَّ وَاللّٰهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، ثُمَّ وَلَتَأْخُذُنَّ عَلَى يَدَى الظَّالِمِ وَلَتَأْطُرُنَّهُ عَلَى الْحَقِّ أَطْرًا، وَلَتَقْصُرُنَّهُ

عَلَى الْحَقِّ قَصْرًا». «أَوْ لَيَضْرِبَنَّ اللَّهُ بِقُلُوبِ بَعْضِكُمْ عَلَى بَعْضٍ ثُمَّ لَيَلْعَنَنَّكُمْ كَمَا لَعَنَهُمْ»[1] . رواه ابو داوود والترمذی وقال حديث حسن.

ئیبنو مەسعود دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: بێگومان لەسەرەتاوە بەم شێوەیە کەمو کوڕی لەناو بەنو ئیسرائیلییەکاندا روویدا. کاتێ پیاوێکی زانایان دەگەیشت بە پیاوێکی نەزانیان: کە خەریکی کارێکی خراپ بوو، پێی دەگوت: کابرا! شەرم لەخودا بکەو لەخودا بترسەو واز لەم کارە بێنە کەدەیکەی! کەچی بۆ رۆژیی دوایی لەسەر ئەم حاڵەتە دەیبینییەوەو هیچ جڵەوگیری لێ نەدەکرد! بەڵکوو خۆشی لەگەڵیدا دەیخواردو دەیخواردەوە دەبووە هاونشینی! جا کە حاڵیان بەم حاڵە گەیشت خودا سەری لێ تێکدان دەستیان کرد بە فیتنەیی کردن‌و ئاشووب گێڕان بەرامبەر یەکتریی، ئەمجار پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم چەند ئایەتەی خوێندەوە ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ تا دەگاتە ﴿فَاسِقُونَ﴾ ئەمجار فەرمووی: نەخێر سوێند بەخودا یان دەبێ فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە بکەن، بەباشی بەری هێزی زۆری زۆردار دەگرن‌و دەیانگێڕنەوە بۆسەر رێگای حەق‌و راست‌و ناهێڵن بەبست لێی لابدەن، بەخودا ئێوە یا ئەمە دەکەن یا ئێوەش وەك ئەوان خودا بۆ یەکتری دەتانکا بە فیتنەگێڕو ئاشووبی یەکتری دڵتان تێکەڵ‌و پێکەڵ دەکاو سەرباری ئەوەیش وەك نەفرینی لە بەنو ئیسرائیل کردووە لە ئێوەشی دەکا!

(ئەبو داوودو تیرمیذی گێڕاویانەتەوە) تیرمیذی دەڵێ: (حەدیث)ێکی حەسەنە.

تیرمیذی لە حوزەیفەی یەمانییەوە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِذَاباً مِنْ عِنْدِهِ ثُمَّ لَتَدْعُنَّهُ فَلاَ يَسْتَجِيبُ لَكُمْ».

---

[1] - بۆ دڵنیایی لەڕاستی حەدیثەکە سەیری (ریاض الصالحين) ل: ٩٦، زنجیرە: ١٩٦ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی عبدالعزیز ریاح‌و ئەحمەد یوسف الدقاق‌و پێداچوونەوەی شێخ شعیب ارناؤوط بکە.

سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە دەبێ فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە بکەن، یان نزیکە پەروەردگار سزاتان بۆ بنێرێ پاشان هاوار دەکەنە خوداو وەڵامتان ناداتەوە.

پاش ئەوەی پەروەردگار چۆنیەتی هەڵسو کەوتی رابردووانی نەتەوەی ئیسرائیلی بۆ پیغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شیکردەوە، ئەمجار حاڵو چۆنیەتی ئەو بەنو ئیسرائیلیانە شیی دەکاتەوە کە هاوچەرخی هاتنەخوارەوەی قورئان بوون دەفەرموێ: ﴿تَرَى كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەی پیغەمبەری خۆشەویست! ئەتۆ دەبینی زۆر لەوانەی ئەهلی کیتابن، دۆستایەتی موشریکەکانی مەککە دەکەنو هاوپەیمانییان لەگەڵدا دەبەستنو دەبنە سوێند خۆرو پشتگیریی کەری یەکتری لەدژی تۆو هاوەڵانت، دژی پەیامی پیرۆزت بۆ لەناوبردنت، کافرەکان هەڵدەنێن بۆئەوەی شەڕتان لەگەڵدا بکەنو لەشکر کێشی بکەنە سەرتان! ئەتۆ بڕوای پتەوت بەخودا هەیە، پێت وایە ئەو پەیامانەی لەپێش تۆ نێردراون بۆ پیغەمبەران راستە، شایەدی بەراستی پیغەمبەرایەتی پیغەمبەرانی پێش خۆت دەدەی، بەڵام ئەو موشریکانەی کە ئەهلی کیتاب پشتیان پێ دەبەستن، بڕوایان بەهیچ پەیامێك نییە، هیچ پیغەمبەرێك بەراست نازانن، خودا پەرستی ناکەن، بڕوایان بە تاكو تەنیایی خودا نییە، ئەگەر گومرایی کردنی شەیتان نەبێ هەڵخەڵەتاندنو لە خشتەبردنی شەیتان نەبوایە ئەومیان نەدەکرد، گومراییان بەسەر هیدایەتدا هەڵنەدەبژارد، ئەوانە بەدەستی خۆیان رێگایان لەخۆیان تێکداوەو خودا گومرای کردوون، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ ریوایەت کراوە: کە کەعبی کوڕی ئەشرەفو هاوەڵانی چوون بۆ مەککە پەیوەندییان بە کافرەکانی قورەیشەوە کرد: کە لەشکر کێشی بکەن بۆسەر پیغەمبەرو موسوڵمانان لە مەدینە بەڵام بۆیان سەرنەچوو، کافرەکان ترسانو بەپیر بانگەوازییەکەیانەوە نەهاتن ﴿لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ﴾ بەراستی خراپ هەڵوێستو کردەوەیەکە: کە ئەوان بۆ رۆژی قیامەتیان پەزمەندە کردووە؛ ئەو کردەوانەیان کە بۆتە هۆی نارەزامەندی خودا لێیان، ئەوانە بەخراپترین شێوە تۆڵەیان لێ دەستێندرێتەوەو رۆژیی قیامەت

لەهەموو لایەکەوە عەزابی خودا دەوریان دەداو رزگاربوونیان نییەو هەتا هەتایە لە دۆزەخدا دەمێننەوە، رزگاربوونیان لەو ئاگرە سامناکە تەنها بەدەست خودا خۆیەتی، ئەوانیش کارێکیان نەکردووە کە جێگای بەزەیی خودابن ﴿وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ ئەگەر ئەو جوولەکانەی دۆستایەتی کافرەکان دەکەن‌و دەبنە سوێندخۆرو هاوڕکێفیان‌و دژی موسوڵمانان پەیمان دەبەستن! ئەگەر ئەوانە بەڕاستی‌و بەتەواوی بڕوایان بە مووسا هەبوایەو پابەندی ئەو پەیام‌و نیگایە بوونایە: کە بۆی نێردراوە کە تەوراتە؛ هەرگیز ئەو عەرەبە کافرە بت پەرستانەیان نەدەکردنە هاوپەیمان‌و دۆست‌و لایەنگیرو پشت‌و پەنای خۆیان! چونکە بیروباوەڕی ئایینییان جڵەوگیرییان لێ دەکا. دژی ئەو خیانەتکارییەیانەو پەسەندی ناکا! بەکورتی ئەم دۆستایەتییەی نێوان جوولەکەو موشریکەکان هیچ هۆکارێکی نییە جگە لەڕێککەوتنی هەردوولا لەسەر بڕوا نەکردن بەخوداو بە پیغەمبەرو هاریکاری کردنی یەکتری لەسەر جەنگان لەدژی ئایینی ئیسلام‌و هەوڵدان بۆ پووچەڵ کردنەوەی بانگەوازییەکەی‌و ئەزیەتدانی ئەوانەی بڕوایان پێکردووەو موسوڵمان بوون.

موجاهید دەڵێ: مەبەست بە ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لێرەدا دووڕووەکانە، واتە: ئەو دووڕووانە کافرو بێ بڕوان، چونکە ئەگەر بڕوایان بەخوداو بە پیغەمبەر هەبوایەو قورئانیان بەنامەی خودا بزانیایە، جوولەکەکانیان نەدەکردن بە هاوپەیمان‌و دۆستی خۆیان دۆستایەتی کردنیان لەگەڵ جوولەکە دژی موسوڵمانەکان گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لەدڵدا کافرو بێ بڕوان بەدرۆو بۆ چاوبەستەکی خۆیان بە موسوڵمان دەردەخەن.

ئەمجار یەزدان هۆکاری ئەم هاوپەیمانی‌و دۆستایەتییەی نێوان جوولەکەو مونافیقەکان یان نێوان جوولەکەو کافرەکانی مەککە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ بەڵام زۆربەی زۆریان لە دووڕوویی‌و نیفاقدا نغرۆ بوون، لە چوارچێوەی ئایین دەرچوون، هەر هەڵپەی پلەو پایەی دونیایی‌و ناوو شۆرەتیانە، بەهەموو شێوەیەك خەریکی دونیا خۆرین‌و دەیانەوێ پلەو پایەی بێ بایەخی دونیای بێ بەقا دەستەبەر بکەن!

**تێبینی**:

ماموٚستای پایە بەرزو ئەدیبو زاناو خواناس: ماموٚستا مەلا شێخ (عبدالرؤوف)ی بێژومیی بەرگی یەکەمو دووەمی (تەفسیری رەوان)ی خوێندوٚتەوەو بەم چامە شێعرە کلاسیکییە هەستی خوٚی بەرامبەر تەفسیری ناوبراو دەربڕیوە، گەلێکی بە شانو باڵی بەندەدا هەڵداوە، دڵنیام حوسنی ظەننی هەیەو خوا پاداشی بداتەوە؛ ئەگینا من خوٚم بە شیاوی ئەو پەسەنییە نازانمو کە دەیخوێنمەوە تك تك ئارەقی شەرم دەرێژم!

بەو پەڕی شانازیو فەخریشەوە لەسەر فەرمانی ماموٚستا خوٚی، چامە شێعرەکە لێرەدا بڵاو دەکەمەوە. هیوادارم لە ئاستی حوسنی ظەننی ئەودا بمو نزای نفووسی پاکی کاریگەر بێو لای خودا قبووڵ بێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

برای بەرێزو ئازیزم کاکە مەلا مەحمود گیان پێش کێشە

سەڵاوێکە دیاری مە دیارە      لەدارو بەردی ئەو دارو دیارە

دیاری پیرۆزیی تەفسیری رەوانم پێگەیی: دڵم پێی گەش بووەوەو چاوم پێی روونو رەوانم پێی شادو کەیف خوٚش بوو: خوای گەروە بتپارێزیو پشتیوانت بێ لە درێژەدان بەم خزمەتە پیرۆزە جا ویستم لە پەراوێزی تەفسیرەکەدا ئەم هەڵبەستەیە بنووسم کەوا بوٚ ئاگاداری ناردوومە خزمەتت.

تەفسیری رەوان قووتی رەوانە      وەك ئاوی حەیات رونو رەوانە[1]

مزگێنیو لێ بێ گەلو هوٚزی کورد!      تەفسیر، رەوان بوو لە کوردستانە

رەوانە دەرسم بوٚ ئەم تەفسیرە      کە شی کردنەوەی کوردی زوانە

دەرسی برایەتیو خەباتو شوٚڕش      جا لێی فێر ئەبین بە پێی توانا

[1] وشەی (رەوان) کەوا ئەبینی تابیلا نەبێتەوە بە فەننی جناس هەریەکە لە جێی خوٚیدا مانای تایبەتیان هەیە.

ڕەوانبێژی کرد لەگەڵ گیان برێژی ... تا دابینی کرد ئەم شانە جوانە
ئەو شانەی کەوا شان بە شان ئەکا ... بە (روح المعان)، (روح البیان)ە
هەڵاڵەی هێنا کاکی گەڵاڵی ... لە رازی قازیو نامیو مەولانا
لەگشت مەڵبەندێ رافەی کۆنو نوێ ... کەوا کراون لەسەر فورقانا
هەر پەڕەیەکی پڕە لە هەنگوین ... بەلام هەنگوینێ بێ کەرەشانە
شانازی ئەکەم کاکی گەڵاڵی ... گەڵاڵەیەکەو نوسخەی ئیمانە
سەرمەشقە لە بۆ چینی داهاتوو ... تا وەدوت کەون لەم گۆڕەپانە
هەرکەس پێنوسی بێنێتە کایە ... دەرگای هونەری لەروی زەمانە
شەرح کا شەرحو تەفسیرو حەدیث ... هەم شێعرو ئەدەب عیلمو عیرفانە
ماڵت ئاوا بێ برای عەزیزم! ... بەڵام نەك ئاوا لە ئاسمانا
هەروا ئاوابێ بۆ خزمەتکاری ... شیرینە تەفسیر لە پیاوی زانا[٢]
کەسی مونکیری تەفسیری تۆ بێ ... ئەوە مصداقی (کلا بل ران)[٣]
زۆر لە کۆنەوە مەشهورو باوە ... کەشافە (محمود) لەرووی قورئانا[٤]

---

[٢] – فەننی (جناسو یەك چوویی) بە کاربراوە. (ئاوا) لە لەتی شێعری ئەوەڵدا بە مانا مەعمور (موخەففەفی) ئاوەدان – ورگیراوەو دروس کراوە لە - ئاو - ماو - دانە - حب = لەلەتی دووەمدا بە مانا – افول وغروب. لەلەتی ئەووەڵی شێعری دوایدا کورت کراوەو – مخفف ومختصری – ئاوەها بێ واتە هەر لەسەر ئەو شێوە بێ.

[٣] - سورەی مطففین/١٤.

[٤] - هێما ئەکا بۆ عەللامەی ئەووەڵ (محمود زمخشری) = المحمود المحمود بلو لاه لمازال القران بکرا – أو کما قال الشاعر في حقة

حوى بأن تنهو زمخشر بامرئه
إذا عد في أسد الشرى نمخ الشرى

وفيى حق تفسير

ان التفاسير في الدنيا بلا عدد
فيها وليس لعمرى مثل كشاف

پێم گەیی تەفسیر وەك عەترو عەبیر — بۆنی جەستە ناوخاوو خێزانا
هەموومان گوتمان ئافەرین (محمود!) — حەمدت ئەکەین بەبێ وەستانا
غولامی پەنجەو دەستو قەڵەمتین — دیاری پیرۆزت لەسەر چاوانە
دیارە دیاری وا دیارە — بۆ کوردی عێراق تورکو ئێرانا[٥]
هەر بەو زوانە هەر بەو زوانە — چاون لە رێوەی سی جزوەکانە[٦]
خوایە بە خاتری سی جزمەی قورئان — بەحەقی سورەی (ئال عمرانا)
تەمەنی درێژ لەگەڵ تەمەنی زۆر — لەگەڵ صیحەتو خۆشی لەژیانا
بدە بە (محمود) مەلای مەلەوان — لە گۆمی ژینا لەمەلەوانا
رمزای مەلەوان: لە بیرو تەفسیر — لە خزمەت بە گەل بە نیشتمانا[٧]
بکە بە باعث سەرفرازی ئەو — هۆی رضوانی تۆو چوونی رضوانا[٨]
بیکە بە چرای ئەو لەبەرزەخا — ثیقلی حەسەنات لە تای میزانا
بکەی بە خەلات لە بۆ منو ئەو — خەباتی خاوێن لە رێی مەردانا
خەڵاتی قەبرن لیباسی تەقوا — ژیانن نەبێ بە مایەی ژانا[٩]

---

ان كنت تبغي الهدى فالزم قرائته
فالجهل كالداء والكشاف كالشاف

[٥]- لە وشەی (دیار)دا جناس هاتۆتە کایەوە هی ئەووەڵ واتە دیارە ئاشکرایە – دیاری: واتە هەدیەو توحفە – دیاری دیارە – واتە: هەدیەیە بۆ چەند وڵات = جمع دارە.

[٦]- دووبارە جناس هاتۆتە کایە – واتە هەر بەپەلە بەم زوانەو بەم نزیکانەو هەر بەم زاراوە جوانەی زمانی کوردی – چاودێرو چاولەرێی پاشماوەی جلدەکانی ترین.

[٧] وشەی (مەلەوان) لە کاتی شێعری ئەووەڵدا بە مانا – غواص – شەنادەرە – لە کاتی دووەمدا وشەیەکی عەرەبیە تەثنیەیە وەك – ملوین – بە مانا شەوو رۆژە – لەلەتی شێعری دواییدا وشەیەکی (مرکب)ە لە وشەی – مە، واتە: ئێمە – لەوان – لە مەلا مەحمود. جمع لەبەر ئیحترامە (وشەی – رمزا – ئەبێتە مەفعول بۆ وشەی – بکە – ئەمر لە شێعری دواییدا.

[٨] – رضوانی ئەووەڵ بە مانا خۆشنودیو قایل بوون – رضوانی دوایی واتە باغی بەهەشت.

نامت وەك نامی بێتە نێو نێوان ... وەك نوری فارس یا وەك (سلمانا)
روناكە دڵم بە نوری فارس ... خوایە بێوەی كەی لە دوو جیهانا
موفق بكەی كاكە (محمود)یش ... بۆ درێژە پێدان بەم خزمەتانە
زیندووەكەیین بە یاسای زەمان ... شاكاری رەسەن، كوردی ئاسانە
رێگەو رێبازی یوسفی (ئەصەم) ... ئەو شێخەمینەی خەڵكی ئالانە
خاوەن تەفسیرن لە لوغەی عەرەب ... باوبوو ئەو رۆژە لوغەی بێگانە
بەڵام ئەورۆكە هەر كەس خەریكە ... بە پیزو بە هێز بە كوردی خوانا
بنێ لەسەر خوان بێ نیتەدوكان ... زمانی زگماكی بێتە مەیدانا[10]
خوایە بە حەقی زاتو صیفاتت ... كوردیش بەشی خۆی بگرێ لەژیانا
نەقشە لە دڵی نەقش بەندیدا ... دوعایی دۆستان بە دڵو بە گیانا

عبدالرؤوف

## برێ لەو سەرچاوانەی لەكاتی پێویستدا بۆ ئەم تەفسیرە سەیریان كراوەو كەڵكیان لێ وەرگیراوە:

١- تەفسیری قورطوبی ج/١ - ٢٠.
٢- التفسیر الكبیر ١ — ٣٢ دانراوی ئیمام فخرالدین الرازی.
٣- الأساس في التفسیر ١ — ١٠ دانراوی مامۆستا سعید حوی.
٤- تەفسیری مونیر ج ١ — ٣٢ لە (١٦) جلْددا، دانراوی د. وهبة الزحیلی.
٥- تەفسیری مەراغی ج ١ — ١٠ دانراوی شێخ أحمەد مصطفی المراغی.
٦- في ظلال القران ج (١ — ٨) دانراوی مامۆستا سەید قوطب.
٧- تەفسیری ئیبنو كەثیر ج (١ — ٤).
٨- تەفسیری نامی ج (١ — ٧) دانراوی مامۆستا عبدالكریم.

---

[9] - خەڵاتی ئەووەڵ بە مانا عەتاو بە خشش – خەڵاتی دوایی – واتە: كفن پۆشاكی قەبر.

[10] – خوان – لە كۆتایی شێعری پێشوودا بە مانا روونو رەوشەن واتە بە جوانیو بە ئاسانی بخوێندرێتەوە لەلەتی شێعری دوایدا بە مانا سفرەو قۆناغە.

